# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی سییەم

سووڕەتەکانی

(المنافقون) و (التغابن) و (الطلاق)
(التحريم) و (الملك) و (القلم)
و (الحاقة) و(المعارج)

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# المنافقون و التغابن و الطلاق و التحريم
# الملك و القلم و الحاقة

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز

٧٩١ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ باللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْده اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِلْ فَلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاّ اللَّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّـا بَعْـدُ: فـإنَّ أَصْـدَقَ الحَديـث كَلاَمُ اللَّـه، وَخَيْـرَ الْهَـدِي هـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُـورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَــلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَــلاَلَةٍ فِي النَّــار[1].

**خوێنـەرە بەڕێــزو خۆشـەویسـتەکان!**

هیـچ گومـانی تێدانیــە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - کـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دواییـن کتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هــەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی لە خزمەتدابوونـدا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفکریـن و ڕامـان، فێرکـردن، کارپێکـردن ... هتـد، بـە باشتــرین جێگرتـن جێـگا دەگـرێ و، خاوەنەکـەی لـە دنیـاو دواڕۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) کـە پێغـەمبـەر ﷺ هـاوەڵانی بەڕێـزی فێـردەکرد، پێـش هــەر قسـەیەکی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخــوازییکردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتــارە، هـەرکام لە: التـرمذي: (١١٠٥)، النسـائي: (١١٠٤)، ابن ماجـه: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطّبــراني: (٢٤١٤) هێنــاویانەو (مسلم)یش بەشـێکی هێنـاوە.

منیـش - کـە وەك باسـکردنی چاکـەی خـوا (**التحـدّث بنعمـة اللّـه**) دەیخـەمەڕوو- لـەوەتی فامـم کردۆتـەوە، خـوای بەبەزەیـی و بەخشـەر چاکـەی لەگـەڵ کـردووم و، بـە فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خۆیـەوە سـەرگەرمی کـردووم و، بـەر لـە تەمـەنی بیسـت سـاڵییەوە هیدایـەتی داوم، قورئـانی بەڕێـزو پێـز لەبـەر بکـەم و، سـەرقـاڵی خوێندنـەوەی تەفسـیرەکانی قورئـان و، تێوەڕامـانی ئایەتـە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیـان بـم.

هـەر بۆیـەش تێکـڕای کتێـب و ناملیکـەو وتـارو دەرسـەکانم، کـەم و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان دابـوون، کـە دیـارە هـەر ئەمـەش شـتێکی سرووشـتییە؛ ئاخـر ئایـا ئیسـلام، بێجگـە لـە قورئـان پاشـان سـوننەتی پێغـەمبـەر ﷺ، کـە ئەویـش هـەر ڕوونکردنـەوەی قورئـان و چۆنیـەتی جێبەجێکـردن و کارپێکردنیـەتی، شـتێکی دیکەیـە؟! بێگومـان نەخێـر.

ئنجـا لەمێـژ ساڵیش بـوو، کـە بـراو خوشـکانێکی دڵسـۆزی نزیـك و ئاشـنام، داوایـان لێدەکـردم کـە دەسـت بکـەم بـە دانـانی تەفسـیـرو لێکدانەوەیـەکی قورئـان، هـەتا لـە ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)دا هاتـە دڵمـەوە، کـە نـاوی خـوای لێبهێنـم و دەسـت بـەو کارە گـەورەو گرنگـە بکـەم، بەڵکـو وردە وردە بەپێـی بـوارو دەرفـەت، هـەرساڵە هـەندێکی لـێ ئەنجـام بـدەم، لەگـەڵ سـەرقاڵیی زۆرو جـۆراو جۆریشـدا، هـەتا دەرفەتێـکی وام بۆ دەڕەخسـێ کـە بتوانـم خێرایـی تێـدا بکـەم و خۆمـی بـۆ یەکلایـی (**متفـرّغ**) بکەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بکـەم، ئەگـەر تەمـەن بەبەریـەوە مابێ.

سـەرچاوەی دانـانی ئـەم تەفسـیرو لێکدانەوەیەشـم، وێـڕای سـەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسـیـرانەی کـە بـاون و، دەسـتم پێیان گەیشـتوە، بریتیە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامانی خـۆم لە خـودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هـەندێکی هـەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّـر بَعضُهُ بَعْضَـاً**)، پاشان سـوننەتی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، چونکە پێغـەمبـەری خـواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئـانە، وەك خـوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٤٤﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە موسوڵمانانی کوردستان بکەم، کە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش کە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەکانی و کتێبەکانی سوننەتدا خەریکم و، دەیان کتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەکانی زانستەکانی شەریعەتدا پێشکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی کرانەم لەلایەن ئەمریکاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێکی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی کتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەکانییەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى**)دا زۆر چاك دەرەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچکەسیش بۆی نیە بڵێ: کە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونکە وێڕای سنوورداربوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر کتێبی لە هەموو ڕوویێکەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە کە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە ئێستا چاپ کراوەو، کەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلام بکەم و، تاکە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەکانی سوننەت، کە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شــارەزا نیم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبـارك وتعــالـى) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســووك و گـورج و گـۆڵ و دڵســۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشــاوە، خــوا بـە باشـتـرین شــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیــرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشــکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حــزب) - ناکەیــن، چونکــە هــەر ســوورەتێك بۆخــۆی شــتێکی ســەربەخۆیــەو، ســەرجەم ئایەتــەکانی وەك ئاڵقــەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـــدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیــاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بــرا دڵســۆزە ئێســتاش پـاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشــی جــەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمــان بەردەوام بێ، هەتــا کۆتــایی ئەم تەفسیــرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکاریيم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

# بەرچاو ڕوونییەكی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەكی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان كردوە كە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە كۆتایی هەر بەرگێكی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی كەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەكانیانمان بە ڕیز نووسیون[١]، بەڵام لێرەش وەك جەختكردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەكانمان نووسیوە، نە پێویست دەكات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆكەیەك، كە زۆربەی تەفسیرەكان لەبارەی ئایەتێكەوە، یان ڕستەو بڕگەیەكی ئایەتێكەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر كات بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتی یەكێك لە تەفسیرەكان هەبێ و بكەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بكەم، چ ڕەفزی بكەم، هەر كات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەكەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەكان لە كۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیكتیفا دەكەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بكەم، چونكە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێكی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

---

(١) دوایی وا بەباش زانرا ناوی تەفسیرەكان لابرێن و، لە كۆتایی كۆی بەرگەكانی [تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز]دا دەیاننووسین.

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەكی ئەم بەرگە

**الحمدلله وكفى، وصلاته و السلامه وبركاته عن عباده الذين اصطفى وآله جميعا من الصحب و الأزواج و القرابة و التابعين لهم بإحسانٍ إلى يوم الدين**

خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم!

ئەمە بەرگی سییەمینە لە تەفسیری قورئانی بەرز و بەڕێز، هەشت سوڕەت دەگرێتە خۆ کە ئەمانەن:

١- المنافقون

٢- التغابن

٣-الطلاق

٤- التحريم

٥- الملك

٦- القلم

٧- الحاقة

٨- المعارج

شێوازی تەفسیرکردنیسیان وەک شێوازی بەرگەكانی پێشوویە، ئەم بەرگە وێڕای قۆناغ و هەنگاو تەفسیرکردنی ئایەتە بەڕێزەكانی ئەو هەشت سوڕەتە، ژمارەیەک کورتەباس و بابەتی دیکەشی تێدان بەڵام بەم شێوەیەی خوارێ:

**یەكەم: سوورەتی (المنافقون):**

لە تەفسیری ئەم سوڕەتەدا ئەم کورتە باس و بابەتانە هەن:

١- کورتە باسێک: پوختەیەكی جەنگی (بنو).

٢- کورتە باسێک دەربارەی نیفاق و مونافیقان.

## دووەم: سوورەتی (التغابن):

کورتە باسێک دەربارەی قەدەرەوە.

## سێهەم: سوورەتی (الطلاق):

١- پێناسەی دادگەری (العدل).

٢- کورتە باسێک لەبارەی طەلاقەوە.

٣- کورتە باسێک لەبارەی حەوت ئاسمانەکان و زەوییەوە.

## چوارەم: سوورەتی (التحریم):

١- چوار سەرنجی گرنگ.

٢- کورتەباسیک لەبارەی پێگەی بەرزی هاوسەرانی پێغەمبەری خواوە -خوا لییان ڕازی بێت-

## پێنجەم: سوورەتی (الـمـــلك):

١- کورتەباسێک لە پێنج سەرنجدا.

٢- کورتە باسێک لەبارەی هەندێک وردەکاری بیستنەوە.

٣- کورتەباسێک لەبارەی وردەکاری بینین.

٤- کورتە باسێک لەبارەی عەقڵ و مێشک.

## شەشەم: سوورەتی (القلم):

١- کورتەباسێک لەبارەی ڕەوشت بەرزی پێغەمبەر ﷺو ڕەفتار پەرستی ناحەزانییەوە.

٢- هەڵوەستەیەک لەبارەی (**یوم یکشف عن ساق**) ەوە.

٣- کورتە باسێک لەبارەی چاو لێدانەوە.

## حەوتەم: سوورەتی (المعارج):

١-چەند دەقێکی سوونە لەبارەی ئەو ڕۆژەوە کە پەنجا هەزار ساڵە.

٢- کورتە باسێک: چوار سەرنج.

٣- خاڵە بێهێزەکانی مرۆڤ.

٤- ڕوونکردنەوەیەک لەبارەی بەردەوامی لەسەر نوێژەکان و پاراستنیانەوە.

٥- حەوت وردە سەرنج.

**هیواداریشم ئەم بەرگەش وەک بەرگە پێشووەکانەوە بە وردی بخوێندرێتەوە، بەهرەو سوودی پێویستی لێ وەربگیرێ.**

**١٤/ شوال/ ١٤٤٤هـ -٢٠٢٣/٥/٤ هەولێر.**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٣)ی مانگـی ڕەمەزانـی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٥/٦)ی زاینیـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسیرکردنی سـووڕەتی (المنافقون)، وەك عادەتـی خۆشـمان، پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـووڕەتە مـوبارەکە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سووڕەتی (المنافقون) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە هـەر بـە (سُـورَةُ المُنَافِقُـونَ) نـاسراوە، لـەو بـارەوەش بەڵگـە زۆرن، بـۆ وێنـە ئـەو دوو دەقـە دێنیـن:

**١)- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ الْمُنَافِقِينَ بِالْمَدِينَةِ} (أخرجه ابْنُ الضَّرِيسِ وَالنَّحَّاسُ وَابْنُ مَرْدَوَيْهِ وَالْبَيْهَقِيُّ، وَأَخْرَجَ ابْنُ مَرْدَوَيْهِ عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ مِثْلَهُ).**

واتــە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس رضي الله عنهما گوتوویەتـی: سـووڕەتی (مُنَافِقِـينَ) لـە مەدینـە دابەزیـوە.

**٢)- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ بِسُورَةِ الْجُمُعَةِ، يُحَرِّضُ بهَا الْمُؤْمِنِينَ، وَفِي الثَّانِيَةِ بِسُورَةِ الْمُنَافِقِينَ، فَيُقَرِّعُ بِهَا الْمُنَافِقِينَ} (أخرجه الطَّبَرَانِيُّ فِي الْأَوْسَطِ كما فِي المجمع: ج٢ ص١٩٢، وقال الهيثمي فِي المجمع إسناده حسن وأصله فِي الصحيح**

باختصار، وَأَخْرَجَ الْبَزَّارُ وَالطَّبَرَانِيُّ عَنْ أَبِي عِنَبَةَ الْخَوْلَانِيِّ، والحديث حسنه السيوطي في الدُّر المنثور: ج٦ ص٣٣٤).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە (ڕكاتـی یەكەمـی) نوێـژی جومعـەدا، (ئـەو باسـی ڕەكاتەكـەی نەكـردوە، بـەڵام دیـارە) سـوورەتی (**جُمُعَـةِ**)ی دەخوێنـد، بڕوادارانـی پـێ هانـدەدا، (بـۆ دینداریـی و مسـوڵمانێتیی و بەردەوامیـی لەسـەر تاعـەت و، خۆپاراسـتن لـە نیفـاق و دەغەڵیـی و، خۆپاراسـتن لـە كەوتنـە ژێـر كاریگەریـی خـاوەن كتێبـە لادەرەكان) و، لـە (ڕكاتـی) دووەمـدا سـوورەتی (**مُنَافِقِينَ**)ی دەخوێنـد (لەمیانـی خوێندنـی سـوورەتی (**مُنَافِقِينَ**)دا) سـەر كۆنـەو سەرزەنشـتی مونافیـق و دەغەڵەكانـی دەكـرد.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

زانایـان لەسـەر مەدینەیـی بوونـی ئـەم سـوورەتە یەكدەنگـن و، ئەمـەش ئاشـكرایە چونكـە هەمـووی لـە بـارەی مونافیقەكانەوەیـە، ئەوانیـش لـە مەدینـە بـوون، حاڵەتـی نیفـاق و دەغەڵیـی و دووڕوویـی لـە مەدینـە سـەری هەڵـداوە، چونكـە لـە مەككـە مسـوڵمانان باڵادەسـت نەبـوون، تاكـو خەڵـك ناچـار بـێ، لـە ڕووی ئەوانـدا خـۆی بـە مسـوڵمان پیشـان بـدات و لـە لای بێبڕوایەكانیـش بڵـێ: بێبـڕوام، هەمیشـە حاڵەتـی نیفـاق لـەو كۆمەڵگایانـەدا دروسـت دەبـێ كـە ئیسـلام تێیانـدا باڵادەسـتە، لـەو كۆمەڵگایانـەدا خەڵكێكـی دەغـەڵ و دڵنەخـۆش، ناچـار دەبـێ خـۆی بـە مسـوڵمان پیشـان بـدات، لـە حاڵێكـدا كـە بـڕوای بـە ئیسـلامیش نیـە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

بـە یەكدەنگیـی زانایانـی ژمێـرەرەری ئایەتەكانـی قورئـان، ژمـارەی ئایەتەكانـی ئـەم سـوورەتە یـازدە (١١)یـە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و لە موصحەفدا:

ئـەم سـووڕەتە لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا بـە پێـی ڕای (**جابـر بـن زیـد**) ژمـارە سـەدو دوو (١٠٢)یـە، واتـە: سـەدو دووەمیـن سـووڕەتە دابەزیـوە، لـە دوای سـووڕەتی (**الحـج**) و، پێـش سـووڕەتی (**المجادلـة**)، لـە موصحەفیشـدا ڕیزبەندییەکـەی ژمـارە شەسـت و سـێ (٦٣)یـە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

یـازدە ئایەتەکـەی ئـەم سـووڕەتە، جگـە لـە سـێ ئایەتـی کۆتایـی، هەموویـان لـە بـارەی موونافیقەکانـەوەن، واتـە: ئـەم سـووڕەتە هەشـت ئایەتـی لـە بـارەی موونافیقەکانـەوەن و، سـێ ئایەتـی کۆتاییـش، خـوا ﷻ تییانـدا بـڕواداران دەدوێنـێ، کـە مـاڵ و سـامانی خۆیـان خـەرج بکـەن و بـە مـاڵ و سـامانیان فیداکاریـی بکـەن لـە پێنـاوی خـوای پـەروەردگارداو، دەسـتگرۆیی و هاوکاریـی هـەژاران و نـەداران بکەن.

هەروەهـا لـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا، هەڵوێسـتێکی زۆر قێزەونـی سـەری موونافیقـەکان (**عبداللـه بـن أبي بـن سـلول**)، لـە جەنگـی (**بني المصطلق**)دا، کە قسـەیەکی زل و ناشایسـتەی بەرانبـەر بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ و مسـوڵمانان کـردوە، خراوەتـە ڕوو، کـە دوایـی حاشـای لـە قسـەکەی خـۆی کـردوەو سـوێندی بـە درۆی خـواردوە، خـوا ﷻ لـە ئایەتەکانـی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا، ئاماژە بەو هەڵوێسـتەو قسـەکانی عەبدوڵـڵاو، پـۆزش هێنانـەوەی و سـوێندی بـەدرۆ خواردنـی، دەکات.

هەروەهـا لـەم سـووڕەتەدا ژمارەیـەك لـە خەسـڵەتەکانی موونافیقـەکان خراونـەڕوو.

لـە سـێ ئایەتـی کۆتاییـش دا خـوا ﷻ ڕووی کردۆتـە بـڕواداران، کـە وەك موونافیقـەکان و دڵ نەخۆشـەکان بـاوەش بـە دنیـادا نەکـەن، ژیـان و گوزەرانـی دنیـا لـە خـوا بێئاگایـان نـەکاو، سـەرەنجام پەشـێمانیی بچێـژن، بـێ ئـەوەی سـوودی لـێ ببینـن.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

تایبەتمەندیی بنەڕەتیی ئەم سووڕەتە، ئەوەیە کە وێڕای ئەوەی بە ناوی (منافقون)ەوەیەو، لە چەند سووڕەتێکی قورئاندا، وەك دوایی باس دەکەین، خوا ﷻ باسی مونافیقەکان و سیفەتەکانیانی کردوە، بەڵام تەنیا ئەم سووڕەتە بە ناوی (**المنافقون**)ە، ئنجا ئەم سووڕەتە موبارەکە، وێڕای ئەوەی ناوی (**المنافقون**) ی لەسەرە، پێناسەیەکی باشی مونافیق و دەغەڵ و دوو ڕووەکان دەکات و دەوری بیست (٢٠) لە خەسڵەت و هەڵس و کەوتەکانیان، لە دوو توێی ئەو هەشت (٨) ئایەتەدا دەخاتە ڕوو.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە کۆی ئەو یازدە (١١) ئایەتەی سووڕەتی (**المنافقون**) دابەش دەکەین بۆ دوو دەرس:

**دەرسی یەکەم:** هەشت (٨) ئایەتە، ئایەتەکانی: (١ - ٨)، ئەوانیش هەموویان باسی مونافیق و دڵ نەخۆشەکان دەکەن و، دەوری بیست (٢٠) لە سیفەت و نیشانەکانیان دەخەنە ڕوو.

**دەرسی دووەم:** لە سێ ئایەتی کۆتایی سووڕەتی (**المنافقون**) پێك هاتوە، ئایەتەکانی: (٩ - ١١) کە تێیاندا خوای بەرزو مەزن فەرمان بە بڕواداران دەکات: وریابن! سامان و ڕۆڵەکانیان لە یادی خوا بێئاگایان نەکەن و نەیانخافڵێنن و لەوەی خوا پێیداون ببەخشن بەوانەی ئاتاجن و، ببەخشن بۆ خزمەتی ئەو قەوارە ئیسلامییەی تێیدا دەژین، بەرلەوەی مردنیان بۆ بێت و، خۆزگە بخوازن دوابخرێن و، خواش ئەجەلی هیچ کەس دواناخات.

شایانی باسە: دواتر پوختەیەك لە بارەی جەنگی (**بني المصطلق**)ەوە باس دەكەین، لەبەر تیشكی (**السيرة النبوية لابن هشام**)[١] و (**عيون الأثر لابن سيد الناس**)[٢]و (**المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير**)[٣]دا، كە بەسەرهاتی عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەیی كوڕی سەلوول و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە مونافیق و دەغەڵەكان و، هەڵوێستی زۆر خراپ و نەرێنییان بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانان، هەبووە، خراوەتەڕوو، هەشت ئایەتەكانی سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەكە باسی دەكەن.

---

(١) ج٣ ص ١٤٩ - ١٥٢.

(٢) ج٢ ص ١٣٤.

(٣) ص ١٤٠٧ - ١٤٠٩.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت ئایـەت پێكـد دێ، ئایەتەكانـی: (١ - ٨)، تێیانـدا باسـی مونافیقـەكان و ژمارەیـەك لـە سـیفەت و ڕەفتارەكانیـان كـراوە، لـەو هەشـت ئایەتـەدا، تیشـك خراوەتـە سـەر كەسـایەتیی مونافیقەكان و بە مسـوڵمانان ناسـێنراون و وەك پێشـتر گوتمـان: دەوری بیسـت (٢٠) سـیفەتیان لـێ باسـكراون، كـە ئەمانـەن:

**١و٢-** شایەدییدانـی ڕواڵەتـیی بۆ موحەممەد كە پێغـــــەمبەری خوایە و، درۆكردن لەو شایەدییدانەدا.

**٣و٤-** سوێندی درۆكردنە قەڵغان و، خەڵك لە ڕێ لادان.

**٥و٦-** بڕواهێنان و دوایی كافربوونەوەو، مۆر بەسەر دڵەوە نرانیان.

**٧-** سەرسامبوون بەجەستەو دیمەنیان.

**٨-** قسەی زرق و برق و خۆش و بۆش كردنیان.

**٩-** چوێنرانیان بە دارو تەختەی بۆشی هەڵپە سێرراو.

**١٠-** هەمیشە دەست لەسەر دڵ بوون و لە خۆترسانیان - كە كەشف بن -.

**١١-** دوژمنی سەر سەخت بوونیان بۆ ئیسلام و مسوڵمانان.

**١٢-** لاڕێ بوون هەتلەبوون لە ڕاستە ڕێی خوا، وەك ویستیان لە دەست دابێ.

**١٣-** مل بادان و نەهاتنەلای پێغەمبەری خوا بۆ داوای لێبوردن بۆ كران.

**١٤-** خۆ بەزلگریی.

**١٥-** لێ نەبوردنی خوا بۆیان بەهۆی لاڕێییانەوە.

**١٦و١٧-** پیلانگێرییان كە هاوكاریی هاوەڵانی دەوری پێغەمبەری خوا نەكرێ و، سەرەنجام لە دەور پرژانیان و پڵاوەكردنیان.

**١٨-** نەبوونی تێگەیشتنی قووڵ.

**١٩و٢٠-** هەڕەشەکردنیان بەدەرکردنی پێغەمبەری خواو هاوەڵانی لە شار و نەزانیی و کەودەنییان.

بێگومان تێنەگەیشتوویی (**عدم الفقه**) جیایە لە نەزانین (**جهل**)، چونکە جاری وا کەسێك زانیاریی هەیە، بەڵام لە شتەکان، ورد تێناگات، نەزانیی ئەوەیە ئەو کەسە زانیاریی نەبێ، بەڵام تێنەگەیشتوویی ئەوەیە عەقڵ و هۆشی باش کارنەکات و تێنەگات.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْاْ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾.

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کاتێك مونافیقەکان هاتنە لات گوتیان: شایەدیی دەدەین، بە دڵنیایی تۆ نێردراوی خوای، خواش دەزانێ بێگومان تۆ نێردراوی وی، بەڵام خوا شایەدیی دەدات کە مونافیقەکان درۆزنن (کە دەڵێن: بڕوامان بە نێردراوییت هەیە) ﴿١﴾ سوێندە (درۆیە)کانیان کردوونە قەڵغان (و پۆشەریان)، ئنجا لە ڕێی خوا لایانداوە (و خەڵکیشیان لاداوە)، بێگومان ئەوەی دەیکەن خراپترین کارە ﴿٢﴾ ئەو (خراپترین کارە)یش بەهۆی ئەوەوە کە بڕوایان هێناوە، دوایی بێبڕوا بوون، سەرەنجام مۆر بەسەر دڵیانەوە نرا، ئنجا ئەوان تێناگەن ﴿٣﴾ کاتێکیش بینیتن، جەستەو دیمەنیان سەرسامت دەکات، ئەگەر قسەش بکەن، گوێ بۆ قسەکەیان دەگری، وەك دارە هەڵپەسێردراوەکان وان، پێیان وایە هەر هاوارو چریکەیەك لە دژی ئەوانە، ئەوانن دوژمن، لێیان وریابە، خوا بیانکوژێ بۆ کوێ لادەدرێن! ﴿٤﴾ هەر کاتێك پێشیان گوترا: وەرن پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێبوردنتان بۆ (لە خوا) دەکات، سەریان باداو بینیتن خۆ بەزلگرانە (لە ڕێی ڕاست) لایاندا ﴿٥﴾ (ئەی پێغەمبەر!) یەکسانە لەسەریان ئایا داوای لێبوردنیان بۆ بکەی، یان داوای لێبوردنیان بۆ نەکەی، هەرگیز خوا لێیان نابووری، بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی لادەران ڕاستە ڕێ ناکات و، بە ئامانج ناگەیەنێ ﴿٦﴾ ئەوان ئەو کەسانەن دەڵێن: خەرجیی ئەوانە مەکێشن، کە لەلای پێغەمبەری خوان ﷺ (و هاوکارییان مەکەن)، تاکو دەپرژێن و بڵاوە دەکەن، عەمبارەکانی ئاسمانەکان و زەوییش هی خوان، بەڵام مونافیقەکان تێناگەن ﴿٧﴾ (مونافیقەکان) دەڵێن: مسۆگەر ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، بە دڵنیایی لایەنی بەهێزو باڵادەست، لایەنی بێهێزو زەبوون (لە شارەکە) وەدەردەنێن، هێزو باڵادەستییش هی خواو هی پێغەمبەرو هی بڕوادارانە، بەڵام مونافیقەکان نازانن ﴿٨﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلۡمُنَٰفِقُونَ): كۆی (مُنَافِق)ە، پێم وایە واباشە بە كوردیی بگوترێ: دەغەڵ، بێگومان مونافیقەكان دووڕوون، بەڵام پێم وایە بابای دوو ڕوو (ذُو الوَجْهَين)، دەگونجێ لە نێو مسوڵمانانیشدا هەبێ و دوو ڕوویی، سیفەتێكی خراپەو گوناهێكی گەورەیە، بەڵام بۆ مونافیق، پێم وایە ئەگەر بگوترێ: دەغەڵ، واتە: كەسێك كە ڕواڵەتی مسوڵمانە، بەڵام لە نێو خۆی و لە نێوەوەدا بێبڕوایە، ڕاسترەو كورد زیاتر ئەو وشەیە بەكاردێنن، بۆ كەسێك كە پێچەوانەی ئەوەی دەری دەخات، دەیشارێتەوە: (يُبْطِنُ خِلَافَ مَا يُظْهِر)، مسوڵمانێتیی دەردەخات، بەڵام كوفر لە دڵی خۆیدا پەنهان دەكات.

(نفاق) لە چییەوە هاتوە؟ (مِنَ النَّفَقِ، وَالنَّفَقُ: الطَّرِيْقُ النَّافِذُ وَمِنْهُ نَافِقَاءُ اليَرْبوع، النِّفَاقُ: الدُّخُولُ فِي الشَّرْعِ مِنْ بَابٍ، وَالخُرُوجُ عَنْهُ مِنْ بَابٍ آخَر)، (نفاق) لە (نَفَق)ەوە هاتوە كە بە ڕێیەك دەگوترێ لە بن زەوییدا (بە كوردیی تونێلی پێدەڵێن) هەروەها كونی جورج (نَافقَاء)ی پێ دەگوترێ ( (نَافقَاء) كونی جورجە لە بیابان، لە شوێنێك دەیكۆڵێ، ئەگەر لێرەوە تینی بۆ هات، لەوێوە دەردەچێ.

لە زاراوی شەرعدا (نیفاق): بریتیە لە چوونە نێو ئیسلام لە دەرگایەكەوەو، لێ هاتنەدەری لە دەرگایەكی دیكەوە.

(نَشۡهَدُ): (الشَّهَادَةُ: قَوْلٌ صَادِرٌ عَنْ عِلْمٍ حَصَلَ بِمُشَاهَدَةِ بَصِيْرَة، أو بَصَرٍ)، شایەدیی دان قسەیەكە دەرچووە لە زانیارییەكەوە، كە پەیدابووە، بەهۆی بینینی دەروون، یاخود بینینی چاوی سەرەوە.

(جُنَّةً): (الجُنَّةُ وَالمِجَنُّ وَالمَجَنَّةُ: التُّرْسُ الّذِي يُجِنُّ صَاحِبَهُ)، (جُنَّة، مِجَنّ، مَجَنَّة) هەرسێکیان بە قەڵغان و سوپەرێك دەگوترێن کە خاوەنەکەی دەشارێتەوە، واتە: لە تیرو ڕم و شیرو تەور، کە کاتی خۆی شەڕیان پێکراوە.

(فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ): خەڵکیان لە ڕێی خوا لادا، ئەگەر (صَدَّ) لە (صَدّ)ەوە بێ، بەڵام ئەگەر لە (صُدُوْد)ەوە بێ، (صَدَّ صُدُوداً، أي: إنْصَرَفَ انصِرَافاً)، واتە: خۆیان لە ڕێ لایاندا، چونکە (صَدَّ)، هەم حاڵەتی (لازم)ی هەیە، (صَدَّ عَنْ سَبِيْلِ الله) واتە: خۆی لایدا، هەروەك حاڵەتی تێپەڕێنەر بۆ بەرکار(مُتَعَدِّي)شی هەیە، ئەو کاتە: (يَصُدُّ عَن سَبِيْل الله) واتە: (يَصُدُّ النَّاس عَن سَبِيْل الله)، خەڵك لە ڕێی خوا لادەدا.

(فَطُبِعَ): (الطَّبْعُ: أنْ تُصَوِّرَ الشَّيء بصُوْرَة ما، وَهُوَ أعَمُّ مِنَ الخَتْمِ وَأخَصُّ مِنَ النَّقْش) (طبْع) ئەوەیە تۆ بەشێوەیەك وێنەی شتێك بکێشی، وشەی (طَبْع) گشتییترە لە مۆر (الخَتْم)، بەڵام تایبەتترە لە نیگار (النَّقْش)، بەڵام ئێمە لە کوردییدا هەر دەڵێین: مۆر، مۆری کردو مۆری پێوەنا، مۆری کێشا، ئەم تەعبیرەش بەکاردەهێنرێ بۆ حاڵەتێك، وەك چۆن نامەیەك دەنووسرێ و مۆر دەکرێ، مانای وایە هیچی دیکەی تێدا نانووسرێ و کۆتاییە، کەسێکیش بەرەو کوفرو خراپە دەچێ، خوای کارزان ئەو حاڵەتە کە ئەو مرۆڤە وای لێ دێ و دڵی ئیمانی ناچێتێ، هەرکام لە (طبع) و (ختم)ی بۆ بەکارهێناون: (خَتَمَ عَلَى قُلُوبِهِم)، یانی: وەك چۆن نامەیەك مۆر دەکرێ، دڵی ئەوانیش مۆر کراوەو تازە کۆتایی هاتوە.

(لَا يَفْقَهُونَ): واتە: تێناگەن، ورد تێناگەن، (الفِقْهُ: التَّوَصُّلُ بِعِلْمٍ شَاهِدٍ إلى عِلْمٍ غَائِبٍ، فَهُوَ أخَصُّ مِنَ العِلْم)، (فِقْه): بریتییە لەوەی بە هۆی زانیارییەکی بەرچاوەوە بگەی بە زانیارییەکی نادیار، کەواتە: (فِقْه) تایبەتترە لە زانیاریی.

هەندێکیش گوتوویانە: (الفِقْهُ: هُوَ فَهْمُ مُرَاد المُتَكَلّم)، (فِقْه): تێگەیشتنە لە مەبەستی بێژەر.

هەندێکیش گوتوویانە: (**الفِقْهُ: هُوَ العِلْم بِدَقَائِق الأمُور**)، (**فِقْه**): بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە وردەکاریی کارەکان.

(**تُعْجِبُكَ**): واتە: سەرسامت دەکات، (**أُعْجِبَ بنَفْسِه، أو بِرَأيِهِ، فَهُوَ مُعْجَبٌ، وَالإسْمُ: العُجْبُ**)، دەگوترێ: (**فُلَانٌ أُعْجِبَ بِنَفْسِه أو بِرَأيِهِ**)، فڵانکەس بەخۆی و بە بۆچوونەکەی خۆی سەرسام بوو، کە ئەو کاتە ناوی بکەر (**إسم فاعل**)ەکەی دەبێتە (**مُعْجَب**)، واتە: سەرسام بوو لە حاڵەتی بەرکاردا دەبێ و، ناوەکەشی بریتیە لە (**عُجب**) واتە: سەرسام بوون.

(**أَجْسَامُهُمْ**): (**جَسَد: مَا لَهُ طُولٌ وَعُرضٌ وَعُمقٌ**)، (**أَجْسَام**) کۆی (**جِسْم**)ە، کە هەر شتێکە درێژیی و پانیی و قووڵیی هەبێ، (**الجَسَدُ: كَالْجِسْم لَكِنَّهُ أَخَصُّ إذ الجَسَد مَا لَهُ لَوْنٌ**) (**جَسَد**)یش هەروەك (**جِسْم**)ە لە زمانی عەرەبییدا (بە کوردیی دەڵێین: جەستە، بەدەن، لاشە) بەڵام (**جَسَد**) تایبەتترە لە (**جِسْم**)، چونکە (**جَسَد**) ئەوەیە ڕەنگی هەبێ، هەرواش (**جِسْم**)ی هەیە، بەڵام ڕەنگی نیە، بەڵام کە گوتت (**جِسْم**) دەبێ ڕەنگی هەبێ.

بەڵام پێم وایە: (**جَسَد**) ئەوەیە ڕووحی تێدانەمابێ و (**جسم**) ڕووحی تێدایە، بە بەڵگەی:

١- ﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ ﴾ یونس: ٩٢. **ببدنك: بجسدك.**

٢- ﴿ ... وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ﴾ البقرة: ٢٤٧.

٣- ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ... ﴾ المنافقون: ٤.

٤- ﴿ وَأَلْقَيْنَا عَلَىٰ كُرْسِيِّهِۦ جَسَدًا ... ﴾ ص: ٣٤.

وەك دەبینین بۆ هەرکام لە (**طالوت**)و (**منافقین**) کە زیندوون و ڕووحیان لە بەرجەستەیان دایە، وشەی (**جسم**)ی بەکارهێناوە.

بەڵام بۆ منداڵە مردووە بێ ڕووحەکەی (**سلیمان**) عليه السلام (**جَسَد**) بەکارهاتوە.

(خُشُبٌ): (**جَمْعُ الخَشَبِ، مِثْلُ ثُمُر وَثَمَر**)، (**خُشُب**) كۆی (**خَشَب**)ە واتە: دارەکان، دار، هەرچەندە ئێستا وەك باوی زمان، زیاتر (**خَشَب**) بۆ تەختە بەکاردێ، تەختەش هەر دارە، بەڵام لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا (**خَشَبْ**) کە بە (**خُشُب**) کۆ دەکرێتەوە، واتە: دار بە گشتیی، دار دوای وشك بوونی، وەك (**ثَمَر و ثُمُر**) (**ثُمُر**) کۆیەکەیەو (**ثَمَر**)یش تاکەکەیە، (**ثُمُر**) واتە: میوەکان، بەرەکان، (**ثَمَر**)یش یەك بەر، یەك میوە.

(مُّسَنَّدَةٌ): (**سَنَدَ وَاسْتَنَدَ إلى الشَّيء: اعْتَمَدَ**) (**سَنَدَ وَاسْتَنَدَ إلى الشَّيء**) واتە: پاڵی بە شتەکەوەدا، کە دەفەرموێ: (**خُشُبٌ مُسَنَّدة**) واتە: داری هەڵپەسێردراو، دارێك کە بە دیوار هەڵدەپەسێردرێ، بە دیوارەوە دەنرێ، لەبەر ئەوەی خەڵك کاری پێی نیەو بەکار نایەت، (**مُسَنَّدَة**) دەشگونجا بگوترێ: (**خُشُبٌ مُسْنَدة**)، دارە هەڵپەسێردراوەکان، بەڵام (**مُسَنَّدَة: شُدِّدَ للكَثْرَة**)، لەبەر ئەوەی دارەکان زۆرن، بۆیە گیرەدار کراوە.

(صَيْحَةٍ): (**الصَّيْحَةُ: رفع الصَّوْت، وَأَصْلُهُ تَشْقِيْق الصَّوْت، انْصَاحَ الخَشَبُ، أو الثَّوْب: انْشَقَّ فَسُمِعَ مِنْهُ صَوْتٌ**)، (**صَيْحَة**) لە بنچینەدا دەنگ بەرزکردنەوەیە، ڕیشەکەی بریتیە لە قڵیشانی دەنگ، تەختەیەك دارێك کە دەقڵیشێ، یاخود بەرگێك پۆشاکێك کە دەقڵیشێ، دەنگی لێ دێ.

(فَاحْذَرْهُمْ): (**الحَذَرُ: إحْتِرَازٌ مِنْ مُخِيْفٍ**)، (**حَذَر**): بریتیە لە خۆپاراستن لە شتێکی ترسناك، شتێکی جێی مەترسیی.

(يُؤْفَكُونَ): (**يُصْرَفُونَ عَنِ الحَقِّ**)، لە هەق لا دەدرێن.

(لَوَّوْا): سەریان بادا، (**اللَّيُّ: فَتْلُ الحَبْل**)، (**لَيّ**): بریتیە لەوەی گوریسێك، پەتێك بنووشتێنیەوە، (**وَلَوَّى رَأْسَهُ: أَمَالَهُ**) سەری بادا، (**وَالتَّشْدِيْدُ لِلْكَثْرَةِ وَالمُبَالَغَة**)،

دەگونجا بگوترێ: (لَـوَوا رُؤُوسَـهُم) کـە بـەو شـێوەیەش خوێندراوەتـەوە، بـەڵام کـە دەفەرمـوێ: (لَـوَّوا رُؤُوسَـهُم) گیرەدارکردنـی بـۆ زۆرییـە، واتـە: زۆر سـەریان بـادەدەن، یاخـود بـۆ زێدەڕۆییـە، واتـە: زۆر بـە سـەختیی مـل بـادەدەن و گـوێ ناگـرن.

(سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ): یەکسـانە لەسـەریان، (السَّـوَاءُ: العَـدْلُ، وَسَـوَاء الـشَّيء: وَسَـطُهُ، سَـوَاءٌ: إِسْمٌ، سَـوَاءٌ عَـلَيَّ أَقُمْـتَ أَمْ قَعَـدَتَ)، وشـەی (سَـوَاء) بـە مانـای دادگەریـی دێ، (وَسَـوَاء الـشَّيء) واتـە: نێوەڕاسـتی ئـەو شـتە، (سَـوَاء) نـاوە، دەگوتـرێ: (سَـوَاءٌ عَـلَيَّ أَقُمْـتَ أَمْ قَعَـدتَ)، بـۆ مـن یەکسـانە هەڵسـی یاخـود دابنیشـی.

(يَنفَضُّواْ): (الفَـضُّ: الكَسْرُ بِالْتَّفْرِقَـة): (فَـضّ) بریتیـە لـە شـکانی شـتێك و بڵاوبوونی، (فَـضَّ القَـوْمَ فَانْفَضُـوا: فَرَّقَهُـمْ فَتَفَرَّقُـوُا)، خەڵکەکـەی پرژانـدو پـرژان واتـە: بـڵاوی کـردن و بڵاوبوونـەوە.

(ٱلۡأَعَزُّ): (العِـزّ: ضِـدُ الـذُّلّ) (عِـزّ) دژی (ذُل)ە، (عِـزّ) واتـە: باڵادەسـتیی، (ذُلّ) واتـە: زەبوونیـی و بێدەسـەڵاتیی، (عَزَّ يَعِزُّ، أي: قَـوِيَ بَعْـدَ ذِلَّـةٍ) واتـە: دوای ئـەوەی بێدەسـەڵات و زەبـوون بـوو، بەهێـز بـوو.

(ٱلۡأَذَلَّ): پێچەوانـەی (الأعَـزّ)ە، واتـە: هـەرە بەهێـزو باڵادەسـت، (الأذَلّ) واتـە: هـەرە زەبـوون و هـەرە بـێ دەسـەڵات و دامـاو، دەگوتـرێ: (ذَلَّ يَـذِلُّ ذُلاً وَذِلَّـةً وَمَذَلَّـةً فَهُـوَ ذَلِيْـلٌ، أَذِلاَّءِ وَأَذِلَّـة، وَالـذُّلُّ ضِـدُّ العِـزِّ)، (ذَلّ يـذلّ) یـانی: زەبـوون بـوو، زەبـوون دەبـێ، (ذُلاًّ وذِلَّـةً وَمَذَلَّـةً) هەموویـان چاوگـن، واتـە: زەبوونیـی، (أَذِلاَّء وأذِلّـة) هەردووکیـان کـۆن، واتـە: ئـەوان زەبوونـن، (ذُلّ) زەبوونیـی، پێچەوانـەی (عِـزّ)ە، (عِـزّ) واتـە: بـاڵا دەسـتیی، (الـذِلُّ ضِـدُّ الصُعُوبَـة)، (ذِلّ) دژی زەحمـەت و قورسـییە، دەگوتـرێ: (دَابَّـةٌ ذَلُـول) کـە لـە (ذِلّ)ەوە هاتـوە، واتـە: وڵاخێـك، ئاژەڵێکی دەسـتەمۆ، کـە بـە ئاسـانیی بێتـە ژێربـار، پێچەوانەکـەی بریتیـە لـە (دَابَّـةٌ صَعْبَـة)، ئاژەڵێـك کـە جەنـە بگـرێ، لووشـکە بـاوێ و ڕێ نـەدات بـاری بخرێتـە سـەر پشـت.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خوارەوەی ئـەم ئایەتانـە: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا۟ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا۟ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾.

چەنـد گێڕراوەیـەك دەربـارەی هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتانـە، هاتـوون، ئێمـە دوو ڕیوایەتمـان لـێ هەڵبـژاردوون، کـە لـە ڕووی سـەنەدەوە بەهێزتـرن:

**یەکەم:** {عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﵁، قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عَمِّي فِي غَزَاةٍ، فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ ابْنِ سَلُولَ يَقُولُ لِأَصْحَابِهِ: لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا، لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ؛ قَالَ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمِّي أو لعُمرَ، فذكره للنَّبي ﷺ فَدَعَانِي فَحَدَّثْته، فَأَرْسَلَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَحَدَّثْتُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ بْنِ سَلُولٍ وَأَصْحَابِهِ، فَحَلَفُوا مَا قَالُوا، فكَذَّبني رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وصَدَّقه، فَأَصَابَنِي هَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثْلُهُ قَطُّ، وَجَلَسْتُ فِي الْبَيْتِ، فَقَالَ عَمِّي: مَا أَرَدْتَ إِلَّا أَنْ كَذَّبَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَقَتَكَ. قَالَ: حَتَّى

**أَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾، قَالَ: فَبَعَثَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ يَا زَيد»} (أخرجه البخاري: ٤٩٠٠، ٤٩٠١، ٤٩٠٢ ٣٩٠٣، ٤٩٠٤، ومسلم: ٢٧٧٢).**

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ، دەڵێ: من لە جەنگێکدا بووم، گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول بوو دەیگوت: خەرجیی ئەوانە مەکێشن کە لە لای پێغەمبەری خوان ﷺ (هاوکاریی ماددییان مەکەن) بەڵکو لە دەوری بپڕژێن، ئەگەر بۆ مەدینەش گەڕاینەوە، دەبێ کەسێک کە باڵادەستترە، (مەبەستی خۆیی و هاوەڵەکانی بووە) کەسێک کە بێ دەسەڵات و زەبوونە دەری بکات لە مەدینە (واتە: دەبێ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی و هاوەڵەکانی لە دەغەڵ و دڵنەخۆشەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵەکانی دەربکەن) منیش ئەوەم بۆ مامم یان بۆ عومەری کوڕی خەتتابم گێڕایەوە، ئەویش بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ باسکرد، پێغەمبەریش ﷺ بانگی کردم، منیش بۆم باسکرد، ئەویش (پێغەمبەری خوا ﷺ )بە دوای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هاوەڵەکانیدا نارد، ئەوانیش سوێندیان خوارد: شتی وایان نەگوتوە، پێغەمبەری خواش ﷺ منی بە درۆ داناو ئەوانیشی بەڕاست دانا، (وایزانی ڕاست دەکەن)، منیش خەمێکم تووش بوو هەرگیز خەمی وام تووش نەبوو بوو، لە ماڵێ دانیشتم، مامم گوتی: هەر ئەوەندەت ویست کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە درۆی دانای و ڕقیشی لێ هەڵسای! ئیدی خوای بەرز ئەم سوورەتەی دابەزاند، پێغەمبەری خواش ﷺ بەدوایدا ناردم و سوورەتەکەی بۆ خوێندمەوەو، فەرمووی: ئەی زەید! خوا تۆی بەڕاست دانا (پشتگیریی قسەکەی تۆی کردو تۆ ڕاستت گوتوە).

**دووەم: {عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ رضي الله عنه، قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ مَعَنَا أُنَاسٌ مِنَ الْأَعْرَابِ فَكُنَّا نَبْدُرُ الْمَاءَ، وَكَانَ الْأَعْرَابُ يَسْبِقُونَا إِلَيْهِ فَيَسْبِقُ الْأَعْرَابِيُّ أَصْحَابَهُ فَيَمْلَأُ الْحَوْضَ وَيَجْعَلُ حَوْلَهُ حِجَارَةً، وَيَجْعَلُ النِّطْعَ عَلَيْهِ حَتَّى تجيء أَصْحَابُهُ. قَالَ: فَأَتَى رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ أَعْرَابِيًّا، فَأَرْخَى زِمَامَ نَاقَتِهِ لِتَشْرَبَ، فَأَبَى أَنْ يَدَعَهُ، فَانْتَزَعَ حَجَرًا، فَبَاضَ الْمَاءِ، فَرَفَعَ الْأَعْرَابِيُّ**

خَشَبَةً فَضَرَبَ بِهَا رَأْسَ الْأَنْصَارِيِّ فَشَجَّهُ، فَأَتَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ رَأْسَ الْمُنَافِقِينَ، فَأَخْبَرَهُ «وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِهِ» فَغَضِبَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ثُمَّ قَالَ: لَا تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ «يَعْنِي الْأَعْرَابَ» وَكَانُوا يَحْضُرُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ الطَّعَامِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: إِذَا انْفَضُّوا مِنْ عِنْدِ مُحَمَّدٍ فَأْتُوا مُحَمَّدًا بِالطَّعَامِ، فَلْيَأْكُلْ هُوَ وَمَنْ عِنْدَهُ. ثُمَّ قَالَ لِأَصْحَابِهِ: لَئِنْ رَجَعْتُمْ إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ. قَالَ زَيْدٌ: وَأَنَا رِدْفُ عَمِّي فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ فَأَخْبَرْتُ عَمِّي، فَانْطَلَقَ فَأَخْبَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَحَلَفَ وَجَحَدَ. قَالَ: فَصَدَّقَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَذَّبَنِي. قَالَ: فَجَاءَ عَمِّي إِلَيَّ فَقَالَ: مَا أَرَدْتَ إِلَى أَنْ مَقَتَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَذَّبَكَ والمسلمون، قَالَ: فَوَقَعَ عَلَيَّ مِنْ جُرْأَتِهِمْ مَا لَمْ يَقَعْ عَلَى أَحَدٍ، قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا أَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ قَدْ خَفَقْتُ بِرَأْسِي مِنَ الْهَمِّ، إِذْ أَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَعَرَكَ أُذُنِي وَضَحِكَ فِي وَجْهِي، فَمَا كَانَ يَسُرُّنِي أَنَّ لِي بِهَا الْخُلْدَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ إِنَّ أَبَا بَكْرٍ لَحِقَنِي فَقَالَ: مَا قَالَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قُلْتُ: مَا قَالَ شَيْئًا إِلَّا أَنَّهُ عَرَكَ أُذُنِي وَضَحِكَ فِي وَجْهِي، فَقَالَ أَبْشِرْ! ثُمَّ لَحِقَنِي عُمَرُ، فَقُلْتُ لَهُ مِثْلَ قَوْلِي لِأَبِي بَكْرٍ، فَلَمَّا أَصْبَحْنَا قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُورَةَ الْمُنَافِقِينَ}، (قال مؤلِّفا: الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص ٤١٣ و ٤١٤ و ٤١٥، قلنا: وهذا سندٌ حسن، قال الترمذي: هذا حسنٌ صحيح، وصححه الحاكم ووافقه الذهبي، وذكره السيوطي في الدر المنثور: ج٨ ص١٧١، وأخرجه الطحاوي في مشكل الآثار رقم ٥٨٨٣، والطبراني: في المعجم الكبير ص ٥٠٧٣، أخرجه البخاري: في صحيحه مُعَلَّقاً بعد الحديث ٤٩٠٢، وَوَصَلَهُ النَّسائي في تفسيره: ٦١٤، قلنا: وسنده صحيح على شرط الشَّيخين).

ئەم ڕیوایەتە ڕوونترەو مەبەست باشتر ڕوون دەکاتەوە، زەیدی کوڕی ئەرقەم خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ چووین بۆ جەنگ، کۆمەڵێك لە خەڵکی عەرەبی خێڵەکییمان لەگەڵدا بوون، ئنجا ئێمە کە ئاوێکمان لێ هەڵدەکەوت، دەمانویست خێرایی بکەین و بچینە سەر ئاوەکە، بەڵام عەرەبە خێڵەکییەکان خێراتر دەڕۆیشتن و دەچوونە سەر ئاوەکە.

جارێك عەرەبێکی خێڵەکیی پێش هاوەڵەکانی کەوت، حەوزەکەی پڕکردو بەردی لە دەوری دانان و چەرمێکیشی لە سەر ڕاخست، (یانی: ئەوە عایدی

ئێمەیە) هەتا هاوەڵەکانی دێن، پیاوێك لە پشتیوانەکان هات، ئەویش هەر ئەعرابیی بوو، (خێڵەکیی و بیابانشین بوو)، جڵەوی حوشترەکەی شل کرد تاکو حوشترەکەی ئاو بخواتەوە، ئەو عەڕەبە خێڵەکییەی پێشێ، کە حەوزەکەی قۆرخ کرد بوو، لێنەگەڕا بخواتەوە، بەڵام خاوەن حوشترەکە ئەو بەردەی نەیدەهێشت ئاوەکە بڕێ {(**قبّاض الماء**) واتە: گیرەی ئاوەکەی کە نەیدەهێشت بڕێ}، بەردەکەی لادا، عەڕەبە خێڵەکییەکەش (وەك بەرگریی کردن لە ئاوەکە، کە دەستکاریی نەکرێ) دارێکی بەرز کردەوەو لەسەری پشتیوانییەکەی داو سەری شکاند، ئەویش چوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، سەرۆکی موونافیقەکان و هەواڵی پێدا (ئەو کەسەی سەری شکابوو لە هاوەڵەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بوو) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیش تووڕە بوو گوتی: ئەوانەی لە دەوری پێغەمبەری خوان، خەرجییان مەکێشن و هاوکارییان مەکەن، بەڵکو لە دەوری بپڕژێن واتە: عەڕەبە خێڵەکییەکان، کە دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و خواردنێك هەبووایە، ئەوانیش لێیان دەخوارد، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی گوتی: هەرکات ئەوان لە دەوری موحەممەد ﷺ پرژان، ئنجا خوارد بۆ موحەممەد ﷺ بەرن، با خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدان، بیخۆن. دوایی بە هاوەڵەکانی گوت: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە، دەبێ کەسێک کە باڵادەسترە، کەسێک کە زەبوونترو بێ دەسەڵاترە، دەری بکات (واتە: خۆی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربکات) زەید دەڵێ: منیش هەمیشە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم، لێی نزیك بووم، کە ئەوەم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بیست، هەواڵم دا بە مامم، مامیشم چوو هەواڵیدا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش بە دوای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوولی دا نارد، ئەویش سوێندی خواردو نکووڵییکرد شتی وای گوتبێ، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوی بەڕاست داناو منی بە درۆ دانا، مامم هات بۆ لام و گوتی: هەر ئەوەندەت مەبەست بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕقی لێت هەڵبستێ و بە درۆت دابنێ و مسوڵمانانیش! منیش خەمێکم هاتە سەر، هەرگیز خەمی وا نەچۆتە دڵی کەس.

ئنجا لە كاتێكدا لە جەنگەكەدا لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتین، لە خەمان سەرم لارە لارەی بوو (یان تۆزێ خەوتم، لە شوێنێك)، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام، گوێی گرتم و گوشی و لە ڕوومدا پێكەنی، ئنجا كە ئەوەم بینی، پێم خۆشتر بووە لەوەی لە دنیادا بە هەمیشەیی بمێنمەوە، دوایی ئەبووبەكر پێم گەیشت گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێ گوتی؟ گوتم: هیچی نەفەرموو، بەڵام گوێی بادام و لە ڕوومدا پێكەنی، ئەبوو بەكر گوتی: كەواتە دڵخۆشبە، ئنجا عومەر پێم گەیشت (خوا لە ئەبوو بەكرو عومەرو زەیدیش ڕازی بێ) هەمان شت كە بە ئەبووبەكرم گوتبوو، بە ویشم گوت، كاتێك كە ڕۆژمان كردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سووڕەتی (**المنافقين**)ی خوێندەوە.

## کورتە باسێک: پوختەیەکی جەنگی (بنو المصطلق)

پێم باشە کورتەیەك لە جەنگی (**بنو المصطلق**) باس بکەین، کە لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشەمی کۆچییدا بووە، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی کتێبەکەی ئیبنو هیشام (**السیرة النبویة**)دا[1]، ئێمە لە نۆ بڕگەدا ئەوەی (ئیبنو هیشام) گوتوویەتی پوخت و کورتی دەکەینەوە:

**بڕگەی یەکەم:** (**قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ بَعْضَ جُمَادَى الْآخِرَةِ وَرَجَبًا، ثُمَّ غَزَا بَنِي الْمُصْطَلِقِ مِنْ خُزَاعَةَ، فِي شَعْبَانَ سَنَةَ سِتٍّ، قَالَ ابْنُ هِشَامٍ: وَاسْتَعْمَلَ عَلَى الْمَدِينَةِ أَبَا ذَرٍّ الْغِفَارِيَّ، وَيُقَالُ: نُمَيْلَةَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ اللَّيْثِيَّ**).

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەشێك لە مانگی جومادی دووەم و مانگی ڕەجەبیش لە مەدینە مایەوە،{بە هیچ لایان دا نەچوو}، دوایی لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشەم دا، بەرەو (**بنو المصطَلق**) لە هۆزی خوزاعە چوو، {دیارە خوزاعە هۆزێکی گەورەبووەو، تیرەیەکیان هەبووە بەناوی (**بنو المُصْطَلِق**)، }ئیبنو هیشام گوتوویەتی: {پێغەمبەری خوا ﷺ دیارە کە دەچوو بۆ جەنگێك، بۆ سەفەرێك، کەسێکی لە شوێنی خۆی دادەنا،} ئەبوو زەڕری غیفاریی لە شوێنی خۆی داناو، گوتراویشە: نومەیلەی کوڕی عەبدوڵڵای لەیسی داناوە {واتە: دوو ڕا هەن لەو بارەوە}.

**بڕگەی دووەم:** ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: عاسیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبووبەکرو، موحەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی حیببان، هەرسێکیان قسەیان بۆ کردووم لە بارەی (**بنو المصطَلِق**)ەوە، گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێگەیشت، کە (**بنو المصطَلِق**) هێزی بۆ کۆ

---

(١) ج٣، ص ١٤٩ -١٥٢،

دەكەنـەوە، كـە بەسـەر مەدینـە دابـدەن، فەرماندەكەشیان **(الحـارث بـن أبي ضرار )** بابـی **(جویریـة بنـت الحـارث)**، كـە دوایـی دەبێتـە هاوسـەری پێغەمبـەری خـوا ﷺ، كاتـێ پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەبیسـتێ ئـەوان بـە تەمـان بەسـەر مەدینـە دابـدەن، دیـارە چـاوەڕێ نـاكات، ئـەوان بێـن و بۆیـان دەچـێ، لەسـەر ئاوێـك پێیـان دەگات كـە پێـی دەگوتـرێ: **(المریسـیع)**، لـە لای كەنـاری دەریـای سـوور، ئیـدی لـەوێ تێـك دەگیرێـن و جەنـگ دروسـت دەبـێ و، خـوا ﷻ **(بنـو المصطَلـق)** دەشـكێنێ و، خەڵكێكیـان لـێ دەكـوژرێ، پێغەمبەریـش ﷺ ژن و منـداڵ و مـاڵ و سـامان و ئەوانـەی لێیـان بەجـێ دەمێنـێ، لێیـان دەگـرێ وەك دەسـتكەوتی جەنگیـی.

**برگـەی سـێیەم:** ئنجـا لـە كاتێكـدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەسـەر ئـاوی **(المریسـیع)** بـووە، ئـاو هێنـەران دەنێـرن كـە ئاویـان بـۆ بهێنـن، عومـەری كـوڕی خەتتابیـش كەسـێكی لەگـەڵ دەبـێ لـە **(بنـي غِفـار)** بـە كرێـی گرتـوە، كـە خزمەتـی بـكات و ئـاو بێنـێ و كاروبـاری بـۆ بـكات، نـاوی **(جهجـاه بـن مسـعود)** بـووە، ئەسپەكەشـی بـۆ خزمەتكـردوە، جەهجـا كـە كرێـكاری عومـەرە خـوا لێـی ڕازی بـێ، لەگـەڵ **(سِـنَان بن وبهـر الجُهَنـي، حلیـف بـن عـوف بـن الخـزرج)**دا كـە هاوپەیمانـی **(بنـي عـوف)** بـووە لـە خەزرەجییـەكان، لەسـەر ئاوەكـە دەبێتـە كێشـەیان و بەشـەڕ دێـن، جوهەنییەكـە هـاوار دەكات: ئـەی كۆمەڵـی پشـتیوانان! جەهجاهیـش هـاوار دەكات: ئـەی كۆمەڵی كۆچكـەران! عەبدوڵـڵای كـوڕی ئوبەیـی كـوڕی سـەلوولیش تـووڕە دەبـێ، دەسـتەیەك لـە خەڵكەكـەی خـۆی لـەلا دەبـن، كـە لـە نێویانـدا زەیـدی كـوڕی ئەرقەمیـش دەبـێ، گەنجێكـی تـازە پێگەیشـتووبووە، {عەبدوڵـڵا بیـری ئـەوەی نەكـردوە كـە زەیـد پێغەمبـەری خـوای ﷺ زۆر خۆشـدەوێ و ڕەنگـە ئـەو قسـانەی بـۆ بگێڕێتـەوە}.

عەبدوڵـڵای كـوڕی ئوبەیـی دەڵـێ: **(أَوَقَـدْ فَعَلُوهَـا؟ قَـدْ نَافَرُونَـا وَكَاثَرُونَـا فِي بِلَادِنَـا، وَاللَّـهِ مَـا أَعُدُّنَـا وَجَلَابِيبَ قُرَيْـشٍ هَـذِهِ، إِلَّا كَمَا قَـالَ الْقَائِـلُ: سَـمِّنْ كَلْبَـكَ يَأْكُلْـكَ. أَمَا وَاللَّـهِ لَـئِنْ رَجَعْنَـا إِلَى الْمَدِينَـةِ لَيُخْرِجَـنَّ الْأَعَـزُّ مِنْهَـا الْأَذَلَّ)**.

واتــە: ئــەوە کردیــان! لــە وڵاتــی خۆمانــدا دژایەتییــمان دەکــەن و، لــە وڵاتــی خۆمــان دا خۆیانمــان بەســەردا دەســەپێنن، بەخــوا مــن و خۆمــان و ئــەو نێردراوانــەی هــۆزی قورەیــش، {(جلابیــب) واتــە: ئەوانــەی هێــنراون لــە قورەیــش، مەبەســتی پێغەمبــەری خــوا ﷺ و هاوەڵانــی کۆچکــەری بــووە، خۆمــان و ئەوانــم} وا دێتــە بەرچــاو، وەك کاتــی خــۆی پێشــینان گوتوویانــە: (سَمِّنْ كَلْبَكَ يَأْكُلْكَ)، ســەگەکەت قەڵــەو بکــە، خــۆت دەخــوات، (حاشــای پێغەمبــەر ﷺ و هاوەڵانــی)، بــە خــوا کــە گەڕاینــەوە مەدینــە، دەبــێ ئــەوەی بــاڵا دەســترە، ئــەوەی زەبوونــە دەری بــکات، {مەبەســتی ئەوەبــووە خــۆی بــاڵا دەســتەو پێغەمبــەری خــواو هــاوەڵانی زەبــوون بــێ دەســەڵاتن!}.

**برگــەی چــوارەم:** دوایــی عەبدوڵــڵای کــوڕی ئوبەیــی ڕوو لــەو خەڵکــە دەکات، کــە لــە دەوریەتــی و پێیــان دەڵــێ: ئــەوە خۆتــان بەخۆتانتــان کــرد، ئەوانەتــان هێنــاو وڵاتــی خۆتــان و مــاڵ و سامانی خۆتــان لەگــەڵ دا بــەش کــردن، بــە خــوا ئەگــەر ئێــوە دەســتتان گرتبایــەوە و هاوکارییتــان نەکردبــان، دەچوونــە وڵاتێکــی دیکــەو شــارێکی دیکــە، زەیــدی کــوڕی ئەڕقــەم خــوا لێــی ڕازی بــێ کــە گوێــی لــەو قســانە دەبــێ، ئــەو قســانە دەبــا بــۆ لای پێغەمبــەری خــوا ﷺ، لــە کاتێکــدا کــە لــە جەنــگ لــە دژی دوژمنەکــەی تــەواو بــووە، هەواڵەکــەی پێــدەدا، عومــەری کــوڕی خەتتابیــش خــوا لێــی ڕازی بــێ، لــەوێ دەبــێ و دەڵــێ: فەرمــان بــە عەببــادی کــوڕی بیــشر بکــە، بــا بیکــوژێ، یــانی: عەبدوڵــڵای کــوڕی ئوبەیــی، پێغەمبــەری خــواش ﷺ دەفەرمــوێ: {فَكَيْـفَ يَـا عُمَـرُ إِذَا تَحَـدَّثَ النَّـاسُ أَنَّ مُحَمَّـدًا يَقْتُـلُ أَصْحَابَـهُ، لاَ، وَلَكِـنْ أَذِّنْ بِالرَّحِيـلِ} **(أخرجـه البخـاري: ٤٦٢٤،٤٦٢٢، مسـلم: ٢٥٨٤)**، چــۆن ئــەی عومــەر! دوایــی خەڵــك قســە دەکــەن و دەڵێــن: موحەممــەد هاوەڵانــی خــۆی دەکــوژێ، بــەڵام جــاڕ بــدە بــا بڕۆیــن، لــە کاتێکــدا کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ عادەتــی وا نەبــووە، لــەو کاتــەدا، بــڕوات.

(پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە لەو کاتەدا دەڕوا[1]، تاکو خەڵکەکە سەرقاڵ بێ و نەیانپەرژێتە سەر مقۆ مقۆو قسەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، کێشە و ئاشووب و ئاژاوەیەك لە نێوخۆدا پەیدا نەبێ).

**برگەی پێنجەم:** عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، کاتێك پێی دەگاتەوە کە زەیدی کوڕی ئەرقەم ئەو هەواڵەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیاندوەو، لە عەبدوڵڵای بیستوە، دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سوێند بە خوا دەخوات، کە شتی وای نەگوتوە، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی لە نێو خەڵکەکەی خۆیدا شەریف و مەزن بووە، ڕێز لێگیراو بووە، ئەوانەی لە خزمەت پێغەمبەردا دەبن، لە پشتیوانان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، یان لە هاوەڵانی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو منداڵە، هەرزەکارە لێی تێکچوە، یان ئەوەی گوتوویەتی هەمووی لەبەر نەکردوەو نەیپاراستوە، ئەوەش هەمووی وەك سۆز نواندن لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، یان وەك بەرگریی لێکردنی.

**برگەی شەشەم:** ئنجا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕوات، ئوسەیدی کوڕی حوزەیری پێدەگات، سڵاو لە پێغەمبەر دەکات بە سڵاولێکردنی پێغەمبەرایەتیی سەلامی لێ دەکات: (**السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا نَبِيَّ الله**)، دوایی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! بەڕاستیی لە کاتێکی نەگونجاودا ڕۆیشتین و سوپایەکەت بەڕێکرد، هەرگیز لە کاتی وادا نەڕۆیشتووین؟! پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (**«أَوْ مَا بَلَغَكَ مَا قَالَ صَاحِبُكُمْ؟» قَالَ: فَأَيُّ صَاحِبٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ»، قَالَ: وَمَا قَالَ؟ قَالَ: «زَعَمَ أَنَّهُ إِنْ رَجَعَ إِلَى الْمَدِينَةِ أَخْرَجَ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ». قَالَ أُسَيْدٌ: فَأَنْتَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُخْرِجُهُ إِنْ شِئْتَ، هُوَ وَاللَّهِ الذَّلِيلُ وَأَنْتَ الْعَزِيزُ؛ ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ارْفُقْ بِهِ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ جَاءَ اللَّهُ بِكَ وَإِنَّ قَوْمَهُ لَيَنْظِمُونَ لَهُ الْخَرَزَ لِيُتَوِّجُوهُ، فَإِنَّهُ لَيَرَى أَنَّكَ قَدِ اسْتَلَبْتَهُ مُلْكًا) (أخرجه الطبري: ج٢، ص١٠٩، وابن**

---

(١) ئەوە قسەی خۆمە.

کثیر في البدایة و النهایة ج٣ ص ١٩٩، وإبن سید الناس في عیون الأثر ج٢، ص١٣٤)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئوسەیدی کوڕی حوزەیر رضي الله عنه دەفەرموێ: پێت نەگەیشتوە، هاوەڵەکەتان چی گوتوە؟ ئەویش دەڵێ: کام هاوەڵ؟ دەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، (واتە: هاوەڵتان لەو ڕووەوە کە پشتیوانی مەدینەییە) دەڵێ: چی گوتوە؟ دەفەرموێ: پێی وایە کاتێ گەڕایەوە بۆ مەدینە، ئەوەی باڵا دەستترە ئەوەی بێ دەسەڵاتە، دەری دەکات، ئەویش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! بەخوا تۆ باڵا دەستی و ئەو زەبوونە، ئەگەر کەیفت لێ بێ تۆ ئەو دەردەکەی، دوایی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! لەگەڵی نەرم بە، سوێند بەخوا، خوا تۆی بۆ لای ئێمە هێنا (وەك پێغەمبەری خوا ﷺ) خەڵکەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، بەردی بەنرخیان بۆ دەچنین وەك تاج کە بیکەنە حوکمڕان و پادشاو، ئێستا ئەو پێی وایە پادشاتییەکەی بە هۆی تۆوە لێ تێکچوە.

**بڕگەی حەوتەم:** ئیبنو هیشام لە ژێر ناوونیشانی: (**سیر الرسول بالناس لیشغلهم عن الفتنة**)، (ڕۆیاندنی پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکەکە، تاکو سەرقاڵیان بکات لەوەی تووشی فیتنەو کێشەی نێوخۆ ببن) دا دەڵێ:

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە هەمووی ڕۆیشت، واتە: خەڵکەکەی هەر ڕۆیاند تاکو ئێوارە، هەروەها شەوەکەشی و فەرمووی: ڕامەوەستن تاکو بەیانی و، بەشێك لە ڕۆژەکەش، هەتا خۆر ئازاری دان، ئنجا بە خەڵکی فەرموو دابەزن بۆ پشوودان، ئیدی خەڵکەکە هەر هێندەیان پێچوو، کەلەکەیان کەوتە عەرزێ، یەکسەر خەوتن.

وەك پێشتریش گوتمان: (پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە وایکرد، تاکو خەڵك سەرقاڵ بکات لە قسەو باسی کە دوێنێ بووە، قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و، فیتنەو ئاشووبێك لە نێودا نەبێ).

**بڕگەی هەشتەم:** ئنجا ئەو سوورەتەی باسی مونافیقەکانی تێدایە، لە بارەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و، ئەوانەی لەسەر ڕای وی بوون، لەو بارەوە دابەزی، کاتێك ئەو سوورەتە دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی زەیدی کوڕی ئەرقەمی گرت، (چونکە گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بووە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی پیاوێکی گەورە ناگرێ، بەڵام گەنج بە شێوەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ) فەرمووی: (**هَـذَا الَّـذِي أَوْفَى اللَّـهَ بِأُذُنِـهِ**)، ئەمە کەسێك بوو کە بۆ خوا وەفادار بوو بە گوێیەکەی، (واتە: گوێیەکەی بەوەفا بوو لەگەڵ خوای پەروەردگارو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ) دوایی هەواڵی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، بە کوڕەکەی گەیشت کە کوڕەکەشی ناوی عەبدوڵڵا بوو[1].

**بڕگەی نۆیەم و کۆتایی:** ئیبنو هیشام لە ژێر ناوونیشانی (**طلب ابن عبد الله بن أُبَيّ أن يتولَّى قتل أبيه وعفو الرسول ﷺ**)، واتە: داواکردنی کوڕەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، کە خۆی بابی بکوژێ، بەڵام لێبوردنی پێغەمبەر ﷺ لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول.

ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە بۆی باسکردم، کە عەبدوڵڵا (واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، کوڕەکەی بە ناوی خۆی کردۆتەوە) هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! هەواڵم پێگەیشتوە، کە بە تەمای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول بکوژی، بەهۆی ئەوەوە کە لە بارەی ئەوەوە پێت گەیشتوە، ئنجا ئەگەر هەر بەتەمای بیکوژی، فەرمانم پێبکە سەرەکەیت بۆ دێنم، بە خوا هۆزی خەزرەج دەزانن، کە هیچ کەس لە من چاکەکارتر نەبووە لەگەڵ بابیدا، بۆیە دەترسێم ئەگەر تۆ جگە لەمن فەرمان پێبکەی و بابم بکوژێ، نەفسم ڕێم نەدا تەماشای بکوژی بابم (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول) بکەم، بڕوا لە نێو خەڵکی و بیکوژم، سەرەنجام من ئیماندارێك بە کافرێك بکوژم و بچمە نێو ئاگر.

---

(١) بڕوانە: تأريخ الأمم والملوك للطبري ج٢ ص١١٠، وعيون الأثر لابن سيد الناس، ج٢، ص ١٣٤.

{فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَلْ نَرْفُقُ بِهِ وَنُحْسِنُ صُحْبَتَهُ مَا بَقِيَ مَعَنَا»} بەڵكو لەگەڵی نەرم دەبین و هاوەڵایەتیی باشی دەكەین تاكو لەگەڵمان دا مابێ.

ئنجا دوای ئەوە كاتێك عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەیی، قسەی بۆ خەڵكەكەی كردبایە، سەركۆنەیان دەكردو دەیانگرت و قسەی توندیان لەگەڵدا دەكردو، ئەگەر باسی ئیسلامی كردبایەو ئامۆژگاریی كردبایە، دەیانگوت: بێدەنگ بە، تۆ نەبووی فڵان شتەو فڵان شتەت گوت و، ئەم ئایەتانەش لە بارەی تۆوە دابەزین! دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری كوڕی خەتتابی ﷺ فەرمووی: كاتێك پێیگەیشتەوە كە خەڵكی عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەیی كوڕی سەلوول ئێستا ئاوا لەگەڵی توند بوون، پێی فەرمووی: («كَيْفَ تَرَى يَا عُمَرُ؛ أَمَا وَاللَّهِ لَوْ قَتَلْتُهُ يَوْمَ أَمَرْتَنِي بِقَتْلِهِ، لَأَرْعَدَتْ لَهُ أَنُوفٌ، لَوْ أَمَرْتُهَا الْيَوْمَ بِقَتْلِهِ لَقَتَلَتْهُ»؛ قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ وَاللَّهِ عَلِمْتُ لَأَمْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَعْظَمُ بَرَكَةً مِنْ أَمْرِي)[1].

ئەی عومەر! ئێستا دەبینی، بە خوا ئەو كاتەی پێت گوتم بیكوژە، ئەگەر كوشتبامایە هەندێك لووت بۆی گرژ دەبوون و هەڕەشەیان دەكرد، ئەگەر ئەمڕۆ فەرمان بكەم بەو خاوەن لووتانە (بەو كەسانە) ئامادەن بیكوژن (بەڵام ئەو كاتەی نەیانناسیوە لەسەری تووڕە دەبوون) عومەریش خوا لێی ڕازی بێ گوتی: بە خوا كاری پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەكەتی زیاترەو مەزنترە، لە كاری من و بۆچوونی من.

ئەمە كورتەیەك بوو لە جەنگی (بني المُصْطَلِق)، كە وەك گوتم لەو جەنگەدا ئەم سووڕەتی (المنافقون) دابەزیوە، بەبۆنەی ئەو هەڵوێستەی عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەیی كوڕی سەلوولەوە.

---

(١) أخرجه: (ابن كثير في البداية والنهاية: ج٤ ص١٥٨، وفي السيرة: ج٣، ص٢٩٩، وابن سيد الناس في عيون الأثر: ج٢ ص١٣٤).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، مەبەستیشی لێی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای باڵادەست دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

لە کاتی گوتنی (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)دا وەك هەمیشە گوتوومانە، پێویستە بەلای کەمەوە ئەو چوار واتاو مەبەستە، لە عەقڵ و دڵدا چەسپاو بن.

ئنجا خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ﴾، کاتێك مونافیقەکان هاتنە لات، گوتیان: ئێمە شایەدیی دەدەین، کە بە دڵنیایی تۆ ڕەوانە کراو و نێردراوی خوای، ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ﴾، خواش دەزانێ تۆ نێردراوی وی، ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾، بەڵام خوا ﷻ شایەدیی دەدات کە بە دڵنیایی مونافیقەکان درۆزنن، لەوەدا کە دەڵێن: شایەدیی دەدەین تۆ نێردراوی خوای، واتە: لەو قسەیاندا کە دەیڵێن، ڕاست ناکەن و شایەدیی نادەن، بۆیەش خوا ﷻ بەرلەوەی شایەدیی دانی خۆی لەسەر درۆزن بوونی مونافیقەکان بخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ﴾، خواش دەزانێ تۆ نێردراوی وی، بۆ ئەوەی وا وەرنەگیرێ کە مونافیقەکان دەڵێن: تۆ نێردراوی خوای، قسەکەیان درۆیە، نەخێر، قسەکەیان: کە موحەممەد ﷺ نێردراوی خوایە، ڕاستە، بەڵام

موونافیقـەکان لـە گوتنـی قسـەکەدا ڕاسـت ناکەن، واتـە لە دڵیانـدا ئەو شـایەدییدانەو، ئـەو بـڕوا هەبـوون و متمانەبوونـە وەک پێغەمبـەری خـوا، بـە موحەممـەد ﷺ نیـە، کـە بـە نێـردراوی خـواو ڕەوانەکـراوی خـوای بزانـن.

﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، سـوێندەکانی خۆیـان کردوونـە سـوپەرو قەڵغـان، کردوونـە پۆشـەرێك، (**جُنَّـة**) بـە مانـای پۆشـەر دێ، ئنجـا مەبەسـت پێـی:

**أ-** هەر پۆششێکە کە بەسەریانەوەیەو وەك دەمامکێك خۆیان پێ پەنهان کردوە، بە هۆی ئەو سوێندە درۆیانەوە.

**ب-** یاخود وەك چۆن سوپەرو قەڵغانێك کەسێك لەجەنگدا بەکاری دێنێ، بۆ ئەوەی خۆی پێ بپارێزێ، مەبەست پێی ئەوەیە، هەردوو واتایەکە دەگرێتەوە، چونکە لە ئەسڵدا (**جَنَّهُ**) واتە: (**سَتَرَهُ**)، (**جَنَّهُ اللَّيْل**) واتە: شەوگار داپیۆشی، (**جِنّ**)یش بۆیە پێیان دەگوترێ (**جن**)، چونکە پۆشراون، کۆرپەلە (**جنين**)یش لەبەرئەوەی پۆشراوە، (**مَجْنُون**)یش لەبەرئەوەی عەقڵەکەی پۆشراوە، (**جَنَّة**)ش باخێکە کە دارو درەختەکانی چڕو پڕ بن و ژێرەکەی دابپۆشن و هەر شتێکی تێدابێ دایپۆشن، خوا دەفەرموێ: سوێندەکانی خۆیان کردوونە قەڵغان و سوپەر، یاخود کردوونەدا پۆشەر.

﴿فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئنجـا لـە ئاکامـی ئـەوەدا کـە ئـەو سـوێندە بـە درۆیانـە دەخـۆن، خەڵـك لـە ڕێـی خـوا لادەدەن، ئەمـە ئەگـەر (**فَصـدّوا**) لـە (**صَـدّ**)ەوە بـێ، (**صَـدَّ يَصُـدُّ صَـدّاً أي: صَرَفَ يـصرِفُ صَرْفـاً**)، بـەڵام ئەگـەر لـە (**صـدود**)ەوە بـێ، (**صـدَّ يَصُـدُّ صَـدوداً**)، واتـە: خۆیـان لـە ڕێـی خـوا لا دەدەن، لێـرەدا هـەردوو واتایەکـەش هەڵدەگـرێ، واتـە: لـە ڕێـی خـوا لایانـدا، یاخـود خەڵکیـان لـە ڕێـی خـوا لادا، واتـە: (**صَـدَّ**) دەگونجـێ (**لازِم**) بـێ و بـەرکار نەخـوازێ، واتـە: لایانـدا، دەشـگونجێ بـەرکار بخـوازێ و (**مُتعـدِّي**) بـێ، تێپەڕێنـەر بـێ بـۆ بـەرکار، ئـەو کاتـە واتـە: خەڵکیـان لـە ڕێـی خـوا لادا.

﴿إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾، بە دڵنیایی ئەوان ئەوە خراپترین شتە دەیکەن، (ساء) وەك (بئس) وایەو کرداری بە خراپدانان (فعل الذم)ە، واتە: ئەوە خراپترین شتە دەیکەن، کە سوێندی بە درۆ دەخۆن، دێن بە ڕواڵەت خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن و، لە ڕاستیشدا وا نین.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾، بۆچی خراپترین کردەوە ئەنجام دەدەن؟ ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە بڕوایان هێنا، دوایی بێبڕوا بوون، ﴿فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾، ئنجا مۆر بەسەر دڵەکانیانەوە نرا، ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾، سەرەنجام ئەوان تێناگەن.

ئایا لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە بەڕاستیی ئیمانیان هێناوەو، دوایی هەڵگەڕاونەوە، یان مەبەست ئەوەیە کە بە ڕواڵەت گوتوویانە: ئیمانمان هێناوەو لە حەقیقەتیشدا بێبڕوابوون؟ هەردوو واتایەکە هەڵدەگرێ، دواییش باسی دەکەین کە مونافیق و دەغەڵەکان جۆراوجۆر بوون:

أ- ڕەنگە هەیانبووبێ، بە کردەوەو بەڕاستیی بڕواشی هێنابێ، بەڵام دوایی لەبەر لۆمەو لەقەمی دۆست و ڕەفیق و برادەران: چۆن بڕوا دێنی، چۆن واز لە بتپەرستیی دێنی، یان چۆن واز لە ئایینی پێشووت دێنی؟ هەڵگەڕابێتەوە.

ب- دەشگونجێ هەر بۆ ڕوو پامایی بۆ هەڵخەڵەتاندنی مسوڵمانان، وایانکردبێ.

ج- دەشگونجێ کەسێك بە ڕاستیی بڕوای هێنابێ، بەڵام بڕوایەکی لەرزۆك و خۆی ڕانەگرتبێ لە ئاقار ئەو پێشهاتانەدا کە دێنە پێشی، یاخود بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی، گەڕابێتەوە سەر ئایین و بەرنامەی پێشێی، هەموو واتایەکان هەڵدەگرێ.

﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ﴾، کاتێك تۆ بیانبینی، جەستەکانیان تۆ سەرسام دەکەن، واتە: کەلەش و جەستەیەکی سەرنج ڕاکێشیان هەیە، دوایی باس دەکەین کە هەر کام لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و، هەندێکی دیکەش، دوو سێیەك کە ناویان هێنراوە، دەڵێن: خاوەن قەدو قیافەیەکی جوان

و بەرچاو بوون، خاوەن کەلەش بوون، خەڵکیش بە زۆری عەقڵی لە چاواندایە، هەروەها خاوەن قسەو زمانپاراویی و ڕەوانبێژییش بوون.

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡ﴾، کاتێك قسەش بکەن، گوێ بۆ قسەکەیان دەگری، هەڵبەتە لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ دەشگونجێ ڕوو لە هەر کەسێك بێ، کە بگونجێ بدوێنرێ (**لِكُلّ من يَصْلُح للخطاب**).

﴿كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞ﴾، وەك دارە هەڵپەسێردراوەکان وان، (**مُسَنَّدة**) لە ئەسڵدا (**مُسْنَدة**)یە، بەڵام گیرە (**شدّة**)ی خراوەتە سەر بۆ ئەوەی مانایەکەی بەهێزتر بکات، یان لەبەر زۆریی ئەو دەغەڵانەی نەرێت و حاڵەتیان وابووە.

ئنجا بۆچی خوا تەشبیهیان دەکات بە داری هەڵپەسێردراوەوە؟ واتە: بێ کەڵکن، ئەگەرنا دارێك هیچ کەڵکی هەبێ، یان دەکرێتە سووتەمەنیی، یان دەکرێتە دارو پەردوو بۆ خانوو، یان شتێکی لێ دروست دەکرێ، تەختەی لێ دروست دەکرێ و بۆ کەلوپەل بەکاردەهێنرێ، بەڵام ئەوانە وەك داری بە دیوارێك شوێنێك هەڵپەسێردراو وان و بێ کەڵکن.

﴿يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡ﴾، هەر دەنگێك لە دژی خۆیان تێدەگەن، هەر چریکەیەك هەر هاوارێك بێ، وا دەزانن لە دژی ئەوانە.

﴿هُمُ ٱلۡعَدُوُّ﴾ ئەوانە بەڕاستیی دوژمنن، دوژمنی بەڕاستیی کە ماناو چەمکی دوژمنی تەواوی بەسەردا بچەسپێ و پڕ بە پێستی بێ، ئەوانەن، چونکە لەڕاستییدا ئەوەی گورگ بێ و لە پێستی مەڕدا، زۆر ئاسانتر دەتوانێ زیانت لێ بدات، لەوکەسەی تۆ دەیبینی گورگەو بەرەو ڕووت دێ.

﴿فَٱحۡذَرۡهُمۡ﴾، بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: لێیان وریا بە، وریایان بە، (**الحَذَرُ: إحْتِرَازٌ مِنْ مُخِيفٍ**)، (حذر) بریتیە لە خۆ پاراستن لە شتێکی مەترسییلێکراو، واتە: وریاو هۆشیار بە.

﴿ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾، خـوا بیانكـوژێ، خـوا لەنێویـان بـەرێ، بـەرەو كـوێ لادەدرێـن! ئـەو ڕاسـتە ڕێیەیـان لەبـەر دەسـتە، ئـەو پێغەمبـەرە پایـە بـەرزە كـە سـەراپا نـوورو بەرەكەتـە، بـەو ڕەوشـتە بـەرزو جوانـەوە، بـەو هەمـوو دڵـە پـڕ بەزەیـی و جـۆش و خرۆشـەوە بـۆ هەمـوو لایـەك، ئـەو قورئانـە ئـەو هەمـوو نـوورو بەرەكەتـە لەبـەر دەسـتیانە، بۆچـی دوای ئـەو پێغەمبـەرە ناكـەون و ئـەو قورئانـە وەرناگـرن، لـە عەقـڵ و دڵـی خۆیانـدا بیچەسـپێنن، ئـەو ڕاسـتە ڕێیـە بـەرەو خـوا ناگرنـە بـەر، بـەرەو كـوێ لادەدرێـن؟ وەك ویسـتی خۆیانیـان لـە دەسـت دابـێ، وەك چـۆن وڵاخێـك ڕێشـمەی دەكەوێتـە دەسـتی كەسـێك و، بـەرەو ئـەو شـوێنە دەبـردرێ كـە وڵاخەكـە نایـەوێ، بەڵكـو ئـەو كەسـە دەیـەوێ، كـە ڕێشـمەكەی بەدەسـتە، ئەوانیـش ئاوایـان لێهاتـوە، شـەیتان ئـاوا بـەو شـێوەیە لای داون.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا۟ رُءُوسَهُمْ ﴾، ئەگـەر پێیـان بگوتـرێ: وەرن پێغەمبـەری خـوا ﷺ داوای لێبوردنتـان بـۆ دەكات، داوای لێبوردنتـان بـۆ لـە خـوا دەكات، ﴿ لَوَّوْا۟ رُءُوسَهُمْ ﴾ سـەرەكانیان بـادا، ئەگـەر فەرمووباشـی (**لـوَوا**) وەك ئـاواش خوێنراوەتـەوە، هەرگونجاوبـوو، بـەڵام ﴿ لَوَّوْا۟ ﴾، لێـرەدا گیـرەدار (**مُشَـدَّد**) كـراوە، بـۆ ئـەوەی مانایەكـەی بەهێزتـر بـێ، واتـە: سـەرەكانیان بـادەدەن، ملیـان بـادەدەن، ڕوو وەردەگێـڕن.

﴿ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴾، دەیانبینـی خـۆ بەزلگرانـە لادەدەن، لێـرەدا: ﴿ يَصُدُّونَ ﴾ بـە مانـای (**لازِم**)ی بەكارهاتـوە، بـە مانـای خـۆ لادان، نـەك بـە مانـای خەڵـك لادان، دەیانبینـی لادەدەن، لـە حاڵێكـدا ئـەوان خـۆ بەزلگـرن، خـۆ بـە زلگرانە ڕووو وەردەگێـڕن و لادەدەن.

﴿ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴾، یەكسـانە لەسـەریان، ئایـا داوای لێبوردنیـان بـۆ بكـەی، یـان داوای لێبوردنیـان بـۆ نەكـەی، هەرگیـز خـوا لێیـان نابـوورێ، واتـە: داوای لێبوردن كـردن و داوای لێبـوردن نەكردنی

تۆ بۆ ئەوان، یەكسانە، خوا بڕیاری داوە، لەبەر ئەوەی ناخێكی پیسیان هەیە، بە كەڵكی ئەوە نایەن و شایستەی ئەوە نین خوا لێیان ببووڕێ، بەڵێ تۆ وەك پێغەمبەری خوا ﷺ كە بە ڕەحمەت نێردراوی بۆ هەموو جیهانییان، بە ئەركی خۆت هەڵدەستی، بەڵام دواجار بڕیاری لێبوردن و لێ نەبوردن بەدەست خوایە، تۆ داوایەكەو دەیكەی، خواش ﷻ بەپێی زانیاریی بێ سنووری خۆی و حیكمەتی بێ سنووری خۆی، جاری وا هەیە داوای لێبوردنەكەت وەردەگرێ، جاری واشە وەریناگرێ، تۆش وەك ئەركی خۆت، وەك بۆ تۆ شایستەیەو لێت دەوەشێتەوە، مامەڵە دەكەی، بەڵام بڕیاری كۆتایی، بەپێی زانیاری بێ سنوورو حیكمەت و دادگەریی بێ سنووری خوا، لەلایەن خواوە دەدرێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا كۆمەڵی لاڕێ بووان لادەران، ڕاستە ڕێ ناكات، بە ئامانج ناگەیەنێ، هیدایەت لێرەدا بە مانای ڕێ پیشاندان نیە، خوا فاسیق و زاڵم و چاك و خراپ، هەموویانی ڕێنمایی كردوون، بەڵام لێرەدا: ﴿لَا يَهۡدِي﴾، یانی: نایانخاتە سەر ڕاستە ڕێ، لوتفیان لەگەڵ ناكات، مشووریان لێ ناخوات، بە ئامانجیان ناگەیەنێ، چونكە ڕێنمایی خوایان ڕەفز كردەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ١٧﴾، بەڵام گەلی (**ثمود**)مان ڕێنمایی كرد بوو، كەچی كوێرییان بەسەر ڕێنماییدا هەڵبژارد.

دەبێ وریا بین: زۆرێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان، لێرەدا بە هەڵەداچوو لە ئەنجامی ئەوەدا كە هیدایەت، بەپێی ئەو سیاقەی تێیدا هاتوە، دەبێ سەرنج بدرێ، ئایا بە مانا گشتییەكەیەتی كە بە مانای ڕێنماییە، یان بە مانای تایبەتییەكەیەتی كە بە مانای ڕاستە ڕێ كردن و بە ئامانج گەیاندنە، لەبەر ئەوەی جیاوازییان بەو دوو واتایە نەكردوە، بە زۆریی وا هەیە، لە مانا كردن لێرەو لە شوێنی دیكەش دا، تووشی هەڵە بوون و، كە ئەوە لە تەفسیرە كوردییەكاندا زیاتریشە.

﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ ﴾، ئـەوان کەسـانێکن دەڵێـن: ئەوانـەی باسـیان کـرا مونافیقـەکان، دەغەڵـەکان دەڵێـن، ﴿ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانـەی لـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوادان خەرجییـان مەکێشـن، هاوکارییـان مەکـەن و پارەیـان مەدەنـێ، ﴿ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ ﴾، تاکـو پـەرش و بـڵاو دەبـن و دەپرژێـن، یـان: تاکـو دەڕۆن و بـڵاوەی لـێ دەکـەن، ئنجـا خـواردن و هاوکاریـی بـۆ پێغەمبـەری خـوا بـەرن، ﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، عەنبـارەکانی ئاسـمانەکان و زەوییـش هـی خـوان، ﴿ وَلَـٰكِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴾، بـەڵام مونافیقـەکان تێناگـەن، وەك پێشـتریش گوتوومانـە: (**فقـه**) بریتیـە لـە ورد تێگەیشـتن، یاخـود تێگەیشـتن لـە مەبەسـتی قسـەبێژ، یاخـود ورد سـەرنجدان بـۆ ئـەوەی بەهـۆی شـتێکی ئاشـکراوە، شـتێکی پەنهانیـش دەرك بکـرێ.

ئـەم هەڵوێسـتەیان وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکـەی دا باسـمان کـرد: عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەیـی کـوڕی سـەلوول، دەیگـوت: بە مـاڵ و سـامانتان هاوکاریی ئەوانـە مەکـەن کـە لـە لای پێغەمبـەری خـوان، ئنجـا بۆچـی گوتوویەتـی: (**رسـولِ اللـه**)، کـە بـە نێـردراوی خواشـی نەزانیـوە؟ لەبـەر دەوروبەرەکـەی کـە خەڵکێکـی مسـوڵمان هەبـوون، پێـی خەڵەتـاون، گوتوویەتـی: ئەگـەر بڵێـم: موحەممـەد و نەڵێـم پێغەمبـەری خـوا ﷺ، دەڵێـن دیـارە دان بـە پێغەمبەرایەتیـی موحەممـەدا ﷺ نانـێ، بۆیـە گوتوویەتـی: ئەوانـەی لـە لای پێغەمبـەری خـوان، هاوکارییـان مەکـەن و خەرجییـان مەکێشـن.

ئەو قسەیەش بەگشتیی سێ ڕووی هەن:

**أ**- هاوکاریی پێغـەمبەری خـوا مەکەن تاکو دەوری چـۆڵ بێ و کەسی بەدەورەوە نەمێنێ.

**ب**- ئەوانەی لە دەوری پێغەمبەری خوان، هاوکارییان مەکەن، بۆ ئەوەی دەوری چۆڵ بکەن و، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری سووك بێ و هێندە باری شانی قورس نەبێ،

ج- ئەوانەی بەدەوری پێغەمبەری خواوەن لە عەرەبە خێڵەکیی و بیاباننشینەکان خەرجییان مەکێشن، تاکو بڵاوەی لێ دەکەن و دەڕۆن، بۆ ئەوەی هاوکارییەکە کە هی پێغەمبەری دەکەن، لە خواردن و پێداویستیی، بەشیان بکات و کورتی نەهێنێ.

بەڵام لە ڕاستییدا مەبەستییان ئەوە بووە کەسی بە دەورەوە نەمێنێ، ئەو مانایەی مەبەست بووە هەرچەندە ئەو مانا سادەو ڕووکەشییەش دەگەیەنێ، بۆ خەڵکێکی سادە کە بڵێن: ئەوانە دڵسۆزی پێغەمبەری خوان و دەڵێن: ئەوانەی لە دەوری هاڵاون، هاوکارییان مەکەن بۆ ئەوەی کەمێك دەوری سووك بێ و ئیسڕاحەت بکات.

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات:

﴿ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ ﴾، دەڵێن: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شار (**يثرب**)، کە دوای تەشریف بردنی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، کرا بە مەنزڵگای ئیسلام ناوی لێنرا: (**المدینة**) یاخود (**مدینة الرسول**) شاری پێغەمبەر ﷺ یان شار، دەڵێن: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شار یان شارەکەمان.

﴿ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی باڵادەسترە، دەبێ ئەوەی بێ دەسەڵاترە دەری بکات، یاخود ئەوەی بەهێزیش، دەبێ ئەوەی بێهێزە، دەربکات، (**الأعزّ**) واتە: ئەوپەڕی بەهێز، (**الأذلّ**)یش واتە: ئەوپەڕی داماوو بێهێزو زەبوون، ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، باڵادەستیی هی خوایەو هی پێغەمبەرەکەیەتی و هی بڕوادارانە، ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام مونافیق و دەغەڵەکان نازانن، کەواتە: ئەگەر وابێ کە کێ بەهێزترە ئەوەی بێهێزەکە دەربکات، ئەوپەڕی هێز، هی خوایەو هی پێغەمبەرەکەیەتی و هی بڕوادارانە.

کەواتە: هەر بەپێی قسەی مونافیق و دەغەڵەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕواداران بە پشتیوانیی خوا، هەرکات بیانەوێ ئەو مونافیق و دەغەڵانەی بێهێزو زەبوونن وەدەردەنێن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

باسی دەغەڵەکان کە لەکاتی هاتنیاندا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆیان بە بڕوادار پیشان داوەو، بەدرۆخستنەوەی خوا بۆیان و، ڕوونکردنەوەی ئەوە کە سوێندە درۆیەکانیان کردوونە پۆشەرو سوپەریان، بۆیەش بەو دەردە چوون، چونکە: بڕوایان هێناوەو دوایی بێبڕوا بوونەوە، ئەوانە ڕواڵەت جوانی تیوەڕۆك ویرانن و، قسەی خۆش و بۆشیان هەیە، وریایی زۆریش پێویستە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، ئامادەش نین بێنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، داوای لێبوردنیان بۆ لە خوا بکات و، ئەگەر گریمان داوای لێبوردنیشیان بۆ بکرێ، هەرگیز خوا لێیان نابوورێ:

خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ ۖ وَإِن يَقُولُوا۟ تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ ۖ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ۖ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ۚ هُمُ ٱلْعَدُوُّ فَٱحْذَرْهُمْ ۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۖ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْا۟ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ﴾، کاتێك مونافیقەکان هاتنە لات، هەڵبەتە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، یانی: ئەی موحەممەد ﷺ! کاتێك مونافیقەکان هاتنە لات، (إِذَا:

**ظَرْفٌ لِلزَّمَانِ الْمَاضِي بِقَرِينَةِ جَعْلِ جُمْلَتَيْهَا مَاضِيَتَيْنِ)**، لێرەدا (**إذا**): شتێکە کارێکی تێدا ئەنجام دراوەو لێرە بۆ ڕابردوویە، بەبەڵگەی ئەوەی ئەو دوو ڕستەیەی لە دوایەوە دێن، هەردووکیان کرداری ڕابردوون:

**یەکەم:** (**جاءَكَ**) هاتن.

**دووەم:** (**قَالُوا**). گوتیان.

کەواتە: لێرە خوا ﷻ باسی شتێکی ڕابردوو دەکات.

**٢)-** ﴿قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ﴾، (کاتێك مونافیقەکان هاتنە لات) گوتیان: شایەدیی دەدەین کە بە دڵنیایی تۆ نێردراوی خوای، (**شهود**) یانی: هەواڵدانێکی جەخت لەسەر کراوە، لە چییەوە هاتوە؟ لە: (**شَهِد يَشهدُ**)، لێرە (**نَشهدُ**) لە (**مشاهدة**)ەوە هاتوە، واتە: بینین، یانی: ئێمە دەزانین تۆ پێغەمبەری خوای، وەك بینین بینیبمان و، بە چاوی عەقڵ و دڵ دەبینین کە تۆ نێردراوی خوای.

**٣)-** ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ﴾، خواش دەزانێ کە تۆ نێردراوی وی، ئەمە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە پێی دەگوترێ: (**جُمْلَة مُعْتَرِضَة**) ڕستەیەکی نێواخن کراو، کە دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ﴾، ئەم ڕستەیە بۆیە هاتوە، تاکو کەسێك کە ڕستەی دوایە دەبیستێ، وانەزانێ خوا ﷻ نێوەڕۆکی ڕستەکە بە درۆ دادەنێ، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾، خواش شایەدیی دەدات کە دەغەڵەکان درۆزنن، ئنجا بۆ ئەوەی وا نەزانرێ کە، لە: ﴿إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ﴾، لەوەدا درۆزنن، چونکە ئەگەر ئەوان لەوەدا درۆزن بن، یانی: کە دەڵێن: تۆ پێغەمبەری خوای، ڕاست نیە تۆ پێغەمبەری خوا ﷻ نی!! بۆیە دەفەرموێ: خوا دەزانێ تۆ پێغەمبەری خوای، بەڵام خوا شایەدیی دەدات کە مونافیقەکان درۆزنن لەوەدا کە دەڵێن: شایەدیی دەدەین کە تۆ بە پێغەمبەری خوا دەزانین، لە شایەدییدان و زانینەکەیان دا، ڕاست ناکەن.

چونکە: (**الْكَذِبُ: مُخَالَفَةُ مَا يُفِيدُهُ الْخَبَرُ لِلْوَاقِعِ فِي الْخَارِجِ**)، درۆ بریتیە لەوەی هەواڵێك بدرێ، ئەو هەواڵە پێچەوانەی ئەوە بێ، کە لە واقیعدا هەیە لە

دەرەوە، بۆ وێنە: کەسێك بڵێ: زەید هات، ئنجا ئەگەر قسەکەی درۆ بێ، مانای وایە زەید نەهاتوە، دەغەڵەکانیش دەڵێن: ﴿نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ﴾ شایەدیی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوای، ئنجا بەڵێ موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، بەڵام ئەوان ڕاستیان نەگوتوەو شایەدییان نەداوەو، ئەو زانین و بەڕاست زانینەیان لە دڵدا نەبووە.

ئێمە دوایی باسێك لە بارەی نیفاق و مونافیقەکانەوە دەکەین، لێرەش هەر بە کورتیی دوو پێناسەی مونافیقەکان، دێنین:

**١-** هەندێکیان گوتوویانە: (**المُنَافِقُ: مَنْ يُظْهِرُ الإِيْمَانَ وَيُبْطِنُ الكُفْرَ أو ويُسِرُّ الكُفْرَ**)، مونافیق کەسێکە ئیمان دەردەخات و پێشان دەدا، بەڵام کوفر لە دڵ و دەروونی خۆیدا پەنهان دەکات و دەشارێتەوە.

**٢-** هەندێکیش گوتوویانە: (**المُنَافِقُ: مَنْ يَدْخُل الإِسْلَام مِن بَابٍ، وَيَخْرُجُ مِنْها مِن بَابٍ آخَر**)، مونافیق کەسێکە لە دەرگایەکەوە دەچێتە نێو ئیسلام و، لە دەرگایەکی دیکەوە لێی دەردەچێ.

بەڵام مانای یەکەمیان ڕاسترەو، مەرج نیە بابای مونافیق هاتبێتە نێو ئیسلامەوە، هەرچەندە هەندێکی واشیان دەگونجێ هەبن، بەڵام مونافیق کەسێکە بە ڕواڵەت خۆی بە مسوڵمان پێشان دەدا، بەڵام لە دڵ و دەروونی خۆیدا بێبڕوایە.

٤)- ﴿وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ﴾، بەڵام خواش شایەدیی دەدا کە مونافیقەکان درۆزنن.

ئنجا خوا ﷻ زیاتر تیشك دەخاتە سەریان، کە وەك پێشتر گوتمان، ئەم هەشت ئایەتە موبارەکە، دەوری بیست لە خەسڵەت و ڕەفتارەکانی مونافیقەکانیان گرتوونە خۆیان و پێشتر باسمان کردن، لێرەدا دەفەرموێ:

٥)- ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَـٰنَهُمۡ جُنَّةً ﴾، سوێندەکانی خۆیانیان بە قەڵغان یان بە پۆشەر گرتوون، (**الْجُنَّةُ: مَا يُسْتَتَرُ بِهِ وَيُتَّقَى**)، (**جُنّة**) هەر شتێکە خۆی پێ بشاردرێتەوەو خۆی پێ بپارێزرێ، بۆیەش بە زرێ (**دِرْع**) گوتراوە: (**جُنَّة**)و بە سوپەر (ترس) گوتراوە: (**جُنّة**) یان (**مِجَنّة**) قەڵغان، لەبەر ئەوەی بەزرێ و سوپەر، جەستەو دەم وچاو سەرو ئەو شوێنانەی، مەترسیی هەیە شیرو تیرو زەبریان پێ بکەوێ، شێردراونەوەو پەنهان کراون.

مونافیقەکانیش سوێندەکانی خۆیان کردوونە پۆشەرو دەمامکێك ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان پێ شاردۆتەوە، ئەگەر سوێندیان نەخواردبایە، قسەیەك، ڕەفتارێك وەك هی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، ماوەیەك بڕی نەدەکرد، کە زەیدی کوڕی ئەرقەم بە پێغەمبەری خوای ﷺ گەیاند، بەڵام دوایی عەبدوڵڵا چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەوەندە سوێندی درۆی بۆ خواردن، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بەڕاست زانی و وایزانی زەید درۆی کردوە، بەڵام دوایی خوا ﷻ ئایەتی دابەزاندو، پێغەمبەری خوا ﷺ حەقیقەت و واقیعی شتەکەی بۆ دەرکەوت، وەك پێشتر بەسەرهاتەکەیمان هێنا.

٦)- ﴿ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، سەرەنجام لە ڕێی خوایان لادا، یاخود خەڵکیان لە ڕێی خوا لادا، (**صَدُّوا**) لێرەدا دەگونجێ کورتهەڵێنەر (**قَاصِر**) بێ، واتە: (**لَازِم**) بێ، یانی: لە ئەنجامی ئەو ڕەوشت و ڕەفتارو ئاکارانەیان دا لە ڕێی خوا لایاندا، (**أي: انْصَرفوا**) کە چاوگەکەی بریتیە لە (**صُدُود**) واتە: لادان، دەشگونجێ بە مانای: (خەڵکیان لە ڕێی خوا لادا) بێ، ئەو کاتەش چاوگەکەی (**صَدّ**) بێ، (**صَدَّ، يَصُدُّ، صَدّاً**)، (**صَدَّ غيره**) واتە: جگەلە خۆی لادا (**صَرَفَ**) خەڵکیان لە ڕێی خوا لادا، هەردوو واتایەکە لێرەدا گونجاون: هەم خۆیان لە ڕێی خوا لایاندا، هەم خەڵکیشیان لادا.

٧)- ﴿ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، بە ڕاستیی ئەوانە ئەوەی دەیکەن خراپترین کردەوەیانە، (**سَاء**) وەك پێشتر گوتمان وەك (**بِئْس**) وایەو لە کردارەکانی بەخراپدانان

**(أفْعَال الذم)**ە، یانی: **(بِئْسَ مَا كَانُوا يَعْمَلُون)**، ئەوەی دەیکەن خراپترین کردەوەیە، کە بریتیە لەوەی دێن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بە درۆ و زۆر بە جەختکردنەوە دەڵێن: شایەدیی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوای، کەچی ڕاستیش ناکەن، دواییش کە شتێکیان لێ ئاشکرا دەبێ، دێن سوێندی بە درۆ، دەکەنە قەڵغان و سوپەرو پۆشەری ڕووی ڕاستەقینەی خۆیان.

٨)- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ﴾، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە بڕوایان هێناوە دوایی بێبڕوا بوون، **(ذَلِك)** بۆچی دەچێتەوە؟ **(أَيْ: سَبَبُ إِقْدَامِهِمْ عَلَى الأَعْمَالِ السَّيِّئَةِ الْمُتَعَجَّبِ مِنْ سُوئِهَا، هُوَ اسْتِخْفَافُهُمْ بِالْإِيْمَانِ وَمُرَاجَعَتُهُمُ الْكُفْرَ مَرَّةً بَعْدَ أُخْرَى، فَرَسَخَ الْكُفْرُ فِي قُلُوبِهِم فَصَارَت مَطْبُوعاً عَلَيْهَا)**.

کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴾، واتە: هۆی ئەوەی ئەو کردەوە خراپانە ئەنجام دەدەن، کە جێی سەرسوڕمانن، ئەوەیە کە ئیمان بە چاوی سووك تەماشا دەکەن و، جار لە دوای جار دەگەڕێنەوە بۆ کوفر، بۆیە کوفر لە دڵ و دەروونیان دا چەسپاوە.

٩)- ﴿ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾، ئنجا دڵیان مۆر کراوە (لەسەر کوفر).

١٠)- ﴿ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴾، سەرەنجام ئەوان (ڕاستییە پەنهانەکان) باش نازانن، ورد تێناگەن، لە مەبەستی قسەبێژ تێناگەن، هەر کەسێك بێ، کە لێرەدا مەبەست پێی تێگەیشتنە لە فەرمایشتی خواو، فەرمایشتی پێغەمبەری خوا.

پێشتریش گوتمان وشەی: **(الطَّبْعُ وَالخَتْمُ وَالنَّقْشُ مُتَقَارِبَة المَعْنَى)**، بۆ مانای **(طَبْع وخَتْم)** لە کوردییدا دەڵێین: مۆر، بەڵام بۆ **(نَقْش)** دەڵێین: نەخش و نیگار، مانایەکەیان لێك نزیکەو، مەبەست ئەوەیە وەك چۆن کەسێك نامەیەك دەنووسێ، دوایی دەگاتە کۆتاییەکەی و مۆرێکی پێوە دەنێ، واتە: هیچی دیکەی تێدا ناگوترێ و نانووسرێ، بە هەمان شێوە دەغەڵەکانیش دڵیان داخراوەو، مۆری لێدراوە، تازە هیچی ناچێتە نێوی.

هەردوو (ف)یەکە: ﴿فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾و ﴿فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ﴾، (الفَاءَان للتَعْقِيْب وَالتَّعْجِيْب)، هەم بۆ بە دوای یەکدا هاتن و هەم بۆ سەرسوڕماندنن، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا دڵیان مۆر کراوە، بۆیە تێناگەن و حاڵەتێکی جێی سەرسوڕمانیان هەیە، وا دڵیان مۆر کراوەو هێندە ناحاڵیین.

**١١)-** ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ﴾، ئەگەر بیانبینی جەستەکانیان سەرسامت دەکەن. (**أَجْسَام**) کۆی (**جِسم**)ە، (**جِسم: مَا لَهُ طُولٌ وَعَرْضٌ وَعُمقٌ**)، (**راغب الأصفهاني**) وا دەڵێ، جیسم هەر شتێکە درێژیی و پانیی و قووڵیی هەبێ، پێشتریش گوتمان: (**جِسم**) لەگەڵ (**جَسد**)دا زانایانی شارەزای زمان گوتوویانە: جیاوازییەکەیان ئەوەیە کە جەستە دەبێ ڕەنگی هەبێ، بەڵام (**جِسم**) وانیەو هەواش بە (**جِسم**) دادەنرێ، کەڕەنگیشی نیە واتە: هەر شتێك تەنێك بێ (**جسم**)ە، مەرج نیە ڕەنگی بینراوی هەبێ.

خوا دەفەرموێ: ئەگەر بیانبینی جەستەکانیان سەرسامت دەکەن، واتە: زۆر بە کەلەش و بە قەدو قیافەن، یان ڕەنگە قەڵەو و زل بووبن.

**١٢)-** ﴿وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾، ئەگەر قسەش بکەن، گوێ بۆ قسەکەیان دەگری، واتە: هەم ڕەنگ و دیمەنیان، هەم قسەو گفت و لفتیان جێی سەرسوڕمانە بۆ تۆ، ئەمە وەك ئەو شیعرەی (**حسّان بن الثابت**)ە خوا لێی ڕازی بێ کە لە یەکێك لە شیعرەکانی دا دەڵێ:

**لاَ بَأْسَ بِالقَوْمِ مِنْ طُولٍ وَمِنْ غِلَظٍ ... جِسْمُ الجِمَال وَأَحْلَام العَصَافِيْر**

ئەو کۆمەڵە عەیبیان نیە لە درێژیی و زەبەلاحییدا

لاشەیان وەك هی حوشترەو عەقڵیان وەك هی چۆلەکانە

**١٣)-** ﴿كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ﴾، ئەوانە وەك داری هەڵپەسێردراو وان، (**الخُشُب المُسْنَدَة**)، یانی: دارە هەڵپەسێردراوەکان، ﴿مُّسَنَّدَةٌ﴾ (**التَّشْدِيْدُ للمُبَالَغَة**)گیرەدارکردن، بۆ زیادەڕۆیی تێدا کردنە، لە هەڵپەساردنیان دا، (**أو للكثرة**) یان: بۆ گەیاندنی مانای زۆرییانە، (**مُسَنَّدة**)

گیرەدار (مُشَدَّد) کراوە. واتە: داری بێ کەڵك کە بە دیوار هەڵدەپەسێردرێن و لە شوێنێك دادەنرێن، بەو شێوەیەن، هەڵبەتە (خُشُب) خۆی (خَشَبَ) یان کۆی (خَشَبَة)یە، وەك (ثُمُر) کۆی (ثَمَر)و (ثَمَرة)یە، (ثُمُر) واتە: میوەکان، (ثَمَر)و (ثَمَرة) واتە: یەك میوە.

(خُشُب) واتە: دارەکان، (خَشَب) و (خَشَبة) واتە: یەك دار، هەندێکیش گوتوویانە: (ثُمُر) کۆی (ثِمَار)ە، (ثُمُر) دەبێتە کۆی کۆ (جمع الجمع).

بۆیەش لێرەدا خوا ﷻ تەشبیهیان دەکات بە دارێکی هەڵپەسێردراوەوە، چونکە دار ئەگەر سوودی هەبێ و خاوەنەکەی مەیلی پێی هەبێ، لە خانوویەکدا، لە بینایەکدا، بۆ شتێك، بۆ کەلوپەلێك بەکاری دێنێ، بەڵام ئەگەر کاری پێی نەبوو و بە کەڵك نەهات، هەڵیدەپەسێرێ.

١٤)- ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾، هەر هاوارو دەنگێك لە دژی خۆیان تێدەگەن، (الصَّيْحَة) جارێکە لە (صِيَاح)، (صِيَاح)یش بریتیە لە دەنگ زۆر بەرزکردنەوە، لێرەدا مەبەست ئەوەیە هەر دەنگێك بێت، هەر هەواڵێك بێت، ئەوانە پێیان وایە لە دژی ئەوانە، گوتراوە: شکداری گوێدار، یان: (الخَائِنُ خَائِفٌ)، بابای ناپاك هەمیشە ترساوە، زانیویانە چییان لە هەگبەدایە، بۆیە هەمیشە دەستیان لەسەر دڵیان بووە، کە نێو هەناویان دەرکەوێت بۆ مسوڵمانان.

١٥)- ﴿هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ﴾، ئا ئەوانە دوژمنن، لێیان وریابە، وشەی (عَدُوّ) بۆ تاك و بۆ دووان و بۆ کۆو بۆ نێرو بۆ مێ، بەکاردێ، واتە: ئا ئەوانە دوژمنی ڕاستەقینەن، ﴿فَاحْذَرْهُمْ﴾ لێیان وریابە، واتە: وریا بە لە ڕواڵەتی جوانیان، ئەوانە ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێرانن، دوور کوژی نیزیك خەسارن، لێیان وریابە.

١٦)- ﴿قَاتَلَهُمُ اللَّهُ﴾، خوا بیانکوژێ، دەگونجێ بە مانا ڕواڵەتییەکەی بێ: خوا بیانکوژێ، خوا لە بەینیان بەرێ، یاخود بە مانای (لَعَنَهُمُ الله) خوا نەفرینیان لێ بکات، بێ.

١٧)- ﴿أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾، بەرەو کوێ لادەدرێن! (إلى أَيْنَ يُصْرَفُون)، یاخود چۆن لادەدرێن! (كَيْفَ يُصْرَفُوْن) چونکە (أَنَّى) لە ئەسڵدا بۆ پرسیارکردنە لە بارەی شوێن، بەڵام جاری

واش هەیە بۆ چۆنیەتییش بەکاردێ، واتە: بەرەو کوێ لا دەدرێن، یان چۆن لا دەدرێن؟ لە حاڵێکدا ئەو ڕاستە ڕێیەی خوا ﷻ لەبەر چاویانە.

**١٨)-** ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ﴾، هەروەها ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن پێغەمبەری خوا داوای لێبوردنتان بۆ دەكات، وشەی (**تَعَالَوْا**) لە ئەسڵدا كرداری فەرمانە لە (**تَعَالِي**)ەوە هاتوە، كە بریتیە لە (**تَكَلُّفَ الْعُلُو**) واتە: خۆ ئەزیەتدان بۆ بەرزبوونەوە، دوایی ئەوەی تێدا لە بیر كراوەو تەنیا ئەو مەبەستەی تێدا ڕەچاو دەكرێ، كە داوای ئامادەبوون كردن (**طَلَبُ الحُضُور**)ە، كەواتە: (**تَعَالَوْا**) واتە: وەرن، ئەگەرنا لە ئەسڵدا (**تَعَالَوْا**) واتە وەرن بەرەو بەرزیی.

**١٩)-** ﴿لَوَّوْاْ رُءُوسَهُمْ﴾، سەریان بە توندیی بادا و سووڕاند. (**واللَّيُّ: الإمَالَة إلى غَيْرِ وجَاهِ المُتَكَلِّم**)، (**لَيّ**) بریتیە لە بادان و ڕوو سووڕاندن بە پێچەوانەی ڕووی ئەو كەسەوی قسە دەكات، واتە: كەسێك كە قسەت لەگەڵ دەكات، ئەگەر ڕووت لێی سووڕاند، پێی دەگوترێ: (**اللَّيُّ**)، (**لَوَّوا**) كە بە گیرەوەیە بۆ بەهێزكردنی واتاكەیەتی، یان لەبەر زۆرییانە، واتە: زۆریان سەریان بادەدەن، یان لەبەر بەتوندیی سەر بادان و سووڕاندنیانە.

**٢٠)-** ﴿وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ﴾، دەشیابنینی لادەدەن، ﴿يَصُدُّونَ﴾: لێرەدا بە مانای (**يَنْصَرِفُون**)ە، تۆ دەیانبینی لادەدەن، واتە: لێرەدا (**صَدَّ**) بە مانا (**قَاصِر وَلازِم**)ەكەیەتی، تۆ دەیانبینی خۆیان لادەدەن.

لێرەدا (**رَأَيْتَهُم**) مەرج نیە بەس بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، بەڵكو بۆ هەر كەسێكە (**لغير مُعَيَّن**)، هەر كەسێك تەماشایان بكات ئاوایان دەبینێ.

**٢١)-** ﴿وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾، لە حاڵێكدا ئەوان خۆ بەزلگرن، (**مُسْتَكْبِرُونَ: فِي مَوْضِعِ الْحَالِ مِنْ ضَمِيرِ يَصُدُّونَ**)، واتە: (**مستكبرون**) لە شوێنی حاڵ دایە لە ڕاناوی (**يصدّون**)، خۆبەزلگرانە لادەدەن.

**٢٢)-** ﴿سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ﴾، یەكسانە لەسەریان، (**سَوَاءٌ اسْمٌ بِمَعْنَى مُسَاوٍ يُعَامَلُ مُعَامَلَةَ الْجَامِدِ فِي الْغَالِبِ، فَلاَ يَتَغَيَّرُ خَبَرُهُ يُقُولُ: هُمَا سَوَاءٌ، وَهُمْ سَوَاء، وهُنَّ سَوَاء**)، (**سواء**) ناوە بە

مانای یەکسان، ئنجا بە زۆریی وەك ناوێکی (جامد) لە شوێنی خۆی ڕەقبوو، مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ، نەك وەك ناوێکی داتاشراو، بۆیە هەواڵەکەی ناگۆڕێ دەگوترێ: (**هُمَا سَوَاءٌ، وَهُمْ سَوَاء، وهُنَّ سواء**)، ئەو دووانە یەکسانن، ئەو کۆمەڵە پیاوە یەکسانن، ئەو کۆمەڵە ئافرەتە یەکسانن، ﴿سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ﴾ واتە: بە نسبەت ئەوانەوە یەکسانە.

٢٣)- ﴿أَسۡتَغۡفَرۡتَ لَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾، داوای لێبوردنیان بۆ بکەی، یان داوای لێبوردنیان بۆ نەکەی، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿أَسۡتَغۡفَرۡتَ لَهُمۡ﴾، ئەم پرسیارکردنە، پرسیارکردنی مەجازییەو مەبەست پێی بایەخ و گرنگیی پێنەدرانیانە لە هەردوو حاڵاندا.

٢٤)- ﴿لَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ﴾ هەرگیز لێیان نابورێ، (**لَنْ: للتَّأْكِيْد وَالتَّأْبِيْد**)، (**لَنْ**) هەم بۆ جەختکردنەوەیە، هەم بۆ بەردەوامیی و کۆتایی) واتە: هەرگیزو بە جەختکردنەوەوە خوا لێیان نابوورێ.

٢٥)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی لادەران ڕاستە ڕێ ناکات و بە ئامانج ناگەیەنێ، هیدایەت لێرەدا بە مانای ڕێ پیشاندان نیە، چونکە خوا ڕێی پێشانی هەموو لایەك داوە.

شایانی باسە: خوا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، (**الفَاسِقِيْن**) کۆی (**فَاسِق**)ە، کە ناوی بکەر (**إسْم فَاعِل**)ە لە (**فَسَق**)، (**فَسَق: خَرَجَ**) واتە: دەرچوو، کەواتە: (**فاسِق**) واتە (**خَارِج**)، کەسێك لە ڕێ دەرچوو بێ، خوا بە ئامانجی ناگەیەنێ و ڕاستە ڕێی ناکات، چونکە بە ویستی ئازادانەی خۆی دەرچووە، خوا بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان ویستێکی ئازادی پێداون، دەتوانن چاکی پێ هەڵبژێرن یان خراپی پێ هەڵبژێرن، ئەوانەش بە ویستی خۆیان دەرچوون لە ڕاستە ڕێ، بۆیە خوا بە ئامانجیان ناگەیەنێ.

پێویستە بزانرێ: مونافیقەکان بەلای کەمەوە چوار جۆر بوون:

**١-** کەسێك ئیمانێك لە دڵیدا بریقەی داوەو خەریك بووە بڕوا بێنێ، بەڵام دوایی بڕوای نەهێناوە.

**٢-** ئەوانە بوون کە ئیمانێکیان ڕواڵەتیی و ڕووکەشیان هێناوە، دوایی دەوروبەرو خەڵك و خزم سەرکۆنەیان کردوون و، بێبڕوا بوون هەڵگەڕاونەتەوە.

**٣-** ئەوانە بوون کە بە درۆ خۆیان بە بڕوادار پێشان داوە، کە بە زۆریی مونافیقەکان ئاوا بوون.

**٤-** هەندێکی دیکەشیان بوون، کە ئیمانێکی ڕووکەشیان هێناوەو، پێیان وابووە بەس ئەوە ئیمانە، وەك عەڕەبە خێڵەکییەکان، ئەمانە مەگەر بە مەجاز پێیان بگوترێ: مونافیق، ئەگەرنا هەر پێیان دەگوترێ: ئیمانداری سەتحیی و ڕووکەشیی، چونکە نەیانویستوە درۆ بکەن و خەڵك هەڵخەڵەتێنن و، وایانزانیوە ئیمان هەر ئەوەندەیە.

لەوبارەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾، ئەم دەقە دێنین: (**قِيلَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولَ: يَا أَبَا حُبَابٍ! إِنَّهُ قَدْ أُنْزِلَ فِيكَ آيٌ شِدَادٌ، فَاذْهَبْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَسْتَغْفِرْ لَكَ، فَلَوَى رَأْسَهُ وَقَالَ: أَمَرْتُمُونِي أَنْ أُومِنَ فَآمَنْتُ، وَأَمَرْتُمُونِي أَنْ أُعْطِيَ زَكَاةَ مَالِي فَأَعْطَيْتُ، فَمَا بَقِيَ إِلَّا أَنْ أَسْجُدَ لِمُحَمَّدٍ**)، (**أخرجه الطبري: ٣٤٢٥١**)، واتە: بە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول گوترا: ئەی ئەبوو حوباب (ئەوە کونیەکەی بووە) چەند ئایەتێکی توندت لە بارەوە هاتوونە خوارێ، بچۆ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێبوردنت بۆ بکات، ئەویش سەری باداو گوتی: فەرمانتان پێکردم (و پێتان گوتم): بڕوا بهێنم (بە موحەممەد ﷺ) بڕوام پێهێنا، دوایی پێتان گوتم: زەکاتی ماڵەکەشت بدە زەکاتەکەشم دا، هەر ئەوە ماوەتەوە کڕنووش بۆ موحەممەد بەرم، (سەری باداو ڕووی وەرگێڕا).

### مەسەلەی دووەم:

**خستنەڕووی دوو پیلانی مونافیقەکان لە دژی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکانی خوا لێیان ڕازی بێ، پیلانی یەکەم: هاوکاری نەکردنیان تاکو هاوەڵان لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ بپرژێن و بڵاوەی لێ بکەن، پیلانی دووەم: دەرکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی خوا لێیان ڕازی بێ لە شار، کە دوو پیلانی گڵاو بوون، بەڵام لە ڕاستییدا دوو خەیاڵ پڵاو بوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ ﴾، ئەوان کەسانێکن دەڵێن: هاوکاریی ئەوانەی لای پێغەمبەری خوا مەکەن، خوا ﷻ لێرەدا هەڵوێستێکی دیکەی مونافیقەکان، دەخاتە ڕوو کە زیاتر پەردە لەسەر ناخی پیس و پۆخڵیان، لادەدات، دەفەرموێ: ئەوان ئەو کەسانە بوون، دەیانگووت، واتە: پێشتر گوتوویانە، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بە کرداری (**مضارع**) دەیهێنێ، بۆ ئەوەی ئێستا دیمەنەکە بخاتە پێش چاو، ﴿ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ ﴾، خەرجیی ئەوانە مەکێشن کە لە لای پێغەمبەری خوان، هاوکارییان مەکەن لە ڕووی ماددییەوە.

٢)- ﴿ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ ﴾، هەتا دەپرژێن و بڵاودەبن، (**حَتَّى: لِبُلُوغ الغَايَة**) وەك: (**أَكَلْتُ السَّمَكَةَ حَتَّى رَأْسَهَا**)، ماسییەکەم خوارد تاکو سەرەکەیشی، بەڵام لێرەدا (**حَتَّى: مُسْتَعْمَلَةٌ فِي التَّعْلِيْل**)، (**حتى**) بۆ هۆکار هێنانەوە بەکارهاتوە، یانی: ئەوانەی لە دەوری پێغەمبەری خوان ﷺ هاوکاریی ماددییان مەکەن، بۆ ئەوەی بپرژێن بڵاوببنەوە، (**الإنْفِضَاض: التَفَرُّق**

وَالإِبْتِعَاد، فَضَّه: فرَّقه)، (إنفضاضْ) پڕژان و دوورکەوتنەوەیە (فضَّهُ) بڵاوی کرد، (فَضَّهُ فَانْفَضَّ)، واتە پڕژاندی پڕژا، یان بڵاوی کرد بڵاوبۆوە، ﴿حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ﴾، هەتا دەپڕژێن و بڵاوەی لێ دەکەن.

وەك پێشتریش گوتمان ئەو قسەیە سێ ڕووی هەن:

أ- ڕوویەکیان بریتیە لەوە کە ئاگایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، باری شاری قورس نەکەن و ئەرکی زۆری نەخەنە سەر شان، بۆیە با ئەوانەی لە دەورینی و پێغەمبەری خوایان سەغڵەت کردوە، ئەرکی سەرشانیان قورس کردوە، با ئەوانە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ بکەینەوە، تاکو ئیسڕاحەت بکات.

ب- با ئەوانەی لێی کۆبوونەوە، بڵاوەی لێ بکەن، ئنجا بە خۆراك و شمەك هاوکاریی بکەن تاکو بەشیان بکات.

ج- هاوکارییان مەکەن تاکو ئەو خەڵکە لە دەوری بپڕژێ و نەمێنێ، ئەو کاتە ئەگەر ئیمام ئۆممەتی لەگەڵ نەما، بە ئاسانیی زەفەری پێ دەبردرێ.

بێگومانیش بەپێی ڕەوت و کەشی ئایەتەکان هەر مانای سێیەم مەبەستە.

٣)- ﴿وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، عەمبارەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی خوان، (خَزائِن) کۆی (خِزَانَة)یە، (الخِزَانَة: الْبَيْتُ الَّذِي يُخَزَّنُ فِيهِ الطَّعَامُ، وَتُطْلَقُ عَلَى الصُّنْدُوقِ الْكَبِيرِ)، (خِزَانَة): بە ژوورێك دەگوترێ خواردن و ئازووقەی تێدا دادەنرێ، هەروەها بە سندووقێکی گەورەش دەگوترێ، کە شتی تێدا هەڵدەگیرێ، عەمبارەکانی ئاسمانەکان و زەوی هی خوان.

٤)- ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَفۡقَهُونَ﴾، بەڵام مونافیقەکان تێناگەن، واتە: تێناگەن کە عەمبارەکانی هەموو شتەکان هی خوای پەروەردگارن.

پیلانێکی دیکەیان:

٥)- ﴿ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ﴾، دەڵێن: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شار، دەبێ ئەوەی باڵادەستترە، ئەوەی زەبوونترە دەربكات.

﴿ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ﴾، (**الأَعَزُّ: الطَّرَفُ الأَقْوَى الَّذِي لَا يُغْلَبُ وَلَا يُقْهَر، وَالأَذَلُّ: الطَّرَفُ الأَضْعَف**)، (**الأَعَزُّ**) ئەو لایەی بەهێزترەو تێناشكێ، كەس ناتوانێ بەسەریدا زاڵ بێ، (**الأَذَلّ**)یش بە پێچەوانەوە: ئەو لایەی بێهێزترە، عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەیی كوڕی سەلوول، خۆی و دەغەڵەكانی دەوروبەری بە لایەنی بەهێز داناون و، پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەلایەنی بێهێز داناون!

٦)- ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ ﴾، عیززەت و باڵادەستیی هەمووی هی خوایەو، هی پێغەمبەرەكەیەتی و، هی بڕوادارانە.

٧)- ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام مونافیقەكان نازانن.

كەواتە: ئەگەر یەكێك لە دوو تەڕەفەكان، مسۆگەر لایەكیان دەربكات، بێگومان تەڕەفی بێهێزو زەبوون، تەڕەفی مونافیق و دەغەڵەكانە، چونكە تەڕەفەكەی دیكە خوای پەروەردگاری لەگەڵدایە، كە خاوەنی هەموو عیززەتە: ﴿ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۝١٠ ﴾**فاطر**، ئنجا پێغەمبەری خواش ﷺ بەهۆی بەهێزكردنی خواوە، هەر بەهێزەو، بڕوادارانیش پشتیان بەخوا قایمەو بەهێزن.

كەواتە: ئەگەر وابێ كە دوو تەڕەف لە شارێك دا، یەكێكیان ئەوی دیكە دەربكات و بەهێزە كە بێهێزەكە دەربكات، لایەنی بەهێز هی بڕوادارانە، كە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دان و، پشتیان بە خوا ﷻ بەهێزە.

بۆ ئەوەی پێشێ، خوا فەرمووی: ﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ۝٧ ﴾، عەمبارەكانی ئاسمانەكان و زەوی هی خوان، بەڵام مونافیقەكان تێناگەن، بەڵام لێرەدا فەرمووی: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۝٨ ﴾، عیززەت هەمووی هی خواو پێغەمبەرەكەی و هی

بڕوادارانـە، بـەڵام موونافیقـەکان نازانـن، هـی پێشـێ بۆیـە لابردنـی فیقهـی لێکـردن و فەرمـووی ورد تێگەیشـتنیان نیـە، چونکـە ئـەوە کـە عەمبـارەکان ئاسـمانەکان و زەوی هەموویـان لەبەردەسـتی خـوا دان، شـتێکە پێویسـتیی بـە ورد تێگەیشـتن و ڕامـان دەکات، بۆیـە فەرمـووی: ﴿لَا يَفْقَهُونَ﴾، ئەگـەر ورد تێگەیشـتنیان هەبووایە، دەیانزانـی کـە خـوا خاوەنـی هەمـوو شـتێکە.

بـەڵام ئـەوەی دیکـە بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿لَا يَعْلَمُونَ﴾، چونکـە ئـەوە کـە خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ و بـڕواداران لایەنـی بەهێزتـر بـوون، شـتێکی زانـراو (**معلـوم**) بـووە:

أ- لە جەنگی بەدردا، لووتی قوڕەیشیان شکاند، قوڕەیشی هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافر.

ب- پاشان لە جەنگی ئوحوددا، بەڵێ شکستیان خوارد، بەڵام هەر ساڵی دوای ئەوە بۆ کافرەکان چوونەوە مەیدان، لە (**حَمْرَاءُ الأَسَد**) کە (**بَدْرُ الصّغرى**)یشی پێ دەڵێن، بەڵام ئەوان ئامادە نەبوون لەگەڵیان دا ڕووبەڕوو ببنەوە.

ج- هەروەها جەنگی ئەحزابیش ڕوویداو کافرەکان هیچیان پێ نەکرا. ئنجا جەنگی (**بنو المصطلق**)یش لە سەرئاوی (**المريسيع**)و لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا بووە، کە کۆمەڵێك جەنگ و ڕووداویش لە پێش ئەوەدا، ڕابردوون، کەواتە: ئەوە کە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕواداران، لایەنی بەهێزترن، شتێکی ڕوون و زانراو بووەو، بەس تۆزێك زانیارییان هەبێ دەرکی ئەوە دەکەن و دەیزانن، بۆیە خوا فەرموویەتی نازانن، واتە: هیچ زانیارییان نیە، ئەگەرنا شتەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، کە لایەنی بەهێزتر کێیە؟!

هەرچەنـدە ئێمـە لـە هـۆی هاتنەخـوارو، دواییـش لـە کاتی خسـتنەڕووی جەنگـی (**بنـي الْمُصْطَلِـقِ**)دا، تیشـکی باشـمان خستەسـەر بارودۆخێـك کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەیـی کـوڕی سـەلوول و هاوکارەکانـی ئـەو قسـانەیان تێدا کـردوون و، ئـەو دوو پیلانەیـان تێیـدا بـە دەسـتەوە بـوون، لـە دژی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و هـاوەڵانی، بـەڵام ئـەم دەقـەش لـەو بـارەوە دێنیـن:

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄، قَالَ: «كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزَاةٍ، قَالَ سُفْيَانُ: يَرَوْنَ أَنَّهَا غَزْوَةُ بَنِي الْمُصْطَلِقِ، فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ! وَقَالَ الْأَنْصَارِيّ: يَا لَلأَنْصَار! فَسَمِعَ ذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «مَا بَال دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ»؟ قَالُوا: رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ كَسَعَ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ»، فَسَمِعَ ذَلِكَ عَبْدُ الله بن أبيّ فقال: وقد فَعَلُوهَا، وَاللَّهِ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَامَ عُمَرُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعْهُ، لَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ» زَادَ التِّرْمِذِيُّ: «فَقَالَ لَهُ ابْنُهُ عَبْدُ اللَّهِ، وَاللَّهُ لاَ تَنْفَلِتُ حَتَّى تُقِرَّ أَنَّكَ الذَّلِيلُ، وَرَسُول الله العَزِيز، فَفَعَلَ»} (أخرجه البخاري: ٤٩٠٥ ، ٤٩٠٧، ومسلم: ٢٥٨٤، والترمذي: ٣٣١٥، والنسائي: ٧١٩).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە لە جەنگێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، سوفیان (یەکێکە لە ڕاوییەکان) دەڵێ: پێیان وابوو جەنگی (بني الْمُصْطَلِقِ) بووە، پیاوێك لە کۆچکەرەکان شەقێکی لە پیاوێك لە پشتیوانەکان هەڵدا، بابای کۆچکەر هاواری کرد: ئەی کۆچکەران! پشتیوانەکەش هاواری کرد: ئەی پشتیوانان! (واتە: هەر کامێکیان هاواری دەکردە خەڵکەکەی خۆی)، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی بیست و فەرمووی: بۆچی بانگەشەی نەفامیی دەکەن؟ گوتیان: پیاوێك لە کۆچکەران شەقێکی لە پیاوێك لە پشتیوانەکان هەڵداوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنن (لەو بانگەشەی نەفامییە) ئەوە بۆگەنە، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول کە ئەوەی بیست، گوتی: ئاوایان کرد! بە خوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شار، دەبێ بەهێزتر، بێهێزتر دەربکات، ئەوەش بە پێغەمبەر ﷺ گەیشتەوە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لێمگەڕێ با لە گەردنی ئەو مونافیقە بدەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێی گەڕێ با خەڵك نەڵێ: موحەممەد ﷺ هاوەڵانی دەکوژێ، (چووزانن ئەوە مونافیق و

دەغەڵـە، پێیـان وایـە ئـەوە هاوەڵـە، بـە ڕواڵـەت مسـوڵمانە)، **(الترمـذي)** ئەوەشـی زیـاد کـردوە، کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی، (واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبەیـی)، لـە تەنگەبەرێـك ڕێـی گـرت (چـووە پێشـیەوە کـە دەگەڕانـەوە بـۆ مەدینـە، لـە تەنگەبەرێك ڕاوەسـتاو) سـوێندی خـوارد گوتـی: نابـێ دەربچـی، تاکـو دان بـەوەدا نەهێنـی کـە تـۆ زەبوونـی و پێغەمبـەری خـوا بەهێـزە، ئەویـش گوتـی، (ئنجـا لێیگـەڕا بچێتـەوە نێـو شـار، بـۆ ئـەوەی بزانـێ ئـەوەی خـوا فەرموویەتـی وایـە، باڵادەسـتیی بـۆ خـواو پێغەمبەرەکـەی و بڕوادارانـە).

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە سێ ئایەتی کۆتایی پێکهاتوە، ئایەتەکانی: (٩ - ١١)، تەوەرەکەشیان باسی سامان و ماڵ بەخشینە لە ڕێی خوادا، خوا فەرمان بە بڕواداران دەکات، کە سامان و ڕۆڵەکانیان لە یادی خوا بێئاگایان نەکەن و، ببەخشن بەر لەوەی مەرگ یەخەیان پێ بگرێ و داوای مۆڵەت بکەن، دوابخرێن و، بەپێی سیستمی خواش، مردنی هیچ کەس دواناخرێ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١١﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! با سامانەکانتان و ڕۆڵەکانتان (نەتانخافڵێنن و) لە یادی خوا بێئاگاتان نەکەن، هەر کەسێکیش ئەوە بکات، ئا ئەوانەن زیانباران ﴿٩﴾ لەوەش کە پێمان داون ببەخشن، بەرلەوەی یەکێکتان مردنی بۆ بێ، ئنجا بڵێ: پەروەردگارم! خۆزگە بۆ ماوەیەکی نزیك دوات خستبام، تاکو (ماڵ و سامانم) ببەخشم و لە چاکان بم ﴿١٠﴾ هەرگیزیش خوا (مردنی) هیچ کەس دواناخات، هەر کات کاتی دیارییکراوی هات، خواش شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن ﴿١١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لَا تُلْهِكُمْ): نەتانخافڵێنێ، بێئاگاتان نەکات، (اللَّهْوُ: ما يَشْغلُ الإِنْسَانَ عَمَّا يَعْنيه ويُهِمُّهُ، يقال: لَهَوْتُ بِكَذَا وَلَهَيْتُ عَنْ كَذَا)، (لَهْو): بریتیە لە هەر شتێك كە مرۆڤ دەخافڵێنێ لە شتێك كە مەبەستیەتی و بەلایەوە گرنگە، دەگوترێ: (لَهَوْتُ بِكَذَا) بە فڵان شتەوە خافڵام، (لَهَيْتُ عَنْ كَذَا) ئاگام لە فڵان شتە نەما.

(أَجَلٍ قَرِيبٍ): (الأَجَلُ: المُدَّةُ المَضْرُوبَة للشَّيء)، (أجل): بریتیە لە ماوەیەكی دیاریكراو بۆ شتێك، كاتێكی دیاریكراوی نزیك.

(دُنُوُّ الأَجَلِ: عِبَارَةٌ عَن دنوِّ المَوْتِ، وَأَصْلُهُ اسْتِيفَاءُ الأَجَلِ، أَي: مُدَّةُ الحَيَاةِ)، دەگوترێ: (دَنَا أَجَلُهُ) واتە: ئەجەلەكەی نزیك بۆوە، كە بریتیە لە نزیككەوتنەوەی مردن و، لە بنچینەدا بریتیە لە تەواوكردنی ئەجەل، تەواوكردنی كات و ماوەی ژیان.

(فَأَصَّدَّقَ): (الصَّدَقَةُ: مَا يُخْرِجُهُ الإِنْسَان مِنْ مَالِه عَلَى وَجْهِ القُرْبَةِ كَالزَّكَاة، لَكِن الصَّدَقَة فِي الأَصْلِ تُقَالُ للمتطوّع بِهِ، وَزَكَاتُهُ للوَاجِب، وَقَدْ يُسَمَّى الوَاجِبُ صَدَقَة إِذَا تَحرَّى صَاحِبهَا الصِّدْقَ فِي فِعْلِه)، (صَدَقَة): بریتیە لەو ماڵەی مرۆڤ دەری دەكات لە ماڵ و سامانی خۆی، كە مەبەستی پێ لە خوا نیزیك بوونەوە وەك زەكات، بەڵام صەدەقە زیاتر بۆ ماڵێك بەكاردەهێنرێ كە خۆبەخشانە ببەخشرێ، بەڵام زەكات بۆ شتێكە كە فەڕز بێ، جاری واش هەیە زەكاتیش كە فەڕزە بە صەدەقە ناو دەبرێ، ئەگەر خاوەنەكەی لەڕاستیی خەفتا، لە ئەنجامدانی، ئەو زەكاتدان و ماڵ بەخشینەدا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە هەشـت ئایەتـی یەکەمـدا باسـی مونافیـق دڵنەخـۆش و دەغەڵەکانـی کـرد، لـە میانـی بیسـت (٢٠) لـە خەسـڵەت و خـوو ڕەفتـارو ئـاکارە خـراپ و موخەننەتەکانیانـداو، تیشـکی خسـتە سـەریان، ئنجـا خـوا ڕوو دەکاتـە بـڕواداران و دەفەرمـوێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ﴿ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ﴾، بـا سـامانەکانتان و منداڵەکانتـان لـە یـادی خـوا نەتانخافڵێنـن و بێئاگاتـان نەکـەن.

﴿ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾، هەرکەسـێکیش ئـەوە بـکات، ئـا ئەوانـەن زیانبـاران، زیانبـاری ڕاسـتەقینە ئەوانـەن کـە لەبـەر مـاڵ و سـامان کۆکردنـەوە، یـان لەبـەر خزمەتـی منـداڵ و ڕۆڵـەکان، ئاگایـان لـە یـادی خـوا نەمێنێ، ئنجـا یـادی خـوا ﷻ بـەس گوتنـی: (**سبحان اللـه، الحمدللـه، لا إلـه إلا اللـه، أللـه أكبر، أستغفرالله**) نیـە، یـادی خـوا هـەر شـتێکە، هـەر قسـەو کردارێکـە کـە پەیوەندیـی بـە خـواوە هەیـە، نوێـژ یـادی خوایـە، ڕۆژوو گرتـن یـادی خوایـە، مـاڵ بەخشـین یـادی خوایـە، تێکۆشـان لـە پێنـاوی خـوادا، یـادی خوایـە، فەرمـان بـە چاکـەو نەهـی لـە خراپـە، پەیوەندیـی خزمایەتیـی گەیانـدن و ...هتـد، هەمـوو ئەوانـە یـادی خـوان، هـەر شـتێك پەیوەندیـی بـە خـواوە هەبـێ و شـەریعەتی خـوا فەرمانـی پێکردبـێ، یـادی خوایـە.

﴿ وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقۡنَٰكُم ﴾، لـەوەی کردوومانـە بـە بژیـو بـۆ ئێـوەو پێمانـداون ببەخشـن، ﴿ مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ ﴾، بەرلـەوەی یەکێکتـان مردنـی بـۆ بـێ، ﴿ فَيَقُولَ رَبِّ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ ﴾، ئنجـا بڵـێ: پـەروەردگارم! دەبووایـە دوام بخـەی، خۆزگـە دوات دەخسـتم بـۆ کاتێکـی نیزیـك، ﴿ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ

ﮋﭐﻟﺼَّٰﻠِﺤِﻴﻦَﮊ، ئـەو كاتـەش مـاڵ بەخشـین دەكـەم و لـە چـاكان دەبـم (ئەگـەر دوام بخـەی).

ﮋوَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاﮊ، هەرگیزیـش خـوا هەركەسـێك كاتی مـردنی دێ، دوای ناخـات، (**وَلَـنْ يُؤَخِّـرَ اللـه أَجَـلَ نَفْـسٍ إِذَا جَـاءَ أَجَلُهَـا**)، هەرگیزیـش خـوا ئەجـەلی هیـچ كەسـێك دواناخـات، كاتێـك دێ.

ﮋوَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَﮊ، خـواش شـارەزایە بـەوەی دەیكـەن، كەواتـە: بزانـن چـی دەكـەن و چـۆن دەكـەن و ئاگاتـان لـێ بـێ، تاكـو لـە سـەرەمەرگدا پەشـێمان نەبنـەوە، چونكـە لەسـەرە مـەرگ دا پەشـێمانیی دادی هیـچ كـەس نـادات.

## مەسەلە گرنگەکان

### لە یەك مەسەلەدا کورتی دەکەینەوە:

**ئامۆژگارییکردنی خوا بۆ بڕواداران، کە سامان و منداڵیان لە یادی خوا نەیانخافڵێنێ، ئەگەرنا زیانبار دەبن و، لەوەی پێیداون ببەخشن، بەر لەوەی مردنیان بگاتە سەرو، داوای دواخستنی مردن بکەن، خواش هەرکەس ئەجەلی هات، دوای ناخات:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقۡنَٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠﴾ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنن) با سامانەکانتان و ڕۆڵەکانتان لە یادی خوا نەتانخافڵێنن، (**لا تُلهِكُم**) (**لَا**) ڕێگرە (**نَاهِيَة**)یە ،بۆیە کردارەکەی جەزم کردوەو بۆ ڕێگالێ گرتنە، با نەتانخافڵێنێ و بێئاگاتان! (**الإِلْتِهَاء: الإِنْشِغَال وَالسَّهْو**): (**إلتهاء**): بریتیە لە سەرقاڵ بوون و خافڵان و بێ ئاگا بوون.

خوا ﷻ بۆیە ماڵ و سامانی پێش منداڵان خستوە، چونکە خەڵك زیاتر بە ماڵ و سامانەوە سەرقاڵ دەبێ، تاکو منداڵان، بەڵێ ماڵ و سامانەکەش ئامرازە بۆ خزمەتی منداڵ و ماڵ و خێزان، بەڵام خەڵك بە گشتیی وایەو کاتی زیاتر تەرخان دەکات بۆ کۆکردنەوەو پەیداکردنی ماڵ و سامان، بۆیە خوا ﷻ ئەوی پێشتر داناوە.

کە دەشفەرموێ: با بێئاگاتان نەکات، مەبەست ئەوە نیە کە سەرقاڵ مەبن بە کارو کاسبییەوەو، بە پەیداکردنی ماڵ و سامان و بژیوی حەڵاڵەوە، چونکە لە شوێنی دیکەدا خوا فەرمانی بەوە پێکردووین، بەڵکو مەبەست ماڵ و سامانێك و منداڵ و ڕۆڵانێکن کە مرۆڤ بێئاگا دەکەن لە یادی خواو لە یادی خوا لایدەدەن، ئا ئەوە خراپە، ئەگەرنا ماڵ و سامان خوا ناوی لێناوە بەخششی خوا (**فضل الله**)، فەرمانیشی کردووە بەپەیداکردنی: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠﴾ ﴾**الجمعة**.

هەروەها ناوی لێناوە: (**خیر**): ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ ﴿١٨٠﴾ ﴾**البقرة**، واتە: هەرکات یەکێك لە ئێوە مردنی گەیشتە سەر ئەگەر خێرێکی بەجێهێشت (ماڵ و سامانی ناو لێناوە (**خیر**)) وەسیەتکردنی لەسەر پێویستە.

**٢)-** ﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴾، هەر کەسێکیش وابکات، ئا ئەوانەن زیانباران، (**ذَلِك**) ئاماژەیە بۆ خافڵان (**لَهْو**)، خافڵان لە یادی خوا بەهۆی سامان و منداڵانەوە، ﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ﴾، واتە (**وَمَنْ يَفْعَل ذَلِكَ الإلْتِهَاء والإنْشِغَال بِسَبَب الأَمْوَال وَالأَوْلَاد**)، هەر کەسێك ئەو خافڵان و بێئاگاییەی ئەنجام دا، بەهۆی ماڵ و سامان و منداڵانەوە، ئا ئەوانەن زیانباران.

**٣)-** ﴿ وَأَنفِقُواْ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم ﴾، هەروەها لەوەی پێمان داون، ببەخشن، خەرج بکەن.

**٤)-** ﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ ﴾، بەر لەوەی یەکێکتان مردنی بۆ بێ، لێرەدا مردن وا وێنا کراوە کە دێ، کە لە ڕاستییدا مرۆڤ بەرەو مردن دەچێ، بەڵام خوا ﷻ بۆ ئەوەی باش دیمەنەکەمان بخاتە بەرچاو، وای وێنا کردوە کە دانیشتووی و مردن بۆ تۆ دێ، ئەگەرنا مرۆڤە بەرەو مردن دەچێ، چ بەهۆی تەمەنەوە بێ، چ بەهۆی بەڵاو ئەو شتانەوە کە دەبنە هۆکاری مردن.

٥)- ﴿فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ﴾، ئنجا بڵێ: پەروەردگارم! خۆزگە دوات دەخستم بۆ ماوەیەکی نزیك، (**لَوْلَا: حَرْفُ تَحْضِيْض، وَيُسْتَعْمَلُ للعَرْضِ وَالتَّوْبِيْخِ وَالتَّنْدِيْمِ وَالتَّمَنِّيِّ، وَحَقُّ الفِعْلِ بَعْدَهَا أَنْ يَكُونَ مُضَارِعَاً، وَجَاء هُنَا مَاضِيَاً لِتَأْكِيْد إِيْقَاعِهِ عَن دُعَاء الدَّاعِي، حَتَّى كَأَنَّهُ تَحقَّق**)، (**لولا**): پیتی هاندانە و (مانایەکەی بەپێی شوێنەکان دەگۆڕێ) بە مانای پێشنیارکردن و، بە مانای سەرزەنشت و، بە مانای پەشێمان کردنەوەو، بە مانای خۆزگە خواستن، دێ (دەگونجێ لێرەدا بە مانای پێشنیار بێ، بۆ خوا، پەروەردگارم! ئەگەر دوام بخەی، دەشگونجێ بە مانای خۆزگە بێ، خۆزگە پەروەرگارم دوات خسبامایە بۆ کاتێکی نزیك) ئەو کردارەی لە دوای ئەوەوە دێ، دەبێ (**مضارع**) بێ، (کە لێرەدا دەفەرموێ: (**لَوْلَا أَخَّرتني**) دەبووایە فەرمووبای: (**لَوْلَا تُؤَخِّرني**)، بەڵام بە ڕابردوو هێناویەتی، بۆ جەختکردنەوەی ئەوەی وەك پاڕانەوەو داوای داواکەرەکە ڕوویدابێ و هاتبێتە دی.

٦)- ﴿فَأَصَّدَّقَ﴾، ئنجا چاکەو بەخشین بکەم، (**فَأَصَّدق: مَنْصُوبٌ عَلَى إِضْمَار «أَن» المَصْدَرِيَّة، إِضْمَارَاً وَاجِبَاً فِي جَوَابِ الطَّلَب**)، (**أَصَّدَّق**) مەنصووب بووە بە پەنهانکردنی (**أن**)ێك کە بۆ چاوگەو، واجبە ئەو (**أن**)ە دەرنەخرێ، واتە: (**أن أتَصَّدَّق**)، کە من خێرو چاکەو ماڵم ببەخشم.

٧)- ﴿وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، هەروەها لە چاکانیش بم، یانی: ئەو کاتە لە چاکان بم، ئێستا خراپ بووم بەهۆی ماڵ نەبەخشینەوە، بەڵام ئەگەر دوام بخەی، ماڵ و سامانی خۆم دەبەخشم و لە چاکانیش دەبم.

٨)- ﴿وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا﴾، (خواش ﷻ دەفەرموێ:) هەرگیزیش خوا ﷻ نەفسێك دواناخات (لە مەرگ و مردن) هەر کاتێك کاتی مردنی هات، (**أي: لَن يُؤَخِّر الله نَفْسَاً عَنِ المَوْتِ**) خوا هیچ نەفسێك لە مردنەکەی دواناخات، هەر کاتێك کاتی مردنی هات.

وشەی: ﴿وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، زۆربەیان هەر بە جەزم خوێندوویانەتەوە، بەڵام (**أبو عمرو**) کە یەکێکە لە حەوت قوڕئانخوێنەکان بە (**وَأَكُونَ مِنَ الصَّالِحِيْن**) خوێندوویەتەوە.

٩)- ﴿ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾، (خوێندراویشەتەوە: (بِمَا يَعْمَلون)) خواش شارەزای ئەوەیە کە ئێوە دەیکەن، یاخود: خواش شارەزای ئەوەیە کە ئەوان دەیکەن.

کورتەی مەبەستی ئەم سێ ئایەتە موبارەکە، ئەوەیە کە خوا ﷻ ڕوو لە بڕواداران دەکات، چونکە لە باسی مونافیق و دەغەڵەکاندا باسی ئەوە کرا کە گوتوویانە: ماڵ و سامان مەبەخشن بەوانی لە دەوری پێغەمبەری خوان، تاکو بپرژێن و بڵاوەی لێ بکەن، هەروەها مونافیقەکان بە زۆریی کە ئەو دەغەڵیی و موخەننەتییەیان دەکرد، بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان و خزمەتکردنی ماڵ و منداڵیان بوو، بۆیە خوا ﷻ لە کۆتایی دا ڕووی لە بڕواداران کرد: با ماڵ و سامانتان و منداڵەکانتان لە یادی خوا بێئاگاتان نەکەن، هەر کەسێك وابکات، ئەوە لە زیانبارانە، زیانبارانی ڕاستەقینە هەر ئەوانن، هەروەها لەوەی پێمان داون، ببەخشن، بەر لەوەی یەکێکتان مردنی بۆ بێ، ئنجا لە سەرەمەرگدا خۆزگە بخوازێ و داوا لە خوا بکات و پێشنیار بکات: کە ئەگەر بۆ ماوەیەکی نزیك، واتە: زۆریشم دوا نەخەی، تۆزێك دەرفەتێکم بدەیە، ماڵ و سامانی خۆم، دەبەخشم و لە چاکان دەبم، بەڵام خوا هەرگیز نەفسێك کە کاتی مردنی دێ، دوای ناخات و، بەپێی سیستمێك کە دایناوە، هەر کەسە، دەبێ لە کاتی خۆیدا بمرێ و گیان بسپێرێ، کەواتە: ئێوە بەرلەوەی مردنتان بگاتە سەر، خەمی خۆتان بخۆن.

## کورتە باسێک دەربارەی نیفاق و مونافیقان[1]

ئەم کورتە باسە لە پێنج بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم:** پێناسەی نیفاق و مونافیقان.

**بڕگەی دووەم:** پانتایی تەرخانکراو لە قورئاندا بۆ باسی مونافیقان.

**بڕگەی سێیەم:** (١٠٧) خەسڵەت و هەڵوێستی مونافیقان لە قورئاندا.

**بڕگەی چوارەم:** شەش سەرنج لە بارەی نیفاق و مونافیقانەوە.

**بڕگەی پێنجەم و کۆتایی:** چوار مەرجی سەرەکیی بۆ تۆبەکردنی مونافیقان.

### بڕگەی یەکەم: پێناسەی نیفاق و مونافیقان:

پێشتریش هەر باسمان کرد، وشەی نیفاق لە بنچینەدا، لە وشەی (نَفَق)ەوە هاتووە، (**النَّفَق: هُوَ السَّرْدَابُ تَحْتَ الأَرْضِ أو الجبل لَهُ مَدْخَلٌ وَمَخْرَجٌ**)[2]، (نَفَق): کونێکە لە ژێر زەوی یان لە چیادا، چوونە نێوێکی هەیەو چوونە دەرێکی هەیە.

یاخود وشەی (نِفَاق) لە (نَافِقَاء)ەوە هاتووە: (نَافِقَاء: **جُحَرةُ اليَرْبُوع يَحْفِرُهَا تَحْتَ الأَرْضِ وَيَجْعَلُ لَهَا مَخْرَجَيْنِ، فَفِي أَيِّهِمَا هُجِمَ خَرَجَ مِنَ الأَخَر**)، واتە: (نِفاق) لە (نَافِقَاء)ەوە هاتووە، (نَافِقَاء)یش کونی جرجە، کە لە ژێر زەویدا لێی دەدا، دوو دەرچەی بۆ دروست دەکات، لە هەر کامێکیانەوە هێرشی بۆ براو، پەلامار درا، لەوەی دیکەوە دەردەچێ.

---

(١) ئەم کورتە باسەمان وەرگرتووە لە: (موسوعة: الإِسلام كما يتجلَّى في كتاب الله) الكتاب الثاني عشر (الإِسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم) ص ٢٨١ - ٣١٢، الطبعة الثانية / ٢٠٢٠م - ١٤٣١هـ.

(٢) المعجم الوسيط، ص٩٤٢.

ئەمە لە ڕووی زمانەوانییەوە.

لـە ڕووی زاراوەی شـەرعییەوە: وشـەی (نِفـاق) ناوێکـە وەك هەندێـك زاراوەی دیکـە، یەکەمجـار ئیسـلام بـەکاری هێنـاوە، هەڵبەتـە پێشـتر ڕەنگـە بووبـێ، بـەڵام بـەو واتـاو چەمکـە شـەرعییەی کـە ئێسـتا باسـی دەکـەم، تەنیـا ئیسـلام بـەکاری هێنـاوە، ئەویـش بریتیـە لـە هەبوونـی کۆمەڵێـك خەڵـك لـە کۆمەڵـگای ئیسـلامییدا، کـە بۆ خۆپاراسـتن، ئیسـلام ئاشـکرا دەکـەن و، کوفـرو بێبڕوایـی لـە دڵ و دەروونیاندا پەنهـان دەکـەن، واتـە: بـە ڕواڵـەت مسـوڵمانن و لەڕاسـتییدا بێبـڕوان، بۆیـە وەك **(المصبـاح المنـير للفيومـي)**[1] گوتوویەتـی: **(المُنَافِـقُ: هُـوَ الكَافِـرُ الَّـذِي أَظْهَـرَ الإِسْـلَامَ كَذِباً، وَأَخْفَـى كُفْـرَهُ عَـنِ المُسْـلِمِيْن)**، مونافیـق ئـەو بێبڕوایەیـە کـە بە درۆ ئیسـلامەتیی پێشـان دەدا، بـەڵام کوفـرو بێبڕواییەکـەی لـە دڵیـدا پەنهانـی کـردوەو دەیشـارێتەوە لـە مسـوڵمانان.

پێغەمبـەری خـواش ﷺ لـە فەرمایشـتێکیدا ئـاوا مونافیـق پێناسـە دەکات و دەفەرمـوێ: **{أَرْبَـعٌ مَـنْ كُـنَّ فِيـهِ كَانَ مُنَافِقـاً خَالِصـاً، وَمَـنْ كَانَـتْ فِيـهِ خَصْلَـةٌ مِنْهُـنَّ كَانَـتْ فِيـهِ خَصْلَـةٌ مِـنَ النِّفَـاقِ حَتَّـى يَدَعَهَـا: إِذَا حَـدَّثَ كَـذَبَ، وَإِذَا عَاهَـدَ غَـدَرَ، وإِذَا اؤْتُمِـنَ خَـانَ، وَإِذَا خَاصَـمَ فَجَـرَ}**، **(أخرجـه أحمـد: ٦٧٦٨، والبخـاري: ٣٤، ومسـلم: ٥٨)**.

واتـە: چـوار سـیفەت لـە هـەر کەسـێکدا هەبـن، مونافیقێکـی بـێ خڵتەیـە، (مونافیقێکـی تـەواو) و هـەر کەسـێك یەکێـك لـەو خەسـڵەت و سـیفەتانەی تێـدا هەبـێ، یەکێـك لـە خەسـڵەت و سـیفەتی مونافیقانـی تێدایـە، تاکـو دەسـتبەرداری دەبـێ، چـوار سـیفەتەکەش ئەوانـەن: هـەر کاتێـك قسـەی کـرد درۆ بـکات و، هـەر کاتێـك بەڵێنیـدا بەڵێنەکـەی بشـکێنێ و، هـەر کاتێـك سـپاردەیەکی پـێ سـپێردرا، ناپاکیـی لـێ بـکات و، هـەر کاتێـك لەگـەڵ کەسـێکدا ناکۆکیـی و دەمەقاڵێیەکـی بـوو، تووشـی گونـاح و تـاوان ببـێ و لـە سـنوور دەربچـێ.

---

(١) ص: ٣١٨.

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێ: هەر کەسێك ئەو چوار سیفەتەی تێدا بن، مونافیقێکی تەواوە، زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: لێرەدا مەبەست پێی نیفاقی کردەییە، نەك نیفاقی ئیعتیقادیی، واتە: مەرج نیە هەر کەسێك ئەو چوار سیفەتەی تێدابن، بە کافر لە قەڵەم بدرێ، بەڵام لەڕووی کردەوەوە، ڕێك وەك مونافیقانە، نەك لە ڕووی ئیعتیقادو دڵ و دەروونەوە.

ب- هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: ئەو چوار سیفەتە لە هەر کەسێکدا کۆببنەوە، هەرچەندە کردەوەن، بەڵام دیارە نیفاقیش لە دڵ و دەروونیدا هەیە.

ج- هەندێکی دیکەش - کە من بۆ خۆم ئەو ڕایەم زیاتر لەلا پەسندە - دەڵێن: ئەگەر تەماشای بێژەی فەرمایشتەکە بکەی دەفەرموێ: (**إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ**)، هەمووی (**إِذَا**)ی لەسەرە، (**وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ**)، واتە: ئەو چوار خەسڵەتە لەو کەسەدا بوون بە خەسڵەتی ڕیشەداری بەردەوام، هەر کاتێك قسەی کرد، درۆ دەکات، مادام بەرژەوەندیی لە درۆدا بینی و، هەر کاتێك بەڵێنی داو پەیمانی دا، دەیشکێنێ، هەر کاتێك ئەمانەتێکی پێ سپێردرا، ناپاکیی لێ دەکات و، هەر کاتێك لەگەڵ کەسێکدا ناکۆکیی بوو، لە سنووری شەرع دەردەچێ، ئنجا هەر کەسێك ئەو چوار سیفەتەی تێدا ڕیشەدار بوون و تێیدا ببنە نەریت و عادەتێك، دیارە لە دڵ و دەروونیشیدا نیفاق و بێبڕوایی هەیە.

## بڕگەی دووەم: پانتایی تەرخانکراو لە قورئاندا بۆ باسی مونافیقان:

خوای بەرز - بەپێی سەرنجدانی من لە سوورەتەکانی قورئان - لە پازدە (١٥) سوورەتدا باسی مونافیقەکانی کردوە، کە من ئێستا تیشك دەخەمە سەر ئەو پازدە سوورەتەو، ژمارەی ئەو ئایەتانەی تێیاندا تەرخان کراون، بۆ باسی نیفاق و مونافیقان.

**١-** یەکەمین سوورەت کە باسی مونافیقەکان و باسی سیفەتەکانی تێداکراوە، بریتیە لە سوورەتی (**البقرة**)، لە سوورەتی (**البقرة**)دا، سێزدە (١٣) ئایەت تەرخانکراون بۆ باسی مونافیقەکان، ئەوانیش ئایەتەکانی: (٨ - ٢٠).

**٢-** دووەم سوورەت کە باسی مونافیقەکانی تێدا کراوە، سوورەتی (**آلِ عمران**)ە، ئەویش لە بواری قسەکردن و شیکردنەوەدا، لە بارەی ڕووداوەکانی جەنگی ئوحوودەوە، لەوێدا چەند جارێك باسی مونافیقەکان کراوە.

**٣-** سێیەمین سوورەت سوورەتی (**النساء**)ەو، لە چوار بۆنەدا باسی مونافیقەکان کراوە:

**یەکەم:** دادوەریی خۆبردن بۆ لای (**طاغووت**)، لە جیاتی خواو پێغەمبەرەکەی.

**دووەم:** دوو دڵیی و خەمساردیی و سستیی لە ڕووبەڕووبوونەوەو جەنگ و جیهاد لەگەڵ ئەهلی کوفردا، لە حاڵێکدا کە شەڕ بەری دەرگای پێگرتوون بە مسوڵمانان.

**سێیەم:** مەسەلەی دادوەریی کردن لە نێوان خەڵکدا بە دادگەریی.

**چوارەم:** مەسەلەی پەیوەندیی هەبوون و کەین و بەین هەبوون، لەگەڵ کافران دا.

**٤-** سوورەتی چوارەم کە باسی نیفاق و مونافیقەکانی تێدا کراوە، سوورەتی (**المائِدة**)یە، ئەویش لە بواری دۆستایەتیی گرتن و نیزیکیی کردن لە جوولەکەو نەصرانییەکان دا.

**٥-** سوورەتی پێنجەم سوورەتی (**الأنفال**)ە، ئەویش لە بواری قسەکردن و شیکردنەوەدا بۆ ڕووداوەکانی جەنگی بەدر، لەوێدا باسی دڵنەخۆش و مونافیقەکان کراوە.

**٦-** شەشەمین سوورەت کە زۆر پەردەی لەسەر مونافیقەکان لاداون، سوورەتی (**التوبة**)یە، کە بە سوورەتی (**الفاضحة**)ش ناوی هاتوە، سوورەتی (**التوبة**) بە زۆریی لە بارەی ڕووداوەکانی جەنگی تەبووکەوەیەو، زۆرترین تیشك خرابێتە سەر هەڵوێستی مونافیقەکان، دەتوانین بڵێین: لە سوورەتی (**التوبة**)دایە.

٧- سووڕەتی حەوتەم سووڕەتی (**النور**)ە، کە ئەویش بە بۆنەی ڕووداوی بوختان هەڵبەستن بۆ دایکمان خاتوون عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، لەلایەنی سەرۆکی مونافیقەکانەوە، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، بەو بۆنەوە باسی نیفاق و مونافیقەکان کراوە.

٨- سووڕەتی هەشتەم کە بە کورتیی ئاماژەیەك کراوە بۆ مونافیقەکان و ناوە باوەکەیان هێنراوە، سووڕەتی (**العنكبوت**)ە لە سەرەتایەکەی دا.

٩- سووڕەتی نۆیەم سووڕەتی (**الأحزاب**)ە، کە لە دوای جەنگی خەندەق هاتە خوار، بەجەنگی (**الأحزاب**) و بە جەنگی خەندەقیش مەشهوورە، بەو بۆنەوە باسی مونافیق و دەغەڵەکان کراوە.

١٠و١١- هەر کام لە سووڕەتی (**محمد**) و (**الفتح**)ن، کە چەند ئاماژەیەکی کورتیان تێدا هەن، بە دڵ نەخۆش و مونافیقەکان.

١٢و١٣و١٤- سووڕەتەکانی: (**الحديد**)و(**المجادلة**)و(**الحشر**)ن، لەوانیش دا چەند سیفەتێکی مونافیقەکان و چەند هەڵوێستێکیان باسکراون.

١٥- کۆتا سووڕەت لە قورئاندا کە باسی مونافیقەکانی تێدا کرابێ، سووڕەتی (**المنافقون**)ە، کە وەك پێشتر باسمان کرد لە دوو توێی هەشت ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (**المنافقون**) دا، خوا ﷻ ئاماژەی کردوە بە بیست (٢٠) لە ڕەوشت و ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانی مونافیقەکان.

ئەمە پانتایی تەرخانکراوە لە قورئاندا، بۆ باسی نیفاق و مونافیقەکان.

## بڕگەی سێیەم: سەدوحەوت (١٠٧) خەسڵەت و هەڵوێستی دەغەڵ و دڵنەخۆشان لە قورئاندا:

ئێمە ناچارین هەروا بە کورتیی ئاماژە بکەین و، سەرژمێری ئەو خەسڵەتانە بکەین، کە خوا ﷻ مونافیقەکانی پێ پێناسەو وەسف کردوون.

بەڵام لە دەستپێکدا دەمەوێ ئەوە بڵێم: کە بەپێی تێگەیشتنی بەندەو هەڵهێنجانم، خوای کاربەجێ زیاتر لەوەی باسی سیفەتەکانی کافران بکات، باسی سیفەتەکانی مونافیقەکانی کردوە، کە مونافیقەکانیش جۆرێکن لە کافرەکان، بەڵام بۆیە خوا ﷻ زۆر تیشکی خستۆتەر سەر مونافیقەکان، چونکە ئەوانە کافری پەنهانن، هەروەها جێی سەرنجیشە کە سێزدە (١٣) ئایەتی تەرخانکراو لە سوورەتی (**البقرة**)دا کە ئایەتەکانی: (٨ - ٢٠)ن، ناوی مونافیقەکان نەهاتوە، بەڵکو بە تەعبیری: (**وَمِنَ النَّاسِ**)، لەنێو خەڵك کەسانێك هەن، ئاوان و ئاوان، باسکراون، چونکە ئەوانە خۆیان لەگەڵ خەڵك و جەماوەرو کۆمەڵگای مسوڵمانان دا تێکەڵ کردوەو، خەڵك بە ناوی مونافیق نایانناسێ، بەڵکو بە سیفەت و هەڵوێست و ئاکارەکانیان دەیانناسێ.

بۆیەش پێویستە ئێمە زۆر وردبینانە تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین و سەرنجیان بدەین، کە باسی مونافیقەکان دەکەن، خوای بەرز زانیویەتی و دەزانێ، کە ئەو حاڵەت و دیاردەی نیفاقە، کەم و زۆر هەر بەردەوام دەبێ لە کۆمەڵگای مسوڵماندا، بۆیە تیشکی زۆری خستۆتە سەر خەسڵەت و ئاکارو هەڵوێستەکانیان، تاکو مسوڵمانان، هەر کەسێك ئەو سیفەت و خەسڵەت و ئاکارانەیان لێ بینی، بەلای کەمەوە نیشانەی پرسیاری بخەنە سەر، کە ڕەنگە جۆرێك لە نیفاقی هەبێ، ئەگەر مونافیقی تەواویش نەبێ، هەندێك لە خەسڵەتی مونافیقان و جۆرێك لە نیفاقی تێدابێ.

سەرژمێری ئەو (١٠٧) خەسڵەتەی مونافیقەكان:

## ١- لە سوورەتی (البقرة) سێزدە (١٣) سیفەت:

لە (**البقرة**)دا ئایەتەكانی: (٨ - ٢٠) واتە: سێزدە (١٣) ئایەت تەرخانكراون و، لەو سێزدە ئایەتەشدا، سێزدە خەسڵەتی مونافیقەكان خراونەڕوو بەم شێوەیە:

١- كەسانێكی پەنهانن، كەسانێكی تەم ومژاوییین و ڕوون نین، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾**البقرة**.

لە خەڵك كەسانێك هەن بەو شێوەیە.

٢- لافی بڕوا هێنان لێ دەدەن بەدرۆ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ ﴾**البقرة**.

٣- بە خەیاڵ فێڵ لە خواو مسوڵمانان دەكەن، بەوە كە مسوڵمانێتیی و ئیسلام ئاشكرا دەكەن: ﴿ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿٩﴾ ﴾**البقرة**.

٤- زۆر كەم هەستن، لەو ڕووەوە كە هەستیان هەبێ بەوەی خوا ﷻ دەیانبینێ و ئاگاداریانەو نێو دڵیان دەخوێنێتەوە، لەو بارەوە زۆر كەم هەست و كەم شعوورن، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾**البقرة**.

٥- دڵیان نەخۆشەو نەخۆشیی تێدایە: ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾**البقرة**، نیفاقیش بۆ خۆی پیسترین جۆری نەخۆشیی مەعنەویی و دەروونییە.

٦- لە ئەنجامی نواندنی ئەو هەڵوێستە دڵنەخۆش و دەغەڵانەیان دا، نەخۆشیی نیفاق لە دڵیاندا هەر زیاد دەكات: ﴿ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ﴾**البقرة**، خوا نەخۆشییەكەی بۆ زیاد كردن.

٧- زۆر درۆزنن، واتە: هەمیشە عادەتیان بە درۆوە گرتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ بِمَا كَانُواْ يَكْذِبُونَ ﴾**البقرة**، بەهۆی ئەوەوە كە بەردەوام درۆ دەكەن، بە (**فعل المضارع**) هێناویەتی بۆ ئەوەی بزاندرێ هەمیشە درۆ كردن تێیاندا تازە دەبێتەوە.

٨- ئەگەر دڵسۆزییان بۆ بنوێنرێ و ئامۆژگارییان بکرێ، زۆر پاکانەی نەفسی خۆیان دەکەن، کە نەك هەر خراپەکارو تێکدەر نین، بەڵکو چاکسازییکاریشن: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴿١١﴾ ﴾البقرة.

٩- لەگەڵ ئەوەشدا تێکدەرانی ڕاستەقینەن، کەچی لە خۆبایی بوون و بەخۆ سەرسام بوونیان، بۆتە پەردەیەك کە ئەو حاڵەتە خراپەی خۆیانی لێ پەنهانی کردوون: ﴿ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾البقرة.

**١٠و١١-** خۆیان بە زۆر عاقڵ و زیرەك دەزانن و، بڕوادارانیش بە پێچەوانەوە بە نەفام و کەودەن تێدەگەن، وەك خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا كَمَا آمَنَ النَّاسُ قَالُوا أَنُؤْمِنُ كَمَا آمَنَ السُّفَهَاءُ ۗ أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ السُّفَهَاءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: وەك چۆن خەڵك ئیمانی هەیە، ئێوەش ئیمان بهێنن، دەڵێن: ئایا ئیمان بهێنین، وەك نەفامەکان ئیمانیان هێناوە، ئاگاداربن! هەر ئەوانن نەفام و کەودەن، بەڵام نازانن.

**١٢و١٣-** کە بە بڕواداران دەگەن، ڕوویەکی مسوڵمانێتیی پێشان دەدەن و، جەختدەکەنەوە کە مسوڵمانن، بەڵام کاتێك بە پەنامەکیی دەگەنەوە لای سەرانی خۆیان، لای بەرپرسەکانیان، لەوێدا ڕووی ڕاستەقینەی کافرانەی خۆیان دەردەخەن و دڵنیایان دەکەنەوە کە هەر لەگەڵ ئەوان دان، لەگەڵ ئەهلی کوفردان و، بەس گاڵتە دەکەن بە بڕواداران، کە خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن: ﴿ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِئُونَ ﴿١٤﴾ ﴾البقرة.

### دووەم: لە سوورەتی (آل عمران)دا، هەشت (٨) سیفەت باسکراون:

١٤- تەنیا بیر لە خۆیان و بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەکەنەوە، هەرچەندە ئەهلی ئیسلام هەر شتێکیان لێبێ، دەربەست نین: ﴿ وَطَائِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ ﴾آلِ عمران، تەنیا خەم لە خۆیان دەخۆن خۆپەرست و ئەنانیین.

**١٥-** بۆچوونیان بەرانبەر بە خوا زۆر نەفامانەیەو هیچ پەیوەندیی بە ئیمانەوە نیە: ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ﴾ **آلِ عمران**، گومانی نەفامانەی ناهەق بە خوا دەبەن.

**١٦-** هەمیشە ڕەشبینن و ڕەخنەگرن لە قیادەی خۆیان و، بە گومانن و لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای دەکەن: ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖ﴾ **آلِ عمران**، دەڵێن: ئایا ئێمە هیچمان بەدەستە! هیچمان بەدەست نیە، مونافیقەکان کاتی خۆی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دەیانگوت: موحەممەد پرس بە کەس ناکات و، ڕاوێژ بە کەس ناکات و ئێمە هیچمان بەدەست نیە، لە حاڵێك دا کە هەمیشە پێغەمبەری خوا کاری بەڕاوێژ بووە.

**١٧-** دوای ئەوەی تووشی ناڕەحەتیی و شکستییەك دەبن لەگەڵ مسوڵمانان دا، هەمیشە ئەگەر ئەگەریانە، ئەگەر وامان نەکردبایە وا دەچوو، ئەگەر وامان کردبایە وادەبوو، لە حاڵێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**لاَ تَقُولُوا: لَوْ، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ**}، (**أخرجه مسلم: ٢٦٦٤**) مەڵێن ئەگەر وابوو ئەگەر واچوو (دوای ئەوەی شتەکە ڕوویدا) چونکە ئەوە دەرگا بۆ شەیتان دەکاتەوە، دەرگا بۆ خوتخوتەی خراپی شەیتان دەکاتەوە.

لە درێژەی فەرموودەکەدا پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: {**فَلاَ تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ الله ومَا شَاء فَعَل، فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ**}، لە سوورەتی (**آل عمران**)دا دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَا﴾ **آلِ عمران**، ئەگەر ئێمە شتێکمان بەدەست بایە لێرە نەدەکوژراین.

**١٨-** ئەگەر لە کاتی سەغڵەتیی و تەنگانەدا، داوایان لێ بکرێ بەرگریی بکەن، بە بڕوو بیانوو پاساوی بێجێ خۆیان پەنهان دەکەن و دەشارنەوە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا

﴿لَاتَّبَعۡنَٰكُمۡ ١٦٧﴾ آلِ عمران، بۆ ئەوەی خوا مونافیقەکانی بۆ دەرکەوون (لەسەر ئەرزی واقیع) کە ئەگەر پێیان گوترا: وەرن لە پێناوی خوادا بجەنگن، یاخود بەلای کەمەوە بەرگریی بکەن (لە شارو وڵاتەکەی خۆتان) دەڵێن: ئەگەر زانیبامان جەنگ ڕوودەدا (یان جەنگێکی ئامانجدارە) شوێنتان دەکەوتین.

**١٩-** لە دوای جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە، کە بۆ ئەهلی ئیسلام دێتە پێش، ئاوا خۆیان پیشان دەدەن:

**یەکەم:** شەماتە دەنوێنن (واتە خۆشحاڵ بوون بەوەی بەڵایەك تووشی مسوڵمانان بووە).

دووەم: پێیان وایە زۆر دووربین و عاقڵن، وەك خوای زاناو شارەزا لێی گێڕاونەوەو دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ ١٦٨﴾ آلِ عمران، ئەو (دڵنەخۆش و مونافیق)انەی بە برایەکانیان گوت و خۆشیان دانیشتن: ئەگەر بە قسەی ئێمەیان کردبایە نەدەکوژران.

**٢٠و٢١-** هەمیشە مونافیقەکان دڵخۆش دەبن بەو گوناحانەی دەیانکەن و، حەزیش دەکەن بە شتێك کە نەیانکردوە، مەدح بکرێن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُواْ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُواْ فَلَا تَحۡسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٖ مِّنَ ٱلۡعَذَابِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٨٨﴾ آلِ عمران، وا مەزانە ئەوانەی خراپە دەکەن و پێی دڵخۆش دەبن و حەزیش دەکەن ستایش بکرێن بە شتێکی چاك کە نەیانکردوە (پێت وانەبێ کە) ئەوانە دەرباز دەبن لە سزا (ی ئاگر) ئازارێکی بە ئێشیان هەیە.

### سێیەم: لە سوورەتی (النساء) دا، هەژدە (١٨) سیفەت باسکراون:

**٢٢-** لە ئەنجامی ئەوەدا کە کوفریان بە خواو بە پێغەمبەری خواو بە کتێبی خوا، لە دڵدا پەنهان کردوە، هەر کاتێك کێشەیەکیان بێتە پێش بۆ چارەسەری، پەنا نابەنە بەر پێغەمبەری خوا ﷺ و، دادوەرێك کە بەپێی شەریعەت حوکمیان بکاو دادوەرییان بکا، بەڵکو پەنا دەبەنە بەر (**طاغووت**)، واتە: جگەلە پێغەمبەرو جێنشینانی پێغەمبەر و

جگەلە شەریعەتی خوا: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا (٦٠)﴾النساء.

**٢٣-** کاتێك کە گرفت و بەڵایەکیان تووش دێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دادوەریی خۆیان بردۆتە لای (**طاغووت**)و، ئامادەنەبوون ملکەچ بکەن بۆ شەریعەتی خواو بۆ قیادەی مسوڵمان، لەو کاتەدا پەنا دەبەنەوە بەر قیادەو، وەك عادەتی خۆیان دەست دەکەنەوە بە پاساو هێنانەوەو، سوێند دەخۆن: کە هەر مەبەستمان پێ چاکە بوو، لە حاڵێکدا کە بێگومان هیچ چاکییەك لەوەدا نیە، پەنا ببرێتە بەر جگەلە شەریعەتی خوا: ﴿فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَاءُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا (٦٢)﴾النساء.

**٢٤و٢٥-** ئەوانە هەمیشە سەلامەتیی و بێ بەڵایی بە چاکەیەکی گەورەی خوا دادەنێن، کاتێك کە مسوڵمانان تووشی بەڵا دەبن، بەهۆی جەنگ و تێکۆشان و بەرەنگارییەوە، بەڵام لەولاشەوە کاتێك تووشی سەرکەوتنێك دەبن، زۆر پەشێمانیی دەردەبڕن، کە بەشدار نەبوون لەو دەستکەوت و سەرکەوتنەدا: ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا (٧٢) وَلَئِنْ أَصَابَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ يَا لَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا (٧٣)﴾النساء.

**٢٦و٢٧-** لەبەرئەوەی بۆچوونەکانیان لە کوفرەوە سەرچاوە دەگرن، ئەوانە هەمیشە دەترسێن لە ڕووبەڕووونەوە لەگەڵ ئەهلی کوفردا، بە ئەندازەی ترسانیان لە خوا، بەڵکو زیاتریش، هەروەها ئەگەر بە زمانیش دەری نەبڕن، لە دڵ و دەروونیاندا لۆمەو سەرکۆنەو ڕەخنە ئاڕاستەی خوا دەکەن، کە بۆچی وا بە زوویی جەنگ و جیهادی لەسەر پێویست کردوون؟! ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلَا أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ (٧٧)﴾النساء.

**٢٨-** کاتێك لەگەڵ بڕواداران داو لەگەڵ تێکۆشەران و فیداکارانی ڕێی خوادا، تووشی سەرکەوتنێك، یاخود دەستکەوتێك دەبن، یان بەرژەوەندییەکی دنیاییان بۆ دێتە دی، ئەوە دەگێڕنەوە بۆ لای خوا، بەڵام کاتێك زیانێکیان تووش دێ، یاخود خراپەو نارەحەتییەکیان تووش دێ، دەست دەکەن بە ڕەخنەگرتن لە قیادەو ئەو بەڵاو نارەحەتییەی بەسەریان هاتوە، دەیگێڕنەوە بۆ ئەوە کە قیادەکەیان فاشیل بووەو چاکی لێ نەزانیوە، بۆیە تووشی ئەو بەڵایە بوون، لە حاڵێکدا خۆشیی و ناخۆشیی و نیعمەت و بەڵا، وەك ئەندازەگیریی هەمووی لە خواوەیە، بەڵام وەك هۆکارەکان، مرۆڤەکانن هۆکاری دەستکەوت هاتنە دەست، یاخود نارەحەتیی تووش بوون، دەڕەخسێنن: ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِكَۚ قُلۡ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٧٨﴾ النساء.

**٢٩-** مونافیقەکان بە ڕواڵەت پابەندیی بە قیادەوە پیشان دەدەن، بەڵام بە پەنهانیی هەمیشە لە دژی ئەو قیادەیە پیلان دادەنێن و، دەیانەوێ کاروباری کۆمەڵگا بە شێوەیەك بڕۆێنن، کە پێچەوانەی بۆچوونی قیادەیە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُۖ ٨١﴾ النساء، لەڕوودا پێت دەڵێن: فەرمانبەرین، بەڵام کاتێك لەلای تۆ لادەچن، کۆمەڵێکیان جگەلە ئەوەی گوتووتە، دەیکەنە نەخشەو پیلان.

**٣٠-** کاتێك هەواڵێکیان پێدەگات، چ پەیوەندیی بە هێمنیی و ئاسایشەوە هەبێ، یان پەیوەندیی بە جەنگەوە هەبێ و، هەواڵێکی خۆش بێ، یان ناخۆش بێ، یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە، بەبێ ڕاوێژ کردن بە قیادە: ﴿وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡ ٨٣﴾ النساء.

**٣١-** حەز دەکەن و ئاوات دەخوازن مسوڵمانان لە دینەکەیان پاشگەزببنەوە، لێی هەڵگەڕێنەوە، تاکو وەك ئەوانیان لێبێ: ﴿وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ

سَوَآءً ﴿٨٩﴾، حەزدەکەن ئێوەش بێبڕوا بن (مسوڵمانینە!) وەك چۆن خۆیان بێبڕوان، تاکو وەك یەکتان لێبێتەوە.

**٣٢-** هەمیشە هەوڵ دەدەن قیادە تووشی هەڵە بکەن و فریوی بدەن و کڵاوی لەسەر بنێن، بەهۆی ئەوەوە کە بڕیاری هەڵە دەدات: ﴿ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ ﴿١١٣﴾ ﴾النساء، ئەگەر چاکەو بەزەیی خوا لەسەر تۆ نەبووایە (ئەی موحەممەد ﷺ!) کۆمەڵێك لەوان (لە دڵنەخۆش و دەغەڵەکان) دەیانویست تۆ گومڕا بکەن و بەهەڵەت دا بەرن.

**٣٣-** هەمیشە ئەهلی کوفر لە خاوەن کتێبەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و جگەلە ئەوانیش بەدۆست دەگرن، لە جیاتی بڕواداران: ﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ ﴾النساء.

**٣٤و٣٥-** هەمیشە لە کەلێن دەگەڕێن و لە بۆسە دان بۆ ئەهلی ئیسلام، کە تووشی بەڵا بن و، لەلایەکی دیکەشەوە هەمیشە کار دەکەن لەسەر دوو پەتان: پەتی ئیسلام و پەتی کوفر، ئنجا هەر کامێکیان هاتی بوو، خۆیان پاڵدەدەنە لای وی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤١﴾ ﴾النساء.

**٣٦و٣٧و٣٨-** مونافیقەکان نوێژ ناکەن و، ئەگەر ئەنجامیشی بدەن زۆر بە تەنبەڵیی و قالب گرانیی دەیکەن، ئەویش تەنیا بۆ ڕووپامایی و ڕووو دەربایسیی بۆ خەڵك، پاشان زۆر بە کەمی یادی خوا دەکەن، ئەویش ئەگەر بۆنەیەك بارودۆخێك وا بخوازێ کە یادی خوای تێدا بکەن، ئەگەرنا نەك لە دڵەوە بێ و لەبەر سام و هەیبەت و خۆشەویستیی خوا بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ ﴾النساء، مونافیقەکان فێڵ لە خوا دەکەن و ئەو فریودەریانە و هەرکات هەڵدەستن بۆ نوێژ بە تەنبەڵیی و

قالب گرانیی هەڵدەستن، ڕیابازیی و ڕووودەربایسیی دەکەن بۆ خەڵك و، بە کەمییش نەبێ یادی خوا ناکەن.

**٣٩-** هەمیشە لە نێو قەدێیەوە گۆچان دەگرن، (**يُمْسِكُونَ العَصَا مِنَ الوَسَطِ**)و ژیانیان لە لەرەلەر دایەو، لە حاڵەتێکی ناسەقامگیر دان و، لە نێوان ئەهلی ئیمان و ئەهلی کوفردا دێن و دەچن، وەك پەڕە مریشكێك كە با بەملاولادا لاری دەكاتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴿١٤٣﴾ ﴾**النساء**، بە لەرەلەرن لەو نێوانەدا، نە لەگەڵ ئەوانن نە لەگەڵ ئەوانن، یانی: دەیانەوێ بەو شێوەیە بمێننەوە، وەك گوتراوە: بارەكە بە كەلادا دەخەن.

## چوارەم: لە سووڕەتی (المائدة)دا یەك سیفەت باسكراوە، جگە لە دووبارەكان:

بێگومـان كۆمەڵێـك سـیفەت لـە زۆربـەی سـووڕەتەكاندا هــەن، بـەڵام ئێمـە هەندێـك سـیفەت كـە پێشـتر سـەرژمێریان دەكەیـن، دووبارەیـان ناكەینـەوە، ئەگەرنا لـە سـووڕەتی (**المائـدة**)دا زیاتـر لـە سـیفەتێكیان هەیـە، بـەڵام یـەك سـیفەتیان هەیـە كـە لـە سـووڕەتەكانی پێشـێدا نەهاتبـێ:

**٤٠-** پێشبڕكێ دەكەن لە دۆستایەتیی كردن و كەین و بەین هەبوون لەگەڵ ئەهلی كوفردا بە گشتیی، بەڵام لەگەڵ جوولەكەو نەصڕانییەكان دا بەتایبەتی، بەوەش پاساوی ئەو هەڵوێستەیان دەدەنەوە، كە لە ڕۆژگارو گۆڕانكارییەكانی ڕۆژگار دەترسێن، لەبەرئەوەی ئەوانە زۆر خاوەن ئەزموونن، بۆیە دووربینیی دەكەن! وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ﴿٥١﴾ ﴾**المائدة**، سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! جوولەكەو نەصڕانییەكان مەكەن بە دۆست، لە ئایەتی دواییدا دەفەرموێ: ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَـٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ﴿٥٢﴾ ﴾**المائدة**، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەیانبینی خێرایی و پێشبڕكە دەكەن لە دۆستایەتیی كردنی جوولەكەو نەصڕانییەكان دا، دەڵێن: دەترسین بەڵایەكمان تووش ببێ.

**پێنجەم: لە سوورەتی (الأنفال)یشدا سیفەتێکی دیکەیان هاتوە:**

**٤١-** کاتێك فیداکارییەکانی ئیمانداران و لەخۆبووردووییان و ئازایەتییان دەبینن، ئەو ئازایەتیی و فیداکارییەی بڕواداران، بە لە خۆبایی بوون و تەهەوورو بێ عەقڵیی و نەفامیی، تەفسیر دەکەن: ﴿ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ ﴿٤٩﴾ ﴾**الأنفال**، کاتێك مونافیقەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەڵێن: ئەوانە دینەکەیان فریوی داون، (یان مەغرووری کردوون و لەخۆیانی بایی کردوون).

**شەشەم: لە سوورەتی (التوبة)دا، بیست و نۆ (٢٢) سیفەتی دیکەیان هاتوون:**

**٤٢-** مونافیقەکان بە پێچەوانەی بڕوادارانی ڕاستەقینەوە، لە کاتێکدا تەماع و هات دەبێ، زۆر دەبن، بەڵام لە کاتی ترسێدا کەم دەبن، بە پێچەوانەی بڕوادارانەوە: (**يَقِلُّونَ عِنْدَ الطَّمَعِ، وَيَكْثُرُونَ عِنْدَ الفَزَعِ**)، بڕوادارانی ڕاستەقینە لە کاتی تەماعدا کەم دەبن، بەڵام لەکاتی ترسێدا زۆر دەبن، مونافیقەکان بە پێچەوانەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ ٱلشُّقَّةُ ﴿٤٢﴾ ﴾**التوبة**، ئەگەر سەفەرێکی کورت و ئامانجێکی نزیك بووایە، شوێنت دەکەوتن، بەڵام سەفەرەکە دوور بوو کارەکە بە زەحمەت بوو (بۆیە نەهاتن).

**٤٣-** هەمیشە درۆ دەکەن و سوێندی بە درۆ دەخۆن بۆ قیادە، بۆ ئەوەی پاساوی هەڵوێستە لەرزۆك و ترسنۆکەکانی خۆیانی پێ بدەن: ﴿ وَسَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ ﴿٤٢﴾ ﴾**التوبة**.

**٤٤-** ئەوانە لە کاتێکدا کە پێویستە خۆ ئامادە ناکەن بۆ جەنگ و جیهاد، بەڵام کاتێك کە دێتە وەختی ڕۆیشتن و ڕووبەڕووبوونەوە، پاساو دەهێننەوە کە خۆیان ئامادە نەکردوە، پێشێ مشووری خۆ ئامادە کردن ناخۆن و، دوایی دەڵێن: خۆمان ئامادە نەکردوەو پێمان ناکرێ! بۆیەش خوا لە بارەیانەوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَوْ أَرَادُوا۟ ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا۟ لَهُۥ عُدَّةً ﴿٤٦﴾ ﴾**التوبة**. ئەگەر ویستبایان دەربچن بۆ جەنگ و جیهاد، ئامادەکارییان بۆ دەکرد.

**٤٥-** کاتێك بە ناچارییش لە جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوەیەکدا بەشدار دەبن، هەمیشە زیانیان زیاترە لە سوودیان: ﴿لَوْ خَرَجُوا۟ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوْضَعُوا۟ خِلَـٰلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ ٱلْفِتْنَةَ ﴿٤٧﴾﴾**التوبة**.

**٤٦-** هەر دەرفەتێکیان بۆ هەڵکەوێ لە دژی ئیمانداران، پیلان دەگێڕن، بەتایبەت کاتێك بڕواداران بێهێز بن و بەڵایەکیان بەسەر بێ، بەڵام کاتێك مسوڵمانان بەهێز دەبن، ئەوانە بێدەنگ دەبن و تاڵاوی کینەو بوغزی خۆیان قووت دەدەنەوە: ﴿لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَـٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾﴾**التوبة**.

**٤٧-** بۆ ئەوەی هەمیشە لە ماڵێ دابنیشن لەگەڵ ئافرەتان و منداڵان دا، لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەو جەنگدا، هەر جۆرە بیانوو یەك دەهێننەوە، ئەگەر لە بێهێزیی دا وەك ماڵی جاڵجاڵۆکەش بێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾**التوبة**، ئەم ئایەتە لەبارەی (**الجدّ بنِ القَيس**)ەوە هاتە خوار، کاتێك پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد لەگەڵی بچێ بۆ جەنگی تەبووك، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من پیاوێکم زۆر کەیفم بە ئافرەتان دێ، دەترسم ئافرەتانی ڕۆم ببینم، تووشی گوناهێ ببم، ئنجا مۆڵەتم بدە با نەیەم!!

**٤٨و٤٩-** ئەوانە دڵخۆش دەبن بە بەڵایەك کە بەسەر مسوڵمانان دێ و، بە پێچەوانەشەوە: دڵتەنگ دەبن بەخۆشیی و هاتێك کە بۆ مسوڵمانان دێتە پێش: ﴿إِن تُصِبْكَ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا۟ قَدْ أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا۟ وَّهُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾﴾**التوبة**، ئەگەر چاکەیەکت بێتەڕێ پێنارەحەت دەبن، بەڵام ئەگەر بەڵایەکت بەسەر بێ، دەڵێن: ئێمە پێشتر ئیحتیاتی خۆمان کردبوو و، دڵخۆشانە پشت هەڵدەکەن و دەڕۆن.

**٥٠-** کاتێك ڕۆژێك لە ڕۆژان ناچار دەبن خەرجیی بکەن و ماڵ ببەخشن، زۆر بە دڵتەنگیی و هەست کردن بە تاڵیی و ناچاریی ماڵ دەبەخشن: ﴿وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَـٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾﴾**التوبة**.

**٥١-** هەمیشە سوێند بە خوا دەخۆن بۆ بڕواداران کە لەوانن، بەڵام ئەوە تەنیا لە ترسانەو بۆ ڕازیکردنی مسوڵمانانە: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾﴾ **التوبة**.

لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾﴾ **التوبة**. سوێندیشتان بە خوا بۆ دەخۆن تاکو ڕازییتان بکەن، خواو پێغەمبەرەکەیشی شایستەتربوون ڕازییان بکەن، ئەگەر بڕوادار بوونایە.

**٥٢-** هەمیشە ڕەخنە لە قیادە دەگرن، لە بواری بەخشین و خەرجیی و مەسرەفدا ئەگەر پێیان نەدرێ، بەڵام ئەگەر پێیان بدرێ، ئەوە دیارە دڵخۆش دەبن: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِن لَّمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ ﴿٥٨﴾﴾ **التوبة**.

**٥٣-** هەمیشە ئازاری قیادە دەدەن بە تۆمەتی بێماناو، خۆڕاگریی و لێبوردەیی و هێمنیی و چاوپۆشیی قیادە لە بەرانبەریان دا، بە نەفامیی و نەزانیی و سادەیی تەفسیر دەکەن، وەك دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُمُ الَّذِينَ يُؤْذُونَ النَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ ۚ وَالَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾﴾ **التوبة**، مونافیقەکان دەچوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و سوێندی بەدرۆیان بۆ دەخوارد، کە پێغەمبەری خواش ﷺ چاوپۆشیی لێیان دەکرد، دەیانگوت: ئەوە هەر گوێیەو بەس گوێ دەگرێ!

**٥٥-** کاتێك پڕوپاگەندەیەکیان لێدەگیرێ و، درۆیەکیان لەسەر ئیسپات دەبێ و سوێندە بە درۆیەکانیان سپات دەبنەوە، لەو کاتەدا پۆزش دەهێننەوە بە پۆزش هێنانەوەیەك کە خراپترە لە خودی گوناهەکە: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾﴾ **التوبة**، ئەگەر پرسیاریان لێبکرێ: ئەو قسانەتان بۆچی کردوون؟ دەڵێن: ئەوە هەر دەڕژاینە نێو قسان و گەمەو یارییمان دەکرد (خواش دەفەرموێ:) ئایا گاڵتە بە خواو ئایەتەکانی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن؟!

**٥٦و٥٧و٥٨و٥٩**- ئەوانە نێرو مێیان دۆستایەتیی و کەین و بەینیان پێکەوە هەیەو، فەرمان بە خراپە دەکەن و ڕێ لە چاکە دەگرن (بە پێچەوانەی ئیماندارانەوە کە دەبێ فەرمان بە چاکە بکەن و ڕێ لە خراپە بگرن) و، دەست لە خەرجکردن و ماڵ سەرفکردن لە پێناوی خوادا دەگرنەوە و، خوای بەرزو مەزنیان هەمیشە لە بیردەچێ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾**التوبة**.

**٦٠**- عادەتی هەندێکیان وایە کە بەڵێن و پەیمان بە خوا دەدەن، ئەگەر خوا دەوڵەمەندیان بکات، وا دەکەن و وا دەچن، بەڵام کاتێك خوا ئاواتەکەیان بۆ دێنێتە دی، بەڵێن لەگەڵ خوای پەروەردگاردا دەشکێنن: ﴿ وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾**التوبة**.

**٦١**- مونافیقەکان هەمیشە کەسانێك کە لە ڕێی خوادا ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن، چ زۆر ببەخشن، چ کەم ببەخشن، هەر ڕەخنەیان لێ دەگرن، ئەگەر زۆر ببەخشن، دەڵێن: ڕیابازیی دەکەن و، ئەگەر کەم ببەخشن، دەڵێن: خوا چ پێویستیی بەوەندە هەبوو؟: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ۙ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾**التوبة**، ئەوانەی عەیب دەگرن لەو بڕوادارانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن (خێرو چاکە دەکەن) هەروەها عەیب لەوانەش دەگرن کە تەنیا ئەوەی لە توانایاندایە دەیبەخشن، گاڵتەیان پێدەکەن، خوا گاڵتەیان پێ بکات و ئازارێکی بە ئێشیان بۆ هەیە.

چونکە ئینسان کە دەبەخشێ، یان کەم دەبەخشێ، یان زۆر دەبەخشێ، ئنجا ئەگەر زۆر ببەخشێ، بگوترێ: ڕیابازیی کردوەو، ئەگەر کەم ببەخشێ، بگوترێ: خوا چ پێویستیی بەوەندەیە! مانای وایە دەبێ کەس هیچ نەبەخشێ، ئنجا زۆریی و کەمیی شتێکی ڕێژەیین و، هەیە زۆری پێ کەمەو، هەیە کەمی پێ زۆرە.

**٦٢و٦٣-** مونافیقەکان کاتێك لە جەنگ و جیهاد دوا دەکەون، دڵخۆش دەبن بەو دواکەوتنەی خۆیان و، هەوڵیش دەدەن خەڵکیش دوا بخەن بە بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندە، بۆ وێنە: ترساندیان لە گەرماو سەرما: ﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾﴾ **التوبة**، بەجێهێڵراوەکان لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دڵخۆش بوون بە بەجێمانیان، پێیان ناخۆش بوو لە پێناوی خوادا بە ماڵ و سامانیان تێکۆشان بکەن، بە خەڵکیشیان گوت: بەو گەرمایە مەچن بۆ جەنگ و جیهاد، بڵێ: ئاگری دۆزەخ گەرمییەکەی توندترە ئەگەر ورد تێگەیشتبانایە.

**٦٤-** ئەوانە بڕو بیانوو زۆر دێننەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ منداڵ و پیرو ئافرەتاندا لە ماڵێ بەجێ بمێنن و، پیاوانەو مەردانە نەچن بۆ جەنگ و جیهاد، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُوْلُواْ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُواْ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾﴾ **التوبة**.

**٦٥-** لە کاتێکدا تێکۆشەران لە جەنگ و جیهاد دەگەڕێنەوە، بە سەرکەوتوویی و بە سەربەرزیی، ئەو دەغەڵ و مونافیقانە دێن بۆ لای قیادەو، پاساوو بیانووی جۆراوجۆر دەهێننەوەو، سوێندی زۆر قورس دەخۆن، تاکو لە لێپرسرانەوەو سەرکۆنەکران، خۆیان دەرباز بکەن: ﴿سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ ۖ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ ۖ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ۖ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْاْ عَنْهُمْ ۖ فَإِن تَرْضَوْاْ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾﴾ **التوبة**.

**٦٦و٦٧و٦٨-** هەروەها لە نەخشە ئیبلیسییەکانی مونافیقەکان، ئەوەیە کە دژایەتیی ئیسلام و قەوارەی ئیسلامیی بکەن، لە میانی دامەزراوەکانی خۆیانداو لە ژێر پەردەی هەندێك دامەزراوەدا، کە ناوی ئیسلامیان لەسەرەو پۆشاکێکی ئیسلامییان بەبەردا دەکەن، بەڵام ئامانجیان لێك بڵاوکردنی مسوڵمانان و لەتکردنی ڕیزەکەیانەو، ئەو

دامەزراوە بە ڕواڵەت ئیسلامییانەی خۆشیان، دەکەنە کانگایەك بۆ سیخوڕیی بۆ دوژمنانی ئیسلام: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٠٧ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ ١٠٨ ﴾**التوبة**، دابەزێنرانی ئەم ئایەتانەش وەك زۆربەی ئایەتەکانی (**التوبة**) بەسەرهاتێکی هەیە:

کابرایەك هەبوو بە ناوی (**أبو عامر الرَّاهب**) کە موونافیق بوو، مزگەوتێکی لەنێو خەڵکەکەی خۆیدا دروست کردو کردی بە مۆڵگەیەك بە سیخوڕییکردن بە قازانجی ڕۆمە نەصڕانییەکان و، موونافیقەکان لەگەڵی لەو مزگەوتەدا کۆ دەبوونەوە، هەروەها هەندێك خەڵکی دیکەی سادە یاخود دڵنەخۆش، بە ڕواڵەت نوێژیشیان تێدا دەکرد، بەڵام لە ئەسڵدا مۆڵگەیەك بوو هەم موونافیق و دڵنەخۆشەکانی نێوخۆ، هەم لانەیەکی سیخوڕییش بوو بۆ ڕۆم و نەصڕانییەکان.

**٦٩-** کاتێك ڕاستییەکانی ئیسلام لە میانی دابەزینی ئایەتەکانی قورئان دا دەدرەوشێنەوە، ئەو موونافیق و دەغەڵانە، بە قیاس لەسەر خۆکردن و لە هەمبانەی خۆدا گوێز ژماردن، گاڵتە دەکەن بە ئەهلی ئیمان و دەڵێن: کامەتان ئەم سوورەتە ئیمانی زێدەکردن؟: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ ١٢٤ ﴾**التوبة**، کە بەدڵنیایی بڕواداران ئیمانیان زیاد دەکات، بەڵام وەك خوا ﷻ دەفەرمویّ، دڵنەخۆشەکان هەر نەخۆشیی و نیفاق لە دڵیان دا ڕۆدەچێ، بە هۆی زیاتر لە دژایەتییکردنی قورئانەوە، وەك خوا دەفەرمویّ: ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا ٨٢ ﴾**الإسراء**، لە قورئان دادەبەزێنین ئەوە کە مایەی شیفاو چارەسەرە بۆ بڕواداران، بەڵام بۆ ستەمکاران بەس زیانبارییان بۆ زیاد دەکات، هەروەها لە سوورەتی (**التوبة**)دا دەفەرمویّ: ئەوان لادان و نەخۆشیی لە دڵیان زیاد دەبێ: ﴿ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ ﴾ چونکە هەتا ئایەتێك زیاتر بێتە خوار، ئەوانیش پێشتر بێبڕوا بوون و، بەو ئایەتەش بێبڕوا دەبن و، بەوی دیکەش و بەوی دیکەش بێبڕوا دەبن، کەواتە بەردەوام بێبڕواییەکەیان زیاتر خەست و تۆخ دەبێتەوە.

**٧٠-** ئەوانە هێندە قەڵس و نارەحەتن بە بیستنی فەرمایشتی خواو ئاڕاستەکردنی قیادە، بۆیە بەپێی توانا هەوڵ دەدەن کە لە کۆڕو مەجلیسی ئیمانداراندا دانەنیشن، بەتایبەتی کە ئایەتیان تێدا دەخوێنرێنەوە: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾﴾**التوبة**، کاتێك سووڕەتێك دادەبەزێ، هەندێکیان تەماشای یەکدی دەکەن و دەڵێن: ئایا کەس دەتانبینێ؟ دوایی دەڕۆن، خوا دڵیان لابدا، چونکە کۆمەڵێکن تێناگەن.

**حەوتەم: لە سووڕەتی (النور)یشدا سێ (٣) سیفەتی دیکەی مونافیقەکان خراونەڕوو:**

**٧١-** بە هەر شێوازێك کە بۆیان بکرێ و بەهەر ئامرازێك، هەوڵ دەدەن لە سومعەو ئابڕوو و پێگەی قیادە کەم بکەنەوە، ئەگەر بە درۆ هەڵبستن و بوختان هەڵبەستنیش بێ بە هاوسەرو خێزانیان، وەك لە ئایەتەکانی (١١ - ٢٦) داهاتوە، ئەو شازدە (١٦) ئایەتە هەموویان بەبۆنەی ڕووداوی (**إفك**)، واتە: (بوختان هەڵبەستن) کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بوختانەکەی هەڵبەست، بەڵام بە شێوەیەك بوختانەکەی هەڵبەست، خۆی سزابار نەبێ و سزا لەسەری نەچەسپێ، ئەو شازدە ئایەتە لەوبارەوە هاتنە خوار، کە ئاوا دەست پێدەکات: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴿١١﴾﴾**النور**.

**٧٢-** هەروەها لە سیفەتی مونافیقەکان ئەوەیە لەبەرئەوەی هەمیشە لە ژینەگەیەکی پیس و قێزەون دا ژیاون و، لە ژینگەی پاك و تاعەت و چاکەکارییدا ناتوانن بژین، بۆیە هەمیشە هەوڵ دەدەن ئەو ژینگە پاکەی کۆمەڵگای ئیسلامیی تێکبدەن و، ئەو ئاوە ڕوونە لێڵ بکەن، وەك گوتراوە: (ڕاوچی خراپ لە ئاوی لێڵدا ڕاو دەکات) و (دز بازاڕی ئاڵۆزی دەوێ) وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَـٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾﴾**النور**، ئەوانەی دەیانەوێ پیسیی و خراپە بە نێو بڕواداراندا بڵاوبکەنەوە (ئنجا بوختانە،

درۆیە، غەیبەتە، گوناهی دیکەی کردەوەییە) ئەوانە ئازارێکی بە ئێشیان لە دنیاو دوارۆژدا هەیەو، خواش دەزانێ و ئێوە نازانن.

**٧٣-** ئەوانە کاتێك بانگ بکرێن بۆ لای شەریعەت کە دادوەرییان لە نێودا بکات، ناچن بۆ ئەو دادوەرییە، مەگەر بەرژەوەندیی خۆیانی تێدا ببینن، واتە: ئەگەر بزانن لە بەرژەوەندیی ئەواندا دادوەریی دەکرێ، دەچن و، ئەگەر بزانن ئەو دادوەرییە بەزیانیان تەواو دەبێ، ناچن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾**النور**.

## هەشتەم: لە سوورەتی (العنبکوت) دا سیفەتێکی دیکەیان خراوەتەڕوو:

**٧٤-** ئەوانە لە کاتێکدا لەسەر ئیسلام تووشی ئازارو مەینەتییەك دێن، بەپێی سیستمی خواش، ئیمانداران تاقی دەکرێنەوەو هەر کەسێك بڵێ: بڕوادارام، خوای پەروەردگار تاقی دەکاتەوە: ﴿ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓا۟ أَن يَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ ﴾**العنکبوت**، بەڵام ئەوانە کە بەڵاو نارەحەتییەکیان دێتەڕێ، بەڕواڵەت لەسەر خواو ئیسلام، پێیان وایە بەڵایەکی زۆر گەورەیان بەسەرهاتووەو، شتێکی زۆر گەورەیان لێ قەوماوە: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِىَ فِى ٱللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ﴿١٠﴾ ﴾**العنکبوت**، (ئەوە تەعبیرێکە خوا بۆ مونافیقەکانی بەکاردێنێ)، لە نێو خەڵکیدا کەسانێك هەن دەڵێن: بڕوامان بەخوا هێنا، بەڵام هەرکات لەسەر خوا تووشی ئازارو ئەزیەت کران، ئازاردانی خەڵکی وەك سزادانی خوا دادەنێن! هێندە بە گەورەو مەزن تەماشای دەکەن.

## نۆیەم: لە سوورەتی (الأحزاب)دا هەشت (٨) سیفەتی دیکەیان خراوەنەڕوو:

**٧٥-** کاتێك بە ناچاریی لەگەڵ بڕواداران دا دەچن بۆ جەنگ، هەر لەگەڵ جەنگەکە گەیشتە قایمەو گەرم بوو، لەو حاڵەدا ئەوەی لە نێو هەناوی ڕەشیاندا هەیە، لە

بوغزو بێزاریی و بێبڕوایی، دەری دەخەن، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢﴾ ﴾**الأحزاب**، یاد بکەوە! کاتێك مونافیقەکان و ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدا هەبوو گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی هەر فریودانیان بەڵێن بە ئێمە دابوو، فریویان داین کڵاویان لەسەر نایین، بۆیە گوتراوە: (**عِنْد الإمْتِحَان يُكْرَمُ المَرْءُ أَو يُهَان**)، لە کاتی تاقیکردنەوەدا، مرۆڤ یان ڕێزی لێدەگیرێ، یاخود ڕیسوا دەکرێ.

**٧٦-** لە گەرمەی جەنگدا دەیانەوێ ڕابکەن و دووربکەونەوە لە مەیدان، بەڵام لەژێر سایەی پۆزش و پاساوی بێهێزدا: ﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ ﴿١٣﴾ ﴾**الأحزاب**، کاتێك کۆمەڵێکیان گوتیان: ئەی خەڵکی **یەثریب!** بگەڕێنەوە بەرهەڵستییتان بۆ ناکرێ و، کۆمەڵێکیان مۆڵەت لە پێغەمبەر ﷺ وەردەگرن دەڵێن: ماڵەکانمان چۆڵن (دوژمن زەفەری پێ دەبات و هیچ شتێکی لێنیە ماڵەکانمان بپارێزێ) کە درۆشیان کردوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ ﴾**الأحزاب**، ماڵەکانیشیان چۆڵ نین، بەس دەیانەوێ ڕابکەن و دووربکەونەوە.

**٧٧-** تەنیا بەوەندەش وازناهێنن کە خۆیان دابنیشن و نەچن بۆ جەنگ و جیهاد، بەڵکو هەوڵ دەدەن خەڵکی دیکەش سارد بکەنەوەو، لەو بارەوە هەموو توانای خۆیان بەکاردەهێنن کە خەڵکی دیکەش پەك بخەن و سارد بکەنەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ ﴾**الأحزاب**.

**٧٨-** وەك چۆن لە کاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمن دا، زۆر ترسنۆکن، کاتێ پێویست بکات بشبەخشن، زۆر چرووکن، واتە: هەم بە بەختکردنی ڕووحیان چرووکن، هەم بە بەختکردنی ماڵیان، بە زۆرییش وایە هەر کەسێك چرووك بوو، ترسنۆکیشەو، ترسنۆکیی و چرووکییش پێکەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك دوو نەخۆشیی و بەڵا

پەنای لێگرتوون، بە خوا: (وأَعُوذُ بِكَ مِنَ الجُبْنِ وَالبُخْل[1])، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ﴿١٩﴾ ﴾الأحزاب.

٧٩- مونافیق و دەغەڵەکان کاتێك مەترسیی دێتە پێش، زمانیان گۆ ناکات، بەڵام کاتێك هێمنیی و ئاساییش دێتەوە گۆڕێ، زۆر زمان درێژن و زۆر بڵێن، قسە دەکەن و خۆیان هەڵدەکێشن: ﴿ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ ﴿١٩﴾ ﴾الأحزاب، ئەگەر ترس هات دەیانبینی لە ترسی مردنێ، وەك چۆن کەسێك بێهۆشیی مردنی دێتە سەر، ئاوا چاویان ئەبڵەق دەبن و دەسووڕێن، بەڵام کە ترس لاچوو، نشتەری تیژی زمانیان لە ئێوە دەدەن.

٨٠- کاتێك بەڵاو قەیران و ناڕەحەتیی لادەچێ، وا بەئاسانیی نایەنەوە قەناعەت کە ترسەکە لاچووە، ترس هێندە چۆتە دڵیانەوە، بەڵاو ترسیش لاچووەو دوژمنیش ڕۆیشتوە، ئەوان هەر بڕوایان نەکردوە: ﴿ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ﴿٢٠﴾ ﴾الأحزاب، پێیان وانیە کە کۆمەڵەکان، (کە بەبۆنەی جەنگی خەندەقەوە ئابڵووقەی مەدینەیان دابوو) ڕۆیشتوون.

٨١- کاتێك هەست بە مەترسییەك دەکەن، یاخود دەیبینن، خۆزگە دەخوازن کە لەو شارەی ئێوەدا دانەنیشتبانایە، بەڵکو زۆر دوور بووانایەو، لە دوورەوە هەواڵ و دەنگوباسی ئێوەیان پێگەیبایە: ﴿ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ﴿٢٠﴾ ﴾الأحزاب، ئەگەر حیزبەکان (کۆمەڵەکان لە دژی ئیسلام) بێن، خۆزگە دەخوازن کە هەر لە نێو عەڕەبە خێڵەکییەکان دا بوونایەو، لەوێوە هەواڵی ئێوەیان زانیبایە.

٨٢- ئەوانە وەك زیندەوەرو دڕندە زیانبەخشەکانن، هەمیشە ئازاری پێغەمبەری خواو بڕواداران دەدەن بە پیاوو ئافرەتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٨﴾ ﴾الأحزاب.

---

(١) متفق عليه.

**دەیەم: سوورەتی (محمد)یش چوار(٤) سیفەتی دیکەیان دەخاتەڕوو:**

**٨٣-** ئەوانە بەهۆی ئەوەوە کە هەمیشە سەریان قاڵەو، دڵیان بە دنیاوە پەیوەستە بەو بەرژەوەندییانەی کە لە دنیادا هەیانن، کاتێك دێن بۆ کۆڕو مەجلیسی قیادە، (ئەو کات پێغەمبەری خوا ﷺ و بە نسبەت دوای ئەویشەوە، ئەوانەی لە شوێنی پێغەمبەرن)، لەو کۆڕو مەجلیسەدا ئەوەی دەگوترێ، ئیستیعابی ناکەن و وەخۆی ناگرن، چونکە دڵیان لە شوێنێکی دیکەیە، بە کە لەش و قالب لێرەن، بەڵام دڵیان لە شوێنێکی دیکەیەو بە دنیاوە پەیوەستە، بۆیە دەپرسن: ئەرێ چی گوت؟ چونکە دڵیان لەوێ نیە: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ ﴾محمد.

**٨٤-** ئەوانە کاتێك کە پشت هەڵدەکەن (واتە: پاش دەکەنە ئیسلام) یاخود کاتێك بەرپرسیاریەتییەکیان پێ دەسپێردرێ و کارێکیان دەکەوێتە دەست، بیرناکەنەوە لە چاکەکەکردن لەگەڵ خزمان و چاکسازیی لە کۆمەڵگادا، بەڵکو ئامادەن هەموو پەیوەندییەکانی خزمایەتیی بپچڕێنن لەبەر سادەترین هۆکارو، هەمیشە خەریکی تێکدان و خراپەکارییـن، هەمیشە خۆپەرستن و خەریکی تێرکردنی غەریزەکانی خۆیانن، ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾محمد.

**٨٥-** ئەهلی نیفاق و دەغەڵیی لەبەرئەوەی کوفر زۆر بە ناخیاندا چۆتە خوارو، لەبەر ئەو هەڵوێستە خراپانەیان، هەمیشە هێزی دەرككردنیان، لە عەقڵ و دڵ و هەستەوەرەکان لە دیتن و لە بیستن، وەك پێویست کار ناکەن: ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾محمد.

**٨٦-** هەرچەندە زۆر هەوڵ دەدەن خۆیان بشارنەوەو پەنهان بکەن، بەڵام بابای عاقڵی وردبین، لە ئاوازو شێوازی قسەیانەوەو بەهۆی دەربڕینەکانیانەوە دەیانناسێ: ﴿ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ﴿٣٠﴾ ﴾محمد، بەهۆی ئاوازو دەربڕینەکانیانەوە دەیانناسی.

### یازدەیەم: سوورەتی (الفتح) یش سیفەتێکی دیکەیان باس دەکات:

٨٧- ئەوانە هەمیشە گومانیان بە بەرانبەر خوای مەزن خراپەو (گۆزەش چی تێدابێ ئەوەی لێدەڕژێ) ئەو گومانە خراپەش زۆر جۆرە شت دەگەیەنێ، ئەوانەش بەدڵنیایی شایستەی هەر جۆرە تەفسیرێکی ئەو گومانە خراپەن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ ﴿٦﴾ ﴾الفتح، (خوا دەیەوێ) مونافیقەکانی پیاوو ئافرەت و، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بە نێرو مێوە سزا بدا، ئەوانەی بەردەوام گومانی خراپ بە خوا بەرن.

پێشتر لە سوورەتی (**آلِ عمران**)دا خەسڵەتی ژمارە پازدە (١٥)، ئەوە بوو کە مونافیقەکان گومانیان بەرانبەر بە خوای پەروەردگار خراپ بوو، بەڵام لەوێ باسی گومانی نەفامیی (**ظن الجاهلية**) کرا، بەڵام لێرەدا بەگشتیی باسی گومان خراپییان دەکات بەرانبەر بە خوا، کە گومانی نەفامیی، یەکێکە لە گومانە خراپەکان و، گومانی خراپ بەرانبەر خوا، بە زۆر شتی دیکەش دەگرێتەوە.

### دوازدەیەم: سوورەتی (الفتح)یش دوو سیفەتی دیکەیان باس دەکات:

٨٨و٨٩- دووانی دیکە لە سیفەت و ڕەفتارە خراپەکانی دڵنەخۆشەکان، بریتین لە: ١- هەمیشە دڵ بە گومان بوون، ٢- خۆ فریودان بە خۆزگەی شیرین و درۆزن: ﴿ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿١٤﴾ ﴾ **الحديد**، شوێنی مەبەستیشم ئەم ڕستەیە: ﴿ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ ﴾، ئێوە هەمیشە دوو دڵ بوون و، خۆزگەو ئاواتەکان فریویان دان.

### سێزدەیەم: سووڕەتی (المجادلة)ش پێنج سیفەتی دیکەیان باس دەکات:

٩٠- هەمیشە لە نێو خۆیاندا سرکە سرك و فسکە فسك و چپە دەکەن، بەشێوەیەك کە پێچەوانەی ڕەزامەندیی خواو پێغەمبەرەکەیەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَـٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ ﴿٨﴾ ﴾المجادلة.

٩١- کاتێك سڵاو لە قیادە دەکەن، بە ئەدەبی ئیسلامیی سڵاو ناکەن، بەڵکو بە شێوەی نەفامانە سڵاو دەکەن: ﴿ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٨﴾ ﴾المجادلة.

٩٢- ئەوانە هەمیشە بە گشتیی سەر بە ئەهلی کوفرن، بەتایبەت جوولەکەو نەصرانییەکان و، بە تایبەت لەگەڵ جوولەکەکان دا کەین و بەینی تایبەتیان هەیە: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ قَوْمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مَّا هُم مِّنكُمْ وَلَا مِنْهُمْ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾المجادلة.

٩٣- ئەوانە هەمیشە سوێندە درۆیەکانیان دەکەنە قەڵغان و سوپەرێك لەسەر سەری خۆیان و، هەر کاتێك نیەتێکی خراپ و نیازێکی خراپ و پیلانێکیان ئاشکرا دەبێ، دەیانەوێ سوێندی بە درۆکە بکەنە پۆششێك و قەڵغانێك و خۆیانی لەژێردا پەنهان بکەن: ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَيْمَـٰنَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿١٦﴾ ﴾المجادلة.

٩٤- ئەوانە کۆمەڵێکن شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووە، بە شێوەیەك کە خستوونیەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو، یادی خوای لەبیر بردوونەوەو، بوون بە کۆمەڵی شەیتان: ﴿ ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ فَأَنسَىٰهُمْ ذِكْرَ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱلشَّيْطَـٰنِ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿١٩﴾ ﴾المجادلة.

### چواردەیەم: سووڕەتی (الحشر)یش پێنج سیفەتی دیکەیان باس دەکات:

٩٥- هەمیشە گفت و بەڵێنی جۆراوجۆر بە ئەهلی کوفر دوژمنانی ئیسلام و مسوڵمانان دەدەن، بەڵام کاتێك دەکەونە تەنگانەو سەغڵەتییەوە، لەو گفت و بەڵێنانەیان پەشێمان دەبنەوە: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ يَقُولُونَ لِإِخْوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَئِنْ أُخْرِجْتُمْ لَنَخْرُجَنَّ مَعَكُمْ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمْ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلْتُمْ لَنَنصُرَنَّكُمْ وَٱللَّهُ

﴿يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١١ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ١٢﴾الحشر.

**٩٦-** مونافیقەکان هەمیشە شانازیی دەکەن بەسەر ئەهلی ئیسلامدا لە کاتی ئاشتییداو، خۆیان بەسەردا هەڵدەکێشن، بەڵام کاتێك دەکەونە ترسەوە، هێندە لە مسوڵمانان دەترسێن، زیاتر لەوەی لە خوا دەترسێن: ﴿لَأَنتُمۡ أَشَدُّ رَهۡبَةٗ فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ١٣﴾الحشر.

**٩٧-** ئەوانە بوێریی ئەوەیان نیە لەگەڵ بڕواداران دا لە مەیدانێكی ئاشكرادا ڕووبەڕووببنەوە، بەڵكو تەنیا لە پشت دیواران و لە نێو قەڵاو شوێنی مەحكەمدا: ﴿لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى مُّحَصَّنَةٍ أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭۚ ١٤﴾الحشر.

**٩٨-** لە نێو خۆیاندا زۆر بەهێزو خاوەن زەبرن، بەڵام كاتێك لەگەڵ مسوڵمانان دا ڕووبەڕوودەبنەوە، زۆر بێهێزو پێزن: ﴿بَأۡسُهُم بَيۡنَهُمۡ شَدِيدٞۚ تَحۡسَبُهُمۡ جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰ ١٤﴾الحشر.

**٩٩-** كە تەماشایان دەكەی، پێت وایە زۆر بەهێزو پێزو تۆكمەو توندو تۆڵن، بەڵام دوایی كە لە مەیداندا تاقییان دەكەیەوە، دەزانی زۆر پەرش و بڵاون و هەر یەكەیان دڵی لە شوێنێكە: ﴿تَحۡسَبُهُمۡ جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ١٤﴾الحشر.

### پازدەیەم: لە سووڕەتی (المنافقون)دا هەشت سیفەتی دیكەیان باس دەكات:

**١٠٠-** مونافیقەكان لەبەرئەوەی ئیمانیان نیە، بۆیە ناچار دەبن بە خۆ بە مسوڵمان پیشان دان، لافی گەورە گەورە لێبدەن: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ ١﴾المنافقون، كاتێك مونافیقەكان دێنە لات دەڵێن: شایەدیی دەدەین (واتە: زۆر ئیمانێكی مەحكەممان هەیە) كە تۆ پێغەمبەری خوای (لە حاڵێكدا كە درۆش دەكەن).

**١٠١-** ئەوانە هەموو ئامانج و مەبەستیان ئەوەیە كە خەڵك لەڕێی خوا لابدەن: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٢﴾المنافقون.

**١٠٢و١٠٣-** ئەوانە ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێرانن، قسەیان خۆشە، بەڵام بۆشە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ ﴿٤﴾﴾ المنافقون.

**١٠٤-** لەبەرئەوەی ئەوانە پەرێزیان پاك نیە، هەمیشە لە ترس و دڵەڕاوكەدان، وەك گوتراوە: خیانەتكار ترساوە: (**الخائنُ خائفٌ**): ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ ﴿٤﴾﴾ المنافقون.

**١٠٥-** كاتێك بابایەكی دڵسۆز بانگیان بكات بۆ گەڕانەوەو، خۆ پاككردنەوەو داوای لێبوردن بۆ كران لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، مل بادەدەن: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴿٥﴾﴾ المنافقون.

**١٠٦-** یەكێك لە پیلانەكانی مونافیقەكان ئەوەیە كە لە ڕووی بژیوەوە دژایەتیی مسوڵمانان بكەن و، هەوڵ بدەن ئابڵووقەی ئابووریيان بخەنە سەرێ، تاكو بڵاوبن و لەبەر بێ ئیمكانیەتیی، لە دەوری قیادە بپرژێن: ﴿هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا ﴿٧﴾﴾ المنافقون.

**١٠٧-** مونافیقەكان ئەگەر بۆیان بكرێ و بۆیان هەڵسووڕێ، دەیانەوێ مسوڵمانان و بڕواداران هەر شاربەدەر بكەن، بۆ ئەوەی شار بۆ خۆیان چۆڵ بێ و ئەوان لەگەڵیاندا نەمێنن، تاكو چیدیكە عەیب و عارو كەم و كوڕییەكانیان دەرنەكەون: ﴿يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾﴾ المنافقون.

## بڕگەی چوارەم: پێنج سەرنج لەبارەی نیفاق و مونافیقەكانەوە:

**١-** حیكمەتی ئەوە كە خوا ﷻ بە درێژیی باسی سیفەتی مونافیقەكانی كردووەو باش تیشكی خستوونەسەر، ئەوەیە كە مونافیقەكان خۆیان بە مسوڵمان پێشان دەدەن، بەڵام كوفر پەنهان دەكەن، بۆیە بۆ پەی پێبردن و ناسینیان، پێویستە تیشكی زۆریان بخرێتە سەر، بەڵام بابای بێبڕوا دیارو ئاشكرایە.

٢- کەم وایە لە هیچ کۆمەڵگایەکدا حاڵەتی نیفاق و دیاردەی نیفاق و دەغەڵیی دەربکەوێ، مەگەر مسوڵمانان جۆرێك لە دەسەڵات و هەیبەتیان هەبێ، مەرج نیە دەوڵەتیان هەبێ، بەڵام مسوڵمانان دەبێ هەیبەت و هێزو پێزێکیان هەبێ، ئنجا کافرەکان ناچار دەبن خۆیان بە مسوڵمان پێشان بدەن و بکەونە حاڵەتی نیفاق و دەغەڵیی و دووڕووییەوە.

٣- مەرج نیە هەر کەسێك یەکێك لەو سەدو حەوت (١٠٧) سیفەتەی تێدابێ، لە بازنەی ئیسلام و ئیمان دەرچووبێ، چونکە جاری وایە مسوڵمانیش گیرۆدەو گرفتار دەبێ بە یەکێ لە سیفەتەکانی مونافیقەکانەوە.

٤- ئەگەر بویسترێ کۆمەڵگای ئیسلامیی پارێزراو بێ لە کاریگەریی خراپی مونافیقەکان، پێویستە دوو شت بکرێن:

أ- تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە شارەزابن بە زانستی شەرعیی وەرگیراو لە قوڕئان و سوننەت، کە لە نێویدا (لە نێو ئەو زانستە شەرعییەدا) بریتیە لە شارەزابوون لە مونافیق و دەغەڵەکان.

ب- پێویستە تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە مەحکەم بن لەڕووی دینداریی و تەقواوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ١٠٥﴾ **المائدة**، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔا ١٢٠﴾ **آلِ عمران**.

٥- لەبەرئەوەی نیفاق خراپترین جۆری کوفرەو، مونافیقەکان خراپترین جۆری کافرەکانن و بەزەڕترینیانن بەرانبەر ئیسلام و مسوڵمانان و، چونکە نیفاق بەرهەمی زۆر خراپی هەن، بۆیە مسوڵمانان پێویستە زۆریان لێ وریا بن و، زۆریش وریا بن لە هەموو ئەو خەسڵەتانەی مونافیقەکانیان پێ پێناسەکراون، خۆیانیان لێ دووربگرن و، بەدڵنیایی تاکو مسوڵمانانیش زیاتر ئەهلی ئیمان بن و ئەهلی تەقوا بن، لە سیفەت و ڕەوشت و ڕەفتارو هەڵوێستەکانی مونافیقەکانیش دوورتر دەبن.

## بڕگەی پێنجەم: چوار مەرجی سەرەكیی بۆ تۆبەكردنی مونافیقەكان:

خـوا ﷻ چـوار مەرجـی دانـاون بـۆ هـەر كەسـێك لـە مونافیقـەكان، كـە بیـەوێ دەستبەرداری نیفاق بێت و وازی لێبهێنێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾﴾ النساء، واتـە: بـە دڵنیایـی مونافیقـەكان لـە پلـەی ژێـرەوەی ئاگـری دۆزەخـدان و، هیـچ پشـتیوانێكت بـۆ ئـەوان چنـگ ناكـەوێ، جگـە لەوانـەی گەڕاونـەوەو، چاكسـازییان كـردوەو، دەسـتیان بـە خـواوە گرتـوەو، ملكەچیـی خۆیانیـان بـۆ خـوا سـاغ كردۆتـەوە، ئەوانـە لەگـەڵ بڕوادارانـن و، خـوا لەمـەودوا بەدڵنیایـی پاداشـتێكی مـەزن دەداتـە بـڕواداران.

كەواتـە: خـوای پـەروەردگار چـوار مەرجـی دانـاون، بـۆ تۆبـەو گەڕانـەوەی مونافیقـەكان، چونكـە دەرد هەتـا قورسـتر بـێ و كوشـندەو بەزەڕتـر بـێ، پێویسـتە چارەسەریشـی وردو قـووڵ و ئاوێتـە بـێ.

ئەمانەش چوار مەرجەكانن:

١- بە كردەوە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، واتە: واز لە گوناهو تاوان و سەرپێچیی و دەغەڵیی بێنن، ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟﴾ مەگەر ئەوانەی گەڕاونەوە.

٢- ئەگەر هەتا ئێستا خراپەو تێكدانیان كردوە لەنێو كۆمەڵگاداو، بەڵابوون و دەردو خۆركە بوون، لەمەودوا چاكسازیی بكەن: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟﴾ هەروەها چاكسازییان كردوە.

٣- ئەگەر تاكو ئێستا دەستیان بە شتی دیكەوە گرتوە، بە دۆستایەتیی جوولەكەو نەصرانیی و ئەهلی كوفرو ئیلحادەوە، لەمەودوا تەنیا دەست بە خواوە بگرن: ﴿وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ﴾، دەستیان گرتوە بە خواوە.

٤- ئەگەر تاكو ئێستا دەغەڵ و موخەننەت و دڵنەخۆش بوون، لەمەودوا ساغ و پاك و چاك بن: ﴿وَأَخْلَصُواْ دِينَهُمْ لِلَّهِ﴾، ملكەچیی خۆیانیان بۆ خوا ساغ كردۆتەوە.

خـوا بـە لوتـف و كەرەمـی خـۆی ئێمـە بپارێـزێ لـە هەمـوو ئـەو خەسـڵەت و ڕەوشـت و ئـاكارو هەڵوێسـتانەی، مونافیقەكانـی پـێ پێناسـە كـردوون، هێنـدە بەصیرەت و بەرچاوڕوونییـمان پـێ بـدات، كـە مونافیق و دڵنەخۆشـەكان كـە گورگن لـە پێستی مـەڕدا، بناسـین و، وریـا بیـن نەتوانـن فێڵـمان لێبكـەن و، هەڵمانخەڵەتێنن و كڵاومـان لەسـەر بنێـن.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

# دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٦)ی ڕەمەزانـی ساڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر: (٢٠٢٠/٥/٩) زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوای بەخشـەرو میهرەبـان پشـتیوانمان بـێ، دەست دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**التَّغَابُـن**)، سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـەڕوو، بـۆ ئـەوەی بـەر لـەوەی بچینـە نێـو وردەکارییـەکانی شـیکردنەوەو ڕوونکردنـەوەی مانـاو مەبەسـتی ئایەتـە بەپێـزەکانی ئـەم سـوورەتە، چوارچێـوەو هێڵـە گشـتییەکانی ئـەم سـوورەتەمان لەبەرچاوبـێ.

## پێناسەی سوورەتی (التَّغَابُن) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە تەنیا بـە نـاوی (**سـورة التَّغَابُـن**)، نـاسراوەو، هیـچ ناوێکـی دیکـەی بـۆ نەزانـراوە، هۆیەکەشـی ئەوەیـە کـە وشـەی (**التَّغَابُـن**)، تەنیـا لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا هاتـوە، ئـەوە هەمـوو زانایـان لەسـەری یەکدەنگـن و لـە هەمـوو تەفسـیرەکاندا هـەروا گوتـراوە، لـە هەمـوو موصحەفەکانیشـدا بـە کـۆن و تـازەوە، ئـەم سـوورەتە ئـەم نـاوەی بـۆ بەکارهێنـراوە.

## دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

زۆربەی زانایان ڕایان وایە ئەم سوورەتە لە مەدینە دابەزیوەو مەدینەییە، بەڵام لە (**الضحاك**)، کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین و، هەندێك لە زانایانی دیکەوە هاتوە، کە لە مەککە دابەزیوە، (**الكلبي**)یش، کە یەکێکە لە زانایان گوتوویەتی: (**هِي مَدَنِيَّة وَمَكِيَّةٌ**)، ئەم سوورەتە، هەم مەدینەییە، هەم مەککەییە.

بەڵام ڕای ڕاست هەر ئەوەیە کە ئەم سوورەتە هەمووی مەدینەییە، وەك دوایی لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئایەتەکانی: (١٤ - ١٨)ەوە، باس دەکەین و، هەر کام لە (**ابن الضريس و ابن مردويه والبيهقي**)، لە (**دلائل النبوة**)دا، لە (**ابن عباس**)ەوە، هێناویانە کە گوتوویەتی: (**نَزَلَتْ سُورَة التَّغَابُن بِالمَدِيْنَة**)، سوورەتی (**التَّغَابُن**)، لە مەدینە دابەزیوە، هەروەها (**ابن مردويه**)یش، لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو ئیبنو عەبباسەوە (خوا لە خۆیان و باییان ڕازی بێ) هێناویەتی کە ئەم سوورەتە لە مەدینە دابەزیوە، وەك (**السيوطي**)، بە نسبەت هەردوو ڕایەکان لە (**الدرُّ المنثور في التفسير بالمأثور**: ج ٨، ص١٨١)دا، هێناویەتی، هەروەها (**فتح القدير للشوكاني: ج ٥، ص ٢٨٤**)یش، ئەوانەی گوتمانن، نەقڵی کردوون.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و لە موصحەفدا:

لە دابەزیندا ڕیزبەندییەکەی بریتیە لە (١٠٧)، واتە: (١٠٧)مین، سوورەتە دابەزیبێ لە ڕووی کاتی دابەزینەوە، پێش سوورەتی (**الصف**)و، دوای سوورەتی (**الجمعة**)، ئەمە بەپێی سەرژمێری جابیری کوڕی زەیدو ژمارەیەکی زۆر لە زانایان، لە موصحەفیشدا ژمارەکەی (٦٤)ە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتەکانـی بـە یەکدەنگیـی ژمێرەرانـی ئایەتـەکانی قوڕئـان هـەژدە (١٨)یـە، هیـچ کەسـی دیکـە نەیگوتـوە (١٧)یـە، یاخـود (١٩)یـە، هەموویـان لەسـەر ژمـارە (١٨)، یەکدەنگـن.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە ژمارەیەکـی زۆر بابەتـی جـۆراو جـۆری گرتوونـە خۆی، کـە سـەرجەم شـانزە (١٦)، بابەتـن، هەشـتیان لـە (١٠) ئایەتـی پێشـەوەداو، هەشـتی دیکەشـیان لـە (٨)، ئایەتـی دوایـی دا، چونکـە ئێمـە دوایـی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە دەکەینـە دوو دەرس، لـە دەرسـێکیاندا (١٠) ئایەتـی یەکـەم و، لە دەرسێکیشـیاندا (٨) ئایەتـی دووەم دەتوێژینـەوە، لەوێـش لـە کاتی هێنانـی دەرسـەکاندا ئامـاژە دەکەیـن، بـە هـەر کام لـەو دوو هەشـت بابەتـە، کـە بـە هەموویـان شـازدە (١٦)، بابەتـن.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:

تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە، چوار تایبەتمەندییمان لێ هێناون:

١- تەنیا لەم سووڕەتەدا وشەی (**التَّغَابُن**) هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٩)دا.

٢- تەنیا لەم سووڕەتەدا ئەم تەعبیرە هاتوە: ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان لافیان لێدا بەدرۆ، وایانزانی زیندوو ناکرێنەوە.

٣- تەنیا لەم سووڕەتەدا ئەم تەعبیرە هاتوە: ﴿ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك بڕوا بە خوا بێنێ، خوا دڵی ڕاستە ڕێ دەکات.

٤- تەنیا لەم سووڕەتەدا ئەم تەعبیرە هاتوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، بە

دڵنیایی لە ژنەکانتان و لە منداڵەکانتاندا دوژمن هەیە بۆ ئێوە، واتە: هەندێك لە ژن و منداڵەکانتان بەشێوەیەك مامەڵەتان لەگەڵدا دەکەن، وەك مامەڵەی دوژمن لەگەڵ دوژمن و زیانتان لێ دەدەن، بۆیە لێیان وریابن.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە کۆی هەژدە (١٨) ئایەتەکانی ئەم سووڕەتەمان، بۆ دوو دەرس دابەشکردوون:

**دەرسی یەکەم:** لە دە (١٠)، ئایەتی سەرەتا پێك دێ، کە وەك گوتمان: هەشت بابەتی گرنگیان تێدا خراونەڕوو، هەشت بابەتی جۆراو جۆر:

بابەتی یەکەم: کە لە ئایەتی ژمارە (١)دا، هاتوە، ئەوەیە کە خوا ڕایگەیاندوە، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدا هەیە، بە پاکگرتن و بەبێ خەوش دانانی خوا، ڕادەگەیەنێ و، هەرچی حوکمڕانیی و هەرچی ستاییش هەیە، تەنیا هی خوایەو لەسەر هەموو شتێکیش بەتوانایە.

بابەتی دووەم: لە ئایەتی ژمارە (٢)دا خراوەتەڕوو، ئەویش ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: خوا ئێوەی وەدیهێناوە، ئنجا هەتانە بێبڕوایەو هەشتانە بڕوادارە.

بابەتی سێیەم: لە ئایەتی ژمارە (٣)دا، خراوەتەڕوو کە خوا ﷻ ئەوەی خستۆتەڕوو: خوا ئاسمانەکان و زەوی بەهەق خوڵقاندوون و، وێنەی ئێوەشی کێشاوەو بەباشترین شێوە وێنەتانی کێشاوە.

بابەتی چوارەم: لە ئایەتی ژمارە (٤)دا، خراوەتەڕوو، کە خوا دەفەرموێ: خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە دەیزانێ و، دەزانێ چی دەشارنەوەو چی ئاشکرا دەکەن و، بەنهێنیی نێو سینەکانیش ئاگادارە.

بابەتی پێنجەم: لە ئایەتەکانی: (٥ و ٦)دا، خوای بەرزی مەزن ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، کە گەلانی بێبڕوای ڕابردوو، سزای سەرەنجامی شوومی کاری خۆیانیان چێژت، بەهۆی ئەوەوە کە پێغەمبەرەکانیان **(عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)**

کـە بەڵگـە ڕۆشـنەکانیان بـۆ هێنابـوون، ئـەوان بەبیانـووی ئـەوەی مرۆڤـن، دەیانگـوت: ﴿أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا ﴿٦﴾﴾، چـۆن مـرۆڤ دەبـێ ڕێنمایـی ئێمـە بـکات؟ بۆیـە بێبـڕوا بـوون و پشـتیان هەڵکـرد، خـواش ﷻ لێیـان بێنیـاز بـوو.

بابـەتی شەشـەم: لـە ئایـەتی ژمـارە (٧)دا، خراوەتـەڕوو: خـوا ﷻ باسـی لافلێـدانی بێبڕوایـەکان دەکات کـە گوتوویانـە: بـە دڵنیایـی هەڵناسـتێنرێینەوەو زینـدوو ناکرێینـەوە، خـوای پەروەردگاریـش لـەوەدا بەدرۆیـان دەخاتـەوەو، سـوێندیان بـۆ دەخـواو دەفەرمـوێ: بڵـێ: بـا سـوێند بـە پـەروەردگارم زینـدوو دەکرێنـەوەو دواییـش بـەوەی کردووتانـە هەواڵتـان پـێ دەدرێ، ئـەوەش لەسـەر خـوا ئاسـانە.

بابەتـی حەوتـەم: لـە ئایەتـی ژمـارە (٨)دا، خراوەتـەڕوو، کـە خـوا ﷻ فەرمـان دەکات: بـڕوا بێنـن بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی و بـەو ڕووناکییـەی دایبەزانـدوە، کـە مەبەسـت پێـی قورئانـە.

بابەتـی هەشـتەم: لـە هـەردوو ئایەتەکانـی: (٩ و ١٠)دا، خراوەتـەڕوو، ئەویـش ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ لـەڕۆژی کۆکرانـەوەدا، هەمـوو مرۆڤـەکان کـۆ دەکاتـەوەو ئـەو ڕۆژەش ڕۆژی تیـدا دۆڕانـە، واتـە: تیـدا زیانبارببـوونی بێبڕوایانـە، ئنجـا ڕایدەگەیەنـێ کە هـەر کەسـێ ئیمان بێنـێ و کـردەوەی بـاش بـکات، خـوا خراپەکانـی لـێ دەسـڕێتەوەو دەیخاتـە بەهەشـت، بـەڵام ئەوانـەی بێبـڕواو بـەدرۆ دانـەری ئایەتەکانی خـوان، ئەوانە هاوەڵـی ئاگـری دۆزەخـن و، بـە هەمیشـەیی تییـدا دەمێننـەوە.

**دەرسـی دووەم:** لـە هەشـت ئایەتـی کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە پێـك دێ، ئایەتەکانـی: (١١ - ١٨)، دیسـان لـەم هەشـت ئایەتـە موبارەکەشـدا، هەشـت بابـەت خراونەڕوو:

بابەتـی یەکـەم: ئەوەیـە کـە هـەر بەڵایـەك بەسـەر مـرۆڤ دێ، بـە مۆڵـەت و ویسـتی خوایـە، بـەڕێ پێدانـی خوایـەو، هـەر کەسـێکیش بـڕوا بەخـوا بێنـێ، خـوا دڵـی ڕۆشـن دەکات و ڕێنمایـی و ڕاسـتە ڕێ دەکات.

بابەتی دووەم: فەرمانكردنی خوای پەروەردگارە بە بڕواداران كە فەرمانبەریی خوا بكەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بكەن، ئەگەر پشتیشیان هەڵكرد، دڵنیابن كە پێغەمبەری خوا، تەنیا گەیاندنی پەیامی خوای لەسەرەو دوایی خۆیان بەرپرسیارن.

بابەتی سێیەم: كە لە ئایەتی ژمارە (١٣)دا، خراوەتەڕوو، ڕاگەیاندنی یەكتایی خواو تەنیا پەرستراوێتیی خوایە.

بابەتی چوارەم: خستنە ڕووی ئەو ڕاستییەیە كە بڕواداران دەبێ تەنیا پشت بە خوا ببەستن.

بابەتی پێنجەم: لە ئایەتەكانی: (١٤و ١٥)دا، خراوەتەڕوو، خوا ﷻ بە بڕواداران ڕادەگەیەنێ كە لە ژنەكانتان و لە منداڵەكانتاندا دوژمن هەیە بۆ ئێوە، واتە: هەندێك لە ژن و منداڵەكانی هەندێكتان، وا مامەڵە لەگەڵ مێردەكانیاندا دەكەن، وەك مامەڵەی دوژمن لەگەڵ دوژمن و، هەوڵدەدەن زیانیان پێبگەیەنن، هەڵبەتە زیانی ڕووحیی و مەعنەویی زیاتر، بەڵام زیانی دیكەش هەر دەگرێتەوە، وەك دوایی لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا باسی دەكەین، كە هەندێك لە ژنەكانی ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لە مەككە، ڕێیان لە مێردەكانیان گرت كە كۆچ بكەن بۆ مەدینەو هەر لە مەككە هێشتنیانەوەو، دوایی چ لەوێ مردبن لە مەنزڵگای كوفردا، چ دوا كەوتبن كە شارەزای ئیسلام بن، گرنگ ئەوەیە تووشی زیان بوون.

بابەتی شەشەم: ئەوەیە كە خوا ﷻ فەرمانمان پێ دەكات ئەوەندەی دەتوانین و هەتا پێمان دەكرێ، پارێز لە خوا بكەین و گوێڕایەڵ و فەرمانبەربین و، لەوەش كە خوا پێیداوین ببەخشین.

بابەتی حەوتەم: ئەوەیە كە خوا ﷻ هانمان دەدا بۆ بەخشین و، هاوكارییكردنی هەژاران و نەداران لەلای ئێمەوە، ناو دەبات بە قەرزی باش، دەفەرموێ:

﴿ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ ﴿١٧﴾ ﴾، ئەگـەر ئێـوە قـەرزی بـاش بـدەن بـە خـوا ﷻ، پاداشـتەکەتان بـۆ چەنـد بەرامبـەر دەکاتـەوە.

بابەتی هەشتەم: ئەوەیە کە خوا ﷻ خۆی بە چەند سیفەتێك پێناسە دەکات:

١- (شَكُورٌ)، سوپاسگوزار.

٢- (حَلِيمٌ)، هێدیی و مەند.

٣- ( عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ )، زانای پەنهان و ئاشکرا.

٤- (ٱلۡعَزِيزُ)، زاڵ و باڵا دەست.

٥- (ٱلۡحَكِيمُ)، کاربەجێ.

خوا ﷻ بەو پێنج سیفەتە خۆی پێناسە دەکات.

واتـە: ئـەو خوایـەی پێتـان دەفەرمـوێ: بەندایەتیـی بـۆ بکـەن و فەرمانبەریـی خـۆی و پێغەمبەرەکـەی ﷺ بکـەن، ئەوانـە سـیفەتەکانی، کـە بێگومـان بەشـێکن لـە سـیفەتە بـەرزو پەسـندە بـێ سـنوورەکانی، نـەک هەموویـان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە دە ئایەتەكانـی: (١ - ١٠)، لـە دە (١٠) ئایـەتی پێشـەوەی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە پێـك دێ، لـەو دە (١٠) ئایەتـەش دا، وەك پێشـتریش گوتمـان: هەشـت بابەتـی جـۆراو جـۆر خراونـەڕوو:

١- ڕاگەیاندنی بە پاكگیرانی خوا لەلایەن هەرچییەك كە لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، لە ئایەتی یەكەمدا.

٢- ناساندنی خوا بەوە كە بەدیهێنەری هەموو لایەكە، بە بێبڕواو بڕوادارەوە، لە ئایەتی دووەم دا.

٣- ڕاگەیاندنی ئەوە كە خوا ئاسمانەكان و زەوی بە هەق و حیكمەت دروستكردوون، بە باشیش وێنەی مرۆڤانی كێشاوە، لە ئایەتی سێیەم دا.

٤- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە خوا هەموو شتێك دەزانێ بە پەنهان و ئاشكراوە، تەنانەت بیرو خولیایەكانی نێو دڵ و مێشكیش دەزانێ، لە ئایەتی چوارەم دا.

٥- سەرنجڕاكێشانی مرۆڤان بۆ مێژووی گەلانی كافر، كە نكووڵییان لە مرۆڤ بوونی نێردراوانی خوا كردوەو، سەرەنجام خوا ﷻ سزای داون، لە ئایەتەكانی (٥ و ٦)دا.

٦- بەرپەرچدانەوەی لافلێدان و گومانی نكووڵیلێكەرەكانی هاتنی قیامەت و، زیندووكرانەوەو، سزاو پاداشتدرانەوە، لە ئایەتی حەوتەم دا.

٧- فەرمانكردنی خوا بە ئیمان هێنان بە خواو بە پێغەمبەرەكەی و ڕۆشنایی دابەزێنراوی، كە بە دڵنیایی مەبەست پێی قورئانە، لە ئایەتی هەشتەم دا.

٨- بابەتی هەشتەم و كۆتایی كە لە ئایەتەكانی: (٩ و١٠)دا، خراوەتەڕوو، باسی ڕۆژی تێدا دۆڕان و زیانباربوونی كافران، كە بڕواداران بە بەهەشتەكانی خوا شاد دەبن و، بێبڕوایانیش دەبنە هاوەڵی ئاگری دۆزەخ و، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ ۚ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ ۚ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن لَّن يُبْعَثُوا۟ ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلْنَا ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ ٱلْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٠﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. هەرچی لە ئاسمانەكان و هەرچی لە زەویدایە، خوا بە پاك و بێخەوش دەگرێ، حوكمڕانیی و باڵادەستیی تەنیا هی ویەو، ستاییش بەس بۆ ویەو، ئەو لەسەر هەموو شتێك توانایە ﴿١﴾ ئەو كەسێكە ئێوەی دروستكردوە، ئنجا هەتانە بێبڕوایەو هەتانە بڕوادارەو، خواش بینەری ئەوەیە كە دەیكەن ﴿٢﴾ ئاسمانەكان و زەوی بەهەق (و حیكمەت) هێناونە دی و، وێنەتانی باش و جوان كێشاوەو، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای ویە ﴿٣﴾ هەرچی لە ئاسمانەكان و زەوی دایە، دەیزانێ و، ئەوەی پەنهانی دەكەن

و ئـەوەی ئاشـکرای دەکـەن، دەیزانـێ و، خـوا بـە (نهێنیـی) خـاوەنی سـینەکان زانـاو ئـاگادارە ﴿٤﴾ ئایـا هەواڵـی ئەوانەتـان بـۆ نەهاتـوە کـە لەمـەو پێـش بێبڕوابـوون، سـزای سـەختی کاری خۆیانیـان چێـژت و (لـە ڕۆژی دواییـش دا) ئازارێکی بە ئێشـیان هەیـە؟ ﴿٥﴾ ئـەوەش بەهـۆی ئـەوەوە کـە پێغەمبەرەکانیـان بەڵگـە ڕۆشـنەکانیان بـۆ هێنـان، کەچـی (بەسەرسـووڕمانەوە) گوتیـان: ئایـا مرۆڤـەکان ڕێنماییـمان دەکـەن؟ ئنجـا بێبڕوابـوون و پشـتیان هەڵکـرد، خـواش بێنیـازی ستاییشـکراوە ﴿٦﴾ ئەوانـەی بێبـڕوان (بـە گومـان و درۆ) پێیـان وایـە (لـە دوای مـردن) هەڵناسـتێنرێنەوە! بلـێ: بـا سـوێند بـە پـەروەردگارم بـە دڵنیایـی هەڵدەسـتێنرێنەوە (و دەژیەنرێنـەوە) دوایـی هەواڵـی ئەوەتـان پێـدەدرێ (لـە لایـەن خـواوە) کـە کردووتانـەو، ئـەوەش (کارێکـە) لەسـەر خـوا سـێنایە ﴿٧﴾ کەواتـە: بـڕوا بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی ئـەو ڕووناکییـەی دامانبەزانـدوە بێنـن و، خـواش شـارەزای ئەوەیـە کـە دەیکـەن ﴿٨﴾ (یـاد بکەنـەوە!) کاتێـك لـە ڕۆژی کۆکردنـەوەدا کۆتـان دەکاتـەوە، ئـەوە ڕۆژی (بردنـەوەی بـڕواداران و) دۆڕانـدن (ی بێبڕوایـان)ەو، هـەر کەسـیش بـڕوای بـە خـوا بـێ و کـردەوەی چاکـە بـکات، (خـوا) خراپـەکانی لـێ دەسـڕێتەوەو، دەیخاتـە باخانێکـەوە ڕووباریـان بەبـەردا دەڕۆن، بـە هەمیشـەیی تێیانـدا هەرمـاو دەبـن، ئـەوەش بردنـەوەی مەزنـە ﴿٩﴾ ئەوانـەش کـە بێبڕوابـوون و نیشـانەکانمانیان بـە درۆ دانـاون، ئەوانـە هـاوەڵانی ئاگـر (ی دۆزەخ)ن بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەبـن و (ئـەو دۆزەخـە) خراپتریـن سەرەنجامیشـە ﴿١٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ): (ذَات: مُؤَنَّثُ ذُو، بِمَعْنَى صَاحِب)، (ذَات): مێینەی (ذو)یە، (ذو)، یانی: (صَاحِب) و (ذَات)، یانی: (صَاحِبَة)، (ذَات الصُّدُور)، یانی: (صَاحِبَة الصُّدُور)، خوا ﷻ ناوی لە نهێنییەكانی نێو دڵەكان ناوە (صَاحِبَة الصُّدُور)، (صَاحِبَة)ش هەم بە مانای هاوەڵ دێ، هەم بە مانای خاوەن دێ، واتە: نهێنییەكان هەمیشە لەگەڵ سینەكاندان و لێیان جیانابنەوە، یاخود وا لە نێو سینەكاندا چەسپاون، وەك بووبنە خاوەنی دڵ و سینەكان.

(نَبَؤُاْ): ﴿نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُ فَذَاقُواْ﴾ (نَبَأ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَة عَظِيْمَة يَحْصلُ بِه عِلْمٌ أَو غَلَبَةُ ظَنٍ)، (نَبَأ): هەواڵێكە سوودێكی مەزنی هەبێ، بە هۆی ئەو هەواڵەوە زانیارییەكی جێی دڵنیایی، یاخود گومانێكی زاڵ پەیدا ببێ.

(وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ): سەرەنجامی شوومی كارەكەیان، (الوَبْلُ وَالوَابِلُ: المَطَرُ الثَّقِيْلُ القِطَار)، (وَبْلُ و وَابِل): هەردووكیان بە بارانی دڵۆپە قورس دەگوترێن، (القِطَار: جَمْعُ قَطْرَة)، (قِطَار) كۆی (قَطْرَة)یە، دڵۆپەی قورس، هەروەها (وَبَال)، بە مانای قورسیی و سەختییش دێ، (وَقِيْلَ لِلأَمْرِ الَّذِي يُخَافُ ضَرَرُهُ: وَبَال)، كارێك مەترسیی لە سەرەنجامەكەی بكرێ، پێی گوتراوە: (وَبَال)، دەگوترێ: (طَعَامٌ وَبِيْل، وَكَلأ وَبِيْل: يَخَافُ وَبَالُه)، لەوەڕێك و خواردنێك كە سەرەنجامەكەی خراپ بێ و جێی مەترسی بێ، دەگوترێ: (كَلأ وطَعَامٌ وَبِيْل)، كە بخۆرەكە لە ئەنجامی خواردنیدا تووشی زەرەرێك ببێ، هەروەها لەوەڕێك ئاژەڵێك دەیخوات ئەگەر جێی مەترسیی بێ، پێی دەگوترێ: (كَلأ وَبِيْل)، لەوەڕێكی جێی مەترسیی.

كەواتە (وَبَالَ)، ئەوە ڕیشە زمانەوانییەكەیەتی، بەڵام خوای پەروەردگار بەكاری هێناوە بە مانای سەرەنجامی خراپ، ﴿فَذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ﴾، چێژتیان سزای سەرەنجامی دژوارو خراپی خۆیانیان چێژت.

(أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا ): (البَـشَرُ: الإنْسَـانُ للوَاحِـد وَالجَمْـع إذَا اعْتُـبِرَ فِيْـه ظَاهِـرُه وَجِثَّتُـهُ)، مـرۆڤ پێـی دەگوتـرێ: بەشـەر، وشـەی بەشـەر وەك ئینسان بـۆ تـاك و بـۆ كـۆش بـەكاردێ، بەشـەریش بـۆ تـاك و بـۆ كـۆ بـەكاردێ، بـەڵام لـەو ڕووەوە پێـی دەگوتـرێ بەشـەر، كـە كەلەشـە ڕواڵەتەكـەی و پێستەكەی، ڕەچاو بكرێ تێیدا، هـەروەك كـە دەگوتـرێ: ئینسـان لـەو ڕووەوەیـە كـە ئولفـەت لەگـەڵ گیـراوەو هۆگریـی لەگـەڵ هاووێنەكانـی خۆیـدا دەگـرێ، ئینسـان لـە (أُنْـس)ەوە، هاتـوە.

(زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ): ئەوانـەی بێبـڕوان لافیـان لێـدا و گومـان و بۆچوونیـان وابـوو، (الزَّعْـمُ: حِكَايَـةُ قَـوْلٍ يَكُـونُ مَظِنّـةً لِلْكَـذِبِ)، (زَعْـم): بریتیـە لـە گێڕانـەوەی قسـەیەك مەزەننـەی درۆی لێبكـرێ، زیاتـر وشـەی (زَعْـم)، بـۆ قسـەیەك كـە درۆ بـێ، یـان بـۆ لافلێدانێـك كـە ناڕاسـت بـێ، بەكاردەهێـنرێ.

(أَن لَّن يُبْعَثُواْ): كـە زینـدوو نەكرێنـەوە، هەڵنەسـتێنرێنەوە، (أَصْـلُ البَعْـثِ: إثَـارَةُ الشَّيءِ وَتَوْجِيهُـهُ، وَيَخْتَلِـفُ البَعْـثُ بِحَسَـبِ اخْتِـلاَفِ مَـا يُعَلَّـقُ بـهِ)، وشـەی (بَعْـث): بـە مانـای هەڵسـاندن و ئاڕاسـتەكردن دێ، هەڵگیرسـاندن و شـتێك و ئاڕاسـتەكردنی، دوایـی وشـەی (بَعْـث)، بەپێـی جیاوازیـی ئـەوەی پێیـەوە پەیوەسـت دەبـێ، مانایەكـەی دەگـۆڕێ، بـۆ وێنـە: (بَعَـثَ إِلَيْـهِ رِسَـالَةً) نامەیەكـی بـۆ نـادر، (بَعَثَـهُ مِـنَ القَـبْرِ)، لـە گۆڕەكـە هەڵیسـتاندەوە، (بَعَـثَ الرِّيْـح)، بایەكـەی نـارد، (ثُـمَّ بَعَثْنَـا مِـنْ بَعْدِهِـم رُسُـولَنَا)، واتـە: دوای وان پێغەمبەرەكانـی خۆمانمـان نـاردن، كەواتـە: بەپێـی ئـەو بابەتـەی پێیـەوە پەیوەسـت بـێ، مانایەكـەی دەگـۆڕێ.

(بَـلَى): (بَـلَى: رَدٌّ للنَّفِـي أَو جَـوَابٌ لاسْـتِفْهَام مُقْـتَرِنٍ بِنَفِـيٍ: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ ﴿١٧٢﴾ ﴾الأعـراف)، وشـەی (بَـلَى)، بەرپەرچدانـەوەی لابردنـە، یاخـود وەڵامـی پرسـیاركردنێكە جـووت بـێ لەگـەڵ لابردنـدا، وەك: ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ﴾الأعـراف، ئایـا مـن پەروەردگارتـان نیـم؟ ئەمـە پرسـیاركردنەو جووتیـش كـراوە لەگـەڵ لابـردن دا، ﴿ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ﴾، ئایـا پەروەردگارتـان نیـم؟ ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ ﴾، گوتیـان: بـا، ئنجـا لـە

وەڵامی پرسیارکردنێك دا كە لابردن (نفي) گرتۆتە خۆی، دەبێ بگوترێ: (بَلَى)، با، ئەگەر بتەوێ پێچەوانەكەی بچەسپێ، ئەگەرنا ئەگەر بگوترێ: (نَعَم)، بەڵێ، واتە: ڕاست دەكەی ئەوەی تۆ لایدەبەی، وایە، بۆ وێنە: ئەگەر لە وەڵامی: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾دا، بگوترێ: (نعم)، واتە: بەڵێ تۆ پەروەردگارمان نیی!.

(يَوْمُ ٱلتَّغَابُنِ): ڕۆژی دۆڕاندن، یاخود ئەو ڕۆژەی هەندێك دەیبەنەوەو هەندێك دەیدۆڕێنن، ئایا ئەوە لەچییەوە هاتوە؟ (التَّغَابُن)، لەسەر كێشی (تَفَاعُل)ەو لە (غَبْن)ەوە، هاتوە، (الغَبْنُ: أَنْ تَبْخَسَ صَاحِبَكَ فِي مُعَامَلَةٍ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ بِضَرْبٍ مِنَ الإِخْفَاء)، (غَبْن): ئەوەیە تۆ هاوەڵەكەی خۆت لە سەوداو مامەڵەیەكدا كە پێكەوە دەیكەن، وابكەی زەرەر بكات و بدۆڕێ، بە جۆرێكی پەنهان كە هەستی پێ نەكات، دەگوترێ: (غَبَنَ فُلاَنٌ فِي المَال)، فڵانكەس لە ماڵەكەیدا دۆڕاو زەرەری كرد، بەڵام ئەگەر لە ڕووی بۆچوونەوە، دۆڕابێ و نەیپێكابێ، دەگوترێ: (غَبِنَ فِي الرَّأْيِ)، دەگوترێ: (غَبِنْتُ كَذَا غَبْنَاً: غَفَلْتُ عَنْهُ)، (غَبِنْتُ كَذَا غَبْناً)، لەو شتە بێئاگا بووم، (فَعَدَدْتُ ذَلِكَ غَبْناً)، ئەوەم بە دۆڕان و زیانباریی دانا، (يَوْمُ التَّغَابُنِ: يَوْمُ القِيَامَةِ لِظُهُورِ الغَبْنِ فِي المُبَايَعَةِ المُشَارِ إِلَيْهَا بِقَوْلِهِ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴿٢٠٧﴾﴾البقرة، فَعَلِمُوا أَنَّهُم غُبِنُوا فِيمَا تَرَكُوا مِنَ المُبَايَعَةِ وَفِيمَا تُعَاطُوه مِن ذَلِكَ جَمِيعَاً، يَومُ التَّغَابُن، تَبْدُوا الأَشْيَاء لَهُم بِخِلَافِ مَقَادِرِهِم فِي الدُّنْيَا، وَأَصْلُ الغَبْنِ: إِخْفَاءُ الشَّيءِ، وَالغَبَنُ: المَوْضِعُ الَّذِي يُخْفَى فِيْهِ الشَّيءُ، وَسُمِّيَ كُلُّ مَنْثَنٍ مِنَ الأَعْضَاءِ كَأُصُولِ الفَخِذَيْنِ وَالمَرَافِقِ: مَغَابِن، لِإسْتِتَارِهِ وَيُقَالُ لِلْمَرْأَةِ: إِنَّهَا طَيِّبَةُ المَغَابِن).

(يَومُ التَّغَابُن) واتە: ڕۆژی قیامەت، چونكە لەو ڕۆژەدا ئەو سەوداو مامەڵەیەی خوا ﷻ لەو ئایەتە موبارەكەی سوورەتی (البقرة)دا، ئاماژەی پێداوە، كە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴿٢٠٧﴾﴾البقرة، واتە: لە خەڵكی هەیە كەسانێك خۆیان دەفرۆشن لە پێناو وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوادا، (واتە: خۆیان دەدەن، ماڵ و سامانەكەیان

دەدەن، تاكو ڕەزامەندیی خوا وەدەست بێنن)، ئنجا كەسێك لەو ڕۆژەدا، لەو سەودایەدا زەرەری كردبێ، ئەوە تووشی زەرەرو دۆڕان بووە، لەو ڕۆژەدا (مرۆڤە بێبڕوایەكان، گوناهبارەكان) بۆیان دەردەكەوێ كە بەهۆی ئەو سەودایەوەی لە خزمەت خوادا كردوویانە، (بەهۆی ئەوەوە كە دنیاو تەماعیان وەرگرتووەو، ڕەزامەندیی خوایان پێداوە) زەرەریان كردوە، ئنجا ئەو ڕۆژە ڕۆژێكە شتەكان بەپێچەوانەی ئەندازەگیرییكردنی وانەوە لە دنیادا دەردەكەون.

وشەی (غَبْن)یش، لە ئەصڵدا بە مانای پەنهانكردنی شتێكەو، (غَبَن)، بەو شوێنە دەگوترێ شتێكی تێدا پەنهان دەكرێ و، هەموو ئەو ئەندامانەی جەستەی مرۆڤ كە دەنووشتێنەوە، پێیان دەگوترێ: (مَغَابِن)، كە كۆی (مَغْبَن)ە، وەك بێخێ ڕانەكان و قۆڵەكان، (بن هەنگڵەكان)، لەبەر ئەوەی شێردراوەن، ئافرەتێك كە بۆنی خۆشبێ، دەگوترێ: (إِنَّهَا طَيِّبَة المَغَابن)، واتە: ئەو ئافرەتە چەند شوێنێك كە شاردراونەوە لە جەستەی، بۆنیان خۆشە.

بەڵام كە ئەو شوێنانەی بۆنیان كرد، بۆنی ناخۆش بێ، ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە بگوترێ: (طَيِّبَة المَغَابن).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە لـە بڕگـەکانی پێشـەوەدا تیشـکی باشـمان خسـتۆتە سـەر چەمـك و واتـای ئـەم دە (١٠) ئایەتـە موبارەکـە، بۆیـە لـەم مانـا گشـتییەدا بـە خێرایـی بەسـەریاندا دەڕۆیـن.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، ئەویـش مەبەسـتی ئەوەیـە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بەرزی مەزن دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم

﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾، هەرچییـەك کـە لـە ئاسـمانەکان و هەرچییـەك کـە لـە زەویـدا هەیـە، خـوا بـە پـاك دەگـرێ لـە هـەر خـەوش و کـەم و کوڕییـەك، خـوا بـە دوور دەگـرێ لـە هـەر ناتەواویـی و هەڵـەو پەڵەیـەك، ﴿لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ﴾، حوکمڕانیـی و باڵادەسـتیی تەنیـا هـی ئـەوەو سـتاییش و مـەدح و سـەناش بـەس هـی ئـەوە، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، ئەویـش، لەسـەر هەمـوو شـتێك توانایـە.

﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ فَمِنكُمۡ كَافِرٞ وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞۚ ﴾، ئـەو (خـوا) كەسـێكە ئێـوەی لـە نەبـوون هێناوەتـە دی، ئنجـا هەتانـە بێبڕوایـەو بێبڕوایـی هەڵگرتـوە، ﴿ وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞ ﴾، هەشـتانە بـڕوادارەو بـڕوای لـە خۆیـدا هێناوەتـە دی، چونكـە (كَافِـرٌ)، و (مُؤۡمِـنٌ)، هەردووكیـان لـە ڕووی ڕێزمانـی عەرەبییـەوە نـاوی بكـەر (**اسـم فاعـل**) ن، كەواتـە: (**كَافِـر**)، كەسـێكە خـۆی كوفـری هێناوەتـە دی، (**مُؤۡمِن**)یـش كەسـێكە خـۆی ئیمانـی هێناوەتـە دی، (**كَافِـر**)، بـە مانـای داپۆشـەر، یاخـود ڕەفزكـەر، بێبـڕواو، (**مُؤۡمِـن**)، واتـە: بڕواهێـن، بەڕاسـتدانەر، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، خـواش بینـەری ئەوەیـە كـە دەیكـەن.

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾، ئاسـمانەكان و زەوی بـە هـەق و حیكمـەت، هێناونە دی، نـەك بـە هەوەنتـەو بـێ حیكمەت، بـەڵام هـەق و حیكمەتەكـە پەیوەندیی هەیە بـە دروسـتكراوەكانەوە، نـەك خـوا ﷻ ئامانجێكـی هەبـێ بەهـۆی دروسـتكردنی ئاسـمانەكان و زەوییـەوە، بیهێنێتـە دی، چونكـە خـوا ﷻ خاوەنـی بێنیازیـی ڕەهایەو، خـوا پێویسـتی بـە جگـە لـە خـۆی نیـەو، هیـچ ئامانجێـك بـە جگـە لـە خـۆی ناهێنێتە دی، چونكـە جگـە لـە خـۆی هـەر دروسـتكراوەكانی، دروسـتكراوەكانیشی هـەم بوونەكەیـان خـوا پێیـان دەدا، هـەم هـەر شـتێكیان هەیـە، هـەر خـوا پێیـداون.

كەواتـە: خـوا ﷻ ناگونجـێ پێویسـتیی بـە جگـە لەخـۆی بـێ، كـە جگـە لـە خـۆی تەنیـا دروسـتكراوەكانی، ﴿ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ ﴾، ئـەو (خـوا) وێنـەی ئێـوەی كێشـاوەو جـوان وێنەتانـی كێشـاوە، واتـە: بـە گشـتیی وێنـەی مـرۆڤ، بـە بـەراورد لەگـەڵ دروسـتكراوەكانی دیكـەدا، باشـترین وێنەیـە، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ ﴾التیـن، هـەم وێنـەی ڕواڵەتیـی و هـەم وێنـەی مەعنەوییشـی، مـرۆڤ لـە باشـترین پێكهاتـەی ماددیـی و مەعنەوییـدا هێنراوەتـە دی، ﴿ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴾، سـەرەنجامیش تەنیـا بـۆ لای وی (خوا)یـە.

﴿ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، هەرچـی لـە ئاسـمانەكان و لـە زەویـدا هەیـە، دەیزانـێ و، دەزانـێ هەرچـی پەنهانی

دەکەن و هەرچی ئاشکرای دەکەن دەیزانێ و، ئەو (خوا) بە نهێنییەکانی نێو سینەکانیش زانایە، کەبوونەتە خاوەن و هاوەڵی سینەکان، خوا بەو نهێنیی و خولیایانەش ئاگادارو زانایە.

﴿ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُ ﴾، ئایا هەواڵی ئەوانەتان پێنەگەیشتوە کە لەمەوبەر بێبڕوابوون؟ ﴿ فَذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، سزای سەرەنجامی شوومی کاری خۆیانیان چێژت (ئەوە لە دنیاداو لە دوارۆژیشدا) ئازارێکی بە ئێش و ژانیان بۆ هەیە، بۆچی؟

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە پێغەمبەرەکانیان (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە موعجیزەو بەڵگەیەکی دەمکوتکەرو دەستەوسانکەری بۆ بەرانبەرەکانی پێ نەبێ، سەلمێنەری ئەوە بێ کە پێغەمبەری خوایە ﷺ، ﴿ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا ﴾، کەچی (ئەوان لە جیاتی ئەوەی تەماشای بەڵگەکان بکەن)، گوتیان: ئایا مرۆڤ ڕێنمایی ئێمە دەکات، ئایا مرۆڤ ڕێمان پێشان دەدا؟ ﴿ فَكَفَرُواْ وَتَوَلَّواْ ﴾، ئیدی بێبڕوابوون و پشتیان هەڵکرد، وشەی بەشەر(بشر) هەرچەندە بە مانای تاك و کۆش دێ، بەڵام لێرەدا بە مانای کۆ هاتوە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ أَبَشَرٞ يَهۡدُونَنَا ﴾، ئایا بەشەرەکان (مرۆڤەکان) ئێمە ڕێنمایی دەکەن؟ هەمیشە گرفت و کێشەی بێبڕوایان لەگەڵ پێغەمبەراندا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، ئەوە بووە کە پێغەمبەرانیان پێ لەوە نەوەشاوەتەوە، خوا بیانکاتە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خۆی، چونکە ئەوانە لە هەنبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوە، ئاخر کەسێك خۆی بە مەیموون زادەو بەوە بزانێ، کە لە ئەمیباو قرژاڵ و کرمە گڵخۆرکەوە هاتوە، دەڵێ: چۆن من شایستەی ئەوەم ببمە نوێنەری خوا؟ بەڵام وەك چۆن مرۆڤ دەتوانێ وەك ئاژەڵ و لە ئاژەڵیش خراپتر بێ، دەشتوانێ وەك فریشتەو لە فریشتەش بەرزتر بێ، بە هۆی پەیوەندیی لەگەڵ خواو، بەندایەتیی بۆ خواو، ئەو پاکیی و چاکییەوەی بە هۆی ئیمانەوە وەدەستی دێنێ، بۆیە ئەگەر

ئـەوان لـە خۆیانیـان نەوەشـاندۆتەوە، هەقیـان بـووە، بـەڵام نەدەبـوو پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامِ**)، وەك خۆیـان تەماشـایان بکـەن و لـە هەمبانـەی خۆیانـدا گوێـز بژمێـرن و، نەدەبـوو پێغەمبـەران قیـاس بکەنـە سـەر خۆیـان، ﴿وَّٱسۡتَغۡنَى ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٞ﴾، (کـە ئـەوان بێبڕوابـوون و پشـتیان هەڵکـرد)، خـواش بێنیـاز بـوو، خـواش بێنیـازی ستایشـکراوە.

﴿زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوان لافیـان لێـدا، بـە درۆ خەیاڵیـان وابــوو کــە زینــدوو ناکرێنــەوە، هەڵناســتێنرێنەوە، ﴿قُلۡ بَلَىٰ﴾، خــوا فەرمــان بــە پێغەمبەرەکـەی ﷺ و بـە هـەر کەسـێکی دیکـە دەکات، کـە بشـێ بدوێـنرێ، کـە بڵـێ: ﴿بَلَىٰ وَرَبِّي﴾، بـا سـوێند بـە پـەروەردگارم، ﴿لَتُبۡعَثُنَّ﴾، زینـدوو دەکرێنـەوە، هەڵدەسـتێنرێنەوە، ﴿ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ﴾، دوایـی بـەوەی کردووتانـە هەواڵتـان پێـدەدرێ، ﴿وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾، ئـەوەش لەسـەر خـوا ئاسـانە.

﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلۡنَاۚ﴾، مـادام زیندووکرانـەوەو لێپرسرانـەوە هەبـێ و دنیـا شـاری بـێ خـاوەن نەبـێ و، خاوەنێکتـان هەبـێ بـۆ تاقیکردنـەوە لێـرەی دانـاون و، بـە پێغەمبەرانـدا پەیامـی خـۆی بـۆ نـاردوون و دوایـی لێتـان بپرسـێتەوە، کەواتـە: بـڕوا بێنـن بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی و بـەو ڕووناکییـەی کـە دامانبەزانـدوە، ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾، خـواش شـارەزای ئەوەیـە کـە دەیکەن.

﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِۖ﴾، ئـەو ڕۆژەی بـۆ ڕۆژی کۆکردنـەوە، خڕتان دەکاتەوەو کۆتـان دەکاتـەوە، ﴿ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلتَّغَابُنِۗ﴾، ئـەوە ڕۆژی تێـدا دۆڕانـە، تێـدا دۆڕانـی کافـران و، تێـدا بردنـەوەی بڕوادارانـە، بۆیـە لەسـەر کێشـی (**تفاعـل**) هێناویەتـی، یـان لەبـەر ئـەوەی بێبڕوایـان زۆر خـراپ دەدۆڕێـن، یـان لەبـەر ئـەوەی وەك چـۆن بـڕواداران بەهرەمەنـد دەبـن لـە جێـگاو ڕێیـەکانی کافـران، کـە لەبەهەشـتدا بۆیـان دانـراون، ئەگـەر ئیمانیـان هێنابایـەو ئـەوان بەشـی ئـەوان دەبـەن، بێبڕوایەکانیـش شـوێنی بـڕواداران لـە دۆزەخـدا، ئەگـەر بێبڕوابوونایـە دەگـرن، ئەوانیـش شـوێنی

ئەوان بۆ خۆیان دەبەن، یانی: هەر کامێکیان شوێنی ئەوی دیکە دەبات، بەڵام بە دڵنیایی کەسێك شوێنی کەسێك لە بەهەشتدا بۆ خۆی دەبات، زۆر جیایە لە کەسێك کە شوێنی کەسێك لە دۆزەخدا بۆی دانراوە، دەیبات، ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ﴾، هەر کەسێ بڕوا بە خوا بێنێ و کردەوەی باش بکات، خراپەکانی لێ دەسڕێتەوەو خاوێنی دەکاتەوە، ﴿وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾، دەشیخاتە نێو باخانێکەوە کە جۆگەو ڕووباریان بە بەردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی و بۆ هەتا هەتا تێیاندا دەمێننەوە، ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾، ئا ئەوەیە بردنەوەو بە مراد گەیشتنی مەزن.

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ئەوانەش کە بێبڕوا بوون (بە خوا ﷻ و بە پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژی دوایی)، ﴿وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾، ئایەتەکانی ئێمەشیان بە درۆ داناون، پێیان بێبڕوا بوون، ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، ئەوانە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخن، یاخود خاوەنانی ئاگری دۆزەخن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾، خراپترین سەرەنجامیش ئاگری دۆزەخە (خوا پەنامان بدات).

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی پاکیی و بێ خەوشیی خوا ﷻ لەلایەن سەرجەم دروستکراوەکانەوە، هەمـوو ئـەو شـتانەی لـە ئاسـمانەکان و لـە زەویـدا هـەن و، ڕوونکردنـەوەی حوکمڕانیـی و ستاییشـکراویی و توانـای ڕەهـای خـواو، بەدیهێنانی بۆ مرۆڤـان و، بینینی بـۆ کردەوەکانیـان و، بەدیهێنانـی بـۆ ئاسـمانەکان و زەوی بـە هـەق و، وێنەکێشـانی بـۆ مرۆڤـان لـە باشـترین وێنـەو پێکهاتـەداو، زانیاریـی بێسـنووری خـوا بەتێکـڕای دروسـتکراوەکان بـە پەنهـان و ئاشـکرایانەوە، تەنانـەت نهێنییەکانـی نێـو سـینەکانیش:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لەزەویدا هەیە، بە پاکگرتن و بێخەوشیی بۆ خوا، ڕادەگەیەنێ، واتە: (**تُنَزِّهُهُ مُكَوَّنَاتُ العَالَمَيْنِ العُلْوِيِّ وَالسُّفْلِيِّ**)، پێکهاتەکانی عالەمی باڵاو عالەمی خوار، ئاسمانەکان و زەوی، خوا بە پاك دەگرن و بێخەوشیی خوا ڕادەگەیەنن.

پێشـتر لـە بـارەی بـە پاکگرتنـی خواوە، هـەم لـە سـووڕەتی (**الإسراء**)دا، کورتە باسـێکمان کـردوە، هـەم لە سـەرەتای سـووڕەتی (**الحديد**)یشـدا، بۆیە لێـرە دووبـارەی ناکەینەوە.

٢)- ﴿ لَهُ ٱلۡمُلۡكُ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ ﴾، حوكمڕانیی و ستاییشكران تەنیا هی ویە، (ملك) بە مانای حوكمڕانیی و باڵادەستیی و شت بەدەست بوون دێ، واتە: ئەوە هەمووی هی خوایە، ﴿ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ ﴾، ستاییشیش واتە: باسكردنی خواو وەسفكردنی خوا بە سیفەتە بەرزو پەسەندەكانیش تەنیا هی خوایە، چونكە هەرچی سیفەتی پەسەندە هی خوایەو، هەر شتێك كە هەیە هەمووی لە ژێر ڕكێف و دەستەڵاتی خوادایە.

٣)- ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾، ئەو لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، بێگومان هەموو سیفەتەكانی خوا ڕەهاو بێسنوورن، واتە: زانیاریی خوا سنوورێكی نیە، بگوترێ: تاكو ئەوێ دەڕوا، هەروەها توانای خوا سنوورێكی نیە، دیتنی خوا، بیستنی خوا، ویستنی خوا ﷻ، ناگونجێ بگوترێ: خوا دەتوانێ فڵانە شت بكات و، ناتوانێ فڵانە شت بكات، سیفەتەكانی خوا بێ سنوورن و ڕەهان.

٤)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ ﴾، ئەو (خوا) كەسێكە ئێوەی هێناوەتە دی، (**خَلَقَكُم**)، (**خَلْق**)، هەم بە مانای ئەندازەگیرییكردن دێ، یانی: (**قَدَّرَكُم**)، هەم بە مانای پەیداكردن دێ: (**أوْجَدَكُم**)، خوا ئێوەی پەیداكردوەو ئەندازەگیریی كردوون.

٥)- ﴿ فَمِنكُمۡ كَافِرٞ وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞ ﴾، هەتانە بێبڕوایەو هەشتانە بڕوادارە.

وشەكانی: (**كَافِر**) و (**مُؤْمِن**)، وەك پێشتریش گوتمان: هەردووكیان ناوی بكەر (**اسم فاعل**)ن، كەواتە: (**كَافِر**)، یانی: (**المُخْتَارُ وَالفَاعِلُ للكُفْر**)، هەڵبژێرەرو ئەنجامدەری كوفر، هەروەها (**مُؤْمِن**)، یانی: (**المُخْتَارُ وَالفَاعِل للإيْمَان**)، هەڵبژێرەرو ئەنجامدەری كوفر، خوا ﷻ دەفەرموێ: خوا ئێوەی هێناوەتە دی، ئنجا هەتانە بێبڕوایە، واتە: بێبڕوایی لە خۆیدا هێناوەتە دی و، هەشتانە بڕوادارە، واتە: ئیمانی لە خۆیدا هێناوەتە دی، وەك چۆن (**عَلِيْم**)، بە مانای كەسێكە زانیاریی هەیە، (**قَدِيْر**)، كەسێكە كە توانای هەیە، (**بَصِيْر**)، كەسێكە دیتنی هەیە، (**مُتَكَلِّم**)، كەسێكە قسەی هەیە، بەهەمان شێوە (**كَافِر**)یش كەسێكە هەقی پۆشیوەو كوفری هەیەو هێناویەتە دی، (**فاعل**)ە، بە مانای ناوی بكەر (**اسم فاعل**)و، (**مُؤْمِن**)یش (**مفعل**)ی بە مانای (**فاعل**)ەو، كەسێكە بڕوا (**إيمان**)ی هێناوەتە دی.

٦)- ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾، خواش بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، کەواتە: پێوەرو سەنگی مەحەك بریتیە لەو کردەوەیەی خەڵك دەیکات، بۆیەش جەخت لەم مەسەلەیە دەکەمەوە، چونکە دوایی کورتە باسێك دەکەین لە بارەی قەدەرەوە، کە پێم وایە زانایان زۆریان تێیدا تووشی بەزایەدان و تێپەڕاندن، یاخود: کورتهێنان و زێدەڕۆیی بوون.

٧)- ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ﴾، (خوا) ئاسمانەکان و زەوی بەهەق هێناونە دی، بە هەق واتە: بە حیکمەت و بۆ ئامانجێك، بەڵام ئامانجەکە پەیوەندیی هەیە بە دروستکراوەکان خۆیانەوە، نەك خوا ﷻ پێویستیی بەو ئامانجە بێ، کەواتە: نکووڵییکردن لە زیندووکرانەوەو لە لێپرسرانەوە، پێچەوانەی ئەو هەق و حیکمەتەیە کە خوا دروستکراوەکانی بۆ هێناونە دی، مادام خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق و بە حیکمەت هێنابنە دی، کەواتە: ناگونجێ مرۆڤەکان ژیانی دنیا هەروا بگوزەرێنن و، دوایی لێیان نەپرسرێتەوەو بە چاك نەگوترێ: چاکەت کردو، بە خراپ نەگوترێ: خراپەت کرد، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الجاثية**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ۝٢٢﴾، خوا ئاسمانەکان و زەوی بەهەق هێناونە دی و، بۆ ئەوەی هەر کەسە بە پێی ئەوەی کردوویەتی، سزاو پاداشت بدرێتەوەو، ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ.

٨)- ﴿وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ﴾، ئەو (خوا) وێنەی کێشاون و جوان وێنەی کێشاون، لێرەدا کە دەفەرموێ: جوان وێنەی ئێوەی کێشاوە، هەندێك لە زانایان باسی ئەوەیان کردوە، کە کەسی وا هەیە شکڵ و شێوەو بیچمەکەی جوان نیە، بەڵام لە ڕاستییدا جوانیی و ناشیرینی شتێکی ڕێژەیین و، جوانیی ڕەها، تەنیا لە لای خوای پەروەردگارە، هەروەك چاکیی ڕەها تەنیا، لە لای خوای پەروەردگارە، بە هەموو ئەو ماناو چەمکانەی جوانیی و چاکیی، کە بۆ خوا شایستەن و لەگەڵ خوادا دەگونجێن ﷻ بەڵام بەگشتیی شکڵ و شێوەی مرۆڤ، قەدو قیافەی مرۆڤ جوانە، چونکە وێنەکێشان بەس دەم و چاو ناگرێتەوە، قەدو قیافەو لەش و لارو دیمەن و هتد، هەمووی دەگرێتەوە،

ئنجا مرۆڤ بە بەراورد لەگەڵ دروستکراوەکانی دیکەدا، لە هەمووان وێنەکەی تەواوترەو، قەدو قیافەو دیمەنەکەی جوانترو ڕێکترە، چونکە هەموو دروستکراوەکانی دیکە، مەگەر چۆن ئەگەرنا لەسەر چوار پێیان دەڕۆن و، ئەوانەی باڵندەشن ڕێك بە دەندووکیان شت دەخۆن، بەڵام مرۆڤ بە دەست شت دەخوات، مرۆڤ بەدوو پێیان دەڕوا، مرۆڤ دەتوانێ تەماشای سەرەوە بکات، تەماشای خوارێ بکات، ئەوە هەر لە ڕووە جەستەییەکەیەوە، بەڵام ئەگەر لە ڕووی مەعنەوییەوە تەماشای بکەین، مرۆڤ خاوەنی عەقڵەو، خاوەنی ڕووحەو، خاوەنی ویستێکە دەتوانێ بژاردەی جۆراو جۆری پێ هەڵبژێرێ، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ﴾، واتە: بە گشتیی خوا وێنەی مرۆڤانی کێشاوەو باش وێنەی کێشاون، بەڵکو لە سووڕەتی (**التين**)دا، فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾﴾، بەدڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین وێنەو شێوەو پێکهاتەدا هێناوەتە دی (بە بەراورد لەگەڵ دروستکراوەکانی دیکەدا).

٩)- ﴿وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای ویە.

١٠)- ﴿يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە دەیزانێ.

١١)- ﴿وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ﴾، هەروەها هەرچی پەنهانی دەکەن و هەرچی ئاشکرای دەکەن، دەیزانێ.

١٢)- ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، خواش زانایە بە نهێنیی سینەکان، بۆچی خوا ناوی لە نهێنی سینەکان ناوە: (**ذات الصدور**)؟ لەبەر ئەوەی ئەو نهێنییانە هێندە لەنێو سینەکان دان و، هێندە لە نێو دڵەکاندا ڕۆچوون و لەگەڵیاندا پەیوەستن، بوونە هاودەم و هاوەڵ و خاوەنیان، (**ذَات**)، (**مؤنث**)ی (**ذو**)یەو، بە مانای (**صَاحِب**) دێ، (**ذات**)یش، یانی: (**صَاحِبَة**)، بۆیەش ئەو وشەیە بۆ نهێنییەکان بەکارهێنراوە، چونکە نهێنییەکان هەمیشە لەنێو سینەکاندان و لە دڵەکان جیانابنەوە، یانی: خولیاو بیرو بۆچوون و نیازو مەبەستەکان، بۆیە ناویان لێنراوە (**ذَات**)، واتە: (**صَاحِبَة**)، هاوەڵ، یاخود بە مانای (**مَالِكَة**)، خاوەن، نیازو مەبەستەکانی نێو دڵ و دەروون، خولیایەکانی نێو عەقڵ و

هۆشیش، هەمیشە لەگەڵ عەقڵ و دڵ دان و بەردەوام هاوەڵی دڵ و دەروونەکانن، بە جۆرێك ڕۆچوون لە نێو عەقڵ و دڵەکاندا، بوونەتە خاوەن و کۆنترۆڵکەری ئەو سینەو دڵ و عەقڵانە.

لێرەدا خوا ﷻ زانیاریی خۆی بە سێ قۆناغ باس دەکات، بەشێوەیەکی پلە پلەیی:

**١-** پێشێ دەفەرموێ: ﴿يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، دەیزانێ.

**٢-** دوایی وردتری دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَيَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ﴾، ئەوەی پەنهانی دەکەن و ئەوەی ئاشکرای دەکەن، دەیزانێ، واتە: خوا پەنهان و ئاشکرا دەزانێ.

**٣-** ئنجا وردتری دەکاتەوە: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، خواش زانایە بە نهێنیی نێو سینەکان، چونکە نهێنیی نێو سینەکان بەشێکن لەو شتانەی مرۆڤ پەنهانیان دەکات، مرۆڤ جاری وا هەیە قسەیەك پەنهان دەکات، یان کردەوەیەك بە پەنهانیی دەکات، خەڵك چاوی لێ نیە، بەڵام نهێنیی نێو سینەکان جۆرێکی زۆر تایبەتن لەو شتانەی مرۆڤ پەنهانیان دەکات و، بە پەنامەکیی و لە شوێنی حەشارگەو نەدیودا ئەنجامیان دەدا، بێگومان ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (**النَّوَايَا ذَاتِ الصُّدُور**)، یان (**الخَواطِر ذَات الصُّدُور**)، نیازو مەبەستەکان، یاخود خولیایەکان کە هاوەڵی سینەکانن، یاخود خاوەنی سینەکانن.

## کورتە باسێک لە بارەی قەدەرەوە

لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە موبارەکەدا، کورتە باسێك لە بارەی قەدەرەوە دەکەین، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ ﴾، خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی هێناوەتە دی، هەتانە بێبڕوایەو هەتانە بڕوادارەو، خواش بینەری کردەوەکانتانە.

لێرەدا هەندێك لە زانایان پێم وایە باش لە چەمك و واتای ئایەتە موبارەکەکە حاڵیی نەبوون، کە گوتوویانە: مانایەکەی ئاوایە: خوا ئێوەی هێناوەتە دی، کوفریشی لە ئێوەدا هێناوەتە دی و، ئیمانیشی لە ئێوەدا هێناوەتە دی، واتە: ئێوە هیچ کارەن، هەندێك وایان لێکداوەتەوە!

ئەم کورتە باسەش لە پێنج بڕگەدا، پێشکەش دەکەین:

### بڕگەی یەکەم: پێناسە

دوو ڕەوت هەبوون بە درێژایی مێژووی مسوڵمانان، لە بارەی قەدەری خوای پەروەردگارەوە:

ڕەوتی یەکەم: پێیان گوتراوە: (الجَبْرِيَّة).

ڕەوتی دووەم: پێیان گوتراوە: (القَدَرِيَّة) و (المُعْتَزِلة)شیان، پێگوتراوە.

(الجَبْرِيَّة)، کێن؟

**(الجُرْجَاني)**، لە کتێبە ناودارەکەی خۆی **(التعريفات)**دا[1]، ئاوا پێناسەی **(الجَبْرِيَّة)**، دەکات: **(الجَبْرِيَّةُ: مِن الجَبرِ وَهُوَ إسْنَادُ فِعْلِ العَبْدِ إلى اللهِ، وَالجبْرِيَّةُ اثْنَانِ مُتَوَسِّطَة تُثْبِتُ للعَبْدِ كَسْباً في الفِعْلِ، كَالأشْعَرِيَّة، وَخَالِصَة لَا تُثْبِتُ كَالْجَهْمِيَّة).**

---

(١) ص: ١٧١.

واتــە: (جَبْرِيَّــة): لــە (جَــبْر)ەوە، هاتــوە (جَبْر)یــش بریتیــە لــە زۆرلێکــردن و ناچارکــردن، کــە بریتیــە لــە پاڵدانــی کــردەوەی بەنــدە بــۆ لای خــوا، کــە خــوا بــە ناچاریــی پێــی دەکات و تۆبزیــی لــێ دەکات.

ئنجا (جَبْرِيَّة)ش دووجۆ

دوو جـۆرن: أ- جۆرێکیـان: میانجییـن، ئەویـش ئەوانـەن کە وەدەسـتهێنان بـۆ بەندە دەچەسـپێنن لــە کــردەوەدا، واتــە: دەڵێــن: بەڵــێ: خــوا بەدیهێنــەری کردەوەکانــی مرۆڤـە، بـەڵام مرۆڤیـش وەدەسـتهێنەریانە، وەك ئەشـعەرییەکان، ئنجـا ئایـا لـە حاڵێکدا خـوا بەدیهێنـەری کردەوەکانـی مـرۆڤ بـێ، مـەودا ماوەتـەوە مرۆڤیـش کردەوەکانـی وەدەسـت بێنـێ، مـادام خـوا بـۆی بخوڵقێنـێ، ئایـا وەدەسـت هێنانـی مـرۆڤ بـۆ کــردەوەکانی لــە کوێدایــە؟ ئــەوە دەبــێ ئەشــعەرییەکان وەڵام بدەنــەوەو لێرەدایــە ئەگـەر شـتێك زۆر ورد بووبـێ، گوتوویانـە: (أَدَقُّ مِـنْ كَسْـبِ الأَشْـعَرِيِّ)، ئـەو شـتە لـە کەسـبی ئەشـعەریی (ئەبـوو حەسـەن لئەشـعەریی رەحمـەتی خـوای لـێ بـێ) وردتـرە، واتــە: شــتێکی زۆر وردو قووڵــە! زانایــان وایانگوتــوە، بــەڵام مــن پێــم وایــە ئــەوەی ئەشـعەریی گوتوویەتـی، هـەر بوونـی نیـە، کـە دوایـی مـن ڕای خـۆم دەڵێـم.

ب- جــۆری دووەم: لــە جەبرییــەکان پێیــان گوتــراوە: (الجَبْرِيَّــة الخَالِصَــة)، جەبرییـە بـێ خڵتـەکان، کـە هیـچ کاریگەرییەکیـان بـۆ مـرۆڤ نەهێشـتۆتەوە، وەك جەهمییـەکان، کـە گوتوویانـە: خـوا کـردەوەکانی مـرۆڤ دروسـت دەکات و مـرۆڤ هیـچ کارەیـە، هەتـا وێنەیـان هێناوەتـەوەو گوتوویانـە: مـرۆڤ وەك پـەڕە مریشـکێك وایـە بـا لـەولاوە بـێ، بـەولادا دەیخـات و، لەولاوەبـێ، بـەولادا دەیخـات، واتـە: مـرۆڤ هیچـی بەدەسـت نیـە.

(الجرجـاني) لـە کتێبـە ناودارەکـەی خـۆی (التعریفـات)دا، لـە پێناسـەی (القَـدَرِيَّ ة) دا[١]، دەڵـێ: (هُـمُ الَّذِيْـنَ يَزْعُمُـونَ أَنَّ كُلَّ عَبْـدٍ خَالِـقٌ لِفِعْلِـه، وَلَا يَـرُوْنَ الكُفْـرَ وَالمَعَاصِي

---

(١) ص: ١٨٠.

بِتَقْدِيـر اللـهِ تَعَـالَى)، واتـە: قەدەرییـە ئەوانـەن پێیـان وایـەو لافـی ئـەوە لـێ دەدەن کـە هەمـوو بەندەیـەك بەدیهێنـەری کـردەوەی خۆیەتـی، پێیـان وایـە بێبڕوایـی و سـەرپێچیی و تاوانـەکان، بـە ئەندازەگیریـی خـوای بـەرز نیـن و، مـرۆڤ بـۆ خـۆی کـردەوەکانی خـۆی دەخولقێنـێ و دەیانهێنێتـە دی.

بەپێـی ئـەو پێناسـەیەش بۆمـان دەردەکـەوێ، کـە جەبرییـە بەلایەکـدا تێیـان پەڕانـدوەو، هیچیـان بـۆ مـرڤ نەهێشـتۆتەوە، قەدەرییـەش بـەولادا تێیان پەڕاندوە، کـە مرۆڤیـان کـردوە بـە بەدیهێنـەری کردەوەکانـی خـۆی، لـە حاڵێکـدا کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴿٦٢﴾ ﴾ الزمـر، خـوا بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێکە، کەواتـە: کـردەوەکانی مـرۆڤ، ئەگـەر بەدیهێـنراو (مخلـوق) بـن، دەبـێ بەدیهێنەرەکەیـان خـوا بـێ، بـەڵام ئەگـەر وەدیهێـنراو نەبـن، ئـەو کاتـە پێویسـتییان بـە بەدیهێنـەر نیـە، کـە دوایـی وەك ڕای خـۆم باسـی دەکـەم.

## بڕگەی دووەم: (القرطبي)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

(وَالَّـذِي عَلَيْـهِ الأَئِمَّـةُ وَالْجُمْهُـورُ مِـنَ الْأُمَّـةِ: إِنَّ اللَّـهَ خَلَـقَ الْكَافِـرَ، وَكُفْـرُهُ فِعْـلٌ لَـهُ وَكَسْـبٌ، مَـعَ أَنَّ اللَّـهَ خَالِـقُ الْكُفْـرِ، وَخَلَـقَ الْمُؤْمِـنَ، وَإِيمَانُـهُ فِعْـلٌ لَـهُ وَكَسْـبٌ، مَـعَ أَنَّ اللَّـهَ خَالِـقُ الْإِيمَـانِ. وَالْكَافِـرُ يَكْفُـرُ وَيَخْتَـارُ الْكُفْـرَ بَعْـدَ خَلْـقِ اللَّـهِ إِيَّـاهُ، لِأَنَّ اللَّـهَ تَعَـالَى قَـدَّرَ ذَلِـكَ عَلَيْـهِ وَعَلِمَـهُ مِنْـهُ، وَلَا يَجُـوزُ أَنْ يُوجَـدَ مِـنْ كُلِّ وَاحِـدٍ مِنْهُـمَا غَيْرُ الَّـذِي قَـدَّرَ عَلَيْـهِ وَعَلِمَـهُ مِنْـهُ، لِأَنَّ وُجُـودَ خِـلَافِ الْمَقْـدُورِ عَجْـزٌ، وَوُجُـودَ خِـلَافِ المعلوم جَهْـلٌ، وَلَا يَلِيقَـانِ بِاللَّـهِ تَعَـالَى، وَفِي هَـذَا سَـلَامَةٌ مِـنَ الْجَـبْرِ وَالْقَـدَرِ، كَـمَا قَـالَ الشَّـاعِرُ: يَـا نَاظِـراً فِي الدِّيـنِ مَـا الْأَمْـرُ ... لَا قَـدَرٌ صَـحَّ وَلَا جَـبْرٌ).

(القرطبـي) بـە حیسـاب ڕایەکـی میانجیـی هێنـاوەو دەڵـێ: ئەمـە سـەلامەتیی تێدایـە! بـەڵام پێـم وایـە لـەوەدا نەیپێـکاوە، پێشـێ دەقـی قسـەکانی دێنیـن، دەڵـێ:

---

(١) ج١٨، ص: ١٠٤، ١٠٥.

ئـەوەی پێشـەوایان لەسـەر نـی و زۆربـەی ئوممـەت لەسـەریەتی لـە بـارەی قـەدەرەوە، ئەوەیـە کـە خـوا بابـای کافـری هێناوەتـە دی، بـەڵام کوفـری بابـای کافـر کردەوەیـەو وەدەسـتهێنراوی مرۆڤەکەیـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە خـوا بەدیهێنـەری کوفریشـەو، خـوا بڕواداری وەدی هێنـاوە، بـەڵام ئیمانەکـەی کـردەوەو وەدەسـتهێنراوی بـڕوادارە، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە خـوا بەدیهێنـەری ئیمانیشـەو، بابـای بێبـڕوا، بێبـڕوا دەبـێ و کوفـر هەڵدەبژێـرێ، دوای ئـەوەی خـوا کوفرەکـەی دروسـتکردوە، چونکـە خـوا ئـەوەی لەسـەر ئەندازەگیریـی کـردوەو بـۆی دانـاوەو، لـە بارەیـەوە زانیـوەو، ناشـگونجێ هیـچ شـتێك لـەو دووانـە پەیـدا بـێ، (جگـە لـەوەی خـوا ئەندازەگیریـی کـردوەو زانیویەتـی)، چونکـە پێچەوانـەی ئـەوە کـە خـوا ئەندازەگیریـی کـردوە، بـۆ خـوا بێتواناییـە، (واتـە: خـوا شـتێك ئەندازەگیریـی بـکات، بـەڵام کەسـێك شـتێکی دیکـە بێنێتـە دی، جگە لـە ئـەوەی خـوا ئەندازەگیریی کـردوە، ئـەوە بێتوانایـی پاڵدەدرێتـە لای خـوا)، پەیدابوونـی پێچەوانـەی ئـەوەش کـە خـوا زانیویەتـی، مـرۆڤ وەدەسـتی بێنـێ و پەیـدای بـکات، بـەوەش نەزانیـی پاڵدراوەتـە لای خـواو پاکیـی بـۆ خـوا، هیـچ کامیـان شایسـتەی خـوای بـەرز نیـن، لەوەشـدا سـەلامەتیی هەیـە، هـەم لـە جەبـر، هـەم لـە قـەدەر، (کـە مـرۆڤ ناچـارەو هیچـی لەدەسـت نایـەت، یـان مـرۆڤ خـۆی کردەوەکانـی خـۆی وەدی دێنـێ)، وەك شـاعیر گوتوویەتـی:

**(يَا نَاظِرًا فِي الدِّينِ مَا الْأَمْرُ ... لَا قَدَرٌ صَحَّ وَلَا جَبْر)،**

واتـە: ئـەی ئـەو کەسـەی تەماشـای دیـن دەکات! کارچییـە؟ نـە بـۆ چوونـی قەدەرییـە ڕاسـتە، نـە بۆچوونـی جەبرییـە.

ئەمـە قسـەی **(القرطبي)**یـەو پێـم وایـە کـە گوتوویەتـی لـەوەدا سـەلامەتیی هەیـە لـە جەبـرو لـە قـەدەر، لەڕاسـتییدا نەپێـکاوە، چونکـە ئەگـەر خـوا ﷻ بەدیهێنـەری کوفـر بـێ لـە کافـرداو، بەدیهێنـەری ئیـمان بێ لـە ئیمانـداردا، هیـچ بـوارو دەرفەتێك

بـۆ کافـرو بـۆ بـڕوادار نەماوەتـەوە کـە کاریگـەرییەکیـان هەبـێ لـە وەدەسـتهێنانی کوفـر، یاخـود ئیـمان دا، بۆیـە ئەمـەش هـەر ڕوویەکـی دیکـەی جەبـرە، کـە بیـرو بۆچوونـی ئەشـعەرییەکانەو، بـە ڕای بەنـدە جەبرێکـی داپـۆشراوە.

## بڕگەی سێیەم: دوو فەرمایشتان دێنین لەم بڕگەی سێیەمەدا:

**١-** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمَاً نُطْفَةً، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبْعَثُ الله إِلَيْهِ مَلَكَاً بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ: فَيَكْتُبُ رِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَعَمَلَهُ وَشَقِيُ أم سَعِيْد؟ ثُمَّ يُنْفُخُ فِيهِ الرُّوحُ**}، (**أخرجه البخاري: ٣٠٣٦، ومسلم: ٢٦٤٣، والترمذي: ٢١٣٧، وأبو داود: ٤٧٠٨**).

واتـە: یەکێـك لـە ئێـوە دروسـتکرانەکەی کـۆ دەکرێتـەوە لـە سـکی دایکیـدا چـل ڕۆژ (**نُطْفَـة**) دەبـێ، دوایـی وێنـەی ئـەوەش (**عَلَقَـة**) دەبـێ، دوایـی وێنـەی ئـەوەش (**مُضْغَـة**) دەبـێ، {(**عَلَقَـة**)، بـە مانـای پارچـە خوێنێـکی زەروو ئاسـا، کـە خـۆی بـە منداڵدانـدا هەڵواسـیوەو، (**مُضْغَـة**)ش، بـە مانـای پارچـە گۆشـتێکی زارجـوو ئاسـا بەقـەدەر زارجوویـەك کـە هـەر لەنێـو منداڵدانداىـە}، دوایـی خـوا فریشـتەیەکی بـۆ لا دەنێـرێ بـە چـوار وشـان {واتـە: چـوار فەرمـان}، بـە نووسـینی بژیوەکـەی و کاتـی مـەرگ و کردەوەکـەی و ئایـا بەدبەخـت و دۆزەخییـە، یاخـود بەختـەوەرو بەهەشـتییە؟، دواییـش ڕووحـی بەبـەردا دەکـرێ.

**٢-** فەرمایشتێکی دیکەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ: {**كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جمعاء، هَلْ تُحِسُّونَ مِنْ جَدْعَاءَ؟**}، (**أخرجه البخاري: ١٢٩٢، ومسلم: ٢٦٥٨، وأبو داود: ٤٧١٤**).

واتـە: هەمـوو لـە دایـك بوویـەك لەسـەر خوارسـك (**فطـرة**) لـە دایـك دەبـێ، دوایـی بـاب و دایکـی دەیکەنـە جوولەکـە، یـان دەیکەنـە نەصرانیـی، یـان دەیکەنـە مەجووسـیی، هـەروەك چـۆن بەچکـەی ئـاژەڵ بـە بەچکەیەکـی تێـرو پـڕو تـەواو لـە

دایك دەبێ، ئایا دەبینی هیچی نوقسان بێ؟ {گوێی بڕا بێ، یان لووتی بڕابێ، یان داغکرابێ، واتە: دوایی مرۆڤەکان دەستکاری دەکەن}.

ئەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بە ڕواڵەت تەماشایان بکەی دەڵێی: تێك دەگیرێن، یەکەمیان دەڵێ: خوا هەموو شتێك بۆ مرۆڤ دەنووسێ و ئەو فریشتەیەی دەنێرێ، هەموو شتێکی بۆ دەنووسێ، ئەوەی دووەمیان دەڵێ: مرۆڤ تێرو تەواوو ڕێك و پێکە، بەڵام دوایی باب و دایکی دەیکەنە جوولەکە، یان نەصڕانیی، یان مەجووسیی، واتە: ژینگەو دەوروبەر، دەیگۆڕن، بەڵام ئەم دوو فەرمایشتە هەر یەکەی باسی ڕوویەکی ئەو ڕاستییە دەکەن، کە خوا هەموو شتێك دەزانێ و، هەموو شتێك دەتوانێ و، بە دڵنیایی هەموو شتێکی مرۆڤ لە لای خوای پەروەردگار ئاشکرایە، بەڵام ئەوە مانای وانیە مرۆڤ هیچ کارەبێ لە ئەنجامدانی کردەوەکانی خۆیداو لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیدا، بەڵکو وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مرۆڤ بە زگماکێکی ڕاست و ساغەوە، کە خوای پەروەردگار و خاوەنی خۆی دەناسێ و، چاکە دەزانێ و خراپە دەزانێ بە گشتیی، بەڵام دیارە بۆ زانینی وردەکارییەکانی پێویستیی بە شەریعەت هەیە، دەستی بگرێ و ڕێنمایی بکات، ئەگەرنا مرۆڤیش لە ناخی خۆیدا، ئەگەر ناخەکەی تێکنەدرابێ و نەشێوێنرابێ، ئەندازەیەك هەست دەکات بە ئاتاجیی خۆی بۆ لای خوا ﷻ و، بۆ بەندایەتیی کردن بۆ خواو، دەزانێ کە ئەم دنیایە نابێ شاری بێخاوەن بێ و، دەزانێ کە ڕاستیی باشەو درۆ خراپە، دزیی خراپەو، دەستپاکیی چاکەو تا کۆتایی.

## بڕگەی چوارەم:

هەندێکی دیکە لە زانایان ئەو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی **(التغابن)**، بە جۆرێکی دیکە تەفسیر دەکەن، کە من ئەو تەفسیرکردنەی ئەوانم بە دڵە، یەکێك لەوانە **(الزمخشري)**، لە تەفسیرە ناودارەکەی خۆی **(الکشاف)**دا، کە

بەداخـەوە زەمەخشـەریی چونکـە لەسـەر ڕێبـازی موعتەزیلـەو قەدەرییـە بـووە، هەندێـك لـە ڕوونکەرەوانـی مانـاو مەبەسـتەکانی ئایەتەکانـی قوڕئـان، لەبـەر ئـەوە هەسـتیارییان بەرانبـەری هەیـە، هـەر شـتێك بڵـێ، بەسـەری دادەدەنـەوە، ئەگەرنـا لێرەدا ئـەو قسـانەی ئێسـتا مـن لێیـەوە نەقڵ دەکـەم، قسـەی ڕاسـت و دروسـت و گونجـاون، لەگـەڵ ئایەتـەکانی قوڕئـان و فەرمایشـتەکانی پێغەمبەری خـوا ﷺ و لەگەڵ عەقـڵ و مەنتیقیشـدا، (**الزمخشري**)، لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمۡ فَمِنكُمۡ كَافِرٞ وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞ ﴾، دەڵـێ: (**هُـوَ الَّـذِي خَلَقَكُـمْ خَلْقَـاً بَدِيْعَـاً حَاوِيَـاً لِجَمِيْـع مَبَـادي الكَـمَالَات العِلْمِيَّـة وَالعَمَلِيَّـة، وَمَـعَ ذَلِـكَ فَمِنْكُـم مُخْتَـارٌ للكُفْـرِ كَاسِـبٌ لَـهُ عَـلَى خِـلَافِ مَـا تَسْـتَدْعِيه خِلْقَتِـه، فَالآيـة لِبَيَـان إخْلَالِهـم بِمَـا يَقْتَضِيـه التَّفَضّـل عَلَيْهِـم بِأصْـل النِّعَـمِ الَّـذِي هُـوَ الخَلْـقُ وَالإيْجَـاد، فَمَـا أَجْهَـل مَـنْ يَمْـزُجُ الكُفْـرَ بِالخَلْـقِ وَيَجْعَلُـه مِـن جُمْلَتِـه، وَالخَلْـقُ أعْظَـمُ نِعْمَـة اللـه تَعَـالى عَـلَى عِبَـادِه، وَالكُفْـرُ أَعْظَـمُ كُفْـرَانٍ مِـنَ العِبَـادِ لِرَبِهِـم**).

هەڵبەتـە ئـەم قسـەیە (**القرطبـي**) و (**روح المعـاني**)ش، هێناویەتـی مـن لـە (**روح المعـاني**)ەوە هێناومـە.

واتـە: {مانـای ئـەم ئایەتـە موبارەکـە بـەم شـێوەیە} خـوا ئێـوەی هێناوەتـە دی، هێنانەدییەکـی زۆر سـەرنجڕاکێش، کـە تێکـڕای بـوارەکانی هەمـوو چاکییـە زانسـتیی و کردەییـەکان دەگرێتـە خـۆی، {واتـە: ئـەو هێنانـە دییـەی ئێـوە وایـە کـە بتوانـن، هـەم لـە ڕووی زانیارییـەوە بـەرەو تەواویـی بچـن، هـەم لـە ڕووی کردەوەییـەوە}، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەتانـە بێبڕوایـی هەڵبـژاردوەو وەدەسـت هێنـاوە، بـە پێچەوانەی ئـەوەوە کـە دروسـتکردنەکەی خوازیاریەتـی، ئایەتەکـە بـۆ ڕوونکردنـەوەی ئەوەیـە کـە ئـەوان بـە پێچەوانـەی چاکـەی خـواوە لەسـەریان، ڕەفتاریـان کـردوە، کـە بناغـەی چاکـەکانی پێـداون، کـە دروسـتکردن و وەدیهێنانیانـە، ئـەو کەسـەش زۆر نەزانـە کـە کوفـرو خەڵـق، تێکـەڵ دەکات {و کوفرەکـە لەگـەڵ وەدیهێنانەکـەدا دەکات بـە یـەك شـت}، لـە حاڵێکـدا کـە وەدیهێنانـی خـوا بـۆ مرۆڤـەکان، گەورەترین

نیعمەتـی خـوای بـەرزە لەسـەر بەنـدەکان، بـەڵام بێبڕوایـی مەزنتریـن سـپڵەییە لـە بەندەکانــەوە بەرانبــەر بــە پەروەردگاریــان.

کەواتــە: چــۆن شــتێك کــە چاکتریــن شــتە لەگــەڵ شــتێك کــە خراپتریــن شــتە هەردووکیــان دەبــێ، تێکــەڵ بکرێــن و ئاوێتــە بکرێــن؟.

قســەکەیم زۆر پــێ جوانــە: خــوا لێــرە دەفەرمــوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُمْ ﴾، واتــە: خــوا ئێــوەی هێناوەتــە دی بــە جەســتەو ڕووحــەوە، ﴿ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾، کەچــی لــە جیاتــی ئــەوەی هەمووتــان بڕواداربــن، ئــەوە ســپڵەییە لــە ئێــوە کــە هەتانــە بێبڕوایــەو بێبڕوایــی وەدەســت دێنــێ، کــە پێچەوانــەی ئــەو نیعمەتەیــە خــوا بــە ئێــوەی بەخشــیوەو، پێچەوانــەی ئــەو چاکەیەیــە کــە خــوا لەگــەڵ ئێوەیــدا کــردوە، خــوا ئێــوە هێناوەتــە دی، ئنجــا چــۆن دەگونجــێ بێبــڕواو ســپڵەبن بەرانبــەر بــە خــوا؟ ﴿ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾، هەشــتانە بــڕوادارە، هەروەهــا سوپاسگوزاریشــە بــۆ خــواو چاکەکــەی خــوای نادیــدە نەگرتــوەو بەرانبــەری ســپڵە نەبــووە، ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾، ئەمەشــیان خــۆم دەیڵێــم و زەمەخشــەریی نەیگوتــوە: خــواش بینــەری ئەوەیــە کــە دەیکــەن، یانی: ســەنگی مەحــەك و پێــوەر بــۆ چاکیــی و خراپیــی مــرۆڤ، کردەوەکــەی خۆیەتــی، کــە خــۆی ئەنجامــی دەدات و وەدەســتی دێنــێ.

### بڕگەی پێنجەم و کۆتایی: ڕای بەندەو چارەسەری بۆ ئەو کێشەیە:

پێــش هەمــوو شــتێك دەڵێــم: بــە زۆریــی وایــە کــە بەهەڵــەدا چــوون، یــان بەهــۆی تێپەڕاندنەوەیــە، یــان بەهــۆی کورتهێنانەوەیــە، یەکێــك بــەولادا تێدەپەڕێنــێ و یەکێك بــەولادا، بــۆ وێنــە: لە بــواری هاوســەنگیی ڕاگرتن لــە نێــوان داخوازییەکانی جەســتەو داخوازییــە ڕووحییەکانــدا، هەیــە بــە لای جەســتەدا تێدەپەڕێنــێ، لەســەر حیســابی ڕووح و هیــچ حســابێك بــۆ ڕووح نــاکات، وەك کرمــە گڵخۆرکەیــەك دەم لــە زەوی دەنــێ، تەنیــا ئــەو بەشــەی لــە زەوییــەوە هاتــوە، بــەس ئــەو بــەش و پێکهاتەیــەی

خۆی کە جەستەکەیەتی دەیبینێ، بەڵام ئەو ڕووحەی لە خواوە هاتووە، کە ڕووحێکی مەعنەوییە، هیچ حیسابی بۆ ناکات، هەشیانە بەپێچەوانەوە: تەنیا ڕووحەکەی خۆی و دیوە مەعنەوییەکەی دەبینێ و، هیچ حیساب بۆ جەستەی ناکات، ئنجا هەر لەوەوە بگرە هەتا زۆر شتی دیکە، بە زۆریی تێپەڕاندن بەلایەکدا لەسەر حیسابی کورتهێنانە لەلایەکی دیکەوە، هەروەها کورتهێنان لەلایەکدا، سەردەکێشێ بە تێپەڕاندن بە لایەکی دیکەدا.

شایانی باسیشە: هەر کام لە وشەی (**كَافِر**)، و (**مُؤْمِن**)، هەردووکیان ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ن، (**كَافِر**)، لە (**كَفَر**)ەوە هاتووە، (**كَفَرَ يَكْفُرُ كَفْراً أي سَتَرَ يَسْتُرُ سَتْرَاً**)، واتە: پۆشیی، دەیپۆشێ، پۆشین، (**كَافِر**)یش واتە: پۆشەر چونکە ئەو هەقەی بۆی دێ، ڕاستییەکانی ئیمان دایاندەپۆشێ و ڕەفزیان دەکات، ئایا بۆچی خوای زاناو شارەزا ئەو وشەیەی بەکارهێناوە بۆ کەسی بێبڕوا؟ چونکە لە ناخی مرۆڤدا داخوازی ئیمان هەیەو، ئەو مرۆڤە (بێبڕوا) داخوازییەکانی کە لە زگماك و دەروونیدا هەن، لە ناخیدا هەن، سەرکوتیان دەکات و دایاندەپۆشێ، ئنجا (**كَافِر**) ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە، واتە: کوفری هێناوەتە دی (**فَاعِلُ الكُفْرِ**)، هەروەها (**مُؤْمِن**)یش، ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە، یانی: کەسێك کە ئیمانی هێناوەتە دی (**فَاعِلُ الإيْمَان**)، کەواتە: هەردووکیان کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ﴾، واتە: هەتانە بێبڕوایی هێناوەتە دی و بۆ خۆی پەیدای کردوەو، هەشتانە ئیمانی پەیدا کردوە، ئیدی خوا ﷻ نەیفەرمووە: هەتانە کوفرم بۆ خوڵقاندوەو، هەشتانە ئیمانم بۆ خوڵقاندوە، ئنجا ئەگەر بگوترێ: خوا ﷻ کوفری کافرانی هێناوەتە دی، هیچ ڕۆڵێکیان بۆ نامێنێتەوە، ئایا مرۆڤ چ کاریگەرییەکی دەبێ لە پەیداکردنی کوفردا کە خوا بۆی هێناوەتە دی؟! وەك چۆن خوا ﷻ جەستەی بۆ ئێمە هێناوەتە دی، ئایا ئێمە دەتوانین چیدیکە بکەین، خوا ئەو جەستەیەی بەو شێوەیە بۆ هێناوینە دی، دوو چاو و دوو گوێ و دوو دەست و دوو لاق و لووتێك و هەتا کۆتایی، مەگەر دەستکاریی بکەین و

بیگۆڕین، ئەگەرنا ناتوانین لێی زیاد بکەین، کەواتە: خوا ئەگەر کوفری کافران بێنێتە دی، ئەوان دەتوانن چی لێ بکەن، تازە خوا هێناویەتە دی و تەواو بووە، هەروەها ئەگەر خوا ئیمانی ئیمانداران بێنێتە دی و بیخوڵقێنێ و لەبەردەستیان دابنێ، ئەوان هیچیان بۆ ناکرێ، هیچیان بۆ نەماوەتەوە.

ئەم ڕایەشم ڕایەکی تازەو نوێیە، بەڵام لەمێژە ئەو ڕایەم گوتووە سەرەتا لەو مەوسووعەیەدا کە لە سجنی ئەمریکاییەکاندا نووسیومە: (**الإسلام كما يتجلى في كتاب الله**)، لە بەرگی دووەمدا ئەو ڕاستییەم خستۆتەڕوو، دواییش لە ژمارەیەك لە کتێبەکانی دیکەم دا بۆ وێنە: (ڕوونکردنەوەی عەقیدەی تەحاویی) و، مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع)دا، کە لە ڕاستییدا خوا ﷻ بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤ نیە، چونکە کردەوەکانی مرۆڤ مەخلووق نین تاکو پێویستییان بە خالیق هەبێ، بەڵکو کردەوەکانی مرۆڤ: مەجعوولن، مەفعوولن، مەعموولن، کەسبن، ئیقتیڕافن، ئیجتیڕاحن، خوا ئەو وشانەی هەموویان بۆ کردەوەکانی مرۆڤ بەکارهێناون:

١- ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا ... ﴾ **يونس: ٥٩.**

٢- ﴿ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾ **المائدة.**

٣- ﴿ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ **البقرة.**

٤- ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ... ﴾ **البقرة: ٢٨٦.**

٥- ﴿ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُۥ فِيهَا حُسْنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ **الشورى.**

٦- ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ... ﴾ **الجاثية: ٢١.**

بەڵێ کردەوەکانی مرۆڤ وەدەستهێنراون، ئەنجامدراون، کراون، مرۆڤیش توانای ئەوەی هەیە کە کردەوەکانی خۆی ئەنجام بدات، ئەوەتا خوای موتەعال بۆ خۆی دەفەرموێ: ﴿ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ﴾، کافر کەسێکە کوفر دێنێتە دی

و پەیدای دەكات، نەك بیخوڵقێنێ، چونكە كوفرێك كە كافر هەڵیدەگرێ، شتێك لە نەبوون پەیدا نەبووە، بەڵكو هەر بەو عەقڵەی خوا پێیداوەو بەو ویستەی كە خوا پێیداوەو، بەو زمانەی خوا پێیداوە، كوفر لە عەقڵی خۆیداو، لە دڵیدا دەچەسپێنێ و، بە زمان تەعبیری لێ دەكات و، بە ئەندامەكانیشی ممارەسەی دەكات، هەروەها ئیمانی ئیمانداران و تاعەتی ئیماندارانیش بەهەمان شێوە، شتێك نەهاتۆتە دی كە بوونی نەبووبێ، بەڵكو هەر بەو ئەندامانەو بەو تواناو وزانەی خوا بۆ مرۆڤی خوڵقاندوون، پەیدای كردوون، خواش بەدیهێنەر (خالق) ی هەموو شتێكەو، هەموو شتێكی دروستكراو خوا بەدیهێنەریەتی.

ئەو ڕایەی منیش نە ڕایەكەی موعتەزیلەیە، نە ڕایەكەی ئەشعەرییەكانیشە.

پێم وایە ئەوە ئەو ڕایەیە كە ڕێك لەگەڵ قورئان و سوننەتدا دەگونجێ.

موعتەزیلە دەڵێن: مرۆڤ بەدیهێنەری كردەوەكانی خۆیەتی، واتە: مرۆڤ دەكەن بە بەدیهێنەر (خالق)، بەڵام خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ ﴿٦٢﴾ ﴾الزمر، واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە.

جەبرییەكان بە تایبەت و ئەشعەرییەكانیش لە دوای ئەوان دەڵێن: مرۆڤ هیچ كارەیە بەڵێ: دوایی دەڵێن: مرۆڤ كردەوەكانی خۆی وەدەست دێنێ، بەڵام وەختێك خوا كردەوەكانی مرۆڤ بخوڵقێنێ، هیچ نەماوەتەوە بۆ مرۆڤ كە بەدەستی بێنێ.

ئێمە كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**الصافات**)دا، لە ڕوونكردنەوەی ئەو ئایەتە موبارەكەدا كە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، لەوێشدا ئەو باسەمان كردوە، كە هەندێك لە زانایان ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، خوا خۆتانی خوڵقاندوەو ئەوەش كە دەیكەن، گوتوومانە: ئەوەی دەیكەن (**ما تعملون**) مەبەست پێی كردەوەكانیان نیەو مەبەست پێی ئەو پەیكەرانەیە

کـە تاشـیویانن، چونکـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾، ئایـا شـتێك دەپەرسـتن کـە خۆتـان پەیکەرەکـەی دەتاشـن؟، ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، خـوا خۆشـتان و ئـەوەش کـە دروسـتتان کـردوە، (واتـە: پەیکەرەکانیشـی) خوڵقانـدوون؟ نـەك مەبەسـت پێـی کـردەوە بـێ و، خـوای پـەروەردگار بـە تەعبیـری موعتەزیلـەو ئەشـعەرییەکان، فەرمایشـتی نەفەرمـووەو، دوایـی ئـەو مەدرەسـەو قوتابخانانـە پەیـدا بـوون!!

کەواتـە: خەتـی نێوەڕاسـت و هـەق ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێکە، کـە بەدیهێندراوبـێ، بـەڵام مرۆڤیـش دەسـتەپاچە نیـەو پـەڕە مریشـك نیـە، وەك جەبرییـەکان دەڵێـن، هـەروەك مـرۆڤ وەك خـوای پەروەردگاریـش نیـە وەك چـۆن خـوا شـتان پەیـدا دەکات لـە نەبـوون، مرۆڤیـش پەیدایـان بـکات لـە نەبـوون، بەڵکـو ئـەو شـتانەی خـوا پەیـدای کـردوون، مـرۆڤ دەتوانـێ دەسـتکارییان بـکات و دەسـتیان تێوەربـداو، دەتوانـێ کوفـر وەدەسـت بێنـێ و، دواییـش گوناهـو تـاوان و خراپـەش وەدەسـت بێنـێ، هـەروەك مـرۆڤ دەتوانـێ ئیـمان وەدەسـت بێنـێ و، لـە دوای ئیمانیشـەوەو لـە بەرهەمـی ئیمانـدا، چاکـەو تاعـەت و فەرمانبەریـی وەدەسـت بێنـێ، کەواتـە: کردەوەکانـی مـرۆڤ دروسـتکراو نیـن، تاکـو ناچاربیـن یـان بڵێیـن: خـوا خوڵقاندوونـی، یاخـود مـرۆڤ خوڵقاندوونـی وەك جەبرییـەو موعتەزیلـە دەڵێـن، بەڵکـو کـردەوەکانی مـرۆڤ وەدەسـتهێنراون و، مرۆڤیـش بـۆ خـۆی وەدەسـتهێنەری کردەوەکانیەتـی.

**مەسەلەی دووەم:**

**سەرنجڕاکێشانی خوا ﷻ بۆ مێژووی گەلانی بێبڕوا، کە سزای سەرەنجامی شوومیان چێژتوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، بەڵام ئەوان گوتیان: چۆن مرۆڤ ڕێنماییمان دەکەن و ڕێمان پیشان دەدەن؟ ئیدی پشتیان هەڵکردو خواش لێیان بێنیازبوو، چونکە خوا بێنیازی ستاییشکراوە بە ڕەهایی:**

وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ ۚ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)-** ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ﴾، ئایا هەواڵی ئەوانەی بێبڕوابوون لەمەوبەر بۆتان نەهاتوە؟ ئەمە لە ڕێزمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: پرسیارکردنی پێچەسپاندن (**الإستفهام التقريري**)، چونکە بەرامبەرەکە ناتوانێ نکووڵیی بکات کە ئەوانەی بێبڕوا بوون، گەلانی بێبڕوا، بەسەرهات و دەنگ و باس و خواسێکیان بووەو دەنگوباسی ئەوانیان پێگەیشتوە، هەموویان بەسەرهاتی نووح عليه السلام و گەلەکەی و تۆفانەکەی، هەروەها بەسەرهاتی ئیبراهیم عليه السلام یان پێگەیشتوە، کە ئەو دوو پێغەمبەرە، دوو پێغەمبەری نێو نەتەوەیی بوون، پاشان زۆربەیان بە تایبەت لە نیوە دوورگەی عەرەبیی و، شام و دەوروبەری بەسەرهاتی گەلی عادو ثەموودو، گەلی مەدیەن و گەلی لووطیان هەر بیستوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ﴾، ئایا ئەوانەی بێبڕوابوون لەوە پێش هەواڵەکەیانتان بۆ نەهاتوە؟ لێرەدا ئەمە گواستنەوەیە لە: بە کنارەو لە پەناڕا قسە لەگەڵ کردن، بۆ بە ڕوون و ڕاشکاویی قسە لەگەڵدا کردن.

**٢)-** ﴿ فَذَاقُوا۟ وَبَالَ أَمْرِهِمْ ﴾، سەرەنجامی شوومی کاری خۆیانیان چێژت.

(وَبَالَ)، لە (وَبْل و وَابِل)ەوە، هاتوە و هەردووکیان بە مانای: بارانی دڵۆپە قورس (المَطَرُ الثَّقِيْل القِطَار)ن، (قِطَار) کۆی (قَطْرَة)یە، واتە: بارانی دڵۆپە قورس، ئنجا لەوەوە (وَبَالَ)، بە مانای قورسیی و سەختیی دێ و، کە دەفەرموێ: ﴿فَذَاقُواْ وَبَالَ أَمْرِهِمْ﴾، واتە: سزای کارە سەختەکەی خۆیان، یان سەرەنجامە شووم و سەختەکەی خۆیانیان چێژت، (أَمْر)، بە مانای: (شَأن)ە، واتە: حاڵ.

٣)- ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، لە ڕۆژی دواییشدا سزاو جەزرەبەیەکی بە ئێش و ژانیان بۆ هەیە.

٤)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ئاشکرایەکانیان بۆ هێنان، (ذَلِك)، ئاماژەیە بۆ ئەوەی پێشتر باسکراوە، واتە: ئا ئەو سزا پێچێژتنە، ئا ئەو ئازاری بە ئێش بۆ ئامادەکردنە لە ڕۆژی دواییداو، پێش ئەوەش، سزای سەخت پێچێژتنە لە دنیادا، ﴿بِأَنَّهُۥ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، بەهۆی ئەوەوەیە کە پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، (بيِّنة)، واتە: بەڵگەیەکی زۆر ڕۆشن کە هیچ کەس نەتوانێ نکووڵیی لێ بکات، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هیچ کامیان بەبێ موعجیزەو بەڵگەیەکی ڕوونی بێ چەندو چوون، نەهاتوە، چونکە خوا ﷻ یەکێك لە سیفەتەکانی بریتیە لەوەی کاربەجێیەو لێزانە، حیکمەتی خواش وا دەخوازێ کە هەر کەسێك بنێرێ بۆ کارێك، هۆکارو ئامرازەکانی جێبەجێ کردنی ئەو کارەی بۆ بڕەخسێنێ، بە کەسێك بفەرموێ: بچۆ ببە بە نوێنەرو ڕەوانەکراوی من و پەیامی من بە خەڵك بگەیەنە، بێگومان خەڵك داوای بەڵگەی لێ دەکات، بۆیە هیچ پێغەمبەرێك بەبێ بەڵگە نەبووە، خوا ﷻ تەعبیری (البيِّنَات)ی بۆ پێغەمبەران لە زۆر شوێن دووبارە کردۆتەوە، واتە: بەڵگە ڕۆشنەکان، هەروەها لە سوورەتی (هود)دا، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەموویان دووبارەی دەکەنەوە: ﴿أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ﴿٢٨﴾﴾هود، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ﴿٥٧﴾﴾الأنعام، هەروەها نووح و هوودو صاڵیح و شوعەیب و هەموو پێغەمبەرانی دیکەش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەر ئەوە ویردی سەر زمانیان بووە: من لە لایەن

پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشنم و، پێغەمبەریش ﷺ «وەك چەند جارێك ئەو فەرمایشتەمان هێناوە» فەرموویەتی: {**مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ**} (**أخرجه أحمد: ٨٤٧٢، والبخاري: ٤٦٩٦، ومسلم: ١٥٢**) واتە: هیچ کام لە پێغەمبەران نەبووە، مەگەر بەڵگەیەکی وای دراوەتێ، موعجیزەیەکی وای دراوەتێ، کە لەسەر ئەوە خەڵك بڕوا بێنن، واتە: کەسێك کە لە ڕاستیی بگەڕێ و لێی بخەفتێ، ئەو پێغەمبەرەی خوا ناردوویەتی، بەڵگەیەکی وای پێداوە، بە کەڵکی ئەوە بێ و بایی ئەوەندە بێ، بەرانبەرەکەی پێ ئیقناع بکات، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەو چێژتنی سەرەنجامە شوومەی دنیایان و، ئەو بۆ ئامادەکرانەی ئازارە بە ئێشەی ڕۆژی دواییان، بەهۆی ئەوەوەیە کە پێغەمبەرانیان بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان کەچی پێیان بێبڕوا بوون، مەرجیش نیە، (**بَيِّنَات**)، لێرەدا تەنیا موعجیزەکانی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) بن، بەڵکو ئەو پەیامەی هێناویانە، پەیامێکی ڕوون بووەو، نێوەڕۆکی ئەو پەیامەش هەرچی چاکەیە فەرمانی پێکردوەو هەرچی خراپەیە قەدەغەی کردوەو، ڕاستییەکانی لە بارەی بوون و، لە بارەی خوای پەروەردگارو، گەردوون و دنیاو دواڕۆژەوەو، دەربارەی ژیانی مرۆڤەوە، خستوونەڕوو، وشەی (**بَيِّنَات**)، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، ئنجا ئەوان چییان گوت؟

٥)- ﴿فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا﴾، گوتیان: ئایا مرۆڤەکان ڕێنماییمان دەکەن؟ پێشتریش گوتوومانە: وشەی (**بَشَر**)، بۆ تاکیش و بۆ دووانیش و بۆ کۆش دەبێ، لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، فیرعەون و دارو دەستەکەی گوتوویانە: ﴿فَقَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا﴾، ئایا بڕوا بۆ دوو بەشەری وەك خۆمان بێنین؟! چونکە (**بَشَر**)، بۆ تاکیش دەبێ و، ئەگەر بویستری بگوترێ: دووان دەکرێتە (**مثنّى**)، بەڵام لێرەدا (**بَشَر**)، بۆ کۆ (جمع) بەکارهاتوە، بە بەڵگەی ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا﴾، ئایا مرۆڤەکان ڕێنماییمان دەکەن و ڕێمان پێشان دەدەن، هەمزە (أ)ی (**أَبشر**)یش (**للإسْتِفْهَام الإنْكَارِيّ**)، بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: نابێ و کەی مرۆڤ شایستەی ئەوەن ڕێنمایی ئێمە بکەن و ڕێمان پێشان بدەن بەرەو خوا، چۆن مرۆڤ لێیان دەوەشێتەوە ببنە نوێنەری خوا؟!

٦)- ﴿فَكَفَرُواْ وَتَوَلَّواْ﴾، ئنجا ئەوان بێبڕوا بوون و پشتیان هەڵكرد، (**تَوَلِّي**)، بریتیە لە لاچوون لەو شوێنەی تۆی لێی، لەو شوێنە لابچی و پشتی تێ بكەی، ئنجا ئەوانە پشت تێكردنەكەیان و ڕوو وەرچەرخاندنەكەیان، لە ئەنجامی بێبڕواییانەوە بوو، هەمیشە هەڵوێستی مرۆڤ لە بیرو بۆچوونیەوە هەڵدەقوڵێ، ئەوانەش لەبەر ئەوەی بێبڕواییان هەبووە بەرانبەر بە پێغەمبەران (**عَلَیْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) بۆیە پشتیشیان تێكردوون، ئەگەر بڕوایان پێهێنابانایە، ڕوویان تێدەكردن، كەواتە: ڕووتێكردن و فەرمانبەرییكردنی هەر كەسێك بۆ پێغەمبەران (**عَلَیْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) و بۆ پەیامی خوا، بە ئەندازەی بڕوا بوونیەتی و ئینسان تاكو ئیمانی زیاتر بێ، فەرمانبەریی باشتر دەبێ و، هەتا قەناعەتی زیاتر بێ، بێگومان كردەوەی چاكی و هەڵوێستی باشی و پابەندیی، زیاتر دەبێ، ئنجا ئایا كە ئەوانە بێبڕوا بوون و پشتیان هەڵكرد، خوا ﷻ چی كرد؟!

٧)- ﴿وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُ﴾، خواش بێنیاز بوو، ئەم (**و**)ە، بۆ بادانەوە (**عَطْف**)یە، یانی: ئەوان كە ئاوایانكرد، خواش بێنیاز بوو.

٨)- ﴿وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾، {ئەم (**و**)ە، لێرەدا بۆ (**حَال**)ە}، لە حاڵێكدا خوا ئەو پەڕی بێنیازو ئەو پەڕی ستاییشكراوە، واتە: خوا لەوان و لە بڕوا هێنانیان بێنیازەو، بێباكیشە لە بێبڕواییان و لە پشت هەڵكردنیان و، ئەگەر ئەوانیش ستاییشی خوا نەكەن و بەندایەتیی بۆ نەكەن، خوا لە زاتی خۆیدا ستاییشكراوەو، خاوەنی هەموو سیفەتێكی بەرزو پەسندەو، شایستەی هەموو جۆرە بەمەزنگرتن و بەپاكگرتن و ستاییشكردن و مل بۆ كەچكردنێكە.

## مەسەلەی سێیەم:

**پووچیی گومان و خەیاڵی بێبڕوایان کە زیندوو ناکرێنەوەو، فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرکەی ﷺ کە سوێند بە پەروەردگاری بخوات: هەڵدەستێنرێنەوەو زیندوو دەکرێنەوەو، هەواڵی کردەوەکانیشیان پێدەدرێ، ئنجا بینا لەسەر ئەوە: فەرمان پێکردنیان کە بڕوا بەخواو بەپێغەمبەرەکەی و ﷺ ئەو ڕووناکییەی دایەزاندوە، بێنن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلۡنَاۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٨ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون پێیان وابوو زیندوو ناکرێنەوە، (زَعَمَ)، هەم بە مانای گومانی برد (**ظَنَّ**)، هەم بە مانای لافلێدان( دێ، (**الزَّعْمُ: القَوْلُ المَوْسُومُ بِمُخَالَفَةِ الوَاقِعِ خَطَأً، وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمَل الزَّعْمُ فِيمَا هُوَ بَاطِلٌ أو ارتِيَابٌ**)، (**زَعْم**): قسەکردنێکە پێچەوانەی واقیع بێ بە هەڵە، بە زۆریی وشەی (**زَعْم**) بەکاردەهێنرێ بۆ شتێك کە پووچە، یاخود جێی دوو دڵییە، کەواتە: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون پێیان وابوو، یاخود ئەوانەی بێبڕوابوون لافیان لێدا، بە هەڵە بە خەیاڵپڵاوی خۆیان گوتیان: ﴿ أَن لَّن يُبۡعَثُواْ ﴾، کە هەرگیز زیندوو ناکرێنەوەو هەڵناستێنرێنەوە، پێشتر مانای وشەی (**بَعْث**)مان، کرد (**بُعِثَ يُبْعَثُ**)، لێرەدا (**يُبْعَثُوا**)، لە (**بَعْث**)، بە مانای وروژاندن و، ناردن و، بڵاوکردنەوەو، بە مانای هەڵستاندنەوە دێ، وەك خوا لە بارەی (**أَصْحَابُ الكَهْف**)ەوە، دەفەرموێ: ﴿ بَعَثۡنَٰهُمۡ ١٩ ﴾**الكهف**، واتە: ئێمە لە خەوەکەیان بێدارمان کردنەوە، (**بَعْث**)، بە مانای لە خەو هەڵسان و بێداربوونەوە دێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡ ١٩ ﴾**الكهف**، ئاوا بێدارمان کردنەوە بۆ ئەوەی لە نێو خۆیاندا بپرسن، هەروەها بە مانای زیندوو

کردنەوەش دێ و، بە مانای ناردنیش دێ، لێرە بە دڵنیایی بە مانای هەڵستێنرانەوەیە لە مەرگ و زیندوو کرانەوەیە.

٢)- ﴿ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ﴾، {خوا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات و دەفەرموێ:} بڵێ: با، سوێند بە پەروەردگارم، بە دڵنیایی هەڵدەستێنرێنەوە، (**حَرْفُ بَلَى: حَرْفُ جَوَابٍ لِلْإِبْطَالِ خَاصٌّ بِجَوَابِ الْكَلَامِ الْمَنْفِيِّ لِإِبْطَالِهِ**)، (بَلَى): پیتی وەڵامدانەوەیە بۆ هەڵوەشاندنەوەو، تایبەتە بە وەڵامی قسەیەکی لابردراو، بۆ هەڵوەشاندنەوەی.

بۆ وێنە: کەسێك دەڵێ: ئایا باران نەباریوە؟ تۆ بۆ هەڵوەشاندنەوەی قسەکەی، کە قسەکەی لابردنە، ئەگەر بڵێی: (**نَعَمْ**)، مانای وایە پشتگیرییت کرد کە نەباریوە، بەڵام کە گوتت: (**بَلَى**)، واتە: با باریوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی قسەکەی، بۆیە لە زمانی کوردییدا (**نَعَمْ**) دەبێتە: بەڵێ، بەڵام (**بَلَى**) دەبێتە: با، یەکێك دەڵێ: ئایا من ئەو شتەم نەدا بەتۆ؟ ئەگەر بتەوێ بڵێی: پێت دام، دەبێ بڵێی: (**با**)، بە عەرەبیی (**بلى**)، بەڵام ئەگەر بتەوێ بڵێی: نەخێر ئەو شتەت پێ نەدام، دەڵێی: (**نعم**)، واتە: بەڵێ پێت نەدام، ﴿ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ﴾، بڵێ با سوێند بە پەروەردگارم ئێوە بە دڵنیایی زیندوو دەکرێنەوەو هەڵدەستێنرێنەوە.

٣)- ﴿ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ﴾، دوایی بە دڵنیایی هەواڵتان پێدەدرێ بەوەی کردووتانە، (**ثُمَّ**) لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەیی و پێگەییە، واتە: لە گرنگەوە بۆ گرنگتر چوون، چونکە ئەوە کە هەواڵیان پێبدرێ بەوەی کردوویانە، گرنگترە لەوەی زیندوو بکرێنەوە، یانی: زیندوو دەکرێنەوە، بەڵام لەوەش گەورەترو گرنگتر ئەوەیە کە هەواڵیشتان پێدەدرێ بەوەی کردووتانە، (**لَتُنَبَّؤُنَّ**)، یانی: (**لَتُخْبَرُنَّ**)، هەواڵتان پێدەدرێ، (**الإِنْبَاءُ: الإِخْبَار**)، پێشتریش گوتوومانە: (**النَّبَأُ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيْمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ أَو غَلَبَةُ ظَنٍّ**)، ڕاغیبی ئەصفەهانیی وشەی (نَبَأ)ی، وا مانا کردوە، دەڵێ: هەواڵێکە سوودێکی مەزنی هەیە، کە بە هۆی ئەو هەواڵەوە، زانیاریی بۆ مرۆڤ پەیدا دەبێ، یاخود گومانێکی زاڵ.

٤)- ﴿وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾، ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە، (ذَٰلِكَ)، ناوی ئاماژەیە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (البَعْث)، واتە: ئەو زیندوو کرانەوەیە و هەڵستێنرانەوەیە، یاخود بۆ کۆی ئەوەی باسکرا، واتە: هەم زیندوو دەکرێنەوە، هەم هەواڵتان پێدەدرێ بەوەی کە کردووتانەو، هەم سزا دەدرێن ئەی بێبڕواییەکان.

٥)- ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلۡنَا﴾، ئنجا بڕوا بە خواو پێغەمبەرەکەی و ئەو ڕووناکییە بێنن، کە دامانبەزاندوە، ئەم (ف)یەی (فَآمِنُوا)، (**الْفَاءُ: فَصِيْحَةٌ تُفْصِحُ عَنْ شَرْطٍ مُقَدَّرٍ، وَالتَّقْدِيرُ: فَإِذَا عَلِمْتُمْ هَذِهِ الْحُجَجَ وَتَذَكَّرْتُمْ مَا حَلَّ بِنُظَرَائِكُمْ مِنَ الْعِقَاب، وَمَا ستنبّؤون بهِ مِنْ أَعْمَالِكُمْ:** ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلۡنَا﴾)، (**ف**)، لێرەدا (**فَصِيحَة**)یە، واتە: ڕوونکەرەوەیە بۆ مەرجێکی مەزەندەکراو کە مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە:

ئەگەر ئەو هەموو بەڵگانەتان زانین و ئەوەشتان هاتەوە یاد کە بەسەر هاوشێوەکانتان هاتوە، لە سزادرانی گەلانی پێشوو، ئەوەشتان زانی کە هەواڵتان پێدەدرێ لە بارەی کردەوەکانتانەوە، کەواتە: بڕوا بە خواو بە پێغەمبەرەکەی و بەو ڕووناکییەی دایبەزاندوە بێنن، کە بێگومان مەبەست پێی قوڕئانە.

﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلنُّورِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلۡنَا﴾، ئەم (**ف**)ە، لە زمانی کوردیدا دەبێتە کەواتە، یان لە ئەنجامی ئەوەدا کە باسکراو ڕابرد، کەواتە بڕوا بێنن بەخواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەو ڕووناکییەی دامانبەزاندوە.

٦)- ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ﴾، خواش شارەزای ئەوەیە کە ئەنجامی دەدەن و دەیکەن، واتە: بە وردەکارییەکانی ئاگادارەو شارەزایە.

### مەسەلەی چوارەم:

**ڕۆژی تێدا کۆکرانەوەی مرۆڤان، ڕۆژی تێدا زیانباربوون و دۆڕانی بێبڕوایانەو، برانە بەهەشتی بڕوادارانی کردار باش بە پاککراوەیی و بردنەوەی مەزنیان بە قسمەت دەبێ و، بێبڕوایانی بە درۆ دانەری ئایەتەکانی خواش دەبنە هاوەڵی ئاگری دۆزەخ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٩﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ خَالِدِينَ فِيهَا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ﴾، ئەو ڕۆژەی (خوا) بۆ ڕۆژی کۆبوونەوە کۆتان دەکاتەوە،

**وشەی (یوم) لێرەدا دوو ئەگەری هەن:**

أ- دەگونجێ (**يَوْم**) مانایەکەی سەربەخۆ بێ، چونکە (**ظَرْف**)ەو، (**مَنْصُوب**)ە، لەسەر (**ظَرْفِيَة**)، واتە: (**اذْكُر يَوْمَ**)، یاد بکەوە ئەو ڕۆژە.

ب- دەشگونجێ (**یوم**) پەیوەست بێتەوە بە ئایەتی پێشەوە کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ﴾، کەی؟ ﴿ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ﴾، ئەو ڕۆژەی کۆتان دەکاتەوە بۆ ڕۆژی خڕ کرانەوەو کۆکرانەوە، یەکێك لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی واتە: قیامەت، کە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییە، بریتیە لە: (**یوم الجمع**) ڕۆژی کۆکرانەوە، هەروەها (**يَوْم الحَشْر**) یش، ڕۆژی خڕکرانەوە، ناوێکی دیکەیەتی.

٢)- ﴿ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ ﴾، ئەو ڕۆژە ڕۆژی بە یەکدی دۆڕاندن، یان ڕۆژی دۆڕانە، پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا وشەی (**تَغَابُنِ**)مان، باسکرد، کە لە (**غَبْنٌ**)ەوە، هاتوە (**الْغَبْنُ**:

**أَنْ يُعْطَى البَائِعُ ثَمَناً دُونَ حَقِّ قِيمَتِهِ الَّتِي يُعَوَّضُ بِهَا مِثْلُهُ**)، (**غَبْنٌ**)، ئەوەیە بابای فرۆشیار نرخێكی بدرێتێ، كەمتر لە ئەو نرخەی وێنەی ئەوی پێ قەرەبوو دەكرێتەوە، واتە: كەسێك شتێ بفرۆشێ، بەڵام نرخێكی كەمتری بدرێتێ كە شایستەی كاڵایەكەیەتی، ئەوە (**غَبْن**)ە، (**غَبْن**)، واتە: زیانباربوون یاخود زیان لێدران، دۆڕان، لەدەست چوون، بەڵام كە لێرەدا بە (**تَغَابُن**)، هێناویەتی كە لەسەر كێشی (**تَفَاعل**)ە، دوو واتای هەن:

**أ-** بە مانای ئەوەیە كە زیانەكە لە هەردووك لایان دەبێ، چونكە هەر لایەك ئەو بەشەی بۆ لایەكەی دیكە دانراوە، پشك و بەشەكەی وی دەبات، كە ئەوە دوایی زیاتر شیی دەكەینەوە.

**ب-** یاخود ڕێژگەی (**تَفَاعل**)، لێرەدا بەكارهێنراوە بە مەجاز، بۆ زۆریی پەیدا بوونی زیان.

ئنجا ئەگەر مانای یەكەمیان بێ و زیانبار بوون لە هەردوو سەرەوە بێ، یان دۆڕان لە هەردوو سەرەوە بێ، زانایان دەڵێن: ئەهلی بەهەشت كە دەچنە بەهەشت وێڕای شوێنی خۆیان كە بۆیان دانراوە، هەر كامێكیان شوێنی بێبڕوایەكیش كە ئەگەر بڕوای هێنابایە، بۆی دانراوە لە بەهەشتدا، شوێنی ئەویش بە میرات دەگرێ و ئەو دەبێ دەبێتە میراتگری، بۆیە هەندێك لە زانایان دەڵێن: خوای پەروەردگار كە وشەی (**میراث**)ی بەكارهێناوە: ﴿ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا ﴿٧٢﴾ ﴾الزخرف، ئەو بەهەشتەی كراوەتە میراتتان، مەبەست پێی پشك و بەشی ئەو كەسانەیە كە گریمانەیان بۆ كراوە، ئەگەر بڕوایان هێنابایە، ئەوە شوێن و جێ و ڕێیان دەبوو، ئنجا ئێستا كە چوونە دۆزەخ، ئەو بەهەشتییانە شوێنی ئەوانیش بە میرات دەگرن.

هەروەها هەر كەسێك كە دەچێتە بەهەشت، شوێنێكیشی بۆ دانراوە لە دۆزەخداو كە ئەگەر بێبڕوا بووایە دەیچۆیە، ئنجا ئەوانەی بێبڕوان، شوێنە داندراوەكانی بڕوادارانیش كە ئەگەر بێبڕوابوونایەو چووبان بۆ دۆزەخ، دەیانچوونێ، ئەو شوێنانەش بە میرات دەگرن و، لە فەرمایشتێكی صەحیحی

پێغەمبەردا ﷺ هاتوە[1]: هەر کەسێك دەچێتە بەهەشت، خوا ﷻ شوێنە بۆ داندراوەکەشی لە دۆزەخدا پێشان دەدا، ئەگەر خراپەی کردبایە، بۆ ئەوەی زیاتر سوپاس و ستاییشی خوا بکات، {خوایە! ستاییش بۆ تۆ کە هیدایەتت دام و هاتمە ئەم بەهەشتەو نەچوومە دۆزەخ}.

هەروەها هەر کەسێك کە دەچێتە دۆزەخیش، شوێنە بۆ داندراوەکەی لە بەهەشتدا پێشان دەدرێ، ئەگەر چاکەی کردبایە، بۆ ئەوەی زیاتر خەفەت و حەسرەت و دڵتەنگیی بۆ بێتە پێش، {کە خوایە! من چیم لەدەست خۆم دا! ئەو شوێنە خۆشەم لە دەست خۆم دا}.

ئەمە ئەگەر مانای (تَغَابُنِ)، لەسەر مانا یەکەمە ڕاستەقینەکەی خۆی بێ، واتە: هەر کامێکیان زیان لەوەی دیکە دەدا، بەڵام بە دڵنیایی ئەمە هەر بۆ وێکچوون (مُشَاكَلَة)ە، وەك خوای پەروەردگار لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾﴾ **الطارق**، یان: ﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٥٤﴾﴾ **آل عمران**، کە بێگومان هی بێبڕوایەکان بە پیلان و فێڵ، لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام هی خوای کاربەجێ مانایەکەی نەخشەیە، بەڵام لەبەر موشاکەلەو وێکچوون، خوا ﷻ وشەی (**مَكْر وكَيْد**)ی، بۆ خۆی بەکارهێناون، لێرەش ئەوەی زیان دەدا لە بەرانبەرەکەی هەر بەهەشتییەکانن، کە شوێنی بێبڕوایەکان بە میرات دەگرن لە بەهەشتدا، ئەگەرنا ئەوە هیچ زیان لێدرانێك نیە، بابای بەهەشتیی کە دەچێتە بەهەشت، شوێنەکەی کە لە دۆزەخدا بۆی دانراوە، بابای بێبڕوا، ئەو شوێنە بەمیرات بگرێ.

ئەگەر مانای دووەمیشیان بێ، مانای وایە ئەو ڕۆژەیە کە بێبڕوایەکان زۆر تێیدا دەدۆڕێن، زۆر زیان و زەرەرێکی گەورەیان دەکەوێتە سەر.

---

(١) {لَا يَدْخُلُ أَحَدٌ النَّارَ إِلَّا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ لَوْ أَحْسَنَ لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً، وَلَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَحَدٌ إِلَّا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ لَوْ أَسَاءَ لِيَزْدَادَ شُكْرًا} أخرجه البخاري: ٦٢٠٠، وابن حبان: ٧٤٥١.

٣)- ﴿ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا ﴾، هەر کەسێکیش بڕوا بە خوا بێنێ و کردەوەی باش بکات.

٤)- ﴿ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ ﴾، (خوا) خراپەکانی لێ دەسڕێتەوە، (**يُكَفِّر**)، خوێندراویشەتەوە: (**نُكَفِّر**)، یانی: خراپەکانی لێ دەسڕینەوە، خوا خراپەکانی لێ دەسڕێتەوەو پاکی دەکاتەوە، (**سَيِّئَات**)، کۆی (**سَيِّئَة**)یە، واتە: خراپەکان، (**سيئات**)یش وێڕای کوفر هەموو جۆرە تاوانەکانی دیکەش بە گەورەو بچووکەوە، دەگرێتەوە.

٥)- ﴿ وَيُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، (خوا) دەیخاتە باخانێکەوە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، خوێندراویشەتەوە: (**وَنُدْخِلْهُ**)، یانی: دەیخەینە باخانێکەوە ڕووباریان بە بەردا دەڕۆن، خوا دەیخاتە نێو چەند باخێکەوە، کە ڕووبارو جۆگەو جۆبار بە ژێر درەختەکانیاندا دەڕۆن.

٦)- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، واتە: لێیان نایەنە دەرێ و لەوێدا هەرماو دەبن.

٧)- ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾، ئا ئەوە بردنەوەو بە ئامانج گەیشتنی مەزنە، (**الْفَوْزُ: نَيْلُ المَطْلُوبِ سَالِمَاً**)، (**فَوْز**): بریتیە لەوەی مرۆڤ ئاواتی خۆی بەدەست بێنێ و بە ئامانجی خۆی بگات و سەلامەتیش بێ.

شایانی باسە: خوا ﷻ ئەم شێوە وەسفەی جێگاو ڕێگای بەهەشتییان زۆر لە قورئاندا دووبارە دەکاتەوە، کە بریتیە لە هەبوونی ڕەز و باخ، کە کانیی و سەرچاوەو ڕووبار و ژێریاندا دەڕۆن، هەروەها خانووبەرەو کۆشکی بەرزو، تێیاندا هەرماو دەبن، چونکە ئەو وەصفانە هەموویان وەڵامی داخوازیی قووڵیی زگماك و ناخی مرۆڤ دەدەنەوە، مرۆڤەکان هەموویان کەیفیان دێ، بە شوێنی سەوزایی و دارو درەخت، بە جۆگەو جۆبارو کانیی و سەرچاوە، بە ڕووبار بە تاڤگەکان، هەروەها مرۆڤەکان هەمیشە حەزیان لە کۆشك و تەلارو شوێنی بڵندە، هەموو مرۆڤەکانیش حەزیان لە هەرماو بوون و، لە نێو

نەچوون و بەردەوام بوونە لە ژیاندا، بۆیە خوا ﷻ ئەو شتانەی لە قووڵایی فیترەت و ناخی مرۆڤدا هەن، لە بەهەشت دا دایناون، خوا بۆ خۆی مرۆڤی دروستکردووەو دەزانێ داخوازییەکانی چین و، بەپێی داخوازییەکانیشی پاداشتی دەداتەوەو، هەر ئەوەش کە لە بەهەشت دا دایناوەو ئامادەی کردوە، باس دەکات، بە ئەندازەی ئەوەی لە کەوڵی وشەکاندا جێی دەبێتەوەو، عەقڵ و دڵی ئێمە دەتوانێ وەخۆی بگرێ و ئیستیعابی بکات، چونکە وەك جاری دیکەش باسمانکردوە، بە دڵنیایی ئەوەی خوا دایناوە بۆ بەهەشتییان، تەنیا ئەوەندە نیە، کە باس دەکرێ و باس کراوە، بەڵام زمان و وشەو دەربڕینەکان بەس جێی ئەوەندەیان تێدا دەبێتەوەو، ئێمەش ئێستا لەم ژیانە دنیاییەدا، هەر لەوەندە حاڵیی دەبین و هەر لەوەندە تێدەگەین، بەڵگەشم ئەوەیە کە خوا ﷻ لە سوورەتی **(السجدة)** دا، دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ ﴿١٧﴾ ﴾، هیچ کەس نازانێ ئەوەی بۆی پەنهان کراوە لەوەی مایەی دڵخۆشیی و شادمانییەتی.

هەروەها فەرمایشتەکەی پێغەمبەریش ﷺ ڕوونە کە دەفەرموێ: {**فيها مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ**} **(أخرجه أحمد: ٢٢٨٧٧، ومسلم: ٢٨٢٥)**، واتە: ئەوەی لە بەهەشتدا هەیە، نە هیچ چاوێك دیتوویەتی، نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی، نە بە خەیاڵ و ئەندێشەی هیچ کەسێکیش دا هاتوە.

ئنجا دوایی دێتە سەر باسی سزای بێبڕوایان:

**٨)-** ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوابوون و نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ داناون، (كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ)، واتە: بەردەوام بوون لەسەر کوفرو، بەردەوامیش بوون لەسەر بە درۆ دانانی نیشانەکانمان، بێبڕوابوون واتە: بە خوا بێبڕوابوون و، بە پێغەمبەری خوا ﷺ و بە ڕۆژی دوایی.

**(آيات)** لە **(آيَاتِنا)**دا، کۆی **(آيَة)**یە، کە بە مانای نیشانە دێ و سێ ئەگەری هەن:

أ-- دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەو بڕگەکانی فەرمایشتی خوا بێ.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی دیاردەو دیمەنەکانی دەوروبەرو بوونەوەر بێ.

ج- دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەکانی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) بێ، هەموویان دەگرێتەوە، ئەوانەی بێبڕوا بوون و، نیشانەکانی خوایان بە درۆ دانان.

٩)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن تێیدا هەرماو دەبن، (**أَصْحَاب**) کۆی (**صَاحِب**)ە، کە هەم بە مانای هاوەڵ دێ، واتە: هەمیشە لەگەڵ ئەو ئاگرەدان و لێی جیا نابنەوە، هەم بە مانای خاوەن (**مَالك**)یش دێ، واتە: ئەگەر شتێك هەبێ ئەوان لە ڕۆژی دواییدا ببنە خاوەنی، تەنیا ئاگرە!.

١٠)- ﴿ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾، خراپترین سەرەنجامیش، خراپترین شوێنیش کە کارو بارەکان بۆی دەچن، ئەو ئاگری دۆزەخەیە.

(ل)ی سەر (**ليوم الجمع**) لە ﴿ يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِ ﴾دا، پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی، بە سێ شێوە مانایان کردوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: (**لَام التَّعْلِيْل**)ە، لامی هۆکارهێنانەوە واتە: ﴿ يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِ ﴾: **أي: لأَجْلِ يَوْم الجَمْع**، لە پێناوی ڕۆژی کۆکردنەوەدا کۆتان دەکاتەوە.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: (ل)، لێرەدا بە مانای (**فِي**)یە، یانی: (**يَوْمَ يَجْمَعُكُم فِي يَوْمِ الجَمْع**)، ئەو کاتەی لە ڕۆژی کۆکرانەوەدا کۆتان دەکاتەوە، بەڵام ڕەنگە لەو دووانەی پێشێ باشتر ڕای سێیەم بێ.

ج- (لَ)، (**لَام التَوْقِيْت**)ە، لامی کات دیاریکردن، واتە: لە کاتێکدا کە ڕۆژی کۆکردنەوەیە، وەك دەگوترێ: (**أَتَانِي فُلَانٌ لِخَمْسٍ خَلَوْنَ مِن شوَّالٍ**)، فڵانکەس هات بۆ لام لە کاتێکدا پێنج شەو لە مانگی شەووال تێپەڕیبوون، لە ڕاستییدا ڕای سێیەم لەوانی دیکە باشترە.

لێرەشدا دێینە کۆتایی ئەم دەرسەمان و، لە خوای پەروەردگار داواکارین بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە لە دنیادا دەبنە خاوەنی ئیمان و کردەوەی باش و، پاکیی و چاکییەکی وا، وایان لێ بکات شایستەی ئەوە بن لە ڕۆژی دواییدا بە بەهەشتەکانی خوا شاد بن و، بە دیداری خوای پەروەردگار شاد بن و، لە ئاگری نێڵدراوو بڵێسەداری دۆزەخ پارێزراو و چەپاڵەدراو بن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــزان!

ئـەم دەرسـەمان دەرسـی دووەمـەو هەشـت (٨) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی **(التغابـن)** دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١١ - ١٨)، پێشـتریش گوتمـان: ئـەم هەشـت ئایەتـەش هەشـت بابەتـی گـەورەو گرنگـی جـۆراو جـۆر دەگرنـە خۆیـان:

١- هیچ بەڵایەك بەسەر کەس نایەت، بەبێ مۆڵەتی خوا.

٢- فەرمانکردن بە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

٣- جگە لە خوا هیچ پەستراوێك کە شایستەی پەرستران بێ، نیە.

٤- بڕواداران پێویستە تەنیا پشت بەخوا ببەستن.

٥- هەندێك لە ژن و منداڵی بڕواداران، مایەی زیانباریین بۆیان و، پێیان دەکەونە گرفتارییەوە، وەك چۆن دوژمنێك زیان بە دوژمنەکەی دەگەیەنێ، ئاوا دەچنە ئەو قاڵبەوە.

٦- پێویستە بڕواداران هەتا دەتوانن، پارێز لە خوا بکەن.

٧- قەرزی باشدان بە خوا، مایەی پاداشتی چەند بەرانبەر پێدرانە، لەلایەن خوای بەخشەری میهرەبانەوە.

٨- خوا سوپاسگوزارو، هێدیی و، زانای پەنهان و ئاشکراو، باڵادەستی، کاربەجێیە.

﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ

أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَـٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُوا۟ وَتَصْفَحُوا۟ وَتَغْفِرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَـٰدُكُمْ فِتْنَةٌ ۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ وَٱسْمَعُوا۟ وَأَطِيعُوا۟ وَأَنفِقُوا۟ خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ ۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَـٰعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هیچ بەڵایەك بەسەر (هیچ کەس) نایەت، مەگەر بە مۆڵەتی خواو، هەر کەسیش بڕوا بە خوا بێنێ، دڵی ڕێنمایی دەکات (بۆ خۆڕاگریی) و، خواش بە هەموو شتێك زانایە ﴿١١﴾ فەرمانبەریی خوا بکەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتتان کردەوە، بە دڵنیایی پێغەمبەرەکەمان تەنیا گەیاندنی ڕوونی لەسەرە (و خۆتان بەرپرسیارن) ﴿١٢﴾ خوا جگە لەوی هیچ پەرستراوێك نیەو، با بڕوادارانیش بەس پشت بە خوا ببەستن ﴿١٣﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان (بەشێك) لە هاوسەرانتان و ڕۆڵەکانتان بۆتان دوژمنن، ئنجا وریایان بن و، ئەگەر وازبێنن (لە سزادان) و چاوپۆشیی بکەن و ببوورن، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بەبەزەییە ﴿١٤﴾ مسۆگەر سامانەکانتان و ڕۆڵەکانتان (هۆکاری) تاقیکردنەوە (و مەینەتی)ن و، خواش پاداشتی مەزنی لەلایە ﴿١٥﴾ ئنجا هەتا دەتوانن پارێز لە خوا بکەن و، گوێ بگرن و فەرمانبەریی بکەن و ببەخشن، باشترە بۆ خۆتان و، هەر کەسیش لە (خراپەی) چرووکیی خۆی بپارێزرێ، ئەوانەن سەرفرازان ﴿١٦﴾ ئەگەر قەرز بە خوا بدەن بە قەرز پێدانێکی باش، بۆتان چەند بەرانبەر دەکاتەوە (لە پاداشتدا)و، لێتان دەبووری و، خواش سوپاسگوزاری هێدییە ﴿١٧﴾ زانای پەنهان و ئاشکرایە، زاڵی کاربەجێیە ﴿١٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلۡبَلَٰغُ): (البُلُـوغُ وَالبَـلاَغُ: الإنْتِهَـاءُ إلى أَقْـصَى المَقْصِـدِ وَالمُنْتَهَـى)، وشـەی (بَـلاَغ وَبُلُـوغ)، هەردووکیـان بـە مانـای گەیشـتنن بـە ئەوپـەڕی ئامانـج و مەبەسـتێك، واتـە: گەیشـتن بـە کۆتایـی.

(تَعۡفُواْ): (العَفُـو: التَّجَـافِي عَـنِ الذَّنْـبِ، وَالعَفُـو: تَـرْكُ العُقُوبَـةِ)، (عَفُـو): بـە مانـای دووریـی گرتـن لـە گوناهـو، وازهێنانـە لـە سـزادان.

(وَتَصۡفَحُواْ): چاوپۆشـیی بکـەن، (الصَّفْـحُ: تَـرْكُ التَّثْرِيْـبِ، وَهُـوَ أَبْلَـغُ مِـنَ العَفْـوِ، إذْ قَـدْ يَعْفُـو الإنْسَـان وَلاَ يَصْفَـح)، (صَفْـح): بریتیـە لە وازلێهێنانی سەرزەنشـتکردن، وشـەی (صَفْـح) لـە (عَفـو)، مانایەکـەی بەهێزتـرە، چونکـە جـاری وا هەیـە مـرۆڤ (عَفـو) دەکات، واتـە: واز لـە سـزادانی کەسـێك دێنـێ، بـەڵام چاوپۆشـیی نـاکات، بـەو واتایـەی بـە جۆرێـك لەگـەڵ ئـەو کەسـەدا مامەڵـە بـکات، کـە ئـەو گوناهـەی هـەر نەکـردوە، ئـەو هەڵەیـەی هـەر نەکـردوە، (عَفـو) یـانی: خراپـەی خراپەکارەکـەی لەبیـر دەمێنـێ، بـەڵام واز لـە سـزادانی دێنـێ، بـەڵام (صَفْـح)، ئەوەیـە وەك ئـەو کەسـە گوناهـو هەڵەکـەی هـەر نەکردبـێ.

(وَتَغۡفِرُواْ): (الغَفْـرُ: إلْبَـاسُ الـشَّيءِ مَـا يَصُونُـهُ عَـنِ الدَّنَـسِ، وَغُفْـرَانُ اللـهِ: صَـوْنُ اللهِ العَبْـدَ مِـنْ أَنْ يَمَسَّـهُ العَـذَابُ)، (غَفْـر): بـە مانـای ئەوەیـە شـتێك بکەیـە پۆشـەری شـتێك بـۆ ئـەوەی چڵکـن نەبـێ و، بـە کوردیـی (غَفْـر) دەبێتـە لێبـوردن، لێبـوردنی خـواش ئەوەیـە بەندەکـەی بپۆشـێ لـەوەی سـزای بگاتـێ.

(شُحَّ نَفۡسِهِۦ): (الشُّـحُّ: بُخْـلٌ مَـعَ حِـرْصٍ)، (شُـحّ): بریتیـە لـە چرووکیـی لەگـەڵ سـووریی لەسـەر ئـەوەی ئـەو مرۆڤـە هیچـی لەدەسـت نەبێتـەوە.

(قَرۡضًا حَسَنًا): قەرزێکـی بـاش، وشـەی (قَرْض): ئێمـە هـەر بـە قـەرز بـەکاری دێنیـن، هەندێـك وشـەی (وام) بەکاردێنـن، کـە وشـەکە فارسـییە، بـەڵام وشـەی

قـەرز، کـورد بـە پیتـی (ز)، دەیڵێـن و ناڵێـن (قَـرْض)، تـازە ئـەو وشـەیە کوردێـنراوە زۆر وشـەی عەرەبیـی هـەن، یـان وشـەی زمانەکانـی دیکـە هـەن، هاتوونە نێـو زمانی کوردییـەوەو پێویسـت نـاکات بەرانبەرێکیـان بۆدابتاشـین، کـە سـەرەنجام وشـەیەکی نامـۆ دەربچـێ و خەڵـك تێـی نـەگات، بـۆ وێنـە: قەڵـەم هەمـوو کـەس تێـی دەگات و پێویسـت نـاکات بڵێـی: پێنـووس، دەفتـەر هەمـوو کـەس تێـی دەگات و، پێویسـت نـاکات بڵێـی: تیانـووس، کتێـب هەمـوو کـەس لێـی حاڵیـی دەبـێ و، پێویسـت نـاکات بڵێـی: پـەڕاو، هەڵبەتـە ئەگـەر ئـەو وشـانەش بەکاربهێنرێـن، ئاسـاییە، بـەڵام ئـەو وشـانەی خەڵـك باشـتر لێیـان تێـدەگات، پێویسـتە بەکاربهێنرێـن لـە هـەر زمانێکـەوە هاتـبن، لـە عەرەبییـەوە دێـن، لـە فارسـییەوە دێـن، لـە ئینگلیزییـەوە دێـن و، زمـان بـە بەکارهێنانـی موفـرەدات و وشـەی زمانەکانـی دیکـە دەوڵەمەنـد دەبـێ.

(**القَـرْضُ: مَـا يُدْفَـعُ إلى الإنْسَـانِ مِـنَ المَـالِ بِـشَرْطِ رَدِّ بَدَلِـهِ**)، (**قـرْض**): بریتیـە لـەوەی دەدرێ بـە مـرۆڤ لـە مـاڵ و سـامان، بەمەرجـی گێڕانـەوەی جێدارەکـەی، گێڕانـەوەی قەرەبووەکـەی، واتـە: مـەرج نیـە خـودی ئـەو پارەیـە، بـەڵام بـۆ وێنـە: کەسـێك (١٠٠) دۆلار، یـان ملیۆنێـك دینـاری ئەمـڕۆ دەدا بـە کەسـێك، گرنـگ ئەوەیـە دوایـی سـەد دۆلارەکـە، یـان ملیـۆن دینارەکـە بداتـەوە، مـەرج نیـە خـودی ئـەو پارەیـە بـێ، چونکە ئـەو پارەیـە سـەرف دەکات، بۆیـە دەڵـێ: (**رَدّ بَدَلِـه**) گێڕانـەوەی جێدارەکـەی.

(**يُضَٰعِفۡهُ**): (**ضَعَّفْتُـهُ وَضَاعَفْتُـهُ: ضَمَمْـتُ إلَيْـهِ مِثْلَـهُ فَصَاعِـدًا**)، (**ضَعَّفْتُـهُ وَضَاعَفْتُـهُ**)، هەردووکیـان بـە مانـای ئـەوەن شـتێك وێنـەی خـۆی و زیاتریشـی بخرێتـە سـەر.

(**حَلِيمٌ**): بـە کوردیـی دەبێتـە هێدیـی و مەنـد، (**الحِلْـمُ: ضَبْـطُ النَّفْـسِ وَالطَّبْـعِ عَـنْ هَيَجَـانِ الغَضَـبِ، وَجَمْعُـه أَحْـلَام، وَلَيْـسَ الحِلْـمُ هـو العَقْـلُ، لَكِـنْ فَسَّرُوهُ بِذَلِـكَ لِكَوْنِـهِ مِـنَ مُسَـبَّبَاتِ العَقْـلِ**)، (**حِلْـم**): بـە مانـای خـۆ کۆنترۆڵکردنـە لـە هەڵچوونـی تووڕەیی (**حِلْـم**) بـە (**أَحْـلَام**)، کـۆ دەکرێتـەوەو (**حِلْـم**)، بریتـی نیـە لـە عەقـڵ، بـەڵام بۆیـە (**حِلْم**)یـان بـە عەقـڵ لێکداوەتـەوە، چونکـە لـە پەیداکراوەکانـی عەقڵـە، کەسـێك عەقڵێکـی باشـی هەبـێ، ئـەو عەقڵـەی کۆنترۆڵـی دەکات و هێدیی و مەنـدی دەکات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـواری ئـەم ئایەتـە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُواْ وَتَصْفَحُواْ وَتَغْفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ ﴾،

لـەو بـارەوە ئـەم گێڕدراوەیـە دێنیـن: {عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ: وَسَـأَلَهُ رَجُـلٌ عَـنْ هَـذِهِ الْآيَةِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ﴿١٤﴾ ﴾، قَالَ: هَـؤُلَاءِ رِجَـالٌ أَسْـلَمُوا مِـنْ أَهْـلِ مَكَّـةَ، وَأَرَادُوا أَنْ يَأْتُـوا النَّبِـيَّ ﷺ ، فَـأَبَى أَزْوَاجُهُـمْ وَأَوْلَادُهُـمْ أَنْ يَدَعُوهُـمْ، أَنْ يَأْتُـوا رَسُـولَ اللـه ﷺ، فَلَمَّا أَتَـوْا رَسُـولَ اللـه ﷺ رَأَوُا النَّـاسَ قَـدْ فَقِهُـوا فِي الدِّيـنِ، هَمُّـوا أَنْ يُعَاقِبُوهُـمْ، فَأَنْـزَلَ عَزَّوَجَـلَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ﴿١٤﴾ ﴾} (أخرجـه الترمـذي: ٣٣١٧، والطـبري: ٣٤٢٩٠، وصححـه الألبـاني في صحيـح السـنن الترمـذي، ورواه الطـبراني في الكبـير: ١١٧٢٠، وقـال الحاكـم: صحيـح الإسـناد ووافقـه الذهبـي، لكـن قـال مؤلفـا: «الإسـتعاب في بيـان الأسـباب»: ج٣، ص٤٢١، قلنـا: وهـذا إسـناد ضعيـف).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، پیاوێـك لـە بـارەی ئـەم ئایەتـەوە لێـی پرسـی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ﴿١٤﴾ ﴾ ئەویـش گوتـی: ئـەوە لـە بـارەی پیاوانێکـەوە هاتـە خـوار کـە خەڵکـی مەککـە بـوون و مسـوڵمان بـوون و، ویسـتیان بێنـە خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ (کـۆچ بکـەن بـۆ مەدینـە)، بـەڵام هاوسـەرەکانیان و منداڵەکانیـان ئامـادە نەبـوون ڕێیـان بـدەن، بچنـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا ﷺ، ئنجـا کاتێـك هاتنـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا ﷺ (واتـە: دوای ماوەیـەك، ئایـا لـە مـاوەی صوڵحـی حودەیبییـەدا هاتـوون؟ یاخـود دوای ئازادکرانـی مەککـە هاتـوون)، بینییـان خەڵـك لـە ئاییـن دا شـارەزا بـوون، (واتـە: ئەوانـەی پێشـتر هاتـوون و

کۆچیان کـردوەو، تەماشایان کـرد دواکەوتـوون لـە دینداریـداو لـە شـارەزا بوونـدا، لـە قورئـان لەبەرکـردن دا)، ئنجـا ویسـتیان منـداڵ و ژنەکانیـان سـزا بـدەن، خـواش عزوجـل ئـەو ئایەتـەی نـاردە خـوار، بـە تایبـەت ئـەوەی دەفەرمـوێ: ﴿وَإِن تَعْفُوا۟ وَتَصْفَحُوا۟ وَتَغْفِرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ١٤﴾.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای بـەرزو بـێ وێنـە لـەم هەشـت ئایەتـە موبارەکـەدا، هەشـت ڕاسـتیی گـەورەو گرنـگ دەخاتـەڕوو، هەشـت بابەتـی گرنـگ، سـەرەتا دەفەرمـوێ: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾، هیـچ بەڵایـەك تـووش نابـێ، مەگـەر بـە مۆڵەتـی خـوا، واتـە: (مَا أَصَابَ أَحَدٌ مِنْ مُصِيبَةٍ)، هیـچ کـەس تووشـی هیـچ بەڵایـەك نابـێ، مەگـەر بـە مۆڵەتـی خـوا، واتـە: کـە بەڵایـەك بەسـەر کەسـێك دێ و، گرفتاریـی و نارەحەتییـەك بەسـەر کەسـێك دێ، بابزانـێ خـوا ئـاگادارەو بـە ویسـتی خـوا بـووەو، بـە مۆڵـەت و ڕێپێدانـی خـوای زانـاو توانـا بـووەو، ئـەوە نەبـووە لـە ویسـتی خـواو لـە زانیاریـی خـوا بـەدەر بـێ، ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾، هـەر کەسـێکیش بـڕوا بـە خـوا بێنـێ، دڵـی ڕێنمایـی دەکات، واتـە: دڵـی ڕاسـتە ڕێ دەکات بـۆ وەرگرتنـی هەڵوێسـتی ڕاسـت و دروسـت لـە بەرانبـەر ئـەو بـەڵاو مەینەتیـی و نارەحەتییانـەدا کـە بەسـەری دێـن، کـە بریتیـە لـەوەی خۆڕاگـر بـێ، سـپڵەیی و ناشـوکریی نـەکات و سـکاڵای بێجـێ نـەکات، ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ﴾، خـواش بـە هەمـوو شـتێك زانایـە، هـەم بـەو بەڵایـەی کـە بەسـەری هاتـوەو، هۆکارەکانـی ئەو بەڵایـەو هەڵوێسـتەکەی ویـش، چ هەڵوێسـتێك دەنوێنـێ؟ خـوا ئـاگادارو زانایـە بـە هەمـوو شـتێك.

﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ﴾، ئێـوەش فەرمانبەریـی خـواو فەرمانبەریـی پێغەمبـەر بکـەن، گوێڕایەڵیـی خـواو گوێڕایەڵیـی پێغەمبـەر بکـەن، ﴿فَإِن

﴿تَوَلَّيْتُمْ﴾، ئنجا ئەگەر پشتتان هەڵکرد؟ لێرەدا ڕووی دواندن لە مرۆڤەکانە بە گشتیی و، دەشگونجێ ڕوو لە بڕواداران بێ، بە تایبەتی، چونکە ئەوانن کە خوا دەناسن و پێغەمبەر دەناسن و، ئامادەشن فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی خواو پێغەمبەری خوا بکەن و، دەشگونجێ ڕووی لە مرۆڤان بێ بە گشتیی، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ﴾، ئەگەر پشتتان هەڵکرد، پشتتان کردەوەو پاشتانکردە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، بە دڵنیایی ڕەوانەکراوی ئێمە، نێردراوی ئێمە، تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشکرای لەسەرە، یاخود گەیاندنی ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەری لەسەرە (**مُبِين**)، دەگونجێ بە مانای ڕوون و ئاشکرا بێ، دەشگونجێ بە مانای ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر بێ، بەپێی ئەوە کە ئایا لە (**أبَان**)ی قاصیرەوە هاتوە وەك: (**أبَان القَمَرُ**)، مانگەکە دەرکەوت، یاخود لە (**أبَان**)ی تێپەڕکەر (**متعدِّي**) یەوە؟ ئەو کاتە (**أبَان**)، بەرکار دەخوازێ، وەك: (**أَبَانَ المُدَرِّسُ لدَّرْسَ**)، وانەبێژەکە دەرسەکەی ڕوونکردەوە.

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، ئەمەش ڕاستییەکی دیکەیە خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ: خوا بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، واتە: هیچ پەرستراوێکی شایستەی پەرستران نیە، ئەگەرنا خەڵك زۆر شت دەپەرستێ، زۆر جاری دیکەش گوتوومانە: (**أللـه**)، بە مانای خوا ﷻ دێ، بە ئینگلیزیی (God)، بە فارسیی (**خُـدا**)، بە عەرەبیی (**أللـه**)، بەڵام (**إلـه**)، بە مانای پەرستراوە واتە: (**مَعْبُود**)، بۆیەش: (**أللـه**) لەبەر ئەوەی خاوەن و بەدیهێنەرو پەیداکەرو پەروەردگاری هەموو کەون و کائیناتە، هەر یەکەو (**أللـه**) نە کۆ دەکرێتەوەو نە دەکرێتە دووانیش، بەڵام (**إلـه**)، دەکرێتە دووان و دەکرێتە کۆش (**إلـه، إلاهـان، إلَهـين، آلهـة**)، بۆیەش هەڵەیە بگوترێ: بێجگە لە خوا هیچ خوایەك نیە، بەڵکو: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾، با بڕوادارانیش تەنیا پشت بە خوا ببەستن، لێرەدا کە (**الجـارّو المجـرور**)، پێشخراون، بۆ کورتهەڵێنانە،

واتە: بڕوادارانی پشت بەستوو، با تەنیا پشت بە خوا ببەستن و، پشت بەهیچ شتێکی دیکە نەبەستن، ئێمە پێشتریش باسی پشت بەستن بەخوامان کردوە، کە تێکگیرانی نیە لەگەڵ دەستگرتن بە هۆکارەکانەوەو پەنا بردن بۆ هۆکارەکان، بەڵکو دەست بە هۆکارەکانەوە گرتن، ئیشی جەستەیە، بەڵام پشت بەستن بە خوا، ئیشی دڵ و دەروونە، با دەستت بە هۆکارانەوە بێ، بەڵام دڵت بە خواوە پەیوەست بێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەرەبە خێڵەكییەكەی فەرمووی: {إِعْقَلْهَا وَتَوَكَّل} **(أخرجه ابن حبان: ٧٣١، والحاكم: ٦٦١٦، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٢١٠)**، حوشترەكەت ببەستەوەو پشتیش بە خوا ببەستە، یانی: بە دەست حوشترەکەت ببەستەوەو، بە دڵیش پشتت بە خوا قاییم بێ و، دڵت بەخواوە پەیوەست بێ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡ ﴾،

ئەمەش ڕاستییەکی دیکەیە کە لەم هەشت ئایەتە موبارەکەدا هاتوەو، بابەتێکی یەکجار گەورەو گرنگ و هەستیارە، بە تایبەت لە ڕووی ژیانی خێزانیی و کۆمەڵایەتییەوە، خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دڵنیایی لە ژنەکاتان و ڕۆڵەکانتاندا دوژمن بۆ ئێوە هەیە، ئنجا وریایان بن! وشەی (عَدُوًّا)، بۆ تاك و بۆ دووان و بۆ كۆش بەكاردێ، کە دەفەرموێ: بە دڵنیایی لە هاوسەرەکانتان و لە ڕۆڵەکانتاندا دوژمن هەیە بۆ ئێوە، واتە: ژنی هەندێکتان و منداڵی هەندێکتان بەشێوەیەك مامەڵە دەکات، وەك چۆن دوژمن مامەڵەت لەگەڵدا دەکات، تاکو زیانت لێ بدات، ئەویش ئاوا زیانت لێ دەدات، ئنجا ئەمە ئەگەر ڕواڵەتەکەی ڕەچاو بکرێ، ڕاستە هەندێ ژن هەیە بۆ مێردی خۆی، وەك دوژمن وایەو، هەندێ کوڕو کچ هەن، ڕقیان لە باب و دایکیان هەڵدەستێ، ئەوەم بینیوە، هەروەها مێردیش هەیە، ڕقی لە ژنی هەڵدەستێ و ژنیش هەیە ڕقی لە مێردی هەڵدەستێ و، وەك دوژمن تەماشای دەکات، کە ئەوەش حاڵەتێکی زۆر ناتەندروستە، چونکە خوا ﷻ لە باسی ژن و مێردا

دەفەرمـوێ: ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ﴿١٨٧﴾ ﴾البقـرة، واتـە: (ئـەی پیاوینـە!) ژنەکانتـان پۆشـاکن بـۆ ئێـوەو، ئێـوەش پۆشـاکن بـۆ وان، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ﴿٢١﴾ ﴾الـروم، لـە نیشـانەکانی (خـوا ﷻ) ئەوەیـە کـە لـە خۆتـان هاوسـەرانێکی بـۆ ڕەخسـاندوون، (لـە شـێوەو سرووشـتی خۆتـان) تاکـو ئۆخـژن و ئارامییتـان بـۆ بـێ بەهـۆی یەکدییـەوەو، لەنێوانتانـدا خۆشەویسـتیی و بەزەیـی دانـاوە.

لـە قۆناغـی سـەرەتاوە خۆشەویسـتیی، دواییـش کـە دەکەونـە تەمەنـەوە، بەزەیی و پـەرۆش بەرامبـەر بـە یەکـدی، ئەمـە حاڵەتـی ئاسـایی و تەندروسـتی نێـوان ژن و مێـردە، بـەڵام ئـەوە کـە بـە چـاوی دوژمـن تەماشـای یەکـدی بکـەن و، لـە یەکـدی بخەفتێـن زیـان بەیەکـدی بگەیەنـن، ئـەوە حاڵەتێکـی زۆر نـا ئاسـایی و ناشـەرعییەو، پێچەوانـەی عەقـڵ و لۆژیکـە، بـەڵام ئـەو حاڵەتـەش هەیەو، ئـەوە مانـا ڕواڵەتییەکەی ئـەم ئایەتەیـە.

ئەگـەر ئـەو دیـوی مانایەکەشـی لێـك بدەینـەوە: وەك لـە هـۆی هاتنەخوارەوەکەیدا باسـمان کـرد لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، کـە پیاوانێـك لـە مەککـە بڕوایـان هێنابـوو و مسـوڵمان بـوو بـوون، دەیانویسـت کـۆچ بکـەن بـۆ مەدینـە، بـەڵام ژن و منداڵەکانیـان لێیـان نەگـەڕان و هـەر لـە مەککـە مانـەوە، دوایـی دەوڵەتـی ئیسـلامیی لـە مەدینـە گەشـەی کـرد و، مسـوڵمانان ئـەو هەمـوو قورئانەیـان دابەزیەسـەرو ئـەو هەمـوو یاسـایانەی شـەریعەت هاتنـە خـوارو لێیـان شـارەزا بـوون، ئەوانـە دوایـی کـە چوونـە ژێـر سـایەی دەوڵەتـی ئیسـلامیی و دەوڵەتـی ئیسـلامیی، دەسـتی گەیشـتە مەککـە، تەماشـایان کـرد، زۆر دواکەوتـوون، ئنجـا زانییـان کـە ئـەو ژن و منداڵانەیـان کـە کاتـی خـۆی نەیانهێشـتوەو ڕێگریـان بوون کـە کـۆچ بکـەن، چ زیانێکیـان لێـداون! وەك زیـان پێگەیاندنـی دوژمـن بـە دوژمـن.

ئەوەش مانا مەعنەوییەکەی و مانا پەنهانەکەیەتی و، ئەم مانایەش زیاتر هەم لەگەڵ هۆی هاتنەخوارەوەکەی و، هەم لەگەڵ سیاقی ئایەتەکاندا دەگونجێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَاحْذَرُوهُمْ ﴾ لێیان وریابن! واتە: لە سەرەتاوە وریابە ژن و منداڵەکەت دەست و پێت نەبەستێ، لە بەرامبەر دینداریی و مسوڵمانیەتییدا، ئاگات لێبێ بەهۆی دڵڕاگرتنی ئەوانەوەو، بەهۆی پاراستنی بەرژەوەندیی و سەلامەتیی ئەوانەوە، دوانەکەوی لە دینداریی و مسوڵمانەتیی و کاری چاك، بەڵام دواییش کە ئەوان کارێکیان کرد، زیانتان پێبگەیەنن، وەك چۆن دوژمن زیان لە دوژمن دەدا، ئەو کاتە لێبوردن و چاوپۆشیی بکەن بە پیشە، باشترە، چونکە تازە تێپەڕیوە، ﴿ وَإِن تَعْفُواْ وَتَصْفَحُواْ وَتَغْفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، خوا سێ وشان بەکاردێنێ: ئەگەر (عَفْو) بنوێنن و (صَفْح) بنوێنن و (غَفْر) بنوێنن، ئەوە بە دڵنیایی خوا لێبوردەی بەبەزەییە:

أ- (عَفْوُ)، ئەوەیە خۆت دووربگری لەو گوناهەی بەرامبەرەکەت دژی تۆ کردوویەتی، لەو هەڵەیە، لەو کەم و کوڕییەو سزای نەدەی، بابای خەتابار بەرامبەر بە خۆت، سزا نەدەی.

ب- (صَفح)یش پلەیەکی بەرزترەو لێرەدا خوا ﷻ بەڕیزبەندیی پلە پلەیی و پێگەیی، ڕیزی کردوون، لە (عَفْوُ) باشتر بریتیە لە (صَفْح)، کە بریتیە لە چاوپۆشیی، کە هەر خۆت بەسەرەوە نەبەی بەرانبەر بە ئەو کەسەی ئەو گوناهەو ئەو غەڵەتەی بەرانبەر بە تۆ کردوە.

ج- لەوەش باشتر بریتیە لە (غَفْر)، کە بریتیە لەوەی ئەو هەڵەیەی ئەو کەسە کردوویەتی، نەیهێڵێ و بۆی بسڕیەوە، لە دڵ و مێشکی خۆتدا بیسڕیەوە، (عَفْوُ)، ئەوەیە سزای نەدەی، (صَفْح)، ئەوەیە چاوپۆشیی لێ بکەی و نادیدەی بگری، بەڵام (غفر)، ئەوەیە خراپەکەی لە مێشك و دڵی خۆتدا بسڕیەوەو، بۆی بپۆشی، بۆیە خوا بە پلە پلە هێناونی: پێشێ دەگونجێ مرۆڤ ئەو کەسەی هەڵەیەکی بەرانبەر دەکات، عەفووی بکات و سزای نەدا،

دوایی دەگونجێ چاوپۆشییشی لێ بکات و هەڵەو کەم و کوڕییەکەی، نادیدە بگرێ، نەك هەر سزای نەدا، بەڵکو نادیدەشی بگرێ، ئنجا لە قۆناغی سێیەم و کۆتاییدا دەگونجێ هەر لە مێشك و دڵی خۆشی دا بیسڕێتەوە، وەك ئەو هەڵەیەی هەر نەکردبێ.

ئەگەر ئێوە وابکەن: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبووردەی بەبەزەییە واتە: ئەگەر ئێوە بەرانبەر بەندەکانی خوا بەگشتیی و، بە تایبەت ماڵ و خێزانی خۆتان، کە هەڵەو کەم و کوڕییەکیان بووەو خێرێکیان لە دەست داون و، تازە قەرەبووش ناکرێتەوە، لە ئەوەڵەوە لە خۆت وریابای، بەڵام تازە کە لەدەست چووە، باشتر وایە: واز لە سزادان هێنان و، چاوپۆشیی کردن، بەڵکو بۆ پۆشین هەبێ، ئنجا ئەگەر ئێوە وابکەن، بە دڵنیایی خواش لێبووردەی بە بەزەییە، واتە: ئەگەر دەتەوێ خوا بەزەیی بە تۆدا بێ و لێت ببووریّ، تۆش لێبووردن و بەزەییت هەبێ بەرامبەر بە بەندەکانی خوا، بە تایبەت بازنەی تەسکی ماڵ و خێزان.

﴿إِنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ﴾، بە دڵنیایی سامانەکانتان و ڕۆڵەکانتان بۆ ئێوە مایەی تاقیکرانەوەن، مایەی مەینەتیی و بەڵاو گرفتاریین، دەبێ وریابن، ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾، خواش پاداشتێکی مەزنی لەلایە، واتە: ئەگەر بە شێوەیەك مامەڵە بکەن لەگەڵ سامانەکانتاندا، کە دەست و پێتان نەبەستێ، ماڵ و سامانتان لە چاکەو فەرمانبەریی بۆ خوا، بەهۆی تەماع و دنیا ویستییەوە، دەست و پێتان نەبەسترێ و، ڕۆڵەکانتان تووشی گوناهو تاوان و خراپەتان نەکەن و، دەست و پێتان نەبەستن، ئەوانە بۆ ئێوە تاقیکردنەوەن، دەبێ لێیان وریابن، ئەو کاتەش خوا پاداشتێکی مەزنی لە لایە.

﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ﴾، ئنجا هەتا پێتان دەکرێ پارێز لە خوا بکەن، بەپێی تواناتان پارێز لە خوا بکەن، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمە ئەوەی نەسخ کردۆتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ ﴿١٠٢﴾﴾آل عمران، وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێبکەن.

بەڵام وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باس دەكەین، لە ڕاستیدا هیچ تێكگیرانێك نیە لە نێوان ئەوەدا كە دەفەرموێ: هەتا دەتوانن پارێز لە خوا بكەن و، ئەوی دیكەش دا كە دەفەرموێ: وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێ بكەن، چونكە وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێ بكەی، ئەوەیە كە بە هەموو تواناو وزەی خۆتەوە، پارێز لە خوا بكەی، ئنجا ئەگەر بە هەموو تواناو وزەی خۆتەوە پارێزت لە خوا كرد، مانای وایە وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزت لێكردوە، هەردووكیان دوو دیوی یەك ڕاستیین، دوو تەعبیرن لە یەك ڕاستیی، بەڵام هەندێك لە زانایان زۆر داڵغەیان بەوەوە لێداوە، ئایەتێك بدۆزنەوە بڵێن: فڵان ئایەتەی نەسخ كردۆتەوەو لابردوە، وەك نۆ هەنگیان لە دارێكدا دۆزیبنەوە!! لە حاڵێكدا كە وەك زانایانی لێكۆڵەرەوەو قووڵڕۆچوو گوتوویانەو ئێمەش ئەو ڕایەمان هەڵبژاردوە: هیچ ئایەتێك و هیچ ڕستەیەك لە قورئاندا نیە، كە بگوترێ: دەخوێنرێتەوەو كاری پێ ناكرێ، ئەوەش كە بگوترێ: فڵان ئایەتە قورئان بووە، پێویستیی بەوە دەكات بە تەواتور ئەوە چەسپابێ، چونكە قورئان هەمووی بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، قورئان بوونی ڕستەیەك، وەك پێشتریش گوتوومانە، وەك: (**الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُما البَتَّة**)، كە لە تەفسیری سوورەتی (**الأحزاب**) و(**النور**) و (**النساء**) یشدا، باسمانكردوە، كاتێك دەتوانین بڵێین: ئەو دەقە قورئان بووە، كە بە تەواتور بە ئێمە گەیشتبێ، بەڵام ئەو دەقانە لە ڕێی ئاحادەوە بە ئێمە گەیشتوون و، وەك زانایان دەڵێن: قورئانیش بەسەنەدی ئاحاد ناچەسپێ و نەچەسپاوە، قورئان هەمووی بە تەواتور بە ئێمە گەیشتوە، كەواتە: ئنجا مادام لە ڕێی ئاحادەوە ئەو دەقە گەیشتوە، ئەو كاتە قورئان بوونی نەسەلمێنراوە، زانایانی پسپۆڕو قووڵڕۆچووش دەڵێن: كاتێك نەسخ ڕوودەدا، كە ئەو دوو ئایەتە تێك بگیرێن، بەڵام ئەگەر دوو ئایەت هەر كامیان تەعبیر بكات لە دیوێكی ئەو ڕاستییە، هیچ پێویست بەوە ناكات بگوترێ: ئەمیان ئەویانی لابردوە.

﴿وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ﴾، خـوا دەفەرمـوێ: ببیسـتن و فەرمانبەریـی بکـەن (وَأَنفِقُواْ) هەروەهـا خـەرج بکـەن، ﴿خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡ﴾، دەگونجـێ (خـيراً) لـە ﴿وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا﴾دا، بـە مانـای مـاڵ و سـامان بـێ، وەك: ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ ١٨٠﴾، (خـير)، بـە مانـای مـاڵ و سـامان دێ، لەوێـدا، لێـرەش دەگونجـێ: ﴿وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا﴾، واتـە: مـاڵ و سـامان ببەخشـن، دەشـگونجێ: ﴿وَأَنفِقُواْ﴾، واتـە: ببەخشـن، ﴿خَيۡرٗا﴾یـش، بـەرکاری کارو بکـەر (**فعـل و فاعـل**) ێکـی، قرتێنـدراو بـێ، واتـە: (**وأتـوا خَـيْرًا**) و هەرچـی خێـرو چاکەیـە ئەنجامـی بـدەن، ﴿لِّأَنفُسِكُمۡ﴾، بـۆ خۆتـان.

﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ﴾، هـەر کەسـێکیش پارێـزراو بـێ لـە چرووکیـی دەروونی و، دەروونـی پارێزراوبـێ لـەو خەسـڵەتە پیسـە، بەڵکـو لـە جیاتی چرووکیی، سـەخیی و بەخشـندەو دڵکراوەبـێ، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، ئـا ئەوانـەن سـەرفرازان، ئـا ئەوانـەن بەختـەوەران و بـە ئامانـج گەیشـتووان.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا﴾، ئەگـەر ئێـوە قەرزێکـی بـاش بـدەن بـە خـوا، ﴿يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ﴾، (خـوا) بۆتـان چەنـد بەرانبـەر دەکاتـەوە، واتـە: پاداشـتەکەتان بـۆ چەنـد بەرانبـەر دەکاتـەوە، ﴿وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ﴾، لێشـتان دەبـووری، هەڵەکانتـان بـۆ دەپۆشـێ، ﴿وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾، خـواش سوپاسـگوزاری هێدیـی و مەنـدە، ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾، زانـای پەنهـان و ئاشـکرایە، ﴿ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، زاڵ و کارزانـە، بـاڵا دەسـتی کاربەجێیـە.

ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الحديـد**)دا، کورتـە باسـێکمان لـە بـارەی قـەرزی چـاك (**القـرض الحسـن**)ەوە کـرد، کـە قـەرزی بـاش بـە خـوادان، ئەوەیـە بـە شـێوەیەك ئـەو مـاڵ و سـامانەی خـۆت ببەخشـی، لـە پێنـاوی خـوادا ﷻ، کـە هەموو مەرجەکانـی چـاك مـاڵ بەخشـین لـەو خێـرو چاکـەو مـاڵ بەخشـینەی تـۆدا هەبـن، بـە دڵێکـی پاکـەوە بـێ، بـە ڕوویەکـی خۆشـەوەبێ، بـە زمانێکـی شـیرین بـێ، ئـەو

کەسەی هاوکاریی دەکەی و قەرزی پێ دەدەی، هەڵینەپێچی و ناڕەحەتی نەکەی و .... هتد، لەوێ بە درێژیی لەو بارەوە باسمانکردوە.

لێرەدا جێی سەرنجە کە خوا ﷻ کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکە، بە باسکردنی کۆمەڵێك لە سیفەتە بەرزو مەزنەکانی خۆی دێنێ: ﴿وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ﴾، خوا سوپاسگوزاری هێدیی و مەندە، سوپاسگوزار واتە: ئەگەر بەندەکانی چاکە بکەن، خوا پاداشتیان دەداتەوە، ﴿شَكُورٌ﴾، بە مانای زۆر سوپاسگوزار، ڕێژگەی زێدەڕۆییە لە (شَاكِر)، چونکە خوا وشەی (شَاكِر)یشی، بۆ خۆی بەکارهێناوە: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ١٤٧﴾النساء، واتە: خواش سوپاسگوزاری زانا بووە، ئەگەر بەندەکان چاکە بکەن، خوا سوپاسیان دەکات، ﴿شَكُورٌ﴾، واتە: زۆر سوپاسگوزارە، ﴿حَلِيمٌ﴾، زۆر هێدیی و مەندە، چونکە ﴿حَلِيمٌ﴾، پێچەوانەی زوو تووڕە بوویە: (**سريع الغضب**)، ﴿حَلِيمٌ﴾، واتە: خوا زۆر هێدیی و مەندە، ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾، زانای پەنهان و ئاشکرایە، ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، ئەوپەڕی بالا دەستەو ئەوپەڕی کاربەجێیە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**هیچ کەس بەبێ مۆڵەت و ویستی خوا، هیچ بەڵایەکی تووش نابێ و، بڕوا بە خوا بوونیش مایەی ڕێنماییکرانی دڵە، بۆ هەڵوێستی ڕاست و دروست لە بەرانبەر بەڵاو گرفتارییەکاندا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، هیچ بەڵایەك تووش نابێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، لێرەدا: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ ﴾، بەرکارەکەی قرتێنراوە، یانی: (**مَا أَصَابَ أَحَداً مِنْ مُصِيْبَة**)، هیچ کەس هیچ بەڵایەکی تووش نابێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا ﷻ.

عەلقەمە گوتوویەتی: (**هُوَ الرَّجُلُ تُصِيبُهُ الْمُصِيبَةُ، فَيَعْلَمُ أَنَّهَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ، فيُسَلِّمُ لذَلِكَ وَيَرْضَى**)، (**جامع البيان: ٣٤٢٨٦**) گوتوویەتی: ئەوە مەبەست پێی پیاوێکە بەڵایەکی بەسەر دێ، دەزانێ کە لەلایەن خواوەیە، بۆیە ملکەچ دەبێ و ڕازی دەبێ، لەو ڕووەوە کە لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە، ئەگەرنا جاری وایە بەڵایەکە شتێکی خراپەو، بە دڵنیایی خودی بەڵایەکەی پێناخۆشە، بەڵام لەو ڕووەوە کە بەبێ ویست و مۆڵەتی خوا بەسەری نەهاتوە، پێی ڕازییەو ئەوەش دەبێتە هۆی دڵخۆش بوونی.

وشەی (**إذْن**)، کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾، (**ابن عاشور**) دەڵێ: (**الإِذْنُ: أَصْلُهُ إجازَةُ الفِعْلِ لِمَن يَفْعَلُهُ، وأُطْلِقَ عَلى إباحَةِ الدُّخُولِ إلى البَيْتِ، وإزالَةِ**

**الحِجابِ لِأنَّـهُ مُشْـتَقٌّ مِـن أذِنَ لَـهُ إذا سَـمِعَ كَلامَـهُ. وهـو هُنـا مُسْـتَعارٌ لِتَكْويـنِ أسْـبابِ الحَـوادِثِ، فأُطْلِـقَ عَـلى ذَلِـكَ التَّقْديـرِ والتَّكْويـنِ لَفْـظُ الإذْنِ**)، واتـە: وشـەی (**إذْن**) بریتیـە لـە مۆڵەتـدان بـە کـردنی کارێـك بـۆ کەسـێك کـە دەیـکات، لـە ئەصڵـدا بەکارهێنراوە بـۆ ڕێپێدانـی چوونـە ماڵێـك و، لابردنـی پـەردە یـان کردنـەوەی دەرگا، چونکـە (**إذْن**)، لـە (**أَذِن لـه**)، هاتـوە (**أَذِنَ لَـهُ**)، واتـە: قسـەکەی بیسـت و گوێـی بـۆ ڕاگـرت، بـەڵام لێـرەدا خوازراوەتـەوە بـۆ هێنانـەدی هـۆکاری ڕووداوەکان، ئنجـا لێـرە بەکارهێـنراوە بـۆ خـودی ئەندازەگیریـی کـردن و هێنانـە دی ڕووداوەکان، کەواتـە: ﴿ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾، یانـی: مەگـەر بـە ڕێپێدانـی خـوا ﷻ.

**٢)-** ﴿ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥ ﴾، هەر کەسێکیش بڕوا بە خوا بێنێ، دڵی ڕێنمایی دەکات، دڵی ڕاستە ڕێ دەکات، (بۆ گرتنەبەری هەڵوێستی ڕاست و دروست)، (**الطبري**)، لە تەفسیری ئەو ڕستە موبارەکەدا: ﴿ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾، دەڵێ: (**لَمْ يُصِبْ أَحَدًا مِنَ الْخَلْقِ مُصِيبَةٌ** ﴿ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ ﴾ **يَقُولُ: إِلَّا بِقَضَاءِ اللَّهِ وَتَقْدِيرِهِ ذَلِكَ عَلَيْهِ**)، واتە: هیچ کەسێك لە خەڵك، بەڵایەکی بەسەر نایەت، مەگەر بە مۆڵەتی خوا واتە: مەگەر بە ئەندازەگیریکردنی خواو بڕیاری خوا لەسەری، کە ئەو شتەی بەسەر بێ، لەو بارەوەش (**الطبري**) لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) ئەم دەقە دێنێ بە ژمارە: (٣٤٢٨٥)، کە دەفەرموێ: (**يَهْدِ قَلْبَهُ: يَعْنِي: يَهْدِ قَلْبَهُ لِلْيَقِينِ، فَيَعْلَم أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَمَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ**)، یانی: (**يَهْدِ قَلْبَهُ**)، واتە: دڵی بۆ دڵنیایی ڕێنمایی دەکات و، دەزانێ ئەوەی بەسەری هاتوە، نەدەگونجا بەسەری نەیەت و، ئەوەی بەسەری نەهاتوە، نەدەگونجا بەسەری بێ.

هەروەهـا (**الطبري**)، لـە تەفسـیری (**يَهْـدِ قَلْبَـهُ**)دا، دەڵـێ: (**يَهْـدِ قَلْبَـهُ: يَقُـولُ: يُوَفِّـقِ اللَّـهُ قَلْبَـهُ بِالتَّسْـلِيمِ لأَمْـرِهِ وَالرِّضَـا بِقَضَائِـهِ**)، واتـە: خـوا دڵـی ڕێنمایـی دەکات: ملکـەچ بـێ بـۆ فەرمانـی خـواو، ڕازیـی بـێ بـە بڕیـاری خـوا ﷻ.

٣)- ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾، خواش بە هەموو شتێك زانایە، واتە: بە هەموو شتێك زانایەو، ئەو بەڵاو ناخۆشیی و گرفتارییەی بەسەر تۆش هاتوە، ئەی مرۆڤ! ئەوە هەر لە زانیاریی خوای پەروەردگار دایە.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەگەر ئینسان ئیمانی باشی هەبێ،بەوە کە دەزانێ ئەو شتە لە زانیاریی خوادا بووە، بە بڕیاری خوایەو، بەبێ مۆڵەتی خوا ئەو شتەی بەسەر نەهاتوە، دەبێتە هۆی دڵخۆشیی و فەرەحنایی لە دڵیداو دەڵێ: هەر شتێك لەلایەن دۆستەوە بێ هەر خۆشەو، ئەو گرفتارییەش لەو ڕووەوە کە لە لایەن دۆستەوەیە، کە خوای موتەعالەو دۆستی ئیماندارانە: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿٢٥٧﴾﴾، خوا دۆستی ئەوانەیە کە ئیمانیان هێناوە، مایەی خۆڕاگریی و دڵخۆشییە.

**مەسەلەی دووەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە گوێڕایەڵیی بۆ خۆی و بۆ پێغەمبەرەکەی و، ئاگادارکردنەوەی کە لە حاڵەتی پشتتێکردندا، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا گەیاندنی ڕوونی پەیامی خوای لەسەرەو، مرۆڤەکان خۆیان بەرپرسیارن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ﴾، فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەری پێغەمبەرەکە بکەن، (الشوكاني)، چەمکێکی ئاوا لەم ڕستە موبارەکە وەردەگرێ: (**هَوِّنُوا عَلَى أَنْفُسِكُمُ الْمَصَائِبَ، وَاشْتَغِلُوا بِطَاعَةِ اللَّهِ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ**)، بەڵاو گرفتارییەکان کە بەسەرتان دێن لەسەر خۆتانیان ئاسان بکەن و بە قورسیان مەگرن و، سەرگەرمی فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرەکەی بن، با چاوت لەسەر ئەو بەڵاو نەخۆشیی و ناخۆشیی و گرفتارییە نەبێ، کە لە جەستە و لە ڕووحتدا و، لە دەوروبەرتدا و، لە ماڵ و خێزانت دا و، لە ماڵ و سامانتدا بەسەرت هاتوە، با چاوت هەر لەسەر ئەوە نەبێ و، دەست و پێت ببەستێ و پەکت بخات، بەڵکو فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ﷺ، ئاگاتان لە تاڵایی ئەو گرفتاریی و ناڕەحەتییانە نەمێنێ.

٢)- ﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ ﴾، ئەگەر پشتتان هەڵکرد، ڕووتان وەرگێڕا، یانی: (**فَإِنْ أَدْبَرْتُمْ عَنْ طَاعَةِ اللَّهِ وَطَاعَةِ رَسُولِهِ مُسْتَكْبِرِينَ عنها**)، ئەگەر پشتتان کردە فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی خواو گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی پێغەمبەرەکەی، خۆتان بە زلگرت لە بەرانبەر خواو پێغەمبەرەکەی دا.

٣)- ﴿ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾، بە دڵنیایی پێغەمبەرەکەمان تەنیا گەیاندنی ڕوونی لەسەرە، واتە: خۆتان بەرپرسیارن، یانی: (**فَقَدْ أَعْذَرَ إِلَيْكُمْ بِالْإِبْلَاغِ وَاللَّهُ**

**وَلِيُّ الإِنْتِقَامِ مِمَّنْ عَصَاهُ، وَخَالَفَ أَمْرَهُ**)، خوا ﷻ بیانووی نەهێشتوون بەوە کە پێی ڕاگەیاندوون و ئاگاداری کردوونەوەو، تۆڵەش لەو کەسە دەستێنێ کە سەرپێچیی لێ دەکات و فەرمانی دەشکێنێ.

ئەم ئایەتە موبارەکانە هەر کامێکیان -- وەك پێشتر باسمان کرد -- ڕاستییەکی مەزن دەگرێتە خۆی و ئەگەر ئینسان ورد سەرنج بدات، وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك هەموویان یەکدیی دەبەستنەوە.

هیچ بەڵایەك بەسەر مرۆڤ نایەت، مەگەر بە مۆڵەتی خوا، هەر کەسێکیش بڕوای بە خوا هەبێ، خوا دڵی ڕۆشن دەکات و ڕێنمایی دەکات بۆ هەڵوێستی ڕاست و دروست، کە بریتیە لە خۆڕاگریی و ملکەچیی بۆ خواو ڕازیی بوون بە بڕیارو ئەندازەگیریی خواو، خێر تێدا دیتنی و، خوێندنەوەی پشتی ئەو بەڵاو ناڕەحەتییانە.

ئنجا بۆ ئەوەی هەتوانی ئەو برینە بێ، کە بەهۆی ئەو بەڵایەوە لە دڵت بووەو برینی دڵت سارێژ ببێ، فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن، چونکە لە ئەنجامی پابەندیی بە شەریعەتەوەو، فەرمانبەریی بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، چاوت هەر لەسەر ئەو گرفتاریی و بەڵاو ناڕەحەتییانە نابێ و، چاویان لەسەر چڕ داناگری کە بەسەرت هاتوون و تاڵاییەکەیان نامێنێ، بەڵام کەسێك وانەکات و پشت لە خواو لە پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات و فەرمانبەرییان نەکات، با بزانێ کە خۆی بەرپرسیارە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا گەیاندنی پەیامی ڕوونی خوای لەسەرە، دوای ئەوەی پەیامی خوای پەروەردگارت پێگەیشت و، شەریعەتی خوای پەروەردگارت پێگەیشت و بۆت ڕوونکرایەوە، ئنجا بەرپرسیاریەتیی لە ئەستۆی خۆتە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی تەنیا پەرستراوێتیی خواو، پێویستکردنی پشت بە خوا بەستنی بڕواداران:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)-** ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، خوا، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، ئەمە ڕاستییەکەو هەموو قورئان لە بازنەی ئەم ڕاستییەدا دەسووڕێ، ئەمە بناغەی هەموو ڕاستییەکانی دیندارییە، کە جگە لە خوا هیچ کەسی دیکەو، هیچ شتێکی دیکە، شایستەی پەرستران نیە، بە مانای ڕاستەقینەو فراوانی پەرستران، کە بریتیە لە: ١- ئەوپەڕی ملکەچیی، ٢- ئەوپەڕی خۆشویستن، ٣- ئەوپەڕی بەبەرز گرتن، ٤- ئەوپەڕی بە گەورەگرتن و بە مەزن گرتن، ٥- ئەو پەڕی سام و هەیبەت بۆ نواندن، ٦- ئەو پەڕی پشت پێ بەستن، دەبێ ئەوانە تەنیا بۆ خوابن تعالى.

**٢)-** ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، بڕوادارانیش با تەنیا پشت بە خوا ببەستن، نەیفەرمووە: (**فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ عَلَى الله**)، بەڵکو (**الجارّو المجرور**) پێشخراون، کە بەرکار پێش دەخرێ وەك (**إِيَّاكَ نَعْبُدُ**)، کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، (**إِيَّاكَ نَعْبُدُ**)، واتە: تەنیا تۆ دەپەرستین، لێرەدا: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴾، با بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، ئێمە پێشتریش باسی پشت بە خوا بەستنمان کردوەو، ڕوونمان کردۆتەوە کە پشت بە خوا بەستن، لەگەڵ دەست بەهۆکارەوە گرتن دژی یەك نین، بەڵکو تەواوکەری یەکدین، دەبێ دڵت بەخواوە پەیوەست بێ و، دەستیشت بە هۆکارەکانەوە بێ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**ئاگادارکردنەوەی بڕواداران کە هەندێك لە ژن و منداڵەکانیان، وەك دوژمن بە زەڕن بۆیان و، دەبێ لێیان وریابن، دواتریش وازلێهێنان و چاوپۆشیی و لێبووردن، بکەنە پیشە لەگەڵیان، ئنجا کە ژن و منداڵ هۆکاری تاقیکردنەوەن، خواش پاداشتی مەزنی لەلایە، بۆ کەسانێك سەربەرزانە لەو تاقیکردنەوەیە دەربچن، کەواتە: هەتا پێیان دەکرێ با پارێز لە خوا بکەن و، فەرمانبەریی و بەخشین بکەن، خۆیان لە چرووکیی بپارێزن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ).

٢)- ﴿إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ﴾، بە دڵنیایی لە ژنەکانتان و لە ڕۆڵەکانتاندا دوژمن هەیە بۆ ئێوە، واتە: بەشێك لە هاوسەرانتان و منداڵەکانتان وەك دوژمن وان بۆ ئێوە، دوژمن ئەو کەسەیە کە زیانت پێ دەگەیەنێ و خێرو قازانجت لەدەست دەدا، هەندێك لە ژن و منداڵیش بەو شێوەیە مامەڵە دەکەن لەگەڵ پیاودا، لە هۆی هاتنەخوارەوەکەیدا باسمان کرد، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، هێناویەتی، کە هەندێك لەوانەی لە خەڵکی مەککە بڕوایان هێنابوو، ویستیان کۆچ بکەن بۆ مەدینە، بەڵام هەبوو ژنەکەی، هەبوو کوڕەکەی، هەبوو کچەکەی ڕێیان

لێگرتن کە کۆچ بکەن، دیارە هەر مسوڵمان و ئیماندار بوون، بەڵام کۆچیان نەکرد، تاکو بچن لە مەدینە لەوێ لە مەنزڵگای ئیسلامدا، پەروەردە بن و، فێری قورئان بن، شارەزا بن و، خێرێکی زۆریان لەدەست چوو، ئنجا خوا ﷻ فەرمووی: هەندێك لە ژن و منداڵەکانت واتە: ئەوانەی ڕێیان گرتوە لە پیاوەکان کە کۆچ بکەن و، پەیوەست بن بە مەنزڵگای ئیسلامەوە، مامەڵەیەکیان کردوە لەگەڵ مێردەکانیاندا، وەك مامەڵەی دوژمن لەگەڵ دوژمن دا، وشەی (**عَدُو**)ش بۆ تاك و بۆ دووان و بۆ کۆ (**جمع**)ش بەکاردەهێنرێ.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ ﴾، (**مِن**)، بۆ هەندێك (**تَبْعِيْض**)ە، یانی: هەموو ژنێك بۆ مێردەکەی وانیەو، هەموو منداڵێکیش بۆ باب و دایکی وانیە، واتە: بەشێکیان وان:

أ- یان مەبەست لەوەیە کە مانا ڕواڵەتییەکەیەتی واتە: هەر ڕێك لێتان دەبنە دوژمن و دوژمنایەتییتان دەکەن، وەك هەندێك ژن بۆ مێردەکەی وایەو، هەندێ منداڵ ئەگەر کوڕە، ئەگەر کچە، بۆ باب و دایکی وایە، جاری وا هەیە ژن مێردی خۆی دەکوژێ، یان تووشی زیانی دەکات، یان خیانەتی لێ دەکات، هەروەها منداڵ کوڕ یان کچ، شتێك دەکات کە بە زەرەری دایکی یان بابی یان هەردووکیان تەواو بێ.

ب- یاخود مەبەست پێی وێچواندنێکە، کە وەك چۆن دوژمن کارێك دەکات، تۆ تووشی زیان بی، ئەو ژنەش کارێك دەکات، ئەو مێردە تووشی زیان بێ، نەك دژایەتیی بکات بە ڕواڵەت و، ئەو منداڵە کارێك دەکات کە باب و دایکی، تووشی زیان بن، بێ ئەوەی ئیعلانی دوژمنایەتیی بکات.

٣)- ﴿ فَٱحْذَرُوهُمْ ﴾، {مادام وان} لێیان وریابن و ئاگاداریان بن، لە دەستیان تووشی زیان نەبن!

٤)- ﴿ وَإِن تَعْفُواْ وَتَصْفَحُواْ وَتَغْفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئەگەر ببوورن و چاوپۆشیی بکەن و بپۆشن، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی میهرەبانە، لە سەرەتاوە دەبێ

وریا بی، ژن و منداڵت تووشی گوناهو لادان و تاوانت نەکات، ئنجا بە نسبەت ئەو کاتەوە کە گوتراوە: کەسێك بڕوای هێناوە، بەڵام ژنەکەی، یان منداڵەکەی ڕێگری بووە کۆچ بکات بۆ مەدینە، ئەوە ڕابردوە، بەڵام گوتراوە: (**إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُمُولَ المَعْنَى**)، تایبەت بوونی هۆکار (ی دابەزینی ئایەتێك) ڕێ لە گشتگیربوونی واتایەکەی ناگرێ، ئێستاش پیاوان ئەگەر لە خۆیان وریا نەبن، لەوانەیە هەندێ لە ژنەکانیان زۆریان داوا لێ بکەن: فڵان شتەمان دەوێ و فڵان شتەمان دەوێ و فڵان شتەمان دەوێ، لە ئەنجام دا تووشی ماڵی حەڕام بن، یان تووشی کاسبیی حەڕام بن، یان تووشی تەنازولکردن بن لە عەقیدەو مەبدەئیان لە پێناوی ڕازییکردنی ژن و منداڵیاندا، یان جاری وایە ژن و منداڵەکان، ئەو پیاوە هەڵدەپێچن بۆ شتێك کە ناشەرعییە، یان بە پێچەوانەوە: جاری واش هەیە پیاوەکە ژنەکەی بەرەو ناشەرعیی هەڵدەپێچێ، یان منداڵەکانی ناچار دەکات، بەڵام لێرە حاڵەتی باوتر ڕەچاوکراوە کە بەزۆریی وایە ئافرەت کە عاتیفییەو، منداڵەکان کە جارێ عەقڵیان کامڵ نەبووە، ئەگەر باب وریا نەبێ، تووشی ناشەرعیی و لادان و تاوانی دەکەن، ئنجا پێشێ دەبێ وریا بێ، بەڵام دوای ئەوەی کەم و کوڕییەك بوو لەلایەن وانەوەو، ئەو پیاوە تووشی لادانێك، تاوانێك، هەڵەیەك بوو، نابێ چاوی لە تۆڵەستانەوەو دوژمنایەتیی بێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَعْفُوا۟ وَتَصْفَحُوا۟ وَتَغْفِرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، ئەگەر واز لە سزادان بێنن و، چاوپۆشیی بکەن و، لێبوردن بکەن، بە دڵنیایی خواش لێبوردەی بەبەزەییە، چونکە ناکرێ پیاو بڵێ ژنەکە! فڵانە ساڵە بەهۆی تۆوە من ئەو کاسبییەم نەکرد، یان ئەوەم نەکردو ئەوەم کرد، یان بەهۆی فڵان کوڕەوەو فڵان کچەوە، ئەویش بێ دوژمنایەتیی بکات، نا، ژیانی خێزانیی بە چاوپۆشیی و لێبوردن تەندروست دەبێ.

کەواتە: با سەرنجێکی ئەو سێ وشەیە بدەینەوە:

(عَفو): بریتیە لەوە کەسێك کە هەڵەیەکی بەرانبەر کردووی، خۆت دوور بگری لە سزادانی.

(صَفْح): بریتیە لەوەی سەرزەنشتیشی نەکەی و چاوپۆشیی لێ بکەی، نەك هەر سزای نەدەی، بەڵکو لێشی لە دڵ نەگری.

(غَفْر)، بوردن و پۆشین، یانی: هەڵەکەی بۆ بپۆشی و وەك ئەو هەڵەیەی هەر نەکردبێ و لە بیر خۆتی بەریەوە.

ئنجا ئەگەر وابکەن:

٥)- ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، بە دڵنیایی خواش لێبوردەی بەبەزەییە، واتە: ئەویش بەپێی کردەوەکەی خۆتان، مامەڵەتان لەگەڵدا دەکات، ئەگەر ئێوە چاوپۆشیی و لێبوردن بکەنە پیشە، خواش لێتان دەبووریٚ و چاوپۆشیی و بەزەییتان لەگەڵ دەنوێنێ.

٦)- ﴿إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٌ﴾، بە دڵنیایی سامانەکانتان و منداڵەکانتان بۆ ئێوە مایەی تاقیکردنەوەن، وشەی (فِتْنَة)، لە قورئاندا بە چەند واتایەك هاتوە، لە ئەصڵدا وشەی (فِتْنَة)، لەوەوە هاتوە: (**فَتَنَ الصَّائِغُ الذَّهَبَ، إِذَا أَدْخَلَهُ فِي النَّار لِتَظْهَرَ جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَائَتِهِ**)، واتە: زێڕینگەر زێڕەکەی جەڕباند، یانی: خستیە نێو ئاگرەوەو قاڵیی کردەوە، بۆ ئەوەی زێڕی ساغ لەو کانزایانەی ڕەگەڵی خراون، جیابێتەوە، لە ئەصڵدا لەوەوە هاتوە، دوایی بەکارهێنراوە بۆ تاقیکردنەوەو، بەکاریش دەهێنرێ بۆ بەڵاو مەینەتیی بەسەرهاتن، بۆ ئەوانە هەموویان بەکاردەهێنرێ، هەندێکیش گوتوویانە: (**الْفِتْنَةُ: اضْطِرَابُ النَّفْسِ، وَحِيرَتُهَا مِنْ جَرَّاءِ أَحْوَالٍ لَا تُلَائِمُ مَنْ عَرَضَتْ لَهُ**)، فیتنە بریتیە لە شڵەژانی نەفس و سەراسیمە بوونی، لە ئەنجامی هەندێك شتدا کە بەسەری هاتوون و لەگەڵی دا ناگونجێن، واتە: سامانەکانتان و منداڵەکانتان بۆ ئێوە مایەی تاقیکردنەوەن و گرفتاریی و مەینەتییتان بۆ دێننە پێش.

٧)- ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾، خواش پاداشتی مەزنی لەلایە، یانی: ئەگەر ئێوە لە تاقیکردنەوەی ماڵ و سامانەکانتان و منداڵەکانتان، دەربچن و، بۆ ماڵ و سامانەکانتان سوور نەبن لەسەر ئەوەی بە حەڵاڵ و بە حەڕام هەر وەسەریەکیان بنێن و، بۆ منداڵەکانتان سوور نەبن لەسەر ئەوەی هەر داواکارییەکیان کرد، پێیان بدەن، یان لە

پێناوی چاك ژیاندنی ئەواندا، خۆتان گوناهبارو عەیبدار بکەن، ئەگەر ئاوا مامەڵە بکەن و بە تەندروستیی، خوا پاداشتێکی مەزنی لەلایە.

لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، زۆربەی تەفسیرەکان ئەم دەقەی سوننەتیان هێناوە:

**{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي بُرَيْدَةَ، يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُنَا فَجَاءَ الْحُسَيْنُ وَالْحَسَنُ ﷺ عَلَيْهِمَا قَمِيصَانِ أَحْمَرَانِ يَمْشِيَانِ، وَيَعْثُرَانِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْمِنْبَرِ فَحَمَلَهُمَا وَوَضَعَهُمَا بَيْنَ يَدَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ ﴾، نَظَرْتُ إِلَى هَذَيْنِ الصَّبِيَّيْنِ يَمْشِيَانِ وَيَعْثُرَانِ، فَلَمْ أَصْبِرْ حَتَّى قَطَعْتُ حَدِيثِي، وَرَفَعْتُهُمَا ثُمَّ أَخَذَ فِي خُطْبَتِهِ} (أخرجه أبو داود: ١١٠٩، والترمذي: ٣٧٧٤، والنسائي في الكبرى: ١٧٩١، وابن ماجه: ٣٦٠٠، وأحمد: ج٥، ص٣٥٤، وابن حبان: ٦٣٩، والحاكم: ١٠٥٩، وابن خزيمة: ١٤٥٦، وحسنه الألباني في سنن أبي داود).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە بابیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ وتاری دەدا، حەسەن و حوسێن هاتن (نەوەی بوون، کوڕانی عەلی ئامۆزای و فاتیمەی کچی خوا لێیان ڕازی بێ، پێڕۆچکەو بچووك بوون)، دوو کراسی سووریان لەبەردا بوون، دەڕۆیشتن و ڕەتەڵیان دەبرد و دەکەوتن، (دیارە لە کراسەکەیان ئاڵقاون)، پێغەمبەری خوا ﷺ (وتارەکەی بڕی) لە مینبەرەکە دابەزیی و هەردووکیانی هەڵگرتن و بردنیە لای خۆی و لە پێش خۆی دانان، دوایی فەرمووی: خوا ڕاستی فەرمووە: ﴿ إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ ﴾، ماڵ و سامانەکانتان و منداڵەکانتان بۆ ئێوە مایەی تاقیکردنەوەن، تەماشای ئەو دوو منداڵەم کرد، دەڕۆیشتن و هەڵدەنگوتن، خۆم ڕانەگرت تاکو وتارەکەم بڕی و، بەرزم کردنەوە بۆ لای خۆم، دوایی دەستی کردەوە بە وتاردانەکەی.

٨)- ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ﴾، هەتا دەتوانن پارێز لە خوا بکەن، هەتا بۆتان دەکرێ، واتە: ئەگەر کەم و کوڕییەکیشتان بوو لەو بوارەدا، نا ئومێد مەبن، ئەوەندەی پێتان

دەکرێ، وریابن ماڵ و منداڵتان تووشی گوناهو لادان و تاوانتان نەکات، بەپێی توانا ئەوەندەی بۆتان دەکرێ پارێز لە خوا بکەن، پارێز لە خوا کردنیش ئەوەیە کە تۆ وریا بی قەدەغەکانی خوا نەشکێنی و، ئەرکەکانی کە لەسەری داناوی، نەیانچووێنی.

٩)- ﴿وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡ﴾، گوێ بگرن (ئەوەی خوا فەرمانی پێکردوون، وەری بگرن و تێبیگەن)، فەرمانبەریی بکەن و گوێڕایەڵیی بکەن، (هەم بۆ خوا ﷻ هەم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ).

١٠)- ﴿وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡ﴾:

أ- ماڵ و سامانیش بە قازانجی نەفسی خۆتان ببەخشن، ئەمە واتایەکی.

ب- یاخود: ﴿وَأَنفِقُواْ﴾، ببەخشن خەرج بکەن، ماڵ و سامان، ئنجا (**وَافْعَلُوا خَيْراً لأَنْفُسِكِم**)، بەڵام (**وَافْعَلُوا**)، نەگوتراوەو قرتێنراوە لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، واتە: ماڵ و سامان ببەخشن و چاکە بکەن بۆ خۆتان، هەروەها ئەم ڕستەیە دوو مانای دیکەشی هەن کە دوایی دەیانهێنین.

١١)- ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ﴾، هەر کەسێکیش لە چرووکیی نەفسی پارێزراو بێ، واتە: چرووکیی و چنگقووچاویی، سیفەتێکی خراپە لە دەروونی مرۆڤدا، هەر کەسێك لەشەڕو خراپەی ئەو سیفەتەی پارێزراو بێ و سەخیی و دڵفراوان بێ.

١٢)- ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾، ئا ئەوانەن سەرفرازان، یانی: سەرفرازی ڕاستەقینەو بە ئامانج گەیشتووی ڕاستەقینە، ئەوانن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ﴾، واتە: (**مَنْ زَكَّى نَفْسَهُ مِنَ الشُّحِّ وَوُقِيَ شَرَّ الشُّحِّ**)، هەر کەسێك نەفسی خۆی پاککردبێتەوە لە چرووکیی و ڕژدیی و، لە خراپیی ئەو سیفەتە پارێزراو بووبێ، بەس ئەوانەن سەرفراز.

کە دەفەرموێ: ﴿وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡ﴾، وێڕای ئەو دوو واتایەی گوتمان: دوو مانای دیکەشی هەن، مانای یەکەم:بەخشینێکی باش بۆ خۆتان ببەخشن: (**وَأَنْفِقُوا إِنْفَاقاً خَيْراً**).

وشـەی (خَيْر)یـش بـە مانـای مـاڵ و سـامان دێ، چونکـە خـوای پـەروەردگار لـە هەندێـك لـە ئایەتەکانـدا وشـەی (خَـيْر)ی، بـە مانـای مـاڵ و سـامان هێنـاوە، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ ﴿١٨٠﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: وەسـییەتان لەسـەر پێویسـت کـراوە، ئەگـەر یەکێـك لـە ئێـوە خەیـری بەجێهێشـت، واتـە: مـاڵ و سـامانی بەجێهێشـت.

دووەم: مانایـەکی دیکـەشی ئەوەیـە کـە وشـەی: ﴿ وَأَنفِقُواْ ﴾، مانـای پێشـبخەن (قَدِّمُـوا)ی، خرابێتـە نێـو، یانـی: (ضُمِّـنَ وَأَنْفِقُـوا مَعْنَـى قَدِّمُـوا)، واتـە: ببەخشـن و پێشـبخەن بـۆ نەفسـی خۆتـان مـاڵ و سـامانێك کـە دەیبەخشـن، بـۆ خـودی خۆتانـی پێشـبخەن بـە قازانجـی خۆتـان، لـە قیامەت بـە کەڵکتـان دێتـەوە، کەواتە: ﴿ وَأَنفِقُواْ خَيْرًا لِّأَنفُسِكُمْ ﴾ سـەرجەم چـوار واتـا هـەن.

لێـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾، ئەوەنـدەی لـە تواناتـان دا هەیـە پارێـز لـە خـوا بکـەن، هەندێـك لـە زانایـان پێیـان وابـووە ئـەم ڕستەیە ئـەو ئایەتـەی نەسـخ کردۆتـەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمـران، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! وەك بـۆ خـوا شایسـتەیە پارێـزی لێبکـەن.

گوتوویانـە: چونکـە وەك بـۆ خـوا شایسـتەیە، واتـە ئـەو پـەڕی تەقـوا، بـەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾، ئەوەنـدەی لـە تواناتانـدا هەیـە پارێـز لـە خـوا بکـەن، ئەمـە گوایـە ئایەتەکـەی سـووڕەتی (آل عمـران)ی، نەسـخ کردۆتەوە!

بـەڵام لـە ڕاسـتییدا ئـەو دوو ئایەتـە تێـك ناگیرێـن، تاکـو بڵێیـن: ئـەوەی دواییـان ئـەوەی پێشـێی نەسـخ کردۆتـەوە، چونکـە ڕسـتەی: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴾، تێیـدا سـەرنجی چەندێتیـی (كميَّـة)ی تەقـوا دراوە، واتـە: بـا تەقوایەکەتـان هەمـوو ئـەو حاڵەتانـەی تەقوایـان تێـدا پێویسـتە، بیانگرێتـەوە، (فَهُـوَ أَمْـرٌ بِاسْـتِيعَابِ جَمِيْـعِ المَـوَارِدِ الَّتِـي تَسَـعُهُ الإِسْـتِطَاعَةَ بَالتَّقْـوَى)، فەرمانـە بـە وەخۆگرتنـی تێکـڕای ئـەو بوارانـەی توانـای پارێزکاریـی دەیانگرێتـەوە.

بەڵام ڕستەی: ﴿ اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ ﴿١٠٢﴾ ﴾، تێیدا سەرنجی چۆنیەتیی (**كيفية**) دراوە، واتە: بەو چۆنیەتییە پارێز لە خوا بكەن كە بۆ خوا شایستەیە لە ڕووی چۆنیەتییەوە، ئەوەی دیكەش لە ڕووی چەندێتییەوەیە، كەواتە: هیچ تێكگیرانێك نیە، یانی: ئەگەر بگوترێ: وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێ بكەن، هەروەها ئەگەر بگوترێ: هەتا دەتوانن پارێز لە خوا بكەن، هەر یەك واتایان هەیە، چونكە هەتا دەتوانن، بریتیە لەوەی وەك بۆ خوا شایستەیە، چۆن بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێ بكەین؟ ئەوەیە كە هەتا دەتوانین، ئنجا: ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ﴾، مانایەكەی بریتی نیە لە: (ئەوەندەی توانیتان)، بەڵكو یانی: هەتا پێتان دەكرێ و دەتوانن، ڕستەكەی دیكەش: ﴿ اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ ﴾، یانی: وەك بۆ خوا شایستەیە، ئنجا ئەو تەقوایەی بۆ خوا شایستەیە، ئەوەیە كە هەموو توانای خۆتی تێدا بەكاربێنی، لەو پارێزكردن و لە خۆ وریابوونەدا.

بۆیە (**الطبري**)یش، هەر دەڵێ: نەسخ لێرەدا هیچ واتایەكی نیە، چونكە (**لاَ يُوَجَدُ تَكْلِيفُ مَا لاَ يُطَاق**)، چونكە هەندێكیان گوتوویانە: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ ﴾، ئەوە لە توانای مرۆڤدا نیە! بەڵام ئەگەر لە توانای مرۆڤدا نەبووایە، خوا پێویستی نەدەكرد، چونكە خوا فەرموویەتی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة، خوا لەسەر هیچ كەسێك پێویست ناكات، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە، ئنجا ئەگەر لە توانادا نەبووایە، نەدەگونجا خوا بفەرموێ: ﴿ اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ ﴾، وەك بۆ خوا شایستەیە پارێزی لێ بكەن.

(**الطبري**)، دەڵێ: {**(إِذاً افَاتَّقـوُا اللـه حَـقَّ تُقَاتِـهِ) لَا يُضَادُّ (فَاتَقُـوا اللـه مَا(اسْـتَطَعْتُم)) بَلِ القَـدْرُ الْمَسْتَطَاع مِـنَ التَّقْـوَى هُـوَ الْمَأْمُور بِـه، وَهُـوَ حَـقُّ التَّقْـوَى للـه**}، واتە: (**فَاتَّقُوا اللـه حَـقَّ تُقَاتِـهِ**) دژی (**فَاتَقُـوا اللـه مَا(اسْـتَطَعْتُم)**)، نیە، بەڵكو ئەو ئەندازەیەی لە پارێزكاریی لە توانادا هەیە، هەر ئەو ئەندازەیە فەرمانی پێكراوەو، ئەو ئەندازەیەش بریتیە لە تەقوای شایستە بۆ خوا ﷻ.

## مەسەلەی پێنجەم و كۆتایی:

**فەرمانكردن بە بڕواداران كە لە ڕێی خوادا ببەخشن و قەرزی باش بە خوا بدەن، تاكو خواش پاداشتی چەند قاتیان بداتەوەو لێیان ببووڕێ و، وەسفكردنی خوا بە پێنج سیفەتی بەرزو بێ وێنەی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)**- ﴿ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ ﴾، ئەگەر قەرزی چاك بە خوا بدەن، (خوا) بۆتان چەند بەرانبەر دەكاتەوە، واتە: پاداشتەكەتان بۆ چەند قات دەداتەوە، ﴿ يُضَاعِفْهُ لَكُمْ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**يُضَعِّفْهُ لَكُم**)، هەردووكیشیان یەك واتایان هەیە، واتە: بۆتان چەند بەرانبەر دەكاتەوە، بۆتان قەرەبوو دەكاتەوە، بە چەند بەرانبەر، پاداشتەكەیتان دەداتەوە.

**٢)**- ﴿ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ﴾، لێشتان دەبووڕێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾، ئێمە لە سوورەتی (**الحديد**)دا، كورتە باسێكمان لە بارەی (**الْقَرْضُ الْحَسَن**)ەوە كرد، وشەی (**قَرْض**)، لە زماندا بە مانای (**قَطْع**)ە، (**قَرَضَهُ أي قَطعه**)بڕی (**مِقْرَاض**)، بە مقەست و بە نینۆكبڕیش دەگوترێ، بەڵام لە زاراوی شەرع دا (**قَرْض**): بریتیە لە بڕینی ئەندازەیەك لە ماڵ و سامان و، بەخشینی بە كەسێك كە لێی بەهرەمەند بێ و دوایی بیگێڕێتەوە، یاخود ئەندازەكەی بگێڕێتەوە، بەڵام (**الْقَرْضُ الْحَسَن**)، وەك لەو كورتە باسەدا بە تەفصیل باسمان كرد، ئەوەیە كە:

**١**- ئەو قەرزەی دەدرێ بە كەسێك، لە ماڵ و سامانێكی حەلاڵ بێ.

٢- ئەو قەرز پێدانە، تەنیا لەبەر خوا ﷻ و بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا بێ.

٣- ئەو قەرز پێدانە، بە ڕەوشتێكی جوانەوەو بەڕووی خۆش و بە زمانێكی شیرینەوە بێ، نەك بە كۆمەڵێك منەت و بە مۆن و مرچیی و كەسەكە پەشێمان بێتەوە لەداوای قەرزكردنەكە.

٤- بابای قەرزدەر بابای قەرز پێدراو سەغڵەت نەكات، هەموو ڕۆژێ داوای بكات.

٥- بابای قەرزدەر ئەگەر زانیشی قەرزدارەكە بۆی نادرێتەوە، لەسەری سووك بكات یان چاوپۆشیی لێ بكات، مادام لە توانای دا هەبێ، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (**البقرة**) دا، فەرموویەتی: ﴿ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ۚ وَأَن تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ ﴾.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ إِن تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾، بەڕاستیی ئەمە تەعبیرێكە ئەو پەڕی لوتف و میهرەبانیی خوای بە بەزەیی تێدایە، چونكە: ماڵ و سامانەكە هی خوایەو تۆ خۆشت هی خوای، كەچی خوا دەفەرموێ: قەرزم بدەیە، هەڵبەتە نایدەی بە خوای پەروەردگارو دەیدەی بە بەندەكانی خوا، بەڵام خوا دەفەرموێ: ئەوەی داوتە بە مرۆڤەكان، بە بەندەكانی خوا، وەك درابێت بە من، وایەو، دوایی من پاداشتت دەدەمەوە، بابای قەرزداریش قەرزەكەت دەداتەوە، بەڵام منیش چەند بەرانبەر پاداشتت دەدەمەوە!

٣)- ﴿ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴾، خواش سوپاسگوزاری هێدیی و مەندە. (**شَكُورٌ**): (**الشَّكُورُ: فَعُول بِمَعْنَى فَاعِلٍ لِلمُبَالَغَةِ، والمقصود به الجَزَاءُ بِالْخَيْرِ عَلَى فِعْلِ الصَّالِحَاتِ**)، (**شَكُورٌ**): لەسەر كێشی (**فَعُول**)ە، بە مانای (**شَاكِر**)ە، بەڵام بۆ زێدەڕۆیی، واتە: خوا زۆر سوپاسگوزارەو مەبەست پێی پاداشتدانەوەی خوایە بە چاكە، لە بەرانبەر چاكەكاندا واتە: خوا ﷻ سوپاسگوزارە بۆ بەندەكانی، ئەگەر چاكە بكەن، خوا چاكەكەیان دەبینێ و سوپاسیان دەكات پێی خۆشەو دەستخۆشییان لێ دەكات و پاداشتیان دەداتەوە، (**حَلِيمٌ**)، یانی: هێدیی و مەندە، چونكە خوا ﷻ دەزانێ كە لە بواری ماڵ و سامان و

قەرز بە یەكدی دان و قەرز وەرگرتنەوەو ئەوانەدا، جار جار كێشەو مشت و مڕ پەیدا دەبێ، یان هەندێك كەس كە قەرزی پێدەدرێ، قەرز كوێرە، یان هەندێ كەسیش هەر فێڵبازو ساختە چییە، دێ قەرز دەكات، بەڵام دوایی قەرزەكە ناداتەوە، من چەند جار ئەوەم بۆ هاتۆتە پێشێ، كابرا پێشێ دێ، زۆر دەكڕووزێتەوەو زۆریش جەخت دەكاتەوە كە لە فڵان كاتەدا قەرزەكە دەداتەوە، دوایی چەند ساڵی بەسەردا تێدەپەڕن، هەر نایبینیەوە، یاخود ئەگەر بینیشتەوە، ڕەنگە هەر نكووڵییش بكات و بڵێ: لەبیرم نەماوە!! بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ شَكُورٌ﴾، یانی: ئەگەر ئەو كەسەی تۆ قەرزەكەت پێداوە، سوپاسیشت نەكات و، قەرزەكەشت نەداتەوەو قەرز كوێر بێ، یاخود دوایی نكووڵییشی لێ بكات، خوا سوپاسگوزارەو پاداشتتان دەداتەوە، (حَلِيْمٌ)، هەروەها هێدیی و مەندە، (حَلِيْمٌ)، پێچەوانەی زوو تووڕەبوویە، یانی: خوا زوو تووڕە نابێ و هێدیی و مەندە، ئێوەش وابن لەگەڵ ئەو كەسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەن، لە بواری قەرز پێدان و قەرز لێكردن دا.

٤)- ﴿عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ﴾، (خوا) زانای پەنهان و ئاشكرایە، (غَيْب)، چاوگە، بەڵام بە مانای بكەر (فَاعِل)ە، واتە: (عَالِم الغَائِب)، زانای ئەوەیە كە پەنهانە، (شَهَادَة)، واتە: ئەو شتەی بینراوەو مەشهوودە، (شَهَادَة)ش، دیسان چاوگە، یانی: بینین، (**شَهِدَ، يَشْهَدُ، شَهَادَةً، فَهُوَ مَشْهُود**)، (**مشهود**)، واتە: بینراو.

٥)- ﴿ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، (خوا) باڵادەستی كارزانە، خوا خاوەنی ئەو پەڕی باڵادەستیی و زاڵییەو، خاوەنی ئەو پەڕی كارزانیی و كارامەییە، كەواتە: خوا ﷻ ئاگاداری پەنهانەو ئاگاداری ئاشكراشەو، ئەو پەڕی باڵادەستیشی هەیەو، ئەو پەڕی حیكمەت و لێزانییشی هەیە.

خاوەنی (**أضواء البيان**)، (**الشنقيطي**)، لە تەفسیرەكەیدا[1] دەڵێ: (**شُكْرُ اللَّهِ لِعَبْدِهِ، هُوَ مُجَازَاتُهُ لَهُ بِالْأَجْرِ الْجَزِيلِ عَلَى الْعَمَلِ الْقَلِيلِ**)، سوپاسكردنی خوا بۆ

---

(١) ج٨، ص٢٠٦.

بەندەکەی بریتییە لە پاداشتدانەوەی بە پاداشتێکی مەزن، لەسەر کردەوەیەکی کەم، کەواتە: خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، پێنج سیفەتی بەرزو مەزنی لە خۆی هەڵدان:

١- (شَكُورٌ).

٢- (حَلِيمٌ).

٣- (عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ).

٤- (ٱلْعَزِيزُ).

٥- (ٱلْحَكِيمُ).

ئنجا ئەم پێنج سیفەتانەو هەموو سیفەتەکانی دیکەی خوای بەرزو مەزن کە باسیان دەکات لە کۆتایی ئایەتەکاندا، هەمووی ئاماژەیە بە ئێمە کە چاو لە سیفەتەکانی خوا بکەین ﷻ و، ئێمەش هەوڵبدەین ئەو سیفەتە بەرزو بێ وێنانەی خوای پەروەردگار کە لەگەڵ مرۆڤان دا دەگونجێن، ئەو سیفەتانە لە خۆماندا بێنینە دی و، خۆمانیان پێ برازێنینەوە، وەك لە سوورەتی (**النور**)دا، خوا ﷻ لە بەسەرهاتی (**أبو بكر الصديق**)، و (**مِسطح بن أثاثة**)دا، کە کوڕە پووری یان کوڕە خاڵی بوو و، هاوکاریی دەکرد، بەڵام (**مِسطح بن أثاثة**)، یەکێك بوو لەو چەند کەسەی بوختانیان بە دایکمان عائیشە کرد (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەبوو بەکریش سوێندی خواردو گوتی: هاوکاریی ناکەم، دوایی خوا[1]، ئەو ئایەتەی ناردە خوار کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾النور، واتە: با ئەوانەتان کە خاوەن چاکەو بەخششن، سوێند نەخۆن هاوکاریی خزمان و نەداران و کۆچکەران نەکەن، با چاوپۆشیی

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٢، ص٥٧٢، رواه البخاري: ٤٧٥٧، ومسلم: ٢٥٣٢.

بکـەن و لێبـوردن بکـەن، ئایا حـەز ناکـەن خـوا لێتـان بـووریٚ و، خـواش لێبـوردەی بەبەزەییـە؟!

واتـە: وەك چـۆن حـەز دەکـەن خـوا لێتـان ببـووریٚ، ئێـوەش ببـوورن و، وەك چـۆن حـەز دەکـەن خـوا بەزەیـی لەگەڵتـان بنوێنـێ، ئێـوەش بەبەزەیـی بـن و، چاوپۆشـیی بکـەن.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات خۆمـان بڕازێنینـەوە بـە هەمـوو ئـەو سـیفەتە بـەرزو جوانانـەی، خـوا ﷻ پێـی خۆشـن، وەك دەفەرمـوێ:

١- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ۝٤﴾ التوبة.

٢- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ۝١٥٩﴾ آل عمران.

٣- ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ۝١٤٦﴾ آل عمران.

٤- ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ۝١٣٤﴾ آل عمران.

٥- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ ۝٢٢٢﴾ البقرة.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی ئـەو سـیفەتانەی خۆشویسـتراونی، یارمەتییـمان بـدات خۆمـان بـەو سـیفەتە بەرزانـە بڕازێنینـەوە، بـۆ ئـەوەی ئێمـەش ببینـە خۆشەویسـتی خـوا.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**التغابن**) دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٨)ی ڕەمەزانـی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٥/١١)ی زایینیـی، لـە شـاری هەولێـر، بـە پشـتیوانی خـوای بەخشـەری میهرەبـان، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیری سـوورەتی (الطَّلَاق)، سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆکـی سـوورەتی (الطَّلَاق)، لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الطَّلَاق)و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە هـەر بـە نـاوی (**سُـورَةُ الطَّلَاق**)، نـاسراوەو، لەوبـارەوە ئـەم دەقـە وەك نموونـە دێنیـن:

{**عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ** ﵄، **قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَة الطَّـلَاق بِالْمَدِينَـةِ**} (**ذَكَـرَهُ السـيوطي فِي الـدر المنثور: ج٨، ص١٨٨، وَنَسَبَهُ إِلى ابْـن الضريـس والنحـاس وَابْـن مرْدَوَيْـه وَالْبَيْهَقِـيّ**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـباس ﵄ دەڵـێ: (**سُـورَةُ الطَّلَاق**) لـە مەدینـە هاتۆتە خوار.

مەبەستمان ناوەکەیە، کەواتە: (**سُورَةُ الطَّلَاق**)، ناوی ئەم سوورەتە موبارەکەیە.

بـەڵام وێـڕای ئـەو نـاوە (**السـيوطي**)، لـە کتێبـە ناودارەکـەی خـۆی (**الإتقـان فـي علـوم القـرآن**)دا، گوتوویەتـی: (**سَـمَّاهَا عَبْـد الله بـنِ مَسْـعُودٍ سُـورَةُ النِّسَـاءِ الْقُـصْرَى**)، واتــە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود نـاوی لـە سـوورەتی تـەڵاق نـاوە: سـوورەتە

کورتەکـەی (النِّسَـاء)، واتـە: سـوورەتی (النِّسَـاءِ)ی درێژتـر هەیـە، کـە چوارەمیـن سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی موصحەفدا: (**الفاتحة، البقـرة، آل عمران، النساء**)، و (**سُـورَةُ النِّسَـاءِ**) جوزئـو نیوێـك زیاتـرەو (**سُـورَةُ النِّسَـاءِ الطُّولى**)یـە، واتـە: سـوورەتی (**النِّسَـاءِ**)ی درێژتـر، ئەمەشـیان (**سُـورَةُ النِّسَـاءِ القُـصْرَى**)، سـوورەتی (**النِّسَـاءِ**)ی کورتـترە، (**السـیوطي**)یش لـەو فەرموودەیـە وەریگرتـوە، کـە بوخاریـی و جگـە لەویـش هێناویانـەو، ئێمـە لـە بڕگـەی دووەمـدا دەیهێنیـن، بـەڵام بێگومـان ئیبنـو مەسـعوود بۆیـە ئـەو نـاوەی بـۆ بەکارهێنـاوە، تاکـو لـە سـوورەتی (**النِّسَـاءِ**)ی جیـا بکاتـەوە، ئەگەرنـا نـاوە ناودارەکـەی ئـەم سـوورەتە، هـەر بریتیـە لـە سـوورەتی (**الطَّلَاق**).

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

زانایـان لەسـەر مەدینەیـی بوونـی ئـەم سـوورەتە یەکدەنگـن و گوتوویانـە: لـە مەدینـە دابەزیـوە، لـەو بـارەوەش وێـڕای ئـەو دەقـەی پێشـوو، ئـەم دەقـەش هەیـە:

{**عَـنْ مَالِـكِ بْـنِ عَامِـرٍ قَـالَ: كُنَّـا عِنْـدَ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ مَسْـعُودٍ ﵁، فَذُكِـرَ عِنْـدَهُ أَنَّ الْحَامِـلَ الْمُتَـوَفَّى عَنْهَـا تَعْتَـدُّ أَقْصَى الْأَجَلَـيْنِ، فَقَـالَ: أَتَجْعَلُـونَ عَلَيْهَـا التَّغْلِيـظَ، وَلَا تَجْعَلُـونَ عَلَيْهَـا الرُّخْصَـةَ، لَنَزَلَـتْ سُـورَةُ النِّسَـاءِ الْقُـصْرَى بَعْـدَ الطُّـولَى: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾**} (**أخرجـه البخـاري: ٤٥٣٢، ٤٩١٠**).

واتـە: مالیکـی کـوڕی عامیـر، دەڵـێ: ئێمـە لـە لای عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود بوویـن (﵁)، لـە لای وی باسـکرا کـە ئافرەتـی تۆڵـدار (ئافرەتـی دووگیـان)، کـە مێردەکـەی مـردووە، پێویسـتە دوورترینـی دوو مـاوەکان، بچێتـە عیـددەوە، (عیددە: بریتیـە لـەو ماوەیـەی ئافـرەت چـاوەڕێ دەکات، دوای ئـەوەی مێـردی مـردووە، یاخـود لـە مێردەکـەی جیابۆتـەوە چـاوەڕێ دەکات، تاکـو ئـەو کاتـە تێدەپـەڕێ، ئـەو جـار بـۆی هەیـە دووبـارە شـوو بکاتـەوە، ئنجـا بـۆی باسـکرا کـە لـە دوو مـاوەکان کامەیـان درێژتـر بـێ، ئەویـان دەبێتـە عیـددەی)، عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوودیش

گوتی: ئایا لەسەری قورس دەکەن، لە جیاتی ئەوەی مۆڵەتی لەسەر دابنێن؟ سوورەتی نیسائی کورتتر، لە دوای سوورەتی نیسائی درێژتر دابەزیوە.

واتە: ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ ﴾، کە لە سوورەتی (**الطلاق**)دایە، دواتر دابەزیوە.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (**سورة الطلاق**)ی ناوناوە (**سُورَةُ النِّسَاءِ الْقُصْرَى**)، سوورەتە کورتەکەی نیساء، کە لە دوای (**سُورَةُ النِّسَاءِ**)، دابەزیوە، کەواتە: ئەوەی لەم سوورەتەدا، هاتووە، دوا حوکمەو ئەوە کاری پێدەکرێ، هەڵبەتە خوای بەرز باسی عیددەی ئافرەتی مێرد مردووی کردوە، لە سوورەتی (**البقرة**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٢٣٤ ﴾**البقرة**، واتە: ئەوانەتان کە دەمرن و ژنان بەجێدێڵن لە دوای خۆیان، چوار مانگ و دە شەوان چاوەڕێی خۆیان دەکەن...

واتە: چوار مانگ و دە شەو، دەبێ بچنە عیددەوە، تاکو دەرکەوێ: ئایا ئەو ئافرەتە لە نوتفەی ئەو پیاوەی لە منداڵداندا هەیە یان نا؟ ئەوەش بە چوار مانگ و دە شەوان دەردەکەوێ، بۆیە دەبێ ئەو ماوەیە چاوەڕێ بکات، لەوێدا خوا باسی عیددەی (**متوفى عنها زوجها**)، (ئەو ژنەی مێردی مردووە)ی کردوەو چوار مانگ و دە شەوی داناوە، بەڵام بە نسبەت ئافرەتی تۆڵدارەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ ﴾، خاوەن تۆڵەکان (کۆرپەکان) کاتی کۆتاییان بۆ عیددە بریتیە لە دانانی تۆڵەکەیان، دانانی کۆرپەکەیان، بەڵام لە مەجلیسی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعووددا گوتوویانە: نەء، تەماشا بکەن: ئایا ماوەی دانانی تۆڵەکە زیاترە لە چوار مانگ و دە شەوەکە، یان نا؟ ئنجا کامیان زیاتر بوو، دەبێتە ماوەی عیددەکەی، بۆ وێنە: ئەو ئافرەتە دوێنێ مێردی مردوەو دوای چەند ڕۆژی دیکە حەملەکەی دادەنێ،

بەپێـی ئـەم ئایەتـە بـێ، بـۆی هەیـە شـوو بکاتـەوە، بـەڵام بـە پێـی ئـەو قسـەیەی لـە کـوڕی (**إبـن مسـعود**)دا کـراوە، دەبـێ مـاوە درێژترەکـە کـە چـوار مانـگ و دە شـەوەکەیە، عیـددەی بـێ، ئنجـا عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود نکووڵیـی لـەوە کـردووەو گوتوویەتـی: نەخێـر، ئەویـان بـۆ ئافرەتانـە[1] بـە گشـتیی، بـەڵام ئەمـە[2] بـۆ ئافرەتانـی تۆڵـدارە بـە تایبـەت، کـە دوایـی لـەو بـارەوە قسـە دەکەیـن، مەبەسـتمان ئـەوە بـوو کـە ئـەم سـوورەتە لـە مەدینـە دابەزیـوە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

لـە لای زۆربـەی ژمێـرەران، ژمـارەی ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە دوازدە (١٢) یـەو، خەڵکـی بەصـڕاش بـە یـازدە (١١)یـان دانـاوە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ڕیزبەندیـی ئـەم سـوورەتە لـە موصحەفـدا: ژمـارە (٦٥)ە، لـە سـوورەتی (**الفاتحـة**)وە، کـە دێیـن لـە (٦٥)میـن دا، نـۆرە دەگاتـە سـەر ئـەم سـوورەتە، بـەڵام لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا، بەپێـی ڕای جابیـری کـوڕی زەیـد، ئـەم سـوورەتە (٩٦) میـن، سـوورەتە پێـش سـوورەتی (**البَیِّنـة**)و، لـە دوای سـوورەتی (**الإنسـان**) دابەزیـوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

تـەوەری بنەڕەتیـی ئـەم سـوورەتە باسـی تەڵاقـە، وەك تەواوکردنـی ئـەو حوکمانـەی دیکـەی تـەڵاق کـە لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا، هاتـوون، ئەم نـۆ حوکمەش لـە بـارەی تەڵاقـەوە، لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا هاتـوون، هەڵبەتـە ئەگـەر وردتـر سـەرنج بـدرێ، دەگونجـێ زیاتریـش بکرێـن، بـەڵام ئەمانـە سـەرەکییەکانیانن:

---

(١) واتە: ئایەتی (٢٣٤)ی (البقرة).

(٢) واتە: ئایەتی (٤)ی (الطلاق).

١- تەڵاقدانی ژنان بەر لە دەستپێکردنی عیددەیان، واتە: ئەگەر کەسێك بیەوێ، ژنەکەی تەڵاق بدات، دەبێ بەر لەوەی بچێتەوە عیددەوە، ژنەکەی تەڵاق بدات، لە پاکییەك دا کە نەچووبێتە لای، وەك دوایی باسی دەکەین.

٢- وەدەرنەنانی ئافرەتێك کە تەڵاق دەدەرێ لە ماڵەکەی، مەگەر خراپەیەکی ئاشکرای لێ دەربکەوێ، کە مەبەست پێی زمانەوەریی و، ئازاردانی مێردو کەس و کاریەتی، بە قسەو نارەحەتکردن و بێزارکردن.

٣- لە کاتی گەیشتنیان بە کۆتایی عیددەکەیان داو، بەر لە تەواو بوونی، یان بە شێوەی پەسند، ئەو مێردانە ئەو ژنانە بگرنە خۆیان، یان بە شێوەیەکی پەسند دەستبەرداریان بن و، لە هەردوو حاڵانیشدا دوو شایەدان بگرن، چ بۆ جیابوونەوەیان، چ بۆ گێڕانەوەیان.

٤- ئافرەتانی لە حەیز چووەوە، هەروەها ئافرەتانی نەکەوتووەوە حەیز، واتە: ئافرەتانێك کە کەوتوونە تەمەنەوەو لە حەیز چوونەوە، هەروەها ئافرەتانێك کە لەبەر کەم تەمەنیی جارێ نەکەوتوونە حەیزەوە، عیددەکەیان بریتیە لە سێ مانگ، هەر کاتێك هاوسەریان لێیان جیابۆوە، عیددەکەیان سێ مانگە.

٥- عیددەی ئافرەتی تۆڵدار (حامل)، بەدانانی تۆڵەکەی تەواو دەبێ.

٦- ئافرەتانی تەڵاقدراو، مافی مانەوەیان و حەوێندرانەوەیان لەسەر مێردەکانیانە، بەپێی توانایان و، لەو شوێنەی لە توانایاندا هەیەو، خۆیان تێیدا نیشتەجێن.

٧- ئەگەر ئافرەتە تەڵاقدراوەکان تۆڵدار بوون، پێویستە تاکو تۆڵەکەیان دادەنێن، مەسرەفیان بکێشرێ بەپێی توانا.

٨- هەر کات ئافرەتە کۆرپەدارەکان شیریان بە کۆرپەکانیاندا، پێویستە بابەکانیان کرێ بدەنە دایکەکان بەڕاوێژو، ئەگەر ڕێك نەکەوتن، ژنێکی دیکە شیری پێ بدات.

٩- بابای هەبوو لە قەدەر خۆی و، هی تەنگدەستیش لە قەدەر خۆی، خەرجیی ژنەکە یاخود شیر پێدرانەکەی، یاخود حەوێندرانەوەکەی، دەکێشن.

ئەم نۆ (٩) حوکمە لە حەوت ئایەتی یەکەمی سوورەتی (**الطلاق**)دا، خراونە ڕوو، لە پێنج ئایەتی کۆتاییشی دا، چەند ڕاستییەك خراونەڕوو کە دەتوانین بڵێین: ئەم پێنجە سەرەکییەکانیان:

١- گەلێك ئاوەدانیی بە هۆی سەرکێشیی و یاخیی بوونیانەوە، لە بەرانبەر خواو پێغەمبەرەکانیدا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، خوا سزای داون و، لە دواڕۆژیشدا سزای سەخت چاوەڕێیانە.

٢- فەرمانکردن بە بڕواداران کە پارێز لە خوا ﷻ بکەن.

٣- باسکردنی دابەزاندنی بیرخەرەوەو، ناردنی نێردراوی کۆتایی( موحەممەد ﷺ )کە خوێنەرەوەی ئایەتە ڕۆشنەکانی خوایە.

٤- باسی سەرەنجامی بەرزو پەسەندی بڕوادارانی چاکەکار، کە بریتیە لە سەقامگیربوون لە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خواداو، بەهرەمەند بوون لە چاکترین بژیو کە خوا بۆیان دەڕەخسێنێ.

٥- ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە خوا حەوت ئاسمانی دروستکردوون، وێنەی وانیشی لە زەویدا دروستکردوون، تاکو خەڵك بزانن خوا ﷻ لەسەر هەموو شتێك توانایەو بە هەموو شتێکیش زانایە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

چوار تایبەتمەندییمان لەم سوورەتەدا باسکردوون:

**یەکەم:** کۆمەڵێك حوکمی تەڵاق و عیددەو نیشتەجێکردن (**إسكان**)ی ژنی تەڵاقدراو و شیرپێدان (**رضاع**)، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون.

**دووەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، لە سێ ئایەتی بە دوای یەکدا پێنج موژدەی گەورەی جۆراوجۆر، بە پارێزکاران دراون:

١و٢)- ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ۝٢ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۝٣﴾، هەر کەسێ پارێز لە خوا بکات، خوا دەرووی خێری لێ دەکاتەوەو، بە بێ ئەوەی خۆی بیری لێ کردبێتەوەو بە خەیاڵیدا هاتبێ، خوا بژیوی دەدا.

٣)- ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ۝٤﴾، هەر کەسێ پارێز لە خوا بکات، خوا کاری بۆ ئاسان دەکات.

٤و٥)- ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ۝٥﴾، هەر کەس پارێز لە خوا بکات، خراپەکانی لێ دەسڕێتەوەو، پاداشتێکی مەزنی دەداتێ و پاداشتی بۆ مەزن دەکات.

**سێیەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا تەعبیری: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۝٧﴾، هاتوە، واتە: خوا لە هیچ کەس داوا ناکات، مەگەر ئەوەندەی پێیداوە، چەندە توانای پێداوە، ئەوەندەشی لێ داوا دەکات، توانای ماڵیی و، توانای جەستەیی و، توانای فیکریی، هەمووی دەگرێتەوە، هەرچەندە سیاقەکە زیاتر توانای ماڵیی دەگەیەنێ، بەڵام لە ڕاستییدا ئەگەر لە سیاقی خۆی دەری بێنین: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا﴾، خوا لە هیچ کەس داوا ناکات، هیچ کەس ئەرکدار ناکات، بە زیاتر لەوەی پێیداوە، واتە: لە هەموو جۆرەکانی ئەو شتانەی خوا بە مرۆڤەکانیان دەدات.

**چوارەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا وێڕای حەوت ئاسمانان، ئاماژە بە حەوت زەوییانیش کراوە: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ ۝١٢﴾، ئەو خوایەی حەوت ئاسمانی دروستکردن و، لە زەویشدا وێنەی وان، کە ئەمە ئاماژەیەکە بەوەی زەوییەکانیش حەوت بن، وەك ئاسمانەکان، بەڵام ئایا مەبەست لە حەوت زەوییەکان چیە؟ ئەوە زیاتر لە ئەگەرێك هەڵدەگرێ.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سووڕەتە بۆ چەند دەرسێك:

ئەم سووڕەتە موبارەکە بۆ دوو دەرسان دابەش دەکەین:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٧)، دەگرێتەوەو وەك گوتمان: نۆ حوکمی گەورەی شەریعەتیان تێدان، لە چوار چێوەی تەڵاق و لێکجیابوونەوەو، عیددەکێشانی ئافرەت، پاشان شیرپێدانی ئافرەت بە منداڵی و، مەسرەف کێشانی پیاو بۆ ژنەکەی، کە تەڵاقی داوەو، حەواندنەوەی.

**دەرسی دووەم:** پێنج ئایەتی کۆتایی، کە ئایەتەکانی (٨ - ١٢)، دەگرێتە خۆی و، ئەویش وەك گوتمان: خوای بەرزی مەزن چەند ڕاستییەکی تێدا خستوونە ڕوو.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە حـەوت ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی (الطـلاق) پێـك دێ، ئایەتەكانـی: (١ - ٧)، كـە پێشـتریش گوتمـان: نـۆ حوكمـی جـۆراو جۆریـان لـە بـارەی تەڵاقدانـی ئافرەتـان و، حوكمـە پەیوەندییدارەكانیـەوە گرتوونـە خۆیـان، كـە بریتیـن لە:

١- تەڵاقدانی ژنان بەر لە دەستپێكردنی عیددەیان.

٢- وەدەرنەنانی ژنانێك كە تەڵاقدراون لە ماڵەكەیان، مەگەر خراپەیەكی ئاشكرایان لێ دەركەوێ، وەك بێزاركردنی مێرد، یان كەس و كارەكەی.

٣- لە كاتی گەیشتنی ئافرەتان بە كۆتایی عیددەیان و بەر لە تەواو بوونی، دەبێ مێردەكانیان مادام تەڵاقەكە تەڵاقی ڕەجعیی بێ، یان بە شێوەی پەسند بیانگرنە خۆیان، یاخود بە شێوەی پەسند دەستبەرداریان بن و، دوو شایەدانیش بگرن.

٤- ئافرەتانی لە حەیز چووەوەو، ئافرەتانێك كە جارێ نەكەوتوونە حەیزەوە، عیددەكەیان سێ مانگە.

٥- عیددەی ئافرەتی تۆڵدار (حامل) بە دانانی تۆڵەكەی تەواو دەبێ.

٦- ئافرەتانی تەڵاقدراو، مافی مانەوەیان و حەوێنرانەوەیان لەسەر مێردەكانیانە، بەپێی توانایان.

٧- ئەگەر ئافرەتە تەڵاقدراوەكان تۆڵدار بوون، پێویستە تاكو تۆڵەكەیان دادەنێن، مەسرەفیان بكێشرێ.

٨- هەر كات ئافرەتە كۆرپەدارەكان شیریان بە كۆرپەكانیاندا، پێویستە بابی منداڵەكان كرێ بدەنە دایكەكان بە ڕاوێژ لە نێوان خۆیاندا، ئەگەر ڕێك نەكەوتن، ئافرەتێكی دیكە شیر بدات بەو كۆرپەیە.

٩- بابای هه‌بوو له قه‌ده‌ر خۆی و هی ته‌نگده‌ستیش له قه‌ده‌ر خۆی، مه‌سره‌فی ماڵ و خێزانیان ده‌كێشن.

باسكردنی ئه‌و حوكمانه‌، كۆمه‌ڵێك ئامۆژگاریی گه‌وره‌و گرنگیشیان نێواخن كراون، به‌ تایبه‌ت فه‌رمانكردن به‌ پارێزكاریی به‌رانبه‌ر به‌ خوا ﷻ و، نه‌شكاندنی سنووره‌كانی خواو، پشت به‌ستن به‌ خوای كاربه‌جێ و، له‌ خۆ وریا بوون له‌ سه‌رپێچییكردن و، لادان له‌و شتانه‌ی خوا ﷻ وه‌ك سنوور داینا‌ون.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ٣ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ٤ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ٥ أَسۡكِنُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ سَكَنتُم مِّن وُجۡدِكُمۡ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُواْ عَلَيۡهِنَّۚ وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمۡلٖ فَأَنفِقُواْ عَلَيۡهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ فَإِنۡ أَرۡضَعۡنَ لَكُمۡ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأۡتَمِرُواْ بَيۡنَكُم بِمَعۡرُوفٖۖ وَإِن تَعَاسَرۡتُمۡ فَسَتُرۡضِعُ لَهُۥٓ أُخۡرَىٰ ٦ لِيُنفِقۡ ذُو سَعَةٖ مِّن سَعَتِهِۦۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيۡهِ رِزۡقُهُۥ فَلۡيُنفِقۡ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَاۚ سَيَجۡعَلُ ٱللَّهُ بَعۡدَ عُسۡرٖ يُسۡرٗا ٧ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە: ئەی پێغەمبەر! هەر کات ژنانتان تەڵاقدان لەسەرەتای عیددەیانەوە تەڵاقیان بدەن و (شەوو ڕۆژەکانی) عیددەش سەر ژمێر بکەن و، پارێزیش لە خوای پەروەردگارتان بکەن، (ژنە تەڵاقدراوەکان) لەماڵەکانیان دەریان مەکەن و، با ئەوانیش دەرنەچن، مەگەر کردەوەیەکی (خراپی) دزێوی ئاشکرا بکەن (ئەو کاتە مافی حەوێنرانەوەیان نامێنێ)و، ئەوانەش سنوورەکانی خوان و، هەر کەسێکیش سنوورەکانی خوا ببەزێنێ، مسۆگەر ستەمی لە خۆی کردوە، (نازانی لە ماوەی عیددەدا چ دەگوزەرێ!)، ڕەنگە خوا دوای ئەوە کارێك (گۆڕانکارییەك) پەیدابکات ﴿١﴾ ئنجا هەر کات گەیشتنە (نیزیك کۆتایی) ماوە (ی عیددە)کەیان، یان بە (شێوازێکی) پەسند دەستیان پێوە بگرن (وەك هاوسەر)، یان بە شێوازێکی پەسند لێیان جیابنەوەو، دوو (پیاوی) خاوەن دادگەرییش بە شایەد بگرن (چ بۆ هێشتنەوە، چ بۆ وازلێهێنانیان) و (ئەی شایەدەکان!) بۆ خوا شایەدییدان(ێکی ڕاست) بەرپا بکەن، ئا ئەوەتان کەسێکی پێ ئامۆژگاریی دەکرێ، کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێ و، هەر کەسێکیش پارێز لە خوا بکات خوا دەرووی (خێری) لێ دەکاتەوە ﴿٢﴾ هەروەها بە شێوەیەك کە مەزەننە ناکات، بژیوی دەدات و، هەر کەسیش پشت بە خوا ببەستێ، ئەوی بەسە، بێگومان خوا کاری خۆی دەگەیەنێتە جێ، بە دڵنیایی خوا ئەندازەی داناوە بۆ هەموو شتێك ﴿٣﴾ ئەو ئافرەتانەشتان کە لە (کەوتنە) حەیز نائومێد بوون، ئەگەر دوو دڵ بوون (لە بارەیانەوە) ماوەی عیددەکەیان سێ مانگەو، ئەوانەش کە نەکەوتوونە حەیزەوە (بە هەمان شێوە)و، خاوەن تۆڵەکانیش، کۆتایی کاتی (عیددەکە)یان ئەوەیە کە تۆڵەکانیان دابنێن و، هەر کەسیش پارێز لە خوا بکات، ئاسانیی لە کاری دا بۆ دەڕەخسێنێ ﴿٤﴾ ئا ئەوە حوکم و فەرمانی خوایە بۆ لاتانی دابەزاندوە، هەر

کەسیش پارێز لە خوا بکات، خراپەکانی لێ دەسڕێتەوەو پاداشتی بۆ مەزن دەکات ﴿٥﴾ (ئەی مێردەکان!) ژنە (تەڵاقدراوە)کانتان بەپێی هەبوونتان لە شوێنێ کە تێیدا نیشتەجێ دەبن، نیشتەجێ بکەن و (بە هیچ جۆرێك) زیانیان پێ مەگەیەنن، تاکو تەنگیان پێ هەڵبچنن (و سەغڵەتیان بکەن)، ئەگەر خاوەن تۆلیش بوون، مەسرەفیان بکێشن، تاکو تۆلەکەیان دادەنێن، ئنجا ئەگەر شیریان بۆ دان (بە کۆرپەکانیان) پاداشتەکانیان (کرێی شیرپێدانەکەیان) پێ بدەن و، بە شێوەیەکی پەسندیش (لەو بارەوە) پێکەوە پرس و ڕا بکەن و، ئەگەر پێکەوە کەوتنە زەحمەت (و تێکگیران)یشەوە، ژنێکی دیکە شیری پێدەدات ﴿٦﴾ با خاوەن فراوانیی (لە ماڵ و سامان دا) لە (قەدەر) فراوانییەکەی خەرج بکات و، هەر کەسیش بژیوەکەی لێ تەنگ کرابێتەوە (کەم دەست بێ) با لەوەی خوا پێیداوە، خەرج بکات، خوا جگە لەو (ئەندازەی)ەی پێیداوە، هیچ کەس ئەرکدار ناکات (و لێی داوا ناکات)، لەمەودواش خوا لە دوای سەغڵەتیی (و تەنگدەستیی) ئاسانیی دەڕەخسێنێ ﴿٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(طَلَّقْتُمُ): (**أَصْلُ الطَّلَاقِ: التَّخْلِيَةُ مِنَ الوَثَاقِ، أَطْلَقْتُ البَعِيْرَ مِنْ عِقَالِهِ، وَطَلَّقْتُهُ وَهُوَ طَالِقٌ وَطُلْقٌ، وَمِنْهُ اسْتُعِيْرَ طَلَّقْتُ المَرْأَةَ**)، وشەی (طَلَاق): لە ئەصڵدا بریتیە لە بەرهەڵداکردن لە پەتێك، شتێك کە پێوەی بەستراوەتەوە، (**أَطْلَقْتُ البَعِيْرَ مِن عِقَالِهِ**)، حوشترەکەم لە پەتەکەی بەرهەڵدا، (**وَطَلَّقْتُهُ**)، (**طَلَّقْتُ**) و (**أَطْلَقْتُ**)، هەردووکیان بەکارهاتوون، واتە: حوشترەکەم بەرداو پەتەکەم لێکردەوە، (**وَهُوَ طَالِقٌ وَطُلْقٌ**)، حوشترەکە (**طَالِق**)، بەرهەڵدایە (**وَطُلْق**)یش هەر بەکاردێ، (**وَمِنْهُ اسْتُعِيْرَ طَلَّقْتُ المَرْأَة**)، و(**طَلَّقْتُ المَرْأَة**)ش لەوەوە خوازراوەتەوەو ڕیشەی وشەکە

لەوێـوە هاتـوە، بـەڵام دوایـی بـۆ دەسـتبەردار بوونـی مێـرد بـۆ ژنـی بەکارهێنراوە.

(ٱلْعِدَّةَ): (عِـدَّةُ المَـرْأَةِ: هِـيَ الأَيَّـامُ الَّتِـي بِانْقِضَائِهَـا يَحِـلُّ لَهَـا التَّـزَوُّج)، عیـددەی ژن ئـەو ڕۆژانـەن کـە بـە تـەواو بوونیـان، ئـەو ئافرەتـە بـۆی حـەڵاڵ دەبـێ هاوسـەرگیریی بـکات.

(بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ): کردەوەیەکـی ناقـۆڵای ئاشـکرا، یـان ئاشـکراکەر، (الفُحْـشُ وَالفَحْشَـاءُ وَالفَاحِشَـةُ: مَـا عَظُـمَ قُبْحُـهُ مِـنَ الأَفْعَـالِ وَالأَقْـوَالِ، وَيُقْصَـدُ بِهَـا هُنَـا البِـذَاءُ والإِيْـذَاءُ وَالنُّشُـوزُ)، وشـەکانی: (فُحْـشُ وفَحْشَـاءُ وفَاحِشَـةُ): بریتیـن لـە هـەر قسـەو کردەوەیـەك کـە زۆر ناقـۆڵاو دزێـو بـێ، لێرەشـدا مەبەسـت پێـی زمانەوەریـی و، ئـازاردان و، یاخیـی بوونـی ئـەو ژنەیـە، کـە تەڵاقیـش دراوە، بـەڵام بـە دەمەوەریـی و، خـراپ قسـەکردن و بێزارکـردن، کردەوەیەکـی خـراپ دەکات، چ لەگـەڵ مێـردی دا، چ لەگـەڵ کـەس و کاری مێردەکـەی لـەو شـوێنەی تێیـدا نیشـتەجێیە.

(بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ)، یانـی: (الفَاحِشَـةُ المُوَضِّحَـة لِفُحْشِـهَا) کردەوەیەکـی خراپـی ئاشـکراکەر، بـۆ خراپیـی و بـۆ ناقۆڵاییەکـەی.

(حُدُودُ ٱللَّهِ): (حُـدُود: جَمْـعُ حَـدّ، وهـو الفَاصِـلُ بَـيْنَ الشَّـيْئَيْنِ يَمْنَـعُ أَخْتِـلَاطُ احَدِهِـمَا بِالآخَـر، وَالمَقْصُـود بِحُـدُوْد للـهِ: أَحْـكَامُ اللـه)، (حُـدُود) کـۆی (حَـد)، (بـە کوردیـی دەڵێیـن: سـنوور)، بریتیـە لـە نێوانێـك لـە نێـوان دوو شـتاندا، ڕێدەگـرێ لـەوەی تێکەڵـی یەکـدی بـبن، (حُـدُودُ اللـهِ)ش، مەبەسـت پێـی یاسـاکانی خوایـە ﷻ.

(أَجَلَهُنَّ): (الأَجَلُ: العِدَّةُ المَضْرُوبَةُ للشيء)، (أَجَل): کاتێکی دیارییکراوە بۆ شتێك.

(مَخْرَجٗا): (المَخْـرَجُ: مَوْضِـعُ الخُـرُوجِ، وَالخُـرُوْج)، (مَخْـرَج): هـەم بەمانای ناوی شـوێن هاتـوە، شـوێنی لـێ دەرچـوون، هـەم بـە مانـای چاوگیـش هاتـوە واتـە: دەرچـوون، (مَخْـرَج)، لێـرەدا بـە کوردیـی دەبێتـە دەروو، یـانی: دەرووی خێـری لـێ دەکاتـەوە.

(لَا يَحْتَسِبُ): (يَحْتَسِـبُ الأَمْـرَ، حَسِـبَهُ وَظَنَّـه)، ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾،

بـە شـێوەیەك کـە بیـری لـێ نەکردۆتـەوەو حیسـابی بـۆ نەکـردوە، ئەگـەری بـۆ دانەنـاوە، (**احْتَسَـبَ الأمْـرَ**)، کارەکـەی ژمـاردو گومانـی بۆچـوو.

(يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ): نائومێـد بـوون لـە کەوتنـە حەیـزەوە، (**الَمحِيْـضُ: الحَيْـضُ**)، (**مَحِيْـض**): لێـرەدا بـە مانـای حەیـزە، واتـە: ئـەو ئافرەتانـەی نائومێـد بـوون بکەونـە حەیـزەوە، لەبـەر ئـەوەی کەوتوونـە تەمەنـەوە.

(وُجْدِكُمْ): (**الوُجْـدُ: اليَسَـارُ وَالسَّـعَة**)، (**وُجْـد**)، ئاسـانیی و فراوانیـی لـە مـاڵ و سـاماندا.

(أَرْضَعْنَ لَكُمْ): شـیریان بـۆ داون بـە کۆرپەکانتـان، (**رَضَـعَ الَموْلُـودُ يَرْضِـعُ**)، واتـە: منداڵەکـە شـیری خـوارد، (**أَرْضَعَتْـهُ**)، ئافرەتەکـە شـیری بـەو منداڵـەدا.

(أُجُورَهُنَّ): (**الأَجْـرُ وَالأُجْـرَةُ: مَـا يَعُـودُ مِـنْ ثَـوَابِ العَمَـلِ دُنْيَوِيَّـاً كَانَ أو أُخْرَوِيَّـاً**)، وشـەی (**أُجُـور**)، کـۆی (**أَجْـر**)ە، (**أَجْـر وأُجْـرَة**)، هەردووکیـان بریتیـن لـەوەی لـە پاداشـتی کـردەوەدا لـە ڕووی دنیایـی، یـان لـە ڕووی دواڕۆژییـەوە، بـۆ مـرۆڤ دەگەڕێتـەوە.

(وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم): لـە نێـوان خۆتانـدا ڕاوێـژ بکـەن، (**الإئْتِـمَارُ: قُبُـولُ الأَمْـرِ، وَالتَّشَـاوُرُ لِقُبُـولِ بَعْضِهِـمْ أَمْـرَ بَعْـض فِيـمَا أَشَـارَ بِـهِ**)، وشـەی (**إئْتِـمَار**)، بـە مانـای وەرگرتـن و قبووڵکردنـی فەرمانـە، هەروەهـا (**إئْتِـمَار**)، بـە مانـای ڕاوێـژ پێکـەوە کردنـە، چونکـە هـەر کامێکیـان ئـەوەی ئـەوی دیکـە دەیڵـێ، قبووڵـی دەکات، (و لێـی دەکۆڵێتـەوەو هەڵیدەسـەنگێنێ).

(تَعَاسَرْتُمْ): (**تَعَـاسَرَ القَـوْمُ: يَعْنِـي طَلَبُـوا تَعْسِـيْرَ الأَمْـرِ**)، (**تَعَـاسَرَ القَـوْم**)، کۆمەڵـە خەڵکەکـە هـەر کامێکیـان ویسـتی کارەکـە بـە زەحمـەت بـێ و داوایکـرد کارەکـە وەزەحمـەت بخـات، (**يَـوْم عَسِـيْر**): (**يَـوْم يَتَصَعَّـبُ فِيْـه الأَمْـر**)، (**يَـوْم عَسِـيْر**)، ڕۆژێـك کـە کار تێیـدا بـە زەحمـەت و قـورس دەبـێ، کەواتـە: (**وإنْ تَعَاسَرْتـم فَسَـترضع**

**لـە أخـرى**)، واتـە: ئەگـەر ڕێـك نەكەوتـن و ژن و مێردەكـە پێكـەوە تەبـا نەبـوون و، نەگەیشـتنە لێكتێگەیشـتن دەربـارەی شـیرپێدانی منداڵەكەیـان لـە لایـەن دایكەكەیـەوە، بـا ئافرەتێكـی دیكـە شـیری پـێ بـدات و، ئـەی پیاوەكـە! ئافرەتێكـی دیكـەی بـۆ بگـرە، یـان جاری وایـە ئافرەتەكـە ئامـادە نابـێ، مـادام تەڵاقـدراوە شـیر بـدات بـەو كۆرپەیـەی و دەڵـێ: مـادام ئـەو كۆرپەیـەم لـەو پیاوەیـە، شیریشـی پـێ نـادەم، ڕەحمـی لەسـەری نابـێ، یـان ڕق هەڵسـان و دەمارگیرییەكـەی زاڵ دەبـێ بەسـەر ڕەحـم و بەزەییەكەیـدا.

(**سَعَةٍ**): (**السَّـعَة: الطَّاقَـةُ وَالقُـوَّةُ**)، (**سَـعَة**)، یانـی: فراوانیـی و توانـا، لێـرەدا مەبەسـت پێـی وزەو توانایـە، (**وَالسَّـعَةُ: الدَّعَـةُ وَالغِنَـى وَالرُّفَاهِيَّـة**)، دیسـان (**سَـعة**) بـە مانـای هەبـوون و بێنیازیـی و خۆشـگوزەرانییش دێ.

(**قُدِرَ عَلَيۡهِ رِزۡقُهُۥ**): بژیوەكـەی لەسـەری تەنـگ كـراوە، (**قَـدَرْتُ عَلَيْـهِ الـشَّيءَ: ضَيَّقْتُـهُ كَأَنَّمَـا جَعَلْتُـهُ بِقَـدَرٍ**)، (**قَـدَرْتُ عَلَيْـهِ الـشَّيء**)، واتـە: شـتەكەم لـێ وەتەنـگ هێنـا وەك بـە ئەنـدازە دامنـا بـێ.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە موبارەکەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١﴾، ئەم دوو ڕیوایەتە دێنین، ڕیوایەت زۆرن لەو بارەوە، بەڵام ئەم دووانەمان لە ڕووی سەنەدەوە پێ بەهێز بوون، یاخود بە لای کەمەوە پێمان بێ ئیشکال بوون، بە تایبەت هی دووەمیان:

یەکەم: {**عَنْ عَبْدِالله بِن عُمَر ﵄، أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ، وَهِي حَائِضٌ عَلَى عَهْدِ النَّبِي ﷺ فَانْطَلَقَ عُمَرُ فَذَكَر ذَلِك لَهُ، فَقَالَ: مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ يُمْسِكهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ يُطْلقِهَا إِن بَدَا لَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ عِنْدَ ذَلِكَ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾، **قَالَ أَبُو الزُّبَيْرُ: هَكَذَا سَمِعْتُ ابْنُ عُمْرَ يَقْرَأهَا: فَطَلِّقُوهُنَّ قُبُلَ عِدَّتُهُنَ**} **(ذكره السيوطي في الدرّ المنثور: ج٨، ص١٨٩، ونسبه لابن مردويه، الإستيعاب في بيان الأسباب،: ج٣، ص٤٢٧).**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﵄، گێڕدراوەتەوە کە ژنەکەی خۆی تەڵاقداوە، لە کاتێکدا لە حەیزدا بووە، لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ) چووە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی بۆ باسکردوە، ئەویش ﷺ فەرموویەتی: پێی بڵێ: با هاوسەرەکەی بگێڕێتەوە لای خۆی و با لە لای بێت، هەتا پاك دەبێتەوە (لە حەیز)، ئنجا ئەگەر ویستی دەستبەرداری بێ، با لە پاکییەکدا کە نەچۆتە لای، دەستبەرداری ببێ، ئیدی لەو بارەوە خوا عزوجل ئەو ئایەتەی دابەزاند، ئەبوو زوبەیر دەڵێ: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرم ئاوا بیستوە دەیخوێندەوە: (**فَطَلِّقُهُن قُبُلَ عِدَّتهُن**)، پێش کەوتنە

عیددەکەیان تەڵاقیان بدەن، ئەوەش وردەکارییەکی هەیە، دوایی باسی دەکەین، کە دروست نیە ئافرەت لە عیددەدا تەڵاق بدرێ، بەڵکو دەبێ پێش ئەوەی بکەوێتە عیددەوە، تەڵاق بدرێ، بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە تووشی زیان نەبێ و ماوەکەی زۆر لێ درێژ بکرێتەوە.

دووەم: {**عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِض، فَذَكَر ذَلِكَ لرَسُولِ اللهِ ﷺ فَتَغَيَّظَ فِيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: لِيُراجِعْهَا، ثُمَّ يُمْسِكْها حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ تَحِيْضَ فَتَطْهُر، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَن يُطَلِّقْهَا، فَلْيُطَلِّقهَا طَاهِراً قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّة الَّتِي أَمَرَ اللهُ أَنْ يُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاء، وَقَرَأَ النَّبِي ﷺ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ فِي قُبُلِ عدتهن﴾**} (**أخرجه البخاري: ٤٩٠٨، ومسلم: ١٠٩٥**).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە کە کاتێ ژنەکەی لە حەیزدا بووە، تەڵاقی داوە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ لەو بارەوە تووڕ بووەو، فەرمووی: با بچێتەوە بۆ لای هاوسەرەکەی (بیهێنێتەوە بۆ لای خۆی) و دوایی بیگرێتە لای خۆی، هەتا پاك دەبێتەوە (لە حەیز)، دوایی جارێکی دیکە بکەوێتەوە حەیز، ئنجا پاك بێتەوە (بۆ جاری دووەم)، ئنجا ئەگەر ویستی تەڵاقیبدات و هەر سوور بوو، با تەڵاقی بدات لە کاتێکدا کە ئەو ئافرەتە لە حەیزدا نیەو نەشچۆتە لای، (چونکە کە پاك بۆوەو چۆوە لای (جیماعی لەگەڵ کرد)، نازانێ ئایا ئەو ئافرەتە نوتفەی ئەو پیاوەی هەڵگرتوە، یان نا)، دەبێ کاتێك دڵنیا بێ کە ئەو ئافرەتە پاکە لە نوتفەی ئەو پیاوە، لەو کاتەدا تەڵاقیبدات، ئا ئەوە ئەو عیددەیە کە خوا فەرمانی کردوە، ئافرەتانی تێدا تەڵاق بدرێن، ئنجا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی ئاوا خوێندەوە: (یَٰٓأَیُّهَا ٱلنَّبِیُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ **فِي قُبُلِ عدَّتهن**) بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی ئەوە بووە، کە ئەم ئایەتە ماناکەی ئاوایە، ئەی پێغەمبەر ﷺ! هەر کات ئافرەتانتان تەڵاقدان، تەڵاقیان بدەن پێش عیددەکەیان، واتە: نەك لە

عیددەکەیدا تـەڵاق بـدرێ، بەڵکـو دەبـێ پێـش ئـەوەی بکەوێتـە عیـددەوە تـەڵاق بـدرێ، بـۆ ئـەوەی ئـەو ئافرەتـە زیانبـار نەبـێ و بـە ناهـەق کاتەکـەی لەسـەر درێـژ نەکرێتـەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

دەست پێکردنم بە ناوی خوایە، کە ئەویش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای توانادار دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خـوا ﷻ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دەدوێنـێ، ئنجـا بـە دڵنیایـی کـە ڕووی دوانـدن لـەوە، وەك پێغەمبـەری مسـوڵمانان و سـەرۆکیان و مشـوورخۆریان و سەرپەرشـتیاریان، بـەڵام مەبەسـت پێـی ئۆممەتەکـەی و شـوێنکەوتووانیەتی، دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ! ﴿إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، هـەر کاتێـك ژنانتـان تەڵاقـدان، واتـە: ویسـتتان تەڵاقیـان بـدەن، ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾، لـە پێـش عیددەکەیانـەوە تەڵاقیـان بـدەن، وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەشـیدا باسـمان کـرد، پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەك لـە صەحیحـی بوخاریـی و موسـلیمدا هاتـوە، لـە کاتـی خوێندنـەوەی ئـەم ڕسـتەیەدا فەرموویەتـی: (**فَطَلِّقُوهُـن فِي قُبُـلِ عِدَّتهِـنَّ**)، لـە پێـش دەسـتپێکی عیددەکەیانـدا، تەڵاقیـان بـدەن.

(عـدة): بریتیـه لـەو ماوەیـەی ئافرەت چـاوەڕێ دەكات، تاكـو بـۆی ڕەوا دەبێت شـوو بكاتـەوە، ئافرەتێك كـە هاوسـەردار بـووە، ئنجـا چ هاوسـەری مردبـێ، چ خۆی داوای كردبـێ لـە هاوسـەری جیـا ببێتـەوە، كـە پێـی دەگوتـرێ: داڕنیـن (خُلْـع)، چ دادوەر لێكـی جیاكردبنـەوە، كـە پێـی دەگوتـرێ: هەڵوەشـاندنەوە (فَسْـخ)، چ مێردەكـەی دەسـتبەرداری بووبـێ، كـە پێـی دەگوتـرێ: (طَـلَاق)، بـە هـەر كام لـەم هۆكارانـە، ئـەو ئافرەتـە لـە مێردەكـەی جیابووبێتـەوەو مێردەكـەی لێـی جیابووبێتـەوەو، گرێبەسـتی هاوسـەرگیریيان لـە نێوانـدا نەمابـێ، دەبـێ ئـەو ئافرەتە عیـددە بەسـەر بـەرێ، (عـدة)ش، واتـە: چەنـد شـەوو ڕۆژێك كـە دەژمێردرێـن، دەبێ چەنـد شـەوو ڕۆژێـك بەسـەر ببـات، ئنجـا دوایـی بـۆی ڕەوا دەبـێ هاوسـەرگیریی بكاتـەوە، دووبـارە، دیـارە ئـەو عیددەیـەش، چەنـد حیكمەتێكـی هـەن، یەكێكیـان یـان سـەرەكییترینیان ئەوەیـە: دەربكـەوێ كـە ئـەو ئافرەتـە منداڵدانـی نوتفـەی ئـەو مێـردە پێشـووەی تێدا نیـە، ئنجـا مێردەكـەی زینـدووە، كـوژراوە، مـردوە، یـان بەهـەر شـێوەیەك لـە شـێوەكان لێـی جیابۆتـەوە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾، واتـە: بـەر لـەوەی بچنـە نێـو عیـددەوە، تەڵاقیـان بـدەن، ئایـا ئەمـە چۆنـە؟ پێشـتریش باسـمانكرد، واتـە: ئـەو ئافرەتـە لـە پاكییدابـێ، و لـە حەیـزدا نەبـێ، لـە بـێ نوێژییـدا نەبـێ، ئنجا پاكییـەك بـێ كـە مێردەكـەی تێیـدا نەچووبێتـە لای، چونكـە بـا پاكیـش بـێ، ئەگـەر مێردەكـەی لەگەڵـی جووتبووبـێ، نازانـرێ ئایـا نوتفـەی ئـەو پیـاوە چۆتـە نێـو منداڵدانیـەوە یـان نـا، بۆیـە دەبـێ لـە پاكییەكـدا تـەڵاق بـدرێ، كـە مێردەكـەی لەگەڵـی دا جـووت نەبووبـێ، كەواتـە: ﴿ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾، واتـە: لـە كاتێكـدا كـە جـارێ دەسـتیان بـە عیددەكەیـان نەكـردوە، پێـش دەسـتپێكردنی عیددەكەیـان، تەڵاقیـان بـدەن، ﴿ وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ ﴾، عیـددەش بژمێـرن، واتـە: ئـەو شـەوو ڕۆژانـە بژمێرن و سـەرژمێر بكـەن، كـە پێویسـتە ئافـرەت چـاوەڕێ بـكات، تاكـو بـۆی ڕەوا دەبـێ و بـۆی دەشـێ هاوسـەرگیرییەكی دیكـە بكاتـەوە، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ ﴾، پارێزیـش لـە خـوای

پەروەردگارتـان بکـەن، ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ﴾، ئێـوە لـە ماڵەکانـی خۆیـان وەدەریـان مەنێـن، ئـەو ئافرەتانـەی تەڵاقتانـداون، بـە هـەر کام لـە دوو جـۆرەکانی تـەڵاق: چ تەڵاقـی یەکجارەکیـی بـێ، کـە پێـی دەگوتـرێ: (الطَّلَاقُ البَائِن) یان تەڵاقی ڕەجعیـی بـێ، واتـە: کـە ئـەو پیـاوە بـۆی هەبـێ ژنەکـەی بگێڕێتـەوە ژێـر نیکاحـی خـۆی، لێـرەدا بەگشـتی فەرموویەتـی و دوایـی دێینـە سـەر وردەکارییـەکان، گرنـگ ئەوەیـە خـوا دەفەرمـوێ: ژنەکانتـان لـە ماڵەکانـی خۆیـان دەر مەکـەن، بـە بیانـووی ئـەوەی تەڵاقتـان داون، ئنجـا ئەگـەر تەڵاقێکـە، ئەگـەر دووانـە، ئەگـەر تەڵاقـی سـێیەمە، ﴿وَلَا يَخْرُجْنَ﴾، هەروەهـا بـا ئەوانیـش دەرنەچـن، نـە ئێـوە دەریـان بکـەن، نـە بـا خۆشـیان لـەو ماڵانەیـان دەربچـن، ﴿إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾، مەگـەر گوناهێکـی ناقـۆڵای ڕوونکـەرەوە ئەنجـام بـدەن، ئەمـە وەك لـە تەفسـیری سـوورەتی (النسـاء) و لـە تەفسـیری سـوورەتی (الأحزاب)یشـدا، باسـمکردوە، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە: ئـەو ئافرەتـە مێردەکـەی بێـزار بـکات، یاخـود خزمەکانی بێـزار بـکات، بـە قسـەو دەنگـە دەنـگ و پرتـەو بۆڵـە، بـە هیـچ جۆرێـك ناگونجـێ لێـرەدا مەبەسـت لـە: ﴿بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾، زینـا بـێ، وەك زۆربـەی توێژەرەوانـی قورئـان وایانگوتـوە، بەڵکـو ئـەوە هەڵەیـەو لـە تەفسـیری سـوورەتی (النسـاء) و تەفسـیری سـوورەتی (الأحـزاب)دا، ڕوونـم کردۆتـەوە لەبەرچـی ئـەوە هەڵەیـە، دوایـیش لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا جارێکـی دیکـە ئاماژەی پـێ دەکەینـەوە.

وشـەی (فَاحِشَـة) لـە قورئانـدا هـەم بـە مانـای زینـا هاتـوە، هـەم بـە مانـای نێربازیـی هاتـوە، هـەم بـە مانـای لادانـە جینسـییەکان هاتـوە بەگشـتیی، بـەڵام کـە قەیـدی ڕوونکـەرەوە (مُبَيِّنـة)ی دەخرێتـە سـەر، لـە مانـای زینـاو نێربازیـی و خۆلێکخشـاندن (سُـحاق) دەیباتـەدەر، واتـە: گوناهێکـی ناقـۆڵای ڕوونکـەرەوە، هەروەهـا خوێندراویشـەتەوە: (مُبَيَّنَـة)، واتـە: گوناهێکـی ناقـۆڵای ڕوونکـراوە، ڕۆشـنکراوە، کـە هەمـوو کـەس بزانـێ ئـەوە گوناهـو تاوانـە، واتـە: ئافـرەت کاتێـك ئـەو مافـەی دەفەوتـێ لـە ماڵـی مێردەکەیـدا، کـە تەڵاقیـداوە، بمێنێتـەوە، کـە

هەڵوێستێكی ناقۆڵاو دزێوی ببێ، كە بە دڵنیایی مەبەست پێی زینا نیە، بەڵكو مەبەست پێی هەڵسوكەوتێكی ناشیرینە لەگەڵ مێردیدا، یان لەگەڵ كەس و كاری مێردیدا، بۆ وێنە: زۆر چوونەدەر، یاخود خەڵك بێنێتە ماڵی خۆی بەبێ مۆڵەتی مێردەكەی، هەرچەندە تەڵاقیشیداوە، یاخود دەمەوەریی لەگەڵ مێردی و كەس و كاری مێردی داو ...هتد. ﴿ وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانەش سنوورەكانی خوان، ﴿ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ ﴾، هەر كەسێكیش سنوورەكانی خوا ببەزێنێ، لێیان تێپەڕێنێ، بە دڵنیایی ستەمی لە خۆی كردوە، ﴿ لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴾، ئەی دوێندراو! هەر كەسێك هەی، نازانی، ڕەنگە دوای ئەوە خوا كارێكی دیكە پەیدا بكات، بارودۆخێكی دیكە بڕەخسێنێ، واتە: لە دوای عیددە یان لە میانی عیددەدا، نازانی چی ڕوودەدات، ئایا ئەو پیاوە جارێكی دیكە دڵی دەچێتەوە سەر ئەو ئافرەتە، یان ئەو ئافرەتە كارێكی وا دەكات، ئەو مێردەی لەگەڵی ئاشت بێتەوە، یان كە تەڵاقێكی داوە، نەهێڵێ ماوەی عیددەكەی بەسەر بچێ و پێش كۆتایی هێنانی عیددەكە، بیهێنێتەوە ژێر نیكاحی خۆی، بۆ ئەوەی حاڵەتی جیابوونەوە ڕوونەدا، كە ئەگەر دوای تەڵاقی یەكەم و دووەم بێ، پێی دەگوترێ: جیابوونەوەی بچووك (**البَيْنُونَة الصُّغْرى**)، بەڵام ئەگەر دوای تەڵاقی سێیەم بێ، پێی دەگوترێ: (**البَيْنُونَة الكُبْرَى**)، جیابوونەوەی گەورە، ئەو كاتەش ئەگەر دوای جیابوونەوەی بچووك بێ، واتە: دوای تەڵاقی یەكەم و دووەم بێ، ئەو پیاوە دەتوانێ بە گرێبەستێكی تازە ئەو ئافرەتە بهێنێتەوە ژێر نیكاحی خۆی و، ئەو ئافرەتە لەگەڵ ئەو پیاوەدا هاوسەرگیریی بكاتەوە، بەڵام ئەگەر دوای جیابوونەوەی گەورە بێ، بۆیان نیە جارێكی دیكە پێكەوە هاوسەرگیریی بكەن، مەگەر ئەو ئافرەتە شووێكی دیكە بكاتەوەو، ئەویش نەك بە فێڵ كە تەنیا بۆ حەڵاڵ كردنەوەی مێردی پێشووی بێ، بەڵكو بەشێوەیەكی ئاسایی شووێكی دیكە بكاتەوە، ئنجا بەشێوەیەكی ئاسایی لەو مێردەی جیاببێتەوە، ئەو كاتە بۆیان هەیە بە گرێبەستێكی تازە، ژیانی هاوسەرگیریی لەگەڵ مێردە پێشووەكەی دا پێك بێننەوە.

﴿ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، ئنجا کاتێك گەیشتنە کاتەکەیان، واتە: کۆتایی کاتەکەیان، لێرەشدا زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، واتە: گەیشتنە نیزیك و قەراغ کۆتایی کاتەکەیان، چونکە ئەگەر عیددە بەسەر چوو، تازە ئەو ئافرەتە ئازاد دەبێ، لەوەدا کە بچێتەوە لای مێردەکەی، یان نەچێتەوە، چ دوای تەڵاقی یەکەم بێ، چ دوای دووەم بێ، دوای تەڵاقی سێیەمیش ئاشکرایە.

بۆ وێنە: ئەو پیاوە تەڵاقێکی ژنەکەی داوەو لێی دەگەڕێ تاکو عیددەکەی بەسەر دەچێ، ئنجا کە عیددەکەی بەسەرچوو و، ئەو پیاوە نەیهێنایەوە ژێر نیکاحی خۆی، ئەو ئافرەتە ئازاد دەبێ و دەتوانێ بچێتەوە لای مێردە پێشووەکەی بە گرێبەستێکی تازە، دەشتوانێ هاوسەرگیریی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا بکات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، واتە: ئەگەر گەیشتنە پێش کۆتایی ماوەی عیددەکەیان، ﴿ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ ﴾، بە شێوەیەکی پەسەند بیانگرنە خۆتان ئەو ئافرەتانە، کە تەڵاقێکتان داون، یان دووانتان داون، ﴿ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ ﴾، یاخود بە شێوەیەکی پەسند لێیان جیاببنەوە، ﴿ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٍ مِّنكُمۡ ﴾، دوو پیاوی خاوەن دادگەرییش لە خۆتان بە شایەد بگرن، لێرەدا خوا ﷻ ڕوونی نەکردۆتەوە، شایەد گرتنەکە بۆ هێنانەوە یان بۆ دەست لێبەردانە؟ بۆیە وەك دوایی باسی دەکەین، ڕای بەڵگەدارترو پەسەندتر بە لای منەوە ئەوەیە کە بۆ هەردووکیان، هەم بۆ لێکجیابوونەوە دەبێ دوو شایەد، دوو پیاوی دادگەر بە شایەد بگیرێن، هەم بۆ هێنانەوەش، چ بۆ دەست لێك بەردان، چ بۆ پێکەوە ئاشت بوونەوە، ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ ﴾، لەبەر خوا شایەدیی بەرپا بکەن، واتە: ئەو شایەدییەی بەرپای دەکەن، ئەی دوو پیاوەکان! یان ئەی ئەوانەی دوو پیاوە دادگەرەکان بە شاهێد دەگرن! با شایەدییدانەکە لەبەر خوا بێ و، هیچ مەبەستی دیکەی خراپی تێدا نەبێ، ئنجا شتێك بۆ خوا بێ، دەبێ ساف و پاك و چاك و دڵسۆزانە بێ.

﴿ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴾، ئـا ئەمەتـان (ئـەو ئامۆژگاریـی و ڕێنمایـی و حوکمانەتـان) هـەر کەسـێك بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەبـێ، پێـی ئامۆژگاریـی دەکـرێ، واتـە: ئـەو ڕێنماییانـە بـۆ کەسـێکن بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی بـێ، ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴾، هـەر کەسـێکیش پارێـز لـە خـوا بـکات (خـوا) دەرووی لـێ دەکاتـەوە، دەروازەی خێـری لـێ دەکاتـەوە، لـە تەنگانـەدا فەڕحانیـی بـۆ دەڕەخسـێنێ و، لـە سـەغڵەتییدا ئاسـانیی بـۆ دەڕەخسـێنێ.

﴿ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾، هەروەهـا هـەر کەسـێ پارێـز لـە خـوا بـکات، بـێ ئـەوەی بـۆ خـۆی حیسـابی بـۆ کردبـێ، بـێ ئـەوەی خـۆی مەزەنـنـەی کردبـێ، خـوا بژیـوی دەدا، واتـە: بژیـوی بـۆ دەڕەخسـێنێ بـە شـێوەیەك خـۆی بـە خەیاڵیـدا نەهاتبـێ و حیسـابی بـۆ نەکردبـێ، ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾، هـەر کەسـێکیش پشـت بـە خـوا ببەسـتێ، خـوای بەسـە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا کاری خـۆی دەگەیەنێتـە جـێ، واتـە: دەیگەیەنێتـە کۆتایـی و بەئامانجی دەگەیەنـێ، بـەڵام ئایـا لـەو کاتـەدا کـە ئێمـە چاوەڕێ دەکەیـن، یـان بـەو شـێوەیەی ئێمـە چـاوەڕێ دەکەیـن؟ مـەرج نیـە، ﴿ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ﴾، خـوا ﷻ بـۆ هـەر شـتێك ئەندازەیەکـی دانـاوە، ئەمـەش لێـرەدا جۆرێکـە لـە دڵخۆشـکردن بـۆ ژنەکـە، کـە دەچێتـەوە لای مێـردی، یـان ناچێتـەوە، هەروەهـا بـۆ پیاوەکـەش ئایـا لەگـەڵ ژنەکـەی دا ئاشـت دەبێتـەوەو دەسـت دەکەنـەوە بـە ژیانـی هاوسـەریی، یاخـود لێـك جیادەبنـەوە؟ ئـەوە دڵدانـەوەو دڵخۆشـکردنە بـۆ هەردووکیـان، هەروەهـا بـۆ کـەس و کاری ژنەکـەش و پیاوەکـەش بـۆ هەموویـان، کـە ئەگـەر بەڕاسـتیی پارێزکاربـن، پارێـز لـە خـوا بکـەن و سـنوورەکانی خـوا نەبەزێنـن، خـوا دەرووی خێرتـان لـێ دەکاتـەوە، بـۆ وێنـە: -- وەك دوایـی باسـی دەکەین و لـە کورتە باسـێکدا باسـی تـەڵاق دەکەیـن -- کەسـێك بـە شـێوەی سـوننەتیی دەسـتبەرداری ژنەکـەی ببـێ، دەبـێ یـەك تەڵاقـی بـدات لـە پاکییەکدا کـە نەچۆتـە لای، ئنجا ئەگەر

ئـەو پارێزكارییـە بەكاربێنـێ، ئـەو كاتـە ئـەو پیـاوە دەسـت كـراوە دەبـێ، كـە پێـش كۆتایـی عیددەكـەی ئـەو ئافرەتـە بێنێتـەوە لای خـۆی، بـەڵام ئەگـەر سـێ تەڵاقـی پێكـەوەدان، وەك زۆرێـك لـە زانایـان گوتوویانـە، مافـی پێـوەی نامێنـێ، چونكـە تەقـوای نەكـردوەو سـنوورەكانی خـوای نەپاراسـتوون، خـوا نەیفەرمـووە ئـاوا ژن تـەڵاق بـدەن، هـەر سـێك تـەلاق پێكـەوە! ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ ۝٢٢٩﴾ البقرة، واتـە: ئـەو تەڵاقـەی دوای وی، دەگونجـێ ژن و مێـرد پێكـەوە ژیانـی هاوسـەرگیریی دروسـت بكەنـەوە، دووانـن، بـەڵام كـە بـوو بەسـێ و لـە قۆناغـی سـێیەمدا، لێكدەترازێـن، ئنجـا هەروەهـا ژنەكـەش ئەگـەر سـنوورەكانی شـەریعەت بپارێـزێ و لـەماڵـی مێردەكەیـدا، دەمەوەریـی نـەكات و، شـتێك نـەكات ناچاریـان بـكات، وەدەری بنێـن، خـوا دەرووی لـێ دەكاتـەوە، كـە لـە ئەنجامـی مانـەوەی لـە ماڵـی مێردەكەیـدا، دڵیـان بچێتـەوە سـەر یـەك، هەروەهـا شـایەدەكانیش ئەگـەر شـایەدییەكە بـۆ خـوا بـدەن و، لـە شـتەكە بكۆڵنـەوەو هاندەریـان ئـەوە نەبـێ غەرەزێكیـان لـە پیاوەكـە هەبـێ، یـان غەرەزێكیـان لـە ژنەكـە هەبـێ و، شـایەدییەكە وا بـدەن بـە زیانیـان تـەواو بـێ، ئەوانیـش ئەگـەر پارێـزی خـوا بكـەن لـە شـایەدییەكەیاندا، هـەم ژنەكـەو هـەم مێردەكـەو، هـەم كـەس و كاری هـەردوو لایـان، خـوا دەرووی خێریـان لـێ دەكاتـەوە، ئـەوە واتایەكـی، واتـا مەعنەوییەكەشـی هـەر لـە شـوێنی خۆیەتـی، كـە ئەگـەر ئینسـان بـۆ خـوا صوڵحاوبـێ و پارێـز لـە خـوا بـكات، چاودێریـی خـوا بەسـەر خۆیـەوە ببینـێ، خـوای پـەروەردگار لـە تەنگانـەو ناڕەحەتییانـدا دەربـازی دەكات، یـان بـە كـردەوە، یـان خـوای میهرەبـان دڵـی فـەڕاح دەكات، دڵـی خـۆش دەكات، سـەری دنیـای لـێ نایەتـەوە یـەك، لـە ئەنجامـی گرفـت و كێشـەیەكی خێزانییـدا.

﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ﴾، هـەر كەسـیش پشـت بـە خـوا ببەسـتێ، خوای بەسـە، پشـت بـە خـوا بەسـتنیش وەك زۆرجـار گوتوومانـە: جێـدارو جێگـرەوەی دەسـتگرتن بـە هۆكارەكانـەوە نیـە، بەڵكـو پشـت بـە خـوا بەسـتن، كاری دڵـە، بـەڵام دەسـت بـە هۆكارانـەوە گرتـن، كاری جەسـتەو ڕواڵەتـە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ

ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىۡءٍ قَدۡرًا ﴾، بەدڵنیاییی خوا کاری خۆی دەگەیەنێتە مەنزڵ، دەیگەیەنێتە کۆتایی و ئەنجام، بەڵام خوا بۆ هەر شتێك ئەندازەیەکی داناوە.

﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ ﴾، ئەو ئافرەتانەش کە نائومێد بوون لە (کەوتنە) حەیز، لەوەی بکەونە بێنوێژیی، نائومێد بوون، لەبەر ئەوەی نەخۆشییەکیان توشبووە، یاخود لەبەر تەمەن، ﴿ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ ﴾، ئەگەر دوو دڵ بوون، ئایا دەبێ عیددەکەیان چەند بێ؟ ﴿ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ ﴾، عیددەکەیان (ئەو ماوەیەی دەبێ چاوەڕێ بکەن، تاکو بۆیان ڕەوا دەبێتەوە هاوسەرگیریی دیکە بکەن)، بریتییە لە سێ مانگ، ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَ ﴾، هەروەها ئەو ئافرەتانەش کە جارێ نەکەوتوونە حەیزەوە، لەبەر کەم تەمەنیی، یان لەبەر نەخۆشییەك، لەبەر هەر هۆکارێك بێ نەکەوتوونە حاڵەتی بێنوێژیی، ئەوانەش دیسان ماوەی عیددەکەیان، ئەگەر مێردەکەیان تەڵاقیدان و لێکجیابوونەوە، بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان لێکجیابوونەوە، ئەو ماوەیەی دەبێ چاوەڕێ بکەن، تاکو بۆیان ڕەوا دەبێ، هاوسەرگیریی دیکە بکەنەوە، بریتییە لە سێ مانگ. ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ ﴾، خاوەن تۆڵەکانیش کۆتایی کات (ی عیددە)یان ئەوەیە کە تۆڵەکەیان دابنێن.

(حَمل)، واتە: تۆڵ، ئەو کۆرپەلەیەی ئافرەت لە سکیدا هەڵیدەگرێ، (أحْمَال)، کۆی (حِمْل) و (حَمل)ە، (حِمْل)، بە مانای بار دێ و (حَمْل)یش بە مانای ئەو کۆرپەلەیە دێ، کە ئافرەت لە سکیدا هەڵیدەگرێ، ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ ﴾، یانی: (صَاحِبَاتُ الأَحْمَال)، خاوەن تۆڵەکان، ئەو ئافرەتانەی دوو گیانن، بەڵام بۆیە وشەی (دوو گیان) کەمتر بەکاردێنم، چونکە جاری وایە ئافرەت دوو گیان نیە، بەڵکو دوو کۆرپەلەی لە سکیدان و سێ گیانە، یاخود جاری وایە چواری لەسکدان و پێنج گیانە، یەکی خۆی و چوار گیانی دیکەش لە سکیدان، بۆیە ئەو وشەیە زۆر ڕاست نیە، بەڵام ئەگەر بگوترێ: تۆڵ، تۆڵ یانی: کۆرپەلە کە لە سکی ئافرەتدایە، یەك بێ، یان پتر، تۆڵدار واتە: خاوەن حەمل، ﴿ أَن

﴿يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴾، واتـە: کۆتایـی کاتـی عیددەکەیـان بریتیـە لـە دانانـی ئـەوەی لـە سـکیاندایە، لـە دانانـی تۆڵەکەیـان، ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴾، هـەر کەسـێ پارێزیـش لـە خـوا بـکات، خـوا لەکاریـدا ئاسـانیی بـۆ دەڕەخسـێنێ.

هەڵبەتـە ئـەوەش دوایـی بـاس دەکەیـن، کـە ئایـا ئافرەتێـك کـە تۆڵـدارەو مێردەکـەی دەمـرێ، یـان مێردەکـەی تەڵاقیـدەداو، دوایـی حەملەکـەی دادەنـێ بـەر لـە سـێ مانـگ، بـۆ وێنـە: هـەر دوای پـازدە ڕۆژان ئافرەتەکـە تۆڵەکـەی دادەنـێ، ئایـا بـە دانانـی تۆڵەکـە، عیددەکـەی بەسـەر چـووە، ئەگـەر چەنـد ڕۆژێکـی کەمیـش بـێ، یاخـود دەبـێ مـاوەی سـێ مانگەکـە هـەر عیـددە بشـوات، ئەگـەر تەڵاقـدراو بـێ، یاخـود چـوار مانـگ و دە شـەو، ئەگـەر مێردەکـەی کۆچـی دوایـی کردبـێ (**متـوفى عنهـا زوجهـا**) بـێ؟! دوایـی باسـی دەکەیـن، کـە زانایـان ڕاجیاییـان لـەو بـارەوە هەیـە.

﴿ ذَٰلِكَ أَمْرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيْكُمْ ﴾، ئـەوەش فەرمانـی خوایـە بـۆی دابەزانـدوون، بـۆ لای ئێـوەی دابەزانـدوە، واتـە: تاکـو کاری پـێ بکـەن، ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ ﴾، هـەر کەسـێکیش پارێـز لـە خـوا بـکات، (خـوا) خراپەکانـی لـێ دەسـڕێتەوە، ﴿وَيُعْظِمْ لَهُۥٓ أَجْرًا ﴾، پاداشـتیشـی بـۆ مـەزن دەکات، پاداشـتێکی مەزنـی دەداتێ.

ئنجـا خـوای کاربەجـێ باسـی ئـەوە دەکات، چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو ئافرەتانەدا بکـرێ کـە تەڵاقـدراون، لـە ڕووی نیشـتەجێ کـردن و حەوێنرانەوەیانـەوە؟ دەفەرمـوێ: ﴿أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ ﴾، ئـەو ژنـە تەڵاقدراوانـە، ئنجـا ئەگـەر تەڵاقێکـدراون، ئەگـەر دووان دراون، ئەگـەر هـەر سـێ تەڵاقـدراون، لەسـەر ڕای بەشـێك لـە زانایـان، کـە منیـش ئـەو ڕایـەم پـێ ڕاسـترە، ئەگـەر بـە یەکجارییـش لێکجیابوونـەوە، نیشـتەجێیان بکـەن، لـەو شـوێنەدا کە خۆتـان لێی نیشـتەجێن، ﴿مِّن وُجْدِكُمْ ﴾، بەپێـی توانـای خۆتـان، ﴿وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ ﴾، هەروەهـا زیانیـان پـێ مەگەیەنـن بـۆ ئـەوەی سـەغڵەتیان بکـەن، هەڵیانپێچـن و تەنگەتاویـان بکـەن و

بـە ناچاریـی ماڵەکـە بەجـێ بهێڵـن، ﴿ وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمْلٍ ﴾، بـەڵام ئەگـەر خـاوەن تـۆڵ بـوون، کۆرپەیـان لەسـکدا بـوو، ﴿ فَأَنفِقُواْ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ﴾، خەرجییان بکێشـن، مەسرەفیـان بکـەن و هاوکارییـان بکـەن هەتـا تۆڵەکەیـان دادەنێـن، ﴿ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ ﴾، ئنجـا ئەگـەر کۆرپەلەکەشـیان دانـا، لێیـان جیابـۆوەو، کۆرپەلەکەیـان بـۆ ئێـوە شـیردا، ﴿ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ﴾، کـرێ و پاداشـتەکانیان پـێ بـدەن (لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە شیر دەن بـەو کۆرپەلانـە)، ﴿ وَأْتَمِرُواْ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ﴾، لـە نێـوان خۆتانـدا بـە شـێوەیەکی پەسـند ڕاوێـژ بکـەن، پـرس و ڕا بکـەن، ﴿ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ ﴾، ئەگـەر کەوتنـە زەحمەتیـی و قورسـییەوەش و نەتانتوانـی لێکتێگەیشـتن بکـەن، لـەو بـارەوە، ﴿ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴾، ئافرەتێکـی دیکـەی شیردەر شـیری ئـەو کۆرپەلەیـە دەدا، واتـە: ئـەی پیـاوەکان! دەبـێ ئافرەتێکـی دیکـە، دایەنێـك شـیردەرێکی دیکـە، بـۆ ئـەو کۆرپەلەیـە پەیـدا بکـەن، مـادام دایکەکـەی ئامـادە نیـە، شـیری پێبـدات و نەگەیشـتوونە لێـك تێگەیشـتن.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ﴾، بـا خـاوەن فراوانیـی لـە مـاڵ و سـامان لـە قـەدەر فراوانییەکـەی خـۆی، ببەخشـێ، ﴿ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ﴾، کەسـێکیش بژێـوی لێوەتەنـگ هێنرابـێ، بـا لـەوەی خـوا پێیـداوە، ببەخشـێ و خـەرج بـکات، واتـە: لـە زۆری زۆرو لـە کەمـی کـەم، کەسـێك کـە دەسـتکراوەیەو مـاڵ و سـامانێکی فراوانـی هەیـە، بـا لـە قـەدەر مـاڵ و سـامانە فراوانەکـەی، خەرجیـی ژنەکـەی بکێشـێ کـە لـە ماڵـی ئەودایـە، بـە تایبـەت کـە تۆڵـی هەبـێ و، بـە تایبەتـر کـە تۆڵەکـەی دادەنـێ، شـیر بـدات بـە کۆرپەلەکـەی، بـا هـەر کەسـە بـە ئەنـدازەی خـۆی ئـەو خەرجیـی و مەسرەفـە بکێشـێ، ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ﴾، خـوا هیـچ کەسـێك ئەرکـدار نـاکات، مەگـەر بـەو ئەندازەیـەی پێیـداوە، چەنـدەی پێـداوە، خـوا ﷻ ئەوەنـدەی لـێ داوا دەکات و، ئەوەنـدە ئەرکـی دەکەوێتـە سەرشـان، ﴿ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴾، بـە دڵنیایـی لـە دوای سـەغڵەتیی و تەنگانـە، خـوا ئاسـانیی و فەڕحانیـی دەڕەخسـێنێ، کەواتـە: دڵتـان فـەڕاح و فـراوان بـێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺو بڕواداران، کە هەر کات ویستیان ژنان تەڵاق بدەن، پێویستە لە دەستپێکی عیددەیانەوە بێ و، لە ماڵەکانیشیان نەچنە دەرێ، مەگەر ڕەفتارێکی ناقۆڵای ئاشکرایان لێ بپشکوێتەوەو، نابێ سنوورەکانی خواش ببەزێنرێن و، حیکمەتی عیددەش ئومێدی پەیدابوونی گۆڕانێکە، ئنجا بەر لە کۆتایی هاتنی عیددەیان، یان دەبێ بە شێوەیەکی پەسند دەست بە هاوسەرەوە بگیرێ، یان بە شێوەیەکی پەسەند وازی لێ بهێنرێ و، لەهەردوو حاڵانیش دا، دەبێ دوو پیاوی دادگەر بە شایەد بگیرێن، بەڵێندانی خواش کە هەر کەس پارێزکاریی بکات، خوا دەرووی خێری لێ دەکاتەوە، بێ ئەوەی حیسابیشی بۆ کردبێ بژیوی بۆ دەڕەخسێنێ، بابای پشت بە خوا بەستووش خوای بەسەو، خواش کاری خۆی دەگەیەنێتە جێ، بەڵام بەپێی ئەندازەگیریی خۆی و لە کات و شوێنی خۆیدا:

خوا دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ١ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ٣﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و دوو بڕگەدا:

١)- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ چونكە ئەو سەرپەرشتیی ئوممەت دەكات و، ئەو شەریعەت و بەرنامەی خوا بەسەر كۆمەڵگاو ئوممەتەكەیدا جێبەجێ دەكات و، ڕێنمایی ئوممەتەكەی دەكات و ئامۆژگارییان دەكات.

٢)- ﴿إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، {(إذَا)، بۆ داهاتوو (للمُسْتَقبل)ە}، هەر كاتێ ویستتان ژنان تەڵاق بدەن.

٣)- ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾، لە دەستپێكی عیددەیاندا تەڵاقیان بدەن، (ل)ی (لِعِدَّتِهِنَّ) بۆ (توقیت)ە، یانی: لە كاتی، وەك دەگوترێ: (**كُتِبَ لِيَوْمِ كَذَا مِنْ شَهْرِ كَذَا**)، نووسرا لە فڵان ڕۆژەداو لە فڵان مانگەدا، خواش دەفەرموێ: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ ﴿٧٨﴾﴾ **الإسراء**، واتە: كە خۆر لا دەدات، نوێژ بەرپا بكە.

كەواتە: لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ﴾، مانایەكەی ئاوای لێ دێتەوە: (**لِيَكُونَ الطَّلَاقُ عِنْدَ ابْتِدَاءِ الْعِدَّةِ، وَإِنَّمَا تُبْتَدَأُ الْعِدَّةُ بِأَوَّلِ طُهْرٍ مِنْ أَطْهَارٍ ثَلَاثَةٍ**)، با تەڵاقدانەكە لە دەستپێكی عیددەكەدا بێ، (واتە: تەڵاقەكە كاتێك بێ، كە عیددە دەست پێدەكات) و، عیددەش لە سەرەتای یەكەمین پاكییەوەیە لە سێ پاكییەكان (كە بەسەر ئەو ئافرەتەدا دادێن)، هەڵبەتە ئەو ئافرەتە لە پاكییەكەشیدا مێردەكەی نابێ چوو بێتە لای، ئنجا دەبێ تەڵاقی بدات، ئەویش یەك تەڵاق، كەواتە: ﴿إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، یانی: (**إِذَا أَرَدْتُم تَطْلِيقَ نِسَاءِكُم**)، یان (**طَلَاقَ نِسَائِكُم**)، ئەگەر ویستتان دەستبەرداری ئافرەتەكەتان بن، ئەگەر ویستتان ژنەكانتان واز لێ بێنن، وەك چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ﴿٦﴾﴾ **المائدة**، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر كاتێ هەڵسان بۆ نوێژ، واتە: هەر كاتێ ویستتان نوێژ بكەن، ئەگەرنا

کـە هەسـتای بـۆ نوێـژ، مانـای وایـە یەکسـەر دەسـتی پـێ دەکـەی، یانـی: ئەگـەر ویسـتتان نوێـژ بکـەن، لێرەشـدا: ﴿إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، ئەگـەر ویسـتتان ژنەکانتـان تـەڵاق بـدەن.

ئـەم ئایەتـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە تەڵاقـدان ڕەوایـەو، لـە کاتـی پێویسـتیی دا کـە ژن و مێردەکـە پێویسـتیان بـێ و، ناچاربـن، شـتێکی ڕەوایـە.

(الطـبري)، هێناویەتـی دەڵـێ: (**إِذَا طَلَّقْتُـمْ نِسَـاءَكُمْ فَطَلِّقُوهُـنَّ لِطُهْرِهِـنَّ الَّـذِي يُحْصِينَهُ مِنْ عِدَّتِهِـنَّ، طَاهِـرًا مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ، وَلَا تُطَلِّقُوهُـنَّ بِحَيْضِهِـنَّ الَّـذِي لَا يَعْتَـدِدْنَ بِـهِ مِـنْ قُرْئِهِـنَّ**)، (**جامع البيان**: ٣٤٣٠٩، ٣٤٣١٢)، واتـە: ئەگـەر ژنەکانتانتـان تەڵاقـدان لـە کاتێکـدا تەڵاقیـان بـدەن لـەو پاکییـەدا کـە دەیژمێـرن، کـە بەشـێك دەبـێ لـە عیددەکەیـان، ئـەو ئافرەتـە لـە کاتـی پاکییدابـێ، (لـە کاتـی بێنوێژییـدا نەبـێ و) جیماعیشـی لەگەڵـدا نەکرابـێ و، لـە کاتێکـدا کـە کەوتوونـە حەیـزەوە، تەڵاقیـان مـەدەن، چونکـە حەیزەکـە بـە بەشـێك لـە عیددەکەیـان بـۆ لـە دانانـدرێ قەڵـەم نادرێ(ئـەو کاتـەش ئافرەتەکـە زەرەرمەنـد دەبـێ).

ئنجـا لـەو بـارەوە کـە زانایـان هەموویـان یاخـود زۆربـەی هـەرە زۆریـان دەڵێـن: دەبـێ لـە سـەرەتای پاکییەکـەوە، پاکییـەك کـە هاوسـەرەکەی لەگەڵیـدا جـووت نەبووبـێ، لەوێـوە عیـددە دەسـت پـێ بکات،یەکێـك لـە زانایان دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە بـۆ ڕای زۆربـەی زانایـان کـە عیـددە بـە پاکییـەکان دەژمێـردرێ، نـەك بـە حەیـزەکان و، ئەگـەر بـە سـەرەتای حەیـز، یـان لـە حەیـزدا عیـددە دەسـتی پێکردبایـە، ئـەو کاتـە خـوا دەیفەرمـوو: لـە کاتێکـدا ئافرەتـەکان دەکەونـە حەیزەوە، تەڵاقیـان بـدەن، بـەڵام ئافـرەت تەڵاقـدان لـە کاتـی حەیـزو بێنوێژییـدا قەدەغـە کـراوە، وەك پێشـتریش لـە کاتـی هێنانـی ئـەو فەرموودەیـە لـە بـارەی هـۆی هاتنـە خـوارەوەدا هاتـوە، باسـمانکرد کـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر ژنەکـەی تەڵاقدابـوو (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) ژنەکـەی خـۆی تـەلاق دابـوو، لـە کاتێکـدا کـە

بێنوێـژ بـوو، پێغەمبەریـش ﷺ تـوورە بـوو، فەرمـووی: بـا لێـی بگـەڕێ تاکـو پـاك دەبێتـەوە، ئنجـا بـێ ئـەوەی دەسـتی بگەیەنێتـێ، ئەگـەر پێیخـۆش بـوو بـا تەڵاقـی بـدات، ئەگەرنـا بیهێڵێتـەوە.

٤)- ﴿وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ﴾، سەرژمێری عیددەش بکەن، (**العِدَّةَ**)، (أل)ەکە بۆ (**عَهْد**)ە، واتە: سەرژمێریی ڕۆژەکان و شەوەکانی عیددەکە بکەن، عیددەش زانایان ئاوا پێناسەیان کردوە: (**قُعُودُ المَرْأَةِ عَنِ الزَّوَاجِ حَتَّى تَنْقِضِي المُدَّة المُرْتَّبَةُ شَرْعَاً**)، دانیشتنی ئافرەتە لەوەی هاوسەرگیریی بکات، تاکو ئەو ماوەیەی شەرع دایناوەو تێدەپەڕێ، کەواتە: عیددە، واتە: شەوان و ڕۆژانێکی ژمێردراو و بە مەرج گیراو، بۆ ڕەوابوونی هاوسەرگیریی کردنەوەی ئافرەت، یان گەڕانەوەی بۆ لای مێردەکەی، یاخود وازلێهێنانی و دەستپێکردنەوەی هاوسەرگیریکی دیکە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ﴾، (**الإِحْصَـاءُ: مَعْرِفَـةُ الْعَـدِّ وَضَبْطُـهُ، وَهُـوَ مُشْتَقٌّ مِـنَ الْحَـصَى، وَهِـيَ صِغَـارُ الْحِجَـارَةِ**)، (**إِحْصَـاء**): لـە ئەصڵـدا لـە چـەوو بـەردی بچـووك (**حـصى**)ەوە داتـاشراوە ( لەبـەر ئـەوەی کاتـی خـۆی شـتیان بـە وردە بـەردان ژمـاردوە)، واتـە: سـەرژمێرییکردن و زانینیـی ژمـارەی شـتێك و کۆنترۆڵکردنـی، (**عَـدّ**)، بریتیـە لـە ژمـارەدن: (١، ٢، ٣، ٤)، بـەڵام (**إِحْصَـاء**)، بریتیـە لـە سـەرژمێر، ﴿وَأَحْصُواْ ٱلْعِدَّةَ﴾، واتـە: مـاوەی عیـددە، شـەوەکانی و ڕۆژەکانـی بـۆ سـەرژمێربکەن.

٥)- ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ﴾، پارێزیش لە خوای پەروەردگارتان بکەن.

٦)- ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ﴾، ئەو ژنانەی تەڵاقتان داون، لە ماڵەکانی خۆیان وەدەریان مەنێن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو ئافرەتە مافی هەیە بەو ماڵەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ﴾، لە ماڵەکانیان وەدەریان مەنێن، واتە: ئەو ئافرەتانە خاوەنی ئەو ماڵانەن، ژن هەتا لە ژێر نیکاحی ئەو پیاوە دابێ، تاکو یەکجاریی لێی جیادەبێتەوە، بەشێك لە خاوەنداریەتیی لەو ماڵەدا هەیە، بەڵکو ئەگەر یەکجارییش لێی جیابووبێتەوە، بە ڕای زۆربەی زانایان مافێکی ئەو ئافرەتەیە

تاكو عیددەی بەسەر دەچێ، لەو ماڵەدا بمێنێتەوەوە تاكو ئەو كاتە خاوەنداریەتیی لەو ماڵەدا هەیە.

٧)- ﴿وَلَا يَخْرُجْنَ﴾، با خۆشیان دەرنەچن، نە ئێوە دەریان بكەن، نە خۆشیان دەربچن.

٨)- ﴿إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾، مەگەر ئەوان كردەوەیەكی نا قۆڵای ڕوونكەرەوە بكەن، یان كردەوەیەكی ناقۆڵای ئاشكرابوو بكەن، چونكە: **(مُبَيِّنَة)** و **(مُبَيَّنَة)**ش، خوێندراوەتەوە، **(مُبَيِّنة)**، واتە: ئاشكراكەر، **(مُبَيَّنَة)**، واتە: ئاشكرا كراو، ئنجا وەك پێشتریش گوتم: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: **(فاحشة مُبَيِّنَة)** مەبەست پێی زینایە، یانی: ئەگەر ئەو ژنە لە ماڵی مێردەكەیدا، دوای ئەوەی تەڵاقدراوە، زینای كرد، دەبرێتەدەر بۆ سزادان! بەڵام بێگومان ئەمە مانا لێكدانەوەیەكی ناڕاستەو، خوا ﷻ باسی ئەوە ناكات، بەڵكو باسی ئەوە دەكات: كە ئافرەتە كە تەڵاقدراوە كە، دەگونجێ بە لە باریی لە ماڵی مێردەكەیدا دابنیشێ، هەتا بزانێ ئایا ئاشت دەبنەوە؟ چونكە جاری وایە مێردەكە دەیەوێ لەگەڵ ژنەكەی دا ئاشت بێتەوەو، ئافرەتەكە ڕازی نیە، یان ژنەكە خوازیارەو مێردەكەی ڕازی نیە، ئایا هەردووكیان دەگەنە ئەو قەناعەتەی پێكەوە باش بن و، ژیانی هاوسەرگیریی دەست پێ بكەنەوە، یان ناگەنە ئەو قەناعەتە؟ تاكو ئەو كاتە ژنەكە بۆی هەیە، لەو ماڵەدا بمێنێتەوە، ئنجا ئەو ژنە كە بە لە باریی لەو ماڵە دانیشت و سنوورەكانی شەریعەتی پاراستن، بەو واتایەی لەگەڵ مێردەكەیدا پرتەو بۆڵەی نەكردو شەڕی بە كەس و كاری نەفرۆشت، دەنگە دەنگی نەكردو بێزاری نەكردن، مانای وایە مافی مانەوەی هەیە، بەڵام ئەگەر كردەوەیەكی ناقۆڵای ئاشكراكەر، یان ئاشكرا كراوی كرد، وەك: ئازاردانی مێردەكەی، بە دەمەوەریی و پرتەو بۆڵە، یان ئازاردانی كەس و كارەكەی، ئەو كاتە ئەو مافەی دەفەوتێ.

٩)- ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾، ئەم یاسایانەش سنوورەكانی خوان، یاسایەكانی خوا، وەك سنوورێكن دیارییكراون و نابێ لێیان تێبپەڕێنرێ.

١٠)- ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾، هەر کەسێکیش سنوورەکانی خوا ببەزێنێ، لێیان تێپەڕێنێ، ستەمی لە خۆی کردوە، واتە: ئێوە سنوورەکانی خوا مەبەزێنن، لێیان تێمەپەڕێنن، ئەگەرنا لە ئەنجامی شکاندنی سنوورەکانی خواو لێ تێپەڕاندنیانەوە، مانای وایە ستەمتان لە خۆتان کردوە، ئنجا ئایا ستەم لە خۆکردنەکەش دوایی لە چیدا بەرجەستە دەبێ؟ لە سەر ئێشەو خراپەو خەم و خەفەت و مەینەتیی و ناڕەحەتیی دا، بۆ وێنە: ئەگەر بێت و پیاو بەپێی سنوورەکانی شەرع مامەڵە بکات، هەرچەندە لە ژنەکەی جیاش بێتەوە، بەڵام بەپێی سنوورەکانی شەرع و ئەو بەرنامەیەی شەریعەت دایناوە، کە بریتیە لەوەی تەڵاقێکی بدات لە پاکییەکدا کە نەچۆتە لای، هەر کات عیددەکەی بەسەرچوو، نەیگێڕایەوە لای خۆی، بێگومان ژنەکەی لێی جیا دەبێتەوەو، ئەو کاتە ئەو ئافرەتە سەر پشکەو دەتوانێ بە گرێبەستێکی تازە بچێتەوە لای مێردەکەی و دەشتوانێ هاوسەرگیریی دیکە بکات، ئەگەر دوای تەڵاقی یەکەم بێ، هەروەها ئەگەر دوای تەڵاقی دووەمیش بێ بەهەمان شێوە، دوای بەسەرچوونی عیددە ئەو ئافرەتە سەر پشك دەبێ، بەڵام دوای تەڵاقی سێیەم، تازە ئەو پیاوە بۆی نیە ئەو ئافرەتە بە گرێبەستێکی تازە بهێنێتەوە لای خۆی، مەگەر ئەو ژنە بچێ شووێکی دیکەو مێردێکی دیکە بکات، دوایی لێی جیا بێتەوە، ئەوجار دەتوانن، بێنەوە لای یەکدی.

خوا دەفەرموێ: هەر کەسێ سنوورەکانی خوا ببەزێنێ، ستەمی لە خۆی کردوەو، خۆی سەرئێشەو ناڕەحەتیی و گرفتاریی بۆ خۆی دێنێتە دی.

١١)- ﴿لَا تَدْرِى لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا﴾، نازانی ڕەنگە خوا دوای ئەوە دۆخێکی دیکە بڕەخسێنێ، واتە: لە حاڵێکدا کە ئافرەتەکە لە عیددە دایە، ڕەنگە لە میانی ئەو عیددەیەدا گۆڕانکارییەکی دیکە بێتە پێش، پیاوەکە دڵی بچێتەوە سەر ژنەکەی، یان ژنەکە پەشێمان دەبێتەوە لەو هۆکارانەی ئەو پیاوەیان بێزار کردوەو ناچاری کردوە تەڵاقی بدات و، گۆڕانکاریی بەسەر خۆیاندا بێنن، کە خوای کارزان گۆڕانکارییەکە، لەبەر ئەوەی هەموو شتێ بە ویستی خواو بە زانیاریی خوایە،

پاڵیداوەتە لای خۆی: ﴿لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا﴾، ڕەنگە، نیزیکە خوا لە دوای ئەوە کارێك بڕەخسێنێ، کارێك پەیدا بکات، بە قازانجی ئەو ژن و مێردە بێ، کە ویستوویانە لێك جیاببنەوە.

زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: ئافرەتێك مێردەکەی چووبێتە لای واتە: گواستبیەوە، کە پێی دەگوترێ: (المدخول بها)[1]، ئافرەتێك گوازرابێتەوە، پێویستە جێگاو ڕێگای بۆ دابین بکرێ، با تەڵاقیشدرابێ، چ تەڵاقەکەی ڕەجعیی بێ، واتە: دوای تەڵاقی یەکەم و دووەم بێ، ئەو عیددەیەی هی دوای تەڵاقی یەکەم و دووەم بێ، کە پێی دەگوترێ: تەڵاقی ڕەجعیی، چونکە مێردەکە بۆی هەیە بەر لە بەسەرچوونی عیددەکەی بیهێنێتەوە لای خۆی، یاخود تەڵاقی جیابوونەوە (بائن) بێ واتە: دوای تەڵاقی سێیەم بێ، یاخود ژنەکە داوای کردبێ لە مێردەکەی جیابێتەوە، کە پێی دەگوترێ: دارنین (**خُلْع**)، یاخود هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە (**فسخ العقد**) لەلایەن قازییەوە بووبێ، هەرچۆن بێ، مادام ئەو ئافرەتە گواسترابێتەوە، مافی ئەوەی هەیە، جێگاو ڕێگای بۆ دابین بکرێ، تاکو عیددەی بەسەر دەچێ، هەندێکیشیان گوتوویانە: ئافرەتێك یەکجاریی لە مێردەکەی جیابووبێتەوە، بە هەر هۆکارێك بێ، مافی نیشتەجێکران و حەوێندرانەوەی دەفەوتێ و، مێردەکەی ئەرکدار ناکرێ و لەسەری پێویست نابێ کە جێگاو ڕێگای بۆ دابین بکات، تاکو عیددە تەواو دەکات.

١٢)- ﴿فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ﴾، ئنجا هەر کاتێك ئەو ئافرەتانەی تەڵاقدراون، گەیشتنە کاتی خۆیان، گەیشتنە ئەو کاتەی عیددەکەیان تەواو دەبێ و بەسەر دەچێ.

١٣)- ﴿فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ﴾، ئێوە (ئەی مێردەکان کە ژنەکانتان تەڵاقداون!) ئەو ژنە تەڵاقدراوانەی عیددەکەیان تەواو بووە، یان بەشێوەیەکی

---

(١) واتە مێردەکە ئەو ژنەی بردۆتە خەڵوەو ژووری تایبەتەوە، بۆ جووتبوون، نەك مەبەست پێی پرۆسەی جیماع و جووتبوون بێ، وەك زۆر کەس وادەزانن!

پەسەند بیانگرنە خۆتان و دەست بە گرێبەستی هاوسەرگیرییەکەیانەوە بگرن، یاخود بەشێوەیەکی پەسەند لێیان جیا ببنەوە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، (أُطْلِقَ هُنَا عَلَى مُقَارَبَةِ انْتِهَاءِ الأَجَلِ، لأَنَّهُ لاَ مُرَاجَعَةَ بَعْدَ انْتِهَاءِ الأَجَلِ)، کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، یانی: (إِذَا قَارَبْنَ بُلُوغَ أَجَلِهِنَّ)، ئەگەر نیزیك بوو بگەنە کۆتایی کاتەکەیان، (کۆتایی کاتی عیدەکەیان) ئەگەرنا دوای ئەوەی عیددەیان تەواو دەبێ، ئەو پیاوە لە ڕووی شەرعییەوە هیچ مافی بەسەر ئەو ئافرەتەوە نامێنێتەوە کە بڵێ: ئەوە گێڕامەوە ژێر نیکاحی خۆم، مادام عیددەکەی تەواو بووبێ، بەڵکو ئەو کاتە ئافرەتەکە سەر پشك دەبێ، ئەگەر دوای تەڵاقی یەکەم یان دووەم بێ، کە پێیان دەگوترێ: تەڵاقی ڕەجعیی، دوای بەسەرچوونی عیددەکەی، ژنەکە سەرپشکە لەگەڵ مێردەکەیدا بە گرێبەستێکی تازەو بە مارەییەکی تازە هاوسەرگیریی دەکاتەوە، یاخود واز لە مێردەکەی دێنێ، هەرچەند مێردەکەشی داوا دەکات، بەڵام ئەو هاوسەرگیرییەکی دیکە لەگەڵ پیاوێکی دیکەدا دەکات؟! واتە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ ﴾، یانی: (إِذَا قَارَبْنَ نِهَايَةَ مُدَّةِ عِدَّتِهِنَّ)، ئەگەر کەوتنە سوێی، کەوتنە قەراغی، نیزیك کۆتایی بەسەرچوونی عیددەکەیان، ئەو کاتەی ئەی مێردەکان کە ژنەکانتان تەڵاقتان داون، تەڵاقی یەکەم و دووەم، یان بیانگرنەوە خۆتان بەشێوەیەکی پەسندو ژیانی هاوسەریی درێژە پێ بدەن، یاخود بەشێوەیەکی پەسەند، یەکجاریی لێك جیاببنەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ ﴾، هەردوو فەرمانەکان بۆ ڕەوا کردنن (الأَمْرَانِ لِلإِبَاحَةِ)، بێگومان بۆ فەرز بوون نین، واتە: هەردوو لاتان بۆ هەن.

پیتی (أو)، لە: ﴿ أَوْ فَارِقُوهُنَّ ﴾دا، بۆ سەرپشککردنە، کە دەشفەرموێ: (بِمَعْرُوف)، لە هەردووکیاندا: ﴿ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ ﴾، (ب)، (للملابسة)، واتە: بۆ تێکەڵییە، یانی: لە حاڵێکدا گرتنەوەخۆیەکە یان وازلێهێنانێکە، بەشێوەیەکی پەسەند بێ.

(**مَعْرُوف**)یش، یانی: بە پەسەند زانراو و باش، ئەویش ئەو حاڵەتە پەسندەیە کە هاوسەرەکان، ژنان و پیاوانی هاوسەردار پێوەی ڕاهاتوون، وەك باوێك کە لە نێویاندایە، چ بۆ پێکەوە ژیان، چ بۆ لێکترازان.

ئنجا کە لە ڕستەی پێشێدا دەفەرموێ: ﴿لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا﴾، وشەی (**أَمْرَاً**)، وەسفکراوی سیفەتێکی قرتێنراوە، یانی: (**لَعَلَّ اللهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرَاً نَافِعَاً**)، نیزیکە دوای ئەوە خوا کارێکی بە کەڵك و سوود بۆ هەردووکیان، بڕەخسێنێ، دەرووێکی خێریان لێ بکاتەوەو، گۆڕانکارییەك کە بە قازانجیان بێ، بیهێنێتە پێش.

**١٥)**- ﴿وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾، دوو پیاوی خاوەن دادگەرییش لە خۆتان بە شایەد بگرن، واتە: دوو پیاو کە خاوەنی دادگەریی بن، بە شایەدیان بگرن بۆ هەردوو حاڵەتی: گرتنەوەخۆ، یاخود وازلێهێنان، ئەوەی لە ڕواڵەتی ئایەتەکەش وەردەگیرێ ئەوەیە کە بە شایەدگرتنەکە لە هەردوو حاڵاندا: (**إِمْسَاك و فِرَاق**)دا، واتە: گەڕانەوەی مێردەکە بۆ لای ژنەکەی و، دووبارە درێژەدان بە ژیانی هاوسەرییان، یاخود وازلێهێنان و دەستبەردار بوون، لە هەردوو حاڵاندا بە شایەدگرتنی دوو پیاوی دادگەر پێویستە.

**١٦)**- ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ﴾، شایەدییدانیش لەبەر خوا بەرپا بکەن، شایەدیی دان لەبەر خوا، واتە: لە پێناوی خواو جێبەجێکردنی فەرمانی خوادا، نەك لەبەر خاتری شایەدیی بۆدراو، یان شایەدیی لەسەر دراو، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ﴾، ئەو ڕستەیە وێڕای ئەوەی ئەوە دەگەیەنێ کە لەبەر خوا شایەدییەکە بدرێ، نەك لەبەر شایەدیی بۆ دراو یان شایەدیی لەسەر دراو، ئەوەش دەگەیەنێ کە شایەدییەکەش شایەدییەکی ڕێك و ڕاست بێ و، لاریی تێدا نەبێ، هەڵبەتە زانایان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە بە شایەدگرتنی دوو پیاوی دادگەر، مەرج نیە نە بۆ هێنانەوە ژێر نیکاحی پیاوەکە بۆ ژنەکەی و، نە بۆ لێکجیابوونەوەیان، بەڵکو بە شایەد گرتنی دوو پیاوی دادگەر، بۆ دوور بینییەو بۆ پاراستنی مافی ژنەکەشەو پیاوەکەشەو، بۆ دووریی گرتنە لە ناکۆکیی و دەمەقاڵیی دوایی

و، پەیدانەبوونی دەرهاویشتەی خراپە، ئەگەرنا ئەگەر پیاوەکە شایەدیش نەگرێ، مادام نیەتی لێ هێنابێ لە ژنەکەی جیابێتەوە، هەر دەتوانێ لێی جیابێتەوە، هەروەها ئەگەر شایەدانیش نەگرێ، دەتوانێ ژنەکەی بهێنێتەوەو، پێش ئەوەی عیددەی بەسەر بچێ بڵێ: من ئەو ژنەم هێنایەوە لای خۆم، بەبێ شایەد گرتنیش، بەڵام شایەدگرتنەکە لە هەردوو حاڵی هێنانەوە ژێر نیکاح و، لێك جیابوونەوەیاندا، هەرچەندە مەرجی هێنانەوە ژێر نیکاح و تەڵاق کەوتنەکە نیە[1]، بەڵام فەرمانی پێکراوە، تاکو دوایی مشت و مڕو دەمە قاڵەو گرفت و کێشە لە نێوانیاندا دروست نەبێ.

زۆربەی زانایان دەڵێن: شایەدگرتنەکە تەنیا لە حاڵەتی هێنانەوە ژێر نیکاحی پیاو بۆ ژنەکەی دایە: (**الجُمْهُورُ عَلَى أنَّ الإشْهَادَ فِي المُرَاجَعَةِ فَقَط، دُونَ الفِرَاق**)، تەنیا ئەگەر پیاوەکە بیەوێ بگەڕێتەوە لای ژنەکەی و ژنەکەی بهێنێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، دوو پیاوی دادگەر بە شایەد گرتنەکە پێویستە، بەڵام (**عبد الله بن عباس و يحيى بن بكير (من المالكية)، وشافعي (في أحد قوليه)، وابن حنبل (في أحد قوليه)، ورواية عن عمران بن حصين و طاووس و إبراهيم و أبي قلابة وعطاء**)، ئەوانە هەموویان ڕایان وایە: هەم بۆ تەڵاق و هەم بۆ هێنانەوە ژێر نیکاح، ئەو شایەدگرتنە پێویستە.

لەو بارەوەش کە ئایا ئەو شایەدگرتنە، شتێکی پێویستە، یاخود بەس پەسەندە؟ لە نێوان زانایان دا ڕاجیایی هەیە، بەڵام بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە، دەبێ پێویست بێت، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾، دوو پیاوی خاوەن دادگەریی لە خۆتان بە شایەد بگرتن، ئایا بەچی دەزانین دەبێ دوو پیاو بن و، دوو ئافرەت بە کەڵکی ئەو شایەدییە نایەن؟ بە بەڵگەی ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾، دوو پیاوی خاوەن دادگەریی لە خۆتان، ئەگەر مەبەست دوو ئافرەت بووایە، دەیفەرموو: (**ذَوَاتَي عَدْلٍ منكم**).

---

(١) مەرج بوون یانی: بەبێ ئەوە کارەکە نایەتە دی و دروست نابێ، بەڵام فەرمان پێکراوبوون، یانی: ویستراوەو داواکراوە، ئەویش چ فەرز بێ چ پەسند.

## پێناسەی دادگەریی (العدل)

(الجُرْجَانِي) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ: (**العَدَالَةُ فِي اللُّغَةِ: الإِسْتِقَامَةُ، وَفِي الشَّرِيْعَةِ: عِبَارَةٌ عَنِ الإِسْتِقَامَةِ عَلَى طَرِيْقِ الحَقِّ بِالإِجْتِنَابِ عَمَّا هُوَ مَحْظُوْر دِيْنَاً، وَالعَدْلُ: عِبَارَةٌ عَنِ الأَمْرِ الْمُتَوَسِّطِ بَيْنَ طَرَفَي الإِفْرَاطِ وَالتَّفْرِيطِ، وَفِي اصْطِلَاح الفُقَهَاء: مَنِ اجْتَنَبَ الكَبَائِر، وَلَمْ يُصِرّ عَلَى الصَّغَائِر، وَغَلَبَ صَوَابُهُ، وَاجْتَنَب الأَفْعَال الخَسِيْسَة، كَالأَكْلِ فِي الطَّرِيْقِ وَالبَوْل**)، واتە: دادگەریی لە زماندا بە مانای ڕێك وەستانە، بەڵام لە شەریعەتدا بریتیە لە ڕێك وەستان لەسەر ڕێی هەق، ئەویش بە خۆدوورگرتن لەو شتانەی لە ڕووی شەرعییەوە قەدەغەن، هەروەها (عَدْل): بریتیە لە کارێکی میانجیی لە نێوان تێپەڕاندن و بەزایەدان دا، بەڵام لە زاراوی شەرعزاناندا: پیاوێکی (عدل) یان (عادل) کەسێکە لە گوناهە گەورەکان خۆی پاراستبێ و، لەسەر گوناهە بچووکەکانیش بەردەوام نەبێ و، ڕاستیی و پێکان تێیدا زاڵ ببێ سەر نەپێکانداو، خۆشی لە کردەوە پەستەکان بپارێزێ، وەك خواردن بە ڕێگاوەو، میزکردن لەبەرچاوی خەڵك.

بێگومان ئەو شتانەش بەپێی عورف و باوی کۆمەڵگا، حوکمیان دەگۆڕێ.

١٧)- ﴿ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾، ئا ئەمەتان (کە باسکرا ئەو حوکمانە) هەر کەسێك بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ، پێی ئامۆژگاریی دەکرێ.

١٨)- ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا﴾، هەر کەسیش پارێز لە خوا بکات، خوا دەرووی لێ دەکاتەوە.

١٩)- ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾، بە جۆرێك کە گومانیشی بۆ نابات و ئەگەری بۆ دانەناوە، (خوا) بژیوی دەدات، (**حَيْثُ: مُسْتَعْمَلَة مَجَازًا فِي الأَحْوَالِ وَالْوُجُوهِ تَشْبِيهًا لِلْأَحْوَالِ**

---

(١) التعریفات: ص١٤٨.

**بِالْجِهَاتِ**)، (**حَيْثُ**): لێرەدا بەکارهێنراوە بە مەجاز بۆ حاڵەکان و بۆ ڕووەکان و، حاڵەکان چوێندراون بە لایەکانەوە، چونکە (**حَيْثُ**)، لە ئەصڵدا بە مانای زەرفی شوێنە، ئنجا لێرەدا: ﴿ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُ ﴾، واتە: لە حاڵێکداو بەشێوەیەك خوا بژێوی دەدات کە نایزانێ، (**حَيْثُ**)، لە حاڵەتی زەرفیی دەرهێنراوە بە مەجاز بۆ تەعبیرکردن لە: حاڵەت و ڕوو و شێوە، یانی: بە حاڵەتێك و شێوەیەك بژیوی دەدات، کە بۆ خۆی حیسابی بۆ نەکردوە.

**٢٠)-** ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓ ﴾، هەر کەسێکیش پشت بە خوا ببەستێ، خوای بەسە.

**٢١)-** ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦ ﴾، بێگومان خوا بە ئەنجام گەیەنەری کارەکەیەتی، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (**إنَّ الله بَالِغٌ أَمْرَهُ**)، ﴿ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦ ﴾، (**بَالِغ**)، پاڵدەدرێتە لای (**أَمْرِه**) و (**أمْرِه**)، دەبێتە پاڵوەلادراو (**مضاف إليه**)، بەڵام (**بالغٌ أَمْرَهُ**)، بە تەنوین، یانی: خوا بە ئەنجام گەیەنەری کاری خۆیەتی، (**الطبري**)، دەڵێ: (**إنَّ اللهَ مُنَفِّذٌ أَمْرَهُ مُمْضٍ فِي خَلْقِه قَضَاءَهُ**)، واتە: خوا کاری خۆی جێبەجێ دەکات و، بڕیاری خۆی لە دروستکراوەکانیدا تێدەپەڕێنێ.

**٢٢)-** ﴿ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ﴾، خوا بۆ هەر شتێك ئەندازەیەکی داناوە، (**الطبري**)، گوتوویەتی: (**قَدراً: حَدّاً وَأَجَلاً وَمُنْتَهَىً**)، خوا ﷻ بۆ هەر شتێك کاتێك و سنوورێك و کۆتاییەکی داناوە.

کەواتە: وامەزانن کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: هەر کەسێك پشت بە خوا ببەستێ، خوای بەسە، مانای ئەوەیە تۆ چیت ویست لەو کاتەدا، کە دەتەوێ و، لەو شوێنەدا کە دەتەوێ، خوا بۆت دەکات، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦ ﴾، بەڵێ، خوا کاری خۆی دەگەیەنێتە جێ و، بە کۆتایی دەگەیەنێ و، بە ئامانج و ئەنجام دەگەیەنێ، بەڵام: ﴿ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ﴾، بە دڵنیایی خوا بۆ هەر شتێك ئەندازەیەکی داناوەو، لە کاتی خۆیداو، لە شوێنی خۆیدا، کارەکانی خۆی دەکات.

## مەسەلەی دووەم:

**ماوەی عیددەی ئافرەتانی بێ ئومێد لە حەیزو، نەگەیشتوو بە تەمەنی کەوتنە حەیز سێ مانگەو، کۆتایی ماوەی (عیددەی) ژنی تۆلداریش دانانی تۆڵەکەیەتی، خواش کاری پارێزکاران ئاسان دەکات و، خراپەکانیشیان لێ دەسڕێتەوەو، پاداشتیان مەزن دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ﴿٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ ﴾، ئەوانەی لە ژنەکانتان، نائومێد بوون لە حەیز، واتە: چیدیکە ناکەونە حەیزەوەو چیدیکە حەیز ناشۆن، لە کوردەوارییدا دەڵێن: سەرو عوزرشۆر، (الطبري) دەڵێ: (**وَالنِّسَاءُ اللَّاتِي قَدِ ارْتَفَعَ طَمَعُهُنَّ عَنِ الْمَحِيضِ، فَلاَ يَرْجُونَ أَنْ يَحِضْنَ**)، ئەو ئافرەتانەی ئومێدیان نەماوە بە حەیزو، بە تەمانین جارێکی دیکە بکەونە حەیزەوە، چونکە تەمەنیان هەڵکشیوە، یاخود تووشی نەخۆشییەك بوون.

٢)- ﴿ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ ﴾، ئەگەر ئێوە (ئەی پیاوینە!) کەوتنە گومانەوە، یان ئەگەر ئێوەو ئافرەتەکان کەوتنە گومانەوە، ئایا دەبێ عیددەیان چەند بێ؟ دوای چەند دەگونجێ هاوسەرگیریی بکەنەوە؟ چونکە حەیزی پێدانایەت تاکو بگوترێ: با حەیزێك بشواو، دوایی پاکییەکی بەسەردا بێ و، دوایی حەیزی دووەم و، دوایی پاکیی سێیەم، ئنجا بۆی هەبێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ ﴿٢٢٨﴾ ﴾**البقرة**، ئافرەتانی تەڵاقدراو چاوەڕێی خۆیان دەکەن، خۆیان مەرزەم دەکەن تاکو تێپەڕینی سێ (**قُرءْ**)، (**قُرُوءٍ**)، ئەبوو حەنیفە بە حەیزی لێکداوەتەوە، بەڵام بەپێی ئەم ئایەتەو بە ڕای جەماوەری زانایان (**قُرءْ**)، بە مانای پاکیی (**طُهُر**) دێ، واتە: ئافرەت

دەبێ سێ پاكیی بەسەردا بێن، عیددەكەی بریتیە لە سێ پاكیی بەسەردا هاتن، ئەوە بۆ ئافرەتێك كە بكەوێتە حەیزەوە.

بەڵام دەفەرموێ: ئەوانەی لە حەیز چوونەوە، واتە: نائومێد بوونە لەوەی بكەونە حەیزەوە:

٣)- ﴿فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَـٰثَةُ أَشۡهُرٍ﴾، ئەوانە عیددەكەیان سێ مانگە، ئنجا لە ڕاستییدا پاكیی و كەوتنە حەیزێكیش، هەر لە ماوەی مانگێكدا دەبێ و ماوەكان لە یەك نیزیكن، چ (**قرء**) بە (**حیض**) مانا بكرێ، چ بە پاكیی (**طهر**).

٤)- ﴿وَٱلَّـٰٓـِٔی لَمۡ یَحِضۡنَ﴾، هەروەها ئەو ئافرەتانەش كە نەكەوتوونەتە حەیزەوە، واتە: جارێ نەگەیشتوونە تەمەنێك حەیزیان پێدا بێ، بەڵام دیارە هاوسەرگیرییشیان كردوە، كە ئەوەش حاڵەتێكی دەگمەنە، هەرچەندە ئەو ئافرەتە مێردی چۆتە لای، بەڵام جارێ نەكەوتۆتە حەیزەوە، یان لەبەر نەخۆشییەك ناكەوێتە حەیزەوە، تاكو ماوەی عیددەكەی دیار بێ، چونكە كە حەیزی دیار نەبوو، پاكییەكەشی دیار نابێ و نازانێ كەنگێیە، هەمیشە هەر پاك دەبێ، چونكە خوێنی حەیزی پێدا نایەت، تاكو پاكیی دوای حەیزی هەبێ و هەمیشە هەر پاك دەبێ، بۆیە ئەو ئافرەتانەی نائومێد بوون لە كەوتنە حەیزو، ئەو ئافرەتانەش كە جارێ نەكەوتوونەتە حەیزەوە، لەبەر كەم تەمەنیی یان لەبەر نەخۆشییەك، ئەوانیش عیددەكەیان هەر سێ مانگە، بەڵام بە مەرجێك مێردیان چووبێتە لایان و گوسترابنەوە، چونكە ئافرەتێك نەگوازرابێتەوەو مێردی نەچووبێتە لای، عیددەكێشانیان لەسەر نیە، وەك خوا لە سووڕەتی (**الأحزاب**) دا دەفەرموێ: ﴿یَـٰٓأَیُّهَا ٱلَّذِینَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَـٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَیۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةࣲ تَعۡتَدُّونَهَاۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحࣰا جَمِیلࣰا ﴿٤٩﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەرئافرەتانتان مارە كردن، دوایی تەڵاقتاندان بەرلەوەی دەستیان بگەیەننێ، (بەر لەوەی بچنە لایان و بیانگوازنەوە)، مافی ئێوە نیە ئەوان عیددە بشۆن، واتە: سێ مانگ یان سێ پاكیی، چونكە سێ مانگ، یان سێ پاكیی،

دوور بینیی (**إحتیاط**)ە، بۆ ئەوەی ئایا ئەو ئافرەتە نوتفەی ئەو پیاوە لە منداڵدانیدا هەیە، یان نا؟ بەڵام ئەگەر مێردەکەی لەگەڵی جووت نەبووبێ و نەگواسترابێتەوە، ئەو ئەگەرە نیە.

کەواتـە: ئافرەتانێکیـش کـە ناکەونـە حەیـزەوە، یـان هـەر نەکەوتوونـە حەیـزەوە، لەبـەر کـەم تەمەنیـی یـان لەبـەر نەخۆشـیی، ئەوانیـش دیسـان عیددەکەیـان سـێ مانگـە.

٥)- ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾، خاوەن تۆڵەکانیش کۆتایی عیددەکەیان ئەوەیە تۆڵەکانیان دابنێن، (**الطبري**)، گوتوویەتی: (**الصَّوَابُ مِنَ الْقَوْلِ فِي ذَلِكَ أَنَّهُ عَامٌّ فِي الْمُطَلَّقَاتِ وَالْمُتَوَفَّى عَنْهُنَّ، لِأَنَّ اللَّهَ جَلَّ وَعَزَّ، عَمَّ بِقَوْلِهِ**)، واتە: قسەی ڕاست لێرەدا ئەوەیە کە دەفەرموێ: ئافرەتانی تۆڵدار کۆتایی کاتی عیددەکەیان، ئەوەیە عیددەکەیان دابنێن، ئەمە گشتییە بۆ ئافرەتانی تەڵاقدراو و بۆ ئافرەتانێك کە مێردیشیان دەمرێ، چونکە خوا بە گشتیی فەرموویەتی، (ئەگەر حەملیان هەبێ)، بەڵام ئافرەتێك تۆڵدار نەبێ و هاوسەرەکەشی مردبێ، دەبێ چوار مانگ و دە شەو عیددە بشوات، وەك خوای بە بەزەیی دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ٢٣٤﴾البقرە، واتە: ئەوانەتان کە دەمرن و ژنان بەجێدەهێڵن، ژنەکان چوار مانگ و دە شەو چاوەڕێی خۆیان دەکەن، واتە: دەبێ چوار مانگ و دە شەوان بچنە عیددەوە، چونکە بە چوار مانگ و دە شەوان، ئەو ئافرەتە حاڵیی دەبێ: ئایا تۆڵی هەیە، یان نیەتی، ئایا نوتفەی مێردەکەی لە منداڵدانیدا هەیە، یان نیە؟.

(**الطـبري**) دەڵـێ: قسـەی ڕاسـت ئەوەیـە کـە ئافـرەتی تۆڵـدار، چ تەڵاقـدراو بـێ، چ مێـردی مردبـێ، بـە دانـانی تۆڵەکـەی عیددەکـەی تـەواو دەبـێ، چونکـە کـە تۆڵەکـەی دانـا، واتـە: تـەواو پـاك بۆتـەوەو، ناگونجـێ حەملەکـەشی دانابـێ و نوتفەی مێردەکـەشی لـە منداڵدانیـدا مابـێ.

٦)- ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ﴾، هەر کەسێکیش پارێز لە خوا بکات، خوا لە کاریدا ئاسانیی بۆ دەڕەخسێنێ.

٧)- ﴿ ذَٰلِكَ أَمۡرُ ٱللَّهِ أَنزَلَهُۥٓ إِلَيۡكُمۡ ﴾، ئەوەش فەرمانی خوایە بۆ لای دابەزاندوون، فەرمانی خوایە بۆ لای ئێوەی دابەزاندوە، لە میانی پێغەمبەرەکەیدا.

٨)- ﴿ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ﴾، هەر کەسێکیش پارێز لە خوا بکات، خوا خراپەکانی لێ دەسڕێتەوەو پاداشتیشی بۆ مەزن دەکات.

﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ ﴾، **(أُولَات)** **(اسْـمُ جَمْـعٍ لِـذَات، بِمَعْنَـى صَاحِبَـة)**، **(أُولَات)**، نـاوی کۆیـە، بـۆ **(ذَات)**، بـە مانـای **(صَاحِبَـة)** دێ، واتـە: خـاوەن، کەواتـە: ﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ ﴾، واتــە: ئافرەتانێـك كـە خـاوەن تۆلـن.

وشـەی **(أُولَات)**، لـە بێـژەی خـۆی تاكـی نیـە، بەڵكـو تاكەكـەی بریتیـە لـە **(ذَات)**، كـە بـە مانـای **(صَاحِبَـة)** دێ، هـەروەك **(أُولـوا)**، بـە مانـای **(ذُوُا)** دێ، واتـە: خاوەنـان كـە بـۆ پیـاوان بـەكاردێ، ئەمیـش دیسـان لـە بێـژەی خـۆی تاكـی نیـە، **(أُولـوا)**، تاكەكـەی **(ذا)**یـە، وەك چـۆن تاكـی **(أُولات)** بریتیـە لـە **(ذات)**.

لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە دێنیـن: {**عَـنِ ابْـنِ مَسْـعُودٍ رضي اللـه عنـه، يَقُـولُ: مَـنْ شَـاءَ قَاسَـمْتُهُ نَزَلَـتْ سُـورَةُ النِّسَـاءِ الْقُـصْرَى بَعْدَهَـا، يَعْنِـي بَعْـدَ: أَرْبَعَـةِ أَشْـهُرٍ وَعَـشْرًا**} **(أخرجـه أبـو داود: ٢٣٠٧، وصححـه الألبـاني)** واتــە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود گوتوویەتـی: هـەر کەسێك دەیـەوێ مـن سـوێندی لەگـەڵ دەخـۆم، (بـا بـێ سـوێند بخـوات، منیـش سـوێند دەخـۆم)، كـە سـوورەتی **(النِّسَـاءِ الْقُـصْرَى)**، سـوورەتە كورتەكـەی **(النِّسَاءِ)**، (واتـە: ئـەم سـوورەتی **(طَلَّاق)**ە)، لـە دوای سـوورەتی **(البقـرة)** دابەزیـوە، كـە ئـەو ئایەتـەی تێدایـە **(أَرْبَعَـةِ أَشْـهُرٍ وَعَـشْرًا)**.

دەڵـێ: ئـەو چـوار مانـگ و دە شـەوە، بـۆ عیـددەی ئافرەتێكـە مێـردی مـردوەو تۆلـدار نیـە، بـەڵام ئافرەتێـك تۆلـدار بـێ، كۆتایـی عیددەكـەی بریتیـە لـە دانانـی كۆرپەلەكـەی.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پێویستە پیاوانێك كە ژنەكانیان تەڵاق داون، لە قەدەر توانایان لە شوێنی نیشتەجێ بوونیاندا ژنەكانیان بحەوێننەوە (ژنە تەڵاقدراوەكانیان) و، زیانیشیان پێنەگەیەنن و تەنگیان پێ هەڵچنن و، ئەگەر ژنەكانیان شیریشیان دایە كۆرپەكانیان، كرێ و پاداشتیان بدەنێ، بە ڕاوێژی نێوانیان و، ئەگەر ڕێكیش نەكەوتن، ژنێكی دیكە شیری بە كۆرپەكەی بدات، هەر پیاوێكیش بەپێی توانای خۆی مەسرەف دەكێشێ، هیچكەس زیاد لە توانای خۆی لێی داوای ناكرێ، خواش دوای تەنگانە كارئاسانیی دێنێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَسۡكِنُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ سَكَنتُم مِّن وُجۡدِكُمۡ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُواْ عَلَيۡهِنَّۚ وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمۡلٖ فَأَنفِقُواْ عَلَيۡهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ فَإِنۡ أَرۡضَعۡنَ لَكُمۡ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأۡتَمِرُواْ بَيۡنَكُم بِمَعۡرُوفٖۖ وَإِن تَعَاسَرۡتُمۡ فَسَتُرۡضِعُ لَهُۥٓ أُخۡرَىٰ ٦ لِيُنفِقۡ ذُو سَعَةٖ مِّن سَعَتِهِۦۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيۡهِ رِزۡقُهُۥ فَلۡيُنفِقۡ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَاۚ سَيَجۡعَلُ ٱللَّهُ بَعۡدَ عُسۡرٖ يُسۡرٗا ٧﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿أَسۡكِنُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ سَكَنتُم مِّن وُجۡدِكُمۡ﴾ (ئەی مێردینە!) ژنە تەڵاق دراوەكانتان نیشتەجێ بكەن و بحاوێننەوە، لەو شوێنەی خۆتان تێیدا نیشتەجێن، بەپێی توانای خۆتان.

واتە: ئەو ماڵانەی خۆتان تێیاندا نیشتەجێن، ژنە تەڵاق دراوەكانیشتان هەر لەوێ بحەوێننەوە بەپێی توانای خۆتان، بابای ژن تەڵاقدەر، لێی داوا ناكرێ ژنە تەڵاق دراوەكەی لە شوێنێكی دیكە، جگە لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی، بحەوێنێتەوە، بەدڵنیایی هوتێلی پێنج ئەستێرەیی بۆ ناگرێ! بەپێی توانای خۆی لە ماڵی خۆیدا ژوورێكی دەداتێ، یاخود دەیحەوێنێتەوە، بەو شێوەیەی پەسندو چاكە.

٢)- ﴿وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيۡهِنَّ﴾، بەڵام زیانیان پێمەگەیەنن تاکو تەنگیان پێ هەڵبچنن (و تەنگە تاویان بکەن و ناچاریان بکەن ماڵەکە جێبهێڵن)، (**المُضَارَّةُ: الضرر القَوِي**)، لێرەدا وشەی: ﴿وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ﴾، لەسەر کێشی، (**تَفَاعُل**)ە، بەڵام مەبەست پێی زیانگەیاندنی بەهێزە، (**لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيۡهِنَّ: التَّضِيقُ المَجَازِي، وَهُوَ الحَرَجُ وَالأَذَى**)، لێرەدا مەبەست لە تەنگە تاو کردن، ئەوە نیە کە لە دیوارێکی بپەستێ، مەبەست مانا مەجازییەکەیەتی، یانی: سەغڵەتیان مەکەن و بێزاریان مەکەن.

٣)- ﴿وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمۡلٍ﴾، ئەگەر ئەو ئافرەتانەی تەڵاقدراون، خاوەن تۆڵ بوون.

٤)- ﴿فَأَنفِقُوا۟ عَلَيۡهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ﴾، خەرجییان بکێشن تاکو تۆڵەکەیان دادەنێن، واتە: ژنەکە کە کۆرپەلەکەی دانا، ئەو کاتە ئەو پیاوەی ژنەکەی تەڵاق داوە، چیدیکە مولزەم نیەو ئەرکدار ناکرێ، بەوەی خەرجیی بکێشێ.

لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی چەمکی ئەو چەند ڕستەیە (**الطبري**) دەڵێ: (**أَسْكِنُوا مُطَلَّقَاتِ نِسَائِكُمْ مِنَ الْمَوْضِعِ الَّذِي سَكَنْتُمْ، يَقُولُ: مِنْ سَعَتِكُمُ الَّتِي تَجِدُونَ؛ وَإِنَّمَا أَمَرَ الرِّجَالَ أَنْ يُعْطُوهُنَّ مَسْكَنًا يَسْكُنَّهُ مِمَّا يَجِدُونَهُ، حَتَّى يَقْضِينَ عِدَدَهُنَّ**)، واتە: ئافرەتانێک کە تەڵاقتان داون، لەو شوێنەی خۆتان تێیدا نیشتەجێن، بەپێی توانای خۆتان و لەوەی بە دەستتانەوە دێ، نیشتەجێیان بکەن و، لێرەدا فەرمان بە پیاوان کراوە: ئافرەتانێک کە تەڵاقتان داون، بیانحەوێننەوە، لەو شوێنەی خۆتان لێی نیشتەجێن، تاکو ماوەی عیددەکەیان (واتە: ئەو شەو و ڕۆژانەی پێویستە چاوەڕێ بکەن)، بەسەر دەبەن و تەواوی دەکەن.

(**الشوكاني**) لە تەفسیرەکەیدا[1]، دەڵێ: (**وَقَدِ اخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الْمُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا، هَلْ لَهَا سُكْنَى وَنَفَقَةٌ أَمْ لَا؟ فَذَهَبَ مَالِكٌ وَالشَّافِعِيُّ أَنَّ لَهَا السُّكْنَى وَلَا نَفَقَةَ لَهَا. وَذَهَبَ أَبُو حَنِيفَةَ وَأَصْحَابُهُ أَنَّ لَهَا السُّكْنَى وَالنَّفَقَةَ. وَذَهَبَ أَحْمَدُ وَإِسْحَاقُ وَأَبُو ثَوْرٍ أَنَّهُ لَا نَفَقَةَ لَهَا وَلَا سُكْنَى، وَهَذَا هُوَ الْحَقُّ، وَلَا خِلَافَ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ فِي**

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص٢٩٧، ٢٩٨.

**وُجُوبِ النَّفَقَةِ وَالسُّكْنَى لِلْحَامِلِ الْمُطَلَّقَةِ، فَأَمَّا الْحَامِلُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا زَوْجُهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ وَابْنُ عُمَرَ وَابْنُ مَسْعُودٍ وَشُرَيْحٌ وَالنَّخَعِيُّ وَالشَّعْبِيُّ وَحَمَّادُ وَابْنُ أَبِي لَيْلَى وَسُفْيَانُ وَأَصْحَابُهُ: يُنْفَقُ عَلَيْهَا مِنْ جَمِيعِ الْمَالِ حَتَّى تَضَعَ. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ وَابْنُ الزُّبَيْرِ وَجَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ وَمَالِكٌ وَالشَّافِعِيُّ وَأَبُو حَنِيفَةَ وَأَصْحَابُهُ: لاَ يُنْفَقُ عَلَيْهَا إِلَّا مِنْ نَصِيبِهَا، وَهَذَا هُوَ الْحَقُّ لِلأَدِلَّةِ الْوَارِدَةِ فِي ذَلِكَ مِنَ السُّنَّةِ**)، واتە: زانایان لەو بارەوە کەوتوونە ڕا جیاییەوە: ئافرەتێك کە تەڵاقی سێیەمی درابێ، (یان سێ بەسێ تەڵاق درابێ) ئایا مافی نیشتەجێکران و حەوێندرانەوەو، نەفەقە و خەرجیی کێشرانی هەیە؟

مالیك و شافیعیی دەڵێن: مافی نیشتەجێکران و حەوێندرانەوەی هەیە، بەڵام مافی خەرجیی کێشرانی نیە.

ئەبوو حەنیفە و هاوەڵانی دەڵێن: هەم مافی حەوێنرانەوەو نیشتەجێکرانی هەیە، هەم مافی خەرجیی کێشرانیشی هەیە.

ئەحمەدو ئیسحاق و ئەبوو سەور دەڵێن: نە مافی خەرجیی کێشران و نە مافی نیشتەجێکرانیشیان نیە.

(**الشوكاني**) دەڵێ: (**وَهَذَا هُوَ الحَق**)، ئا ئەوەش ڕاستە، (بەڵام ئەوەی ئەو گوتوویەتی، ڕاست نیە، بەس من قسەکەی وی دێنم)، لە نێو زانایاندا لەو بارەوە ڕاجیایی نیە، کە ئافرەتی تۆلداری تەڵاق دراو، هەردووك مافی خەرجیی کێشران و نیشتەجێکرانیشی هەن، (چونکە خوا بە دەقی ئایەت فەرموویەتی: ﴿وَإِن كُنَّ أُوْلَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُواْ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾، پێشێش باسی نیشتەجێ کردنەکەی کردوە) بەڵام ئایا ئافرەتێك کە تۆلدارەو مێردەکەی مردوە، حوکمی چییە؟ عەلی و ئیبنو عومەر و ئیبنو مەسعوود و شووڕەیح و نەخەعیی و شەعبیی و حەمماد و ئیبنو ئەبوو لەیلا و سوفیان و هاوەڵەکانی ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، گوتوویانە: پێویستە لە هەموو ماڵ و سامانەکەی کە ئەو

پیاوە بە دەستیەوەیەتی، خەرجییان بکێشرێ، بەڵام عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی زوبێرو جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﭭ و مالیك و شافیعیی و ئەبوو حەنیفەو هاوەڵەکانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتوویانە: تەنیا لەوەندە بەشەی دەیکەوێ، خەرجیی دەکێشرێ.

دوایی (**الشوكاني**)، دەڵێ: هەر ئەوەش هەقە لەبەر ئەو بەڵگانەی لەو بارەوە لە کتێبەکانی سوننەتدا هاتوون.

٥)- ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ﴾، (ئنجا هەرکات ئەو ئافرەتە تەڵاق دراوانەی تۆلداربوون)، ئەگەر شیریان بۆ دان بە کۆرپەکانتان.

٦)- ﴿فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾، کرێیەکانیان بدەنێ، واتە: کرێی ئەو ژنەی شیر دەدا بەو منداڵە، هەقەکەی بدەنێ.

٧)- ﴿وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ﴾، لە نێوان خۆشتاندا ڕاوێژ بکەن بە شێوەیەکی پەسند، لێرەدا ڕووی دواندن لە مێردەکانیشەو لە ژنەکانیشە، مێردەکان، کە ژنەکانیان تەڵاق داون و، ژنەکان کە تەڵاق دراون، بەڵام منداڵیان بووە.

٨)- ﴿وَإِن تَعَاسَرْتُمْ﴾، ئەگەر تێکگیران و ناڕەحەتییتان تووشبوو، (**التَّعَاسُرُ صُدُورُ العُسْرِ مِنَ الجَانِبَيْنِ، وَتَعَاسَر البَيِّعَانِ: لَمْ يَتَّفِقَا، وَعَسَرْتُ فُلاَنَاً: أَخَذْتُهُ عَلَى عُسْرِهِ**)، (**تَعَاسُر**): بریتیە لە دەرچوونی سەغڵەتیی لە هەردووکیانەوە (**وَتَعَاسَر البَيِّعَانِ**)، واتە: کڕیارو فرۆشیارەکە ڕێك نەکەوتن، (**عسر**)، یانی: زەحمەتیی، واتە: ئەگەر سەر ئێشەو زەحمەتییتان تووش بوو و نەگەیشتنە لێك تێگەیشتن، پیاوە تەڵاقدەرەکەو ژنە تەڵاق دراوەکە ڕێك نەکەوتن، لەسەر ئەوەی ئەو ئافرەتە بە چەندو چۆن شیر بدات بەو منداڵە؟ یان ئافرەتەکە هێندە دڵی لە مێردەکەی ڕەنجا بێ، لەبەر ئەوەی تەڵاقی داوە، بڵێ: شیر نادەم بەو منداڵە.

٩)- ﴿فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ﴾، ژنێکی دیکە شیری پێ دەدات، پیتی (س) بۆ داهاتوو (**للإستقبال**)ە، بەڵام لێرەدا بە مانای جەختکردنەوەیە، وەك: ﴿سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ

﴿لَكُمْ رَبِّي ﴿٩٨﴾﴾ یوسف، کە لە ئەصڵدا بە مانای داهاتوویە، بەڵام لێرەدا بە مانای جەختکردنەوەیە، کەواتە: ﴿فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ﴾ واتە: پێویستە ئەو پیاوە شیردەرێکی دیکە بۆ ئەو کۆرپەیەی خۆی بگرێ.

١٠)- ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ﴾، با بابای خاوەن فراوانیی لە ماڵ و ساماندا، لە قەدەر فراوانیی ماڵەکەی خەرجیی بکێشێ، هەم هی دایکەکە کە شیر دەدا بە منداڵەکە، هەم هی منداڵەکە.

١١)- ﴿وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ﴾، هەر کەسێکیش بژێوی لێ وەتەنگ هێنرابوو، واتە: تەنگ دەست بوو.

١٢)- ﴿فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ﴾، با لەوەندە ببەخشێ کە خوا پێیداوە، وەك پێشینان گوتوویانە: لە کەمی کەم و لە زۆریش زۆر.

١٣)- ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا﴾، خوا هیچ لە کەس داوا ناکات، مەگەر ئەوەندەی پێیداوە.

١٤)- ﴿سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾، بە دڵنیایی خوا لە دوای سەغڵەتیی، ئاسانیی دەڕەخسێنێ، (**السَّعة: الجِدَةُ وَالوَفْرَة مِن المَال وَالرِّزق**)، ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ﴾، (سَعَة)، بە مانای هەبوون و دەستڕۆیشتوویەتییە لە بژیوو سامان دا.

﴿وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ﴾، گوتراوە: (**الرِزْقُ: اسْمٌ لِمَا يَنْتَفِع بِهِ الإِنْسَانُ فِي حَاجَاتِه مِنْ طَعَامٍ وَلِبَاسٍ وَمَتَاعٍ وَمَنْزِلٍ، سَوَاءٌ كَانَ أَعْيَاناً أو أَثْمَاناً**)، (رزق) ناوە بۆ هەر شتێك کە مرۆڤ لێی بەهرەمەند دەبێ، لە پێداویستییەکانی، لە خواردن و پۆشاك و کەل و پەل و جێگاو ڕێگا، یەکسانە شتە دیارو بەرجەستەکان بن یان نرخەکان.

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا﴾، خوا لە هیچ کەس داوا ناکات، مەگەر ئەو ئەندازەیەی پێیداوە، زیاد لە توانا، خوا ﷻ لە مرۆڤ داوا ناکات.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَتُرۡضِعُ لَهُۥٓ أُخۡرَىٰ ﴾، ئەمە هەم جۆرێك لە سەرزەنشتی تێدایە بۆ ژنەكە، كە ئامادە نیە شیر بدات بە كۆرپەكەی خۆی، هەم ئامۆژگاریی تێدایە بۆ بابەكەش كە ئاسانكاریی بكات تاكو لەگەڵ ژنە تەڵاق دراوەكەی دا بگەنە لێكتێگەیشتن و، شیری بۆ بدات بە كۆرپەكەی، هەروەها فەرمانیشە بە بابەكە، ئەگەر لەگەڵ ژنە تەڵاقدراوەكەی دا نەگەیشتە لێكتێگەیشتن، پێویستە دایەنێك بۆ منداڵەكەی بگرێ.

**(إبن عاشور)** لە تەفسیرەكەی خۆیدا دەڵێ: ئەوەی دێتە بەر چاو ئەوەیە: ئەگەر مسوڵمانان خەزێنەی دەوڵەتیان هەبێ، لەسەری پێویستە ژن و مێردەكە كە سەغڵەتن و توانایان نیە، خەرجییان بكێشێ، بەڵام ئەگەر دەوڵەت نەیتوانی بەو كارە هەڵسێ، قازی بۆی هەیە بڕیاری پێویستیان لە بارەوە بدات، ئنجا چ ئەركەكە بخاتە سەرشانی دەوڵەت، چ خزمانی ژن و مێردەكە.

كۆتایی ئەم دەرسە بەم دەقە دێنین كە **(الطبري)** لە **(جامع البيان)**دا بە ژمارە (٣٤٤٤٥) هێناویەتی: **(عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: كَانَ عُمَرُ وَعَبْدُ اللَّهِ يَجْعَلَانِ لِلْمُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا: السُّكْنَى، وَالنَّفَقَةَ، وَالْمُتْعَةَ. وَكَانَ عُمَرُ إِذَا ذُكِرَ عِنْدَهُ حَدِيثُ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهَا أَنْ تَعْتَدَّ فِي غَيْرِ بَيْتِ زَوْجِهَا، قَالَ: مَا كُنَّا لِنُجِيزَ فِي دِينِنَا شَهَادَةَ امْرَأَةٍ)**، **(أخرجه مسلم: ١٤٨٠)**.

واتە: ئەعمەش لە ئیبراهیمەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عومەری كوڕی خەتتاب و عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود ، بۆ ئافرەتێك كە تەڵاقی سێیەمی دراوە، دەیانگوت: دەبێ هەم جێگاو ڕێگای نیشتەجێ بوون و، هەم نەفەقە و مەسرەف و، هەم دیارییشی پێ بدرێ، {**(متعة)**، واتە: دیاریی}، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) كاتێك ئەو فەرموودەیەی بۆ باس دەكرا، كە **(فاطمة)**ی كچی قەیس دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرمانی پێ كردوە لە ماڵێك، جگە لە ماڵی مێردەكەیدا عیددەكەی تەواو بكات، دەیگوت: ئێمە شایەتییدانی

ئافرەتێك لە دینی خۆماندا، ڕێ پێنادەین، واتە: ئافرەتێك بە تەنیا قسەکەی بە بەڵگە ناشێ، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ: دەبێت دوو شایەد بن و، ئەو دوو شایەدەش پیاو بن، یان دەبێ پیاوێك و دوو ئافرەت بن، بەڵام ئافرەتێك بە تەنیا شایەدییەکەی ڕەوا نیە، گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆت نیە، نە لە ماڵی مێردەکەتدا بی و، نە نەفەقەشت بکێشێ! عومەر گوتوویەتی: ئەوە کاری پێ ناکەین، بەڵکو ئافرەت با تەڵاقی سێیەمیشی درا بێ، بۆی هەیە لە ماڵی مێردەکەشیدا بێ و نەفەقەشی بکێشێ، تاکو عیددەکەی تەواو دەبێ،منیش گەر ئەن ڕایە بەڕاست و دروست دەزانم و بێگومانیش هەرقسەیەکی هەرکەسێک بێ لەگەڵ قورئاندا ناکۆک و تێکگیراوبێ، ڕەتکراوەیە و مەحاڵیشە پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی فەرمووبێ، دژی قورئان بێ و لەگەڵی ناکۆک بێ.

## کورتە باسێک لە بارەی تەڵاقەوە

ئـەم کورتـە باسـە لـە کتێبـی: (ئافـرەت و خێـزان لـە سـایەی شـەریعەتدا)، زۆر بـە گوشراویـی وەردەگریـن[1]، سـەرەتاش دەڵێیـن: (لێکـترازانی ژن و مێـرد)، لـەو کتێبـەدا ڕوونمـان کردۆتـەوە، کـە سـێ جـۆری هەیـە:

**یەکەم:** دەستبەردانی مێرد لە ژنەکەی، مێرد دەستپێشخەر دەبێ بەوەی واز لە ژنەکەی بێنێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (**الطَّلَاق**).

**دووەم:** دەستبەردان و لە خۆداڕنینی ژن بۆ مێردەکەی، ئەوەش پێی دەگوترێ: (**خُلْع**).

**سێیەم:** جۆرێکی دیکەی هەڵوەشانەوەی ئەو هاوسەرگیرییە، بریتیە لە هەڵوەشاندنەوە (**فَسْخ**)، (**فَسْخ**)یش لە سەر دەستی قازیی، یان حوکمڕانی مسوڵمانان ئەنجام دەدرێ.

لـەم کورتـە باسـەدا تەنیـا بـاسی (**الطَّـلَاق**) دەکەیـن، واتـە: جـۆری یەکەمـی لـە یەکـترازانی ژن و مێـرد، ئەویـش ئەوەیـە کـە پیـاو تێیـدا دەستپێشـخەر بـێ، ئـەوەش بـە هـۆی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەوە، کـە سـووڕەتی (**الطَّـلَاق**)ەو، بـاسی تـەڵاق لێـرەدا کـراوە، بـەڵام بـاسی (**خُلْـع**) لـە سـووڕەتی (**البقـرة**)دا هاتـوەو، لـە سـووڕەتی (**النساء**)یشـدا هاتـوەو، کاتی خـۆی لـە کاتی تەفسـیرکردنی ئـەو دوو سـووڕەتە بـەرزو بـە پێـزەدا، لـەو بـارەوە قسـەمان کـردوە، ئـەم کورتـە باسـەش لـە بـارەی تەڵاقـەوە، لـە پێنـج بڕگـەدا دەکەیـن:

١- پێناسەی تەڵاق.

٢- حوکمی تەڵاق.

٣- حیکمەتی بە دەست پیاو بوونی تەڵاق.

٤- پایەکانی تەڵاق.

---

(١) چاپی سێیەم، لاپەڕە: ٦٠١ بەرەودوا.

٥- جۆرەكانی تەڵاق.

## بڕگەی یەكەم: پێناسەی تەڵاق:

ئایا تەڵاق هەم لە ڕووی زمانەوە، هەم لە زاراوەی شەرع دا چییەو چۆنە؟:

وشەی (طلاق): وشەیەكی عەرەبییە، بە مانای بەرهەڵداكردن و ئازادكردن دێ، وەك (ڕاغیبی ئەسفەهانیی)، لە كتێبە ناودارەكەی خۆی[1] (**مفردات ألفاظ القرآن**)دا، گوتوویەتی: (**أَصْلُ الطَّلَاقِ: التَّخْلِيَةُ مِنَ الوَثَاق، يُقَالُ أَطْلَقْتُه مِنْ عِقَالِهِ وَطَلَّقْتُهُ، وَهُوَ طَالِقٌ وَطَلْقٌ بِلَا قَيْدٍ، وَمِنْهُ اسْتُعِيْرَ طَلَّقْتُ المَرْأَة نَحْو خَلَّيتهَا فَهِيَ طَالِقٌ أي مُخَلَّاةٌ مِن حِبَالَة النِّكَاح**)، واتە: وشەی تەڵاق لە ڕیشەدا بریتییە لە بەرهەڵدان لەو شتەی پێی بەستراوە، (**أَطْلَقْتُه مِنْ عِقَالِهِ وطَلَّقته**)، (**عِقَال**): پەت (ئەوەی حوشتریان پێ بەستۆتەوە)، واتە: حوشترەكەم لە پەتەكەی بەرهەڵدا، (**طَالِقٌ**) و (**طَلْق**)، یانی: بەرهەڵداو نەبەستراوە، هیچ پەت و شتێك كە پێی ببەسترێتەوە، پێوەی نەماوە، لەوەوە (طلاق) خوازراوەتەوە بۆ دەستبەرداربوونی مێرد بۆ ژنەكەی، (**طَلَّقْتُ المَرْأَة**)، وەك (**خَلَّيْتهَا**)، لە ژنەكە گەڕام و وازم لێ هێنا، (**فَهِيَ طَالِقٌ**)، ئەو واز لێهێنراوە، یان بەرهەڵداكراوە (**أي مُخَلَّاةٌ مِن حِبَالَة النِكَاح**)، لە پەت و گرێبەستی هاوسەرگیریی ئازادە، ئەمە لە ڕووی زمانەوانییەوە.

لە ڕووی شەریعەتیشەوە زانایان و شارەزایان بە چەند وشەیەك پێناسەی تەڵاقیان كردوە، سەرەنجام دەبنەوە بەیەك، بەڵام ئەوەی لە هەموویان باوترە، ئەوەیە كە دكتۆر (**عبدالكريم زيدان**)، بە ڕەحمەت بێ لە مەوسووعەكەی خۆی دا[2] هێناویەتی دەڵێ: (**الطَّلَاقُ شَرْعَاً إنْهَاءُ عَقْدُ الزَّوَاجِ الصَّحِيْح فِي الحَالِ أو فِي المَآلِ بالصِّيغَة الدَالَّةِ عَلَيْه**)، واتە: تەڵاق لە ڕووی شەرعییەوە بریتییە لە

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن: ص٥٣٣.

(٢) المفصل في الأحكام المرأة والبيت المسلم: ج٧، ص٣٤٧.

کۆتایی پێ هێنانی گرێبەستێکی ڕاست و دروستی هاوسەرگیریی، ئێستا یاخود لە داهاتوودا، بە تەعبیرێك کە بیگەیەنێ.

**(محمد أبي زهرة)**، لە **(الأحوال الشخصية)**دا[1]، کورتتر هێناویەتی دەڵێ: **(الطَّلَاقُ رَفْعُ قَيْدِ النِّكَاحِ فِي الحَالِ أَو فِي المَآلِ بِلَفْظٍ مَخْصُوص)**، تەڵاق بریتیە لە لابردنی کۆت و بەندی هاوسەرگیریی ئێستا، یان لە داهاتودا، بە وشەیەکی تایبەت.

کەواتە: تەڵاق بریتیە لە لە یەکترازانی ژن و مێردو لە یەك جیابوونەوەیان بە بەکارهێنانی وشەو تەعبیرێك لە لایەن مێردەوە، کە ئەو مەبەستە بە ئاشکراو ڕوونیی بگەیەنێ.

## بڕگەی دووەم: حوکمی تەڵاق:

تەڵاقدان لە بنەڕەتدا شتێکی ڕەوایە، بەڵام دوایی پێنج حوکمەکانی بەسەردا دەچەسپن، بۆ لە ئەصڵدا ڕەوابوونی تەڵاق، هەم دەتوانین بە قورئان بەڵگە بێنینەوە، هەم بە دەقەکانی سوننەت، هەم بە یەکدەنگیی زانایان:

### ١- لە قورئان دا:

**چەند ئایەتێك لە قورئاندا دەلالەت لەسەر ڕەوایی تەڵاقدا دەکەن:**

أ- لە سوورەتی (البقرة)دا: ﴿ ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ ﴿٢٢٩﴾ ﴾، واتە: تەڵاقدان دوو کەڕەتە، (یانی: تەڵاقدانێك کە بواری پێکهاتنەوەی ژن و مێردی تێدا بێ، یان تەڵاقی ڕەجعیی)، ئنجا یان گرتنە خۆیەکی پەسند، یان دەست لێ بەردانێکی چاك.

ب- هەروەها لە سوورەتی (الطلاق)یشدا: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! هەر کات ژنانتان تەڵاقدان، بەر لە کەوتنە عیددە، تەڵاقیان بدەن، واتە: لە حاڵەتێك کە پاکبووبنەوەو لەو پاکییەدا نەچووبنە لایان.

---

(١) ص٢٧٩.

**٢- لە سوننەت دا:**

**هەر لەو بارەوە دوو دەقی سوننەتیش دێنین:**

**ج- {عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُول الله ﷺ طَلَّقَ حَفْصَةَ ثُمَّ رَاجَعَهَا} (أخرجه عبد بن حميد: ٤٣، والدارمي: ٢٢٦٩، وأبو داود: ٢٢٨٣،والنسائي: ٣٥٦٠، وابن ماجه: ٢٠١٦، وصحَّحه الألباني).**

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی تەڵاقدا، پاشان گێڕایەوە لای خۆی.

حەفصە خوا لێی ڕازێ بێ، یەکێکە لە دایکانی بڕواداران و کچی عومەری کوڕی خەتتاب بووە، دیارە پێغەمبەر ﷺ تەڵاقێکیداوە لەسەر شتێك کە بێزارو تووڕەی کردوە، بەڵام دوایی لە عیددەیدا هێناویەتەوە لای خۆی، بەر لەوەی عیددەی بەسەربچێ.

د- دەقێکی دیکە لەو بارەوە: **{أَبْغَضُ الحَلاَلِ إلى اللهِ الطَّلَاَق} (أخرجه أبو داود: ٢١٧٨، وابن ماجه: ٢٠١٨، والحاكم في المستدرك: ج٢، ص١٩٦، وَصَحَّحَهُ، ووافقه الذهبي، وضعفه الألباني).**

واتە: بوغزێنراوترین حەڵاڵ لە لای خوا تەڵاقە.

یانی: حەڵاڵە بەڵام خوا پێی پەسەند نیە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێ ژن و مێرد بارودۆخیان دەکەوێتە حاڵەتێکی ناچاریی لە یەك جیابوونەوە، بۆیە خوای پەروەردگار ڕێگای پێداوە، وەك شتێکی ناخۆشویستراو.

**٣- یەکدەنگیی زانایان:**

بەڵگەیەکی دیکە لە بارەی ڕەوایی تەڵاقەوە، بریتیە لە یەکدەنگیی زانایان، زانایان لەسەر ڕەوای تەلاق یەکدەنگن وەك خاوەنی **(المغني)**[1]، هێناویەتی، هەروەها **(المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم)**، هی دکتۆر **(عبدالكريم زيدان)**[2]، ئەویش هێناویەتی.

---

(١) (المغني لأبن قدامة)، بەرگی (٧)، لاپەڕە (٩٦).
(٢( بەرگی (٧)، لاپەڕە (٣٤٧).

پێم وایە هەر ئەم ڕایەش ڕاست و پەسندە کە دەڵێ: هەرچەندە تەڵاقدان لە بنەڕەتدا ڕەواو دروستە، بەڵام لە ڕاستییدا پێنج حوکمە شەرعییەکان (**الأحكام الشرعية الخمسة**)ی بەسەردا دەچەسپێن، بەم شێوەیەی خوارێ:

**یەکەم:** تەڵاقدان پێویست دەبێ هەر کات ژن و مێرد کەوتنە ناکۆکییەوەو دوو دادوەرەکان (**حَكَمَيْن**)، لە یەك ترازانیان بڕیاردا، هەروەها پاش تێپەڕبوونی چوار مانگ بەسەر سوێند خواردن (**إيلاء**)ی بابای سوێند خۆر (**مُولي**)دا، وەك دوایی باسی دەکەین، ئەگەر پیاوێك سوێند لە ژنەکەی بخوات، کە ناچێتە لای و سەرجێی ناکات، تاکو چوار مانگ مۆڵەتە، وەك خوا لە سووڕەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن (نەچنە لایان) ماوەی چوار مانگ چاوەڕوانیی هەیە، ئەگەر گەڕانەوە خوا لێبوردەی بە بەزەییەو، ئەگەر بڕیاری دەست لێ بەردانیشیان دا، خوا بیسەری زانایە.

لەم دوو حاڵەتەدا بە تایبەت تەڵاقدان پێویست دەبێ.

**دووەم:** پەسند بوونی تەڵاق، ئەویش لە کاتێك دایە، کە ژن بەرامبەر بە ئەرکە شەرعییەکانی کەمتەر خەم بێ و، مێردەکەشی نەتوانێ چارەسەری کەمتەرخەمییەکەی بکات، وا باشترە لێك جیابنەوە، نەك هەموو ڕۆژێ دەمەقاڵێ شەڕو ناکۆکیی بێ.

**سێیەم:** قەدەغەبوون، قەدەغەبوونی تەڵاق لە کاتێك دایە، پیاوەکە قەناعەتی وابێ، ئەگەر ژنەکە تەڵاق بدات، ستەمی لێ دەکات و، هیچ بەڵگەو پاساوێکی بەدەستەوە نەبێ بۆ دەست لێبەردانی، یان لە کاتی حەیزدا تەڵاقی بدات، یان لە پاکییەکدا کە چووبێتە لای (**فِي طُهْرٍ جَامَعَهَا فِيْهِ**)، هەرچەندە بۆ تەڵاقدانەکەی بەڵگە و پاساویشی هەبێ واتە: ئەگەر بەڵگەو پاساوی نەبێ، ئەوە لە هەموو حاڵان دا حەرامە تەڵاقی بدات، بەڵام ئەگەر بەڵگەو پاساوی هەبێ، کەچی لە کاتێکدا کە ژنەکەی لە حەیز دایەو بێ نوێژە، یاخود لە پاکییەکدایە کە چۆتە لای، لەو دوو حاڵەتەدا حەڕامە، هەروەها لە

حاڵەتێکی دیکەش دا کە بابای مێرد قەناعەتی وابێ، پاش تەڵاقدانی ژنەکەی، ژنی دیکە بۆ نایەتەوەو تووشی زیناو خراپە دەبێ، لەو کاتەشدا بە دڵنیایی حەرامە ژنەکەی تەڵاق بدات.

**چوارەم:** حوکمی ناپەسند (**كراهة**)ی تەڵاقدان، ئەویش لە کاتێکدایە کە پیاو هەندێك تێبینیی لەسەر ژنەکەی هەبن، کە بگونجێ بە خۆ ڕاگرتن چارەسەریان بکات و، تۆزێ تەحەممول و پشوو درێژیی زیاتری هەبێ و تەمەنی لەگەڵ بگوزەرێنێ، لەم حاڵەتەدا باش نیە وازی لێ بێنێ و ناپەسندە.

**پێنجەم:** ڕەوابوون (**مباح**)ی تەڵاقە، ئەمیش لە حاڵەتێکدایە کە مێرد پێویستی بە دەربازبوون بێ لە ژنەکەی، بە هۆی نارێکیی لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتییەوەو، زەرەرمەند بوونی بە دەستیەوە، لەم حاڵەتەدا ئەو پیاوە بۆی هەیە واز لە هاوسەرەکەی بێنێ.

## بڕگەی سێیەم: حیکمەتی بە دەستی پیاو بوونی تەڵاق:

بۆچی شەریعەت دەست لێبەردانی ژنی خستۆتە دەستی مێردەوە؟ ئێمە حیکمەتی ئەوە بەو شێوەیە ڕوون دەکەینەوە: لە کاتێکدا مێرد لەگەڵ ژنەکەیدا دەگاتە بنبەست و، پاش بەکارهێنانی سەرجەم هەنگاوو شێوازەکانی ڕاستکردنەوەو هێنانە سەر ڕێیی ژنەکەی، هەر لێی یاخیی دەبێ، لەو حاڵەتەدا ئەو پیاوە سێ ئەگەری لەبەردەم دان و سێ ڕێگای لە پێشن:

١- پێکەوە مانەوە بە ناچاریی، وێڕای هەبوونی بوغزو کینەو ناکۆکیی، کە دیارە لەو حاڵەتەدا ژیانی ژن و مێرد و منداڵەکانیشیان، بگرە هی خزمە نیزیکەکانیشیان دەبێتە نیمچە دۆزەخێك.

٢- هێشتنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی و، لە یەك دوورکەوتنەوەی جەستەیی، کە لەم حاڵەتەشدا ژنەکە زەرەرمەندی گەورە دەبێ و، بە زاراوەی قورئان دەبێتە هەڵواسراو، ﴿فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ﴿١٢٩﴾﴾ النساء.

٣- هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی نێوانیان و، ئازادو سەربەست بوونیان و لەو واقیعە تاڵ و دژوارەی تێیدان و دەربازبوونیان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾ ﴾النساء، واتە: ئەگەر لە یەك بترازێن خوا هەر كامێكیان بەخششێكی خۆی پێ دەبەخشێ و لەوەی دیكەی بێ نیاز دەكات، ئاشكراشەو هەموو عاقڵێكی خاوەن ویژدان، دڵنیایە كە تەنیا ڕێی سێیەم ڕێیەكی شایستەو گونجاوەو، دوو ڕێیەكەی دیكە بە كەڵك نایەن و، بە زیانی ژن و مێرد و منداڵەكانیشیان تەواو دەبن.

ئنجا لە بارەی حیكمەت و هۆكاری بەدەستی پیاو بوونی تەڵاقی ژنەوە، هەر بە كورتیی دەڵێین: بە لای كەمەوە چوار هۆكار هەن، پێویستی دەكەن دەبێ تەڵاق بە دەست پیاو بێ، نەك بە دەست ژن:

١- پیاو مشوورخۆرەو بەرپرسی ژن و خێزانە: ﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ﴿٣٤﴾ ﴾ النساء.

٢- هەروەها پیاو دەستپێشخەری هاوسەرگیریی و بنیاتنانی خێزانە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ أَوْ يَعْفُوَا۟ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ... ﴾، **البقرة (٢٣٧)**، بۆیە شتێكی لۆژیكییە كە هەر خۆشی مافی هەڵوەشاندنەوەی هەبێت.

٣- تەڵاق كە بریتیە لە هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیریی، دەرەنجامی زۆری لێ دەكەونەوەو، بڕیارێكی پڕ مەترسییەو، نابێ بە دەست كەسێكەوە بێ كە عاتیفە و سۆز بە سەریدا زاڵ دەبێ، پیاوانیش بە گشتیی لە ژنان زیاترو چاكتر هەست و سۆزی خۆیان پێ كۆنترۆڵ دەكرێ و، هەر كەسێك نكووڵیی لەوە بكات، نكووڵیی لە ڕاستییەكی زانستیی، واقیعیی، مێژوویی و ئێستایی دەكات.

٤- تەڵاقدان دەبێتە مایەی پێویستبوونی چەند بەرپرسیارییەتێكی دارایی، وەك مارەیی دواخراو (**المَهْرُ المؤجَّل**) و كرێی شیر پێدان و بەخێوكردن (**أُجْرَة الرَّضَاعَة والحَضَانة**) و بژێوی كاتی عیددەو، نشتەجێ كردنی ئافرەتەكە لە كاتی عیددەدا، وەك پێشتر باسمانكرد،

ئەوانەش هەموویان وادەکەن کە مێرد پەلە نەکات لە بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرگیرییدا.

ئنجا بێگومان بە دەستی پیاوبوونی تەڵاق، مانای وانیە کە ژن هیچ مافێکی نیە، بەڵکو ئەویش بۆی هەیە:

**١-** لە کاتی گرێبەستی هاوسەرگیریی (**عَقْدُ النِّكَاح**)دا بە مەرجی بگرێ، کە تەڵاق بە دەستی خۆی بێ، وەك لە مەزهەبی (**أبو حنيفة**)دا هاتوە، وەك لە (**حاشية ابن عابدين**)، (**رد المحْتار على الدرِّ المختار**)[1]، کە ئافرەت بۆی هەیە لە کاتی گرێبەستی هاوسەرگیریی دا بڵێ: دەبێ بەدەست خۆم بێ هەر کاتێ ویستم جیاببمەوە.

**٢-** کە مێردەکەی سەر پشکی بکات، هەر کات ویستی جیاببێتەوە، ئەوەش زۆربەی زانایان بە ڕەوایان زانیوە، وەك لە: (**المهذب للشيرازي**)دا[2]، هاتوە وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەکانی خۆی سەرپشك کردن، پاش دابەزینی ئایەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾**الأحزاب**، کە لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**الأحزاب**)دا، بە درێژیی قسەمان لە بارەوە کردوە.

**٣-** کە مێردەکەی بیکاتە وەکیل بۆ خۆ تەڵاقدان و جیابوونەوەی، وەك (**محمد أبو الزهرة**)، لە کتێبەکەی (**الأحوال الشخصية**)دا[3]، هێناویەتی.

**٤-** سەرباری هەموو ئەوانە، ژن مافی لە خۆ داڕنینی مێردیشی هەیە، یانی: (**خُلْع**)، وەك لە مەوسووعەی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەت دا)، بە درێژیی باسمان کردوە.

---

(١) ج٢، ص٤٨٥.

(٢) ج٣، ص٨.

(٣) ص٣٢٣.

## بڕگەی چوارەم: پایەکانی تەڵاق:

تـەڵاق چەنـد پایەیـەکی هـەن، ئێمـە بـە کورتیـی بەسـەریاندا دەڕۆیـن و، لـە بـارەی پایـەکانی تەڵاقدانـەوە، لـە نێـوان زانایانـدا مشـت و مـڕو ڕاجیایـی هەیـە، بـۆ وێنـە: حەنەفییـەکان دەڵێـن: تەڵاقـدان، بـەس یـەك پایـەی هەیـە کـە بریتیـە لـە بێـژە (**لفـظ**)، یـەک بـۆ لێکترازانی ژن و مێـرد بـەکاردێ، وەك (**الکاسـاني**) لـە (**بدائـع الصنائـع فِي ترتيـب الشرائـع**)دا[1]، دەڵـێ: (**فَرُكْـنُ الطَّـلَاقِ هُـوَ الَّفْـظُ الَّـذِي جُعـل دَلَالَـةً عَـلَى مَعْنَـى الطَّلَاقِ**)، پایـەی تـەڵاق بریتیـە لـەو بێژەیـەی کـراوە بـە نیشـانە لەسـەر مانای تـەڵاق، بـەڵام شـافیعییەکان دەڵێـن: تەڵاقـدان پێنـج پایـەی هـەن، وەك (**الشربینـي**) لـە (**مغنـي المحتـاج**)دا[2] دەڵـێ: (**وَأَرْكَانُـهُ خَمْسَـةٌ: مُطَلِّـقٌ، وَصِيْغَـةٌ، وَمحَـلٌ وَوِلَايَـةٌ، وَقَصْـدٌ**)، واتـە: پایـەکانی تـەڵاق پێنجـن: تەڵاقـدەر، تەعبیرەکـە، شـوێنی تەڵاقدانەکـە (مەبەسـت پێـی ئافرەتەکەیـە)، سەرپەرشـتیی بەسـەریدا هەبـێ، مەبەسـتیشی بـێ تەڵاقـی بـدات.

بـەڵام ئـەوەی زۆربەیـان لەسـەری ڕێککەوتـوون، ئەوەیـە کـە تەڵاقـدان سـێ پایـەی سـەرەکیی هـەن، کـە بریتیـن لـە:

١- تەڵاقدەر (**المُطَلِّق**)، کە مەبەست پێی مێردە.

٢- تەڵاقدراو (**مُطَلَّقَة**)، کە مەبەست ژنە.

٣- ڕێژگە (**الصِّیْغَة**) ئەو تەعبیرەی پێی تەڵاق دەدرێ.

بـەڵام دوای لێکۆڵینـەوە، ئـەو ڕایـەی زانایانـم پـێ ڕاسـترە، کـە دەڵـێ: تەڵاقـدان پایەیـەکی دیکەشـی چوارەمـی هەیـە کـە بریتیـە لـە:

---

(١) ج٣، ص٣٥٧.

(٢) ج٤، ص٢٥٥.

٤- شایەد لەسەر گرتن (**الإشهَاد**)، واتە: دوو پیاوی دادگەر (**عادل**) شایەد بن لەسەر تەڵاقدانەکە، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الطلاق**)دا، بە ڕوون و ڕاشکاویی دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ﴾، دوو پیاوی خاوەن دادگەریی بکەنە شایەدو شایەدیی بەرپا بکەن لەبەر خوا.

ئێستاش با سەرنجێکی خێرا لە هەر کام لەو چوار پایەی تەڵاقدان بدەین:

**پایەی یەکەم:** تەڵاقدەر (**المُطَلِّق**)، مەبەست ئەو پیاوەیە کە لە نێوان ئەو و هاوسەرەکەیدا، گرێبەستێکی هاوسەرگیریی ڕاست، (**عقد زواجٍ صحيح**)، هەیەو، ئەو پیاوە شایستەی ئەوەی هەیە، هاوسەرەکەی تەڵاق بدات و دەستبەرداری ببێ، ئنجا زانایان لە بارەی مەرجەکانی بابای تەڵاقدەرەوە، ڕا جیایی و مشت و مڕی زۆریان هەیە، بەڵام پاش سەرنجدان و لێ وردبوونەوەی قسەو بەڵگە هێنانەوەکانیان، گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتە، کە ڕای پەسندو ڕاست و پشتئەستوور بە بەڵگەی بەهێز ئەوەیە، کە بابای تەڵاقدەر دەبێ چوار مەرجی سەرەکیی تێدا بێنە دی، ئەگەرنا شایستەی تەڵاقدان نابێ، ئەو چوار مەرجەش ئەمانەن:

١- عاقڵ بێت، شێت ئەوەی بۆ نیە.

٢- باڵغ بێ، منداڵ ئەوەی بۆی نیە.

٣- سەربەست بێ، واتە: دیل و ژێر دەست نەبێ، بە ناچاریی ژنەکەی پێی تەڵاق نەدرێ.

٤- ئامانجدار بێ، واتە: مەبەستی بێ ژنەکەی تەڵاق بدات، نەك بە هەڵە وشەیەکی بە زار دابێ.

ئنجا هەرسێك مەرجەکە (١و ٢و ٣)، بەگشتیی و هەر کامێك لەوان زانایان بەڵگەی زۆریان لەسەر هێناونەوە، بۆ وێنە:

**١-** لە بارەی مەرجی یەکەم و دووەم (عاقڵ بوون و باڵغ بوون) ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەڵگە هێنراوەتەوە: {**رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّغِيرِ حَتَّى يَكْبُرَ ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ، أَوْ يُفِيقَ**}، (**أخرجه البخاري معلقاً، وأبوداود: ٤٤٠٣، والألباني في صحيح الجامع: ٣٥١٢**)، واتە: قەڵەمی گوناه نووسین لەسەر سێ جۆر کەس لابراوە: لەسەر خەوتوو تاکو بێدار دەبێتەوەو، لەسەر منداڵ تاکو باڵغ دەبێ و، لەسەر شێت تاکو دێتەوە هۆش.

**٢-** هەروەها لەبارەی مەرجی دووەمەوە (باڵغ بوون) ئەوە بە بەڵگە هێنراوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّمَا الطَّلَاقُ لِمَنْ أَخَذَ بِالسَّاقِ**} (**أخرجه ابن ماجه: ٢٠٨١، وحسَّنه الألباني في صحيح الجامع: ٣٩٥٨**)، واتە: تەڵاق بەدەست ئەو کەسەیە کە لاق (ی هاوسەرەکەی) دەگرێ، کە مەبەست پێی جیماع کردنە واتە: تاکو توانای جیماع کردن نەبێ، شایستەیی تەڵاقدان نیە.

هەڵبەتە بە مەرج گرتنی عاقڵ بووی تەڵقدراویش نیشی ئەوە دەگەیەنێ، کە هەر کام لە شێت و، بێهۆش و، سەرخۆش و، ئاگا لە خۆبڕاو بە هۆی تووڕەیی زۆرەوە، هەروەها عەقڵ و هۆش لە لانەماو بە هۆی پیریی، یان نەخۆشییەوە، هیچ کام لەمانە تەڵاقیان ناکەوێ، ئەوەش بە گشتیی ڕای زۆربەی زانایانی لەسەرەو، دەشگونجێ وێرای دوو دەقەکەی پێشێ، ئەم دەقانەش لەسەر ئەوە بە بەڵگە بهێنرێنەوە:

**٣-** پێغەمبەری خوا ﷺفەرموویەتی: {**لَا طَلَاقَ فِي إِغْلَاقٍ**}، (**أخرجه أبو داود: ٢١٩٣، وابن ماجه: ٢٠٤٦، والحاكم: ٢٠٠٢، وَحَسَّنَهُ الأَلبَانِي فِي صحيح الجامع: ٢٥٢٥**)، واتە: تەڵاقدان لە داخران دا نیە، زۆرێك لە زانایانیش وشەی (**إِغْلَاق**)یان بە تووڕەیی لێکداوەتەوە، وەك (**علي بن أبي طالب، وابن عباس، وأحمد، وأبو داود، والكرخي، والطحاوي، وابن تيمية، وابن القيم**)، خوا لە هەموویان ڕازی بێ و لێیان خۆش بێ[1]، بەڵام بێگومان مەبەست لە تووڕەیی،

---

(١) (إعلام الموقِّعين عن رب العالمين)، ج٣، ص ٥٢، والمسائل الفقهية من اختيارات شيخ الإسلام ابن تيمية، ص ٢١٨.

ئەوەیە تووڕەییەکی توندی وابێت، خاوەنەکی ئاگای لە خۆی نەمابێ و عەقڵ و هۆشی داخرابێ.

**ب-** هەروەها عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: {**لَيْسَ لِمَجْنُونٍ وَلاَ لِسَكْرَانَ طَلَاقٌ**}[1] واتە: شێت و سەرخۆش تەڵاقیان لەسەر نیە.

**ج-** هەروەها ئیبنو عەبباس خوا لێیان رازی بێ گوتوویەتی: {**طَلَاقُ السَّكْرَانِ وَالْمُسْتَكْرَه لَيْسَ بجَائِزٍ**}[2] واتە: واتە: تەڵاقی سەرخۆش و زۆرلێکراو ناکەوێ.

**٣-** هەڵبەتە بە مەرج گیرانی ئازاد بوون و سەربەست بوون بۆ تەڵاقدەریش یانی: بابای ناچارکراو و زۆر لێکراو (**مُكْرَه ومضطرّ**) تەڵاقیان ناکەوێ، چونکە خوای میهرەبان دەفەرموێ: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۝٢٨٦﴾ **البقرة، خوا** جگە لە توانای لە هیچکەس داوا ناکات، کەسێکیش زۆری لێ بکرێ و ناچار بکرێ، لەو کاتەدا توانای نەماوە، بۆیەش ئەرکدار ناکرێ و، هەر کارێك پێی هەڵدەستێ، بەرپرسیارێتیی ناکەوێتە سەر.

**هەر** لەو بارەوە کە بابای ناچارکراو تەڵاقی ناکەوێ، ئەو فەرموودەیەش دەگونجێ بە بەڵگە بهێنرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

{**إِنَّ اللـه تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأُ وَالنِّسْيَانُ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ**} (**أخرجه ابن حبان: ٧٢١٩، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري، والحاكم: ٢٨٠١، وقال: صحيح على شرط الشيخين**)، واتە: بێگومان خوا ئۆممەتەکەمی لە سێ شتان بواردوە: هەڵەو، لە بیرچوون و، ئەوەی لەسەری ناچار بکرێن.

**٤-** بۆ بە مەرجگیرانی ئامانجداربوونی بابای تەڵاقدەریش کە مەبەستی بێت ژنەکەی تەڵاق **بدات**، کاتێك ئەو وشەیەی بە زار دادێ، یاخود دەینووسێ، یان ئاماژە پێکردنی، لەسەر ئەوەش دەگونجێ ئەم ئایەتە موبارەکە بە بەڵگە بهێنرێتەوە:

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٧٨١، باب الطلاق في الإغلاق والكره، والسكران والمجنون وأمرهما، والغَلَط والنسيان في الطلاق والشرك وغيره.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٧٨١.

﴿وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَآ أَخْطَأْتُم بِهِۦ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥﴾﴾ **الأحزاب**، واتە: لەوەدا کە بەهەڵە دەیڵێن، گوناهتان ناگات، بەڵکو بەوەی بە مەبەستی دڵتانەو، دەیڵێن (بەوە گوناهتان دەگات) و، خواش لێبوردەی بە بەزەییە.

٨- بەڵام بە نسبەت قسەی گاڵتەو گەمە، زانایان ڕایان وایە تەڵاقی پێدەکەوێ و، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ بە بەڵگە دەهێننەوە: {**ثَلاَثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ وَهَزْلُهُنَّ جِدٌّ: النِّكَاحُ وَالطَّلاَقُ وَالرَّجْعَةُ**}، (**أخرجه أبو داود: ٢١٩٤، والترمذي: ١١٨٤، وقال: حسن غريب . وابن ماجه: ٢٠٣٩، والحاكم: ٢٨٠٠، وقال: صحيح الإسناد**)، واتە: سێ شت ڕاستییان جیددییەو گاڵتەشیان هەر جیددییە: مارەکردن و تەڵاقدان و گێڕانەوەی ژن، واتە: دوای ئەوەی تەڵاقیداوە، بیگێڕێتەوە لای خۆی.

بەڵام من پێم وایە ڕایەکەی دیکە، کە هی ژمارەیەك لە زانایانە، لەو بارەوە بەهێزترە، واتە: ئەگەر مەبەستی نەبێ تەڵاقی بدات، با گاڵتەو سوعبەتیش بکات تەڵاقی ناکەوێ، چونکە لەسەر سەنەدی فەرموودەکە مشت و مڕ هەیەو پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى**}، (**أخرجه: البخاري: ١، مسلم: ١٩٠٧**) واتە: کردەوەکان بە پێی نیازەکانن و هەر مرۆڤێك ئەوەی بە دڵی داهاتوە، ئەوەی بۆ حیسابە.

هەروەها خوا ﷻ لە بارەی تەڵاقدانەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾﴾ **البقرة**، واتە: ئەگەر دڵیان لەسەر تەڵاقدان ساغکردەوە، خوا بیسەری زانایە.

ئاشکراشە بابای گاڵتەکەر نیازی تەڵاقدانی ژنەکەی هەر نیە، چ جای دڵی خۆی لەسەر ساغ بکاتەوە!

**پایەی دووەم:** تەڵاقدراو:

تەڵاقـدراو ئـەو ئافرەتەیـە کـە تـەڵاق دەدرێ، ئەویـش چەنـد شـتێکی تێـدا بـە مەرجگیـراون و، ئێمـە بـە خێرایـی بەسـەریان دا دەڕۆیـن:

**یەکەم:** دەبێ ئەو ژنە لەسەر بناغەی گرێبەستی هاوسەرگیرییەکی ڕاست بووبێتە هاوسەری مێردەکەی، ئەگەرنا ئافرەتی بێگانەو ئافرەتێك کە بە گرێبەستێکی نادروست، (**عَقْدُ فَاسِد**)، بە هاوسەر داندرابێ، نابێتە شوێنی تەڵاق.

**دووەم:** دەبێت پێش گواستنەوەی (**قَبْلَ الدُخُولِ بِهَا**)، تەڵاقی نەدابێ، چونکە ئەگەر ئەو کاتە تەڵاقی دابێ، هەر زوو لێی جیابۆتەوەو هیچ تەڵاقی نەماوە.

**سێیەم:** دەبێ لە عیددەی تەڵاق و جیابوونەوەی گەورە (**البینونة الکبری**)دا نەبێ، تەڵاقی جیابوونەوەی گەورەش ئەوەیە یان سێ تەڵاقی لەسەر یەك دابن، بە ڕای زۆربەی زانایان، یاخود تەڵاقی سێیەمی دابێ.

**چوارەم:** دەبێ لە عیددەی هەڵوەشانەوەی هاوسەرگیریی دا نەبێ.

**پێنجەم:** دەبێ لە کاتی حەیزدا نەبێ و، لە پاکێکییشدا نەبێ کە چووبێتە لای.

**پایەی سێیەم:** ڕێژگە (**الصِّیغة**):

پایـەی سـێیەمی تەڵاقـدان بریتیـە لـە ڕێژگـە (**الصِّیغـة**): زانایـان لـەو بـارەوە زۆر قسـەیان کـردوە، بـەڵام بـە گشـتیی دوو ڕان:

**أ-** هەندێکیان گوتوویانە: بە بێژەی ڕوون و ڕاشکاوی تەڵاق نەبێ، تەڵاق ناکەوێ، کە بریتین لە: (**طلاق**)، (**فراق**)، (**سراح**)، لەبەر ئەوەی ئەو سێ وشەیە لە قورئاندا هاتوون.

**ب-** ئەوانی دیکە ڕایان وایە هەر وشەیەك ئەو واتایانەش بگەیەنێ، تەڵاقی پێ دەکە

، بەڵام ئەوانەی لەسەرڕای (**ظاهرية**)کانن، دەڵێن: دەبێ ئەو هەر سێ وشەیە بن، واتە: سێ وشەیە بە عەرەبیی، یاخود واتایەکانیان بە زمانەکانی دیکە.

**پایەی چوارەم:** شایەدگرتن (**الإشهاد**):

پایـەی چوارەمـی تەڵاقـدان بریتیـە لـە شـایەد گرتـن، زانایـان لـەو بـارەوە بـە پلـەی یەکـەم، ئـەم ئایەتـە موبارەکـە بـە بەڵگـە دێننـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ ﴾**الطلاق**، واتـە: (هـەر کاتێـك (ژنـانی یـەك جـار یـان دوو جـار تەڵاقـدراو) گەیشـتنە نزیـك کاتی دیارییکراویـان (بەسـەرچوونی مـاوەی (**عیـدة**))، یـان بـە شـێوەیەکی پەسـەند دەسـتیان پێـوە بگـرن و بیانهێڵنـەوە، یـان بـە شـێوەیەکی پەسـند دەسـتیان لـێ بـەردەن و، دوو پیـاوی خـاوەن دادگەریـی بـە شـایەد بگـرن لـە خۆتـان، کـە بـۆ خـوا شـایەدیی بـدەن، ئـا ئەوەتـان ئامۆژگاریـی هـەر کەسێکی بـڕوادار بـە خـوا ڕۆژی دوایـی پـێ دەکـرێ، هـەر کەسـیش پارێـز لـە خـوا بـکات دەرووی خێـری لـێ دەکاتـەوە.

ئێمـەش ئـەو ڕایەمـان پـێ بەهێزتـرە کـە دەڵـێ: وەك چـۆن بـۆ گرێبەسـتی نیـکاح، دوو شـایەد بـە مـەرج گیـراون، بـۆ لێـك جیابوونـەوەش بـە هەمـان شـێوەو، ئایەتەکـەش زۆر بـە ڕوونیـی دەیگەیەنـێ.

## بڕگەی پێنجەم و کۆتایی: جۆرەکانی تەڵاقدان:

ئـەم بابەتـە بابەتێکـە زۆر دوورو درێـژو بـە لـق و پۆپـە، هـەر بـە کورتیـی دەڵێیـن: تەڵاقـدان جـۆری زۆرن و بـە گشـتیی نـۆ (٩) جـۆری هـەن:

**١و٢)**- لە ڕووی سیفەتەوە: تەڵاقدانی سوننەتیی و، تەڵاقدانی بیدعەتییش هەیە:

أ- تەڵاقدانی سوننەتیی: ئەوەیە پیاوەکە یەك تەڵاقی ژنەکەی بدات و، لە حەیزدا نەبێ و، لە پاکییەکیش دانەبێ، کە چووبێتە لای، چونکە ئەگەر لە حەیزدا بێ، دوایی بۆ عیددەکەی ئافرەتەکە زەرەرمەند دەبێ، کە دەبێ لە حەیزەکەی تەواو بێ و بکەوێتە نێو پاکیی، ئنجا بۆی حیسابە، هەروەها کاتێك ئافرەتەکە لە حەیزدایە، شەرع حەڕامی کردوە مێردەکەی تەڵاقی بدات، چونکە دەبینی میزاجیان پێکەوە تەواو نیە، دیسان لە پاکییەکیشدا کە چووبێتە لای، قەدەغەیە تەڵاقی بدات، چونکە نازانرێ ئایا ئەو ئافرەتە تۆو (نُطْفة)ی، ئەو پیاوە لە منداڵدانی دا هەیە یان نا؟.

ب- تەڵاقدانی بیدعەتیی: ئەوەیە کە پیاوەکە زیاتر لە تەڵاقێکی بدات، دوو تەڵاق یان سێ تەڵاق پێکەوە، یان لە حەیزدا تەڵاقی بدات، یان لە پاکییەکدا کە چووبێتە لای، ئنجا ئایا تەڵاقی بیدعەتیی دەکەوێ، یان ناکەوێ؟ زۆرێك لە زانایان دەڵێن: ناکەوێ، واتە: تەڵاقی سێ بە سێ هەرسێکیان ناکەون تەنیا یەکیان دەکەوێ، کە من بە خۆم ئەو ڕایەم پێ ڕاستەو، لە مەوسووعەی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا)، بە تەفصیلی باسم کردوە، بەڵام ئایا ئەگەر لە کاتی حەیزدا تەڵاقی دا، یان لە پاکییەکدا کە چووبێتە لای تەڵاقەکەی دەکەوێ یان نا؟ زۆربەی زانایان دەڵێن: گوناهبارەو تەڵاقەکەی دەکەوێ، کەواتە: تەڵاقی بدعەتیی ئەوەیە: ١- یان سێ تەڵاقانی پێکەوە بدات، ٢- یان لە حەیزدا بێ، ٣- یان لە پاکییەکدا بێ چووبێتە لای.

**٣و٤)**- دوو جۆری دیکەش لە ڕووی سیغەکەیەوە: تەڵاقدانی ڕاشکاو و تەڵاقدانی کینایە، هەن:

٣- تەڵاقدانی ڕاشکاو: ئەوەیە کە بە بێژەی (**طلاق**) یان (**فراق**) یان (**سراح**) بێ، (**فسَرِّحوهن، فارقوهن، طلِّقوهن**)، ئەگەر بە یەکێك لەو سێ وشەیە، یاخود واتایەکانیان بن بە زمانەکانی دیکە، ئەوە تەڵاقی ڕاشکاوە.

٤- تەڵاقدانی کینایە: ئەوەیە کە بەبێژەیەك بێ ئەو واتایە بگەیەنێ، بەڵام خودی ئەو بێژەیە نەبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: کینایە، بۆ وێنە: بڵێ بچۆوە ماڵی بابت، یاخود:

خێزانی من نەمای! زانایان لەو بارەیەوە زۆر مشت و مڕیان هەیە، کە ئایا وەك چۆن بە تەڵاقدانی ڕاشکاو، تەڵاق دەکەوێ، بە هی کینایەش دەکەوێ یان نا؟.

**٥و٦)**- لە ڕووی شوێنەواریشەوە دوو جۆرە تەڵاقدان هەن: أ- تەڵاقدانی گێڕدراوە **(الطلاق الرَّجعي)**، کە پیاوەکە بۆی هەیە ژنەکەی بگێڕێتەوە، ب- تەڵاقدانی جیابوونەوە **(الطلاق البائن)**: کە مێردەکە بۆی نەبێ ژنەکەی بگێڕێتەوە لای خۆی:

**٥**- تەڵاقدانی گێڕدراوە: ئەوەیە کە ئەو پیاوە، یەك تەڵاقی ژنەکەی دابێ، بەر لەوەی عیددەی تەواو بێ، بڵێ: ئەوە گێڕامەوە، یان بە کردەوە بیگێڕێتەوە، کە زانایان دەڵێن: دەبێ دوو شایەدان بگرێ، هەندێکیش دەڵێن: شایەدیی ناوێ، ئەوە ئەگەر دوای تەڵاقی یەکەم بێ، بەر لەوەی عیددەی بەسەر بچێ و بیهێنێتەوە لای خۆی، یان دوای تەڵاقی دووەم بێ بەر لەوەی عیددەی بەسەر بچێ و بیهێنێتەوە، ئا ئەوە پێی دەگوترێ: تەڵاقی ڕەجعیی، لەبەر ئەوەی مێردەکە بۆی هەیە بیهێنێتەوە لای خۆی، بەڵام ئەگەر دوای بەسەرچوونی عیددەکە بێ، ئەوە تازە پێی دەگوترێ: تەڵاقدانی جیابوونەوە **(الطلاق البائن)**.

**٦**- تەڵاقدانی جیابوونەوە **(الطلاق البائن)**: ئەگەر دوای بەسەرچوونی عیددەی تەڵاقی یەکەم و دووەم بێ، دەگونجێ ئەو ژن و مێردە بە گرێبەستێکی تازە دووبارە ژیانی هاوسەرگیریی دروست بکەنەوە، ئەوەش جیابوونەوەی گچکە **(البينونة الصُّغرى)**یە، بەڵام جیابوونەوەی دوای تەڵاقی سێیەم، پێی دەگوترێ: جیابوونەوەی گەورە **(البينونة الكبرى)**، لە دوای جیابوونەوەی گەورەش، ژن و مێرد بۆ یەکدی حەڵاڵ نابنەوە، مەگەر ئەو ژنە شووێکی دیکە بکاتەوەو، دوایی لێی جیابێتەوە، ئنجا بە گرێبەستێکی تازە دەگونجێ بێتەوە لای مێردە پێشووەکەی.

**٧و٨)**- لە ڕووی کاتی پەیدابوونی شوێنەواریشەوە، دیسان تەڵاق دەبێتە دوو جۆر:

**٧**- تەڵاقی دەستبەجێ **(مُنَجَّز)**: ئەوەیە کە یەکسەر تەڵاقی بدات، بێ دواخران.

**٨**- تەڵاقی هەڵواسراو **(مُعَلَّق)**: ئەوەیە کە بڵێ: ئەگەر فلان شتە بوو، تەڵاقت بکەوێ.

٩)- جۆری نۆیەمی تەڵاقدان:

٩- سوێند خواردن بە تەڵاق (**الحلف بالطلاق**): کە پوختەکەی ئەوەیە پیاوێك سوێند بە تەڵاق بخوات لەسەر کردن یان نەکردنی کارێك، ئنجا ئایا ئەوە ڕەوایە، هەروەها ئایا چ حوکمێکی دێتە سەر؟ ئەوە قسەی زۆری لەسەرەو لەو کتێبەدا بە تەفصیڵ باسم کردوەو، پوختەکەی ئەوەیە کە پێم وایە سوێند خواردن بە تەلاق گوناهە و تەڵاقیشی پێ ناکەوێ و، بەڕای زۆرێک لە زانایانیش کەفارەتی سوێندی لەسەرە.

لە کۆتاییدا دەڵێم:

شەریعەتی خوای کاربەجێ، هەموو شتێکی تێدا ڕەچاو کراوە، یەکێك لەو شتانەی لە ژیانی بەشەردا دێنە پێش، ئەوەیە کە مرۆڤ هاوسەرگیریی دەکات، بەڵام جاری وایە ئەو هاوسەرگیرییە بە هەر هۆیەکەوە دروست بووبێ، پێشەکییەکانی و بناغەکەی چاك بووبێ، یان چاك نەبووبێ، گۆڕانێك بەسەر ژن، یان بەسەر پیاو دادێ، ناچاری لێك جیابوونەوە دەبن، ئنجا شەریعەت ڕێی داناوەو، ئەگەر پیاوەکە بیەوێ جیا بێتەوە، تەڵاقی بەدەستەو، ئەگەر ژنەکە بیەوێ جیا ببێتەوە داڕنین (**خلع**)ی بە دەستەو، جاری واش هەیە هیچیان ڕەغبەتیان نیە، بەڵام بە کەڵکی یەکدی نایەن، لەبەر ئەوەی لە کاتی خۆی دا کە مارەی کردوە، پێی نەشیاوە، یان لەبەر هەر هۆیەك بێ، ئەوە تەرەفی سێیەم کە بریتیە لە دەسەڵات دەسەڵاتی شەرعیی، دادوەر، لێکیان جیادەکاتەوە کە پێی دەگوترێ: هەڵوەشاندنەوە (**فسخ**)، واتە: شەریعەت سێ ڕێی داناون، بۆ لێك ترازاندنی ژن و مێرد.

مەبەستم ئەوەیە ئێستا کە لە ئایینی شێوێندراوی نەصرانییدا تەڵاقدان نیەو، پیاوێك کە ژنێکی مارەکرد، تازە وەك تۆقێك دەچێتە ملیەوە، ئەوە شتێکی ناڕاست و هەڵەیە، بۆیەش هەر کات کابرا زۆر ناچاربوو، ژنەکەی دەکوژێ، یان جاری وایە ژنەکە مێردەکەی دەکوژێ، یان لەگەڵ کەسێکی دیکەدا ڕێك دەکەوێ، بەڵام شەریعەتی ئیسلام بۆ ئەوەی ئەو بەڵاو موسیبەتانە پەیدا نەبن، سێ ڕێی بۆ داناون:

**١-** ئەگەر پیاوەکە زۆر مەبەستی بوو، تەڵاقی بۆ هەیە.

**٢-** ئەگەر ژنەکە دەستپێشخەر بوو و لە مێردەکەی بێزار بوو، داڕنین (**خُلْع**)ی بۆ هەیە، کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبووەو لە سوورەتی (**البقرة**)[1]داو، لە سوورەتی (**النساء**)[2]یشدا هاتوە.

**٣-** ئەگەر بە کەڵکی یەکدی نەدەهاتن، بەڵام خۆیان بۆیان نەدەکرا لێك جیابنەوە، ئەوە لایەکی دیکەی سێیەم کە (دادوەر)ە بۆی هەیە، لێکیان بترازێنێ.

لێرەدا دێینە کۆتایی ئەم دەرسەمان و، کۆتایی ئەم کورتە باسەش لە بارەی تەڵاقەوە، هەر کەسێ بیەوێ وردەکاریی زیاتر بزانێ، دەبێ تەماشای مەوسووعەی: (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا) بکات، کە بە تەفصیل باسی هەر سێ ڕێیەکەمان کردوە.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**

---

(١) ئایەتی ژمارە: ٢٢٩.

(٢) ئایەتی ژمارە: ١٩.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە پێنـج (٥) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (الطـلاق)، پێکهاتـوە، ئایەتـەکانی: (٨ - ١٢) و سـێ بابـەتی سـەرەکیی دەگرنـە خۆیـان:

**یەکەم:** سەرنجڕاکێشان بۆ مێژوو، کە چەندان کۆمەڵگای یاخیی لە خواو لە پێغەمبەران (علیهم السلام) سزای سەخت دراون و، سەرەنجامیان دۆڕان و زیانباریی و سەر بە فەتارەت چوون بووە.

**دووەم:** هۆشداریی دان بە بڕواداران کە پێویستە پارێز لە خوا بکەن و، شوێن ئەو بەرنامەیەو، ئەو پێغەمبەرە بکەون کە ئایەتە ڕۆشنەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، تاکو سەرەنجام شایستەی ئەوە بن، بیانخاتە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکانی خۆیەوە.

**سێیەم:** ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە خوا حەوت ئاسمانی دروستکردوون و، لە زەویش بە هەمان شێوە، تاکو خەڵك بزانێ خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایەو، بە هەموو شتێکیش زانایە.

﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەهـا (لـە ڕابـردووش دا) زۆر ئاوەدانیـی سـەرپێچییان لـە فەرمـانی پەروەردگاریـان و پێغەمبەرانـی کـرد، ئنجا بـە لێپرسینەوەیەکی توند لێپرسینەوەمان لەگـەڵ کـردن و، بـە ئازاردانێـکی بێـڕەزا سـزامان دان ﴿٨﴾ ئنجا (سـزای) سـەرەنجامی شـوومی خۆیـان چێـژت و ئاکامـی کارەکەیـان زیانباریـی بـوو ﴿٩﴾ (لـە دواڕۆژیشـدا) خـوا ئازارێـکی تونـدو سـەختی بـۆ سـازکردوون، ئنجا ئـەی ئـەو خـاوەن عەقڵانـەی بڕواتـان هێنـاوە! پارێـز لـە خـوا بکـەن، بـە دڵنیایـی (خـوا قورئانێـك) بیرخەرەوەیەك (ی مـەزنی) بـۆ لاتـان دابەزانـدوە ﴿١٠﴾ (هەروەهـا) پێغەمبەرێـك (یـشی نـاردوە) ئایەتـە ڕوونکـەرەوەکانی خواتـان بەسـەردا دەخوێنێتـەوە، تاکـو ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکان دەکـەن، لـە تاریکاییـان بـەرەو ڕووناکیـی دەریانبهێنـێ، هـەر کەسـێکیش بـڕوا بـە خـوا بێنـێ و، کـرداری بـاش بـکات (خـوا) دەیخاتـە نێـو باخانێکـەوە، ڕووباریـان بـە ژێـردا دەڕۆن و بـە هەمیشـەیی تێیانـدا دەبـن، مسـۆگەر خـوا بژێویـکی بـاشی داوە ﴿١١﴾ خـوا ئـەو کەسـەیە حـەوت ئاسـمانی هێناونـەدی و لـە زەویـش وێنـەی وان، فەرمـان(ی خـوا) بـە نێویانـدا دێتـە خـوارێ، تاکـو بزانـن کـە خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێك بـە توانایـە، هەروەهـا کـە زانیاریـی خـوا دەوری هەمـوو شـتێکی داوە ﴿١٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَكَأَيِّن): (اسْمٌ لِعَدَدٍ كَثِيْرٍ مُبْهَمٍ يُفَسِّرُه مَا يُمَيِّزُهُ بَعْدَهُ، وَكَأَيِّن الخَبَرِيَّة بِمَعْنَى: كَثِيْر)، (كَأَيِّن)، ناوێکە بۆ ژمارەیەکی زۆر کە زانراو نیە، بەڵام ئەوەی دوایی جیای دەکاتەوە، مانایەکەی ڕۆشن دەکاتەوە، (كَأَيِّن) بە مانای (كَمْ)ی، (الخَبَرِيَّة) یە، نەك (كَم الإسْتِفهَامِيَّة)، (كَمْ قَلَمٌ عِنْدَك)؟، چەند قەڵەمت لەلان؟ ئەوە جیایە، بەڵام (كَمْ أَهْلَكَ الله مِنْ قَرْيَة!)، واتە: خوا زۆر ئاوەدانیی فەوتاندن!

(قَرْيَةٍ): پێشتریش گوتوومانە: (قَرْيَةٍ: اسْمٌ للمَوْضِع الَّذِي يَجْتَمِعُ فِيْه النَّاسُ وَلِلنَّاسِ جَمِيْعَاً، وَيُسْتَعْمَلُ لِكُلٍّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا)، (قَرْيَة): ناوە بۆ هەر شوێنێك کە (خەڵك) زۆر لێی کۆ بێتەوەو، بۆ خەڵکەکەش کە کۆبۆتەوەو، بە هەردووکیشیان دەگوترێ، هەر کامێکیان بە جیا پێی دەگوترێ: (قَرْيَةٍ).

(عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا): یاخیی و سەر کێش بوو لە فەرمانی پەروەردگاری (العُتُوّ: النُّبُوّ عَنِ الطَّاعَة، عَتَا يَعْتُو عُتُوّاً وَعِتِيَّاً)، (عُتُوّ)، بریتیە لە دوور کەوتنەوە خۆ دوور گرتن لە فەرمانبەریی، دەگوترێ: (عَتَا يَعْتُو عُتُوّاً وَعِتِيَّاً)، هەردووکیان چاوگن.

(وَبَالَ أَمْرِهَا): سەرەنجامی شوومی کارەکەی خۆی، (الوَبْلُ وَالوَابِلُ: المَطَرُ ثَقِيْلُ القِطَارُ)، بارانێك کە دڵۆپەکانی قورس بن، (وَبْل) و (وَابِل)ی، پێ دەگوترێ، (وَلِمُرَاعَاةِ الثِّقَلِ قِيْلَ للأَمْرِ الَّذِي يُخَافُ ضَرَرُهُ: وَبَال، وَطَعَامٌ وَبِيْل وَكَلأوبيل: يُخَافُ وَبَالُهُ)، ئنجا بە ڕەچاوکردنی قورسیی بۆ هەر کارێك کە مەترسیی زیانی لێ پەیدابێ، پێی گوتراوە: (وَبَال)، هەروەك خواردنێك کە بابای بخۆر دەیخوات، یاخود لەوەڕێك کە ئاژەڵێك دەیخوات، ئەگەر مەزەنەی خراپیی لێ بکرێ، بە هەردووکیان گوتراوە: (طَعَامٌ وَبِيْل، وَكَلأ وَبِيْل)، یانی: خواردنێك کە سەرەنجامی خراپەو، لەوەڕێك کە سەرەنجامی خراپە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، دوای ئـەوەی بـاسی حوکمـەکانی تەڵاقـی کـرد، کـە پێشـتر خسـتمانە ڕوو، ئنجـا بـەو بۆنـەوە کـە دەبـێ پابەندیـی بکـرێ بـە شـەریعەتی خـواوە، لـە بـوارەکانی: هەڵسـوکەوتی تاکیـی و خێزانیـی و کۆمەڵایەتیـی و سیاسییدا، کـە لێرەدا بـاسی هەڵسـوکەوتی خێزانیـی بـوو، خـوا ﷻ بۆمـان بـاسی ئـەو کۆمەڵگایانـە دەکات، کـە لـە مێـژوودا لـە فەرمـانی پەروەردگاریـان و لـە فەرمـانی پێغەمبـەرانی خـوا (**علیهـم السـلام**)، یاخیـی بـوون و سەرکێشـییان کـردوە، کـە خـوا چـۆن سـزای داون، کەواتـە: ئەمـە هۆشـدارییدانە بـە مسـوڵمانان، کـە مسـوڵمانینە، بڕوادارینـە! ئێـوەش لـە هیـچ شـتێکدا لـە فەرمـانی خـواو لـە فەرمـانی پێغەمبـەری ﷺ خـوا ﷻ یاخیـی مەبـن و، سەرکەشـیی مەکـەن و لـە ڕێ دەرمەچـن، چونکـە هەمیشـە لـە ڕێ دەرچـوون، سـەرەنجامی خراپـەو، یاخیبـوون لـە خـواو، یاخیبـوون لـە پێغەمبـەرانی خـوا (**صلی اللـه علیهـم وسـلم**)، هـەم لـە دنیـادا سـزای هەیـەو هـەم لـە ڕۆژی دواییشـدا، سـزا چاوەڕێـی خاوەنەکـەی دەکات، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ ﴾، (**وَكَأَيِّـن**)، بـە مانـای (**کـم الخبريّة**)یـەو بـە مانـای زۆرییـە، واتـە: زۆر ئاوەدانیـی، خەڵـکی زۆر ئاوەدانییـان لـە فەرمـانی پەروەردگاریـان یاخیبـوون و لـە فەرمـانی پێغەمبـەرانی خـواش یاخیبـوون، ﴿ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا ﴾، ئێمـەش زۆر بـە سـەختیی، زۆر بـە توندیـی لێپرسـینەوەمان لەگەڵـدا کـردن، ﴿ وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴾، بـە سـزادان و ئازاردانێـکی نەنـاسراو و نەزانراویـش سـزامان دان، یـانی: ئـەو سـزایە، عەقـڵ و ئیدراکـی مـرۆڤ نەیدەتـوانی دەورەی بـدات، هێنـدە بێـرەزاو گـەورەو نامـۆ بـوو، کـە تاکـو ئەوسـا خەڵـك بـەو شـێوەیە سـزا نەدرابـوو!

﴿ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا ﴾، سەرەنجامی شوومی کارەکەی خۆیان چێژت، ﴿ وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴾، سەرەنجامی کارەکەشیان زیانباریی بوو، هی ئەو ئاوەدانییانە کە لە خوا یاخیی بوو بوون و، لە پێغەمبەرانی خوا ﷺ یاخیی بوو بوون.

﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ﴾، بۆ ئەو خەڵکانە، ئەو کۆمەڵگایانە خوا ئازارێکی سەختی بۆ خەڵکی ئەو ئاوەدانییانە ئامادە کردوە، بە دڵنیایی مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، واتە: لە دنیا و دواڕۆژدا تووشی چەرمەسەریی و سزای خوا بوون، هەم سزاباری دنیا بوون و، هەم سزابار و سزادراوی ڕۆژی دواییش بوون، ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەم (ف)ە، لە ڕووی ڕێزمانی عەڕەبییەوە پێی دەگوترێ: (**الفَاء الفَصِيْحَة لأنَّها تفْصِحُ عَمَّا قبلها**)، واتە: کە حاڵ بەو شێوەیەو کۆمەڵگا پێشووەکان سزادراون، بە هۆی لادانیانەوە لە فەرمانی خواو یاخیبوونیانەوە لە پێغەمبەرانی خوا ﷺ و، تووشی سزاباریی بوون، کەواتە: پارێز لە خوا بکەن، ئەی خاوەن عەقڵانێك کە بڕواتان هێناوە! ﴿ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴾، بە دڵنیایی خوا بیرخەرەوەیەکی بۆ ئێوە دابەزاندوە، یاخود بەرنامەیەکی بۆتان دابەزاندوە، کە شەڕەف و ناوو پێگەو پایەیە بۆتان، چونکە (**ذِكْرَاً**)، هەم بە مانای ناوبانگ و پایە بەرزیی دێ، هەم بە مانای بیرخستنەوەو بیرخەرەوەش دێ.

﴿ رَّسُولًا يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ ﴾، ئنجا لێرەدا چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان چی فەرمووە، زیکری خوا چی فەرمووە، ئەویش وایکردوەو، لەگەڵیدا ئاوێتە بووەو لە خۆیدا بەرجەستەی کردوە، (**رَسُولًا**) دەبێتە جێدار (**بَدَل**)ی (**ذِكْرَاً**)، واتە: چ بڵێی قورئان، چ بڵێی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر یەکن و دوو ڕووی ڕاستییەکن.

یاخود: ﴿ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ ﴾، (**وَأرسلَ الله إلَيْكُم رَسُولًا**)، وەك چۆن خوا ﷻ زیکری بۆتان دابەزاندوە، پێغەمبەرێکیشی بۆتان ناردوە، ﴿ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ ﴾، ئایەتە ڕوونکەرەوەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، یاخود:

ئایەتـە ڕۆشـنەکان، چونکـە دەگونجـێ بـە (**مُبَيِّنَـات**)، بخوێندرێتـەوەو دەشـگونجێ بـە (**مُبَيَّنَـات**).

بۆچـی؟ ﴿لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾، دەیتـوانی بفەرمـوێ: (**لیخرجکـم**)، وەك لـە سـووڕەتی (**الحدیـد**)دا، وا هاتـوە، بـەڵام لێـرەدا بـۆ جەختکرنـەوەی ئـەوە کـە ئـەو پێغەمبـەرە ﷺ ئـەو ئایەتانـە کـە دەخوێنێتـەوە، کـە هـەم ڕوونکـەرەوەن هـەم ڕۆشـنن، کەسـێك لێیـان بەهرەمەنـد دەبـێ، کـە خـاوەنی ئیـمانی و کـرداری بـاش بـێ، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾، تاکـو بـە هـۆی ئـەو ئایەتـە ڕوونکـەرەوەو ڕۆشـنانەوە، ئـەو پێغەمبـەرە ﷺ، ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجامـداون، لـە تاریکاییـان دەربازیـان بـکات بـەرەو ڕۆشـنایی، ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا﴾، هـەر کەسـێکیش بـڕوای بـە خـوا بـێ و کـردەوەی بـاش بـکات، زۆر جەختکراوەتـەوە لەسـەر کـردەوەی بـاش، کـە بریتیـە لـە پابەندیـی بـە بەرنامـەی خـوای پـەروەردگارەوە، هـەر کەسـێك ئیـمانی بـە خـوا بـێ و کـردەوەی بـاش بـکات: ﴿يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، دەیخاتـە باخانێکـەوە ڕووباریـان بـە بـەردا دەڕۆن، واتـە: بـە ژێـر درەختەکانیانـدا دەڕۆن، ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾، تییانـدا هەرمـاو دەبـن، بـۆ هەمیشـەو هەتـا هەتایـە، ﴿قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا﴾، (هـەر کەسـێ وابـێ) خـوا باشـترین بژیـوی بـۆ ڕەخسـاندوە، باشـترینی ئـەو پێداویسـتییانەی بـۆ ژیـانی پێویسـتن، چونکـە وشـەی (**رِزْقـاً**)، مـەرج نیـە، تەنیـا خـواردن و خواردنـەوە بگرێتـەوە، بەڵکـو پۆشـاك و جێـگاو ڕێـگاو هەمـوو ئـەو کەلوپـەل و پێداویسـتییانەی مـرۆڤ پێویسـتیی پێیانـە، دەیانگرێتـەوە.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ﴾، خـوا ﷻ ئـەو کەسـەیە حـەوت ئاسـمانی دروسـتکردوون، ﴿وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾، لـە زەویشـدا وێنـەی وان، ئنجـا ئەمـە زانایـان زۆر قسـەیان لەسـەر کـردوەو، دوایـی کورتـە باسـێك

لـەو بـارەوە دەکەیـن، بـۆ ئـەوەی زیاتـر چەمـك و واتایەکـەی ڕوون بکەینـەوەو، قسـەی زانایـان لـەو بـارەوە بێنیـن:

**أ**- ئایا لە زەویش وێنەی حەوت ئاسمانەکان، مەبەست ئەوەیە وەك چۆن حەوت ئاسمانی چین لەسەر چین (**طباقاً**)و لەسەر یەك، هەن، حەوت زەویش چین لەسەر چین هەن؟

**ب**- یان ئایا مەبەست پێی ئەوەیە حەوت زەویش هەن، لە شوێنەکانی دیکە لە گەردووندا؟.

**ج**- یاخود ئایا مەبەست پێی ئەوەیە وەك چۆن حەوت ئاسمان هەن، حەوت زەویش هەن و، گۆی زەویش دەبێتە حەوت بەش، کە مەبەست پێی کیشوەرەکان بێ؟ یان مەبەستێکی دیکە هەیە.

ئێمـە دوایـی هـەم لـە مەسـەلە گرنگـەکان داو، هـەم لـەو کورتـە باسـەدا کـە دەیخەینـە ڕوو، زیاتـر تیشـك دەخەینـە سـەر چەمـك و واتـای ئـەم ئایەتـە موبارەکـە.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَتَنَزَّلُ ٱلۡأَمۡرُ بَيۡنَهُنَّ ﴾، بـە نێـوان ئـەو ئاسـمانانەدا فەرمـان دادەبـەزێ، دەشـگونجێ دابەزینـی فەرمـان زەوییەکانیـش بگرێتـەوە، بـەڵام زیاتـر مەبەسـت پێـی ئاسـمانەکانە، کـە فەرمانـی خـوا بـە نێویـان دا دادەبـەزێ، ﴿ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، خـوا ئـەوەی بـۆ ڕوونکردنـەوە، تاکـو بزانـن خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێك بەتوانایـە، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عِلۡمَۢا ﴾، هەروەهـا بشـزانن کـە خـوا زانیارییەکـەی دەوری هەمـوو شـتێکی داوە، خـوا بـە زانیارییەکـەی خـۆی دەوری هەمـوو شـتێکی داوەو، هیـچ شـتێکی لـێ ون و پەنهـان نیـە.

# مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكەم:

سەرنجڕاكێشان بۆ سەرەنجامی شوومی كۆمەڵگایانێكی زۆر، كە بە هۆی یاخیبوونیانەوە لە فەرمانی خواو پێغەمبەرانی خوا، خوا لێپرسینەوەی توندو سەختی بۆ ڕەخساندوون و، سزای سەرەنجامی خۆیانیان چێژتوە و، سەربارەش خوا ئازارێكی سەختی لە دواڕۆژدا بۆ داناون، بۆیە پێویستە بڕوادارانی هۆشدار پارێز لە خوا بكەن و شوێن ئەو قورئانە بیرخەرەوەیە بكەون، كە بۆی دابەزاندوون و، ئەو پێغەمبەرەی بۆی ناردوون، پەیڕەویی لێ بكەن، كە ئایەتە ڕوونكەرەوەكانی خوا، یان ئایەتە ڕۆشنەكانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە، بە مەبەستی دەربازكردنی بڕوادارانی كردار باش، لە تاریكاییان بۆ ڕووناكیی و، سەرەنجامی بڕوادارانی كردار باشیش باغە پڕ كانیی و ڕووبارە هەمیشەییەكانن:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ ﴾، زۆر شارو وڵات و ئاوەدانیی لە فەرمانی پەروەردگاریان و هی پێغەمبەرانیشی یاخیبوون! بەڵام ئایا وەك بەرزەكی بانان دەرچوون؟ نەخێر.

٢)- ﴿ فَحَاسَبْنَـٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا ﴾، سەرەنجام لێپرسنەوەی توندو سەختمان لەگەڵ خەڵکی ئەو ئاوەدانییانەدا کرد.

(وَكَأَيِّـن): (وَكَأَيِّـن مَبْنِـيٌّ فِي مَحَـلِّ رَفْـعٍ مُبْتَـدَأ، وَعَتَـتْ عَـنْ أَمْـرِ رَبِهَـا: خَـبَرُه)، (كَأَيِّـن)، (مَبنِيٌّ)یـە، (هـەر لەسـەر یـەك حاڵـەت دەمێنێتـەوە) و لـە شـوێنی ڕەفـع دایـەو نیهـادە، ڕسـتەی (عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ)، لـە شـوێنی ڕەفـع دایـەو گوزارەیـە. (عَتَـتْ) لـە (عُتُـوّ)ەو، بریتیـە لـە سـەرپێچیی و سـنوور شـکێنیی، (عَتَـتْ: عَصَـتْ)، سـەرپێچیی کـرد، (العُتُـوّ: تَجَـاوزُ الحَـدِّ فِي العِصْيَـان وَالفَسَـاد)، (عُتُـوّ)، بریتیـە لە سـنوور بەزانـدن لـە سـەرپێچیی و تێکـدان و خراپەکارییـدا، ﴿ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ ﴾، لـە فەرمـانی پەروەردگاریـان یاخیبـوون و لـە سـنوور دەرچـوون و، لـە فەرمـانی پێغەمبەرانـی خـواش.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَحَاسَبْنَـٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا ﴾، لێپرسـینەوەی سـەخت و توندمـان لەگەڵـدا کـردن، لێـرەدا وشـەی (مَحَاسَـبة)، بەکارهێـنراوە بـۆ سـزا، واتـە: سـزایەکی توندمـان دان، خـوا لێپرسـینەوەو لـە ئەنجامـی لێپرسـینەوەکەدا، شایسـتەی ئـەوە بـوون سـزای توندیـان بـدات.

٣)- ﴿ وَعَذَّبْنَـٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴾، ئازارێکی بێڕەزامان دان، (نُكْرَاً)، خوێندراویشەتەوە: (نُكُراً)، بە زەنە (سکون)و بە بۆر(ضمّة)یش، (الشَّيءُ الفَظِيْعُ الَّذِي يُنْكِرُهُ العَقْلُ وَلَا يَسْتَوعِبه)، (نُكْر)، یان (نُكُر)، بریتیە لەو شتە زەبەلاحەی عەقڵ نکووڵیی لێ دەکات و ناتوانێ بیگرێتە خۆی، واتە: تێی ناگات و نامۆیە، پێی نائاشنایە، تاکو ئێستا شتی وای نەدیوە.

٤)- ﴿ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا ﴾، (خەڵکی ئەو ئاوەدانییانە) سەرەنجامی سزای شوومی کاری خۆیانیان چێژت، (وَبَال)، لە (وَبْل و وَابِل)ەوەیە، هەردووکیان بە مانای بارانی دڵۆپە قورس دێن، ئنجا لە ڕووی قورسییەوە، گوتراوە: (وَبُلَ المَرْعَى: إِذَا كَانَ كَلأهُ وَخِيْماً ضَارّاً)، لە وەرگایەك کە لەوەڕەکەی خراپ بێ و سەرەنجامی خراپ و زیانبەخش بێ، دەگوترێ: (وَبُلَ المَرْعَى)، هەروەها (طَعَامٌ وَبِيْل، وَبُلَ الطَّعَام)، خواردنێك کە ئەگەر

بخورێ سەرەنجامی خراپ بێ و، خاوەنەکەی لێی زەرەرمەند بێ، ئەو وشەی بۆ بەکارهاتوە، کەواتە: (وَبَال)، واتە: سەرەنجامی شووم و خراپ.

(وَبِيل)، (**صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالْفِعْل**)، سیفەتێکی چوێنراوە بە کردارەوە.

٥)- ﴿ وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمۡرِهَا خُسۡرًا ﴾، سەرەنجامی کارەکەشیان زیانباریی بوو، (**عَاقِبَةُ الأَمْرِ: آخِرُهُ وَأَثَرُهُ، وَالخُسْرُ مَصْدَرٌ وصِفَ بِهِ الأَمْرُ للمُبَالَغَة**)، سەرەنجامی کار، یانی: کۆتاییەکەی و شوێنەوارەکەی، (**خُسْر**)یش، لە ئەصڵدا چاوگە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی سیفەتە، ئەگەرنا (**خُسر**)، بە مانای (زیانباریی)یەو، وشەی (**أمر**)ی، پێ وەسفکراوە لە ئەصڵدا ئاوا بووە: (**أَمْرُهَا خَاسِرَاً**)، کارەکەیان زیانبار بوو، بەڵام بە چاوگ وەسفکراوە، واتە: سەرەنجامی کارەکەیان خودی زیانباریی بوو.

٦)- ﴿ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗا ﴾، (بۆ خەڵکی ئەو ئاوەدانییانە)، خوا ﷻ سزایەکی سەختی بۆ ئامادە کردوون، (لە ڕۆژی دواییدا).

٧)- ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، [ئەم (ف)یە، دەگونجێ بڵێین: (**فَاء التَّفْرِيع**) ە]، بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد، ئەی بڕوادارە خاوەن عەقڵەکان! پارێز لە خوا بکەن، دەشگونجێ بڵێین: (**فاء الفَّصِيْحَة**)یە، واتە: ئاواو ئاوا بوو، ئنجا ئێوە لە ئەنجامی ئەوەدا پارێز لە خوا بکەن، ئەی خاوەن عەقڵانی ئیماندار!.

٨)- ﴿ قَدۡ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكُمۡ ذِكۡرٗا ﴾، بە دڵنیایی خوا بیرخەرەوەی بۆ ئێوە دابەزاندوە، یاخود: خوا شتێکی بۆ دابەزاندوون، مایەی شەڕەف و پلەو پایەی و پێگەی بەرزتانە، چونکە (**ذِكر**)، کە ناوی قورئانە، هەم بە مانای (**مُذَكِّر**) بیرخەرەوەو، هەم بە مانای بە مانای (**الصِّيْتُ الحَسَن وَالشَّرف**)، ناوبانگی چاك و پێگەی باش، دێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئاماژەیە بەوە کە عەقڵی چاك، وا لە خاوەنەکەی دەکات، پارێز لە خوا بکات و، ئیمان بێنێ و ڕوو لە خوا بکات.

٩)- ﴿ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ ﴾، ڕەوانەکراوێك کە ئایەتەکانی خوا لە حاڵێکدا کە ڕۆشنکەرەوەن بۆتان، بەسەرتاندا دەخوێنێتەوە، (**مُبَيِّنَات**)، خوێندراویشەتەوە: (**مُبَيَّنَات**)، واتە: ئایەتە ڕۆشنکراوەکان.

وشەی (**رَسُول**)، دوو ئەگەری هەن:

أ- دەگونجێ جێدار (بدل) بێ بۆ (**ذِكْر**)، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ وەك دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: {**كَانَ خُلُقُ نَبِيِّ اللهِ ﷺ الْقُرْآن**}[1]، واتە: ئاکاری پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان بوو، یانی: قورئانێکی زیندوو بوو، قورئان چی دەفەرموو، ئەو وای دەکرد، کەواتە: ئەو زیکرە کە خوا بۆی دابەزاندوون، بەرجەستە بووە لە پێغەمبەرێکدا، ئایەتە ڕۆشنکراوە یان ڕۆشنکەرەوەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنێتەوە.

ب- هەروەها دەگونجێ (**رَسُولاً**)، بەرکاربێ بۆ کردارێکی قرتێنراو، کە وشەی (**أنْزَل**) دەیگەیەنێ، یانی: (**أَنْزَلَ اللهُ إِلَيْكِم ذِكْرَاً، وَأَرْسَلَ إِلَيْكُم رَسُولًا**)، کەواتە: (**رَسُولًا**)، دەگونجێ بەرکار (**مفعول به**) بێ، بۆ فیعلێك کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ و وشەی (**أَنْزَل**)، دەیگەیەنێ، یانی: خوا پێغەمبەرێکیشی بۆ ناردوون، کە ئایەتە ڕوونکەرەوەکانی خوا، یان ئایەتە ڕۆشنکراوەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنێتەوە.

١٠)- ﴿لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾، تاکو ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، لە تاریکاییان دەربازیان بکات، بەرەو ڕۆشنایی.

کەواتە: کێ لە قورئان بەهرەمەند دەبێ؟ ئیمانداران، کەسانێك کە بڕوایان هێناوەو، کردار باشن، ئەوانەی پابەندن و بە پێی ئیمانەکەیان بەڕێوە دەچن، ئەوانە لە قورئان بەهرەمەند دەبن.

---

(١) أخرجه مسلم: ٧٤٦.

١١)- ﴿ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا ﴾، هەر كەسێكیش ئیمان بە خوا بێنێ و كردەوەی باش بكات.

١٢)- ﴿ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، (**يُدْخِلهُ**)، خوێندراویشەتەوە: (**نُدْخِلهُ**)، واتە: دەیخەینە نێو باغانێكەوە ڕووباریان بەبەردا دەڕۆن، یان (**يُدْخِلهُ**)، واتە: خوا دەیانخاتە باغانێكەوە ڕووباریان بەبەردا دەڕۆن.

١٣)- ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾، بە بەردەوامیی، هەتا هەتایە، تێیاندا هەرماو دەبن.

١٤)- ﴿ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴾، بە دڵنیایی خوا باشترین بژیوی بۆ ڕەخساندوە، وشەی (**رزق**) وەك گوتمان: یانی: هەر شتێك مرۆڤ پێویستیی پێی بێ و لێی بەهرەمەند بێ، (**كُلُّ مَا يَنْتَفِعُ بِهِ الإِنْسَان**)، ئنجا خواردن و خواردنەوەیە، بەرگ و پۆشاكە، جێگاو ڕێگایە، كەل و پەل پێداویستییەكانن، هەموویان دەگرێتەوە.

وشەی (**رِزْقاً**)، كە بە نەزانراو (**نَكِرَة**) هاتوە، بۆ بە مەزنگرتن و قەبەكردن (**تَعْظِيْم وتَفْخِيْم**)ە، واتە: بژیوێك و حاڵێكی بۆ دەڕەخسێنێ، بە ئاسانیی وەسف و پێناسە ناكرێ، هێندە مەزنە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: كە دەفەرموێ: ﴿ رَّسُولًا يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ ﴾، مەبەست لە: (**رَسُولًا**)، جبیریلە، بەڵام بێگومان ئەوە ڕایەكی بێهێزەو ئاماژەم پێكرد بۆ ئەوەی بزانرێ، (**رَسُولًا**)، واتە: پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئایەتەكان دەخوێنێتەوە، بەڵێ جبیریل ئایەتەكانی بەسەر پێغەمبەردا خوێندوونەوە و، وشەكانی:

أ- (**نزل**): ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ ﴾**الشعراء**، ب- (**علَّم**): ﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴾النجم، بۆ (جبریل) بەكارهاتوون، شایانی گوتنە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (إبراهیم)دا، لە كاتی تەفسیركردنی ئەو ئایەتە موبارەكانەدا كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ

ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾﴾، لەوێ چەمك و واتای دەرهێنانی خەڵك لە تاریكاییان بەرەو ڕۆشنایی، كە تاریكاییان (**ظلمات**) بە كۆ هاتوەو ڕۆشنایی (نور) بە تاك هاتوە، لەوێ بە درێژیی باسمان كردوەو لە چەند شوێنی دیكەش دا، بۆیە لێرە نایەینە سەر تەفصیڵ و وردەكارییەكانی ئەو واتایە.

چونكە كە خوا دەفەرموێ: لە تاریكاییان دەریان دێنێ، واتە: لە تاریكاییەكان، چ پەیوەندییان بە لایەنی بووناسییەوە هەبێ، چ بە لایەنی فیكرییەوە، چ بە لایەنی خێزانییەوە، چ بە لایەنی پەرستشەكانەوە، چ بە لایەنی ڕەوشت و ئاكارەوە، چ بە لایەنی كۆمەڵایەتییەوە، چ لایەنی سیاسەت و حوكم و ئیدارەوە، چ بە لایەنی گوزەران و ئابوورییەوە هەبێ، هەمووی دەگرێتەوە لە هەموو تاریكاییەكان دەریاندێنێ بەرەو ڕۆشنایی، ڕۆشنایی و هیدایەتی خواو بەرنامەی خوا، ئەو هەقەی لە ئایین و بەرنامەی خوادا بەرجەستەیە.

**مەسەلەی دووەم و کۆتایی:**

**ڕوونکردنـەوەی ئـەو ڕاستییە کـە خـوا ﷻ حـەوت ئاسـمانی هێناونـە دی و، لـە زەویـش وێنـەی وانی خوڵقانـدوون، تاکـو خەڵـك بزانـێ: خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێك بـە توانایـەو، بـە هەمـوو شـتێکیش زانایـە:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾، خوا ﷻ ئەو زاتەیە (ئەو کەسەیە) حەوت ئاسمانی هێناونە دی، (**أَللَّهُ**)، یانی: (**هُوَ اللَّهُ**)، (**أَللَّهُ**) دەبێتە گوزارە (**خَبَر**) بۆ نیهاد (**مُبْتَدأ**)ێکی قرتێنراو، یانی: ئەو خوایەی باسکرا، ئەو خوایەیە کە حەوت ئاسمانی هێناونە دی، ئایا ئەو حەوت ئاسمانانە چۆنن؟ بە دڵنیایی ئەو حەوت ئاسمانانە لەسەر یەکن، وەك خوای بەرزو مەزن لە سوورەتی (نوح)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْاْ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿١٥﴾ ﴾، ئایا نابینن چۆن خوا حەوت ئاسمانی چین چینی هێناونە دی! هەروەها لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، کە پێشتر تەفسیرمان کردوە: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، بە دڵنیایی لە سەرووی ئێوەوە حەوت چینمان خوڵقاندوون و، ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێئاگا نین، هەروەها لە سوورەتی (**الملك**)یشدا، هەمان تەعبیر دووبارە بۆتەوە: ﴿ خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿٣﴾ ﴾.

٢)- ﴿ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ ﴾، لە زەویشدا وێنەی ئەو حەوت ئاسمانەی هێناونە دی.

ئنجا وێنـەی ئـەو حـەوت ئاسـمانە، ئایـا وەك چۆن ئاسـمانەکان هـەر حەوتیـان چیــن لەســەر چینــن و، لەســەر یەکــن، زەوییەکانیــش هــەروان؟ ئــەوەی ئێمــە دەیزانیــن زەوی تەنیــا یــەك زەوییــە، ئنجــا ئایــا:

أ- مەبەست پێی شوێنەکانی دیکەیەو، حەوت زەوی دیکەی، وەك هی ئێمە هەن؟.

ب- یان مەبەست پێی حەوت چینەکانی زەویین؟

ج- یان مەبەست پێی ئەوەیە زەوی دەبێتە حـــەوت بـــەش، واتـــە: مەبەست پێی کیشوەرەکانە؟.

د- یاخود مەبەست پێی ئەوەیە کە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (مِنْ)، لە: ﴿ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ ﴾دا، زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە (**أي: خَلَقَ سَبْعَ سَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ، مِثْلَهُنَّ**)، واتە: وەك چۆن حەوت ئاسمانی دروست کردوون، زەویشی دروست کردوە، وەك وان و (**مِنْ**)، زیادکراوە بۆ جەختکردنەوە؟.

ه- هەندێکیش دەڵێن: (**مِنْ**)، لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەیە (**مِنْ للبيان**)، واتە: بە هەمان شێوە زەویشی خوڵقاندوە، وەك حەوت ئاسمانەکان؟.

ئێمە دوایی لە کورتە باسێکدا زیاتر ئەو بابەتە ڕوون دەکەینەوە.

٣)- ﴿ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ ﴾، فەرمان بە نێویاندا دادەبەزێ.

مەبەسـت لـە (**أمـر**) دەگونجـێ (**الأمـر التكوينـي**)، فەرمـانی دروسـتکردنی خـوا بـێ، یاخـود مەبەسـت پێـی (**الأَمْـر التَّشْرِيعـي**)، فەرمـانی بەرنامەیـی خـوا بـێ، یـان هەردووکیـان وێکـڕا.

٤)- ﴿ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴾، تاکو بابزانن کە خوا لەسەر هەموو شتێك توانایە، هەروەها کە خوا بە زانیاریی دەوری هەموو شتێکی داوە، ئەم (ل)ە، بە مانای: (لكي)، (بۆ ئەوەی)یە، ئەم ڕستەیەش لێرەدا دوو واتایان دەگەیەنێ: یەکەم واتە: حیکمەتی دروستکرانی حەوت ئاسمانەکان و زەوی، (**العَالَمِيْنِ العُلْوِيِّ وَالسُّفْلِيِّ**)، ئەوەیە کە خەڵك توانای خوا بزانێ و زانیاریی خوا بزانێ.

دووەم: یاخـود لێـرەدا (ل)ی (**لِتَعْلَمُـوا**)، واتـە، خـوا ﷻ ئـەوەی بـۆ ڕوونکردنـەوە، تاکـو بزانـن، واتـە: بۆیـە خـوا ئـەوەی پـێ فەرمـوون، تاکـو بزانـن کـە خـوا ﷻ

لەسـەر هەمـوو شـتێك بەتوانایـەو، بـە هەمـوو شـتێکیش زانایـە، واتـە: (ل)ەکـە ناچێتـەوە بـۆ دروسـتکردنی حـەوت ئاسـمانەکان و زەوی، بەڵکـو دەچێتـەوە بـۆ ئـەوە کـە خـوا ئـەوەی بـۆ ڕوونکردنـەوە، تاکـو زانیارییتـان پەیدابـێ، بـە زانیاریـی بـێ سـنووری خـواو، توانـای بـێ سـنووری خـوای توانـاو زانـاو شـارەزا.

## کورتە باسێک لە بارەی حەوت ئاسمانەکان و زەوییەوە

بەڕێـــزان!

ئـەم کورتـە باسـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئایەتـی کۆتایـی سـووڕەتی (**الطلاق**)، ئایەتـی ژمـارە (١٢)دا دەکەیـن، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا ﴿١٢﴾ ﴾، ڕاسـتە مانایەکەشـی ئاوایـە: خـوا ئـەو کەسـەیە کـە حـەوت ئاسـمانەکانی هێناونـە دی و، لەزەویشـدا وێنـەی وان، فەرمـان بـە نێویـان دا دێتەخـوار، بـۆ ئەوەی بزانـن خـوا لەسـەر هەمـوو شـتێك بـە توانایـەو، خـوا بـە زانیاریـی دەوری هەمـوو شـتێکی داوە.

لە چوار بڕگەدا ئەم کورتە باسە دەخەینەڕوو:

**بڕگـەی یەکـەم :** حـەوت ئاسـمانەکان: ئـەوە کـە خـوا ﷻ حـەوت ئاسـمانەکانی هێناونـە دی و ئاسـمانەکان ژمارەیـان حەوتـە، لـە ژمارەیـەك لـە ئایەتەکانـی قوڕئانـدا هاتـوە، مەبەسـتیش لـە حـەوت ئاسـمانەکان، کـۆی ئـەو دروسـتکراوانەیە، کـە خـوا خوڵقاندوونـی، چونکـە زەوییـش هـەر دەکەوێتـەوە نێـو حـەوت ئاسـمانەکان.

شایانی باسیشە: خوا ﷻ:

أ- ﴿ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ﴾ (حەوت ئاسمانەکان)ی بەکارهێناوە.

**ب**- (**السَّمَاء**): (ئاسمان)ی بەکارهێناوە.

**ج**- (**سَمَاوَات**): (ئاسمانەکان)یشی، بەکارهێناوە.

**أ**- وشەی (**السَّمَاء**): ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٧﴾ ﴾**الرحمن**، ئاسمانی بەرز کردۆتەوەو تەرازووی داناوە.

**ب**- (**السموات**): ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ﴿١٠﴾ ﴾لقمان، واتە: ئاسمانەکانی بە بێ کۆڵەکە بیندراوەکان (یان بەبێ کۆڵەکە وەك دەیبینن) هێناونە دی.

**ج**- ﴿ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ ﴾ وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ ﴾، لە سووڕەتی (**مؤمنون**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، (**طَرَائِق**)، کۆی (**طَرِيْقة**)یە، کە ئەویش هەندێك لە زانایان دەڵێن: بە مانای چین (**طبقة**)ەو، هەندێك دەڵێن: بە مانای ڕێگاوبانە، هەروەها لە سووڕەتی (**الملك**)دا، دەفەرموێ: ﴿ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا ﴿٣﴾ ﴾، (**طِبَاق**)، کۆی (**طبقة**)یە، واتە: چین بە چین و، هەروەها لە سووڕەتی (**نوح**)یشدا، بە هەمان شێوە، ئەو تەعبیرە هاتوە.

هەموو ئەو تەعبیرانەش، مەبەست پێیان کۆی دروستکراوەکانی خوای بەرزی مەزنە، جگە لە عەڕش و، (**سدرة المنتهى**) و، بەهەشت و، دۆزەخ.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا ئێمە دەزانین حەوت ئاسمانەکان چین و چۆنن؟ بە دڵنیاییی نەخێر، بەڵام بۆچی خوا باسیان دەکات؟ دەڵێین: خوای پەروەردگار بۆیە باسیان دەکات، تاکو بە گشتیی بزانن موڵکی خوا زۆر فراوانە، چونکە خوا ﷻ هەم لە سووڕەتی (**الملك**)دا، هەم لە سووڕەتی (**فصلت**)دا، ئەو تەعبیرە بەکاردێنێ، لە سووڕەتی (**الملك**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴿٥﴾ ﴾، ئێمە ئاسمانی نیزیکترمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، (**مَصَابِيح**)، کۆی (**مِصْبَاح**)ە، هیچ گومانی تێدانیە کە مەبەست لە (**مَصَابِيح**)، ئەستێرەکانە: ﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ ﴾

الملك، لـه سـوورەتی (**فصلت**)یشـدا، هەمـان تەعبیـر، بـەڵام بـە تۆزێـك جیاوازییـەوە هاتـوە، خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ﴿١٢﴾ ﴾، واتـە: خـوا لـە دوو ڕۆژان (دوو قۆناغـان) دا حـەوت ئاسـمانی هێنانـە دی و، هـەر ئاسـمانێك كاری خـۆی تێـدا سرووشـكردو، ئاسـمانی نیزیكترمـان بـە چرایـان ڕازاندۆتـەوەو بـۆ پاراستنیشـی، واتـە: ئەسـتێرەكان وێـڕای جوانیـی بـۆ ئـەو ئاسـمانەی نیزیكـترە لـە زەوی، ئەركێكـی دیكەشـیان هەیـە، كـە بریتیـە لـە پاراسـتن، ئـەو پاراسـتنەش لـە سـوورەتی (**ملـك**)دا، ڕوونـی دەكاتـەوە كـە بریتیـە لەچـی؟ ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ﴿٥﴾ ﴾الملـك، ئەسـتێرەكانمان كـردوون بـە[1] مایـەی تیربارانیـش بـۆ شـەیتانەكان، كەواتـە: پاراسـتنەكەش هـەر لـە شـەیتانەكانە، هـەروەك لـە شـوێنی دیكەشـدا هاتـوە، بۆیـە ئێمـە لـەو بـارەوە لـە ڕابـردوودا، هـەم لـە سـوورەتی (**حجـر**)داو، هـەم لـە سـوورەتی (**الشعراء**)دا، هـەم لـە سـوورەتی (**الصافـات**[2])دا، كورتـە باسـمان كـردوون، كەواتـە: ئـەو حـەوت ئاسـمانانەی كـە خـوای بـەرزو مـەزن باسـیان دەكات، بـە لای كەمـەوە، لـە دوو شـوێنی قورئانـدا، خـوا دەفەرمـوێ: ئاسـمانی نیزیكترمـان لـەو حـەوت ئاسـمانانە، بـە چرایـان ڕازاندۆتـەوە، ئـەو ئاسـمانەی نیزیكـترە، نزیكـترە لـە كـێ؟ خـوای پـەروەردگار ئێمـە دەدوێنـی، یـانی: نیزیكـترە لـە ئێمـەوە، چونكـە (**دنیـا**) یانـی: نزیكـتر (**السَّمَاء الدُّنْيا**)، واتـە: ئاسـمانی نیزیكـتر، (**الدُّنيا مؤنَّـث الأدنى**)، (**الأدنى: الأقـرب**) نیزیكـتر، ئنجـا بـە نسـبەت ئێمەوە ئـەو ئاسـمانەی ئەسـتێرەی لـێ دەبینرێن، دەبـێ هەمـووی ئاسـمانی یەكـەم بـێ و ،هەرچـی ئەسـتێرەیەو كەهكەشـانە دەبـێ هەموویـان لـە سـنووری ئاسـمانی یەكـەم و نیزیكـتر لـە ئێمـەدا بـن.

---

(١) (رُجُوم) كۆی (رَجم)ە، ئەویش بەردەیە كە دەهاویشترێ.

(٢) لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الجـن**) باسـێكی چڕوپڕمـان لەبـارەی جند(**جـنّ**) ەوە كـردووە بـە گشتی .

هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن: دەگونجـێ ئـەو ئەسـتێرانە پەیوەندییـان بـە ئاسـمانەکانی دیکەشـەوە هەبـێ، بـەڵام مـن پێـم وایـە ئـەو مانایـە ڕاسـترە، کـە هەرچـی ئەسـتێرەیەو ئەسـتێرەکانی کـە کەهکەشـانەکان پێکدێنـن و، کەهکێشـانەکانیش، کـە گەلـە کەهکێشـانەکان پێـك دێنـن، ئنجـا هەرچـی ئەسـتێرەیەو کەهکەشـانەو گەلـە کەهکەشـانە، هەمـووی لـە سـنووری ئاسـمانی یەکـەم دایـە، ئنجـا وەك پێشـتریش، چەنـد جارێـك باسـمان کـردوە، تیـرەی ئـەوەی ئێسـتا وشـەی(**کَوْن**) گـەردوون، بوونـەوەر (Universe) ی بـۆ بەکاردەهێـنرێ و لەلایـەن ئێمـەوە دەبیـنرێ بەهـۆی تەلیسـکۆبەکانەوە دەبیـنرێ، واتـە: ئەمسـەرو ئەوسـەری گـەردوون بەنسـبەت ئێمـەی خەڵکـی سـەر زەوییـەوە، مـادام تەمەنـی گـەردوون سـێزدە ملیـارو هەشتسـەد ملیـۆن (١٣،٨٠٠،٠٠٠،٠٠٠) سـاڵی تیشـکییە، بۆیـە دەبـێ ئـەو تەمەنـەی گـەردوون جارانـی ژمـارەی ئـەو کیلۆمەترانـە بکەیـن کـە تیشـک لـە ساڵێکدا دەیانبـڕێ، بەمجۆرە: تیشـک لـە چرکەیەکـدا(٣٠٠ ٠٠٠) کیلۆمەتـر دادەبـڕێ، کەواتـە(٣٠٠ ٠٠٠ × ٦٠ = ١٨ ٠٠٠ ٠٠٠) کلـم، لـە خولەکێکـدا، ئنجـا: (١٨ ٠٠٠ ٠٠٠×٦٠ = ١ ٠٨٠ ٠٠٠ ٠٠٠) ملیارێـک و هەشـتا مللیـۆن کلـم، گـە سـەعاتێکدا، ئنجـا: (١ ٠٨٠ ٠٠٠ ٠٠٠ × ٤٢ = ٢٥ ٩٢٠ ٠٠٠ ٠٠٠) بیسـت و پێنـج ملیـار و نۆسـەد و بیسـت ملیـۆن کلـم لـە ڕۆژێکـدا، ئنجـا: (٢٥ ٩٢٠ ٠٠٠ ٠٠٠ × ٣٦٥ = ٩ ٤٦٠ ٥٢٨ ٠٠٠ ٠٠٠) نۆترلیۆن و پێنجسـەد و بیسـت و هەشـت ملیـۆن کلـم، لـە سـاڵێکدا، ئنجـا(٩ ٤٦٠ ٥٢٨ ٠٠٠ × ١٣ ٨ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ =٨,٨ ×١٠) هەشـت پۆینـت هەشـت جارانـی دە تـوان بیسـت و سـێ کیلـۆ مەتـر، یانـی هەشـتاو هەشـت ملیـۆن ملیـۆن ملیـۆن کیلۆمەتـر تیـرەی گەردوونـە[1]. واتـە: تیشـك بـە سـێزدە ملیـار و حەوتسـەد، یـان هەشتسـەد ملیـۆن سـاڵ، ئەمسـەرو ئەوسـەری ئـەو گەردوونـە دەکات، کـە ئێمـە دەیبینیـن، ئـەوەش هەمـووی ئاسـمانی یەکەمـە، ئەویـش بـەس خـوا ﷻ دەزانـێ سـنوورەکەی لـە کـوێ کۆتایـی دێ، چونکـە تاکـو ئێسـتا هیـچ زانایەکـی گەردووننـاس نەیگوتـوە، دوای ئـەو ئەسـتێرانە، ئـەو کەهکەشـانانە،

---

(١) بـۆ وردەکاری زیاتـر لـە بـارەی گەردوونـەوە بڕوانـە: تەفسـیری سـورەتی (الرحـمان) لـە بەرگـی (٢٨) ی ئـەم تەفسـیرەدا، لاپـەڕە:٥٣٤-٥٣٦، چاپـی یەکـەم.

ئـەو گەلەکەهکەشـانانە، گەیشـتووینە سـنووریٚك کـە چیدیکـە نیـەو، ئـەوە سـنووری ئاسـمانی یەکەمـە، نازانیـن ئەویـش لـە کـوێ کۆتایـی دێ، ئنجـا لەسـەرووی ئـەوەوە دەبـێ، شـەش ئاسـمانی دیکـە هەبـن،

مانـای وایـە هەرچـی ئەسـتێرەیەو مایـەی جوانییـە، لـە ئاسـمانی سـەرووی ئێمـەوە، کـە نیزیکتریـن ئاسـمانە لـە زەوییـەوە، هەمـووی لـە سـنووری ئاسـمانی یەکەمدایـەو، مـەرج نیـە، شـەش ئاسـمانەکانی دیکـە، بـەم شـێوەیە بـن و خاوەنـی ئـەو ئەسـتێرانە بـن، بـەس خـوا دەزانـێ ئـەوان چۆنـن؟ ئـەوە بەنسـبەت حـەوت ئاسـمانەکان (سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ)ەوە.

کەواتـە: ژمـارەی حـەوت ویسـتراوە (**مقصود**)ە، ئـەوە ڕاسـت نیـە کـە هەندێـك لـە زانایـان، بـۆ وێنـە: (**إبـن عاشـور**) ڕایەکـی وای هەیـە لـە (**التحریـر والتنویـر**) دا، هەروەهـا (دکتـور **محمـد راتـب النابلسي**)، لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا هـەر بـە نـاوی (**تفسیر النابلسي**)[1]، دەڵێـن: مەبەسـت پێـی ژمـارە حـەوت نیـەو ژمارەیەکـی دیارییکـراو نیـە، بەڵکـو مەبەسـت پێـی زۆرییـە، دەڵێـن: بەڵـێ جـاری وا هەیـە، عـەرەب ژمارەیەکیـان هێنـاوە مەبەسـت پێـی زۆریـی بـووە، وەك حەفتـا، کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۝٨٠﴾ **التوبـة**، ئایـا ئەگـەر بیکاتـە حەفتـاو یـەك خـوا لێیـان خـۆش دەبـێ؟ بـە دڵنیایـی نەخێـر، بـەڵام ئـەوە بـۆ زۆرییـەو دیـارە، بـەڵام وشـەی حـەوت، وانیـە، چونکـە حەفتـا جـار (**سَبْعِيْن مـرّة**)، بـەس لەوێـدا هاتـوە، لـە سـوورەتی (**التوبـة**)دا، ئەگـەر حەفتـا جـار داوای لێبوردنیـان بـۆ لـە خـوا بکـەی، خـوا لێیـان خـۆش نابـێ لـە مونافیقـەکان، وەك کاتـی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی تەوبـەدا باسـمان کـردوە، مەبەسـت ئـەوە نیـە، ئەگـەر ببێتـە حەفتـاو یـەك و حەفتـاو دوو جـار، خـوا لێیـان خـۆش دەبـێ، واتـە: هەرچەنـدە زۆر داوای لێبوردنیـان بـۆ لـە خـوا بکـەی، خـوا هـەر لێیـان خـۆش نابـێ، تەنیـا لـە یـەك شـوێندا ئـەوە هاتـوە، بـەڵام لێـرەدا کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ نـە شـوێنێکەو نـە دووەو نـە سـێیەو نـە چـوارە، مانـای وایـە، ڕێـك ژمـارەی

---

(١) ج٩، ص٣٨٨.

ئاسمانەکان حەوتە، ئنجا بەڵێ تاکو ئێستا زانست ئەوەی بۆ بە دیار نەکەوتوە، بەڵام زانست زۆر شتی دیکەشی بۆ دەرنەکەوتوە، کەواتە: ئەو ڕایەی **(ابن عاشور)**، و **(د.محمد راتب النابلسي)** و **(الطنطاوي)** و هەندێك لە تەفسیرەکانی دیکەش هێناویانە، کە گوتوویانە: مەرج نیە، ئاسمانەکان حەوت بن، لەوانەیە سەدان ئاسمان هەبن! ئەو ڕایە، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، بەڵکو وەك خوا لە قورئان دا فەرموویەتی: ئاسمانەکان حەوتن و سەرەتا: ئاسمانی نیزیکتر کە ئاسمانی یەکەمە بە نسبەت ئێمەوە، دوایی شەش ئاسمانەکەی دیکەو بەرەو سەر دەچین، ئنجا ئاسمانیی نزیکتر لە ئێمەی خەڵکی سەر زەوی، بە ئەستێران ڕازاوەتەوە، کەواتە: هەرچی ئەستێرەو کەهکەشانەو، گەلە کەهکەشانە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دایە، ئنجا تەنیا خوا ﷻ دەزانێ ئەویش سنوورەکەی لە کوێ کۆتایی پێ دێ و، لە کوێوە سنووری شەش ئاسمانەکەی دیکە «هی هەر کامیان» دەست پێ دەکات و کۆتایی دێ؟!.

**برگەی دووەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾، لە زەویشدا وێنەی ئەو حەوت ئاسمانانە، پێشتریش باسمان کرد، کە هەندێك لە زانایان بە چەند جۆرێك تەئویل و مانایان بۆ کردوە، بۆ نموونە:

١- هەندێکیان گوتوویانە: **(مِنْ)** لە: ﴿وَمِنَ ٱلْأَرْضِ﴾دا، لێرەدا لە ڕووی ڕێزمانەوە بۆ جەختکردنەوە زیادکراوە، واتە: **(خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَالْأَرْضَ مِثْلَهُن)**، خوا حەوت ئاسمانی دروستکردوون و، زەویش وەك وان، دروستکراوە.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: **(مِنْ)**: **(بَيَانِيّة)**یە، بۆ ڕوونکردنەوەیە، کە مانایەکەی لە هی پێشێ نیزیکە.

٣- مانایەك کە زیاتر دێتە زەینەوەو زۆربەی زانایانیش تەبەننییان کردوە، ئەوەیە کە لێرەدا مەبەست چواندن و تەشبیهکردنی زەوییە، بە حەوت ئاسمانەکانەوە لە ڕووی ژمارەوە، واتە: زەویش حەوتن، ئەو حەوتەش زانایان سێ ڕای سەرەکییان، تاکو ئێستا لەو بارەوە هەڵبژاردوون، دوای ئەوەی سەرنجی تەفسیرەکانم دا:

**١-** حەوت خڕۆکەی زەوی هەن، وەك چۆن حەوت چینی ئاسمان هەن، بەڵام ئایا ئەو حەوت خڕۆکەی زەوییە، لە کوێن؟ یەکیان ئەوە زەوی ئێمەیەو، لەو کەهکەشانەکەی ئێمەدایە، یانی: (ڕێی کاکێشان)، بەڵام ئایا شەش زەوییەکەی دیکە لە کوێن؟ تاکو ئێستا هیچی لێ نازانین!.

**٢-** مەبەست پێی حەوت چینەکەی زەوییە، چونکە بۆ ئاسمانەکان خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (**سبع طَرَائِق**)، (**طِبَاقًا**)، کە (**سبع طرائق**) لە (**المؤمنون**)داو، (**طباقاً**)ش هەم لە سووڕەتی (**الملك**)و هەم لە سووڕەتی (**نوح**)دا، هاتوە، (**طرائق**) کۆی (**طريقة**)یە، واتە: (چین)، (**طباقاً**)یش، بریتیە لەوەی چەند شتێك لەسەر یەکدی بن و هێندەی یەکدیین.

دەڵێن: مەبەست لە (وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ) حەوت چینەکانی زەوییە، کە ئێستا زانایانی زەویناسیی (جیۆلۆجیا)، وەك پێشتریش باسمان کردوە، چینەکانی زەوییان بۆ حەوت چینان دابەشکردوون: کرۆکی زەوی، کە هەمووی ماددەی ئاسنی زۆر ڕەق و پۆڵاو کانزا زۆر ڕەق و پتەوەکانە، ئنجا دوای ئەو چینێکی دیکە، کە هەمووی ئاسن و کانزای تواوەیە، ئنجا چینێکی دیکەو، چینێکی دیکە... تاکو ئەم چینە خاکییەی خۆمان، لەگەڵ ئاوی دەریاو ئۆقیانووسەکان، زانایان ئاوا دابەشیان کردوە بۆ حەوت چین، واتە: وەك چۆن ئاسمانەکان حەوت تەبەقەو چینن لەسەر یەك، زەوییش حەوت چینە.

**٣-** مەبەست پێی ئەوەیە: وەك چۆن ئاسمانەکان حەوتن، خڕۆکەی زەوییش وشکانییەکەی حەوت بەشە، کە بە چەند شێوەیەك دابەشیان کردوون:

### أ- دابەشکردنی یەکەم:

**١-** کیشوەری ئاسیا.

**٢-** کیشوەری ئەورووپا.

٣- کیشوەری ئوستوڕالیا.

٤- کیشوەری ئەمریکای سەروو و ئەمریکای خواروو.

٥- کیشوەری ئەفریقیا.

٦- بەستەڵەکی سەرووی دنیا.

٧- بەستەڵەکی خوارووی دنیا.

**ب- دابەشکردنی دووەم:**

هەندێکی دیکە ئاوایان دابەشکردوە، دەڵێن:

**١و٢:** بەستەڵەکی سەروو، لەگەڵ بەستەڵەکی خواروو ئەوە دووان.

**٣و٤-** دوو ناوچەی میانجیی (**مُعْتَدِل**)، واتە: دوو ناوچەی لە ڕووی گەرماو سەرماوە نێوەندیی.

**٥و٦-** دوو ناوچەی گەرم، لەسەروو و خواروو.

٧- هێڵی یەکسانیی (**خط الإستواء**).

واتە: زەویش وەك چۆن ئاسمانەکان حەوت ئاسمانن، زەوییش حەوت بەشە، ئەو زەوییە وشکانییەی مرۆڤ دەگونجێ لەسەری بژی، بە شێوەیەك لە شێوەکان، ئەوانیش حەوت بەشن.

هەڵبەتە لەو مانایانەشدا زیاتر مانای دووەمم بە دڵە، کە مەبەست لە زەوییەکان حەوت چینەکانی زەوی بێ، ئەویش لە بەر هەندێك شت کە دوایی باسیان دەکەم.

**بڕگـەی سـێیەم:** لـە فەرمایشـتی پێغەمبەریشـدا ﷺ لـە بـارەی زەویـی و حـەوت چینەکانــی زەوی و، حــەوت زەوییەکانــەوە، چەنــد ئاماژەیــەك هــەن، ئێمــە دوو فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەو بـارەوە دێنیـن:

**یەکەم:** {كَانَ ﷺ إِذَا رَأَى قَرْيَةً أو مَدِيْنَةً قَالَ: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظْلَلْنَ، وَرَبَّ الْأَرَضِينَ السَّبْعِ وَمَا أَقْلَلْنَ، وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أَضْلَلْنَ، وَرَبَّ الرِّيَاحِ وَمَا أَذْرَيْنَ، إِنَّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ، وَخَيْرَ أَهْلِهَا، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ أَهْلِهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا}، (أخرجه ابن خُزيمة: ٢٥٦٥، وابْنُ حِبَّان: ٢٧٠٩، قَال شعيب الأرنؤوط: إسنادهُ حَسَن، والحاكم في المستدرك: ١٦٣٤، والبيهقي فِي الكبرى: ١٠١٠٠، والنسائي في الكبرى: ٨٨٢٦، والضياء المقدسيُّ في المختارة: ٦٩، والطبراني في الكبير: ٩٠٢، وحسنه الألباني لغيره عند ابن خزيمة: ٢٥٦٥).

واتـە: دایـکمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر ئاوەدانییـەك، شـارێکی دەبینـی کاتێـك لـە سـەفەردا بـەرەو ڕووی دەچـوو، ئـەم دوعایـەی دەفەرمـوو: ئـەی خوایـە! پـەروەردگاری حـەوت ئاسـمانەکان و ئـەوەی حـەوت ئاسـمانەکان سـێبەریان لێکـردوەو، پـەروەردگاری حـەوت زەوییـەکان و ئـەوەی حـەوت زەوییـەکان هەڵیانگرتـوەو، پـەروەردگاری شـەیتانەکان و ئـەوەی شـەیتانەکان گومـڕای دەکـەن و، پـەروەردگاری بایـەکان و هەرچـی بایـەکان ڕای دەدەن، داوای خێـرو چاکـەی ئـەم ئاوەدانییـەت لـێ دەکـەم و، خێـرو چاکـەی هـەر کەسـێك کـە لـەو ئاوەدانییـە دایـە و پەنـات پێدەگـرم لـە خراپـەی ئـەو ئاوەدانییـەو، لـە خراپـەی کەسـانێك کـە لـەم ئاوەدانییـەدا هـەن، خراپـەی هەرچـی تێیدایـە.

کەواتـە: وەك چـۆن حـەوت ئاسـمانەکان سـێبەر دەکـەن، حـەوت زەوییەکانیـش هەڵدەگـرن، هەرچەنـدە ئەمـە زیاتـر ڕای یەکـەم بەهێـز دەکات و دەبـێ حـەوت خڕۆکـەی زەوی هەبـن.

بـەڵام دەشـگونجێ بڵێیـن: مەبەسـت حـەوت چینەکـەی زەوی و، هـەر شـتێکە کـە لەسـەر ئـەو حـەوت چینـەی زەوی هەڵگیـراوە.

**فەرمایشتی دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ ظَلَمَ قِيدَ شِبْرٍ مِنَ الأَرْضِ، طُوِّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ} (أخرجه البخاري: ٢٣٢١، ومسلم: ١٦١٢)،

واتە: هەر کەسێك بستێك زەوی داگیر بکات بە ستەم، (خوا لە قیامەتدا) بە حەوت زەوییان دا دەیباتە خوار، زیاتر ئەو ڕایە زاڵ دەکات، کە مەبەست لە حەوت زەوی، حەوت چینەکانی زەوی بێ، ئەمەش چونکە خوای پەروەردگار کەسێك بە حەوت زەوییان دا بەرێتە خوار، واتە: حەوت چین، چینەکانی زەوی، دەبێ هەموویان لەسەر یەك بن، هەرچەندە ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموێ، جاری وا هەیە بۆ تێگەیاندنی ئێمەیە، واتە: خوا سزایەکی سەختی دەدات، وەك چۆن کەسێك بە زەویدا دەچێتە خوار، بەو شێوەیە.

### بڕگەی چوارەم و کۆتایی:

مەرج نیە بەو ئەندازەیەی هەتا ئێستا زانیاریی مرۆڤ پێی گەیشتوە، چییەتی ئاسمانەکان بزانین و، بزانین چۆن چۆنی ئاسمانەکان حەوتن؟ بەڵام بەپێی ئایەتەکان کە دەفەرموون: ئاسمانی نیزیکترمان بە چرایان ڕازاندوەتەوە، دەڵێین: هەرچی ئەستێرەیە دەبێ لە سنووری ئاسمانی یەکەمدا بێ، ئنجا لە سەرووی ئەوەوە شەش ئاسمانی دیکەش هەبن، بەڵام ئایا ئاسمانی یەکەم سنوورەکەی بۆ ئێمە دیارە؟ سنووری هیچ کام لە شەشەکانی دیکە دیارە؟ بە دڵنیایی نەخێر، بەڵام ئایا بەچی دەزانین ئاوان؟

**یەکەم:** خوای پەنهانزان لە چەند ئایەتێکدا دەفەرموێ: حەوت ئاسمانن.

**دووەم:** بەسەرهاتی شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ: **(الإسراء و العروج لرسول الله)**، وەك لە تەفسیری سووڕەتی **(الإسراء)**دا، بە تەفصیلْ باسمان کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ باس دەکات کە کاتێك کە بەرز دەبێتەوە لەگەڵ جیبریلداو، دەگەنە دەروازەی ئاسمانی یەکەم، «کە بەپێی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو ئاسمانەکان دەروازەیان هەیە» کە دەگەنە دەروازەکە سڵاو دەکەن و، ئەو دەروازەیە ئێشکچیی هەن، لە فریشتەکان

و، دەپرسن کێیە؟ جیبریل دەڵێ: منم، دەڵێن: کێت لەگەڵدایە؟ دەڵێ: موحەممەد ﷺ، فریشتەکان دەپرسن: ئایا کراوە بە پێغەمبەر؟ دەڵێ: بەڵێ کراوە بە پێغەمبەرو وەحیی بۆ هاتوە، ئنجا سڵاوی لێ دەکەن و دەرگای ئاسمانی یەکەمیان بۆ دەکەنەوە، هەروەها ئاسمانەکانی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، ئنجا لە سەرووی ئەوەشەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەگاتە ئەو شوێنەی خوا مەبەستیەتی.

ئنجا بەپێی ئەو فەرموودەیە، ئەو حەوت ئاسمانانە چین چین لەسەر یەکن و دەروازەشیان هەیەو، پێغەمبەری خواش ﷺ هەموو ئەو دەروازانەی حەوت ئاسمانەکانی بۆ کراونەوە، هەروەها باسی پێغەمبەرانیش دەکات، بۆ وێنە ئادەم لە ئاسمانی یەکەمە، عیسا و یەحیا عليهما السلام لە ئاسمانی دووەمن و، یەکێك لە ئاسمانی سێیەمەو...، هەروەها هەتا ئیبراهیم کە لە ئاسمانی حەوتەمە.

هەڵبەتە مەبەست لە لەوێ بوونیان، لەوێ بوونی جەستەیی نیەو، لەوێ بوونی مەعنەویی و ڕووحییە، لە عالەمی بەرزەخدا کە جارێ ئێمە بە وردیی نازانین چۆنە؟!

(**سید قطب**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: ئێمە بە تەواویی نە حەوت ئاسمانەکان دەزانین چین، نە زەوییش چییەتەکەی و بە تەواویی بۆ ئێمە زانراوە.

بەڵام خوا تعالى کە باسی حەوت ئاسمانەکان دەکات بۆ ئەوەیە ئێمە بەگشتیی بزانین موڵکی خوا زۆر فراوانە، هەڵبەتە کاتی خۆی کە زانستی گەردوونناسیی و فیزیاش هێندە بەرەو پێش نەچووە، بەڵام بە گشتیی زانیویانە، گەردوون زۆر فراوانە، بە تایبەتی بەهۆی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ، کە زۆر جار تیشکی بۆ خستوونە سەر هەندێك چەمك و واتای ئایەتەکان، بە تایبەت کە باسی شەوڕۆو بەرز بوونەوەی خۆی کردوە، کە سواری بوڕاق بووەو بوڕاق

---

(١) في ظلال القرآن: ج٦، ص٣٦٠٦.

(**يَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى بَصَرِهِ**)، وڵاخێك بووە سمی داناوە لە لای ئەو پەڕی مەودای چاوی، واتە: هەتا چاو بڕ دەكات، هەر خواش دەزانێ چاوی بوڕاق تاكو كوێ بڕ دەكات، بوڕاق هەر هەنگاوێكی بە ئەندازەی چەشمەندازێك بووە، مەبەست ئەوەیە، كە بزانین پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە خێرایی بەرز بووەتەوەو زۆر خێراتر لە خێرایی تیشك، چونكە بە خێرایی تیشكیش كە سێسەد هەزار (٣٠٠،٠٠٠) كیلۆمەتر لە چركەیەكدا دەبڕێ، ئنجا بۆ دەرچوون لە سنووری كەهكەشانی (كاكێشان) چەند ملیۆن ساڵی دەوێ، چ جای دەرچوون لە سنووری ئاسمانی یەكەم و، هەموو ئاسمانەكان! كەواتە: خێراییەكەی بۆڕاق لە خێرایی تیشك (**سرعة الضوء**) زۆر زۆر زیاتر بووە، ئنجا ئایا جەستەی مرۆڤ تەحەممولی ئەو هەموو خێراییە دەكات بەفەزادا بڕوا؟ بێگومان نەخێر، بۆیە سەفەرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ موعجیزەیەك بووە، یاسادڕێك بووە، نابێ بەپێی ئەو یاسا فیزیایی و گەردوونییانەی ئێستا مرۆڤ بۆ دەركەوتوون، ئەو سەفەرەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەفسیرو شیی بكرێتەوە، چونكە بە ڕۆیشتنی خێرایی زۆر كەمتر لە هی تیشكیش، مرۆڤ هەپڕوون بە هەپڕوون دەبێ، چ جای خێرایی تیشك و، چ جای خێراییەك كە زیاتر بێ لە خێرایی تیشك!!

بۆیە قسەكەی (**سید قطب**)، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، زۆر جوانە كە دەڵێ: ئێمە بە تەواویی نازانین نە ئاسمانەكان حەوت ئاسمانەكان چین و، نە زەوییش و، خوا ﷻ مەبەستی گشتیی لە باسی ئاسمانەكان و گەردوون و ئەوەی لەو بارەوە دەیفەرموێ، ئەوەیە كە ئێمە لە فراوانیی موڵكی خوای پەروەردگار حاڵیی بین و ئەو ئامانجەش هاتۆتە دی، ئێستا ئێمە دەزانین موڵكی خوا یەكجار فراوانە بە تایبەت لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا لەم سەدەی پازدەیەمی كۆچیی و سەدەی بیست و یەكەمی زاینییدا، كە دەزانین ئەم گەردوونە پانتاییەكی یەكجار فراوانە، ئەوەندەی كە تائێستا هاتووەتە بەر چاوی تەلیسكۆبەكانی كە مرۆڤ دروستی كردوون.

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوەو دەڵێین: خوایە! بە لوتف و کەرەمی خۆت عەقڵ و دڵمان بە ڕووناکیی وەحیی خۆت ڕۆشنتر بکەوەو، لە فەرمایشتی خۆت زیاتر حاڵییمان بکە، لە دروستکراوەکانی خۆشتدا بەرچاو ڕوونترمان بکە، تاکو زیاتر بزانین چیت دروستکردوە، هەروەها یارمەتییشمان بدە، بزانین چیت فەرمووەو چۆنت فەرمووە! بێگومان خوا دوو کتێبی خستوونە بەر دەستی ئێمە، یەکەم: کتێبی خوێنراوەی قورئان، دووەم: کتێبی بینراوی گەردوون، ئنجا هەتا ئێمە لەو دوو کتێبەی خوا شارەزاتر بین و پێیان زاناتر بین، هەم بە بێژەری قورئانەکە کە خوای بەرزە، ئاشناتر دەبن و، هەم بە بەدیهێنەری کتێبی گەردوونیش.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی بەهۆی زانیاریی و شارەزایی زیاتر بەو دوو کتێبەوەیە، لە خۆیمان زیاتر وەنیزیك بخات و، بە خۆیمان زیاتر ئاشنا بکات.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢٢)ی ڕەمەزانـی سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر: (٢٠٢٠/٥/١٥) زایینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوای بەخشـەرو میهرەبـان پشـتیوانمان بـێ، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (التَّحْرِيـم)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (التحريم) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە زیاتـر بـە نـاوی (**سُـورَةُ التَّحْرِيـم**) نـاسراوە، لـەو بـارەوە چەنـد دەقێـك هـەن، بـۆ وێنـە:

{**عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ** ﷺ، **قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ التَّحْرِيـمِ بِالْمَدِينَـةِ**} (**ذَكَـرَهُ السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٢١٣، وَنَسَـبَهُ لابْـن الضريـس والنحّـاس وابْـن مرْدَوَيْـه وَالْبَيْهَقِـيّ**)، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﷺ، گوتوویـەتی: (**سُـورَةُ التَّحْرِيـم**) لـە مەدینـە دابەزیـوە.

بـەڵام وێـڕای ئـەو نـاوە، ئـەم سـوورەتە (**سُـورَةَ النِّسَـاء**)یشی پـێ گوتـراوە، وەك لـەم دەقـەدا هاتـوە:

{**أَخْـرَجَ ابْـنُ مَرْدَوَيْـهِ عَـنِ ابْـنِ الزُّبَيْرِ** ﷺ، **قَـالَ: أُنْزِلَتْ بِالمدِينَة سُـورَة النِّسَـاء:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾}[1]. واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر ﷺ گوتوویـەتی: سـوورەتی (**النِّسَـاء**) لـە مەدینـە دابەزیـوە، کەواتـە: ئـەو نـاوەشی پـێ گوتـراوە.

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص٣٠٢.

هەروەها جگە لەو دوو ناوە، دوو ناوی دیکەشی لێ هەڵداراون، یەکەم: (سُـورة النَّبـي)[١].

دووەم: (سـورَةُ لِـمَ تُحَـرِّمُ)[٢]، بەڵام ئەو سێ ناوە کەمتر بوون و زیاتر ناوی (سُورَةُ التَّحْرِيم)، ئەم سوورەتە موبارەکەی پێ ناسراوە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

(القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[٣]، دەڵێ: (مَدَنِيَّةٌ فـي قَـولِ الجَمِيع) واتە: زانایان لەسەر مەدینەیی بوونی سوورەتی تەحریم یەکدەنگن، هەرچەندە (السيوطي) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (الإتقان فـي علُومِ القُرآن)دا، لە قەتادەوە ڕایەکی دیکەشی هێناوە، گوایە لە مەککە دابەزیوە، بەڵام بەسەرنجدانی نێوەڕۆکی ئاشکرایە کە ئەم سوورەتە مەدینەییە.

بەشێك لە زانایان هەندێك ڕایان هێناون، باش سەرنجیان لێیان نەداوەو لێیان ورد نەبوونەوە، ئەگەرنا سوورەتی تەحریم هەر دیارە کە سوورەتێکی مەدینەییە.

ئەو ڕایەی دیکەش گوتراوە: ئەم سوورەتە سەرەتایەکەی مەدینەییە، دوایی ئەوی دیکەی مەککەییەو، دوای ئەویدیکە دەبێتەوە مەدینەیی! تەماشایان کردوە: ئایا کام ئایەتە لە سوورەتە مەدینەییەکان دا لەگەڵ قورئانی مەککەیی دا دەگونجێ؟ یان کام ئایەتە لە سوورەتە مەککەییەکان، لەگەڵ قورئانی مەدیەنییدا دەگونجێ؟ بەڵام بە دڵنیایی خوا ﷻ ژمارەیەك لەو ڕاستییانەی لە قورئانی مەککەیی دا دایبەزاندوون، لە هی مەدینەییش دا دووبارەی کردوونەوەو،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٨، ص١٣٨.

(٢) التحرير والتنوير ج٢٨، ص٣٤٣.

(٣) ج٢٨، ص١٣٨.

هەندێك شتیش كە لە قورئانی مەدینەیی دابەزیوە، شێوەی ئەوە دەكات كە لە قورئانی مەككەیی دا هەیە، هەندێك ڕاستیی هەن، خوا ﷻ هەم لە مەككە خستوونیە ڕوو، هەم لە مەدینەش.

بۆیە ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوە كە فڵان سووڕەتە، چەند ئایەتێكی تێدان، شێوەی قورئانی مەدینەیی و ناچارمان دەكەن، بڵێین: مەدینەییە، سووڕەتێكی دیكەش لەبەر ئەوەی شێوەی هەندێك ئایەتانیان هەیە كە لە مەككە دابەزیون، بڵێین: ڕەنگە ئەم ئایەتانە مەككەیی بن و لە مەككە دابەزیبن!

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

ژمێرەرانی ئایەتەكانی قورئان، یەكدەنگن كە ژمارەی ئایەتەكانی (**سُورَةُ التَّحْرِیم**)، دوازدە(١٢)ن.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و لە موصحەف دا:

ڕیزبەندیی لە دابەزیندا، ژمارە سەدو پێنج (١٠٥)ە، پێش سووڕەتی (**الجمعة**) و دوای سووڕەتی (**الحجرات**) دابەزیوە، لە موصحەفیشدا ژمارە شەست و شەش (٦٦)ە، یانی: كە لە سووڕەتی (**الفاتحة**)ەوە دێین، لە (٦٦)ەمیندا نۆرە دەگاتە سەر سووڕەتی (**التَّحْرِیم**).

## پێنجەم: نێوەڕۆكی:

ئەم سووڕەتە بۆ سێ تەوەر دابەش بووە:

١- لە پێنج ئایەتی سەرەتادا، ئایەتەكانی: (١ - ٥) باسی ڕووداوێكی خێزانیی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ كراوەو پوختەكەی ئەوەیە:

پێغەمبەری خوا ﷺ بە مەبەستی ڕازییکردنی یەکێك لە هاوسەرەکانی، شتێکی ڕەوای لە خۆی قەدەغە کردوە، خواش ﷻ گلەیی لێکردوەو ڕێنماییشی کردوە، کەفارەتی سوێندەکەی بدات و بگەڕێتەوە سەر ئەو شتەی لە خۆی قەدەغە کردوە، بەو بۆنەیەشەوە خوا سەرزەنشتی دووان لە هاوسەرانی پێغەمبەری خوای کردوە خوا لێیان ڕازی بێ، لەسەر ئازاردانی دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و دواییش بە گشتیی، هەڕەشەی لە هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا (**رضي الله عنهن**) کردوە، کە ئەگەر ئازاری بدەن، خوا ﷻ ئەوان لادەبات و بە ئافرەتانی دیکە دەیانگۆڕێ.

**٢-** ئنجا لە چوار ئایەتەکانی: (٦ - ٩)دا، خوای بەرزو مەزن دوو جاران بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، بڕوادارانی دواندوون و، جارێکیش بێبڕوایان بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ دەدوێنێ و، جارێکیش پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ بە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ﴾ دەدوێنێ، ئنجا هەم بڕواداران خوا چەند شتێکیان پێڕادەگەیەنێ، چەند ڕێنمایی و ئامۆژگارییەك، هەروەها بێبڕوایەکانیش چەند شتێکیان لێ حاڵیی دەکات و، ئەو دواندنەی بێبڕوایەکانیش لە ڕۆژی دوایی و لە قیامەت دایە، بۆیەش خوای بەرز لێرەدا بۆمان باس دەکات، یانی: ئەی بێبڕوایەکان! ئەگەر بە بێبڕوایی بمرن، لە ڕۆژی دوایی دا، ئەو سەرەنجامەتان تووش دەبێ و، خوا ئاوا دەتاندوێنێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۝٧﴾التحريم، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ خوای پەروەردگار دەیدوێنێ و ئەرکێکی گرنگی پێڕادەگەیەنێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ۝٩﴾التحريم.

**٣-** لە سێ ئایەتی کۆتاییشدا، ئایەتەکانی: (١٠، ١١، ١٢)، خوا ﷻ چوار ئافرەتی لە دوو وێناندا بۆ بێبڕوایان و بڕواداران باسکردوون، کە دوو ئافرەتی یەکەم بریتین لە: هاوسەری **لووط** و هاوسەری **نووح** صەڵات و سەلامی خوا لەسەر **لووط و نوح** بێ، ئەو دوو ئافرەتە بە وێنە هێنراونەوە بۆ بێبڕوایەکان، کە ئەی بێبڕواینە! بەتەما مەبن بەهۆی خزمایەتیی و نزیکییەوە، هیچ قازانجێك بکەن، مادام بێ ئیمان بن.

دوو ئافرەتــە بڕوادارەکــەش کــە خــوا بــۆ ئیمانــدارانی بــە وێنــە هێناونــەوە، یەکەمیـان هاوسـەری فیرعەونـە، کـە لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دا نـاوی بـە ئاسیا هاتـوە، (ئاسـیای کچـی موزاحیـم)، دووەمیشـیان مەریەمـی کچـی عیمرانـە، خـوا لـە هەردووکیـان ڕازی بـێ، ئەمـە نێـوەڕۆکی سـووڕەتی (**التَّحْرِيـم**)ە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمــە چــوار تایبەتمەندییــمان کەوتوونــە بــەر چــاو، کــە ئــەم ســووڕەتەیان پــێ جیادەکرێتــەوە لــە ســووڕەتەکانی دیکــە:

١- ئەو بەسەرهاتە خێزانییەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، لە ئایەتەکانی: (١ -- ٥)و، لە هیچ کام لە سووڕەتەکانی دیکەدا نەهاتوەو، ئاماژەی پێ نەکراوە.

٢- تاکە شوێنێك لە قورئاندا تەعبیری: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴾ەی تێدا هاتبێ، ئەم سووڕەتەیە، ئایەتی ژمارە (١).

٣- وێنە هێنرانەوە بە هەردوو هاوسەری نووح و لووط (**عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بۆ بێبڕوایان، کە نیزیکترین کەسیان سوودیان پێ ناگەیەنێ و، وێنە هێنانەوە بە هاوسەری فیرعەون و مەریەمیش بۆ بڕواداران، کە ئەهلی کوفر زیانیان لێ نادەن، ئەو دوو وێنە هێنرانەوەیەش تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون.

هەڵبەتـە خـوا ﷻ لـە چەنـد شـوێنێکی دیکـەدا، بـاسی ژنەکـەی **لووطی** کـردوە، کە لـە فەوتـاوان بـووە، بـەڵام ئێـرە تاکـە شـوێنە کـە تێیـدا بـاسی ژنەکـەی نـووح (**عَلَيْهِ السَّلام**) بکـرێ و، ئێـرەش تاکـە شـوێنێکە کـە هـەردوو ژنی ئـەو دوو پێغەمبـەرە پایـە بـەرزە، خێزانەکـەی نـووح و لـووط بـە نموونـە بهێنرێنـەوە بـۆ کافـران، کـە ئـەی بێبڕواینـە! بەتەمـا مەبـن بەهـۆی خزمایەتیـی و نزیکیـی و ڕەچەڵـەکی کەسـانێکەوە کـە بـۆ خـوا صوڵحـاون و ئێـوە لێیـان نزیکـن، بەهرەمەنـد بـبن، ئەگـەر بـۆ خۆتـان بـێ ئیمان بـن.

٤- چەند تەعبیرو وشەیەك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

١- ﴿ مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَ ﴾، ﴿ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَ ﴾، لە ئایەتی یەكەمدا.

٢- ﴿ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡ ﴾، كەفارەتی سوێندەكان، حەڵاڵ بوونەوەی ئەوەی سوێندتان لەسەر خواردوە، لە ئایەتی ژمارە دوودا.

٣- ﴿ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا ﴾، دڵەكانتان لایانداوە، كە وەك دوایی باس دەكەین، مەبەست هەردوو هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ دایكمان حەفصەو دایكمان عائیشەن (خوا لێیان ڕازی بێ).

٤- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾، ئەمەش لە نێو هەموو قورئاندا، تەنیا لێرەدا هاتوە.

٥- ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٦)دا، كە لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوە.

٦- ﴿ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا ﴾، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە گەڕانەوەیەكی ساغ، تەنیا لە ئایەتی ژمارە (٨)ی سوورەتی (التحريم)دا هاتوە، لە هەموو قورئاندا.

٧- ﴿ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ ﴾، ئەو دوو ئافرەتەی لە ژێر نیكاحی دووان (لە بەندە چاكەكانمان)دا بوون، كە مەبەست پێیان نووح و **لووطه** (**عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلام**) تەنیا لە ئایەتی ژمارە (١٠)ی سوورەتی (**التَّحْرِيم**)دا هاتوە.

٨- ﴿ وَكَانَتۡ مِنَ ٱلۡقَٰنِتِينَ ﴾، ئەو ئافرەتە {مەریەم (خوا لێی ڕازی بێ)}، لە ملكەچان بوو بۆ خوا، مەریەم ئافرەتە، بەڵام خوا ﷻ لە ڕیزی پیاوانی بۆ خوا ملكەچ دا حیسابی كردوەو، نەیفەرموە: (**وَكانَت مِنَ القَانِتات**)، كە دوایی حیكمەتەكەی باس دەكەین، لە ئایەتی ژمارە (١٢)دا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

کۆی ئەو دوازدە (١٢) ئایەتە بەپێی نێوەڕۆکیان، بۆ سێ دەرسان دابەش دەکەین:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٥)، کە وەك گوتمان باسی ئەو بەسەرهاتە خێزانییە دەکەن، لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ڕوویداوە، کە بریتی بووە لەوەی شتێکی لە خۆی قەدەغە کردوە بۆ ڕازی کردنی یەکێك لە هاوسەرانی، دوایی ئەو نهێنییەی لە لای یەکی دیکە لە هاوسەرانی درکاندوەو، گوتوویەتی: بیپارێزە، کەچی نەیپاراستوەو، بەو بۆنەوە خوا ﷻ هەم گلەیی ئاڕاستەی پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە، کە بۆچی بە مەبەستی ڕازییکردنی هەندێك لە هاوسەرەکانت، شتێکی حەڵاڵ لە خۆت قەدەغە دەکەی؟ هەم گلەیی و سەرزەنشتیشی لەو دوو هاوسەرەی پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە، کە دەبێ بگەڕێنەوە، هەم بە گشتییش هەڕەشەی کردوە لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەکەی خوا لێیان ڕازی بێت کە ئەگەر بێت و ئاگایان لە خۆیان نەبێ، نیزیکە پێغەمبەری خوا دەستبەرداریان بێ و، خوای کاربەجێ ئافرەتانی لەوان باشتری بۆ بڕەخسێنێ.

**دەرسی دووەم:** لە چوار ئایەتەکانی: (٦ - ٩) پێك دێ، لەو چوار ئایەتە موبارەکەدا خوا دوو جاران بڕواداران بانگ دەکات و، جارێك بێبڕوایان و، جارێکیش پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

بڕواداران، خوا ﷻ کۆمەڵێك ڕێنمایی و ئامۆژگارییان دەکات، هی بێبڕوایانیش بانگکردن و دواندنەکە لە ڕۆژی دوایی دایە، خوا ﷻ لێرەدا دەیگێڕێتەوە، کە دەفەرموێ: بێبڕواینە! پۆزش مەهێننەوە، تازە ئەمڕۆ هەر کەسە بەپێی ئەوەی کردوویەتی سزا دەدرێ.

بە نسبەت پێغەمبەریشەوە ﷺ خوا ﷻ فەرمانی پێدەکات کە لە بەرامبەر کافرو مونافیقەکاندا زبر بێ و، لە دژیان تێبکۆشێ، هەر کامیان بەشێوەی خۆی.

**دەرسی سێیەم:** لە سێ ئایەتەکانی: (١٠ - ١٢) پێك دێ و، خوا ﷻ چوار ئافرەتی بە نموونە هێناونەوە، دووانیان هاوسەری **لووطن** و نووح و بۆ کافرەکانی بە نموونە هێناونەوە، کە ئەوەتا ئەو دوو ئافرەتە هەرچەندە هاوسەری دووان لە پێغەمبەرانی پایەبەرزی خوا بوون، کە **لووطن و نووح (عَلَيْهِما الصلاة والسَّلام)** بەڵام ئەو پێغەمبەرانە سوودیان پێ نەگەیاندن، چونکە ئەوانە بەرانبەر بە پێغەمبەرەکانیان ناپاك بوون، ناپاك لە ڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوەو، لە ڕووی دڵسۆزییەوە بۆیان، ئنجا لەبەر ئەوەی موخەننەت و ناپاك بوون لەگەڵ ئەو دوو پێغەمبەرانە، سوودیان پێ نەگەیاندوون و بڕیاری چوونە دۆزەخیان بۆ درا، دوو ئافرەتیش بە نموونە هێنراونەوە بۆ بڕواداران، کە وەك چۆن ئیمانی پێغەمبەران **(عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)** سوود ناگەیەنێ بە هاوسەرەکانیان مادام بێبڕوابن، با هاوسەریشیان بن، بەهەمان شێوەش کوفری کافرەکان زیان نادات لە ئافرەتانی دیندارو مسوڵمانی وەك هاوسەری فیرعەون، کە مێردەکەی فیرعەون بووە، بەڵام کوفری فیرعەون زیانی لێنەدا، هەر وەك کوفری قەومەکەی مەریەمیش کە بوختانیان بۆ کرد، کاتێك خوا ﷻ بە شێوەیەکی یاسادڕ **(خارق العادة)** عیسای پێ بەخشی، بێ ئەوەی هاوسەرگیریی کردبێ و هاوسەری هەبێ، بوختانی بۆ کرا لەلایەن جوولەکەکان و لەلایەن ڕۆمەکانەوە، ئەوە هیچ زیانی لێ نەدا، کەواتە: ئافرەتان ئەگەر بۆ خوا صوڵحاو بن، کوفری کافرانی نیزیکیان، ئەگەر قەومیانن، ئەگەر مێردیانن، ئەگەر هەر کەسیانن، زیانیان لێ نادات، هەروەك چۆن ئافرەتان ئەگەر بۆ خوا صوڵحاو نەبن، ئیمان و چاکەی نیزیکانیان ئەگەر هاوسەریانن، ئەگەر هەر کەسێکیانن، سوودیان پێ ناگەیەنێ.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە پێنـج (٥) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (١ - ٥)، كـە تێیـان دا بـاسی ڕووداوێـكی خێزانیـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـراوەو پوختەكـەشی ئـەوە بـووە، كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە مەبەسـتی ڕازییكـردنی یەكێـك لـە هاوسـەرەكانی، بڕیـاری خۆگرتنـەوەی لـە شـتێكی ڕەوا داوە، واتـە: شـتێك كـە بـۆی ڕەوا بـووە، وەك دوایـی بـاسی دەكەیـن، ئنجـا ئایـا كەنیزەكێـك بـووە، یاخـود خـواردنی هەنگویـن بـووە، بڕیـاری داوە ئـەو شـتە ڕەوایـە لـە خـۆی بگرێتـەوەو بەلایـدا نەچـێ، بـە پەنهانییـش قسـەی لـە لای یەكێـك لـە هاوسـەرانی كـردوە، بـەڵام ئـەو ئـەو نهێنییـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە لای دانـاوە، دركاندوویـەتی و لێـی بـڵاو كردۆتـەوە، خـواش ﷻ پێغەمبەرەكـەی ﷺ ئـاگادرار كردۆتـەوە، ئنجـا ئـەو هاوسـەرەش كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گلەیـی لێكـردوە: بۆچـی ئـەو نهێنییـەت دركانـدوە؟ بەسـەر سـوڕمانەوە پرسـیویەتی: كـێ ئـەوەی پـێ گـوتی؟ پێغەمبەریـش ﷺ گوتوویـەتی: خـوای زانـاو شـارەزا ئـاگاداری كردوومـەوە، ئیـدی بـەو بۆنەیـەوە خـوای دادگـەر ڕێـی ژیـوان بوونـەوەی پێشـانی ئـەو دوو هاوسـەرەی پێغەمبەرەكـەی ﷺ داوەو، بـە پێچەوانـەوەش: هەڕەشـەیان لـێ دەكات، هـەم بـە پشـتیوانیی لێكـردنی خـۆی و جیبریـل و فریشـتەكان و بـڕوادارانی چـاك و، هـەم بـە تـەڵاق درانی ئـەوان و ئـەوانی دیكـەش، ئەگـەر وەك وان بكـەن و، گۆڕینیـان بـە ئافرەتـانی دیكـەی باشـتر لـەوان، ئەمـە - وەك پێشـتریش باسـمان كـرد - خوڵاسـەو پوختـەی چەمـك و واتـای ئـەو پێنـج ئایەتـە موبارەكەیـە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ۖ تَبْتَغِى مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١﴾ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَـٰنِكُمْ ۚ وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُۥ وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ ۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتْ مَنْ أَنۢبَأَكَ هَـٰذَا ۖ قَالَ نَبَّأَنِىَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٣﴾ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ۖ وَإِن تَظَـٰهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَـٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَـٰتٍ مُّؤْمِنَـٰتٍ قَـٰنِتَـٰتٍ تَـٰٓئِبَـٰتٍ عَـٰبِدَٰتٍ سَـٰٓئِحَـٰتٍ ثَيِّبَـٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴿٥﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەی پێغەمبەر! بۆچی شتێك (لە خۆت) قەدەغە دەکەی، کە خوا بۆی ڕەوا کردووی؟ ڕازییکردنی هاوسەرەکانت دەخوازی؟ خواش لێبوردەی بە بەزەییە ﴿١﴾ بێگومان خوا (ڕێی) کردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتانی بۆ داناون و، خواش پشتیوان و سەرپەرشتیارتانەو، ئەو زانای کارزانە ﴿٢﴾ (یاد بکەوە!) کاتێك پێغەمبەر قسەیەکی نهێنیی بە هەندێك لە هاوسەرانی ڕاگەیاند، ئنجا کاتێك ئەو (هاوسەرەی) هەواڵی پێدا (و ئاشکرای کرد)و، خواش (پێغەمبەری) لەوە ئاگادار کردەوە، (پێغەمبەریش) بەشێکی پێگوت و بەشێکی نادیدە گرت، (ئەو هاوسەرە) گوتی: کێ هەواڵی ئەوەی پێداوی؟ (پێغەمبەریش) گوتی: خوای زاناو شارەزا هەواڵی پێداوم ﴿٣﴾ (ئەی دوو هاوسەرەکەی پێغەمبەر!) ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا (ئەرکتانە، چونکە) بە دڵنیایی دڵەکانتان (لە هەق) لایان داوەو، ئەگەر دژی وی (پێغەمبەر)یش پشتگیریی یەکدی بکەن، بێگومان خوا پشتیوانیەتی، جیبریل و پیاوانی بڕواداری

باش و، فریشتەکانیش دوای ئەوە، هاوکارو پشتیوانن ﴿٤﴾ ئەگەر (پێغەمبەر) تەڵاقتان بدات، نیزیکە خوا هاوسەرانی لە ئێوە باشتری بۆ بکاتە جێدارتان، (بۆ خوا) ملکەچانی بڕواادارانی گوێڕایەڵان (بۆ پێغەمبەر)ی گەڕاوان (بۆ لای خوا)، خوا پەرستانی کۆچکەران (لە) بێوەژنان و کچان ﴿٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِمَ): لە دوو پیت پێکهاتوە، لە (ل) و (م)، (لِمَ)، لە ئەصڵدا (لِمَا) بووە، یانی: بۆچی؟ بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بەکارهێنراوە، ئەلیفەکەی قرتێنراوەو بۆتە (لِمَ)، بۆچی؟

(تُحَرِّمُ): واتە: قەدەغە دەکەی، یان خۆتی لێ دەگریەوە، (الحَرَامُ: المَمْنُوعُ)، حەڕام: ڕێ لێگیراو، قەدەغە، کە لێرە دەفەرموێ: ﴿لِمَ تُحَرِّمُ﴾، یانی: (لِمَ تَمْتَنِعُ)، بۆچی خۆت دوور دەگری؟ خۆتی لێ دەگریەوە؟ یاخود: (لِمَ تَحْكُمُ بِتَحرِيمِ ذَلِكَ)، بۆچی حوکم دەدەی بەوەی ئەو شتە قەدەغەیە، کە دیارە هی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو مانایەی دووەمیان نەبووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموە: ئەو شتە قەدەغەیە، بەڵکو ئەو شتەی بۆی ڕەوا بووە، خۆی لێ دوورگرتوەو بەکاری نەهێناوە، کەواتە: ﴿لِمَ تُحَرِّمُ﴾، یانی: (لِمَ تَمْتَنِعُ)، بۆچی خۆتی لێ دەگریەوە؟ ئەگەرنا ﴿لِمَ تُحَرِّمُ﴾، بە مانای: (بۆچی قەدەغەی دەکەی)یش هاتوە، بەڵام لێرەدا بەو مانایە بەکارنەهاتوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی قەدەغە نەکرد، شتێك خوا حەڵاڵی بکات و ئەو بڵێ: قەدەغەیە، بەڵام شتێك کە خوا بۆی حەڵاڵ کرد بوو، ئەو خۆی لێگرتەوەو بەکاری نەهێنا، ئەوەش شتێکی ڕەوایە، بەڵام خوای کاربەجێ بۆیە لێی بە ڕەخنە دەگرێ، چونکە مەبەستی ئەوە بووە، بەوە یەکێك لە هاوسەرەکانی ڕازیی بکات، ئەگەرنا بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ شت کە ڕەوا بووە، خۆی

لـێ دوور گرتـوە، وەك جێـگاو ڕێـگای خۆشـگوزەرانانەو، زۆر خۆشـیی و لـەززەتی دیکـەی دنیـا، کـە توانیویشـیەتی هەیـبن، لەسـەر ئـەوەش هاوسـەرانی (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، وەك لـە تەفسـیری سـوورەتی ئەحزابـدا باسـمان کـرد، گەلـە کۆمەکێیـان لێکـردوەو گوتوویانـە: دەبـێ نەفەقەمـان بـۆ زیـاد بکـەی، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئامادە نەبـووە، مـل بـدات بـۆ داواکاریـی ئـەوان، خـواش ﷻ لـەو بـارەوە فەرمـانی بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ کـردوە، کـە خێزانـەکانی سـەر پشـك بـکات: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ٢٨ ﴾الأحزاب، ئـەی پێغەمبـەر! بـە هاوسـەرەکانت بفەرمـوو: ئەگـەر ژیـانی دنیـاو جوانیـی دنیاتـان دەوێ، وەرن بـە بـە لـە باریـی دەسـتتان لـێ بکەمـەوەو، سـەرو دیاریـی و خەڵاتتـان بدەمـێ.

کەواتـە: دەبـێ بزانیـن کـە لێـرەدا خـوا ﷻ ڕەخنـەی لـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ گرتـوە لەبـەر ئـەوە بـووە کـە بـۆ ڕازییکـردنی دڵـی یەکێك لـە هاوسـەرەکانی بـووە، ویسـتوویەتی ئـەو کارە بـکات.

(تَحِلَّةَ): (أَصْلُ الحَـلِّ: حَـلُّ العُقْـدَةِ وَعَـن حَـلِّ العُقْـدَةِ اسـتُعِيرَ قَولُهُـم: حَـلَّ الـشَّيءُ حَـلالاً)، (حَـلّ) لـە ئەصڵـدا کردنـەوەی گرێیـە، ئنجـا لـە کردنـەوەی گرێـدا ئـەو قسـەیەیان خوازراوەتـەوە، کـە گوتوویانـە: (حَـلَّ الـشَّيءُ حَـلالاً)، ئـەو شـتە حـەڵاڵ بـوو، ڕەوا بـوو، یـانی: گرێـی قەدەغـە بـوونی لێکراوەتـەوە، کەواتـە: (تَحِلَّـةَ) لـە بنـەڕەت دا (تَحلِلة)یـە، یـانی: ئـەو شـتەی دەبێتـە هـۆی ڕەوا کردنـەوەی ئـەوەی قەدەغـە کـراوەو خـۆی لـێ دوورگیـراوە.

(وَأَظۡهَرَهُ): (أَي: أَطْلَعَـهُ)، ئـاگاداری کـردەوە، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ ﴾الجـن، (أَي: لاَ يُطْلِعُ)، خـوا هیـچ کـەس لـە نهێنیـی و پەنهـانی خـۆی ئـاگادار ناکاتـەوە، ﴿ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ ٢٧ ﴾الجـن، مەگـەر یەکێك لـە پێغەمبـەران کـە خـوا ﷻ پەسـندی کـرد بـێ، ئـاگاداری بکاتـەوە لـە هەنـدێ شـتی پەنهـان و نادیـار.

(عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ): یانی: (وَصَفَ بَعْضَهُ وَذَكَرَهُ)، هەندێك لەو نهێنییەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای ئەو هاوسەرەی دانابوو و ئەو ئافرەتە دركاندبووی، پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك لەو نهێنییەی باسكرد، وەسفی كرد، ﴿ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ ﴾، هەندێكیشی وازلێهێنا، ئەو هاوسەرەی ئەوەیشی هەر دركاند بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی بە چاو دانەدایەوە.

(صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ): (الصَّغوُ: المَيلُ، صَغَيْتُ الإِنَاءَ وَأَصْغَيْتُهُ)، (صَغو): بە مانای مەیل خوار كردنەوە دێ، دەگوترێ: (صَغَيْتُ الإِنَاءَ وَأَصْغَيْتُهُ)، قاپەكەم لار كردەوە، هەم (صَغَيتُ)ی بۆ بەكاردێ، بە سیانیی (ثُلاثي) هەم بە چواریی (رُبَاعي)ش، (أَصغَيتُهُ)، لارم كردەوە، كەواتە: ﴿ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ ﴾، دڵەكانتان لایانداوە، نەیفەرمووە: (صَغَتْ قَلبَاكُمَا)، لەبەر ئەوەی عەرەب پێیان باش نەبووە دوو دووانە (مُثَنَّی) لە یەك وشەدا بێنن، (قَلْبَا) لەگەڵ (كُمَا)، هەردووكیان بۆ (مُثَنَّی)ن، پێیان قورس بووە، بۆیە (قلب)ی كۆ كردۆتەوە، ئەگەرنا دوو دڵن، بەڵام بەو ئیعتیبارەی لە یەك بەو لاوە بە كۆ (جمع) لە قەڵەم دەدرێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ ﴾، دڵەكانتان واتە: دڵی هەردوو هاوسەرە بەڕێزەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ لایداوە لە ڕاستیی، كە مەبەست حەفصەو عائیشەن (خوا لێیان ڕازی بێ).

(قَٰنِتَٰتٖ): (القُنُوتُ: لُزومُ لطَّاعَةِ مَعَ الخُضُوعِ)، (قُنُوت) بریتیە: لە فەرمانبەریی لەگەڵ ملكەچیی و بە قسە كردن و نەرمیی و، ئاسان بە دەستەوە هاتن.

(سَٰٓئِحَٰتٖ): (سَائِحَات): هەم بە (صائِمَات) مانای لێكدراوەتەوە، واتە: ڕۆژووگران، هەم بە مانای كۆچكەران (مُهاجِرات) لێكدراوەتەوە، (السَّائِحُ: المَاءُ الدَّائِمُ جَرْيُهُ فِي سَاحَةٍ، يُقَالُ سَاحَ فُلَانٌ، أَي: مَرَّ مَرَّ السَّائِحِ): (سائِح): بەو ئاوە دەگوترێ كە بە بەردەوامیی بە مەیدانێكدا دەڕوا، دەگوترێ: (سَاحَ فُلانٌ)، واتە: وەك چۆن ئاوی خێرا دەڕوا، ئاوا ڕۆیشت، (سَائِح) لەوەوە هاتوە، لە ئەصڵدا (سَائِح) واتە: ئاوێك كە بەردەوام دەڕوا.

بەڵام (سَائِح) بە كوردیی دەبێتە گەڕیدە كەسێك كە سەفەر دەكات، ئنجا لەبەر ئەوەی باباى بە ڕۆژوو بەردەوام دەبێ لەسەر نەخواردن و نەخواردنەوە، وەك چۆن ئاو دەڕواو بەردەوام دەبێ، بۆیە لەو ڕووەوە (سَائِحَات) بە مانای (صَائِمَات) دێ، دەشگونجێ (سَائِحَات) مەبەست پێی كۆچكەران بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ... ﴿٢﴾﴾التوبة، یانی: بە زەویدا بڕۆن كۆچ بكەن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

١- هۆی هاتنە خوارەوەی چوار ئایەتی یەكەم: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١﴾ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٣﴾ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾﴾، لەو بارەوە ئەو سێ گێڕدراوەیە دێنین:

**أ- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَشْرَبُ عَسَلًا عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَيَمْكُثُ عِنْدَهَا، فَوَاطَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ عَلَى، أَيَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا فَلْتَقُلْ لَهُ: أَكَلْتَ مَغَافِيرَ، إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، قَالَ: لاَ، وَلَكِنِّي كُنْتُ أَشْرَبُ عَسَلًا عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، فَلَنْ أَعُودَ لَهُ، وَقَدْ حَلَفْتُ، لاَ تُخْبِرِي بِذَلِكَ أَحَدًا} (أخرجه البخاري: ٤٩١٢، ٥٢٦٧، ٦٦٩١، ومسلم: ١٤٧٤).**

واتە: دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو هەنگوینی لە لای زەینەبی كچی جەحش[1] دەخواردەوەو، ماوەیەك لای دەمایەوە، من و حەفصە ڕێك كەوتین، كە پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای هەر كامێكمان با پێی بڵێ: ئایا مەغافیرت خواردوە؟ (مەغافیر جۆرە گیایەكە

---

(١) كە هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ و كچە پووریشی بووە.

بۆنێکی ناخۆشی هەیە)، من بۆنی مەغافیرت لێدەکەم، (هەڵبەتە ئەو بۆنەیان لێ نەکردوە، بەڵام بۆ ئەوەی هەنگوین خواردنەوەکەی لە لای زەینەب پێ تەرك بکەن، وایان گوتوە، ئنجا دەڵێن: کە هات بۆ لای هەر کامێکمان وامان پێگوت)، ئەویش فەرمووی: نەخێر مەغافیرم نەخواردوە، بەڵام هەنگوینم لە لای زەینەبی کچی جەحش (هاوسەرەکەی خۆی) خواردۆتەوە، بەڵام لەمەودوا جارێکی دیکە (مادام ئەو بۆنە بدات) بۆی ناگەڕێمەوە (نایخۆمەوە)، سوێندیشم خواردوە، بەڵام هەواڵ بە کەس مەدە.

ئنجا بەپێی ڕیوایەتەکان دیارە حەفصە بووە، پێی گوتوە، بەڵام حەفصە دوایی هەواڵی داوە بە عائیشە لەبەر ئەوەی پێکەوە زۆر ڕێك بوون، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: با ئەو قسەیە تەنیا لە لای خۆت بێ، بەڵام ئەو درکاندوویەتی بۆ عائیشە خوا لێیان ڕازی بێ.

**ب-** {**عَنْ أَنَسٍ** رضي الله عنه، **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ يَطَؤُهَا، فَلَمْ تَزَلْ بِهِ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ حَتَّى حَرَّمَهَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٢﴾} **(أخرجه النَّسَائِي فـي سننه، قال الألباني: صحيح الإسناد).**

واتە: ئەنەس رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کەنیزەکێکی هەبوو لەگەڵیدا جووت دەبوو (دەچووە لای)، بەڵام عائیشەو حەفصە زۆر خەریك بوون، (دیارە پرتەو بۆڵەیان لەسەر کردوە) و هەوڵیان لەگەڵدا تاکو لەسەر خۆی قەدەغە کرد، (کە جارێکی دیکە نەچێتە لای)، لەو بارەوە خوا سبحانه وتعالى ئەم ئایەتەی دابەزاند.

کەواتە: ئەوەی پێشێ باسی هەنگوین خواردن بوو و ئەمیان کەنیزەکێکە، کەنیزەکەکەش لە ڕیوایەتەکانی دیکەدا هاتوە، کە ماریەی **قیبطیی** بووە، واتە: دایکی ئیبڕاهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ج- {عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِحَفْصَةَ: «لَا تُخْبِرِي أَحَدًا، وَإِنَّ أُمَّ إِبْرَاهِيمَ عَلَيَّ حَرَامٌ»، فَقَالَتْ: أَتُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ؟ قَالَ: «فَوَاللَّهِ لَا أَقْرَبُهَا»، قَالَ: فَلَمْ يَقْرَبْهَا حَتَّى أَخْبَرَتْ عَائِشَةَ. قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ ۚ وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾}، (أخرجه الْهَيْثَمُ بْنُ كُلَيْبٍ فِي مُسْنَدِهِ: ج٤، ٤١٢، والضياء المقدسي في الأحاديث المختارة: ١٨٩، وقال: إسناده صحيح).

واتە: عومەر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەفصەی فەرموو: هەواڵ بە کەس مەدە دایکی ئیبڕاهیمم لە خۆم قەدەغە کردوە، (واتە: ناچمە لای، دایکی ئیبڕاهیم ناوی مارییە بوو، (مارییەی قیبطیی)، کە پاشای میسڕ بە دیاریی بۆی نارد بوو)، ئەویش پێی دەڵێ: ئایا شتێك کە خوا بۆی ڕەوا کردووی لە خۆتی قەدەغە دەکەی؟ ئەویش (پێغەمبەر) ﷺ دەفەرمویٚ: سوێند بە خوا نیزیکی ناکەومەوە، ئیدی نیزیکی نەکەوتەوەو، دوایی حەفصە هەواڵیدا بە عائیشە (واتە: ئەو نهێنییەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای دانابوو لە لای عائیشە درکاندی)، ئیدی لەو بارەوە خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی ناردنە خوار، بۆ ئەوەش کە مارییەی بۆ ڕەوا بێتەوە، چونکە سوێندی خوارد بوو، یاخود: تاکو هەنگوینەکەی لای زەینەبی کچی جەحشی بۆ ڕەوا بێتەوە، خوای بە بەزەیی ئەوەشی دابەزاند: ﴿ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ ۚ وَٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، واتە: بێگومان خوا ﷻ هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتانی بۆ ئێوە دابەزاندوەو خوا سەرپەرشتیاری ئێوەیەو بەس ئەو زانای کاربەجێیە.

٢- هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴿٥﴾ ﴾، لەو بارەوە بەسەرهاتێکی تۆزێك درێژ هەیە، بەڵام بە باشی دەزانم دەقەکەی بە عەرەبیی بێنم و دواییش بە کوردیی مانای دەکەین، لەبەر ئەوەی وێڕای تیشك خستنە سەر چەمك و واتای ئەو ئایەتە موبارەکە، کە لە نێوان زانایاندا قسەو باسی زۆری لەسەر کراوە، هەندێك چەمك و واتای دیکەش و، هەندێك مەبەستی دیکەش دەگرێتە خۆی، ئەمەش دەقی ئەو گێڕدراوەیە:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، قَالَ: حَدَّثَنِي عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ قَالَ: لَمَّا اعْتَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا النَّاسُ يَنْكُتُونَ بِالْحَصَى وَيَقُولُونَ: طَلَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ «وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُؤْمَرْنَ بِالحِجَابِ» فَقَالَ عُمَرُ: فَقُلْتُ لَأَعْلَمَنَّ ذَلِكَ الْيَوْمَ، قَالَ فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ فَقُلْتُ: يَا بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ! أَقَدْ بَلَغَ مِنْ شَأْنِكِ أَنْ تُؤْذِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! فَقَالَتْ: مَالِي وَمَالَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ! عَلَيْكَ بِعَيْبَتِكَ! قَالَ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا حَفْصَةُ! أَقَدْ بَلَغَ مِنْ شَأْنِكِ أَنْ تُؤْذِيَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ! وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَا يُحِبُّكِ، وَلَوْلَا أَنَا لَطَلَّقَكِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. فَبَكَتْ أَشَدَّ الْبُكَاءِ، فَقُلْتُ لَهَا: أَيْنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتِ: هُوَ فِي خِزَانَتِهِ فِي الْمَشْرُبَةِ، فَدَخَلْتُ فَإِذَا أَنَا بِرَبَاحٍ غُلَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَاعِدًا عَلَى أُسْكُفَّةِ الْمَشْرُبَةِ مُدَلٍّ رِجْلَيْهِ عَلَى نَقِيرٍ مِنْ خَشَبٍ، وَهُوَ جِذْعٌ يَرْقَى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَيَنْحَدِرُ. فَنَادَيْتُ: يَا رَبَاحُ، اسْتَأْذِنْ لِي عِنْدَكَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَظَرَ رَبَاحٌ إِلَى الْغُرْفَةِ، ثُمَّ نَظَرَ إِلَيَّ، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا. ثُمَّ قُلْتُ: يَا رَبَاحُ! اسْتَأْذِنْ لِي عِنْدَكَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَظَرَ رَبَاحٌ إِلَى الْغَرْفَةِ ثُمَّ نَظَرَ إِلَيَّ، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا. ثُمَّ رَفَعْتُ صَوْتِي فَقُلْتُ: يَا رَبَاحُ! اسْتَأْذِنْ لِي عِنْدَكَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ظَنَّ أَنِّي جِئْتُ مِنْ أَجْلِ حَفْصَةَ، وَاللَّهِ لَئِنْ أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِضَرْبِ عُنُقِهَا لَأَضْرِبَنَّ عُنُقَهَا، وَرَفَعْتُ صَوْتِي فَأَوْمَأَ إِلَيَّ أَنِ ارْقَهْ، فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى حَصِيرٍ، فَجَلَسْتُ فَأَدْنَى عَلَيْهِ إِزَارَهُ وَلَيْسَ عَلَيْهِ غَيْرُهُ، وَإِذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ، فَنَظَرْتُ بِبَصَرِي فِي خِزَانَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَإِذَا أَنَا بِقَبْضَةٍ مِنْ شَعِيرٍ نَحْوِ الصَّاعِ، وَمِثْلِهَا قَرَظًا فِي نَاحِيَةِ الْغُرْفَةِ، وَإِذَا أَفِيقٌ مُعَلَّقٌ «قَالَ» فَابْتَدَرَتْ عَيْنَايَ. قَالَ: (مَا يُبْكِيكَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ)؟ قُلْتُ يَا نَبِيَّ اللهِ، وَمَا لِي لَا أَبْكِي وَهَذَا الْحَصِيرُ قَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِكَ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ لَا أَرَى فِيهَا إِلَّا مَا أَرَى! وَذَاكَ قَيْصَرُ وَكَسْرَى فِي الثِّمَارِ وَالْأَنْهَارِ وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَصَفْوَتُهُ، وَهَذِهِ خِزَانَتُكَ! فَقَالَ: (يَا ابْنَ الْخَطَّابِ أَلَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَنَا الْآخِرَةُ وَلَهُمُ الدُّنْيَا) قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: وَدَخَلْتُ عَلَيْهِ حِينَ دَخَلْتُ وَأَنَا أَرَى فِي وَجْهِهِ الْغَضَبَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا يَشُقُّ عَلَيْكَ مِنْ شَأْنِ النِّسَاءِ، فَإِنْ كُنْتَ طَلَّقْتَهُنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مَعَكَ

وَمَلَائِكَتُهُ وَجِبْرِيلُ وَمِيكَائِيلُ، وَأَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَالْمُؤْمِنُونَ مَعَكَ. وَقَلَّمَا تَكَلَّمْتُ «وَأَحْمَدُ اللَّهَ» بِكَلَامٍ إِلَّا رَجَوْتُ أَنْ يَكُونَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يُصَدِّقُ قَوْلِي الَّذِي أَقُولُ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ، آيَةُ التَّخْيِيرِ: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴿٥﴾﴾التحريم، وَكَانَتْ عَائِشَةُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ وَحَفْصَةُ تَظَاهَرَانِ عَلَى سَائِرِ نِسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَطَلَّقْتَهُنَّ؟ قَالَ: (لا). قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَالْمُسْلِمُونَ يَنْكُتُونَ بِالْحَصَى يَقُولُونَ: طَلَّقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، أَفَأَنْزِلُ فَأُخْبِرُهُمْ أَنَّكَ لَمْ تُطَلِّقْهُنَّ؟ قَالَ: (نَعَمْ إِنْ شِئْتَ)، فَلَمْ أَزَلْ أُحَدِّثُهُ حَتَّى تَحَسَّرَ الْغَضَبُ عَنْ وَجْهِهِ، وَحَتَّى كَشَرَ فَضَحِكَ، وَكَانَ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ ثَغْرًا. ثُمَّ نَزَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ وَنَزَلْتُ، فَنَزَلْتُ أَتَشَبَّثُ بِالْجِذْعِ، وَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّمَا يَمْشِي عَلَى الْأَرْضِ مَا يَمَسُّهُ بِيَدِهِ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا كُنْتَ فِي الْغُرْفَةِ تِسْعًا وَعِشْرِينَ. قَالَ: (إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ) فَقُمْتُ عَلَى بَابِ الْمَسْجِدِ فَنَادَيْتُ بِأَعْلَى صَوْتِي: لَمْ يُطَلِّقْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ نِسَاءَهُ، وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾﴾النساء، فَكُنْتُ أَنَا اسْتَنْبَطْتُ ذَلِكَ الْأَمْرَ، وَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّخْيِيرِ} (أخرجه: مسلم: ١٤٧٩).

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) بۆی باسم كردم، دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشەگیر بوو لە هاوسەرەكانی (واتە: هاموشۆی نەكردن ماوەی مانگێك)، چوومە مزگەوت، خەڵك بە دەنكە چەو لە عەرزیانەوە دەژەنی، (وەك چۆن كەسێك داڵغە لێ دەدات، یان مەراقێكی هەیە، دارۆچكەیەك لە زەوییەوە دەژەنێ، بەڵام ئەوان دەنكە چەویان بەكارهێناوە)، دەیانگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەكانی تەڵاق داون، ئەویش بەرلەوەی فەرمانیان پێ بكرێ و بكەونە پشتی پەردە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم: دەبێ ئەمڕۆ

ئـەو شـتە بزانـم، (ئایـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاوسـەرەكانی تـەڵاق داون یـان نـا)، چوومـە لای عائیشـە گوتـم: ئـەی كچـی ئەبـوو بەكـر! ئایـا حـاڵ و پایـەی تـۆ گەیشـتە ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ئـازار بـدەی؟ عائیشـەش گـوتی: تـۆ حەقـی منـت چییـە، ئـەی كـوڕی خەتتاب! بچـۆ كـەم و كوڕیـی خـۆت چارەسـەر بكـە، (واتـە: كچەكـەی خـۆت كـە حەفصەیـە ئامـۆژگاریـی بكـە)، دەڵـێ: چوومـە لای حەفصـە (حەفصـەی كچـی عومـەر) گوتـم: ئـەی حەفصـە! ئایـا حـاڵ و پێگـەی تـۆ گەیشـتە ئـەوە كـە پێغەمبـەری خـوا ئـازار بـدەی؟ بـە خوا مـن دەزانـم پێغەمبـەری خوا تۆی خۆشـناوێ، (ڕقـی لـێ هەڵسـاوە، بۆیـە وای گوتـوە)، ئەگـەر مـن نەبوومایـە پێغەمبـەری خـوا دەسـتبەردارت دەبـوو، تەڵاقـی دەدای، ئەویـش زۆر گریـا، پێمگـوت ئایـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە كوێیـە؟ گـوتی: ئـەوە لـەو شـوێنەیە، لـەو بانیژەیـەدا كـە كـەل و پـەلی تێـدا دادەنێـن، دەڵـێ: چوومـە ژوور، تەماشـام كـرد، ڕەبـاح غوڵامـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـە بەردەسـتێكی بـووە، دانیشـتبوو لەسـەر شـیپانەی دەرگای شـوێنی ئـاو لـێ خواردنەوەكـە، لاقـی شـۆڕ كردبوونـەوە بەسـەر تەختەیەكـدا، تەختەكـەش بریتـی بـوو لـە قـەدە دار خورمایـەك كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێیـدا سـەر دەكـەوت، وەك پەیـژەو پێیـدا دەهاتـە خـوار، (دیـارە شـوێنەكە بـەرز بـووە)، منیـش بانگـم كـرد ڕەبـاح! لـە لای خۆتـەوە مۆڵەتـم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ وەربگـرە، ڕەبـاح تەماشـای ژوورەكـەی كـرد، كـە پێغەمبـەری خـوای تێـدا بـوو ﷺ، دوایـی تەماشـای منـی كـردو هیچـی نەگـوت، (دیـارە تەماشـای ژوورەكـەی كـردوەو پێغەمبەریـش ﷺ موافیـق نەبـووە)، دوایـی دووبـارەم كـردەوە گوتـم: ڕەبـاح! لـە لای خۆتـەوە مۆڵەتـم بـۆ لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەربگـرە، دووبـارە ڕەبـاح تەماشـای ژوورەكەی كـردەوەو تەماشـای منیـشی كـردو هیچـی نەگـوت، (ئەوانـە ئەدەبیـان چەنـد بـەرز بـووە! پێویسـتیی بـەوە نەكـردوە بڵـێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! ئایـا عومـەر بـێ؟ ئەویـش بفەرمـوێ: نەخێـر، هـەر بـە ئامـاژە لێـك حاڵیـی بـوون، ئـەدەبی بـەرزی ئیسـلام ئاوایـە، پێویسـت نـاكات هەمـوو شـتێك بـە دەنگ و قسـە بێ، هەر تەماشـای

پێغەمبـەری خـوای ﷺ کـردوە، پێغەمبـەری خـواش گوێـی لـە دەنگەکـەی بـووە، ئەگـەر پێـی بـاش بووایـە ئیشـارەتێکی دەکـرد بـا بـێ)، ئنجـا دەنگـم بـەرز کـردەوەو گوتـم: ئـەی ڕەبـاح! لـە لای خۆتـەوە مۆڵەتـم بـۆ لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەربگـرە، چونکـە پێـم وایـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گومـانی وایـە مـن لەبـەر حەفصـە هاتـووم (حەفصـەی کچـم)، سـوێند بـە خـوا ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا فەرمانـم پـێ بـکات لـە گـەردنی دەدەم، (نـەك بەرگریـی لـێ بکـەم)، (دووبـارە ڕەبـاح تەماشـای پێغەمبـەری خـوای ﷺ کـردەوەو پێغەمبەریـش ئامـاژەی بـۆ کـردوە بابـێ، ئەمـە نەهاتـوە، بـەڵام سـیاقەکە دەیگەیەنـێ)، یەکسـەر ئامـاژەی بـۆ کـردم (واتـە: ڕەبـاح)، سـەرکەوە، بەدارەکـەدا سـەرکەوتم، چوومـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەسـەر حەسـیرێك ڕاکشـا بـوو، پاڵیدابـووە، منیـش دانیشـتم، پێغەمبـەری خـوا ﷺ کراسـەکەی کـە تۆزێـك لەسـەر لاقـی لاچـوو بـوو، بەسـەر لاقـی دادایـەوەو بـەس ئـەوەشی لەبـەر دابـوو، تەماشـام کـرد حەسـیرەکە شـوێنکەی لەسـەر کەلەکـەی (تەنیشـتی) دروسـتکردبوو، ئنجـا چـاوم گێـڕا بـە عەمبارەکـەی پێغەمبـەردا ﷺ، (**خزانة**) ئـەو شـوێنەیە شـتی تێـدا هەڵدەگـرن)، تەنیـا بـڕە جۆیەکـم دی دەوری ڕبەیـەك دەبـوو، هەروەهـا بـە ئەنـدازەی ئـەوەش قـەڕەزم بینـی، {(**قَرَظ**) ئەوەیـە کـە پێسـتی پـێ دەبـاغ دەکـەن}، هەروەهـا مەشـکەیەك، کوندەیەکیشـم بینـی هەڵواسرابـوو، (دیـارە ئـاو یـان شـلەمەنییەکی تێـدا بـووە)، ئیـدی یەکسـەر چـاوم فرمێسـکی پێداهاتـن، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: چ شـتێك دەتگریەنـێ ئـەی کـوڕی خەتتـاب؟! گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! بۆچـی نەگریـم؟ حەسـیر شـوێنکەی لەسـەر جەسـتەی تـۆ کـردوە، (هیچـت نیـە لەسـەری ڕاخـەی)، ئـەوەش عەمبارەکەتـە هـەر ئـەوەی تێـدا دەبینـم، کـە دەیبینـم، کەچـی قەیصـەڕ (پادشـای ڕۆم) و کیسـڕا (پادشـای فـارس) لـە نێـو میـوەو ڕووبـارو جۆگـەو جۆبـار دان، تـۆش پێغەمبەرو هەڵبـژاردەی خـوای، (ئەوەش کـەل و پـەل و شـمەکەکانتن)؟! فەرمـووی: ئـەی کـوڕی خەتتـاب! ئـەدی نـازانی کـە ڕۆژی دوایـی، مەنزڵـگای کۆتایـی، بـۆ ئێمەیـەو ئەوانیـش دنیایـان هەیـە! گوتـم: بـا،

ئنجا کاتێ لێی چوومە ژوورێ، پێغەمبەری خوا ﷺ تووڕەیی بە دەم و چاوەوە دیار بوو (پەستیی و بێزاریی)، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! لە بارەی ئافرەتانەوە، بۆچی دڵت نارەحەت دەبێ؟ ئەگەر تەڵاقت داون، خوا لەگەڵتەو، فریشتەکانی و جیبریل و میکائیل و من و ئەبوو بەکریش و بڕوادارانیش لەگەڵتین، (عومەر دەڵێ:) ستایش بۆ خوا کەم وا هەبووە قسەیەك بکەم، مەگەر ئومێدم کردوە خوا ﷻ قسەکەی من بەڕاست دابنێ و پشتگیریی قسەکەم بکات، ئیدی کە من ئەوەم گوت، خوای پەروەردگاریش ئایەتی سەرپشککردنی بۆ پێغەمبەرەکەی دابەزاند، کە دەفەرموێ: {نیزیکە، ئەگەر (پێغەمبەر ﷺ) تەڵاقتان بدات، پەروەردگاری ئافرەتانی لە ئێوە باشتری بۆ بڕەخسێنێ، ملکەچ و بڕوادار، گوێڕایەڵ و زۆر گەڕاوە بۆ لای خوا، خوا پەرست و ڕۆژووگر، (یاخود کۆچکەر)، و لە بێوەژنان و لە کچان}.

عائیشەی کچی ئەبوو بەکرو حەفصە کچی عومەر پێکەوە پشتی یەکدییان دەگرت لە بەرانبەر هاوسەرەکانی دیکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ، (وەك عادەتی هەوێیان)، منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا هاوسەرەکانت تەڵاقت داون؟ فەرمووی: نەخێر، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! کاتێك من هاتمە مزگەوت مسوڵمانان بە چەوو لە عەرزیانەوە دەژەنی، (وەك داڵغە لێدان و مەڕاق خواردن دەستیان بە دەنکە چەواندا دەهێنا، یان دەنکە چەویان لە زەوی وەردەدا)، دەیانگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەکانی تەڵاق داون، ئایا دابەزم هەواڵیان پێ بدەم کە تۆ تەڵاقت نەداون، (بۆ ئەوەی دڵخۆش بن)؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر پێتخۆشە، ئیدی وردە وردە من هەر قسەم لەگەڵدا کرد، هەتا تووڕەیی لە دەم و چاویدا نەما، بەڵکو وابوو کە ددانی دەرکەوتن و پێکەنی و، لە هەموو کەسیش زارو ددانی جوانتر بوون کە پێدەکەنی، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی منیش دابەزیم، من لە دابەزینەکەدا دەستم بە دارەکە دەگرت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وەك لەسەر عەرزێ بڕوا (پێویستیی بەوە نەبوو دەست

بە دارەکە بگرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر قایم و مەحکەم بووەو وەك بابایەکی وەرزشوان بووەو، خوای کارزان جەستەیەکی ساغ و بەهێزی پێداوەو، خۆشی ئاگای لە ساغ و سەلامەتیی خۆی بووە)، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! تۆ بیست و نۆ (٢٩) ڕۆژ لە ژوورەکەدا بووی، {واتە: (٢٩) ڕۆژە کە سوێندت لە هاوسەرانت خواردوە، مانگێك نەیاندوێنی، ئێستا بووەتە (٢٩) ڕۆژ و نەبۆتە (٣٠)}، فەرمووی: مانگی (٢٩)ییش هەیە (و (٣٠)ییش هەیە، واتە: مانگی قەمەریی، مانگی عەرەبیی)، منیش لە دەرگای مزگەوتەوە ڕاوەستام، بە دەنگی هەرە بەرزم هاوارم کرد گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرەکانی تەڵاق نەداون و، لەو بارەوە ئەو ئایەتەی سوورەتی (النساء)، ئایەتی ژمارە (٨٣) دابەزی، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٣ ﴾النساء، واتە: (کاتێك کە هەواڵێکیان لە بارەی هێمنیی و ئاساییش یان ترسەوە بۆ دێ، خەڵکەکە یەکسەر بڵاوی دەکەنەوە، بەڵام ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و بۆ لای مشوور خۆران و کاربەدەستانێك کە توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی، ئەگەر بەخششی خواش نەبووایە لەسەر ئێوە، جگە لە کەمێکتان هەمووتان شوێن شەیتان دەکەوتن)، عومەر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: من ئەو کەسە بووم کە هەڵم هێنجا (کە ئەو هەواڵەم بیست، چووم ساغم کردەوە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ڕاستە هاوسەرەکانی تەڵاق داون یان نا، ساغم کردەوە نەك یەکسەر هەواڵەکە بڵاوبکەمەوە)، خوای بەرزو مەزنیش عَزَّ وَجَلَّ ئایەتی سەرپشککردنی دابەزاند.

وەك گوتم: ئەم گێڕراوەیە وێڕای ئەوەی تیشکمان بۆ دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەو ئایەتە موبارەکە، ئایەتی ژمارە (٥)، کۆمەڵێك شتی دیکەشی تێدابوون، کە بەرچاو ڕوونیی باشمان پێدەدەن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرمویٚ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەویش مەبەستی پێ ئەوەیە:

**١** - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

**٢** - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

**٣** - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

**٤** - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەرەکەی ﷺ و دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴾، ئەی پێغەمبەر! بۆچی شتێك کە خوا بۆی حەڵاڵ کردووی، لە خۆتی قەدەغە دەکەی؟ وەك دوایی باسی دەکەین، قەدەغە کردن لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بفەرمویٚ: فلان شتە قەدەغەیە، چونکە بێگومان بە حەڵاڵ دانان و بە حەڕام دانان، تایبەتە بە خوای بەرزی مەزنەوەو، تەنانەت بۆ پێغەمبەریش ﷺ جێی نەهێشتوە، بەڵکو مەبەست لە: ﴿ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ﴾، یانی: (لِمَ تَمتَنِعُ عَمَّا أَحَلَّ اللهُ لَك؟)، شتێك کە خوا بۆتی ڕەوا کردوە، بۆچی خۆتی لێ دەگریەوە، بۆچی وازی لێ دەهێنی و دەستبەرداری دەبی؟ ﴿ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ ﴾، ڕازییکردنی هاوسەرەکانت دەخوازی؟ بۆیە خۆت لە شتێك دەگریەوە کە خوا بۆی ڕەوا کردووی؟ ئنجا خواردنی هەنگوینە، یان چوونە لای ماریەی **قیبطییە**، کە کەنیزەکەکەیەتی، گرنگ ئەوەیە خوا کە شتێکی

بۆ تۆ ڕەوا کردوە، خۆتی لێ مەگرەوە، بە مەبەستی ئەوەی هاوسەرەکانت ڕازیی بکەی، ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، خواش لێبوردەی بەبەزەییە.

﴿ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ ﴾، بە دڵنیایی خوا حەلاڵ کردنەوەی سوێند لەسەر خوراوەکانتانی، یاخود: هەڵوەشاندنەوەی سوێندەکانتانی بۆ داناون، لێرەدا: ﴿ فَرَضَ ﴾، بە مانای (شَرَعَ)یە، خوا بۆی داناون، ﴿ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡ ﴾، ﴿ تَحِلَّةَ ﴾، لە ئەسڵدا (تَحلِلَة)یە، بەڵام دوو لامەکان پێکەوە دەغم کراون، واتە: هەڵوەشاندنەوە، ئەگەر سوێندێکت لەسەر کردن یان نەکردنی شتێك خواردو، ویستت ئەوەی سوێندی لەسەر خوراوە (سوێند لەسەر خوراوەکە) لەسەری بەردەوام نەبی، یاخود سوێندەکەت هەڵبووەشێنیەوە، دەبێ کەفارەتێك بدەی، ﴿ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ ﴾، خواش سەرپەرشتیارتانە، کە دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴾، یانی: پێشتر، چونکە کەففارەتی سوێند لە سوورەتی (المائدة)دا هاتوەو، سوورەتی مائیدەش پێش سوورەتی (التحريم) دابەزیوە، کە لەوێدا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٨٩ ﴾المائدة، مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا پێشتر ئەوەی بۆ دابەزاندوون کە کەففارەتی سوێندی تێدایەو ئەمەیە: ﴿ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ ﴾، خوا ﷻ سێ شتی داناون:

أ- یان خواردن دان بە دە نەدار، لە خواردنێکی میانجیی کە دەیدەن بە ماڵ و منداڵی خۆتان.

ب- یاخود پۆشاك بۆ کڕینیان، ئەگەر پارچەیەکیش بێ.

ج- یاخود ئازاد کردنی کۆیلەیەك، دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ ﴾، هەر کەسێك ئەوەی دەست نەکەوت، هەر کام لەوانەو توانای نەبوو، با سێ

ڕۆژان بەڕۆژوو بێ، ﴿ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡ ﴾، ئا ئەوە مایەی سڕینەوەی سوێندەکانتانە، هەر کاتێك سوێندتان خوارد، ﴿ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، خواش سەرپەرشتیاری ئێوەیەو، هەر ئەویش زانای کاربەجێیە، یانی: هەموو شتێك دەزانێ و کارەکانی هەموویان لە شوێنی خۆیاندان.

ئنجا خوا ﷻ ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە کە چۆن چۆنی بووە؟، ﴿ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا ﴾، یاد بکەنەوە (هەر کەسێك کە دەشێی بۆ ئەوەی بدوێندرێی، یاد بکەوە)کاتێك پێغەمبەر ﷺ قسەیەکی درکاند بە نهێنیی لە لای هەندێك لە هاوسەرەکانی، واتە: قسەیەکی نهێنیی لە لای هەندێك لە هاوسەرەکانی دانا، یاخود: بە چپە قسەی لەگەڵ هەندێك لە هاوسەرەکانی کرد، ﴿ فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ﴾، کاتێك ئەو هاوسەرە کە پێغەمبەر ﷺ بە چپە قسەیەکی بۆ کرد بوو، هەواڵی پێداو ئاشکرای کرد، ﴿ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ﴾، خواش پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کردەوە لە درکاندنی ئەو نهێنییەی لە لای دانابوو، ﴿ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖ ﴾، پێغەمبەر ﷺ هەندێك لەو قسانەی کردبوونی بۆ ئەو ئافرەتە، هەندێك لە نهێنییەکە کە درکاندبووی، پێیگوتەوە، پێی ناساند، ﴿ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖ ﴾، چاوپۆشییشی لە هەندێکی کرد، وەك گوتراوە: (**ماسْتَقصَى كَرِيمٌ قَطُّ**)، ئینسانی بەڕێز هەرگیز لەگەڵ خەڵکدا نایگەیێنێتە ئەو پەڕی، ئەویش هەموو شتێکی بەچاودا نەدایەوە، تاکو تەریق نەبێتەوە، ﴿ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ ﴾، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێدا کە ئەو شتەت درکاندوە، ﴿ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ ﴾، ئەو هاوسەرەی پێغەمبەر ﷺ بەسەرسوڕمانەوە بە پێغەمبەری خوای گوت: کێ هەواڵی پێداوی؟ دیارە حەفصە بووە هەواڵی داوە بە عائیشەو، حەفصە ویستوویەتی بزانێ ئایا عائیشە نهێنییەکەی لێ درکاندوە؟، ﴿ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەو کەسە هەواڵی پێدام کە ئەوپەڕی زانیاریی هەیەو، ئەوپەڕی شارەزایی هەیە، واتە: ئەوپەڕی زانای شارەزا کە خوایە، ئەو هەواڵەی پێدام.

وەك لە هۆی هاتنەوە خوارەوەكەیدا باسمان كرد: دوو گێڕراوە لەو بارەوە هەن:

**یەكەم:** كە پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەكی پەنهانی لە لای یەكێك لە هاوسەرانی كردوە، قسە پەنهانەكە ئەوە بووە كە پێغەمبەر ﷺ لەلای زەینەبی كچی جەحش هەنگوینی خواردوەو، عائیشەو حەفصەش ڕێككەوتوون بۆ ئەوەی ئەو هەنگوین خواردنەوەیەی لای زەینەبی پێ تەرك بكەن، پێیان ناخۆش بووە لە لای وی هەنگوین بخواتەوە، ئنجا ڕێككەوتوون كە هات بۆ لای هەر كامێكیان پێی بڵێ: ئایا مەغافیرت خواردوە؟ مەغافیریش جۆرە گیایەكە بۆنێكی ناخۆشی هەیە، بەڵام دەشخورێ، ئایا مەغافیرت خواردوە، بۆنی مەغافیرت لێ دێ؟ ئەو بۆنەشی لێ نەهاتوە، تەنیا بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ وا حاڵیی بكەن، كە تۆ بۆنێكی ناخۆشت لێ دێ، ئیدی كە چووە بۆ لای حەفصە، گوتوویەتی: ئایا مەغافیرت خواردوە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟، فەرموویەتی: نەخێر، بەڵام لە لای زەینەبی كچی جەحش هەنگوینم خواردۆتەوەو لەمەودواش نایخۆمەوە، مادام ئەو بۆنەی لێبێ، نەیزانیوە كە بە فێڵ وایان كردوە، بۆ ئەوەی هەنگوین خواردنەوەكەی پێ تەرك بكەن، دوایی سوێندیشی خواردوە، كە من جارێكی دیكە ئەو هەنگوینە لە لای وی ناخۆمەوە، مادام ئەو بۆنەم لێبێ، فەرمووشیەتی: ئەی حەفصە! با هەر لە لای خۆت بێ و مەیدركێنە ئەم قسەیە، كەچی ئەو چووە بۆ عائیشەی باسكردوە، پێغەمبەریش ﷺ وازی لە هەنگوین خواردنەوەكە هێناوە، كە شتێكی حەڵاڵ و ڕەوا بووە، خواش ﷻ بەو بۆنەوە ئەو ئایەتانەی دابەزاندوون.

**دووەم:** ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ كاتی خۆی پادشای میسڕ كچێكی بۆ ناردوە بە ناوی ماریە، كە دوایی نازناوەكەی ئاوا ڕۆیشتوە: (**ماريَة القِبطِيَّة**) چونكە قیبتیی بووەو خەڵكی میسڕ بووە یانی: ماریەی میسریی، كە بە دیاریی بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ ناردوە، ئەو كاتە وا عادەتی دنیا وابووە، ئافرەت وێڕای ئەوەی كە بە هاوسەرگیریی هاوسەرگیریان لەگەڵ كراوە، وەك كەنیزەكیش ڕەوا بووە، پیاو لەگەڵ كەنیزەكی خۆیدا جووت بێ، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ وەك لە گێڕراوەیەكدا هاتوە، ڕۆژێك لە ماڵی حەفصەدا، كە حەفصە دەچێ بۆ لای بابی، بۆ لای عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێیان ڕازی بێ)، پێغەمبەر ﷺ

بانگی ماریە دەكات و لەوێ لەگەڵیدا جووت دەبێ، حەفصەش دەگەڕێتەوەو پێی دەزانێ، دوایی زۆر تووڕە دەبێ و دەڵێ: چۆن لە ماڵی من و، لە ژووری من و، لە نۆرەی من دا؟! بێگومان پێغەمبەریش ﷺ بۆی ڕەوا بووە، بەڵام دەفەرموێ: خۆت ناڕەحەت مەكە، جارێكی دیكە ناچمەوە لای ئەو ئافرەتە، سوێندیشی بۆ دەخوات كە جارێكی دیكە ناچێتەوە لای، بۆ ئەوەی دڵی ڕازیی بكات، حەفصەش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا شتێك كە حەڵاڵە چۆن لە خۆتی قەدەغە دەكەی؟ دەفەرموێ: سوێندم خواردوەو جارێكی دیكە لەگەڵی دا جووت نابمەوە، بەڵام پێی دەڵێ: هەواڵەكە با هەر لە لای خۆت بێ، كەچی حەفصە دەچێ بە عائیشەی ڕادەگەیەنێ، كە پێكەوە زۆر دۆست و تێكەڵ بوون، هەردوو كچەكانی دوو وەزیرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوو بەكرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، ئنجا بەو بۆنەوە خوای پەروەردگار ئەو ئایەتەی دابەزاندوە.

هۆی هاتنە خوارەوەكەش هەر كامێكیان بێ، چ هەنگوین خواردنەوەكە بووبێ، یاخود جووت بوون لەگەڵ كەنیزەكەكەی دا، هەردووكیان ڕەوا بوون.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا ﴾، ئەگەر هەردووكتان بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، واتە: حەفصەو عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بێگومان دڵتان لایداوە، لە ڕێی ڕاست لایداوە، كە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو هەنگوینە لە لای زەینەبی كچی جەحش نەخواتەوە، هەڵساون لە بەینی خۆتاندا لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون و شتێكی ناڕاستتان گوتوە، پێغەمبەریشتان ﷺ ئەزیەت داوەو، ناچارتان كردوە سوێندتان بۆ بخوات، ئنجا چ بەهۆی هەنگوینەكەوە بێ، چ بەهۆی ماریەوە بووبێ (خوا لێی ڕازی بێ)، ماریەش دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ كوڕێكی لێی بووە، بە ناوی ئیبڕاهیم، بەڵام دوایی ئیبڕاهیمیش وەك كوڕەكانی دیكەی بە گچكەیی كۆچی دوایی كردوە، (خوا لێیان ڕازی بێ).

بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەوە لە جێی خۆیەتی، ﴿ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا ﴾، چونكە دڵەكانتان لایانداوە، پێشتریش گوتمان: لە جیاتی

بفەرمـوێ: (قَلبَاكُـمَا) فەرموویـەتی: ﴿ قُلُوبُكُمَا ﴾، چونکـە عـەرەب پێیـان خـۆش نیـە دوو دووانـە (مُثَنَّـی) لـە یـەك وشـەدا بێنـن، (كُـما) هـەر موثەننایـەو (قَلبـا) ش موثەننایـەو، دوو (مُثَنَّـی)ش قورسـن، بۆیـە لـە حاڵـی وادا کاتێـك شـتێك دووان بووبـێ، کۆیـان کردۆتـەوە، ﴿ قُلُوبُكُمَا ﴾، دڵەکانتـان، دڵەکانیـش هـەر دووانن، ﴿ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيْـهِ ﴾، ئەگـەر لـە دژی پێغەمبەریـش ﷺ پشـتی یەکدی بگـرن، واتـە: هـەر لەسـەر ئـەو کەیـن و بەینـەی دەرهاویشـتەی هەوێدارییـەو، دەبێتـە هـۆی ئـازاردانی دڵـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەردەوام بـن، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوْلَىٰهُ وَجِبْرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَعْدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا پشـتیوانیەتی، (هـی پێغەمبەرەکـەی ﷺ) هەروەهـا جیبریلیـش و بـڕوادارە چاکەکانیـش و فریشـتەکانیش دوای ئـەوە، هـەر پشـتیوانی پێغەمبـەرن ﷺ، ئنجـا وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا بـاس دەکەیـن، جێـی سەرسـوڕمانە کـە خـوا ﷻ لـە بەرامبـەر دوو ئافرەتـدا دەفەرمـوێ: خـوا پشـتیوانیەتی و، جیبریـل پشـتیوانیەتی و پیـاوە بـڕوادارە چاکـەکان پشـتیواننی و، فریشـتەکانیش لـە دوای وان، پشـتیوان و، هـاوکاری پێغەمبـەرن ﷺ، حیکمـەتی ئـەوە چییـە، کـە خـوا ﷻ هـەم خـۆی و هـەم فریشـتەکان و جیبریـل و پیـاوانی بـڕواداری چـاك بـاس دەکات، لـە بەرامبـەر دوو ئافـرەتی بێهێـزدا؟!

زانایـان لـەو بـارەوە زۆریـان قسـە کـردووەو، دوایـی لـەو بـارەوە ڕای خـۆم دەڵێم، لـە مەسـەلە گرنگەکانـداو، کورتەکـەشی ئەوەیـە: پێـم وایـە ئـەوە زیاتـر دوانـدنی لایـەنی عاطیفیـی ئـەو دوو ئافرەتەیـە، ئـەو دوو هاوسـەرە بەڕێـزەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ حەفصـەو عائیشـە، ئافرەتیـش کائینێکـە خـوا وای خوڵقانـدوە، هەسـت و سـۆزی بەهێزتـرەو، خـواش ﷻ ویسـتوویەتی لـەو دەرگایـەوە بیاندوێنـێ، کـە ئایـا ئێـوە دوایـی دەتوانـن بەرهەڵسـتیی خـواو جیبرائیـل و پیـاوانی بـڕواداری چـاك و فریشـتەکان هەموویـان بکـەن؟ ئەوانـە هەموویـان لەپشـت پێغەمبـەرن ﷺ پشـتی دەگـرن، هـاوکار و سەرپەرشـتیارنی، کەواتـە: کارێـکی وامەکـەن پێغەمبـەری خـوا ﷺ تـووڕەو نارەحـەت بکـەن و، سـەرەنجام لەگـەڵ خـوای پـەروەردگار و جیبریـل و پیـاوانی بـڕوادارو فریشـتەکاندا ڕووبـەڕوو ببنـەوە!!.

لـە كۆتايـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ﴾، نیزیكـە ئەگـەر ئـەو (پێغەمبـەری خـوا) تەڵاقتان بـدات، پـەروەردگاری هاوسـەرانێكی باشـتر لـە ئێـوەی بـۆ بڕەخسـێنێ.

ئنجـا وەك دوايـی بـاسی دەكەيـن: شـيعەكان لێـرەدا ئـەم ئايەتەيـان كردۆتـە بيانووی ئـەوی بڵێيـن: ئـەو هاوسـەرانەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ شايسـتەی وی نەبـوون، ئەوەتـا خـوا دەفەرمـوێ: نیزیكـە ئەگـەر تەڵاقتـان بـدا، پـەروەردگاری ئافرەتـانی لـە ئێـوە باشـتری بـۆ بڕەخسـێنێ، واتـە: ئەوانـە بـاش نەبـوون! بـەڵام لـە ڕاسـتييدا ئـەوە بـەس لە پشـت پـەردەی ڕەشـەوە تەماشـا كردنـی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبەرە ﷺ بـە تايبەت حەفصـەو عائيشـە (خـوا لێيـان ڕازی بـێ)، وەك دوايـی ئێمـە لـەو بـارەوە كورتە باسـێك لـە بـارەی پێگـەو كەسايەتيی بـەرزی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەری خـوا دەكەيـن ﷺ، لێـرەدا بەڵـێ خـوای كارزان ئـاوای دوانـدوون، لەسـەر كـەم و كوڕيـی و لادان و لاسارييەك، بـەڵام ئايـا بـەس ئـەم ئايەتـە لـە بـارەی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەرەوە هاتـوە، تاكـو ئـەوەی لـێ هەڵبهێنجـرێ كـە ئەوانـە بـاش نەبـوون و خـوا فەرموويـەتی: ژنانـی باشـترت بـۆ دەڕەخسـێنێ؟ كـە خـوا نەشـيفەرمووە: ئێوە بـاش نيـن، فەرموويەتی: هـی باشـتر لـە ئێـوە، كـە دوايـی حيكمـەتی ئـەو تەعبيـرەش لـەو كورتـە باسـەدا، لـە مەسـەلە گرنگەكانـدا زياتـر تيشـكی دەخەينـە سـەر، ئنجـا ئايـا ئـەو هاوسـەرانەی خـوا بـۆ پێغەمبەريـان دەڕەخسـێنی ﷺ، ئەگـەر دەسـتبەرداری هاوسـەرەكانی ببـێ، چۆنـن؟:

**١و٢:** ﴿ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ ﴾، واتە: بۆ خوا ملكەچن و، بڕوادارن.

(**مُسلم**) كەسێك كە بۆ خوا ملكەچەو بێ فەرمانیی خوا ناكات.

(**مؤمـن**) بەڕاسـتدانەر، خـوا بەڕاسـت دەزانـێ و ئەهـلی ئيمانە، واتە: هاوسـەرانێك هـەم ئەهـلی ئيسـلام بـن، هـەم ئەهـلی ئيـمان بن.

**٣:** ﴿ قَٰنِتَٰتٍ ﴾، (**قانتات**) لە (**قنوت**)ەوە هاتوە، (**قنوت**)يش واتە: گوێڕايەڵیی و ملكەچييەك لەگەڵ نەرميی و ميهرەبانيی دا.

٤: ﴿ تَٰٓئِبَٰتٍ ﴾، بەردەوام بۆ لای خوا گەڕاوە.

٥: ﴿ عَٰبِدَٰتٍ ﴾، بەردەوام خواپەرست.

٦: ﴿ سَٰٓئِحَٰتٍ ﴾، کۆچکەران، یاخود: ڕۆژوو گران.

٧و٨: ﴿ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبۡكَارٗا ﴾، بێوەژنان و کچان، هەموو هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ بێوەژن بوون، جگە لە عائیشە.

ئەمەش ترساندنی خوای کاربەجێیە بۆ هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەگەر بێت و جارێکی دیکە ئەو جۆرە ڕەفتارانە دووبارە بکەنەوە، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و ناچاری بکەن، شتی ڕەوا لە خۆی قەدەغە بکات و سوێندیشتان بۆ بخوات، نزیکە خوا مۆڵەتی بدات دەست لە ئێوە هەڵبگرێ و، پێشتان وانەبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئێوە پەکی کەوتوە، خوای باڵادەست هاوسەرانی لە ئێوە باشتری بۆ دەڕەخسێنێ، یانی: ئێوە باشن، بەڵام ئەگەر لەسەر ئەو ڕەفتارانە بەردەوام بن، مانای وایە ئافرەتانێکی دیکە کە دەیانڕەخسێنێ، لە ئێوە باشتر دەبن، چونکە ئەو ڕەفتارەی ئێوەیان تێدا نابێ، بەڵام ئەگەر دەست لەو ڕەفتارە هەڵبگرن، دیارە حاڵەتی باشترییەکەیان لە خۆیاندا دەپارێزن.

ئەمە کورتەیەك لە مانای گشتیی ئەو پێنج ئایەتە موبارەکە، بۆیە زۆر نەچووینە نێو وردەکارییەکانەوەو، هەوڵماندا چەمك و واتای ئایەتەکان بە پوختیی و بە ڕوونیی بگەیەنین، بەڵام بە دڵنیایی هەندێ وردەکاریی دیکە هەن، کە ئێمە هەم لە مەسەلە گرنگەکاندا باسیان دەکەین، هەم لە کورتە باسێکی تایبەتییش دا، کە لە بارەی پێگەو پایەی بەرزی ڕێزو حورمەتی هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیکەین، دەیانخەینەڕوو.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

ڕەخنەگرتنی خوا ﷻ لە پێغەمبەرەكەی ﷺ كە بە مەبەستی ڕازییكردنی هاوسەرانی، شتێك كە خوا بۆی ڕەوا كردوە، لە خۆی قەدەغەی كردوە، ئنجا دانانی كەففارەتی سوێندو باسی بە نهێنیی و چپە باسكردنی پێغەمبەر ﷺ قسەیەك بۆ یەكێك لە هاوسەرانی و، دركاندنی ئەو نهێنییەو سەرزەنشتكردنی خوا، بۆ ئەو دوو هاوسەرەو ئامۆژگارییكردنییان بە گەڕانەوەو، ترساندنیان بەوە، كە خواو جیبریل و پیاوانی چاكی بڕوادار و فریشتەكان، پشتیوانی پێغەمبەرن ﷺ، ئەگەر لە دژی پشتگیریی یەكدی بكەن بۆ ئازاردانی، بە پاڵنەری هەوێداریی و غەیرەی هەوێدارییەوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٢ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ٣ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ٤﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! بۆچی شتێك كە خوا بۆی حەڵاڵ كردووی، قەدەغەی دەكەی؟ پێشتریش گوتمان: ﴿لِمَ تُحَرِّمُ﴾، بۆچی

قەدەغەی دەکەی؟ (**المَقصُودُ بِهِ الإمتِناعُ عَمَّا هُوَ حَلاَلٌ لَهُ وَحِرْمَانُ نَفسِهِ مِنْهُ**)، مەبەست خۆگرتنەوەیە لە شتێك كە بۆی حەڵاڵەو خۆ بێبەش کردنیەتی لێی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِمَ تُحَرِّمُ﴾، پێشـتریش گوتوومانـە: ﴿لِمَ﴾، لـە دوو پیتـان پێکهاتـوە: (ل) و (مـا)، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی زۆر بەکارهێـنراوە، (**لِما**) ئەلیفەکـەی قرتێـنراوەو بۆتـە: ﴿لِمَ﴾، واتـە: بۆچـی؟ لێـرەدا ئـەو پرسـیارکردنە بـە مانـای لابـردن (**نفـي**)ە، واتـە: هیـچ شـتێك پاساوی ئـەوە نیـە شـتێك کـە خـوا بـۆی ڕەوا کـردووی، لـە خـۆتی قەدەغـە بکـەی.

ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە پێغەمبـەری خوا ﷺ لـەو کارەیـدا کۆشـش (**إجتهاد**) ی کـردوە بـۆ ڕازییکـردنی هاوسـەرەکانی، بـەڵام خـوای کاربەجـێ کۆششـکردنەکەی لـێ هەڵوەشـاندۆتەوە، کـە دروسـت و ڕەوا نیـە شـتێك لـە خـۆت بگریـەوە، کـە خـوا بـۆی ڕەوا کـردووی بـە مەبەسـتی ڕازییکـردنی هاوسـەرانت، واتـە: پیـاو دەبـێ هەوڵبـدات ژنی خـۆی ڕازی بـکات، بـەڵام نابـێ بگاتـە ئـەو ئەندازەیـەی شـتێك خـوا بـۆی ڕەوا کـردوە لـە خـۆی بگرێتـەوە! بـە دڵنیاییـش مەبەسـت لـە: ﴿تُحَرِّمُ﴾، ئـەوە نیـە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرمووبێتـی: فـڵان شـت قەدەغـەو حەڕامـە، بەڵکـو مەبەسـت ئەوەیـە کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: بـەلای ئـەو شـتەدا ناچـم و لـە خۆمـی دەگرمـەوەو لێـی بەهرەمەنـد نابـم.

٢)- ﴿تَبْتَغِى مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ﴾، ڕەزامەندیی هاوسەرەکانت دەخوازی، ئەم ڕستەیە لە ڕووی ڕێزمانییەوە، شوێنەکەی (**نَصْب**)ە، واتە: (**مُبتَغِياً مَرضاتَ أزواجِكَ**)، بەو کارەت کە هەندێك شت، خوا بۆی حەڵاڵ کردووی، لە خۆتی دەگریەوە، هاندەرت بریتیە لە ڕازییکردنی هاوسەرانت، واتە: ﴿تَبْتَغِى﴾، دەبێتە (حاڵ)، لە ڕاناوی ﴿تُحَرِّمُ﴾.

٣)- ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، خواش لێبوردەی بە بەزەییە، ئەمەش خۆشکردن و ئاوپڕژێن کردنی ئەو دواندنەو، ئەو ڕەخنە گرتنەی خوایە لە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە هەر چەندە واشت کردبێ، بەڵام خوا ﷻ لەگەڵ تۆ لێبوردەیەو، بەبەزییشە، ئەم تەعبیرەش شێوەی

ئەو تەعبیرەی سووڕەتی (**التوبة**) دەکات، کە خوا ﷻ ڕەخنەی لە پێغەمبەر گرت لە بارەی مۆڵەتدانی بۆ هەندێك لە دڵنەخۆش و مونافیقەکان کە لەگەڵی نەچوون بۆ جەنگی تەبووك، کە دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ...﴿٤٣﴾﴾التوبة، خوا لێت ببوورێ، چاوپۆشییت لێ بکات، بۆچی مۆڵەتت دان؟ واتە: نەدەبوو مۆڵەتت دابانایە، لەگەڵتدا نەیەن، ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾التوبة، تاکو ئەوانەی ڕاست دەکەن، بۆت ڕوون بووبانەوەو، درۆزنەکانیشت زانیبانایە.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! لە شوێنی دیکەش دا هاتووە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ... ﴿٤١﴾﴾المائدة، ئەی ڕەوانە کراو! ئەمە لێی وەردەگیرێ، کە ئەم فەرمانە تایبەتە بە پێغەمبەرەوە ﷺ و لە جۆری ئەو فەرمانانەیە، کە تایبەتن بە خۆیەوەو، لە جۆری ئەو فەرمانانە نیە کە فەرمانی پێ بکرێ ڕایانبگەیەنێ بە خەڵکی دیکە، بەو واتایەی: تایبەتە بە خۆیەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ، نەك وەك ڕەوانەکراوێك کە ئەو پەیامە بگەیەنێ بە خەڵك، چونکە ئەوە کارێکی کەسیی و خێزانیی بووە.

٤)- ﴿قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡ﴾، بە دڵنیایی خوا هەڵوەشانەوەی سوێندەکانتانی بۆ داناون، (**تحِلَّة أَصْلُهَا تَحْلِلَةٌ، فَأُدْغِمَتْ، وَهِيَ مِنْ مَصَادِرِ التَّفْعِيلِ كالتَّوْصِيَةِ والتَّسْمِيَةِ، فَكَأَنَّ اليَمِينَ عَقْدٌ، والكَفَّارَةُ حِلٌّ، لِأَنَّهَا تُحِلُّ لِلْحالِفِ مَا حَرَّمَهُ عَلَى نَفْسِهِ**)، وشەی ﴿تَحِلَّةَ﴾، لە بنچینەدا (**تَحْلِلَة**)یە، بەڵام دوو لامەکان تێکدا جۆش دراون و، ﴿تَحِلَّةَ﴾، لە چاوگەکانی (**تفعيل**)ە، وەك (**تَوصِيَة**) و (**تَسمِيَة**)، (**وَصَّى، يُوَصِّي، تَوصِيَةً، سَمَّى يُسَمِّي، تَسمِيَةً، أَحَلَّ، يُحِلُّ، تَحِلَّةً**)، وەك سوێندەکە مەبەستێك بێ و، کەففارەتەکەی بریتی بێ لە هەڵوەشاندنەوەی، چونکە دوای کەففارەتەکە، بابای سوێند خۆر ئەوەی لە خۆی قەدەغە کردوە، بۆی ڕەوا دەبێتەوە.

(المقاتل): کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین ئەم ڕستەیەی ئاوا مانا کردوە: (**المَعْنى: قَدْ بَيَّنَ اللَّهُ كَفَّارَةَ أَيْمَانِكم في سُورَةِ المائِدَةِ**)، مانایەکەی ئەوەیە کە خوا

سڕانەوە (**كفارة**)ی سوێندەكانتانی بۆ ڕوون كردوونەوە لە سووڕەتی (**المائِدَة**)دا، پێشتریش ئایەتە موبارەكەكەی سووڕەتی (**المائِدَة**)مان خوێندەوە، كە دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾المائدة.

واتایەكەشی بە كورتیی ئاوایە:

خوا لێتان ناگرێ بە سوێندی سەر زارەكیی، بەڵام لێتان دەگرێ بەو سوێندانەی دڵتان لەسەریان چەسپاندووون، سڕینەوەی ئەو سوێندانەش بریتیە لە: خواردندان بە دە (١٠) نەدار لە خواردنێكی میانجیی كە دەرخواردی ماڵ و خێزانتانی دەدەن، یان پۆشاك بۆ كردنیان (بۆ دە (١٠) نەدار)، یان ئازاد كردنی كۆیلەیەك، هەر كەسێك وەدەستی نەكەوت، (هیچ كام لەو سێیانە یان توانای ماددیی نەبوو)، سێ ڕۆژان بە ڕۆژوو دەبێ، ئەوە سڕینەوەی سوێندەكانتانە، هەر كاتێ سوێندتان خوارد (ئنجا ویستتان ئەو شتەی سوێندتان لەسەری خواردوە، دووبارە بگەڕێنەوە سەری، بۆ وێنە: سوێندت خواردوە: سەلام لە فڵانكەس ناكەم، یان سوێندت خواردوە: ناچمە ماڵی فڵانكەس، یان سوێندت خواردوە: فڵان شتە ناخۆم، بەڵام دوایی پێویست دەكات بیخۆی، یان پێویست دەكات ئەو سەردانانە بكەی، كەففارەت بدەو بگەڕێوە سەر شتەكەی خۆت، وەك لە سووڕەتی مائیدەدا كورتە باسێكمان لە بارەی سوێندەوە كردوەو لێرە ناچینە نێو وردەكارییەكان)، دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ ﴾، سوێندەكانیشتان بپارێزن، واتە: لە خۆوە سوێند مەخۆن و، زۆر سوێندان مەخۆن، كە سوێندیشتان خوارد، مەگەر ئەو شتەی سوێندی لەسەر خوراوە، سوێند لەسەر خوراو (**مُقسَمٌ عَلَيهِ**)ەكە، جێ بە جێ كردنی فەڕز یان پەسند بێ، ئەگەرنا مادام سوێندتان خوارد، سوێندەكەتان بەرنە سەرو بیپارێزن.

یەکێکی دیکە لە زانایان لە بارەی چەمکی ئەو ئایەتە موبارەکەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿ قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ ﴾، دەڵێ: (أَمَرَ اللَّهُ نَبِيَّهُ ﷺ أَنْ يُكَفِّرَ يَمِينَهُ وَيُرَاجِعَ وَلِيدَتَهُ، فَأَعْتَقَ رَقَبَةً)، خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد، کەففارەتی سوێندەکەی بدات و بگەڕێتەوە بۆ لای کەنیزەکەکەی، بۆیە کۆیلەیەکی ئازاد کرد، تاکو ماریەی بۆ ڕەوا بێتەوە، چونکە سوێندی خواردبوو بەلایدا نەچێتەوە، ئەوە ئەگەر هۆی هاتنە خوارەوەکەی ئەوە بوو بێ، ئەگەر هەنگوین خواردنەوەکەش بوو بێ، کۆیلەیەکی ئازاد کردووەو کەففارەتی داوە، بەپێی ڕای ئەو زانایە.

(الطبري)یش لەو بارەوە ئەم دەقە دێنێ: (عَنْ مَسْرُوقٍ رَحِمَهُ الله قَالَ: آلَى رَسُولُ الله ﷺ وَحَرَّمَ، فَعُتِبَ فِي التَّحرِيمِ وَأُمِرَ بِالكَفَّارَةِ فِي اليَمِين)، (جامع البيان: ٣٤٤٧٥) مەسڕووق کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووان دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیلای کردوە، (سوێندی خوارد نەچێتە لای ئەو کەنیزەکەی) و شتێکی لە خۆی قەدەغە کرد، ئنجا لەو بارەوە لۆمەی کرا، (بۆچی لە خۆی قەدەغە کردوە؟) و فەرمانیشی پێکرا کەففارەتی سوێند بدات.

٥)- ﴿ وَاللَّهُ مَوْلَىٰكُمْ ﴾، خوا سەرپەرشتیاری ئێوەیە، واتە: سەرپەرشتیارو دۆست و نیزیکی ئێوەیە، بە تایبەتی هی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

٦)- ﴿ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ﴾، هەر خواش زانای کارزانە، واتە: زانایە بە هەموو شتێك و کارزانە لە هەر فەرمایشتێك و هەر حوکمێکیدا.

ئنجا ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ کەففارەتی سوێندەکەی داوە، یان نا؟ (الزَّجَّاجُ) کە یەکێکە لە زانایان گوتوویەتی:

(وَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يُحَرِّمَ مَا أَحَلَّ اللَّهُ، قُلْتُ: وَهَذَا هُوَ الْحَقُّ أَنَّ تَحْرِيمَ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لاَ يَنْعَقِدُ وَلَا يَلْزَمُ صَاحِبَهُ، فَالتَّحْلِيلُ وَالتَّحْرِيمُ هُوَ إِلَى اللَّهِ سُبْحَانَهُ لاَ إِلَى غَيْرِهِ، وَمُعَاتَبَتُهُ لِنَبِيِّهِ ﷺ فِي هَذِهِ السُّورَةِ أَبْلَغُ دَلِيلٍ عَلَى ذَلِكَ، وَاخْتَلَفَ الْعُلَمَاءُ هَلْ مُجَرَّدُ

التَّحْرِيمِ يَمِينٌ يُوجِبُ الْكَفَّارَةَ أَمْ لَا؟ وَفِي ذَلِكَ خِلَافٌ، وَلَيْسَ فِي الْآيَةِ مَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ يَمِينٌ، لِأَنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ عَاتَبَهُ عَلَى تَحْرِيمِ مَا أَحَلَّهُ لَهُ، وَقَدْ وَرَدَ فِي الْقِصَّةِ التي ذهب أكثر المفسرين إلى أنها سَبَبُ نُزُولِ الْآيَةِ، أَنَّهُ حَرَّمَ أَوَّلًا ثُمَّ حَلَفَ ثَانِيًا)[1].

واتە: هیچ کەس بۆی نیە شتێك کە خوا حەڵاڵی کردوە، قەدەغەی بکات، گوتم: {یانی: (الشوكاني)}، هەر ئەوەش ڕاستە، چونکە قەدەغە کردنی شتێك کە خوا حەڵاڵی کردوە، هەر دانامەزرێ و خاوەنەکەی پێوەی پابەند ناکرێ، چونکە بە حەڵاڵ دانان و بە حەرام دانان، تەنیا هی خوان ﷻ و مافی کەسی دیکە نیە، لەم سوورەتەشدا کە خوا لۆمەی پێغەمبەرەکەی دەکات ﷺ باشترین بەڵگە هەیە لەو بارەوە، کە هیچکەس بۆی نیە شتێك کە خوا حەڵاڵی کردوە، قەدەغەی بکات، ئنجا زانایان لەو بارەوە لە ڕاجیایی دان، کە ئایا تەنیا بە قەدەغە دانانی شتێك بە سوێند دادەنرێ و، کەففارەتی بۆ پێویست دەبێ، یان نا؟ بەڵام لە ئایەتەکەدا هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر ئەوەی لە خۆ قەدەغە کردنی شتێك، سوێندە، چونکە خوا ﷻ لەسەر ئەوە لۆمەی کردوە کە خوا شتێکی بۆ حەڵاڵ کردوە و ئەو خۆی لێ گرتۆتەوە، {واتە: لە خۆی قەدەغە کردوە} و لەو بەسەرهاتەشدا کە زۆربەی ڕوونکەرەوەی قورئان گوتوویانە: هۆی هاتنە خواری ئایەتەکەیە، هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتەکەی لە خۆی قەدەغە کردوەو، دواییش سوێندی خواردوە (کەواتە: خودی لە خۆ قەدەغە کردنەکە سوێند نەبووە، بەڵکو سوێندەکەی دوایی خواردوەو، ئەگەر کەففارەتی دابێ، ﴿تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡ﴾، لەبەر سوێندەکە بووە، نەك لەبەر خودی لە خۆ قەدەغە کردنەکە).

هەڵبەتە منیش هەر ئەو ڕایەم پێ پەسندە، کە خودی لە خۆ قەدەغە کردنی شتێك، بە سوێند دانانرێ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وێڕای لە خۆ قەدەغە کردن، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکاندا باسمان کرد، سوێندیشی خوارد کە

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص٣٠٣.

جارێکی دیکە ئەو هەنگوینە نەخواتەوە لە لای زەینەبی کچی جەحش، یان جارێکی دیکە نەچێتەوە لای ماریەی **قیبطیی** خوا لێی ڕازی بێ.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆ قەدەغە کردنی هەنگوین خواردنەوە لە لای زەینەبی کچی جەحشی یان بە لای ماریەی **قیبطیی** دا نەچوونی، درکاندوە، بۆ یەکێك لە هاوسەرانی و بە چپە بە یەکێك لە هاوسەرانی گوتوە، کەچی ئەو لێی ئاشکرا کردوە:

٧)- ﴿ وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا ﴾، یاد بکەوە کاتێك پێغەمبەر ﷺ قسەیەکی نهێنیی بۆ یەکێك لە هاوسەرانی درکاند، کە دەفەرموێ: ﴿ بَعْضِ ﴾، (هەندێك) مەبەستی پێ یەکێکە، یانی: قسەیەکی نهێنیی لە لای یەکێك لە هاوسەرانی درکاند، قسەیەکی نهێنیی پێگوت، وشەی ﴿ أَسَرَّ ﴾، (**مُشتَقٌّ مِنَ السِّرِّ وَالهَمزَةُ لِلجَعلِ، أَي: جَعَلَهُ ذا سِرٍ، أَسَرَّ فِي نَفسِهِ أَي: كَتَمَ سِرَّهُ**)، کەواتە: ﴿ أَسَرَّ ﴾، داتاشراوە لە وشەی (**سِرّ**)، واتە: نهێنیی، هەمزەکەش بۆ گێڕانە، (**أَسَرَّهُ: أَي جَعَلَهُ ذا سِرٍّ**)، واتە: کردی بە خاوەن نهێنیی، واتە: قسەیەکی نهێنیی بۆ یەکێك لە هاوسەرانی کرد، دیارە پێشی فەرمووە: تەنیا لە لای تۆیەو مەیدرکێنە، (**أَسَرَّ: أَي أَخبَرَ بِمَا يُرَادُ كِتمانُهُ عَنْ غَيرِ المُخبَرِ**)، ﴿ أَسَرَّ ﴾، یانی: هەواڵێکی دا کە دەویسترێ بشاردرێتەوە لە جگە لە ئەو کەسەی هەواڵەکەی پێدراوە.

٨)- ﴿ فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ ﴾، کاتێك هەواڵی پێدا، ئەو هاوسەرەی هەواڵەکەی پێدرا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ نهێنییەکەی لە لا دانابوو بە چپە، ﴿ فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِۦ ﴾، بەرکارەکەی قرتێنراوە، یانی: (**فَلَمَّا نَبَّأَت حَفصَةُ عَائِشَةَ بِهِ**)، دوای ئەوەی حەفصە هەواڵەکەی بە عائیشەدا، خوا لێیان ڕازیی بێ، بەڵام بەرکار (**مَفعُولٌ بِهِ**)یەکە قرتێنراوە، ﴿ فَلَمَّا نَبَّأَتْ ﴾، (ت)ەکە ڕاناوێکی تێدا شێردراوەیە، ﴿ نَبَّأَتْ ﴾، کارو بکەر (**فعل وفاعل**)ە، (**فاعِلُه ضَمِيرٌ مُستَتِرٌ تَقدِيرُها هِيَ**)، بکەرەکەی ڕاناوێکی شێرراوەیە بە (**هي**) مەزەننە دەکرێ و بۆ حەفصە دەچێتەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەپێی هۆی هاتنەوە خوارەوەکان، بەڵام بەرکارەکەی یانی: (**نَبَّأَت عائِشَةَ**) هەواڵەکەی بە عائیشەدا، یان (**نَبَّأَتها بِهِ**) هەواڵەکەی پێدا، یانی: بە یەکێکی دیکەی سێیەم کە بریتی بووە لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ).

٩)- ﴿وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ﴾، خواش ﷻ ئەوی (پێغەمبەری ﷺ) لێ ئاگادار کردەوە، ﴿وَأَظْهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيْهِ﴾، (**أَي أَطْلَعَهُ اللهُ عَلَيهِ**)، خوا پێغەمبەری ﷺ لێ ئاگادار کردەوە، دیسان (**أَظهَرَهُ**) (هـ)ەکە ڕاناوە و بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتەوە، وشەی (**أَظهَرَهُ: مُشتَقٌّ مِنَ الظُّهُورِ**)، (**ظهُورِ**) واتە: زاڵبوون، واتە: وایکرد پێغەمبەر ئەو هەواڵە بزانێ.

١٠)- ﴿عَرَّفَ بَعْضَهُۥ وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ﴾، ئەویش هەندێکی ناساندو وازیشی لە هەندێکی هێنا، وشەی ﴿عَرَّفَ﴾، بە زۆریی وایان خوێندۆتەوەو هەندێکیان بە (**عَرَفَ**)شیان خوێندۆتەوە، (**عَرَفَ**) یانی: زانی، بەڵام ﴿عَرَّفَ﴾، واتە: ناساندی، یانی: ئەو هەواڵەی ئاشکرای کردبوو، پێغەمبەر ﷺ هەندێکی بۆ باسکرد بۆ حەفصە، ﴿وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ﴾، چاوپۆشییشی لە هەندێکی کرد، ڕووی لە هەندێکی وەرگێڕا، لێرەدا ﴿عَرَّفَ﴾: (**المَفعُولُ الأَوَّل لِعَرَّفَ مَحذُوفٌ أَي عَرَّفَهَا بَعضَهُ**)، بەرکاری یەکەمی (**عَرَّفَ**) قرتێنراوە، واتە: هەندێك لە هەواڵەکەی پێ گوتەوەو پێی ناساند، ﴿عَرَّفَ بَعْضَهُۥ﴾، لەوەی خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو بوو، (**أَي مَا أَطْلَعَهُ اللهُ عَلَيهِ**)، پێغەمبەر ﷺ بەشێك لەوەی خوا لێی ئاگادار کردبۆوە بە حەفصەی گوتەوە، کە نهێنییەکەی لە لا دانابوو، ﴿وَأَعْرَضَ عَنۢ بَعْضٍ﴾، وازیشی لە هەندێکی هێنا، وەك پێشتریش گوتمان: زانایان گوتوویانە: (**مَااستَقصَى كَرِيمٌ قَطّ**)، مرۆڤی بەڕێز هەرگیز لە مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا، نایگەیەنێتە ئەوپەڕی، هەموو شتێك ناڵێ و، هەموو شتێك ناکات و تێیدا دەهێڵێتەوە.

١١)- ﴿فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ﴾، کاتێك (پێغەمبەری خوا ﷺ) هەواڵی پێدا (کە نهێنییەکەی وی ئاشکرا کردوە)، (**أَي: نَبَّأَ النَّبِيُّ حَفصَةَ بِإِفشاءِ سِرِّهِ**)، یانی: دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی دا بە حەفصە، بە بڵاو کردنەوەی ئەو نهێنییەی داوای لێ کردبوو نەیدرکێنێ.

١٢)- ﴿قَالَتْ مَنْ أَنۢبَأَكَ هَٰذَا﴾، (ئەو ئافرەتە) گوتی: کێ ئەو هەواڵەی بەتۆدا؟ زانایان گوتوویانە: ئەو تەعبیرە ئەوە دەگەیەنێ کە حەفصە زۆر متمانەی بە عائیشە بووە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە نهێنیی وی نادرکێنێ، بۆیە پێی سەیر بووە: من پێم نەگوتووی و عائیشەش نایدرکێنێ، ئەدی کێ هەواڵەکەی پێدای؟ بەسەرسوڕمانەوە وایگوتوە، سەرسوڕمانەکەش لێرەدا ڕاستەقینەیە، بە مانای سەرسوڕمان و پرسیارە.

١٣)- ﴿قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ﴾، فەرمووی: زانای شارەزا هەواڵەکەی پێدام، یانی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی، زانای شارەزا، کە خوای بەرزە، هەواڵەکەی پێدام.

زۆربەی زانایان هەر بە ﴿عَرَّفَ﴾یان خوێندۆتەوە، بەڵام (**الكِسائي**) کە یەکێکە لە قورئانخوێنەکان، بە (عَـرَفَ)ی خوێندۆتەوە، (عَـرَفَ بَعضَـهُ)، ئنجا (الطبری) دەڵێ: (**عَـرَفَ لِحَفْصَـةَ بَعْـضَ ذَلِـكَ الْفِعْـلِ الَّـذِي فَعَلَتْـهُ مِـنْ إِفْشَـائِهَا سَرَّهُ، وَقَـدِ اسْـتَكْتَمَهَا إِيَّـاهُ، أَيْ: غَضِـبَ مِـنْ ذَلِـكَ عَلَيْهَـا رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ، وَجَازَاهَـا عَلَيْـهِ؛ مِـنْ قَـوْلِ الْقَائِـلِ لِمَـنْ أَسَـاءَ إِلَيْـهِ: لَأَعْرِفَـنَّ لَـكَ يَـا فُلَانُ مَـا فَعَلْـتَ، بِمَعْنَـى: لَأُجَازِيَنَّـكَ عَلَيْـهِ**).

ئەگەر بە (عَـرَفَ) بخوێندرێتەوە (عَـرَفَ بَعضَـهُ) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کردەوەیەی حەفصە ئەنجامی دابوو کە بریتی بوو لە درکاندنی نهێنیی وی، لە حاڵێکدا پێی فەرموو بوو: ئەو نهێنییە مەدرکێنە، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی تووڕە بوو و لەسەر ئەوە سەرزەنشتی کرد، چونکە لە زمانی عەرەبییدا بۆ کەسێك خراپەی لەگەڵ کەسێك کردبێ، دەڵێ: (**لَأَعْرِفَـنَّ لَـكَ يَـا فُلَانُ مَـا فَعَلْـتَ**)، ئەوەی لەگەڵ منتدا کردوە بۆت دەناسم، بۆت دەزانم، واتە: لەسەری سزات دەدەم و بۆت قەرەبوو دەکەمەوە.

لە کوردییش دا دەگوترێ: (بۆت لە نێو دوو نانی گەرمدا هەڵدەگرم).

ئنجا خوا ﷻ بە هەردوو هاوسەرە بەڕێزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ (**حفصة وعائیشة**) دەفەرمویٚ:

١٤)- ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا﴾، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بە دڵنیایی دڵەکانتان لایانداوە، یانی: ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، جێی خۆیەتی، چونکە دڵتان لایداوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە پێکەوە کەین و بەینتان کردوە، بە هاندەری غەیرەی هەوێداریی و تێتانپەڕاندوەو، واتانکردوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتە ڕەوایە لە خۆی قەدەغە بکات، کە خواردنەوەی هەنگوینە لە لای زەینەبی کچی جەحش، یاخود چوونە لای ماریەی **قیبطییە**، خوا لێیان ڕازی بێ، کە حەڵاڵی بووە.

دەشـگونجێ: مانـای ڕسـتەی: ﴿ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَا ﴾، ئـاوا بـێ: (**أَي: مالَـت إِلَى التَّوبَـةِ**)، دڵەکانتـان بـۆ گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا مەیلیـان کـردوەو ئێسـتا کاتیـەتی.

ئەگـەر مانـای یەکەمیـان بـێ واتـە: ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ لای خوا، شـتێك لـە ئێوە ڕوویـداوە، هـۆکاری ئەوەبـێ بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، ئەگـەر مانـای دووەمیشـیان بـێ، یـانی: ئەگـەر بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، ئێسـتا دڵتـان نـەرم بـووەو لایـداوە بـۆ گەڕانـەوە بـۆ لای خـواو کاتیـەتی.

١٥)- ﴿ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ ﴾، بەڵام ئەگەر پشتی یەکدی بگرن لە دژی وی (واتە: لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ)، (**التَّظَاهر: التَّعَاضُدُ وَالتَّعَاون**)، (**تظَاهر**) پشتی یەکدی گرتن و هاوکاریی یەکدی کردنە، وشەی: ﴿ تَظَٰهَرَا ﴾، وێڕای ﴿ تَظَٰهَرَا ﴾، بە دوو جۆری دیکەش خوێندراوەتەوە: یەکەم: (**تَتَظَاهَرَا**)، دووەم: (**تَظَّهَّرا**)، هەر سێك خوێندنەوەکانیش بە یەك واتان، واتە: پشتی یەکدی بگرن و هاوکاری یەکدی بن، لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبەتە بەو واتایەنا کە دوژمننی، بەڵکو بەو واتایە کە پشتی یەکدی بگرن کە پێغەمبەر ﷺ بە هۆی هەنگوین خواردنەوەکەوە لە لای زەینەبی کچی جەحش، زیاتر دڵی بە لای زەینەبدا نەچێ، یان بەهۆی ئەوەوە کە دەچێتە لای ماریەی **قیبطی**، ئەوان مونافیسێکی دیکەشیان بۆ پەیدانەبێ و لە کۆڵیان بێتەوە، هەتا لە هەندێك ڕیوایەتاندا هاتوە: حەفصە کە نهێنییەکە بە عائیشە دەڵێ، دەڵێ: عائیشە! ئەوە ماریەی **قیبطییم** لە کۆڵ کردیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خواردوە جارێکی دیکە بەلایدا نەچێ!

ئنجـا کەسـێك زیاتـر لـەو ئایەتانـە تێـدەگات، کـە ئەزمـوونی چەنـد ژنیـی هەبـێ، بـەڵام کەسـێک ئـەو ئەزموونـەی نەبـێ، پێـی سـەیرەو وادەزانـێ کـە ئـەو هاوسـەرانە دژی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوون، وەك شـیعەکان[1] کـە هـەر لـە پشـت پـەردەی ڕەشـەوە تەماشـا دەکـەن، وەك دواییـش بـاس دەکـەم، وایانزانیـوە کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ ﴾، ئەگـەر لـە دژی وی پشـتی یەکـدی

(١) شیعەی دوازدەیی (الشیعة الإثناي عشرية)، زۆربەی هەرە زۆریان.

بگرن، حەفصەو عائیشە ئیشیان هەر ئەوە بووە، کە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ بن! نەخێر، بەڵکو لەبەر خۆشویستنی زێدەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان خۆشبووە، پێغەمبەر بەس ئەوانی هەبێ، ئنجا کە هەنگوینی لە لای زەینەبی کچی جەحش خواردۆتەوە، مەترسیی ئەوەیان هەبووە، وەك گوتراوە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) بە حەفصەی گوت: حەفصە! بۆم چاودێریی بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژوورەکەی زەینەبی کچی جەحش دا پێی دەچێ و نۆرەشی نیە، چی دەکات؟ گوتراویشە: عائیشە کەنیزەکێکی ڕاسپارد، بزانێ چی دەکات؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێ هەنگوین دەخواتەوە، وایانزانیوە لەگەڵیدا جووت دەبێ و نۆرەی خۆشی نیە! بە نسبەت ماریەی **قیبطییە**وەش، ئەگەر هۆی دابەزینەکە ئەوە بووبێ، دەشگونجێ لە یەك کاتدا هەردووکیان بووبن، حەفصەو عائیشە خوا خوایان بووە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك لە هاوسەرەکانی لەبەر چاوی بکەوێ و لێیان کەم بێتەوە، ئنجا ئەوەش هەستی ئافرەتەو هەستی هەوێدارییەو ئافرەتان بەگشتیی وان، ئنجا مادام هاوسەرانی پێغەمبەری خوا وابووبن، مانای وایە ئەوە شتێکی سرووشتییە لە ئافرەتانداو، پێویست ناکات گومانی خراپ بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ببەین، یاخود بێژە قورئانییەکە زیاد لەو مانایەی هەڵیدەگرێ، بیخەینە سەر، لەبەر ئەوەی گومانی خراپ بە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبەین، چونکە هەرچی دایکانی بڕواداران کردوویانە، لەبەر زێدە خۆشەویستییان بووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

(ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر پشتی یەکدیش بگرن لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ بە شێوەیەك دڵی ئازار بدەن)

١٦)- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا سەرپەرشتیارو دۆستیەتی و، جیبریلیش و پیاوە بڕوادارە چاکەکانیش و، لە دوای وانیش فریشتەکانیش هاوکارو پشتگیری.

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾، وشەی (**المَلَائِكَة**) دەبێتە نیهاد، (**ظَهِير**)یش دەبێتە گوزارە، (**المَلَائِكَة**)ش بۆ کۆیەو کۆی (**مَلَك**)ە، (**ظَهِير**)یش بۆیە بەو ڕێژگەیە هاتوە، چونکە لە زانیاریی نەحوودا ئەوە چەسپاوە، کە ڕێژگەکانی وەك: (**ضَرِيع و صَبُور و ظَهِير**)، (تاك و دووان و کۆ)یان پێ وەسف دەکرێن.

## چوار سەرنجی گرنگ

ئێمە لێرەدا بۆ زیاتر تیشك خستنە سەر چەمك و واتای ئەو چوار ئایەتە موبارەکە، چوار سەرنج دەخەینە ڕوو، هەڵبەتە دواییش پاش ئەوەی مەسەلەی دووەم دەخەینەڕوو، کە ئایەتی پێنجەم دەگرێتە خۆی، کورتە باسەکە دەکەین:

### سەرنجی یەکەم:

زانایان لە بارەی حوکمی لەسەرخۆ قەدەغە کردنەوەی کەسێك بۆ شتێك، ڕاجیاییان زۆرە، ئایا ڕەوایە، ڕەوا نیە؟ حوکمی چۆنە؟ (**القرطبي**) لەو بارەوە هەژدە (١٨) ڕای هێناون[1]و، (**إبن عاشور**)[2]یش لە چوار (٤) ڕادا، ئەو هەژدە (١٨) ڕایانەی (**القرطبي**) هێناونی، پوخت و کورتی کردوونەوەو، گوتوویەتی: ئەوە پوختەی ئەو هەژدە (١٨) ڕایەیەو، زیاتر ڕێیان تێدەچێ و ئەمانەش چوار ڕایەکەن:

**١-** بابای قەدەغەکەر هیچی ناکەوێتە سەر، قەدەغەکراوەکە ژن بێت، یاخود خواردنێك بێت، واتە: کەسێك دەڵێت: فڵان شتەم لێ قەدەغە بێ، ئەوە بەس قسەیەکە، قسەیەکی هەڵەیە کردوویەتی، بەڵام هیچی ناکەوێتە سەر، نە کەففارەتی سوێندو نە هیچ.

---

(١) الجامع الأحكام القرآن، ج٢٨، ص: ١٤٠ – ١٤٢.

(٢) التحرير والتنوير، ج٢٨، ص: ٣٤٨ – ٣٤٩.

٢- بابای قەدەغەکەر پێویستە کەففارەتی سوێند بدات، چونکە هەر خودی قەدەغە کردنەکە بە ڕای هەندێك لەو زانایانە، بە سوێند لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام ئێمە پێشتر گوتمان: ئەو ڕایە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، کە خودی قەدەغە کردن بە تەنیا، سوێند بێ.

٣- لە جگە لە ژندا، بابای قەدەغەکەر هیچی ناکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر قەدەغەکراوەکە ژن بێ، ئەو کاتە ئەو ژنەی یان گواستۆتەوە یان نەیگواستۆتەوە، ئەگەر گواستبێتیەوە، گوتراوە: وەك تەڵاقی سێ بەسێیەو، ئەمەش ڕای مالیکە، بەڵام ئەگەر نەیگواستبێتەوە، بەپێی نیەتەکەی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ، ئەگەر نیەتی تەڵاقدان بێ، تەڵاقەو، ئەگەر نیەتی تەڵاقدان نەبێ، هیچ نیە، هەندێکیش گوتوویانە: لەهەردوو حاڵاندا واتە: ئافرەتەکەی چ گواستبێتەوە، چ نەیگواستبێتەوە، مادام بڵێ: لێم قەدەغەی، ئەوە هەر بۆی بە تەڵاق حیسێبەو بە سێ تەڵاق بۆی دادەنرێ، هەندێکیش کە شافیعییان لە نێودایە گوتوویانە: ئەگەر نیەتی تەڵاقی هێنابێ، ئەوە بەپێی نیەتەکەیەتی و بۆی بە تەڵاق حیسابە، بەڵام تەنیا یەك تەڵاقی ڕەجعیی بۆ حیسابە، واتە: ئەگەر نیەتی تەڵاقیشی هێنابێ، یەك تەڵاقی دەکەوێ.

٤- هەندێکیش کە ئەبوو حەنیفەیان لە نێو دایە، ڕەحمەتی خوا لە هەموو زانایان بێ، گوتوویانە: ئەگەر مەبەستی **ظیهار** بێ، بەپێی نیەتەکەیەتی و، ئەگەر نیەتیشی تەڵاق بێ، بە یەك تەڵاقی جیاکەرەوە (بائن) بۆی حیسابە، مەگەر نیەتی سێ تەڵاقانی هێنابێ، ئەو کاتە هەر سێکیانی دەکەون، ئەگەر نیەتی هیچیشی نەهێنابێ، ئەوە بۆی بە سوێند دادەنرێ و کەففارەتی لەسەرە، ئەوە پوختەی ڕای زانایانە، کە من ڕای یەکەمم لە هەمووان پێ ڕاسترە، کە بابای قەدەغەکەر (**مُحرِّم**) هیچی ناکەوێتە سەر، قەدەغە کراوەکە، ژن بێ، یان خواردن بێ، یان هەر شتێك بێ، بەڵام بە دڵنیایی کەسێك لەخۆوە بڵێ: فلان شتە لێم حەڕام بێ و قەدەغەیە، قسەیەکی هەڵەی کردوە، ئەدی هی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی خوا باسی سوێند دەکات و دەفەرموێ: ﴿ قَدْ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَٰنِكُمْ ﴾؟، باسمان کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ وێڕای لە خۆ قەدەغەکردن سوێندیشی خوارد بوو، کەففارەتەکە بۆ سوێندەکەی بووە، بەڵام لە خۆ قەدەغە کردنەکە، قەدەغەکردن تەنیا

بە دەست خوایەو، حەڵاڵ کردن و حەڕام کردن تەنیا مافی خوای پەروەردگارەو کەسی دیکە بۆی نیە، تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ، بۆیە کەسێك کە دەڵێ: ئەو شتەم لێ قەدەغەو حەڕام بێ، ئەوە هەر قسەیەکی هەڵەیە دەیکات، بۆیەش خوا ﷻ لەسەر ئەوە لۆمەی پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوەو ڕەخنەی لێگرتوە، کە بۆچی ئەو قسەیەت کردوە؟!

**سەرنجی دووەم:**

کە دەفەرموێ: ﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾، بە دڵنیایی دڵەکانتان لایانداوە، بێگومان مەبەست پێیان حەفصەو عائیشەیە، خوا لێیان ڕازی بێ[1]، کە پێشتر بەسەرهاتەکەمان هێنا، کەواتە: مەبەست لە: ﴿قُلُوبُكُمَا﴾، دڵەکانتان، دڵی هەردوو هاوسەری بەڕێزو خاوەن پێگەی بەرزی پێغەمبەری خوایە، خوا لێیان ڕازی بێ: حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتتاب و، عائیشەی کچی ئەبوو بەکری صیددیق، پێشتریش گوتمان کە دەفەرموێ: ﴿قُلُوبُكُمَا﴾، لەبەر ئەوە بووە کە عەرەب عادەتیان وایە، ئەگەر دوو شتیان باس کردن، هەردووکیان دووان (**مُثَنَّى**) بوون، هەردووکیان بە دووان (**مُثَنَّى**) ناهێنن و یەکیان دەکەنە کۆ (**جمع**)، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا﴾، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (**فَقَد صَغَت قَلبَاكُما**)، دوو دڵەکانتان لایانداوە، لە عەرەبییدا ئەوە قورسە لەسەر زمان، بۆیە فەرموویەتی: ﴿قُلُوبُكُمَا﴾، دڵەکانتان لایاندا، ئاشکراشە مەبەست لە دڵەکان هەر ئەو دوو دڵەن و، لە زمانی عەرەبییدا دروستە دووش بە کۆ بهێنرێن.

**سەرنجی سێیەم:**

ئایا حیکمەتی ئەوە چییە کە خوا ﷻ خۆی و جیبریل و فریشتەکان و پیاوە بڕوادارە چاکەکانی، هەموو پێکەوە کۆ کردوونەوە، لە بەرانبەر ئەو دوو ئافرەتەدا، خوا لێیان ڕازی بێ؟ زانایان دوو واتایان بۆ هێناون لە تەفسیرەکاندا، بەڵام من ڕایەکی دیکەی سێیەمم هەیە:

---

(١) صحيح البخاري: ٥١٩١، وصحيح مسلم: ١٤٧٩.

أ- مەبەست تەنیا ئەو دوو هاوسەرە نین، بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە هەر كەسێك دژی پێغەمبەری خوا ﷺ بێ و ئازاری بدات و نارەحەتی بكات، با بزانێ كە لەگەڵ كێدا تەرەفە، كێی لەبەرانبەر دایە، خوا ﷻ و جیبریل سەرۆكی فریشتەكان و، فریشتەكان و پیاوانی بڕواداری چاك.

ب- ڕایەكی دیكەی زانایان ئەوەیە كە مەبەست لەمە، دەرخستن و ئاشكرا كردنی پێگەی بەرزی پێغەمبەرە ﷺ لە لای خوای بەرز، كە خوا ئەوەندە پێغەمبەری خۆی خۆشدەوێ، هەر كەسێك لە بەرانبەری دا بوەستێ، خۆی و جیبریل و فریشتەكانی و پیاوانی صاڵحی بڕواداریش، هەموویان یەك بەرەن و لە بەرانبەریدان.

ج- بەندەش ڕایەكی دیكەی سێیەمم هەیە، كە لە مانا گشتییەكەش دا ئاماژەم پێدا، بە دڵنیایی ئەو دوو مانایەی دیكەش هەر دەگونجێن، بەڵام پێم وایە ڕایەكی دیكەی سێیەم یان هۆكارێكی دیكە سێیەم هەیە، بۆ كۆكردنەوەی ئەوانە هەموویان لە بەرەیەكدا، لە بەرانبەر دوو ئافرەتاندا، ئەویش ئەوەیە كە ئافرەت (ئافرەتان بە گشتیی) سۆزو بەزەیی تێیاندا بەهێزترە لە عەقڵ و مەنطیق، ئەوەش حەقیقەتێكە زانست و مێژوو و واقیع دەیڵێن، لێرەش خوا ﷻ ئەگەر هەر فەرمووبای: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ ! لاساریی مەكەن، نارەحەتی مەكەن و ئازاری مەدەن، ئەوە شتێك بوو، بەڵام كە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ﴾، ئەگەر هاوكاریی یەكدی بكەن لە دژی، بە دڵنیایی خوا سەرپەرشتیاریەتی و ﴿وَجِبۡرِيلُ﴾، جیبریلیش بەهەمان شێوە سەرپەرشتیاریەتی و ﴿وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، پیاوە بڕوادارە چاكەكانیش پشتیوانی پێغەمبەرن ﷺ ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ﴾، فریشتەكانیش دوای ئەوە هاوكارو پشتیوانن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمە بێگومان كاریگەریی لەسەر عاطیفە و هەست و سۆزی ئافرەتەكان زیاتر هەیە، كە بیر بكەنەوە: چۆن دەبێ من شتێك بكەم، كە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش بێ و، سەرەنجام خوا لێم توورە بێ و، جیبریل و فریشتەكان و پیاوانی بڕواداری چاك؟ كەواتە: حیكمەتی كۆ كرانەوەی خوای بێ وێنە و جیبریل و فریشتەكان و پیاوانی بڕوادار، ئەوەیە كە باسمان كرد.

**سەرنجی چوارەم:**

ئـەو قسـە نهێنییـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە لای حەفصـەی کـردوە، بەپێـی بەسـەرهاتەکان:

**أ-** نەخواردنەوەی هەنگوینەکەی زەینەب بووە، کە لە هەندێك ڕیوایەتانیشدا دەڵێ: هەنگوینەکەی لە لای حەفصە خواردوە، هەندێکیش دەڵێن:لە لای سەودە خواردوویەتی.

**ب-** یاخود بریتی بووە لە بە لای ماریەی **قیبطیی** دا نەچوون و لەگەڵدا جووت نەبوونی، لە حاڵێکدا کە هەم هەنگوینیش ڕەوایەو حەڵاڵە، هەم ئەو ئافرەتەش ماریەی **قیبطیی** (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەویش حەڵاڵی پێغەمبەری خوا بووەو، خوای پەروەردگاریش پێی ناخۆش بووە دڵ ڕازیکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوسەرانی، بگاتە سنوورێك، شتێك کە خوا بۆی ڕەوا کردوە، لە خۆی قەدەغەی بکات.

## مەسەلەی دووەم و كۆتایی:

هۆشـداریی خـوا بـۆ هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەری خـوا ﷺ كـە ئەگـەر لەسـەر ئـازاردانی پێغەمبـەری خـواو سـەغڵەت كـردنی بـەردەوام بـن و، تەڵاقیـان بـدات، خـوا هاوسـەرانی لـە ئێـوە چاكـتری بـۆ دەڕەخسـێنێ، كـە ملكـەچ و بـڕوادار و فەرمانبـەرو تۆبـەكارو خواپەرسـت و كۆچكـەر بـن، لـە بێوەژنـان و لـە كچـان:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴿٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ﴾، نیزیكە ئەگەر تەڵاقتان بدات، پەروەردگاری هاوسەرانێكی لە ئێوە چاكتری بۆ بكاتە جێدارتان (لە جیاتی ئێوە بۆی بڕەخسێنێ)، ﴿ عَسَىٰ ﴾، بە مانای: نیزیكە، لەوانەیە، ڕەنگە، ﴿ أَن يُبْدِلَهُۥٓ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (أَن يُبَدِّلَهُ)، بۆی بگۆڕێ، پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا، لە زمانی عومەری كوڕی خەتتابەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هێنامان، لێرەش ئەم دەقە دێنین:

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رضي الله عنه: اجْتَمَعَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نِسَاؤُهُ فِي الْغَيْرَةِ، فَقُلْتُ لَهُنَّ: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ ﴿٥﴾ ﴾، قَالَ: فَنَزَلَ كَذَلِكَ} (جامع البيان: ٣٤٥١٨).

واتـە: ئەنـەسی كـوڕی مالیـك دەڵـێ: عومـەری كـوڕی خەتتـاب (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، گـوتی: (عومـەر بـۆ ئەنـەسی كـوڕی مالیـكی بـاس كـردوە، خـوا لـە هەردووكیـان ڕازی بـێ)، هاوسـەرانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە دژی وی لـە مەسـەلەی هەوێدارییـدا {(غەیـڕە) واتـە: هەسـتی هەوێداریـی}، گەلـە كۆمەكێیـان كـرد، منیـش پێمگوتـن: نیزیكـە ئەگـەر پێغەمبـەر ئێـوە تەڵاقبـدات، پـەروەردگاری هاوسـەرانێكی لـە ئێـوە باشـتری بـۆ بڕەخسـێنێ، دوایـی خـوا سبحانه وتعالى هـەر بـەو شـێوەیە ئـەو ئایەتـەی دابەزانـد.

ئنجا خوای پەروەردگار بە شەش سیفەتان ئەو ئافرەتانە باس دەكات، ئەوەش هۆشدارییە بۆ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ كە ئێوە هەوڵبدەن خاوەنی ئەو شەش سیفەتانە بن، بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ناچار نەبێ، ئەگەر بێزاری بكەن دەستبەرداری ئێوە بێ و پەروەردگاری هاوسەرانێك بەپێی ئەو سیفەتانە بۆ وی بڕەخسێنێ:

٢)- ﴿ مُسْلِمَٰتٍ ﴾، ملكەچ بن (بۆ خوا).

٣)- ﴿ مُّؤْمِنَٰتٍ ﴾، بڕوادار بن (بە خواو بە پێغەمبەرەكەی ﷺ).

٤)- ﴿ قَٰنِتَٰتٍ ﴾، گوێڕایەڵ بن (بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، یان بۆ پێغەمبەر).

٥)- ﴿ تَٰٓئِبَٰتٍ ﴾، گەڕاوە بن (بۆ شتێك كە خوا پێیخۆشە بۆ ئەوان، كە بریتیە لە فەرمانبەرییان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و، واز لە شتێك بێنن كە خوا پێی ناخۆشە بۆ ئەوان، كە بریتیە لە ئازاردانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

٦)- ﴿ عَٰبِدَٰتٍ ﴾، خواپەرست بن.

٧)- ﴿ سَٰٓئِحَٰتٍ ﴾، ڕۆژووگر بن، كۆچكەر بن.

٨)- ﴿ ثَيِّبَٰتٍ وَأَبْكَارًا ﴾، لە بێوەژنان بن و لە كچانیش بن.

**(القرطبي)** دەڵێ: **(ثَيِّب)** واتە: بێوەژن، دەڵێ: **(وَقِيلَ: إِنَّمَا سُمِّيَتِ الثَّيِّبُ ثَيِّبًا، لِأَنَّهَا رَاجِعَةٌ إِلَى زَوْجِهَا إِنْ أَقَامَ مَعَهَا، أَوْ إِلَى غَيْرِهِ إِنْ فَارَقَهَا. وَقِيلَ: لِأَنَّهَا ثَابَتْ إِلَى بَيْتِ أَبَوَيْهَا، وَهَذَا أَصَحُّ، لِأَنَّهُ لَيْسَ كُلُّ ثَيِّبٍ تَعُودُ إِلَى زَوْجٍ، وَأَمَّا الْبِكْرُ فَهِيَ الْعَذْرَاءُ، سُمِّيَتْ بِكْرًا لِأَنَّهَا عَلَى أَوَّلِ حَالَتِهَا الَّتِي خُلِقَتْ بِهَا)**.

قورتووبیی شیكردنەوەی ئەوە دەكات بۆچی بێوەژن پێی دەگوترێ: **(ثَيِّب)** و كچیش پێی دەگوترێ: **(بِكر)**؟ دەڵێ: بێوەژن بۆیە پێی دەگوترێ: **(ثَيِّب)** چونكە دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەكەی، ئەگەر لەگەڵیدا بەردەوام بێ، یاخود ئەگەر

مێردەکـەی لێـی جیابـۆوە، دەچـێ بـۆ لای، مێردێـکی دی، هەندێکیـش گوتوویانـە لەبـەر ئـەوە دوای ئـەوەی مێردەکـەی دەسـتی لـێ هەڵگـرت، دەچێتـەوە بـۆ لای بـاب و دایکـی و، ئـەوەش ڕاسـترە، چونکـە مـەرج نیـە هـەر ئافرەتێـك کـە مێـردی دەسـتی لـێ هەڵگـرت، بچـێ مێردێـکی دیکـە بکاتـەوە، {هەیـە دەچێتـەوە لای ماڵـی بـابی} بـەڵام کـچ (**بکـر**) بۆیـە پێـی دەگوتـرێ: (**بكر**)،چونکـە هـەر لەسـەر ئـەو حاڵەتەیـە کـە خـوا لەسـەری خوڵقانـدوە.

(واتــە: دەســتکاریی نەکــراوە، چونکــە (**بُكـرَة**) واتــە: بەیانیــی و ســەرەتای کات، واتـە ئـەو ئافرەتـە لەسـەرەتاوە خـوا چـۆنی خوڵقانـدوە، هـەر بـەو شـێوەیە ماوەتــەوە).

## کورتە باسێک لەبارەی پێگەی بەرزی هاوسەرانی پێغەمبەری خواوە ﷺ

بەڕێـــــزان!

ئـەم کورتـە باسـەمان لـە بـارەی پێگـەی بـەرزی هاوسـەرانی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ خـوا لێیـان ڕازی بـێ و، بەرپەرچدانـەوەی هەندێـك گومـان و تۆمـەتی شـیعەی دوازدەیـی (**الشّيعَة الإثنا عَشَرِيَّة**)یـە، پاڵنـەرم بـۆ پێشکەشـکردنی ئـەم کورتـە باسـە لـە بـارەی دایـکانی بڕوادارانـەوە (**أُمَّهـاتُ المُؤمِنِين**)، هاوسـەرە بەڕێـزو دڵسـۆزەکانی پێغەمبـەری کۆتایـی موحەممـەد ﷺ (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، ئەوەیـە کـە هەندێـك لە تەفسیرەکانی شـیعە، شـیعەی دوازدە ئیمامیـی[1]، قسـەی زۆر بـێ جـێ و ناشایسـتیان

---

(١) مسـوڵمانان زانایـانی ڕەسـەنی ئیسـلام بـە پێشـەوای خۆیـان دەزانـن و، پێشـەوایانی مسـوڵمانان نـە لـە دوازدەدا کـورت هەڵاتـوون، نـە لـە بیسـت داو، نـە لە سـی داو، ئـەو بیرۆکەیـە بیرۆکەیەکی ئەفسـانەییە، کەسـێك لـە نێـو هەمـوو زانایـانی ئیسـلامدا دوازدەیـان لـێ جیـا بکاتـەوەو بڵـێ: ئەوانـە پێشـەوامانن، ئـەدی ئـەوانی دیکـە کێـن و چیـن؟ لـە حاڵێـك دا هەمووشـیان وەك یـەك پێشـەوای مسـوڵمانانن، ئنجـا هەیانـە پێشـەوایەتییەکەی زیاتـر تێـدا بەرجەسـتە بـووەو هەیانـە کەمـتر، هەیانـە باشـتر کاری بـە زانیارییەکـەی کـردوەو هەیانـە کەمـتر، ئـەوە شـتێکی ڕێژەییـە، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە هەمـوو زانایـانی ئیسـلام و، هەمـوو ئەوانـەی کـە بەڕێـی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ ڕۆیـون، بـە جێنشـینان و میراتگـرانی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دادەنرێـن، لـە لای ئەهلی ئیسـلام، بـە مەرجێـك عەقـڵ و هـۆشی سـەلیم بەکاربێنـن و، پابەنـد بـن بـە ئایەتـەکانی قوڕئـان و، دەقـەکانی سـونەتی پێغەمبـەرەوە ﷺ:

أ- عەقـڵ و هـۆشی سـەلیم دەڵـێ: ئـەو شـتانەو ئـەو کەسـانەی وەك یەکن، پێویسـتە مامەڵـەی وەك یەکیـان لەگەڵـدا بکـرێ (التَّسوِيَةُ بَينَ المُتَماثِلِين)، یەکسـانکردنی شـتە وەك یەکەکان.

ب- دەقــەکانی قوڕئانیــش بەبــێ جیاوازیــی بــاسی زانایــانی ئیســلام دەکــەن: ﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾ المجادلـة، خـوا ئەوانەتـان کـە بڕوایـان هێنـاوە بەرزیـان دەکاتـەوەو، ئەوانـەی کـە زانیارییـان پێـدراوە چەنـدان پلـە.

ج- پێغەمبەری خواش ﷺ باسی زانایان دەكات بە گشتیی و دەفەرموێ: {إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاء} (أخرجه أحمد: ٢١٧٦٣، وأبو داود: ٣٦٤١، والترمذي: ٢٦٨٢)، زانایان میراتگرانی پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام) پێغەمبەری خاتەم هەندێكی لێ جیانەكردوونەوە.

كەواتە: هەم عەقڵی سەلیم، هەم قورئانی حەكیم، هەم سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانمان پێ دەكەن و پابەندمان دەكەن، كە بە یەك چاو تەماشای زانایان و پێشەوایانی ئیسلام بكەین، نەك هەندێكیان لێ جیا بكەینەوەو گوڵبژێریان تێدا بكەین، بەبێ پێوەرێكی ڕاستەقینە، ئەگەر پێوەرێك هەبێ، ئەوە جیایە، بۆ وێنە: چوار خەلیفە ڕاشیدەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێ خۆی لە دوای پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەمووهاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) یان زۆربەی هەرە زۆریان ڕێككەوتوون، كە ئەبوو بەكر خوا لێی ڕازی بێ ئەو پێشەوایەو ئەو زانایەو ئەو حوكمڕانە بێ، كە لە جیاتی پێغەمبەری خوا ﷺ كاروباری ئوممەت بەڕێوەبەرێ، لە دوای ئەبوو بەكریش، بەڵێ ئەبوو بەكر پێشنیاری كرد، بەڵام ئەوە مسوڵمانان و هاوەڵان بوون كە پێشنیارەكەی ئەبوو بەكریان خوا لێی ڕازی بێ پەسند كردو، عومەریان خوا لێی ڕازی بێ كردە دووەمین جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ، وەك ئیبنو تەیمییە دەڵێ: عومەر بوو بە خەلیفەو حوكمڕانی مسوڵمانان دوای ئەوەی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) لەسەری كۆك و تەبا بوون، ئەگەرنا كارەكەی ئەبوو بەكر (خوا لێی ڕازی بێ)، تەنیا پێشنیار بوو، ئەبوو بەكریش (خوا لێی ڕازی بێ)، لەوە باشتر لە دین تێگەیشتوەو دەزانێ: مادام خۆی مسوڵمانان دایاننـاوە، هی دوای خۆیشی هەر دەبێ مسوڵمانان دایبنێن، بەڵام پێشنیارێكی كردو، لە دوای ئەبوو بەكر، عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) بوو بە حوكمڕان و جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە دوای عومەریش مسوڵمانان لە نێوان عەلی و عوسماندا خوا لە هەردووكیان ڕازی بێ، چەند ڕۆژێك خەریك بوون، سەرەنجام زۆرینەیان ڕایان لەسەر عوسمان بوو، ئنجا لە نۆرەی چوارەمدا عەلییان هەڵبژارد، خوا لە هەر چواریان ڕازی بێ.

هەروەها ئەگەر پێوەرێكی بەو شێوەیەمان هەبێ كە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ خوا دەفەرموێ: لێیان ڕازییم و ڕازییشیان دەكەم و، خوا شاهێدییان بۆ دەدات، كە دڵسۆزیی و پاكیی و چاكییان لە دڵدا هەبووە، بە تایبەتی ئەو هەزارو چوار سەد (١٤٠٠) كەسەی كە لە ژێر سێبەری (شجرة الرضوان)دا پەیمانیان بە پێغەمبەردا ﷺ كە خوا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾ الفتح، واتە: بە دڵنیایی خوا ڕازی بوو لەوانەی لە ژێر درەختەكەدا پەیمانیان لەگەڵ تۆدا بەست، زانی چییان لە دڵدایە، ئارامیی و ئۆخژنی ڕژاندە سەر دڵیان و، پاداشتیشی دانەوە بە سەركەوتنێكی نیزیك.

بەرانبەر بە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر بە گشتیی و (**عائیشة وحفصة**) بە تایبەت کردوون.

ئنجا لە تەفسیرەکانی شیعەکاندا، دوویانم لێ بە نموونە هێناونەوە:

أ- هەندێك قسەم لە تەفسیری (**المیزان**)ی (**محمد حسین الطباطبائي**)، وەرگرتوون.

ب- هەروەها تەفسیری (نمونە) کە هی کۆمەڵێك لە زانایانی شیعەیە لە ژێر چاودێریی

---

کەواتە: خوا زانیویەتی چی لە دڵی ئەو (١٤٠٠) هاوەڵەدایە، (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە هەر چوار جێنشینەکەی پێغەمبەریان ﷺ تێدا بوون (عوسمان خوا لێی ڕازی بێ لەو کاتە نوێنەری پێغەمبەری خوا بوو بۆ لای قورەیش و پێغەمبەری خوا دەستی خۆی خستە نێو دەستەکەی دیکەی و فەرمووی: ئەمەش لە جیاتی عوسمان! وەك لە (صحیح البخاري و صحیح مسلم)دا هاتوە)، هەموو ئەوانی دیکەی یەکە یەکەی مسوڵمانایان تێدا بوون، وەك (ئەبوو عوبەیدەی جەڕراح و، تەڵحەو، زوبەیرو، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص و، سەعیدی کوڕی عاص و، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی موعاذ و، سەعدی کوڕی عوبادە)و هەموو ئەو هاوەڵانەی دیکە (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەوانەی کە (شیعەی دوازدەیی) هیچ حیسابیان بۆ ناکەن، بەڵکو دەشیان بوغزێنن، ئەوانە هەموویان لە ژێر ئەو درەختەدا بوون، کە خوا دەفەرمویێ: لێیان ڕازییم، چونکە خوا زانی چییان لە دڵدا هەیە، بۆیە ئارامیی و ئۆخژنی ڕژاندە سەر دڵیان و، پاداشتیشی دانەوە بە سەرکەوتنێکی نیزیك.

ئنجا ئەگەر پێوەرێکی ئاوامان لەبەر دەستدا هەبێ، کە خوا وا دەفەرموێ، بە نسبەت هاوەڵانەوە بە گشتیی، بە تایبەتی ئەو هەزارو چوار سەد (١٤٠٠) کەسەو، بە نسبەت چوار جێنشینەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ کە ئەو ئەو هەزارو چوار سەد کەسە، زۆربەی هەرە زۆریان هەڵیانبژاردوون، ئەوە لەسەر ئەو بناغەیە جیاکارییەك بکرێ و بگوترێ: چوار خەلیفە ڕاشیدەکان خوا لێیان ڕازی بێ، واپێدەچێ لەوانی دیکە باشتربن، لەبەر ئەوەی هەموو ئەوانەی دیکە، ئەو چوارەیان هەڵبژاردوون بۆ جێنشینایەتیی پێغەمبەری خوا ﷺ، یان بگوترێ: ئەو هەزارو چوار سەد کەسە، لە کۆی هاوەڵانی دیکە لە پێشترن، لەبەر ئەوەی خوای پەنهانزان ئەو ئایەتەی لەسەر ناردوونە خوار، ئەوە ڕێی تێدەچێ، بەڵام کەسێك لە خۆڕاو لە گۆترەو لەسەر بناغەی دەمارگیریی و، بە چاولێکردنی حوکمی بنەماڵەیی و میراتیی پادشایەکانی ڕۆم و فارس، هەندێك لە زانایان بە بیانووی ئەوەی ئەوانە لە وەچەو بنەماڵەی پێغەمبەرن ﷺ جیایان بکەیەوە، لەڕاستییدا ئەوە شتێکە خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەناردۆتە خوار.

(ناصر مكارم شیرازی)دا، چەند قسەیەكم لێ وەرگرتوون، كە هەر كامیان قسەی ناشایست و بێ جێیان لە بارەی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە ﷺ بە گشتیی و، بە تایبەتی هەردوو هاوسەری بەڕێزو خۆشەویستییەوە: حەفصەو عائیشە، كردوون، بۆیە بە چاكم زانی لەو بارەوە هەندێك ڕاستیی بخەمە ڕوو، لە چوار بڕگەداو، لە دوو توێی ئەم كورتە باسەدا:

**بڕگەی یەكەم: پێگەی بەرزو ناوازەی دایكانی بڕواداران، هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ بە گشتیی:**

**١-** لە سوورەتی **(الأحزاب)** ئایەتی ژمارە (٦)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ... ﴿٦﴾﴾**الأحزاب**، پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕوادارانی پیاو لە خۆیان لە پێشترە و، هاوسەرەكانیشی دایكانیانن.

هاوسەرەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دایكانی پیاوانی بڕوادارن، بەڵكو هەندێك لە زانایان گوتوویانە: هاوسەرەكانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ دایكانی پیاوو ئافرەتەكانی مسوڵمانانن.

**٢-** هەر لە سوورەتی **(الأحزاب)**، لە ئایەتەكانی: (٣٠ - ٣٤)دا، با تەماشا بكەین خوا چۆن ڕاستەوخۆ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەكەی ﷺ دەدوێنێ، خوا لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە بەمجۆرە ئەو هاوسەرە بەڕێزانەی پێغەمبەری كۆتایی ﷺ دەدوێنێ: ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾الأحزاب،

لێرەدا بە کورتیی ئەو ئایەتە موبارەکانە مانا دەکەین، خوا دەفەرمووێ: ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر! (واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ!) هەر کامێك لە ئێوە کردەوەیەکی ناقۆڵای ئاشکرا، (یاخود ئاشکراکەر) ئەنجام بدا[1]، (پێغەمبەری خوا ئازار بدات و نارەحەت بکات)، سزای بۆ دوو قات دەکرێتەوەو، ئەوەش لەسەر خوا ئاسانە، هەر کامیش لە ئێوە گوێڕایەڵ بێ بۆ خوا و بۆ پێغەمبەرەکەی و، کردەوەی باشیش بکات، دوو جاران پاداشتی دەدەینەوەو، بژیوێکی پڕ ڕێزو حورمەت (یاخود بژیوێکی زۆر باش و پەسند)یشمان بۆ ئامادە کردوە، ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر! ئێوە ئەگەر پارێز بکەن، (پارێز لە خوا بکەن)، وەك هیچ کام لە ئافرەتان نین، (پێگەیەکی زۆر بەرزو ناوەزەتان هەیە، هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرن ﷺ)، بۆیە قسەی نەرم و ناسك مەکەن، (قسەی بە نازەوە مەکەن)، کە سەرەنجام کەسێک کە دڵی نەخۆشیی تێدایە تەماعتان تێ بکات و، قسەیەکی پەسند بکەن و، لە ماڵەکانی خۆتانیش دا نیشتەجێ بن و، وەك ڕازاندنەوەی سەردەمی نەفامیی خۆتان مەڕازێننەوە، (یاخود وەك خۆ ڕووتکردنەوەی سەردەمی نەفامیی خۆتان ڕووت مەکەنەوە، واتە: بە زۆریی لە ماڵ دا بن و، کە چوونە دەریش بەشێوەیەك بچنە دەر، وەك ئافرەتانی ڕۆژگاری نەفامیی مەکەن، چ لە ڕووی خۆ ڕازاندنەوەو، چ لە ڕووی دەرخستنی جوانییەکانی خۆتانەوە)، نوێژ بەرپا بکەن و زەکات بدەن و فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، بە دڵنیایی ئەی (ئافرەتە) خاوەنەکانی ماڵ (ی پێغەمبەر ﷺ!) خوا تەنیا دەیەوێ پیسییتان لێ لابەرێ، (پیسیی گوناهو لادان و تاوان) و بە پاككردنەوەی چاك پاكتان بکاتەوە، یادی ئەو ئایەتانەو ئەو

---

(١) پێشتریش گوتوومانە: ﴿بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾، تەنیا لە سێ ئایەتدا هاتوە لە قورئاندا: ١- لە سوورەتی (النساء)دا، ٢- لێرە لە سوورەتی (الأحزاب)دا، ٣- لە سوورەتی (الطلاق)دا، کە ئێمە هەم لە تەفسیری سوورەتی سوورەتی (النساء)و، هەم لە تەفسیری سوورەتی (الأحزاب) و، هەم لە تەفسیری سوورەتی (الطلاق)یشدا، قسەمان لێکرد کە مەبەست لە: ﴿بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ﴾، ئازاردانی ژنە بۆ مێردی، چونکە وشەی (فاحِشَة) ئەگەر بە تەنیا بێ، بە مانای داوێن پیسییەو بە مانای نێربازییەو، بە مانای لادانی جینسییە، بەڵام کە قەیدی ﴿مُّبَيِّنَةٖ﴾ یان (مُبَيِّنَة)ەی دەخرێتە سەر، واتە: ئەوە کە ئەو ئافرەتە بە جۆرێك لەگەڵ مێردیدا مامەڵە بکات، ئازاری بدات و نارەحەت و بێزاری بکات.

حیکمەتەش بکەنەوە کە لە ماڵەکەتاندا دەخوێنرێنەوە، (بیر خۆتانیان بهێننەوە)، بە دڵنیایی خوا پەنهانکاری شارەزایە.

ئنجا ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی ئەحزابدا بە تەفصیل لە بارەی ئەو ئایەتانەوە قسەمان کردوەو، لەوێشدا بەرپەرچی قسەی شیعەکانمان داوەتەوە کە دەڵێن: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾، ﴿أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾، ئەی خاوەنانی ماڵ (**أهل البيت**)، خوا دەیەوێ پیسییتان لێ لابەرێ و بە پاککردنەوە پاکتان بکاتەوە، لەوێ ڕوونمان کردۆتەوە کە بە دڵنیایی لەم ئایەتانە هەموویاندا، ڕووی دواندن لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ، وشەی ﴿أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾یش، لە دوو شوێن لە قورئاندا هاتوە، لە سووڕەتی (**الأحزاب**)و لە سووڕەتی (هود) داو، لە هەردووکیاندا مەبەست پێی ژن و هاوسەرە، هی (**الأحزاب**) ئاشکرایە (**يا نساء النبيِّ**)، لە سووڕەتی (هود)یشدا فریشتەکان هاوسەری ئیبراهیم (سارا خاتوون) دەدوێنن: ﴿قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ...﴿٧٣﴾﴾هود، وشەی ﴿أَهْلَ ٱلْبَيْتِ﴾، یانی: ژن و هاوسەرو خێزان، لە قورئاندا تەنیا لەو دوو شوێنەدا هاتوەو، لە هەردوو شوێنەکاندا ڕووی دواندن لە هاوسەری پیاوە، لێرە: هاوسەرانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لەوێش: هاوسەری ئیبراهیم (**عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) ئنجا ئەگەر دوایی دەقێکی سوننەت هەبێ ئەوانەی دیکەش بخرێنە نێو چەمکی ئەم ئایەتەوە، وەك عەلی و فاتیمەو حەسەن و حوسەین خوا لێیان ڕازی بێ، بەڵکو هەندێك لە زانایان دەڵێن: خزمانی دیکەی پێغەمبەریش ﷺ بەڵام بێگومان مەبەستی ئەسڵیی و سەرەکیی لەم تەعبیرە، هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوان ﷺ.

بەڵێ خوا ﷻ ئاوا هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەدوێنێ و، ئەوە پایەو پێگەی بەرزیانە، هەروەها لە سووڕەتی (النور)یش لە ئایەتی (٢٦)دا، کە تایبەت لە بارەی دایکمان عائیشەوەیە (خوا لێی ڕازی بێ)، بەڵام واتاو

چەمكەكـەی هاوسـەرەكانی دیكـەی پێغەمبەریـش دەگرێتـەوە، كـە لـە بەسـەرهاتی بوختـان كـران بـۆ دایكـمان عائیشـەدا (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، خـوا ﷻ شـازدە (١٦) ئایـەتی ناردنـە خـوار، ئایەتـەكانی: (١١ - ٢٦)، لـە ئایـەتی (٢٦)ەم و كۆتایـی دا كـە شـازدەیەمین ئایەتـە، بـە نسـبەت كـۆی ئـەو ئایەتـەوەی كـە لـە بـارەی بەسـەرهاتی بوختـان (إِفْك) بـۆ كـرانی دایكـمان عائیشـەوە هاتنـە خـوار، لـە ئایـەتی كۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلْخَبِيثَٰتُ لِلْخَبِيثِينَ وَٱلْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَٰتِ ۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَ ۖ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٢٦﴾ ﴾النـور، واتـە: ئافرەتـانی پیـس بـۆ پیـاوانی پیسـن و، پیـاوانی پیسـیش بـۆ ئافرەتـانی پیسـن، ئافرەتـانی پـاك بـۆ پیـاوانی پاكـن و، پیـاوانی پاكیـش بـۆ ئافرەتـانی پاكـن، ئەوانـە دوورن لـەوەی (دڵنەخۆشـەكان و بوختانچییـەكان) دەیڵێـن، لێبوردنێـك و بژیوێـكی ئەوپـەڕی باشـیان هەیـە، یاخـود: ئەوپـەڕی پـڕ ڕێـزو حورمەتیـان هەیـە، (لـە لای خـوا ﷻ) كـە بـە تایبـەت عائیشـە دەگرێتـەوە خـوا لێـی ڕازی بـێ و، لەگەڵیشـدا ئـەو پیـاوەی لەگـەڵ ئـەودا بوختـانی پـێ كـرا (صەفـوانی كـوڕی موعەتتیـلی سـەهمیی)، بـەڵام بێگومـان چەمكەكـەی هەمـوو هاوسـەرە بەڕێـزەكانی دیكـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەگرێتـەوە، هەروەهـا تێكـڕای ئافرەتـان و پیـاوانی پـاك و چـاك.

كەواتـە: ئـاوا خـوا ﷻ بـاسی پێگـەو پایـەی بـەرز و نـاوازەی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ دەكات.

### بڕگـەی دووەم: ئایـا ئایەتـەكانی سـوورەتی (التحریـم) مانـای خراپیـی هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ دەگەیەنـن؟

كـە وەك گوتـم: شـیعەی دوازدە ئیمامیـی كـە بەداخـەوە لـە پشـت پـەردەی ڕەشـەوە تەماشـای هـاوەڵان بـە گشـتیی و، بـە تایبـەت هاوسـەرانی بەڕێـزی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و لـە نێویشـیانداو بەتایبەتـر: حەفصـەو عائیشـە (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) دەكـەن، وایـان لـێ خوێندۆتـەوە، وەك دوایـی بـاسی دەكەیـن، ئنجا بـا

تەماشا بکەین: (ابن عجيبة) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، لە (النَّسفي)یەوە نەقڵ دەکات و دەڵێ: (**كَيْفَ يَكُونُ الْمُبْدَلَاتُ خَيْرًا مِنْهُنَّ، وَلَمْ يَكُنْ عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ نِسَاءٌ خَيْرٌ مِنْ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ؟ نَقُولُ: إِذَا طَلَّقَهُنَّ الرَّسُولُ لِعِصْيَانِهِنَّ لَهُ، وَإِيذَائِهِنَّ إِيَّاهُ، لَمْ يَبْقِينَ عَلَى تِلْكَ الصِّفَةِ، وَكَانَ غَيْرُهُنَّ مِنَ الْمَوْصُوفَاتِ بِهَذِهِ الْأَوْصَافِ مَعَ الطَّاعَةِ لِرَسُولِ اللَّهِ، خَيْرًا مِنْهُنَّ**).

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ﴾، ڕەنگە ئەگەر ئەو (پێغەمبەر ﷺ) تەڵاقتان بدات، پەروەردگاری هاوسەرانی لە ئێوە باشتری بۆ بگۆڕێ، بیانکاتە جێداری ئێوە، (النسفي) دەڵێ: ئەگەر گوتت: چۆن دەبێ ئەو ئافرەتانەی دەبنە جێدارو پێ گۆڕدراوی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ {واتە: هاوسەرەکان لابچن و بگۆڕدرێن بەوانە}، چۆن بەدیلەکانیان لەوانە باشتر دەبن، لەحاڵێکدا کە لەسەر ڕووی زەوی باشتر لە دایکانی بڕواداران لە نێو ئافرەتاندا نەبووە؟ دەڵێین: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ تەڵاقی دابانایە، چونکە سەرپێچییان لێی کردوەو ئازاریان داوە (و لەسەر ئازاردانەکەی بەردەوام بووبانایە)، ئەو کاتە لەسەر ئەو سیفەتە نەدەمان و، ئەو کاتە ئەو ئافرەتانەی خاوەنی ئەو سیفەتانەن، کە خوا ﷻ خستوونیە ڕوو: ﴿مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ﴾، ئەو کاتە ئەو ئافرەتانەی ڕازێندراوە دەبوون بەو سیفەتانە، باشتر دەبوون لە دایکانی بڕوادارانێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەرداریان دەبوو و وازی لێ دەهێنان.

ئەمە مانایەکی ڕێك و ڕاست و مەعقووڵە، ئنجا هەرچەندە (النسفي) ڕوونی نەکردۆتەوە، کە بۆچی دەڵێ: لەسەر ڕووی زەوی هیچ ئافرەتانێك لە دایکانی بڕواداران باشتر نەبوون؟ چونکە بەپێی ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (النور)، خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ﴾، کەواتە: ئەو هاوسەرانە

---

(١) البحر المديد في تفسير كتاب الله المجيد: ج٨، ص٨٤.

دیارە (طَيِّبات) بوون، بۆیە خوا ﷻ قسمەتی ئەوانی خستۆتە لای ئەو پیاوە، هەرە (طَيِّب) و پاك و چاكە، كە پێغەمبەری خوایە ﷺ.

بەڵام ئەگەر وەك شیعە دەڵێن: پیس و زیانبەخش بوونایە، بە دڵنیایی خوای كاربەجێ بواری نەدەدا ئەو ئافرەتانە بێنە ژێر نیكاحی پێغەمبەرەكەی ﷺ و ببنە هاوسەری.

هەر لە بارەی چەمكی ئەو ئایەتە موبارەكەوە كە ناگونجێ بكرێتە بەڵگە لەسەر تانەدان لە هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ واتە: ئایەتی ژمارە پێنجی سوورەتی (التحريم) كە دەفەرموێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَٰجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ﴾، یەكێكی دیكە لە ڕوونكەرەوانی قورئان (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[1] دەڵێ:

(فَلَمَّا سَمِعْنَ (رَضِي الله عَنْهُنَّ) هَذَا التَّخْوِيْفَ وَالتَّأْدِيْب، بَادَرْنَ إِلى رِضَا رَسُولِ الله ﷺ، فَكَانَ هَذَا الوَصْفُ مُنْطَبِقًا عَلَيْهِن، فَصِرْنَ أَفْضَل نِسَاءِ المُؤْمِنِيْن، وَفِي هَذَا دَلِيْلٌ عَلَى أَنَّ الله لَا يَخْتَارُ لِرَسُولِهِ ﷺ إلاَّ أَكْمَلَ الأَحْوَال وَأَعْلَى الأُمُورِ، فَلَمَّا اخْتَارَ الله لِرَسُولِهِ بَقَاءَ نِسَائِهِ المَذْكُورَات مَعَهُ، دَلَّ عَلَى أَنَّهُنَّ خَيْرَ النِّسَاءِ وَأَكْمَلُهُنَّ)، واتە: كاتێك هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ترساندنەو تەمبێ كردنەیان بیست، یەكسەر دەست و بردیان كرد بۆ ڕازیكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو وەسفە [كە خوا دەفەرموێ: ﴿مُسْلِمَٰتٍ مُّؤْمِنَٰتٍ قَٰنِتَٰتٍ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٍ سَٰٓئِحَٰتٍ﴾، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەستبەردارتان بێ، خوا هاوسەرانێكی ئاوای بۆ دەڕەخسێنێ]، بەسەریان دا چەسپا و بوون بە باشترین ئافرەتانی بڕواداران، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە خوا ﷻ باشترین و تەواترین حاڵ نەبێ و بەرزترین كار نەبێ بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ هەڵنابژێرێ.

---

(١) تيسير الكريم المنان في تفسير كلام الرحمن: ص(٨٧٣، ٨٧٤).

مـادام خـوا مانـەوەی هاوسـەرەکانی، ئـەو هاوسـەرانەی باسـیان کـراون، بـۆ پێغەمبەرەکـەی هەڵبژاردبێ و بڕیاری دابێ بمێننەوە لـە خزمەتیدا، ئـەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو هاوسـەرانە باشـترینی ئافرەتانـن و تەواوترینیانـن، ئەمـەش شـتێکی زۆر مەنتیقـی و مانـا لێکدانەوەیـەکی ڕێـك و ڕاسـتە، خـوا پاداشـتیان بداتـەوە.

**بڕگـەی سـێیەم: کەواتـە: قسـەی قڕپـۆك و پـڕ قینـەو بوغـزی نووسـەرە شـیعە ئیمامییـەکان، هیـچ بنەمایـەکی زانسـتیی و شـەرعیی و عەقڵیـی نیـە.**

**ئنجا با تەماشای قسەکانی ئەو دوو تەفسیرە بکەین:**

**یەکەم:** (**محمد حسين الطباطبائي**) کە شیعە خۆی بە حەکیم و فەیلەسووف و، تەفسیرەکەی (الميزان) بە موعتەبەرترین تەفسیری خۆیان دادەنێن و بە زمانی عەرەبیی نووسراوە[1]، ئاوا ئەم ئایەتە بەلاڕێدا دەبات و مانای لێ دەداتەوە، کە سەر بکێشێ بۆ نەك لە پشت پەردەی ڕەشەوە، تەماشا کردنی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵکو زۆر بە گوناهبارو خراپەکاریش دایانبنێ! دەڵێ:

(**وَالصَّغْو: المَيْلُ، وَالمُرَادُ بِهِ المَيْلُ إلى البَاطِلِ وَالخُرُوجِ عَنِ الإسْتِقَامَةِ، وَقَدْ كَانَ مَا كَانَ مِنْهُمَا مِنْ إِيْذَائِهِ وَالتَّظَاهُرِ عَلَيْهِ مِنَ الكَبَائِرِ:** ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٥٧﴾﴾**الأحـزاب،** ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾﴾**التوبـة**)، واتـە: (**صغـو**) بـە مانـای مەیلـە (ئـەوە ڕاسـتە لـە ڕووی زمانەوانییـەوە)، بـەڵام مەبەسـت لێرەدا مەبەسـت پێـی لادانـە بـەرەو ناهـەق و دەرچوونـە لـە ڕاسـتە ڕێ، ئـەوەش کـە لـەو دووانـە ڕوویـدا [ناویـان ناهێنـێ، واتـە: (حەفصـەو عائیشـە)، خـوا لێیـان ڕازی بـێ]، لـە ئـازاردانی (پێغەمبـەر ﷺ) و پشـتی یەکـدی گرتـن بـۆ ئـازاردانی، لـە گوناهـە گـەورەکان بـوو، خـوای بەرزیـش فەرموویـەتی: ئەوانـەی ئـازاری خـواو پێغەمبـەری خـوا دەدەن، خـوا لـە دنیـاو دواڕۆژدا نەفرینـی لێکـردوون، سـزاو ئازارێـکی ڕیسـواکەری بـۆ دانـاون، هەروەهـا خـوا فەرموویـەتی: ئەوانـەی ئـازاری پێغەمبـەری خـوا دەدەن، سـزاو ئازارێـکی بـە

---

(١) ج١٩، ص٣٣١.

ئێشیان بۆ هەیە. واتە: حەفصەو عائیشە خوا لێیان ڕازی بێ، وەبەر هەڕەشەی ئەو دوو ئایەتە دەکەون!!

ئای چەند بێ ئەدەبییەکی گەورەیەو، چەند بێ حورمەتییەکی مەزنە بەرانبەر بە هاوسەرانێك کە خوا ﷻ بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ هەڵیبژاردوون، هەر لەبەر ئەوەی بە پێشبڕکەی زۆر خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، تەگبیرێکیان کردوە کە هەوێیەکیان لە کۆڵ بێتەوە، یاخود پێغەمبەر ﷺ لەلای ئەو هەوێیەیان نەمێنێتەوە، کە زەینەبی کچی جەحشەو لە لای وی هەنگوینی خواردۆتەوە، یان ماریەی **قیبطیی** (خوا لێی ڕازی بێ)، وەك هەوێیەك لە کۆڵیان بێتەوەو، هاوسەرەکەیان زیاتر ڕوو لە وان بکات، هەموو ئەوەی حەفصەو عائیشە کردوویانە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بە پاڵنەری زێدە خۆشویستنیان بووە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و، لەبەر زۆر ڕق هەڵسانیان نەبووە لێی و نەیانویستوە ئازاری بدەن، بەڵام ناڕاستەوخۆ شتەکە بۆتە هۆی ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ، نەك ئەوان مەبەستیان بووبێ، کەچی ئەو بێنێ ئەوەی لێ هەڵهێنجێ کە وەبەر لەعنەتی خوا کەوتوون و خوا ئازاری ڕیسواکەری بۆ داناون و، ئازاری بە ئێشی بۆ داناون!! بەڕاستیی ئەوە جگە لە بێ ئینصافیی و دڵڕەشیی و، جگە لە ناحاڵیی بوون لە قورئان و لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و، جگە لە دوور کەوتنەوە لە عەقڵ و ڕەوشتە بەرزەکانی مسوڵمانان، هیچی دیکە نیە.

ئەو ئایەتانەش کە ئەو بە بەڵگەی هێناونەوە، چ ئەوەی **(الأحزاب)**و، چ ئەوەی **(التوبة)**، لە بارەی مونافیقەکانەوە هاتوونە خوارو، هیچ پەیوەندییان هەر بە مسوڵمانیشەوە نیە، چ جای هاوسەرانی پاك و چاكی پێغەمبەری خوا ﷺ!!

هەڵبەتە دوای ئەوەش کە خوا ﷻ لە سوورەتی (النور)دا ڕایدەگەیەنی کە ئافرەتە پاکەکان بۆ پیاوە پاکەکانن و پیاوە پاکەکان بۆ ئافرەتە پاکەکانن، ئاشکراشە کە ئەو ئافرەتە پاك و چاکانە هاوسەری پێغەمبەری خوا بوون، کەواتە: هیچ دەرفەت بۆ گومانی بەدو قسەی بێ نەزاکەت بەرانبەریان

نەماوە! خواش ﷻ هەڕەشەی لێکردوون لە ئەو ئافرەتانە، کە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر ئازاردانی پێغەمبەرەکەی ﷺ کە وەك گوتم: ئازاردانەکە ناڕاستەوخۆ بووە، نەك ڕاستەوخۆ و، ئەوان کارێکیان کردوە بۆتە هۆی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی ئازار بدرێ، نەك مەبەستیان بووبێ ئازاری بدەن، بەڵکو قەزیەکە مونافەسە بووە لە خۆشەویستیی پێغەمبەردا ﷺ و نزیکیی زیاتر لێیەوە، کەچی کەسێک بێنێ ئەوە بکات بەهانەو دەستەچیلەی ئەوە، کە دایکانی بڕواداران، وەبەر نەفرینی خوا بخات و پێی وابێ ئازاری ڕیسواکەرو بە ئێشیان بۆ هەیەو، ئەو هەموو ئایەتانەی دیکە نادیدە بگرێ، ئەوانەی سووڕەتی ئەحزاب کە خوێندمانەوەو، ئەوەی سووڕەتی نوور و، ئەوانەی ئێرەش (**التحريم**)، ئەوە شتێکی زۆر ناماقووڵ و بێ جێیە! سەربارەش خوا فەرموویەتی: ئەگەر تەڵاقتان بدات، خوا هاوسەرانی دیکەی بەو جۆرەی بۆ دەڕەخسێنێ و دەیانکاتە جێدارتان، نەك لە هەموو حاڵان دا!.

**دووەم:** ئێستاش با قسەی تەفسیرێکی دیکەشیان سەرنج بدەین، هی شیعەی دوازدەیی، کە تەفسیری (نمونه)یە[1] بە فارسیی، دەڵێ:

**(أز مجموع ین هیة بَرمی آید کە بعض أزهمسران پیامبر، نەتنها أورا باسُخنان خود ناراحت میکردند، بلکە مسئلەی رازداری، کە أز مهمترین شرائط یك همسر بە وفا أست، در آنها نبود).**

واتە: لە کۆی ئەم ئایەتە وەردەگیرێ کە هەندێك لە هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ نەك هەر بە قسەکانی خۆیان، ئەویان نارەحەت دەکرد، بەڵکو مەسەلەی پاراستنی نهێنیی، کە لە گرنگترین مەرجەکانی هاوسەرێکی بە وەفایە، ئەو سیفەتەشیان تێدا نەبوو!!

---

(١) ج٢٤، ص(٢٧٥،٢٧٦).

بێگومان ئەوەش بێ ئەدەبییەکی زۆر ناقۆڵایە و، دەڵێم:

أ- ئەوانە یان دەبێ کۆیلەی ژنەکانیان بن.

ب- یان دەبێ نەزانن پیاوێك کە زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێ، ئەو هاوسەرانە پێکەوە مونافەسەو پێشبڕکێیان دەبێ و، هەستی هەوێدارییان دەبێ و، غەیرەیان دەبێ، لە ئەنجامی ئەوەش دا کە هەر کامێکیان دەیەوێ لە مێردەکەی نزیکتر بێ، دەیەوێ ئەوی دیکە دووربکەوێتەوەو، دەمەقاڵێ دەبێ و قسەو قاڵ دەبێ، ئنجا ئەوانە واپێدەچێ یان کۆیلەی ژنەکانیان بن و، ژنەکانیان چییان پێ بڵێن، وابکەن و وایان کردبێ، یان لە عەقڵ و مەنطیق و عیلم و واقیع زۆر خۆیان دوور خستۆتەوە! هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ کە قسەیەکیان کردوەو، پێغەمبەری خوا دڵی پێ ناڕەحەت بووە، مەبەستیان ئەوە نەبووە پێغەمبەری خوا ئازار بدەن، بەڵکو ئافرەت عاتیفە و هەست و سۆزی هەیەو هەستی هەوێدارێتیی هەیە، بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لەگەڵیان چاوپۆشییکارو لێبوردەو میهرەبان بووە، چونکە زانیویەتی لە خۆشەویستیی ئەودا وادەکەن، نەك ڕقیان لێی هەڵبستێ، ئنجا ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ زانیبای یەکێك لە هاوسەرانی لەگەڵیدا پاك نیەو موخەننەتە، کەس دەستی نەگرتبوو، وازی لێ دەهێنا.

بۆیە ئەمەش جگە لە داخی دڵی خۆ ڕشتن، بە هەردوو دایکانی بەڕێزمان: حەفصەو عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە کچی هەردوو وەزیرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ و، هەردوو هاوەڵە زۆر نزیك و دڵسۆزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەبوو بەکرو عومەر بوون، جگە لە ڕق هەڵسان لە بابیان و لە خۆشیان، هیچی دیکەی لێ ناخوێندرێتەوە.

**برگەی چوارەم و كۆتایی: ئەو جۆرە قسانە بێ ڕێزیین بە هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ و دڵنەخۆشییە بەرانبەریان و، بێ ئەدەبییە بەرانبەر پێغەمبەری خوا ﷺ و، حاڵی نەبوونیشە لە سرووشتی ژیان و سرووشتی ئافرەتانیش:**

ئنجا من ئەوەی لێی دەخوێنمەوە، كە چەند پاڵنەرێك لەپشت ئەو قسانەوە هەن:

١- لە بیانوو بوون لە هاوەڵان و هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕق و بوغز بەرامبەریان، بە تایبەت: حەفصەو عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ)و بابیان عومەرو ئەبوو بەكر، بۆیەش حەفصەم پێش عائیشە خست، چونكە نهێنییەكە كە پێغەمبەر ﷺ دایناوە، بەپێی هەردوو ڕیوایەتەكە، ئەگەر خواردنی هەنگوین بووە لەلای زەینەب، پێشێ حەفصە پێی گوتوە: بۆنی مەغافیرت لێ دێ، بە ڕێككەوتن لەگەڵ دایكمان عائیشەداو، ئەگەر جووت بوون بووە لەگەڵ ماریەی **قیبطیی** دا، لە ژوورەكەی حەفصەدا بووە، ئەو نهێنییەكەی لە لا داندراوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺو، ئەو دركاندوویەتی بۆ دایكمان عائیشە ﷺ (خوا لێیان ڕازی بێ).

٢- ئایا دوای فەرمایشتی خوا ﷻ كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ ﴾، ئەی ئافرەتانی پێغەمبەر ﷺ! ئێوە وەك هیچ كام لە ئافرەتان نین ئەگەر پارێزكار بن، ئایا نەدەبوو واز لە بێ ڕێزیی بەرانبەریان بهێنرێ؟ مادام گوێ لە فەرمایشتی خوا بگیرێ كە خوا دەفەرموێ: ئێوە وەك هیچ كام لە ئافرەتان نین، ﴿ إِنِ ٱتَّقَيۡتُنَّ ﴾، ئەگەر ئەهلی تەقوا بن، بێگومانیش حەفصەو عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ) كە سیرەو ژیانەكەیان دەیخوێنینەوە، دەزانین چەندە ئەهلی تەقوا بوون:

أ- بەنسبەت حەفصەوە دەڵێین: موصحەف ئەو موصحەفەی ئێستا لەبەر دەستی ئێمە دایە، لە ماڵی حەفصەدا بووە خوا لێی ڕازی بێ، دوای ئەوەی بە پێشنیاری عومەر لە سەردەمی ئەبوو بەكردا (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە دوو توێی موصحەفێكدا هەموو قورئان كۆ كرایەوە، لە لای عومەر بوو، دوایی لە لای حەفصەی كچی داینا، حەفصەش هەموو قورئانی لەبەر بووە.

ب- بەنسبەت عائیشەوە دەڵێین: عائیشەش هەموو قورئانی لەبەر بووە، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەو شازدە (١٦) ئایەتەی سووڕەتی نووری بەسن، تاکو قیامەت مایەی شانازینی و، هەزار قسەو قاڵی بوغزاوییانەی شیعە فلسێکی قەڵب ناهێنێ، لە بەرانبەر (١٦) ئایەتی خوای بەرزو مەزندا، کە کۆتاییەکەیان ئەوەیە خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ ﴾النور، ئەوانە دوورن لەوەی ئەو (دڵنەخۆش)انە دەیڵێن و، لێبوردنێك و بژیوێکی ئەوپەڕی باش و پڕ ڕێزو حورمەتیان بۆ هەیە، ئنجا بێگومان هەرچی ئەو هاوسەرە بەڕێزانە کردوویانە، وەك پێشتریش گوتمان، هەرچەندە هەڵەش بووبێ، بەڵام هەر لەبەر زێدە خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، نەك وەك شیعە گومانیان پێ دەبەن، ڕقیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوبێ و ویستبیان ئازاری بدەن! شتی ئاوا هەر ناگونجێ، پێغەمبەرێك ﷺ کە خوا وەحیی بۆ دەنێرێ و، خوای پەروەردگار ئاگاداری دڵ و دەروونی هەموو مرۆڤەکانە، ئەگەر زانیبایە ئەو هاوسەرانەی بە کەڵکی نایەن، دەیفەرموو: دەستیان لێ بەردە.

٣- ئایا هاوەڵان و هاوسەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ هێندە بە خراپ زانین، وێڕای تێکگیران لەگەڵ قورئاندا، ناڕاستەوخۆش تانەدان نیە لە عەقڵ و هۆشیاریی پێغەمبەر ﷺ؟ با، لەڕاستییدا ئەوە گومانی خراپ بردنە بە خودی پێغەمبەریش ﷺ، پێغەمبەری خوا وێڕای ئەوەی کە بۆ خۆی خاوەنی گەورەترین عەقڵ بووە، بێگومان هەموو پێغەمبەران لە ڕۆژگاری خۆیاندا، لە هەموو خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان عاقڵتر بوون و بلیمەت بوون، وێڕای ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ وەحیی خواشی بۆ هاتوە، ئنجا کەسێك هاوسەرەکانی هێندە بە خراپ دابنێ، لە حاڵێکدا ئەویش لە لای خۆی بیانهێڵێتەوە، ئایا ئەوە تانەدان نیە لە عەقڵ و هۆشی پێغەمبەریش؟ بێگومان با.

٤- کۆتا قسەشم ئەوەیە: هەموو ئەوەی ئەو دوو نووسەرە شیعەیە کردوویانە بە بنەما بۆ ئەو گومانی خراپ پێبردن و دڵڕەشییە، بەرانبەر بە هەردوو هاوسەری بەڕێزو دڵسۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ: عائیشەو حەفصە، ئەوەیە کە لە ئایەتی ژمارە (٥)ی سووڕەتی (التحريم)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ ﴾.

بەڵام دەڵێین: بە دڵنیایی ئەو هەڕەشە کردنە بە تەڵاقدان، تەنیا بۆ ترساندن و تەمبێ کردن بووەو، ئەگەر ئەنجامگیریی خراپی لێ بکرێ، وەك ئەوە وایە ئەنجامگیریی خراپ لەو ئایەتە موبارەکە بکرێ، کە خوا ﷻ بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٦٥﴾ الزمر، واتە: ئەگەر هاوبەش دابنێی بۆ (خوا)، کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو لە زیانباران دەبی، ئنجا ئایا کە خوا مەرجی داناوە، بۆ پێغەمبەرەکەی کە: ئەگەر هاوبەش دابنێی بۆ خوا، کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو بە دڵنیایی لە هەرە زیانباران دەبی، ئایا دەگونجێ بگوترێ: لەبەر ئەوەی خوا وای پێ فەرمووە، کەواتە: وایە؟ نەخێر، بێگومان ئەوە کوفرە.

لێرەش کە خوا دەفەرموێ: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرًا مِّنكُنَّ﴾، ڕەنگە ئەگەر تەڵاقتان بدات پەروەردگاری هاوسەرانی لە ئێوە باشتری بۆ بڕەخسێنێ، بەڵام ئایا تەڵاقی داون؟ نەخێر، کەواتە: هاوسەرانی لەوان باشتری بۆ نەڕەخساندوون و، هەر ئەوان باشترین هاوسەرەکانی بوون، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا هێشتنیەوە لە ژێر نیکاحی پێغەمبەردا ﷺ و، بە هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەر هێشتنیەوە، کەواتە: ئەو سیفەتانەی خوا دەفەرموێ: لەو ئافرەتانەدا دەبن کە جێگۆڕکەیان پێدەکات لەگەڵ ئێوەداو، ئێوەیان پێ دەگۆڕێ و دەیانهێنێتە شوێنی ئێوە، کە بریتین لە: ﴿مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا﴾، دیارە ئەو هەشت سیفەتە، لە هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ بوون، بۆیەش خوا ﷻ ئەوانی لانەبردوە، کە ئەو ئافرەتە گریمانکراوانە بهێنێتە شوێنیان، بەڵکو هەر خۆیانی هێشتوونەوە، چونکە هەر خۆیان خاوەنی ئەو سیفەتانە بوون، کە پەسندی خوای پەروەردگارن.

هەر کەسێك عەقڵ و ئینصافی هەبێت، دوای ئەم کورتە باسەی بەندە، پێم وایە کە جارێکی دیکە مانای هەڵە لەو ئایەتە موبارەکانە ناگرێ و، دەشزانێ

هەمــوو ئەوانــەی بــێ ڕێزیــی و بــێ ئەدەبیــی بەرانبــەر بــە هاوســەرانی بەڕێــزی پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەکــەن، بــە تایبــەت عائیشــەو حەفصــە (خــوا لێیــان ڕازی بــێ)، بــە دڵنیایــی جگــە لــە دەرخســتنی بوغــزو کیــن و، جگــە لــە داخــی دڵــی خــۆ پــێ ڕشــتن، هیــچ شــتێکی دیکەیــان بــە دەســتەوە نیــە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە چـوار (٤) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (٦ - ٩)، كـە تێیانـدا چـوار جـۆرە بانگكـردن هـەن:

١- خوا بانگی بڕوادارانی كردوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، كە خۆیان و خێزانیان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن: ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾.

٢- خوا بانگی بێبڕوایانی كردوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، هەڵبەتە لە دواڕۆژدا كە پۆزش و بیانو مەهێننەوە، بیانوو مەهێننەوە، چونكە بی سوودەو بە پێی كردەوەكەتان سزا دەدرێن: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَعۡتَذِرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾.

٣- خوا بانگی بڕواداران دەكات كە بە گەڕانەوەیەكی ساغ بۆ لای خوا بگەڕێنەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا ﴾.

٤- خوا بانگی پێغەمبەر ﷺ دەكات، كە دژی بێبڕواو دەغەڵەكان تێبكۆشێ و لەسەریان زبرو توند بێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَعۡتَذِرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥۖ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا وَٱغۡفِرۡ لَنَآۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٨ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٩ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! خۆتـان و خێزانتـان لـە ئاگرێـك بپارێـزن کـە سـووتەمەنییەکەی خەڵك و بـەردە، فریشـتانێکی (دۆزەخـەوانی) بـە سـەرەوەن، زبـر و زەبـەلاح و تونـدو تیـژن، هـەر فەرمانێـکی خـوا پێیـان بـکات، سـەرپێچیی لـێ ناکـەن و، هەرچـی فەرمانیـان پـێ بکـرێ دەیکـەن ﴿٦﴾ ئـەی ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون (لـە دنیـادا)! ئەمـڕۆ (کـە ڕۆژی قیامەتـە)، پـۆزش و بیانـوو مەهێننـەوە، بێگومـان هـەر بەپێـی ئـەوە سـزا دەدرێـن کـە (کاتی خـۆی) دەتانکـرد ﴿٧﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـە گەڕانەوەیـەکی ڕاسـت و سـاغ بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، نیزیکـە پەروەردگارتـان خراپەکانتـان لـێ بسـڕێتەوەو، بتانخاتـە باخانێکـەوە جۆگـەو ڕووباریـان بەبـەردا دەڕۆن، لـە ڕۆژێکـدا کـە پێغەمبـەر و ئـەو بڕوادارانـەی لەگەڵیـدان، خـوا زەبوونیـان نـاکات، ڕووناکییەکەیـان بـە خێرایـی لـە پێشـیانەوە دەڕوات و، بـە دەسـتی ڕاستیشـیانەوەیە دەڵێـن: پەروەردگارمـان! ڕووناکییەکەمانمان بـۆ تـەواو بکـەو لێـمان ببـوورە، بێگومـان تـۆ لەسـەر هەمـوو شـتێك بـە توانـای ﴿٨﴾ ئـەی پێغەمبـەر! دژی بێبـڕواو دەغەڵـەکان تێبکۆشـەو لەسـەریان بـە زەبـرو زەنـگ بـە، جێـی حەوانەوەیـان ئاگـرەو خراپتریـن سـەرەنجامیشـە ﴿٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**قُوٓاْ**): بپارێزن، (**الوِقَايَـةُ: حِفْـظُ الـشَّيءِ عَـمَّا يُؤْذِيـهِ وَ يَـضُرُّهُ**)، (**وِقَايَـة**) بریتیـە لـە پاراسـتنی شـتێك لـەوەی ئـازاری بـدات و زیـانی پـێ بگەیەنـێ.

(**وَقُودُهَا**): (**الوَقُـودُ: يُقَـالُ لِلحَطَـبِ المَجعُـولِ بالوُقُـودِ، وَلِـمَا يَحْصـلُ مِـنَ اللَّهَـبِ**)، (**وَقُـود**): سـووتەمەنیی، ئـەو دارەیـە کـە دانـدراوە بـۆ سـووتاندن، (**وقُـود**) واتـە: سـووتاندن، (**وَقُـود**) واتـە: سـووتەمەنیی، هەروەهـا ئەو بڵێسـەیەی لێـشی پەیدادەبێ، لـە کاتی سـووتاندن دا بـەوەش دەگوتـرێ، وەك (**وَضُـوء**) ئـەو ئاوەیـە کـە دەسـتنوێژی پـێ دەگیـرێ، بـەڵام (**وُضُـوء**) واتـە: دەسـتنوێژ گرتـن، (**وُقُـود**) واتـە: سـووتاندن، بـەڵام (**وَقُـود**) ئـەو شـتەی دەسـووتێنرێ.

(**غِلَاظٌ**): (**جَمْـعُ غَلِيْـظ، مِـنَ الغِلْظَـةِ، وَالغِلْظَـةُ ضِـدُّ الرِّقَّـةِ، غِلْظَـة وَغُلْظَـة، وَأَصْلُـهُ أَنْ يُسْـتَعْمَلَ فِي الأَجْسَـامِ لَكِـن قَـدْ يُسْـتَعَارُ لِلْمَعَـانِي كَالكَبِـيرِ وَالكَثِـير**)، وشـەی (**غِـلاظ**) کـۆی (**غَلِيـظ**)ە، (**غَلِيظ**)یـش لـە (**غِلْظَـة**)ەوە هاتـوە، کـە دژی (**رِقَّة**)یـە، (**رِقَّـة**) واتـە: تەنکیـی و نەرمیـی، (**غِلظَـة**) واتـە: ئەسـتووریی و زبریـی، هـەم (**غِلظَـة**) بـەکاردێ، هـەم (**غُلظَـة**)، لـە ئەصڵـدا وشـەی (**غِلظَـة**) یـان (**غُلظَـة**) بـۆ تەنـەکان بـەکاردێ، بـۆ شـتی بەرهەسـت، بـەڵام جـاری وا هەیـە دەشـخوازرێتەوە بـۆ مانـاو مەبەسـتەکان، وەك وشـەی (**كَبِير**) و (**كَثِير**)، (**كَبِير**) واتـە: گـەورە، (**كَثِير**) واتە: زۆر، دیسـان ئەوانیش بـۆ شـتی بەرهەسـت و مادديیـن، بـەڵام جـاری واش هەیـە بـۆ شـتی مەعنەوییـش بەکاردەهێنرێـن.

(**شِدَادٌ**): (**جَمْـعُ شَـدِيد مِـنَ الشِّـدَّةِ، وَالشِّـدَّةُ مِـنَ الشَّـدّ، وَهـو العَقْـدُ القَـوِيُّ، وَتُسْـتَعْمَلُ الشِّـدَّةُ فِي العَقْـدِ وَالبَـدَنِ وَفِي النَّفـسِ**)، (**شِـدَاد**) کـۆی (**شَـدِيد**)ە، (**شَـدِيد**) یـش لـە (**شِـدَّة**)وە، ئەویـش لـە: (**شَـدّ**)ەوە کـە گرێدانێـکی بەهێـزە، (**شِـدَّة**)ش واتـە:

توندیی، بەکاردەهێنرێ بۆ گرێیەك كە گرێ بدرێ و، بۆ جەستەیەك كە بەهێز بێ، هەروەها بۆ هێزەکانی نەفسیش، دەگوترێ: عەقڵێکی بەهێزی هەیە، صەبرێکی بەهێزی هەیە.

(**لَا تَعْتَذِرُواْ**): واتە: پۆزش مەهێننەوە، داوای لێبوردن مەکەن، (**العُذْرُ: تَحَرِّي الإِنْسَانِ مَا يَمْحُو بِهِ ذُنُوبَهُ**)، (**عُذر**) بریتیە: لە خەفتانی مرۆڤ لەوەی گوناهەکانی خۆی پێ بسڕێتەوە، بە کوردیی دەڵێین: پۆزش هێنانەوە، داوای لێبوردن کردن، عوزر هێنانەوەش، هەر بەکاردەهێنرێ.

(**نَّصُوحًا**): (**النُّصْحُ: تَحَرِّي فِعلٍ أَو قَولٍ فِيهِ صَلاَحُ صَاحِبِهِ**)، (**نُصْح**): بریتیە لە گەڕان و خەفتان بۆ کردەویەك و قسەیەك، كە چاکیی هاوەڵەکەی تێدابێ، واتە: ئەو کەسەی (**نُصْح**)ەکەی ئاڕاستە دەکرێ.

(**لَا يُخْزِى**): زەبوون و سەرشۆڕ ناکات، (**خَزِيَ الرَّجُلُ: لَحِقَهُ انكِسارٌ**)، (**خَزِيَ الرَّجُلُ**)، واتە: ئەو پیاوە تەریق بوونەوەو خەجاڵەتیی پێوە نووسا.

(**وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ**): پێشتر باسی وشەی (**غَلِيظ**)مان کرد، واتە: لەسەریان زبرو توندو سەخت بە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

خـوا ﷻ لـەو چـوار ئایەتـەدا دوو جـاران ڕوو لـە بـڕواداران دەکات و دەیاندوێنێ بـە نازنـاوی ئیـمان: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، جارێکیـش ڕوو لـە بێبڕوایـان دەکات، ئەویـش بـە نازنـاوی نـاسراو و زانـراوی خۆیـان دەیاندوێنـێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، هەروەهـا لـە ئایـەتی چـوارەم و کۆتایـی دا، ڕوو لـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەکات ئەویـش بـە یەکێك لـە دوو نازنـاوە زۆر زانراوەکـەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾ و ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ﴾، بـە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، دەیدوێنـێ.

سـەرەتا خـوا ڕوو لـە ئیمانـداران دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! خۆتان و خێزانتـان لـە ئاگرێـك بپارێـزن، کـە سـووتەمەنییەکەی خەڵـك و بـەردە، خەڵـك و بـەرد واتـە: ئـەو ئاگـرە بەچـی دەئایسـێ و چـی بـۆی دەبێتـە سـووتەمەنیی؟ خەڵـك (مرۆڤـەکان)، پاشـان بەردیـش، دیـارە ئـەو خەڵکانـە دەبنـە سـووتەمەنیی دۆزەخ، کە دڵیـان وەك بـەرد بـووە، بەڵکـو لـە بەردیـش ڕەقـتر بـووە، لـە ئاسـتی خـواو یـادی خـوادا، بۆیـە لەگـەڵ بەردانـدا دەبنـە سـووتەمەنیی بـۆ دۆزەخ، واتـە: هـەر خۆشیان بـەو سـووتەمەنییە دەسـووتێنرێن، کـە هـەر خۆیانـن، یـانی: جەسـتەی خۆشـیان دەبێتـە مایـەی بڵێسـەدارکردنی ئاگـری دۆزەخ، دیـارە خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ئـەی بڕوادارینـە! خۆتـان و خێزانتـان لـە ئاگرێـك بپارێـزن کـە سـووتەمەنییەکەی خەڵکـەو بـەردە، واتـە: خۆشـتان و خێزانیشـتان (أهـل) بـە پلـەی یەکـەم بـە ژن دەگوتـرێ، لەبـەر ئـەوەی ئـەو کەسـەی لـە ماڵەوەیـە زیاتـر ژنـە، بـەڵام (أهـل) وێـڕای ژن، منداڵەکانیـش دەگرێتـەوەو، هەمـوو ئەوانـەش کـە لـە چـوار چێـوەی ماڵـدا لەگـەڵ مرۆڤـدا دەژیـن، دەیانگرێتـەوە، بـەڵام (أهـل) بـە پلـەی یەکـەم بـۆ

هاوسەر بەکاردێ، وەك پێشتریش باسمان کرد، ئنجا خۆ پاراستن و پاراستنی ماڵ و خێزان لە ئاگری دۆزەخ، کە سووتەمەنییەکەی خەڵك و بەردن، بەوە دەبێ خۆیان لەو شتانە بپارێزن، کە مایەی سزاو جەزرەبەی خوان، واتە: پابەند بن بە شەریعەتەوە، ئەگەر بەڕێی شەریعەتدا بڕۆن، ڕێتان ناکەوێتە دۆزەخ، ئەگەر لە دنیادا بە پاکیی و چاکیی بژین، بە هۆی پابەندیی بە شەریعەتی ڕاست و دروست و پاك و چاکی خوای پەروەردگارەوە، هەر کەسێك لە دنیادا بە ڕاستە ڕێی خوادا بڕوا، لە ڕۆژی دوایی دا ناخلیسکێتە نێو ئاگری دۆزەخ.

ئنجا ئەو ئاگری دۆزەخەش کە سووتەمەنییەکەی خەڵکەو بەردە: ﴿عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ﴾، فریشتانێکی بە سەرەوەن، مەبەست پێیان دۆزەخەوانەکانن، ئەوانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن، کە دوو سیفەتیان لێ هەڵدەدا: ﴿غِلَاظٌ شِدَادٌ﴾، ﴿غِلَاظٌ﴾، کۆی (غَلِيظ)ە، ﴿شِدَادٌ﴾یش کۆی (شَدِيد)ە، ﴿غِلَاظٌ﴾، واتە: لە ڕووی جەستەوە زۆر زەبەلاح و بەهێزن، ﴿شِدَادٌ﴾، واتە: لەڕووی مەعنەوییەوە زۆر تووڕەو توندو تیژن، کەواتە: ئەو فریشتانەی خوا ﷻ ئازاردان و سزادانی دۆزەخییانی پێ سپاردوون، یەکەم: زۆر بەهێزو زەبەلاحن، دووەم: زۆر دڵڕەق و سەخت و بێ بەزەیین، ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ﴾، هەرچی خوا فەرمانیان پێ بکات، سەرپێچیی لێ ناکەن، ﴿وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾، هەر شتێکیش فەرمانیان پێ بکرێ، ئەنجامی دەدەن، وەك خۆی جێ بەجێی دەکەن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ﴾، ئەی ئەوانەی بێبڕوا بوون (لە دنیادا)! ئەمڕۆ پۆزش مەهێننەوە، ئەم ڕووی دواندنە لێرەدا لە کافران، لە ڕۆژی دوایی دایە، هی بڕواداران لێرەش و لە ئایەتەکەی دواییش، هەروەها هی پێغەمبەریش ﷺ لە دنیادایە، بەڵام هی بێبڕوایان ئەو دواندنە لە ڕۆژی دوایی دایە، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ئەی ئەوانەی بێبڕوا بوون! واتە: لە دنیادا، ﴿لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ﴾، ئەمڕۆ پۆزش مەهێننەوە، ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، بە دڵنیایی تەنیا بەپێی ئەوەی کردووتانە سزا دەدرێن، پڕ بەپێستی کردەوە خراپەکانی

خۆتـان سـزا دەدرێـن، کەواتـە: ئێسـتا پـۆزش هێنانـەوەو داوای لێبـوردن کـردن، دادتـان نـادات و بـە کەڵکتـان نایـەت.

هەڵبەتـە خـوا ﷻ بۆیـە ئـەو دیمـەن و مەشـهەدەی قیامـەت دێنـێ بـۆ ئێـرە، واتـە: ئـەی بێبڕوایـەکانی کـە ئێسـتا ئـەم قورئانـە دەبیسـتن! ئەگـەر ئێسـتا بـڕوا نەهێنـن و لـە خۆتـان وریـا نەبـن، سـبەینێ کـە قیامـەت دێ، ڕۆژی دوایـی دێ، هەرچەنـدە پـۆزش بهێننـەوە، ئاواتـان پـێ دەگوتـرێ، پێتـان دەگوتـرێ: ئەمـڕۆ پۆزش مەهێننـەوە، چونکـە هـەر بەپێـی ئـەوەی کردووتانـە، سـزا دەدرێـن، کەواتـە: ئـەی بێبڕوایـەکان! ئێسـتا بـە خەمـی خۆتانـەوە بـن و، مشـووری خۆتـان بخـۆن و، ئاگاتـان لـە خۆتـان بـێ، ژیانـە دنیاییەکەتـان چـۆن دەگوزەرێنـن!.

ئنجـا بـۆ جـاری سـێیەم خـوا ﷻ بانگیـان دەکات، کـە بانگکـردنی دووەمـە بـۆ بـڕواداران لـەم سـوورەتەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! واتـە: بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، بـە گەڕانەوەیـەکی ڕاسـت و سـاغ بـۆ لای خـوا بگەڕێنـەوە، ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾، نیزیکـە پەروەردگارتـان خراپەکانتـان لـێ بسـڕێتەوە، (بـە هـۆی گەڕانەوەیـەکی ڕاسـت و سـاغەوە)، ﴿وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، دوای ئـەوەی خراپـەکانی لـێ سـڕینەوەو پـاك و چـاك بـوون، خاوێـن بوونـەوە، ئنجـا بتانخاتـە نێـو باخانێکـەوە کـە ڕووباریـان بەبـەردا دەڕۆن، ڕووبـارو جۆگـە، بەبـەر درەختەکانیانـدا دەڕۆن، ﴿يَوۡمَ لَا يُخۡزِي ٱللَّهُ ٱلنَّبِيَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ﴾، لـە ڕۆژێکـدا کـە خـوا ﷻ پێغەمبـەر ﷺ زەبـوون و شـەرمەزار نـاکات، بڕوادارانیـش کـە لـە خزمـەتی دان، زەبـوون و شـەرمەزاریان نـاکات، لێـرەدا خـوا ﷻ وشـەی (**خِـزِی**)، زیاتـر بـۆ بـڕواداران بەکارهێنـاوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی بـڕواداران لـە خزمـەت پێغەمبـەردا ﷺ بـوون، بۆیـە پێشـێ بـاسی پێغەمبـەر دەکات، ئەگەرنـا ئـەو جـۆرە تەعبیـرە خـوا ﷻ بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـەکاری ناهێنـێ، چونکـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەوە دوورە ئەگـەری ئـەوەی هەبـێ توشـی ئـەو حاڵەتـە

ببێ، بەڵام بڕواداران ئەگەر لە خۆیان وریا نەبن، ئەگەری ئەوەی هەیە تووشی شەرمەزاریی و عەیبداریی و ڕیسوایی ببن، ﴿ نُورُهُمۡ يَسۡعَىٰ بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ ﴾، ڕووناکییەکەیان واتە: هی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پلەی یەکەم و، هی بڕوادارانیش کە لە خزمەتی دان، ڕووناکییەکەیان بە خێرایی لەپێشیانەوە دەڕوا، لەپێش دەستەکانیانەوەو، بەدەستی ڕاستیشیانەوە، پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (الحديد)دا، کە تەعبیرێکی شێوەی ئەوە هاتوە، باسمان کرد، کە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ڕووناکییەکەی پێشیان، لە نێو چاوانیانەوەیە، ئەو نێو چاوانەی کڕنووشیان پێ بردوە، ڕووناکیاکە لەوێ دەردەچێ، ڕووناکییەکەی دەستی ڕاستیشیان: ﴿ وَبِأَيۡمَٰنِهِمۡ ﴾، پەنجەی شایەتمانیانە، گرنگ ئەوەیە لای پێشەوەو لای ڕاست لە قورئاندا، هەمیشە بە لای موبارەك و بۆ چاکیی بەکارهاتوون، بە پێچەوانەی لای چەپ و پشتەوە، هی بێبڕوایەکان یان لەپشتەوە نامەکەیان دەدرێتەوە، نامەی کردەوەکانیان، یاخود بە لای چەپدا، بەڵام هی بڕواداران بە لای ڕاستداو لە پێشەوەڕا، ئنجا خوا دەفەرموێ: ڕووناکییەکەیان بەخێرایی دەڕوا لەپێشیانەوەو بە دەستی ڕاستیشیانەوە، ﴿ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا ﴾، دەپاڕێنەوەو دەڵێن: پەروەردگارمان! ڕووناکییەکەمانمان بۆ تەواو بکە، ﴿ وَٱغۡفِرۡ لَنَآ ﴾، لێشمان ببوورە، ﴿ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لەسەر هەموو شتێك بە توانای.

ئنجا خوا ﷻ لە جاری چوارەم و کۆتایی لەم چوار ئایەتە موبارەکەدا، پێغەمبەری خاتەم دەدوێنێ ﷺ دوو جاران بڕوادارانی دواندوون و، جارێك بێبڕوایان و، ئەم جارەش پێغەمبەری خاتەم ﷺ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، ئەی پێغەمبەر! ﷺ ﴿ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴾، ئەوپەڕی تێکۆشان بکە لە دژی بێبڕوایەکان و موونافیق و دەغەڵەکان، ﴿ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾، زبرو ڕەق و پتەویش بە لەسەریان، ﴿ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾، جێی حەوانەوەشیان دۆزەخەو ئەوێ خراپترین سەرەنجامیشە (کە مرۆڤی بچێتێ) بێگومان تێکۆشانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە دژی کافران بە شێوازی خۆیان و، لە دژی موونافیقەکانیش بە شێوازی خۆیان.

کافرەکان لە دژیان تێبکۆشە لە ڕووی فیکرییەوە، بە بانگەوازو ڕوونکردنەوەی ئیمان و ڕاستییەکانی ئیسلام و، بەرپەرچدانەوەی بیرۆکە پووچەکانی ئەهلی کوفر.

بەڵام لە ڕووی بەرەنگاریی و ڕووبەڕوو بوونەوەو، لە کاتی سەنگەر لە یەکدی گرتندا، ئەوە دیارە بە چەك و هێز لەگەڵ بێبڕوایەکاندا ڕووبەڕوو ببەوە، بەڵام بۆ مونافیقەکان، تەنیا ڕووبەڕووبوونەوەی فیکریی و مەعنەویی و ڕاگەیاندنیی هەیە، بە ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکان و پەردە هەڵماڵین لەسەر ناخی موخەننەتانەیان و، سەرزەنشت کردنیان و، ئامۆژگاریی کردنیان و، بەرپەرچدانەوەی پڕووپاگەندەکانیان، ﴿وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ﴾، زبریش بە لەسەریان، یانی هەم لەسەر کافرەکان زبر بە، بە هەردوو شێوەکانی ڕووبەڕوو بوونەوە، هەم لەسەر مونافیقەکانیش بەو شێوەیەی باسمان کرد، قسەی زبرو توندو سڵەمێنەرەوەو سەرزەنشتکارانەیان و لەگەڵدا بکە، بەڵکو واز بێنن لە نیفاق، یاخود بۆ ئەوەی مسوڵمانان لێیان تووشی زیان نەبن، ﴿وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾، هەر کامێك لە بێبڕوایەکان و دەغەڵ و مونافیقەکانیش، شوێنی حەوانەوەیان شوێنێك کە بۆی دەگەڕێنەوەو تێیدا دەحەوێنرێنەوە، دۆزەخە، ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ﴾، یانی: (وَجَهَنَّمُ وَبِئسَ المَصِير)، دۆزەخیش خراپترین شوێنە کە خەڵکی بۆ دەچێ، ﴿ٱلۡمَصِيرُ﴾، یانی: (ما يُصارُ إلَيهِ)، ئەو شوێنەی خەڵك بۆی دەچێ و بۆی دەگەڕێتەوە، ئەوێ (دۆزەخ) خراپترین شوێنە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکـردن بـە بـڕواداران کـە خۆیـان و خێزانیـان لـە ئاگـری دۆزەخ، کـە سـووتەمەنییەکەی خەڵـك و بـەردە و، فریشـتانی بەهێـزو تونـدو تیژی بەسـەرەوەن، بپارێـزن:**

خـوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦ ﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە! واتە: بڕواتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

**٢)-** ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ﴾، خۆتان و خێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن، ﴿ قُوٓاْ ﴾، کارو بکەر (**فعل و فاعل**)ە، ﴿ أَنفُسَكُمۡ ﴾، بەرکاری یەکەمیەتی و ﴿ وَأَهۡلِيكُمۡ ﴾، دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر ﴿ أَنفُسَكُمۡ ﴾ و، ﴿ نَارٗا ﴾، دەبێتە بەرکاری دووەم، خۆتان و خێزانتان بپارێزن لە ئاگرێك (**ناراً**) بە نەزانراو (**نكرة**) هاتوە، واتە: ئاگرێك کە ناناسرێ و وەسف ناکرێ، ئاگرێك کە وەسف کردن دەورەی نادات، (**لا يُحِيطُ بِهِ وَصفٌ**)، ئاگرێکی زۆر زەبەلاح و بێڕەزا.

**٣)-** ﴿ وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾، سووتەمەنییەکەی خەڵکەو بەردە، پێشتریش گوتمان: (**الوَقُودُ: ما يُجعَلُ لِلوُقُودِ**)، (**وَقُود**) ئەوەیە کە بۆ سووتاندن دادەنرێ، هەروەك (**وَضُوء: ما يُجعَلُ لِلوُضُوءِ**)، (**وَضُوء**) ئەو ئاوەی دەستنوێژی پێ دەگیرێ، ئەوەیە کە بۆ دەستنوێژ گرتن

دادەنرێ، ئاگری دۆزەخ سووتەمەنییەکەی بریتیە لە خەڵك و بەرد، ئایا لێرەدا بۆچی خوا ﷻ خەڵك و بەردی پێکەوە هێناون؟ دەڵێین: بەرد نموونەی ئەو دروستکراوانەیە کە بۆ ئێمە زانراون و، زۆر ڕەق و سەختن، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (**البقرة**) دا دەفەرموێ: ﴿ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ...﴿٧٤﴾ ﴾**البقرة**، ئەو دڵانە وەك بەرد یاخود سەختییان توندتریشە، ئنجا خەڵکێکیش کە خاوەنی خۆی نەناسێ و خاوەنی خۆی نەپەرستێ و، گوێ بۆ پەیامی خوا نەگرێ و، بە دوای پێغەمبەری خوا نەکەوێ ﷺ، بە دڵنیایی ئەوانەش دڵیان وەك بەردە، بەڵکو لە بەردیش ڕەقترە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾**البقرة**، دوایی خوا بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوەی کە دڵی ئێوە (ئەی جوولەکەکان) ڕەق بوو وەك بەرد، بەڵکو لە بەردیش ڕەقتر، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ...﴿٧٤﴾ ﴾**البقرة**، بەردی وا هەیە ڕووبارو کانیی و سەرچاوەی لێ دەردەقوڵن، وەك سەرچاوەی زەڵم و زۆر سەرچاوەی دیکە، کە لە شاخێکی ڕەق دێتە دەرێ، ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ...﴿٧٤﴾ ﴾**البقرة**، هەروەها هەیانە لەت دەبێ و دەقڵیشێ و ئاوی لێ دێتە دەرێ، ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ...﴿٧٤﴾ ﴾**البقرة**، بەردیش هەیە لە سام و ترسی خوا دەکەوێتە خوار.

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دەگونجێ دڵی مرۆڤ لە بەرد ڕەقتر بێ، نە لە ترسی خوا بکەوێ و، نە تۆزقاڵێك ئیمانی لێ بچۆڕێ و، نە کانیی و سەرچاوەی ئیمانیشی لێ هەڵبقوڵێ!

٤)- ﴿ عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ ﴾، ئەو ئاگرە فریشتانێکی زەبەلاح و زبرو بە هێزی بەسەرەوەن و سەرپەرشتیی دەکەن، ﴿ غِلَاظٌ ﴾، کۆی (**غَلِيظ**)ە، ﴿ شِدَادٌ ﴾، کۆی (**شَدِيد**)ە، واتە: زۆر زەبەلاح و بەهێزن لە ڕووی جەستەوەو، لە ڕووی مەعنەوییشەوە توندو تیژو بێ بەزەیین، (**غِلاظُ الأَجسامِ شِدَادُ القُلُوبِ**)، دەشگونجێ بگوترێ: (**غِلَاظُ القُلُوبِ شِدَادُ الأَجْسَامِ**)، دڵ زبری جەستە بەهێزن.

هەر کام لە (غلیظ) و (شدید) لە قورئان دا، بۆ شتی ماددیی و بەرهەست و بۆ شتی مەعنەوییش بەکارهێنراون، وەك:

١- ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ... ﴾، **آل عمران (١٥٩).**

٢- ﴿وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾﴾، **إبراهيم.**

٣- ﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾﴾، **البروج،**

٤- ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾﴾، **النجم،**

بۆیە لێرەش دەگونجێ هەر کامیان چەمك و واتایەکی مەعنەویی یان بەرهەست و ماددییان لێ بگیرێ، بەڵام زیاتر واپێدەچێ (**غلیظ**) بۆ حاڵەتی مەعنەویی و، (**شدید**) بۆ حاڵەتی ماددیی و بەرهەست بێ.

شایانی باسیشە:

فریشتە دۆزەخەوانەکان لە قورئان دا بە (**زبانیة**) و (**خزنة**)ش ناوهێنراون: ﴿سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾﴾،**العلق (١٨)**، ﴿وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ..... ﴿٧١﴾﴾، **الزمر.**

٥)- ﴿لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ﴾، هەرچی خوا فەرمانیان پێ دەکات، سەرپێچیی لێ ناکەن، زانایانی ڕێزمانزان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

أ- (**لا يَعصُونَ اللهَ أَمرَهُ**) واتە: سەرپێچیی فەرمانی خوا ناکەن.

ب- (**لا يَعصُونَ اللهَ الَّذِي أَمَرَهُم بِهِ**)، سەرپێچیی لە خوا ناکەن، لەوەدا کە فەرمانیان پێ بکات، هەردوو واتایەکەش لێك نزیکن، واتە: فەرمانی خوا سەرپێچیی لێ ناکەن، یاخود: سەرپێچیی لە خوا ناکەن، بۆ هەر شتێك کە فەرمانیان پێ بکات.

ج- بەڵکو واتایەکی دیکەی سێیەمیشی هەیە: (**لا يَعصُونَ اللهَ فِي أَمرِهِ**)، واتە: لە فەرمان کردنیدا سەرپێچیی لە خوا ناکەن.

٦)- ﴿ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴾، هەرچی فەرمانیان پێ بکرێ ئەنجامی دەدەن، واتە: لە کاتی خۆیداو، لە شوێنی خۆیداو، بە ئەندازەی خۆی و، بە چۆنیەتیی خۆی، هەرچی پێیان بگوترێ، جێبەجێی دەکەن، ئەوەی پێشێ تەنیا ئەوە دەگەیەنێ کە سەرپێچیی لە فەرمانی خوا ناکەن، بەڵام ئەمەیان ئەوە دەگەیەنێ کە چۆنیان پێ دەگوترێ و، بە چ چۆنیەتییەك و، لە چ کاتێك و لە چ شوێنێکداو، بە چ ئەندازەیەك، بەو شێوەیە جێبەجێی دەکەن.

بێگومان خۆ و ماڵ و خێزان پاراستن لە ئاگری دۆزەخیش، بەوە دەبێ کە مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە کاتێك کە دەیەوێ خێزان پێکەوە بنێ، چاو بگێڕێ بۆ ئافرەتێك کە لەگەڵیدا هاوکارو دەستبارگر بێ، بۆ ئەوەی هەم ئافرەتەکە خۆی و، هەم ئەو وەچەیەی لێیان پەیدادەبێ، هەروەها هەردووکیان پیاوەکە و ئافرەتەکەش پێکەوە، هاوکارو دەستبارگری یەکدی بن، کە وەچەکەیان چاك پەروەردە بکەن، یەکەمین هۆکاری خۆو خێزان پاراستن لە ئاگری دۆزەخ، ئەوەیە کە مرۆڤ لە بناغەی دانانی خێزاندا وریا بێ، ئنجا هەمیشەش چاوی لەسەر ژن و منداڵەکانی بێ و ئاگای لێیان بێ، دڵسۆزانەو بە پەرۆشانەو بە ڕەحمانە، پەروەردەیان بکات، ئاگای لێیان بێ، تووشی لادان و تاوان نەبن، چونکە وێڕای ئەوەی پیاو پابەند کراوەو، دەبێ ماڵ و خێزانەکەی بژیەنێ و نەفەقەیان بکێشێ و بژیویان بۆ دابین بکات، پۆشاکیان بۆ دابین بکات، جێگاو ڕێگایان بۆ دابین بکات، لە پێش ئەوەشدا مولزەمە کە لە ڕووی مەعنەویی و ڕەوشت و ڕەفتارەوە، ئاگای لێیان بێ، لانەدەن، نەك تەنیا خزمەتی جەستەیان بکات، بەڵام عەقڵ و دڵیان پشت گوێ بخات و، سەرەنجام تووشی لادان و تاوان بن، ئەویش لێیان تووشی عەیبداریی و گوناهباریی ببێ، خۆشیان زایە بن و، ئەویش تووشی گوناهو تاوان ببێ، بە هۆی کەمتەرخەمییەوە لە بەرانبەریان دا.

**مەسەلەی دووەم:**

**دواندنی بێبڕوایان لە قیامەتدا، کە ئێستا پۆزش مەهێننەوەو ئێرە شوێنی سزایە بۆ ئێوەو، پۆزش هێنانەوە و بیانوو هێنانەوە، هیچ دادێکتان نادات.**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ⑦ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە دوو بڕگەدا:**

١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَا تَعْتَذِرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ﴾، ئەی ئەوانەی بێبڕوا بوون! (لە دنیادا)، ئەمڕۆ پۆزش مەهێننەوە.

ئەمڕۆ واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، لە ڕۆژی دوایی دا، لە کاتێکدا ئەوەیان پێ دەگوترێ، کە فڕێ دەدرێنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، بۆ ئەوەی نائومێدو تەما بڕاو بن و، خاتر جەم بن و دەستی لێ وەبن سەربدەن، تازە ئێوە ئێرە شوێنتانە.

٢)- ﴿ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە تەنیا سزای ئەوە دەدرێنەوە کە دەتانکرد، یانی: کردەوە خراپەکانتان بە ئێرەی گەیاندن، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {**حُفَّتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ**}، (**أخرجه مسلم: ٢٨٢٣**) واتە: بەهەشت بە ناڕەحەتییەکان دەورە دراوەو، ئاگری دۆزەخ بە ئارەزووەکان تەنراوە.

کەواتە: کەسێك بە دوای ئارەزووەکان بکەوێ (ئارەزووە ناشەرعییەکان) و پەرژینی ئارەزووکان ببڕێ و هەر بە دوایان بکەوێ، دەچێتە نێو دۆزەخ و، کەسێکیش بیەوێ بەرەو بەهەشت بچێ، دەبێ ناڕەحەتییەکان تەحەممول بکات و ئەرکەکان جێ بەجێ بکات، ناڕەحەتییەکان بەو واتایە کە هەندێك لە ئەرکە شەرعییەکان جاری وایە مرۆڤ پێیانەوە ماندوو دەبێ، بەڵام بە دڵنیایی لەگەڵ عەینی ماندوو بوونیشدا، گەورەترین چێژی پێ دەبەخشن.

بۆ وێنە: ئێستا ئێمە لە مانگی موبارەکی ڕەمەزان داین[١]، زۆربەی خەڵکی ڕەنگە وەك شتێکی مەترسییلێکراو بۆ ڕەمەزان بڕوانن، بەڵام بێگومان ئەگەر خەڵك تێبگات، ڕۆژوو گرتنی ڕەمەزان و هەر تاعەتێکی دیکە کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، گەورەترین چێژ و خۆشیی مەعنەویی پێ دەگەیەنێ، بەڵێ تۆزێك جەستەی ماندوو دەبێ و ئێش و ئازاری دەبێ، هەروەها لە جەنگ و جیهاد و، کۆچ کردن و، ماڵ و حاڵ بەجێ هێشتن داو، لە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە کردن و، لەسەر خوا قسە پێ گوتران و، ناڕەحەتکران دا، ئازارو ناڕەحەتیی و ئێش و ژان دەبن، بەڵام لەڕاستییدا چێژە مەعنەوییەکەی جێبەجێ کردنی ئەرکە شەرعیەکان و دینداریی بۆ خوا کردن، زۆر زۆر زیاترە لە ئازارە جەستەیی و ماددیی و ڕواڵەتییەکان.

لێرەش دا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، ئەمە زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، کە هەم بەهەشتییەکان خوا کردەوەکانیانی کردوونە هۆکار بۆ چوونیان بۆ بەهەشت و، هەم دۆزەخییەکانیش خوا کردەوە خراپەکانیانی کە پێش هەموویان بێبڕواییە، یان نیفاق و هاوبەش بۆ خوا دانانە، کردوونە هۆکار بۆ چوونە دۆزەخیان، کەواتە: هەندێك کەس هەندێك فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە سیاقێکی دیکەداو بۆ مەبەستێکی دیکە فەرمووني، دەیانکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی خوا چی بۆ مرۆڤ بڕیار بدات هەر ئەوەیە، ئەگەر خوا ﷻ بۆی نووسیبێ بچێتە بەهەشت، دەچێتە بەهەشت و، ئەگەر بۆی نووسیبێ بچێتە دۆزەخ، دەچێتە دۆزەخ، هێنانەوەی ئەو جۆرە فەرمایشتانە بۆ پاساودانەوەی ئەوە کە تازە خوا ﷻ چی نووسیوە، هەروایە! زۆر هەڵەیەو، لەڕاستییدا وەك جاری دیکەش گوتوومانە: ئەوە شوێن ڕچەی ئیبلیس کەوتنە، چونکە ئەوەتا خوا ﷻ لە چەندان ئایەت دا دەفەموێ: ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ١٧﴾ السجدة، (تعمَلُون)، (يَكسِبُون)، (تكسِبُون)، سزاو پاداشتی ئەوەیە کە کردوویانە، کردووتانە، وەدەستیان هێناوە، وەدەستتان هێناوە.

---

(١) مانگی ڕەمەزانە ساڵی ١٤٤١ك - ٢٠٢٠ز.

ئنجا ئـەوەش کـە خـوای پەنهانـزان دەزانـێ کـێ دەچێتـە دۆزەخ، یـان کـێ دەچێتـە بەهەشـت، بـە هیـچ جۆرێـك جەبـرو زۆرلێکـران ناگەیەنـێ، چونکـە خـوا زانیویـەتی کـێ بـە ویسـتی خـۆی ئیمان دێنـێ و کـردەوەی چاك دەکات و دەچێتـە بەهەشـت، کێـش بـە ویسـتی خـۆی کافـر دەبـێ و خراپـە دەکات و، دەچێتـە دۆزەخ؟ واتــە: ویســتی خــوای پــەروەردگارو زانیــاری خــوا بــە دوای ویســتی مرۆڤــەکان دەکـەوێ، خـوا لـە ئەزەلـدا بـەس ئەوەنـدەی نەزانیـوە کـە تـۆ دەچیـە بەهەشـت، بەڵکـو زانیویشـیـەتی کـە ئیـمان دێنـی و کـردەوەی چـاك دەکـەی، بۆیـە دەچیـە بەهەشـت، ئـەوی دیکـەش: کافـر دەبـێ و خراپـە دەکات، بۆیـە دەچێتـە دۆزەخ.

مەسەلەی سێیەم:

**فەرمانکردن بە بڕواداران کە بە گەڕانەوەیەکی ڕاست و ساغ بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، تاکو خراپەکانیان لێ بسڕێتەوەو، بیانخاتە باخە هەمیشە سەوزو ئاودارەکانەوە، لە ڕۆژێکدا کە بڕواداران لەبەر ڕۆشنایی ئیمانیاندا بەرەو بەهەشت دەچن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە گەڕانەوەیەکی ڕاست و ساغ، وشەی ﴿ نَّصُوحًا ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**نُصُوحاً**)، واتە: بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان بە گەڕانەوەیەکی ساغی ڕاست، چونکە (**نَصُوح**)، یان (**نُصُوح**)، یانی: خاوەن (**نُصح**)، (**نُصح**)یش بە مانای ساغیی و پاکیی دێ، (**النُّصحُ: الإخلاصُ في العَمَلِ وَالقَول**)، (**نُصح**): بریتیە لە ساغکرنەوەی قسەو کردەوە، بۆ خوا، ساغی بکەیەوەو خڵتەی پێوە نەهێڵی، دەگوترێ: (**عَسَلٌ نَّاصِحٌ، إذَا خَلُصَ مِن شَمْعِهِ**)، هەنگوینێك کە ڕەشان و مێوی پێوە نەمێنێ، پێی دەگوترێ: (**عَسَلٌ نَّاصِح**).

شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (**النساء**) لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکانی: (١٧ و ١٨)دا، باسێکمان لە بارەی تەوبەوە کردووەو، کتێبی: (گەڕانەوە بۆ لای خوا)ش کە تا ئێستا شەش جاران چاپ کراوەتەوە، بە تەفصیل لەوێدا

باسی گەڕانەوە بۆ لای خواو بە تایبەت تەوبەی نەصووحمان کردوە، بەڵام لێرەش یەك دوو قسەی زانایان دێنین:

(إبن عَجِيبَة) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ: (**تَوْبَةُ العَامَّة مِنَ الذُّنُوب، وَتَوْبَةُ الخَاصَّةِ مِنَ العُيُوبِ، وَتَوْبَة خَاصَّةِ الخَاصَّةِ مِنَ الغَيْبَةِ عَنْ حَضْرة علاّم الغُيُوب، فَهَؤلَاء أَشَدّ النَّاس افْتقَاراً إلى التَّوْبَة؛ إذْ لَا بُدَّ للعَبد مِنْ سَهْوٍ وَسِنَةٍ حَتَّى يَجُولَ بِقَلْبِه فِي الأكْوَان، أو يَمِيْلَ عَن الإعْتِدَال، فَيَجِبُ فِي حَقِّهِم الإسْتِغْفَار مِنْهَا**).

واتە: گەڕانەوەی خەڵك بە گشتیی لە گوناحانە، بەڵام گەڕانەوەی خەڵکی تایبەت لە عەیب و کەم و کوڕییانەو، گەڕانەوەی خەڵکی تایبەتی تایبەت لە بێئاگا بوونە لە خوای زانای نهێنییەکان، بۆیە ئەو جۆرەی سێیەمیان لە هەموو کەس زیاتر پێویستییان بە گەڕانەوە هەیە، چونکە مرۆڤ هەر چۆن بێ، تووشی بێ ئاگاییەك و خافڵانێك هەر دەبێ، لە کاتێکدا دڵی بەنێو دروستکراوەکاندا دێ و دەچێ، (واتە: بە فیکر پێیانەوە مەشغووڵ دەبێ)، یاخود کاتێك لە ڕێی ڕاست تۆزێك لا دەدات، بۆیە ئەوانە زیاتر پێویستییان بە داوای لێبوردن کردن هەیە!

قسەکەی زۆر جوانە، هیچکەس بە قەدەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ داوای لێبوردنی لە خوا نەکردوە، لە یەك مەجلیسدا جاری وا هەبووە حەفتا جار، سەد جار داوای لێبوردنی لە خوا کردوە، فەرموویەتی: {**إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ**} (**أخرجه أحمد: ١٧٨٨١، وعبد بن حميد: ٣٦٤، ومسلم: ٢٧٠٢، وأبو داود: ١٥١٥، وابن حبان: ٩٣١**)، واتە: تەمێك بەسەر دڵمدا دێ، تاکو من جاری وا هەیە لە ڕۆژێکدا سەد جار داوای لێبوردن لە خوا دەکەم.

بەڵکو جاری وابووە لە مەجلیسێکدا حەفتا جار سەد جار داوای لێبوردنی لە خوا کردوە، چونکە ئینسان تاکو لە خوا نزیکتر بێ، باشتر دەزانێ پێگەو پایەی خوا چەندە بەرزە! بۆیە هەرچی دەیکات هەر بە کەم و کوڕیی

---

(١) البحر المديد في تفسير كتاب الله المجيد: ج ٩، ص٨٧.

دەزانێ، ئەگەر خەڵك لە گوناحان داوای لێبوردن لە خوا دەكات، ئەوانەی زۆر لە خوا نزیكن، بۆ تاعەتیان داوای لێبوردن لە خوا دەكەن، پێغەمبەری خوا ﷺ كە سەلامی نوێژی دەدایەوە[1]، سێ جاران دەیفەرموو: (**أَستَغفِرَ الله**)، داوای لێبوردن لە خوا دەكەم، یانی: خوایە ئەو تاعەتەی ئەنجامم دا لایەقی تۆ نیە، بەڵام من هەر ئەوەندەم لە تواناندا هەیە.

زانایەكی دیكە هەر كە (**ابن عجيبة**) لە سەرچاوەی پێشوو لێی دەخوازێتەوە، دەڵێ: (**التَّوْبَةُ النَّصُوح، قَال القُرَطِيُّ: يَجْمَعُها أَرْبَعَةٌ: الإِسْتِغْفَارُ بِاللِّسَان، وَالإِقْلَاعُ بِالأَبْدَان، وَتَرْكِ العَوْدَ بِالجَنَان، وَمُهَاجَرَة سَيئ الخُلَّان**)، واتە: تەوبەی نەصووح، گەڕانەوەی ڕاست، قورطیی گوتوویەتی: چوار شت كۆی دەكەنەوەو دەبێ چوار سیفەتی تێدابن:

**یەكەم:** بە زمان داوای لێبوردن بكات.

**دووەم:** بە جەستە واز لە گوناهو خراپەكان بێنێ.

**سێیەم:** بە دڵیش بڕیار بدات جارێكی دیكە نەگەڕێتەوە سەریان.

**چوارەم:** وازیش لە دۆست و ڕەفیقە خراپەكانی بێنێ.

**٢)-** ﴿عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾، نیزیكە (ئەگەر تەوبەی ڕاست و ساغ بكەن)، پەروەرگارتان خراپەكانتان لێ بسڕێتەوە، (**عَسَى: مُستَعمَلٌ لِوَعدٍ صادِرٍ عَنِ المُتَفَضِّلِ**)، ﴿عَسَىٰ﴾، بەكاردەهێنرێ بۆ وەعدێك كە دەرچووبێ لە كەسێكی چاكەكارەوە، ئنجا كێ لە خوا ﷻ چاكەكارترە؟ بۆیە زانایان گوتوویانە: (**عَسَى مِنَ اللهِ واجِبَةٌ**)، خوا كە دەفەرموێ: (**عَسَى**) و (**لَعَلَّ**) ئەو شتەی (**لعلَّ**) و (**عَسى**)ی لەگەڵدایە، خوا لەسەر خۆی پێویستی كردوە.

**٣)-** ﴿وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾، بشتانخاتە نێو باخانێكەوە كە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، واتە: هەتا پاك نەبنەوە بە كەڵكی ئەو شوێنە چاكە

---

(١) تخريج.

نایەن، بەهەشت خەڵكی پیس و پۆخەڵی بە كەڵك نایەت، دەبێ پاك و چاك بێ، ئنجا بە كەڵكی بەهەشت دێی، بەهۆی تەوبەی ڕاست و ساغەوەش مرۆڤ پاك دەبێتەوە، ئنجا شایستەی ئەوە دەبێ خوا بیخاتە نێو باخانێكەوە كە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: هەمیشە تەڕ و سەوزن.

٤)- ﴿ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ﴾، ئەو ڕۆژەی خوا ﷻ پێغەمبەر ﷺ شەرمەزارو زەبوون ناكات، ئەوانەش كە بڕوایان هێناوە لەگەڵیدا، **(لايخزي)** شەرمەزار ناكات، لە ڕاستییدا زیاتر بۆ ئەوانە دەچێتەوە، كە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دان، ﴿ يَوْمَ ﴾، **(ظَرْفَ)**ە بۆ **(يُدخِلَكُم)** واتە: لە ڕۆژێكدا دەتانخاتە نێو ئەو باخانەوە، خوا ﷻ بڕوادارانێك كە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دان، زەبوون و شەرمەزاریان ناكات.

٥)- ﴿ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ ﴾، ڕووناكییەكەیان بە خێرایی لەپێشیانەوەو بەدەستی ڕاستیشیانەوە دەڕوا، بەرپێیان بۆ ڕۆشن دەكاتەوە، **(سَعْيُ النُّورِ: امتِدادُهُ وَانتِشارُهُ بِسُرعَةٍ، شُبِّهَ بِاشتِدادِ مَشيِ الماشي)**، كە دەفەرموێ: ﴿ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ ﴾، خێرایی ڕۆیشتنی، ڕووناكیی بریتیە لە درێژ بوونەوەو بڵاوبوونەوەی بەخێرایی، چوێنراوە بە ڕۆیشتنی كەسێكەوە كە بە خێرایی دەڕوا.

٦)- ﴿ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا ﴾، دەڵێن: پەروەردگارمان! ڕووناكییەكەمانمان بۆ تەواو بكە، واتە: ئەو ڕووناكییەمان بۆ بەردەوام بكە، تاكو دەگەینە مەنزڵ، تاكو دەگەینە بەهەشت، چونكە ئەوان لەو كاتەدا بەرەو بەهەشت دەڕۆن، وەك لە تەفسیری سوورەتی **(الحديد)**دا، باسمان كرد[1].

٧)- ﴿ وَٱغْفِرْ لَنَآ ﴾، لێشمان ببوورە، واتە: ئەو لێبوردنەی لێت بوردین، با بەردەوام بێ، چاوپۆشیی و لێبوردنی تۆمان بەردەوام پێویستە.

٨)- ﴿ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لەسەر هەموو شتێك بە توانای.

---

(١) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا: ﴿ يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّـٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ ﴾ الحديد.

## مەسەلەی چوارەم:

**فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺ کە بەوپەڕی توانایەوە لە دژی بێبڕوایان و دەغەڵەکان تێبکۆشێ و، زبرو توند بێ لەسەریان و، جێگەی حەوانەوەشیان ئاگرە:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ﴾، ئەی پێغەمبەر ﷺ! تێبکۆشە بەوپەڕی تێکۆشان لە دژی بێبڕوایەکان و مونافیق و دەغەڵەکان، واتە: هەر کامێکیان بە شێوازی خۆی، وەك پێشتر گوتمان.

٢)- ﴿وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾، زبریش بە لەسەریان، (**الغِلْظَةُ: حَقِيقَتُهَا صَلابَةُ الشَّيء، وَهُنا مُستَعَارَةٌ فِي المُعَامَلَةِ بِالشِّدَّة**)، (**غِلْظَة**): بریتیە لە شتێکی پتەوو ڕەق و زبر، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ هەڵس و کەوتی توند، لە دژی بێبڕوایەکان، چ لە ڕووی مەعنەوییەوە: لە کاتی شەڕە قسەو وتووێژ و ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکان و پووچەڵکردنەوەی هەڵەکانی ئەوان دا، چ لە ڕووی مادديیەوە: بەرەنگاریی و سەنگەر لە یەکدی گرتن، بۆ مونافیقەکانیش هەر مەبەست پێی ڕووبەڕوو بوونەوەی مەعنەویی و ئەدەبیی و فیکریی و کۆمەڵایەتییە، ئەگەرنا مونافیقەکان جەنگیان لە دژ نەکراوەو جەنگیان لە دژ ناکرێ، ﴿وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ﴾، مەبەست زبرییە بۆ هەر کامێکیان بەشێوەی خۆی و لە قەدەر خۆی.

٣)- ﴿وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾، جێگەی حەوانەوەشیان دۆزەخەو، خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە.

(**مَأوَى**) یانی: جێگاو ڕێگا، (**مَفعَلٌ مِن أَوَى إذَا رَجَعَ**)، (**مأوى**): (**مفعل**)ە لە (**أَوَى**)وە، یانی: (**رَجَعَ**) گەڕایەوە، (**مَأوَى**) ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ بۆی دەگەڕێتەوە، واتە: شوێنێك کە ئەوان بۆی دەگەڕێنەوەو تێیدا دەحەوێنەوەو پشوو دەدەن، تەنیا ئاگری دۆزەخە.

(القرطبـي)، بـۆ شـیکردنەوەو ڕوونکردنـەوەی چەمـکی ئـەو ئایەتـە موبارەکـە دەڵـێ: (**أَمَـرَ اللـهُ نَبِيَّـه أَنْ يُجَاهِـد الكُفَّـارَ بِالسَّـيْفِ وَالمَوَاعِـظ الحَسَـنَة وَالدُّعَـاءِ إلى اللـه، وَيُجَاهِـد المُنَافِقِـيْن بِالغِلْظَـة وَإقَامَـة الحجّـة، وَأَنْ يُعَرِّفَهُـم أَحْوَالَهُـمْ فِي الآخِـرَة، وَأَنَّهُـم لاَ نُـورَ لَهُـم يَجُـوزُونَ بِـه الـصِّرَاط مَـعَ المُؤْمِنِين**)، واتـە: خـوا فەرمـانی بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ کـردوە کـە لـە دژی بێبڕوایـەکان تێبکۆشـێ، بـە شمشـێر و بـە ئامۆژگارییـە باشـەکان و بانگکردنیشـیان بـۆ لای خـوا[1].

فەرمانیـشی کـردوە بـە پێغەمبـەر ﷺ کـە لـە دژی مونافیقـەکان بجەنگـێ و لەسـەریان زبـر بـێ، بـەوە کـە بەڵگەیـان لەسـەر تـەواو بـکات و حـاڵ و باڵـی خۆیانیـان لـە ڕۆژی دوایـی دا پێشـان بـدات و پـێ بناسـێنێ، هەروەهـا لـە ڕۆژی دوایـی دا ڕووناکییەکیـان نابـێ، پـردی سـەر پشـتی دۆزەخ [کـە (**صراط**)ی پـێ دەڵێـن]، پێـی ببـڕن، لەگـەڵ بڕوادارانـداو، بپەڕنـەوەو بچنـە بەهەشـت.

واتـە: بـۆ مونافیقـەکان بـە شـێوازی خۆیـان و بـۆ بێبڕوایەکانیـش بەشـێوازی خۆیـان، لـە حاڵەتێـك دا کـە بەهێـز ڕوو بـەڕوو نابنـەوە، بانگـەوازەو تێگەیاندنـەو ئامۆژگاریـی کردنـەو بەرپەرچدانـەوەی بیرۆکـە پووچەکانیانـەو، خسـتنە ڕووی ڕاسـتییەکانی ئیسـلامە، لـە حاڵێکـدا کـە سـەنگەریش لـە ئیسـلام و مسـوڵمانان بگـرن، بێگومـان کـەس لـە شـەڕ شـەکری نەبەخشـیتەوەو، ئیسـلام لـە بەرانبـەر هێـزدا هێـز بەکاردێنـێ و، لـە بەرانبـەر فیکـردا فیکـر بەکاردێنـێ و، بـۆ هـەر کەسـەو هـەر حاڵـە، وەڵام و شـێوازی پـڕ بـە پێسـت و گونجـاوی خـۆی بەکاردێنـێ.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**

---

(١) دەبووایـە پێشـێ (المَواعِـظ الحَسَـنَة وَالدُّعَـاء إلى اللـه)ی پێـش خسـتبایە، چونکـە دوای ئـەوەی بـەدەم ئامۆژگاریـی چـاك و بـەدەم بانگەوازەکەیـەوە نەهاتـن و، سـەنگەریان گرت لە دژی ئیسـلام و مسـوڵمانان، ئنجـا ئیسـلام هێزیـان لـە دژ بەکاردێنێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان سـێ ئایەتـەکانی کۆتایـی سـوڕەتی **(التحریـم)** (١٠ و ١١ و ١٢) دەگرێتـە خـۆی، تێیانـدا دوو وێنـە هێنراونـەوە بـە چـوار ئافرەتـان:

أ- بۆ کۆمەڵی بێبڕوایان: ئافرەتی نووح و ئافرەتی لووط، کە جگە لە ئیمان و کرداری باشی خۆیان، هیچ شتێکی دیکەیان فریا ناکەوێ، ئافرەت ئەگەر هاوسەری باشترین کەسیش بێت، کە پێغەمبەرە (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) مادام ئیمانی نەبێ و کردەوەی باشی نەبێ، هاوسەرێتیی بۆ باشترین پیاو و باشترین کەس، بە کەڵکی نایەت، مادام خۆی بێ ئیمان بێ و دەست خاڵیی بێ لە کردەوەی چاك.

ب- بۆ کۆمەڵی بڕوادارانیش: ئافرەتەکەی فیرعەون و مەریەمی کچی عیمڕان (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە بێبڕوایی و خراپەی نیزیکانیان مادام خۆیان پاك و باش بن، هیچ زیانیان لێ نادات، واتە: ئافرەت ئەگەر بۆ خۆی خاوەن ئیمان و کردەوەی باش بوو، ئەگەر هاوسەری خراپترین پیاویش بێ، وەك فیرعەون، هاوسەرێتیی ئەو بۆ خراپترین پیاو، زیانی لێ نادات، هەروەها ئافرەتێك کە پاك و چاك بێ، با لە نێو خەڵك و کۆمەڵگایەکی زۆر خراپ و بوختانچیی و داخ لە دڵ و زمان شڕدا بێ، وەك جوولەکەکانی کاتی خۆی و ڕۆمانەکان، کە مەریەم خوا لێی ڕازی بێ لە نێویاندا بوو، بوختانیان پێ کرد، بەڵام هیچ زیانی لێ نەدا.

﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾

﴿وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{خوا ئافرەتی نووح و ئافرەتی لووط**ی** بۆ ئەوانەی بێبڕوا بوون، بە وێنە هێنانەوە، (كە جگە لە ئیمان و كردەوەی باش دادی مرۆڤ نادات)، ئەو دوو ژنە لە ژێر (نیكاحی) دوو بەندەی چاك لە بەندەكانماندا بوون، كەچی لەگەڵیاندا بێ بەڵێن و پەیمان شكێن بوون، ئنجا ئەو دوو (بەندە چاكە) نووح و لووط لە بەرانبەر سزای خوادا، تۆزێكیش سوودیان پێ نەگەیاندن و (پێیان) گوترا: ئێوەش وێڕای چووە نێوان، بچنە نێو ئاگر (ی دۆزەخەوە) ﴿١٠﴾ هەروەها خوا ئافرەتی فیرعەونی بە وێنە هێناوەتەوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، كاتێك گوتی: پەروەردگارم! لە لای خۆت لە بەهەشتدا،ماڵێكم بۆ بنیات بنێ و، لە فیرعەون و كردەوەكەی قوتارم بكەو، لە كۆمەڵی ستەمكاران ڕزگارم بكە ﴿١١﴾ (دیسان) مەریەمی كچی عیمرانیش (وێنەیە بۆ بڕواداران)، ئەو (ئافرەت)ەی داوێنی خۆی پاراست، ئنجا ئێمەش لە گیانی بە تایبەت دروستكراوی خۆمان فوومان بەبەردا كرد (بۆ بەدیهێنانی عیسای كوڕی) و وشەكانی پەروەردگاری و كتێبەكانی بەڕاست دانان و، لە (بۆ خوا) ملكەچان بوو ﴿١٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا ): واتـە: خـوا وێنەیـەکی هێنایـەوە، (**ضَرْبُ المَثَلِ هُـوَ مِـنْ ضَربِ الدَّراهِـمِ، وَهُـوَ ذِكْـرُ شَيءٍ أَثَـرُهُ يَظْهَـرُ فِي غَـيْرِهِ، وَالمَثَـلُ: الشَّـبَهُ وَالوَصْـفُ**)، (**ضَرْبُ المَثَـل**) وەك: (**ضَرْبُ الدَّرَاهِـم**) لـە جـۆری سـکە لێدرنـەو، بریتیـە لـە باسـکردنی شـتێك کـە شـوێنەوارەکەی لـە جگـە لـە خۆیـدا دەرکەوتـوە، (**مَثَـل**) بـە مانـای (**شَـبَه**)ە، یـانی: بـە مانـای وەسـفیش هاتـوە، وەك: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ...﴿٦٠﴾ ﴾النحـل، واتـە: وەسـفی هـەرە بـەرز بـۆ خوایـە.

(فَخَانَتَاهُمَا ): خیانەتیـان پێکـردن، ناپاکییـان لەگـەڵ کـردن، (**الخِيانَـةُ: مُخالَفَـةُ الحَـقِّ بِنَقْـضِ العَهْـدِ فِي الـسِّرّ**)، خیانـەت بریتیـە لـە پێچەوانـەی هـەق بـوون، بەهـۆی هەڵوەشـانەوەی پەیـمان بـە پەنهانیـی، دوایـی بـاسی دەکەیـن، کـە موخەننەتیـی و ناپاکیـی ژنی نـووح صـەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر نـووح بـێ و، ژنەکـەی **لـووط** صـەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر **لـووط** بـێ، ئـەوە نەبـووە، کـە بـە بـاری لادانی جینسـیی دا بـێ، بەڵکـو بێبڕواییـان بـووە بـە نـووح و بـە **لـووط**، هەروەهـا دژی ئـەوان جووڵانەوەیـان بـووەو، لەگـەڵ هـەوای خەڵـك و دەوروبـەردا ڕۆیشـتنیان بـووە.

(فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ): لـە بەرانبـەر (سـزای) خـوادا، هیـچ سـوودیان پـێ نەگەیانـدن، دەگوتـرێ: (**أَغنَـى عَنـهُ كَـذَا، أَي: كَفَـاهُ**)، واتـە: سـوودی پێگەیانـد و بـۆی بـەس بـوو، بەرگرییـکاری بـوو، یاخـود بەرپەرچـدەرەوەی زیانێـك بـوو لێـی.

(أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا): داوێنـی خـۆی پاراسـت، (**حَصَـان، أَي: عَفِيْفَـة**)، ئافرەتێـکی پـاك، (**أَحْصَنَـتْ، وَحَصَنَـتْ: أَي صانَـت وَحَفِظَـت**)، واتـە: پاراسـتی، یـانی: خـۆی پاراسـتوە، خـوای کاربەجـێ بۆیـە ئـەم وشـەیە زۆر بـۆ مەریـەم بەکاردێنـێ، چونکـە ئێسـتاشی

لەگەڵدابێ، جوولەکەکان مەریەم بەوە تاوانبار دەکەن، کە داوێن پیسی کردوەو، عیساش بە بیژوو و زۆڵ دادەنێن! بۆیە خوا ﷻ بۆ مەریەم (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەم وشەی پاکییە زۆر بەکاردێنێ، کە زۆر خۆی پاراستوەو، ئەصڵەن مەریەم هاوسەرگیریی هەر نەکردوەو، نە بە حەڵاڵیی و نە بە حەڕامیی، هیچ پیاوێك دەستی پێی نەکەوتوە، بەڵام خوا ﷻ وەك یاسادڕێك و موعجیزەیەك عیسای بە بێ باب لە مەریەم پەیدا کردوە، وەك بەسەرهاتەکەیمان لە تەفسیری سوورەتی مەریەمدا بە تەفصیل باسکردوە.

(فَرۡجَهَا): (**الفَرْجُ: الشَقُّ بَيْنَ الشَّيئَينِ، مَا بَيْنَ الرِّجْلَيْنِ، وَكُنِّيَ بِهِ عَنِ السَّوْءَةِ**)، (**فَرْج**): واتە: کەلێنی نێوان دوو شتان، درزو کەلێن، بە نێوان دوو لاقەکانی مرۆڤیش دەگوترێ، بە کینایەش بۆ ئەندامی زاوزێی مرۆڤ بەکاردەهێنرێ.

(فَنَفَخۡنَا فِيهِ): واتە: فوومان پێیدا کرد، (**النَّفْخُ: نَفْخُ الرِّيحِ فِي شَيء**)، (**نَفْخ**): بریتیە لەوەی با بە شتێکدا بکەی.

(ٱلۡقَٰنِتِينَ): (**القُنُوتُ: لُزُومُ الطَّاعَةِ مَعَ الخُضُوع**)، (**قُنُوت**): بریتیە لە فەرمانبەریی لەگەڵ ملکەچیی و زەبوونیی پێشانداندا، (بۆ خوای بەرزی مەزن).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لە کۆتایی سووڕەتی (**التحريم**)دا، کە وەك گوتمان: تەوەرە سەرەکییەکەی کە دەستپێکیشیەتی باسی ڕووداوێکی خێزانیی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەگەڵ دووان لە هاوسەرەکانی دا، ئنجا بەو بۆنەوە خوا ﷻ فەرمانی کرد بە بڕواداران، خۆیان و ماڵ و خێزانیان لە ئاگرێك بپارێزن، کە سووتەمەنییەکەی خەڵکەو بەردە، پاشان دیمەنێکی ڕۆژی دوایی هێنایە بەر چاو و کافرەکانی لەوێدا دواندن، یانی: ئەو دواندنەی لە ڕۆژی دوایی دا، خوا کافرەکان پێ دەدوێنێ، لە قورئاندا باسی کردوە، کە لەوێ پێیان دەفەرموێ: (لێرە عوزرو پۆزش مەهێننەوە، چونکە تەنیا بەپێی کردەوەکەی خۆتان سزا دەدرێن)، دوایی جارێکی دیکە خوا ڕووی لە بڕواداران کردو فەرمانی پێکردن کە بە گەڕانەوەیەکی ڕاست و ساغ بۆ لای خوا بگەڕێنەوە، تاکو گوناهو خراپەکانیان لێ بسڕێتەوەو، شایستەی چوونە بەهەشت بن، لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دا، دواییش خوای میهرەبان پێغەمبەری پێشەوای ﷺ بانگ کردو، فەرمانی پێکرد کە لە دژی کافرەکان و دەغەڵ و مونافیقەکان ئەوپەڕی تێکۆشان بکات، هەر کامیان بە شێوازی خۆی.

ئنجا لە کۆتایی ئەم سووڕەتەدا خوا ﷻ وێنەی بە چوار ئافرەتان هێناوەتەوە، دووانیان خوا کردوونی بە نموونەو وێنە بۆ بێبڕوایان، کە بێبڕوایان بزانن چ ئافرەتان، چ پیاوان، بە تایبەتی ئافرەتانی بێبڕوا، چونکە سووڕەتەکە زیاتر سووڕەتێکی خێزانییە، با بزانن ئەگەر بێت و خۆیان خاوەن ئیمان و کرداری باش نەبن، ئەوە هەرچەندە هاوسەرەکانیان زۆر زۆر باش بن، هیچ سوودیان پێ ناگەیەنن، هەڵبەتە ئەمە هۆشدارییدانیشە بە گشتیی بە کۆی ئافرەتان، کە بە تەمای ئەوە تێنەکەون و، لە خۆیان بایی نەبن و پشتێنی لێ نەکەنەوە، کە هاوسەرەکانیان پیاوی باشن، بەتایبەتییش بۆ هۆشدارییدانە بە

هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ کە زیاتر لە خۆیان وریا بن و، چونکە مێردیان پێغەمبەری خاتەمە موحەممەد ﷺ سەروەری پێغەمبەران و، باشترین ئینسان و پاکترین و چاکترین بەندەی خوای میهرەبان، تەنیا بەوە پشتێنی لێ نەکەنەوە، بێگومان ئەگەر بۆ خۆیان لە خۆ وریا نەبن و، خاوەنی ئیمان و کردەوەیەکی باش و پاك و پوخت نەبن، هاوسەر بوونیان بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دادیان نادات، خوا دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ﴾، خوا وێنەی هێنایەوە بۆ ئەوانەی بێبڕوا بوون، وێنەکەی بەکێ هێنایەوە؟ بە ئافرەتەکەی نووح و ئافرەتەکەی لووط، جێی سەرنجە کە لێرە خوا ﷻ نەیفەرمووە: (**زَوْجَةَ نُوحٍ وَزَوْجَةَ لوط**)، یان (**زَوجَ نُوحٍ وزوج لوط**) چونکە وشەی (**زَوج**) لە زمانی عەرەبییدا، هەم بۆ ئافرەت بەکاردێ، هەم بۆ پیاو)، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە بارەی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرەوە خوا لێیان ڕازی بێ، کە دوو جاران خوای زاناز شارەزا ئەو وشەیە (**أزواج**)ی بۆ ئەوان بەکارهێناوە، کە دەفەرموێ: ﴿تَبْتَغِى مَرْضَاتَ أَزْوَٰجِكَ﴾، دواییش دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَسَرَّ ٱلنَّبِىُّ إِلَىٰ بَعْضِ أَزْوَٰجِهِۦ حَدِيثًا﴾، چونکە ئافرەت کاتێك بە جووت و هاوسەر (زوج)ی پیاو دادەنرێ، کە هاوکووف و هاوتای بێ، هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی ئیمان و کرداری باشەوە، هاوتای پێغەمبەری خوا ﷺ بوون و لەگەڵی گونجاو بوون، لێی دەوەشانەوەو شایستەی بوون، چونکە جووتی هەر شتێك ئەوەیە کە وەك ئەو بێ، با لە هەموو ڕوویەکیشەوە نەبێ، بەڵام لە چەند لایەنێکی بنەڕەتییدا، وەك ئەو بێ، هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەریش خوا لێیان ڕازی بێ، لە ئیمان و کرداری باش و پابەندیی بە شەریعەتدا، «بۆ ئەوان کەم و زۆر و بە شێوەیەکی ڕێژەیی» هاوکووف و هاوتای پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، بۆیە وشەی (**زَوج**)ی بۆ بەکارهێناون، هەروەها بۆ ئادەمیش: ﴿يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ ...﴿٣٥﴾﴾البقرة، واتە: ئەی ئادەم! خۆت و هاوسەرەکەت، خۆت و جووتەکەت لە باخەکەدا، لە بەهەشتێدا نیشتەجێ

بن، بەڵام لێرە بۆ هەردووك هاوسەرەكەی نووح و لووط (عليهما السلام) «كە ئەوە كەمتر لە تەفسیرەكاندا بینیومە ئاماژەی پێ كرابێ» هەر دەفەرمووێ: ﴿ ٱمۡرَأَتَ نُوحٖ وَٱمۡرَأَتَ لُوطٖ ﴾، واتە: ئافرەتەكەی نووح و ئافرەتەكەی لووط، نەیفەرمووە: (زَوجَ نُوحٍ وَزَوجَ لوط)، واتە: هاوسەری نووح و هاوسەری لووط، چونكە هاوسەرو جووت و هاوتایان نەبوون، بەڵكو لە ڕووی ئیمانەوە لێیان جیابوون و، لە ڕووی كرداری باشەوە لێیان جیابوون، هەروەها كە هاوكاریی مێردەكانیان نەكردوە، لێیان جیا بوون، بۆیە خوای كاربەجێ هەر وشەی ئافرەتی بۆ بەكارهێناون، یانی: بەس ئافرەت بوون و مێینە بوون، بەڵام جووت و هاوكووف و شایستەی هاوسەرەكانیان نەبوون، بەڵام ئێستا لە شەریعەتی ئێمەدا، ئافرەتی كافر هاوكووف نیە بۆ پیاوی بڕوادارو پێی ناشێ، ئەوەش لەو شتانەیە كە جیاوازیی بەرنامەكان (اختلاف الشرائع)، دەیخوازێ، كە خوا دەفەرمووێ: ﴿ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗا ...﴿٤٨﴾ ﴾المائدة، بۆ هەر كامێك لە ئێوە بەرنامەیەك و میتۆدێكمان داناوە، تەنانەت لە شەریعەتی ئیسلامییشدا، تاكو صوڵحی حودەیبییە كە خوای دادگەر ئەو ئایەتەی ناردە خوار لە سووڕەتی (المُمتَحِنَة)دا، كە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تُمۡسِكُواْ بِعِصَمِ ٱلۡكَوَافِرِ ...﴿١٠﴾ ﴾الممتحنة، دەست بە گرێبەستی نیكاحی ئافرەتانی بێبڕواوە مەگرن، پێش ئەوەش خوا دەفەرمووێ: ﴿ لَا هُنَّ حِلّٞ لَّهُمۡ وَلَا هُمۡ يَحِلُّونَ لَهُنَّ...﴿١٠﴾ ﴾الممتحنة، نە ژنە (بڕواداره)كان بۆ مێردە (كافره)كان ڕەوان و، نە ئەوانیش بۆ ژنەكان ڕەوان، هەر بۆیەش عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دوو هاوسەری هەبوون لە مەككە لە گەڵی نەهاتبوون و هەر لە مەككە بەجێ مابوون، هەر هاوسەریشی بوون، ئیدی كە ئەو ئایەتە هاتە خوار، عومەر دەستبەرداری ئەو دوو ژنەی بوو.

﴿ كَانَتَا تَحۡتَ عَبۡدَيۡنِ مِنۡ عِبَادِنَا صَٰلِحَيۡنِ ﴾، ئەو دوو ئافرەتە (هی نووح و لووط عليهما السلام) لە ژێر دوو بەندەی چاك لە بەندەكانماندا بوون، واتە: لە ژێر نیكاحی ئەواندا بوون، لە ژێر سەرپەرشتیی ئەواندا بوون، ﴿ فَخَانَتَاهُمَا ﴾،

کەچی ناپاکییان لەگەڵ کردن، ناپاکیی دینیی، نەك ناپاکیی جینسیی و ڕەوشتیی، چونکە خوا ﷻ پێغەمبەرانی صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، لەوە پاراستوە کە نەسەب و ڕەچەڵەکیان کەم و کووڕیی و عەیب و شوورەیی تێدابێ، ئەو دوو ژنەش، ئەو دوو ئافرەتەش کە هاوسەری نووح و هاوسەری لووط **(عليهما السلام)** بوون، بە پێی عورفی کۆمەڵگای خۆیان شتێکی ناشیرین و شوورەیی نەبووە، کە بێبڕوا بن، بەڵام بێگومان لە عورفی هەموو کۆمەڵگایەکاندا بێ نامووسیی و لادانی جینسیی و زینا کردن، شتێکی عەیبەو شوورەیی بووە، بۆیە خوای تاك و پاك پێغەمبەرانی خۆی لەوە پاراستوە، بەڵام ئەوان شانازییان بەوەوە کردوە، کە لەسەر دینی قەومەکەی خۆیانن و، بڕوایان بە پێغەمبەرانی خۆیان نەهێناوە، کەواتە: ﴿ فَخَانَتَاهُمَا ﴾، واتە: ناپاکییان لەگەڵدا کردوون لە ڕووی ئیمانییەوە، لە ڕووی دینییەوە، لەو ڕووەوە -- وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکانیشدا باس دەکەین - کە قسەی ناشایستیان بە هاوسەرەکانیان گوتوە، بۆ وێنە گوتراوە: خێزانەکەی نووح بە خەڵکی دەگوت: نووح شێت بووە، هەروەها خێزانەکەی **لووط** سیخوڕیی لەسەر مێردەکەی دەکرد، کە ئەگەر میوانیان هاتبانایە کارێکی وای دەکرد، خەڵکەکە پێ بزانن بۆ ئەوەی بێن، نێربازیی لەگەڵ میوانەکانیدا بکەن، خیانەتەکەیان ئەوە بووە، ﴿ فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، ئەو دوو بەندە چاکەی خوا، کە نووح و لووطن صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، لە بەرانبەر خوادا، لە بەرانبەر سزای خوادا، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن، ﴿ وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴾، پێشیان گوترا: لەگەڵ ئەوانەدا کە دەچنە دۆزەخەوە، ئێوەش بچنە نێوی، واتە: بەو دوو ئافرەتانە گوترا: بچنە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

بە نسبەت بێبڕوایانەوە، خوا ئەو دوو ئافرەتەی بە وێنە هێناونەوە، کەواتە: خەڵکینە! دڵی خۆتان بەوە خۆش مەکەن، کە: فڵانکەس خزممە، ئنجا ئەگەر پێغەمبەرێکە صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، ئەگەر زاناو پێشەوایەکە،

ئەگەر بۆ خوا صوڵحاوێکە، بە تەمای خزمایەتیی و ڕەچەڵەك تێمەکەون، ئەوەتا ژنەکەی نووح و ژنەکەی لووط صەڵات و سەلامی خوا لەسەر ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە بێ، ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزەش سوودیان پێ نەگەیاندن، چونکە موخەننەت و ناپاك و نارێك بوون لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا.

ئنجا خوا عزوجل دوو وێنەی دیکە دێنێتەوە بە دوو ئافرەتی دیکە، بۆ بڕواداران: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ ﴾، هەروەها خوا وێنەیەکی هێنایەوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، وێنەی بە کێ هێنایەوە؟ ﴿ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ ﴾، ئافرەتەکەی فیرعەون، ئەویشی دیسان بە هاوسەر (زوج) ناو نەهێناوە، چونکە بە دڵنیایی ژنەکەی فیرعەون کە ئیماندار بووە (ئاسیای کچی موزاحیم) هاوکووفی فیرعەون نەبووە، لەبەر ئەوەی ئەو ئیماندار بووەو فیرعەون کافر بووەو، ئەو ئافرەتە چاکەکار بووەو فیرعەون خراپەکار بووەو، هاوکووفی یەکدی نەبوون، بۆیە خوا ئەویشی بە جووت (زوج) ناو نەهێناوە، چونکە هاوکووف و جووت نەبوون، خوا بۆچی و لە چی دا بە وێنەی هێنایەوە؟ ﴿ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ ﴾، کاتێك گوتی: پەروەردگارم! لەلای خۆت ماڵێکم لە بەهەشتدا بۆ بنیات بنێ، ﴿ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ ﴾، قوتاریشم بکە لە فیرعەون و کردەوەی فیرعەون، لەو هەموو دەستدرێژیی و ستەم و خراپەیەو، لەو سۆغرەو بێگارەی کە بە بەنی ئیسرائیلی دەکرد، لەو هەموو لاف لێدانەی پەروەردگارێتیی و پەرستراوێتیی کە لافی لێدەدا، لەوە بمپارێزە، ﴿ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، لە کۆمەڵی ستەمکارانیش، دەربازم بکە، دارو دەستەی فیرعەون و ئەو کۆمەڵگایە بوون کە فیرعەونیان دەپەرست، کۆیلایەتییان بۆ دەکردو، لەبەر دەستیدا بوون، لەوانەش بمپارێزەو ڕزگارم بکە.

هەروەها خوا وێنەی هێناوەتەوە بە ئافرەتێکی دیکە، ئەویش هەر بۆ بڕواداران: ﴿ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِىٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا ﴾، هەروەها مەریەمی کچی عیمران (خوا بە وێنەی هێنایەوە)، کە داوێنی خۆی پاراست، ﴿ فَنَفَخْنَا

﴿فِيهِ مِن رُّوحِنَا﴾، ئێمەش لە ڕووحی خۆمان فوومان پیدا کرد، (فوومان بە یەخەی کراسەکەیدا کرد)، لە، واتە: ڕووحێك کە بە تایبەتی دروستمان کرد بوو، بەشێوەی فوو لە ڕێی جیبریلەوە عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام بە بەر جەستەی مەریەممان دا کرد، لە یەخەیەوە فووەکەی پێدا کراوە، ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ﴾، (مەریەم) فەرمایشتەکانی پەروەردگاری بە ڕاست دانان، ﴿وَكُتُبِهِۦ﴾، هەروەها کتێب و پەیامەکانی خواشی بەڕاست دانان، ﴿وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ﴾، ئەویش (مەریەم) لە زۆر بۆ خوا ملکەچان و کڕووزاوان بوو، لە ناخەوە (بۆ خوا) لە تەسلیم بووان بوو.

کەواتە: وەك چۆن ئیمانی پیاوە باشەکان ئەگەر پێغەمبەریش بن، سوود ناگەیەنێ بە ئافرەتانی بێ ئیمان، بە هەمان شێوە: کوفری پیاوە خراپەکانیش زیان نادات لە ئافرەتانی خاوەن ئیمانی، وەك ئافرەتەکەی فیرعەون، هەروەها وەك مەریەمی کچی عیمڕان، بە نسبەت ئافرەتی فیرعەونەوە: کوفری فیرعەون و ملهوڕیی فیرعەون و دارو دەستەکەی، زیانی نەبوو بۆی نەبوو، بە هەمان شێوەش بە نسبەت مەریەمی کچی عیمڕانیشەوە: گەلی جوولەکە بوختانیان بۆ کردو، بوختانیان بە کوڕەکەشی دەکرد، کە عیسایە (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) دەیانگوت: بیژوویە، زۆڵە، چونکە بابی نەبوو، دەیانگوت: مەریەم زینای کردوە، ئەو خەڵکە بوختان چییە زیانیان پێ نەگەیاند، ئەوەتا خوا ﷻ ناوی مەریەمی لە هەموو دنیادا بەرز کردەوە، ئەو بوختان و درۆو دەلەسەیەش زیانی پێ نەگەیاند، چونکە مرۆڤ ئەگەر لەزاتی خۆیدا پاك و چاك بوو، لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا کردن و بوختان بۆ کردنی ناحەزانی، زیانی پێ ناگەیەنێ، چ جوولەکەکان، چ ڕۆمانەکان، کە دیارە دواییش عیسا (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) خوای دەرووکەرەوە لە دەستی ئەوان دەربازی کردو، بە کڵاو ڕۆژنەدا بەرزی کردەوەو، بردی بۆ ئاسمان بە ڕووح و جەستەوەو بە زیندوویەتیی، هەرچەندە جوولەکەکان ئێستاش وا دەزانن کە بە دەسیسەی ئەوان و ڕۆمانەکان، عیسایان

لـە سـێداره داوەو، نەصرانییەکانیـش هـەر لێیـان تێکچـوەو، بـەڵام ئـەم ڕاسـتییە لـە قورئانـدا ڕوونکراوەتـەوە، کـە عیسـا علیـه السـلام وەك خـوا لـە سـوورەتی (النسـاء) دا فەرموویـەتی: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ... ﴿١٥٧﴾﴾، نـە کوشـتیان و نـە هەڵیشـیانواسی، بەڵکـو وێنـەی عیسـایان بـۆ برایـە سـەر یەکێـکی دیکـە، یانی: ئەویـان لـە جێـی عیسـا لـە سـێدارەدا، کـە یەهـووزای ئەسـخەریوتییە، یاخـود کەسـێکی دیکـە بـووە، لەوانـەی لەگـەڵ عیسـادا بـوون، ئنجـا چ لەبـەر ئـەوەی خیانـەتی پـێ کـردوە، خـوای دادگـەر بـەو شـێوەیە سـزای داوە، چ وەك لـە هەندێـك ڕیوایەتانـدا هاتـوە -- کـە پێشـتر باسـمان کـرد[1] - فیداکاریـی کردبـێ و بـە عیسـا (عَلَيْـهِ السَّـلام)ی گوتبـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! بـا مـن لـە جیـاتی تـۆ لـە سـێداره بدرێـم و بکوژرێـم و، خـۆی کردبێتـە بـەڵا گێـڕەوەی عیسـا (عَلَيْـهِ السَّـلام).

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الحدید)دا.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**وێنە هێنانەوەی خوا ﷻ بۆ بێبڕوایان کە: پەیوەندیی نیزیکیی و خزمایەتیی، دادیان نادات لە بەرانبەر سزای خواداو، وێنە هێنانەوەی خوا بۆ بێبڕوایان بە هەردوو ژنەکەی نووح و لووط (علیهما السلام) کە لە ئەنجامی پەیمان شکێنییان لەگەڵیاندا، سزابار بوون و مێردەکانیان کە دووان لە هەرە بەندە چاکەکانی خوا بوون، سوودیان پێ نەگەیاندن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ ﴿١٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ﴾، خوا ﷻ وێنەیەکی بۆ ئەوانەی بێبڕوان، هێنایەوە، بە ئافرەتەکەی نووح و ئافرەتەکەی لووط، ﴿ضَرَبَ اللَّهُ﴾، کارو بکەر (**فعل وفاعل**)ن، واتە: خوا هێنایەوە، ﴿مَثَلًا﴾، بەرکاری دووەمەو پێشکەوتوە ﴿لِلَّذِينَ كَفَرُوا﴾، بۆ ئەوانەی بێبڕوا بوون.

﴿امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ﴾، ئەمانە بەرکاری یەکەمن و دواکەوتوون، واتە: (**ضَرَبَ اللهُ امرَأَتَ نُوحٍ وَامرَأَتَ لُوطٍ مَثَلاً لِلَّذِينَ كَفَرُوا**)، بەڵام بۆچی ﴿مَثَلًا﴾، پێشخراوە؟ چونکە ئەوە زیاتر گرنگە، وێنە هێناوە کە گرنگترە، وێنە پێ هێنراوەکەش، هەردوو ژنەکەی نووح و لووط بوون، ئەمەش دەگونجێ بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی بێ، بە تایبەت بۆ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە بەهۆی ئەوەوە لە خۆبایی

نەبن، کە هاوسەری پێغەمبەری کۆتایین (هاوسەری پێغەمبەر موحەممەدن ﷺ) هەروەها بە گشتییش ئامۆژگارییە بۆ ئافرەتان و بۆ پیاوانیش، کە بەهۆی نیزیکیی لە خەڵکی چاکەوە بوغڕا مەبن، لە خۆتان بایی نەبن، دەبێ لە زاتی خۆتاندا باش بن، ئەگەرنا نیزیکییتان لە چاکان دادتان نادات، یەکێك لە زانایان لە بارەی (**ضَربُ المَثَل**)ەوە گوتوویانە: (**ضَربُ المَثَل**) (وێنە هێنانەوە) بریتیە لە وێنە هێنانەوەی حاڵەتێکی سەیر، کە حاڵی شتێکی دیکەی وەك ئەوی لە سەیرییدا پێ دەناسرێ، واتە: لێرەدا خوا ﷻ بۆ حاڵی ئەو بێبڕوایانەو، ئەوە کە هیچکەس سوود بە هیچکەس ناگەیەنێ، ئەو وێنەیەی هێنایەوە، بە هەردوو ژنەکەی نووح و لووط صەڵات و سەلامی خوا لەسەر نووح و لووط بێ.

٢)- ﴿كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ﴾، ئەو دوو ئافرەتە لە ژێر دوو لە بەندە چاکەکانمان دابوون، واتە: لە ژێر نیکاحی ئەواندا و لە ژێر سەرپەرشتیاریی ئەواندا بوون.

٣)- ﴿فَخَانَتَاهُمَا﴾، کەچی ناپاکییان پێ کردن، لەگەڵیاندا موخەننەت بوون، واتە: خیانەت لە ڕووی کوفرو شیرکەوەو، لە ڕووی دژایەتییکردنی هاوسەرەکانیانەوە، (**الطبري**) لە (**ابن عباس**)ەوە، خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: {**ذُكِرَ أَنَّ خِيَانَةَ امْرَأَةِ نُوحٍ زَوْجَهَا، أَنَّهَا كَانَتْ كَافِرَةً، وَكَانَتْ تَقُولُ لِلنَّاسِ: إِنَّهُ مَجْنُونٌ، وَأَنَّ خِيَانَةَ امْرَأَةِ لُوطٍ، أَنَّ لُوطًا كَانَ يُسِرُّ الضَّيْفَ، وَتَدُلُّ عَلَيْهِ**}، (**جامع البيان: ٣٤٥٥٤**)، واتە: باسکراوە: ناپاکیی ژنەکەی نووح لەگەڵ مێردەکەیدا ئەوە بوو کە بێبڕوا بوو، (ئافرەتەکەی بێبڕوا بوو)، بە خەڵکیشی دەگوت: نووح شێتە!، ناپاکیی ژنەکەی **لووطیش** ئەوەبوو، کە **لووط** بە پەنهانیی میوانی دەبردنە ماڵێ، بەڵام ژنەکەی خەڵکی لە میوانەکان ئاگادار دەکردەوە.

ئەو گەلەی لووطیش عادەتیان وابوو هەر کاتێ کەسێکی غەریب و میوان هاتبێتە نێو شارو ئاوەدانییەکەیانەوە، هەوڵیان داوە دەستدرێژیی سێکسیی بکەنە سەر.

٤)- ﴿فَلَمۡ يُغۡنِيَا عَنۡهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا﴾، ئەو دوو (پێغەمبەر)ە (پایە بەرزە نووح و لووط صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ)، لە بەرانبەر (سزای) خوادا هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن.

تەنیا لە سۆنگەی ئەوەوەی ئەو دوو ئافرەتە هاوسەریان بوون، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن.

٥)- ﴿وَقِيلَ ٱدۡخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ﴾، گوتراش: لەگەڵ چووەوە نێوان، ئێوەش بچنە نێو (ئاگرەوە).

ئەوەیان لە باسی قیامەتدا خوای دادگەر هێناویەتە پێش، یاخود باسی قۆناغی بەرزەخە، کە ئێستا ئەوان تێیدان، ئنجا ئەگەر مەبەست قۆناغی بەرزەخ بێ، دوای ئەوەی مردوون، ئەوەیان پێگوتراوە، مرۆڤ کە مرد ڕووحەکەی بۆ بەهەشتە یان دۆزەخە، یاخود هەر باسی قیامەتەو خوای پەنهانزان هێناویەتە پێش، هەڵبەتە زانایان بۆ وێنە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما هەروەها زانایانی دیکەش هەموویان گوتوویانە: (**قَدْ وقَعَ الإجْماعُ عَلى أنَّهُ ما زَنَتِ امْرَأةُ نَبِيٍّ قَطُّ**)، یەکدەنگیی زانایان لەسەر ئەوەیە کە هەرگیز هاوسەری هیچ پێغەمبەرێك داوێنپیسیی و زینای نەکردوە، چونکە ئەوە:

أ- لە لایەکەوە: شتێکی نەنگ و شوورەییە، بۆ کەسایەتیی ئەو پێغەمبەرانە (**علیهم السلام**)، بەپێی عورف و باوی هەموو کۆمەڵگایەکان، بەڵام کوفر شتێکی شوورەیی و عەیبە نەبووە، بەڵکو ئەو کاتە بڕوا هێنان، شتێکی نامۆو غەریب و سەیر بووەو جێی ڕەخنە بووە، بەڵام زیناو داوێنپیسیی، هەمیشە شتێکی شوورەیی و عەیب بووە، خوای پەروەردگاریش پێغەمبەرانی خۆی لە لەکەو پەڵە پاراستوون.

ب- لە لایەکی دیکەشەوە: بێ متمانەیی دەهاتە دی بە وەچە (نَسْل)ی پێغەمبەران!

**مەسەلەی دووەم:**

**وێنــە هێنانــەوەی خــوا بــۆ بــڕواداران، کــە بێبڕوایــی نیزیکانیــان زیانیــان لــێ نــادات:**

**١- بــە هاوســەری فیرعــەون، کــە لــە خــوا پاڕایــەوە، لــە لای خــۆی کۆشــکێکی لــە بەهەشــتدا بــۆ بنیــات بنێ و، لــە فیرعەون و کــردەوەکانی و، کۆمەڵگا ستەمکارەکەی دەربــازی بــکات.**

**٢- بــە مەڕیەمــی کچــی عیمــڕان کــە خــۆی پــاك ڕاگــرت و خــواش ڕووحــی عیســای بــە فووێــك بەبــەردا کــردو، ئافرەتێــکی بــڕوادارو لــە ملکەچــان بــوو بــۆ خــوا.**

خوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴿١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ ﴾، هەروەها خوا وێنەیەکی هێنایەوە بۆ ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بە ئافرەتەکەی فیرعەون، یانی: (**وَضَرَبَ اللهُ امرَأَةَ فِرعَونَ مَثَلاً لِلَّذِينَ أَمَنُوا**)، وەك پێشتریش گوتمان: وشەی (**مَثَلاً**) بەرکاری دووەمی پێشخراو (**مَفعُولٌ بِهِ الثَّانِي المُقَدَّم**)ە، بۆیەش پێشخراوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە زیاتر گرنگەو جێی بایەخەو بناغە خودی وێنەکەیە، بەڵام ئایا وێنەکە بریتی بوو لە کێ؟ لە ئافرەتەکەی فیرعەون، کە خوا ﷻ هەم بۆ ژنەکەی نووح، هەم بۆ ژنەکەی **لووط**، هەم بۆ ژنەکەی فیرعەون، وشەی (**إِمرَأَة**)ی بەکارهێناوە، واتە: ئافرەت و، وشەی هاوسەر (زوج)ی بەکار نەهێناوە، چونکە نە هاوسەری نووح و **لووط** جووت و شایستەو

هاوتای ئەو مێردە پاك و چاكانەیان بوون، كە دووان لە پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوان (علیهما الصلاة و السلام)، دیسان ژنەكەی فیرعەونیش كە ئاسیای كچی موزاحیمە، كە خاوەنی ئیمان و كرداری باش بوو، ئەویش هاوكووفی فیرعەون نەبوو، كە لە بێبڕوایی و خراپەكاریی و ملهوڕییدا ژمارەی پێوانەیی شكاند بوو، مانای ئەم ئایەتە موبارەكەش ئاوایە: خوا حاڵی ژنەكەی فیرعەونی بە وێنە هێنایەوە بۆ حاڵی بڕواداران، تاكو هانیان بدات لە سەر خۆڕاگریی لە فەرمانبەریی و دەست گرتن بە دینەوەو، خۆڕاگریی لە ناڕەحەتیی و سەختییان دا.

ئایا ژنەكەی فیرعەون (ئافرەتەكەی فیرعەون) چی گوت؟:

٢)- ﴿إِذۡ قَالَتۡ رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ﴾، (ئێوەش ئەو حاڵەت و پاڕانەوەیەی بكەن، بە جێی سەر مەشق و تەماشا كردنتان، ئەی ئافرەتەكان!) كاتێ گوتی: پەروەردگارم! بۆم بنیات بنێ لە لای خۆت ماڵێك لە بەهەشتدا، (عِندَكَ) لە لای خۆت، یانی: (بَیْتاً قَرِیباً مِنْكَ)، ماڵێك لە نیزیك خۆتەوە.

ئەمەیان بە چەند واتایەك لێكداوەتەوە:

١- (أَي: قريباً مِن رَحمَتِكَ)، لە نیزیك بەزەیی خۆتەوە.

٢- (قريباً مِنْكَ)، نیزیك لە خۆتەوە، وەك بۆ تۆ شایستەیە.

٣- (فـي مَكَانٍ لا يُتَصَرَّفُ فِيهِ إلاَّ بِإِذْنِكَ)، لە شوێنێكدا كە هیچكەس دەستی نەگەیەنێتێ مەگەر بە مۆڵەتی تۆ.

وەك عـەرەب گوتوویانـە: (الجَـار قبـل الـدَّار)، دراوسـێ بـەر لـە مـاڵ، ئەویـش گوتوویـەتی: ﴿رَبِّ ٱبۡنِ لِي عِندَكَ بَيۡتٗا فِي ٱلۡجَنَّةِ﴾، لـە نیزیـك تـۆ، لـە لای خـۆت، ئنجا بـاسی ماڵـی كـردوەو دوایـی بـاسی بەهەشـتی كـردوە، هەروەهـا لـەو بـارەوە گوتـراوە: (الرَّفِيـق ثُـمَّ الطَّرِيـق)، پێشـێ هـاوەڵ، ئنجا ڕێ، كـێ لەگەڵـی بـە ڕێیـەدا دەڕوات؟

٣)- ﴿ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، دەربازیشم بکە لە فیرعەون و کردارەکەی و، ڕزگاریشم بکە لە کۆمەڵی ستەمکاران، کە **قیبط**ییەکان بوون، خەڵکی میصرٍ بە گشتیی و دارو دەستەی فیرعەون و ئالی فیرعەون (واتە: شوێنکەوتووانی) بە تایبەت، کە لێرە دەفەرموێ: ﴿ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ ﴾، (**أَيِ نَجِّنِي مِنْ ذَاتِهِ وَمَا يُظْهِرُهُ مِنَ الشَّرِّ**)، هەم لە خودی خۆی و، هەم لەو خراپەیەی لێی دەردەچێ، لە ڕێی کردەوەکانیەوە، دەربازو قوتارم بکەو بمپارێزە.

ئەمە وێنەی یەکەم بۆ بڕواداران.

ئنجا خوا وێنەی دووەم دێنێتەوە:

٤)- ﴿ وَمَرْيَمَ ٱبْنَتَ عِمْرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا ﴾، هەروەها (خوا وێنەی هێنایەوە بۆ بڕوداران) بە مەڕیەمی کچی عیمڕان، کە داوێنی خۆی پاراست، واتە: خۆی پاراست لە هەر شتێك کە ناشەرعیی بێ، لە هەر شتێك خوا پێی ناخۆش بێ، وەك پێشتریش گوتمان: ئەم تەعبیرە بۆیە بۆ مەڕیەم بە تایبەت، زۆر بەکارهاتوە، چونکە ئێستاشی لەگەڵدابێ جگە لە مسوڵمانان و نەصرانییەکان، جوولەکەو بێبڕوایەکانی دیکە هەموویان، گومانی خراپ بە مەڕیەم دەبەن، گوایە زینای کردوەو، عیساش لەبەر ئەوەی بابی دیار نیە، گوتوویانە: زۆڵەو بیژوویە و مەڕیەم بەهۆی زیناو داوێنپیسییەوە، ئەو منداڵەی وەسك کەوتوە، هەڵبەتە ئەوان نکووڵیی لەوە دەکەن کە خوا ﷻ بە تایبەت عیسای بەو شێوەیە خوڵقاند بێ.

٥)- ﴿ فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا ﴾، (دوای ئەوەی مەڕیەم خۆی پاك و چاك ڕاگرت)، ئێمەش لەو ڕووحەی خۆمان (کە بە تایبەت خوڵقاندبوومان کە ڕووحی عیسایە)، فوومان پێدا کرد، واتە: جیبریل فووی بە یەخەی کراسەکەیدا کردو، ڕووحی عیسای چووەبەر، یانی: بە یەخەی کراسەکەیدا ڕووحەکەی عیسا چووە نێو منداڵدانی و، مەڕیەم پێی تۆلدار بوو.

٦)- ﴿ وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ ﴾، مەڕیەم فەرمایشتەکانی پەروەردگاری و کتێبەکانی پەروەردگاریشی بە ڕاست دانان.

یەکەم وشە کە مەریەم بەڕاستی دانا، ئەو وشەیە بوو کە عیسای پێ دروست بوو، چونکە خوای پەروەردگار ناوی لە عیسا ناوە (وَكَلِمَةٌ مِنهُ) وشەیەکی پەروەردگار بوو، عیسا بە وشەی ڕاستەوخۆی پەروەردگار دروست بوو، بە فەرمانی تەکوینی ڕاستەوخۆی، نەك مەریەم لەگەڵ پیاوێکدا جووت بووبێ.

٧)- ﴿ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَـٰنِتِينَ ﴾، مەریەمیش لە زۆر بۆ خوا ملکەچان بوو، ﴿ مِنَ ٱلْقَـٰنِتِينَ ﴾، یانی: (القَوْمِ المُطِيعِينَ لِرَبِّهِمْ)، ئەو کۆمەڵ و خەڵکەی زۆر ملکەچن بۆ پەروەردگاریان، ئەویش لەوان بوو، یاخود: (رَهْطُها وعَشِيرَتُها الَّذِينَ كانَتْ مِنهم)، ئەو خزم و قەومەی مەریەمیش یەکێك بوو لەوان، کە بنەماڵەکەی هەموویان هەر لە بابیەوە کە عیمڕانەو، لە دایکیەوە، زۆر ساغ و پاك و پارێزکار بوون.

کۆتایی ئەم دەرسەشمان بەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین:

١- {أَفْضَلُ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ: خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ، وَفَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ، وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَآسِيَةُ بِنْتُ مُزَاحِمٍ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ}، (أخرجه أحمد: ٢٩٠٣، والحاكم: ٣٨٣٦، وقال: صحيح الإسناد، وعبد بن حميد: ٥٩٧، والنسائي في الكبرى: ٨٣٦٤، وأبو يعلى: ٢٧٢٢، وابن حبان: ٧٠١٠، وقال الحافظ في الفتح: إسناده صحيح)، واتە: باشترینی ئافرەتانی بەهەشت خەدیجەی کچی خوەیلیدەو، فاتیمەی کچی موحەممەدەو، مەریەمی کچی عیمڕانەو، ئاسیای کچی موزاحیمە، ئافرەتەکەی فیرعەون.

٢- {كَمُلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ آسِيَةُ امْرَأَةِ فِرْعَوْنَ، وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النسَاءِ، كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ}، (أخرجه البخاري: ٣٤١١، ومسلم: ١٤٨٦)، واتە: زۆر کەس لە پیاوان تێرو تەواو بوون، بەڵام لە ئافرەتان ئەوەی زۆر تێرو تەواو بووبێ، تەنیا ئاسیە ئافرەتەکەی فیرعەون و، مەریەم کچی عیمڕان و، خەدیجەی کچی خوەیلیدەو، چاکیی عائیشەش بەسەر ئافرەتانی دیکەدا، وەك چاکیی و ئیمتیازی تشریب و تێکوشین (الثَّرِيدِ)ە، (کە جۆرێکە لە خواردنی نایاب بە نسبەت عەرەبانەوە)، بەسەر جۆرە خواردنەکانی دیکەدا.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیمان بدات، هەمیشە پیاوە چاکەکان و ئافرەتە چاکەکان، بکەینە سەر مەشق لە ژیانماندا، هەمیشە مشووری ئیمان و کرداری باش بخۆین و، دڵنیابین لەوەی هیچکەس بە مەلەی کەس ناپەڕێتەوە، دڵنیابین لەوی ئەگەر خاوەنی ئیمان و کرداری باش نەبین، هیچ شتێکی دیکەمان بە کەڵک نایەت، بەڵام کەسێ خاوەن ئیمان و کرداری باش بێ، ئەو کاتە لە نیزیکیی چاکانیش بەهرەمەند دەبێ، لە دنیاو لە دوارۆژیشداو، لە تکاو شەفاعەتی پێغەمبەریش ﷺ و زانایان و شەهیدانیش بەهرەمەند دەبێ،

لێرەدا کۆتایی بە ئەم دەرسەمان دێنین و، کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**التحريم**)یش دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢٥)ی ڕەمـەزانی/ سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر: (٢٠٢٠/٥/١٨) ی زاینیـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (المُلْكُ)، سـەرەتاش دێینـە سـەر خسـتنەڕووی پێناسـەو نێوەڕۆکی (سُـورَةُ المُلْكُ)و، لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا، پێناسـەی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە دەکەیـن:

## پێناسەی سووڕەتی (الملک) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە بەلای کەمەوە هەشت (٨) ناوی هەن:

**نـاوی یەکـەم:** نـاوی باوتـری ئـەم سـووڕەتە بریتیـە لـە: (**سُـورَةُ المُلْـك**)، بـەڵام چەنـد ناوێـکی دیکەشـی هـەن، ڕەنگـە لـە هەندێـك شـوێنان، هەندێـك لـەو ناوانـەی باسـیان دەکـەم، باوتریـش بـن لـە نـاوی (**سُـورَةُ المُلْـك**).

**نـاوی دووەم:** یەکێـکی دیکـە لـە نـاوەکانی بریتیـە لـە: ﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ①﴾، کـە ئەمـە ناوێکـە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ ئـەم سـووڕەتەی بەکارهێنـاوە، وەك لـەم دوو دەقـەوە دیـارە:

**١- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {سُورَة من الْقُرْآن مَا هِيَ إِلَّا ثَلَاثُونَ آيَة، خَاصَمَتْ عَنْ صَاحِبِهَا حَتَّى أَدْخَلَتْهُ الْجنَّة، وَهِي سُورَة تبَارك}، (أخرجه الطبراني فـي الأوسط: ٣٦٥٤، والضياء: ١٧٣٨، وقال: إسناده حسن، وأخرجه أيضًا: الطبراني فـي الصغير: ٤٩٠، قال الهيثمي: «ج٧، ص١٢٧»: رجاله رجال الصحيح).**

واتــە: ســوورەتێك لــە قورئانــدا هەیــە، تەنهــا سی (٣٠) ئایەتــە، دەمەقاڵــێ و بەرگریــی کــردوە لــە خاوەنەکــەی، (واتــە: لــە کەســێك ئــەو ســوورەتەی لەبــەر کــردوەو، تێیگەیشــتوەو کاری پێکــردوە)، تاکــو خاوەنەکــەی خســتۆتە بەهەشــت، ئەویــش بریتیــە لــە ســوورەتی: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١﴾.

**٢-** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**مِنَ الْقُرْآنِ سُورَةٌ ثَلاثُونَ آيَةً، شَفَعَتْ لِرَجُلٍ حَتَّى غُفِرَ لَهُ، وَهِيَ: تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ**} (**أخرجه أبو داود: ١٤٠٠، والترمذي: ٢٨٩١، والنسائي: ٦٣٣، وفي الكبرى:، ١٠٥٤٦، ١١٦١٢، وابن ماجه: ٣٧٨٦**).

واتــە: ســوورەتێك لــە قورئانــدا هەیــە، سی (٣٠) ئایەتــە، تــکای کــرد بــۆ پیاوێــك هەتــا لێــی بــوردرا (خــوا لێــی خۆشــبوو)، ئەویــش ســوورەتی: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١﴾ ە .

**ناوی سێیەم:** (**سُورَةُ تَبَارك**).

**ناوی چوارەم:** (**الواقية**)، پارێزەر.

**ناوی پێنجەم:** (**المنجية**)، دەربازکەر.

**ناوی شەشەم:** (**المانعة**)، بەرگریی لێکەر، بەرگرییکار لە خاوەنەکەی.

**ناوی حەوتەم:** (**المجادلة**)، مشتومڕکار لەسەر خاوەنەکەی.

**ناوی هەشتەم:** (**المنّاعة**)، زۆر ڕێگرییکار لە خاوەنەکەی کە سزا بدرێ.

هەڵبەتــە ئــەو هەمــوو ناوانــەش، نیشــانەی زێــدە گرنگیــی و، بایەخــی ئــەم ســوورەتە موبارەکەمــان بــۆ دەردەخــەن.

## دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

بــە یەکدەنگیــی زانایــان ئــەم ســوورەتە مەککەییــە، هەرچەنــدە ڕایــەکی ڕیزپــەڕ گوتوویــەتی: مەدینەییــەو، ڕایــەکی دیکــەش گوتوویــەتی: ســێ ئایــەتی مەدینەییــن، وەك

(**السيوطي**) لـە کتێبـە ناودارەکـەی (**الإتقـان**)دا هێناویـەتی، بـەڵام هیـچ بەڵگەیەکیـان لەسـەر نیـەو، ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە هەموویـان وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك، یەکدییـان بەسـتۆتەوەو، پێدەچـێ هەمووشـی پێکـەوە دابەزیبـێ.

هەڵبەتـە ئـەو سـوورەتانەش کـە چەنـد ئایەتێکیـان لـە مەدینـە دابەزیـون و، چەنـد ئایەتێـك لـە مەککـە، بـۆ وێنـە: سـوورەتی (**المزمـل**)، ئایەتەکانیـان هەمیشـە وەك ئاڵقـەکانی زنجیر یەکـدی دەبەسـتنەوە، بـەڵام قورئانـی مەککەیـی سرووشـتێکی هەیـەو، قورئـانی مەدینەییـش سرووشـتێکی جیـاوازو تایبـەت بـە خـۆی هەیـە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە سـی (٣٠)یـە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـۆ خـۆی فەرموویـەتی: {**مَا هِـيَ إِلاَّ ثَلاَثُـونَ آيَـةً**}، بـەڵام (**أَهْـلُ الحِجَـاز**)، ژمـارەی ئایەتەکانیـان بـە (٣١) دانـاوە، بـۆ ئـەوەش کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: تەنیـا سـی (٣٠) ئایەتـە، گوتوویانـە: لـەو ژمارانـەدا دوو سـێیەك کـەم یـان زیـاد، ناخوێنرێتـەوە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە هاتنە خواردا:

لـە موصحەفـدا ئـەم سـوورەتە موبارەکـە ژمارەکـەی (٦٧)ە، لـە سـوورەتی (**الفاتحـة**)وە، کـە دێـی ئەمـە (٦٧)ەمیـن، سـوورەتە، لـە دابەزینیشـدا (٧٦)ەمیـن، سـوورەتە پێـش (**الحاقـة**)و، دوای سـوورەتی (**المؤمنـون**)، دابەزیـوە.

ڕەنگـە زانـای دیکـەش هەبـێ بڵـێ: لـە پێـش (٧٦)ەوەیـە، یاخـود لـە دوای (٧٦) وەیـە، بـەڵام ئەمـە ڕای جابیـری کـوڕی زەیـدە، کـە زۆر لـە ڕوونکـەرەوانی قورئـان پشـتیان بـە ڕایەکـەی ئـەو بەسـتوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی:

نێـوەڕۆكی ئـەم سـوورەتە، هەمـان نێـوەڕۆكی قورئـانی مەككەییـەو دەتوانیـن بڵێیـن: كـۆی ئـەو سـی (٣٠) ئایەتـە، دەربـارەی دوو بابـەتی هـەرە گـەورەو گرنگـن:

١- بابەتی خواناسیی و، خستنە ڕووی نیشانەكانی پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتیی و خاوەندارێتیی و سیفەت بەرزیی و، بێ وێنەیی خواو، چاكەو نیعمەتەكانی لە ژیانی مرۆڤدا.

٢- ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزای خوا، كە لە بەهەشت و دۆزەخدا، بەرجەستەن و سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان و، ئاكامی خێری بڕواداران.

كـە دوایـی تیشـك دەخەینـە سـەر هەریـەك لـەو دوو بابەتـە، لەمیـانی ڕوونكردنـەوەی واتـاو چەمـكی ئایەتـە موبارەكەكانـدا.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

من دوو تایبەتمەندیی گرنگی ئەم سوورەتەم كەوتوونە بەر چاو:

١- پێم وایە ئەم سوورەتە لە قەبارەی خۆیدا، تاكە سوورەتێكە كە تەنیا باسی خواناسیی و، چاكەو نیشانەكانی خواو، ڕۆژیی دوایی تێدا كراوەو، باسی هیچ كام لە تەنیا پەرستنی خوا (**توحيد الله في عبادته**)و، باسی فریشتەكان و، كتێبەكانی خواو، پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، نەكراوە، جگە لە وشەی (**نذير**)، كە تێیدا هاتوە، یانی: ترسێنەرو وریاكەرەوە، ئەگەرنا باسی ئەوانەی هیچ كام تێدا نەكراوە، بۆیە پێم وایە ئەم سوورەتە تاكە سوورەتێكە تایبەتكراوە، بە باسی خواناسیی و چاكەو نیشانەكانی خواو ڕۆژی دواییەوە.

٢- چەند تەعبیرو وشەیەك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

١- ﴿خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ ﴿٢﴾﴾، خوا مردن و ژیانی هێناونە دی.

٢- ﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ﴿٣﴾﴾، لە دروستکراوی خوای بەبەزەییدا، ناڕێکیی و کەم و کوڕیی نابینی.

٣- ﴿ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ ﴿٤﴾﴾، دوایی دوو جاران چاو بگێڕەوە، کە مەبەست پێی جار لە دوای جارە.

٤- ﴿يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾﴾، چاوت دەگەڕێتەوە بۆ لات بەدەرکراویی و، لە حاڵێکدا کە زۆر ماندوویە، لەبەر ئەوەی هیچی دەستگیر نەبووە، لە دیتنەوەی کەم و کوڕیی لە دروستکراوی خوای بە بەزەییدا.

٥- ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ﴿٨﴾﴾، خەریکە لە داخ و ڕقان پارچە پارچە ببێ و لێك بێتەوە.

٦- ﴿فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾﴾، ئنجا دووریی بۆ هاوەڵانی کڵپەی دۆزەخ.

٧- ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا ﴿١٥﴾﴾، خوا ئەو کەسەیە کە زەوی بۆ ڕام و دەستەمۆ کردوون.

٨- ﴿فَٱمْشُوا۟ فِي مَنَاكِبِهَا ﴿١٥﴾﴾، بەلا شان قەد و پاڵەکان و کەلێن و بۆشاییەکانیدا بڕۆن.

٩- ﴿صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ ﴿١٩﴾﴾، کە باسی باڵندەکان دەکات، واتە: باڵیان ڕێك ڕاگرتووەو دەشیهێننەوە یەك.

١٠- ﴿بَل لَّجُّوا۟ فِي عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾﴾، بەڵکو ئەوان بەردەوام بوون لە سنوور شکاندن و لە سڵەمینەوەدا، یان لە ملهوڕیی و دوورکەوتنەوە لە پەیامی خوادا.

١١- ﴿أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ ﴿٢٢﴾﴾، ئایا کەسێك کە لەپەو ڕوو لەسەر دەم و چاوی دەڕوا، ڕێی ڕاستگرتووترە، یان کەسێك کە بە قیت و قنجیی و بە ڕێك و ڕاستیی دەڕوا؟!.

١٢- ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴿٢٧﴾﴾، کاتێك بینییان، دەم و چاوی ئەوانەی بێبڕوا بوون، خراپ بوو، واتە: تاڵ و ناشیرین بوو، دەم و چاویان تێك چوو و ڕوویان گرژو مۆن و ناهەموار بوو.

**١٣-** ﴿إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا ﴿٣٠﴾﴾، ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو، واتە: ئاوەکەتان بەزەویدا چووە خوارو پەنهان بوو، ون بوو، (**غَـوْرًا**)، چاوگە بە مانای: (**غائراً**) ونبوو.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

شـایانی باسـە: دوای سـەرنجدان و تێوەڕامـانی زۆری ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە، ڕام هاتـە سـەر ئـەوە کـە هەمـووی بکەینـە یـەك دەرس، چونکـە ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـکی مەحکـەم، پێکـەوە پەیوەسـتن و، هەمووشـیان لـە سـوڕگەی ئـەو دوو بابەتـەدا دەسـووڕێنەوەو، ئـەو دوو بابەتـەش ئایەتەکانیـان بەسـەردا دابـەش نەکـراون، نـەك بـۆ وێنـە: بابـەتی یەکەمیـان کـە باسـی خواناسـیی و خسـتنە ڕووی نیشـانەکانی خـواو نیعمەتـەکانی خوایـە، لـە پێشـەوە بـێ و، بابەتەکـەی دیکـە لـە دواوە بـێ، بەڵکـو ئـەو دوو بابەتـە پێکـەوە ئاوێتـە کـراون، بۆیـەش کـۆی ئـەو سی (٣٠) ئایەتـە موبارەکـەی، کـە ئـەم سـوورەتە موبارەکەیان لـێ پێـك دێ، هەموویانمان کردنـە یـەك دەرس.

### ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای گشتیی ئەم سوورەتە لە دە (١٠) برگەدا:

با سـەرەتا ڕوونکردنـەوەی نێـوەڕۆك و واتـای ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە، بکەینـە پێشدەسـتیی چوونـە نێـو تەفسـیرکردن و ڕوونکردنەوەی:

**١-** لە پێنج ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتەدا، ئایەتەکانی: (١ - ٥)، سەرەتا باسی مەزنیی و بەرزیی و بەردەوامیی پیرۆزو بەرەکەتی خوای بێ وێنە، کراوە: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾، ئنجا باسی حیکمەتی هێنانە دی خوا ﷻ بۆ مەرگ و ژیان، کە تاقیکردنەوەی مرۆڤانە، کراوە: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾، دواتر باسی دروستکرانی ئاسمانە حەوت چینەکان و ڕازێنرانەوەی ئاسمانی نیزیکتریان لە ئێمەوە، بە ئەستێران و، نەبوون و نەدیترانی هیچ کەم و کوڕییەك لە دروستکراوی خوادا، کراوە: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ

مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ﴿٤﴾ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ ﴾، ئەمە لە پێنج ئایەتی یەکەمدا.

٢- ئنجا لە شەش ئایەتی دواتردا، ئایەتەکانی: (٦ - ١١)، سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان لە ڕۆژیی دوایی داو، پۆل پۆل خرانیانە نێو دۆزەخی ڕق لێ هەڵساویان و، سەرزەنشتکرانیان کە بۆچی گوێیان بۆ ترسێنەرانی خوا نەگرت، وریاکەرەوانێك کە خوا ناردبوونی ؟ ئنجا دان بە هەڵەو تاوانی خۆدا هێنانیان و، دووریی لە بەزەیی خوا لە بۆ بڕیاردانیان، خراوەتە ڕوو: ﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ﴿٨﴾ قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ ﴿٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ ﴾.

٣- ئنجا لە ئایەتەکانی: (١٢ و ١٣ و ١٤)دا، باسی لێبوردن و پاداشتی گەورەی خوا بۆ خواناسانی دڵ پڕ سام و هەیبەتی خواو، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە بۆ خوای پەنهانزانی شارەزا، چپەو قسەی بەرز یەکسانن، کراوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿١٢﴾ وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾.

٤- ئنجا لە ئایەتی (١٥)دا، ئاماژە کراوە بە ڕام و دەستەمۆ کرانی زەوی و ملپێکەچکرانی بۆ تێدا ژیانی مرۆڤان: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾.

٥- ئنجا لە سێ ئایەتەکانی: (١٦و ١٧و ١٨)دا، باسی هەڕەشە لێکردن و ترس وەبەرنانی بێبڕوایان، بە بەڵای زەمینیی و ئاسمانیی و، سەرنج ڕاکێشانیان بۆ مێژووی گەلانی

فەوتاو، کراوە: ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ١٦ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ١٧ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ١٨ ﴾.

٦- دوایی جارێکی دیکە سەرنجڕاکێشان بۆ دیاردەی فڕینی باڵندان لە ئایەتی (١٩) دا: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ ١٩ ﴾.

٧- ئنجا کردنی سێ پرسیاری سەرزەنشتکارانە لە بێبڕوایەکان، لە بارەی دەستە پاچەیی و بێتواناییان، لە بەرانبەر سزای خواداو، گرتنەوەی بژیوو، یەکسان نەبوونی بابای لەسەر ڕوو و چەنگان ڕۆیشتوو و، بابای بە قیت و قنجیی ڕۆیشتوو، لە ئایەتەکانی: (٢٠و ٢١و ٢٢)دا: ﴿ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ جُندٞ لَّكُمۡ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ إِنِ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِلَّا فِي غُرُورٍ ٢٠ أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي يَرۡزُقُكُمۡ إِنۡ أَمۡسَكَ رِزۡقَهُۥۚ بَل لَّجُّواْ فِي عُتُوّٖ وَنُفُورٍ ٢١ أَفَمَن يَمۡشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجۡهِهِۦٓ أَهۡدَىٰٓ أَمَّن يَمۡشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٢٢ ﴾.

٨- ئنجا جارێکی دیکە سەرنجڕاکێشانی مرۆڤەکان بۆ پێدانی هێزەکانی: بیستن و دیتن و دەرککردن: گوێ و چاوەکان و عەقڵەکان و، دروستکردن و بڵاوکردنەوەیان بە زەویدا، لە ئایەتەکانی: (٢٣و ٢٤)دا: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ٢٣ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٤ ﴾.

٩- وەڵامدانەوەی پرسیارە زۆر دووبارە کراوەکەیان: کەی کاتی زیندوو کرانەوە دێ؟ بەوە کە زانیارییەکەی تەنیا لە لای خوایە ﷻ، ئنجا کت و پڕ هێنانە پێشی دیمەنی هاتنی قیامەت و تێکچوونی ڕووی بێبڕوایان و ڕەش و تڵخ بوونی، لە ئایەتەکانی: (٢٥و ٢٦و ٢٧)دا: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٢٥ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٢٦ فَلَمَّا رَأَوۡهُ زُلۡفَةٗ سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ٢٧ ﴾.

١٠- لە کۆتاییشدا ڕاگەیاندنی سێ ڕاستیی مەزن، لە ئایەتەکانی: (٢٨و ٢٩و ٣٠)دا، کە بریتین لەوەی:

**یەك:** خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: ئایا ئەگەر خوا من و ئەوانەی لەگەڵ مندان، فەوتاندینی و مراندینی، یاخود بەزەیی لەگەڵماندا نواندو سەری خستین، ئایا کێ بێبڕوایان لە سزاو ئازارێکی بە ئێش دەرباز دەکات؟ واتە: خەونی خراپمان پێوە مەبینن، کە سەرمان بە فەتارەت بچێ، چونکە ئەگەر بشڕۆین، ئێوە لە سزا هەر دەرباز نابن!.

**دوو:** خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: ئەو خوای بە بەزەییە ئێمە بڕوامان پێی هێناو پشتمان هەر بەو بەستوە، بە دڵنیایی لەمەودواش زۆر چاك دەزانن، کێ لە گومڕاییەکی ئاشکرا دایە.

**سێ:** لە کۆتاییشدا دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو و بەزەویدا چووە خوار، ئایا بێجگە لەخوا ﷻ کێ توانای ئەوەی هەیە ئاوی شیرین و زوڵاڵ و ڕۆیشتووتان بۆ بێنێ؟!.

## پێناسەی ئەم دەرسە

پێشتریش گوتمان: ئەم دەرسەمان کۆی سی (٣٠) ئایەتەکەی سووڕەتی (الملك) دەگرێتە خۆی و، پێشتریش لە (پێشدەستیی)یەك تارادەیەك تیشکمان خستەسەر نێوەڕۆك و چەمك و واتای سی (٣٠) ئایەتە بە پێزەکەی ئەم سووڕەتە، بۆیە لێرەدا پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴿٤﴾ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۖ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾ وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ ۖ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ

نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَـٰٓفَّـٰتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَـٰنُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنْ هَـٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَـٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَـٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَـٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَـٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَـٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴿٣٠﴾

## ماناى دەقاو دەقى ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. بەرزو بەڕێزو شكۆدارە ئەو كەسەی حوكمڕانیی ڕەهای (دنیاو دواڕۆژی) بەدەستەوە، ئەو لەسەر هەموو شتێك توانایە ﴿١﴾ ئەو كەسەی مردن و ژیانی هێناونە دی، تاكو تاقیتان بكاتەوە كامەتان كردەوەی چاكترە، ئەو زاڵی لێبوردەیە ﴿٢﴾ ئەو كەسەی حەوت ئاسمانی چین چینی دروستكردوون، لە دروستكراوی (خوای) بە بەزەیی دا، ناڕێكیی نابینی، چاو بگێڕە ئایا هیچ درزو كەلێنان دەبینی؟ ﴿٣﴾ دوایی جار لە دوای جار چاو بگێڕە (و ئاسمانان بپشكنە، بۆ دۆزینەوەی ناڕێكیی)، سەرەنجام چاوت بە دەركراویی دەگەڕێتەوە لات (بێ ئەوەی هیچی دەستگیر ببێ)، لە حاڵێكدا شەكەت بووە ﴿٤﴾ بە دڵنیاییش ئاسمانی نزیكتر (لە زەوی)

مـان بـه چرایـان ڕازاندۆتـه‌وه‌و، بـۆ بڵێسـه بـارانی شـه‌یتانه‌كانیش (لـه پارچـه‌كان) و (وێـڕای ئـه‌وه‌ش) ئـازاری بڵێسه‌داریشـمان بـۆ دانـاون (لـه ڕۆژی دوایـی دا) ﴿٥﴾ بـۆ ئه‌وانـه‌ش كـه بـه په‌روه‌ردگاریـان بێبـڕوان، ئـازاری دۆزه‌خ هه‌یـه‌و، خراپتریـن سه‌ره‌نجامیشـه ﴿٦﴾ كاتێـك تێیفـڕێ ده‌درێـن بـه كوڵیـن و قوڵـپ دانـه‌وه گرفـه‌و لرفـه‌ی ده‌بیسـتن ﴿٧﴾ نیزیكـه لـه په‌سـتییان بپچـڕێ (و پارچـه پارچـه ببـێ)، هـه‌ر كات كۆمه‌ڵێـك (لـه بێبڕوایـان)ی فڕێدرانـه نێـو، (فریشـته) دۆزه‌خه‌وانـه‌كان لێیـان پرسـین: ئایـا ترسـێنه‌رو ورياكه‌ره‌وه‌تـان بـۆ نه‌هـات؟ ﴿٨﴾ گوتیـان: بـا، بێگومـان ترسـێنه‌رو ئاگاداركه‌ره‌وه‌مـان بـۆ هـات، كه‌چـی به‌درۆمـان دانـاو گوتمـان: خـوا هیـچ شـتێكی دانه‌به‌زانـدوه‌و، ئێـوه جگـه لـه گومڕاییـه‌كی گـه‌وره، لـه هیـچ شـتێكی دیكـه‌دا نیـن ﴿٩﴾ (بێبـڕوا دۆزه‌خییـه‌كان) گوتیشـیان: ئه‌گـه‌ر (كاتی خـۆی) ئێمـه بیسـتبامان یـان فامیبامـان (ئێسـتا) لـه نێـو هـاوه‌ڵانی كڵپـه (ی ئاگـری دۆزه‌خ)دا نه‌ده‌بووین ﴿١٠﴾ دانیـان بـه گوناهیـان داهێنـا، ئنجـا دووریـی (لـه به‌زه‌یـی خـوا) بـۆ هـاوه‌ڵانی كڵپـه (ی ئاگـری دۆزه‌خ) ﴿١١﴾ مسـۆگه‌ر ئه‌وانـه‌ی بـه په‌نهانیـی سـام لـه په‌روه‌ردگاریـان ده‌كـه‌ن، لێبوردنێـك (ی نـاوازه)و پاداشـتێكی گه‌وره‌یـان هه‌یـه ﴿١٢﴾ قسـه‌تان په‌نهـان بكـه‌ن یـان ئاشـكرای بكـه‌ن (یه‌كسـانه)، چونكـه بێگومـان ئـه‌و (خـوا) بـه (نیـازو خولیایـه‌كانی) هاوه‌ڵـی سـینه‌كان زانایـه ﴿١٣﴾ ئایـا ئـه‌و كه‌سـه‌ی (مرۆڤـی هێناوه‌تـه دی و) دروسـتیكردوه (هه‌مـوو شـتێكی لـه بـاره‌وه) نازانـێ ﴿١٤﴾ لـه حاڵێكـدا ئـه‌و په‌نهانـزانی شاره‌زاشـه؟ ﴿١٥﴾ (خـوا) ئـه‌و كه‌سـه‌یه زه‌وی بـۆ ده‌سـته‌مۆ كـردوون، ئنجـا بـه قـه‌د پـاڵ و لاشـانه‌كانی دا بـڕۆن و لـه بژیـوی، وی بخـۆن و (دوای زینـدوو كرانـه‌وه‌ش) بڵاوكرانـه‌وه ته‌نیـا بـۆ لای ویـه ﴿١٦﴾ ئایـا لـه‌و (خوایـ)ه‌ی لـه ئاسـمانه دڵنیـان كـه بـه زه‌ویتانـدا ڕۆچوێنـێ، ئنجـا یه‌كسـه‌ر (زه‌وی) گێـژ بخـوات؟ یـان ئایـا لـه‌و كه‌سـه‌ی لـه ئاسـمانه دڵنیابـوون كـه (بایـه‌كی) چـه‌و ڕاماڵتـان بنێرێتـه سـه‌ر؟ ئنجـا چـاك ده‌زانـن (ئاكامـی) ترسـاندنم چۆنـه! ﴿١٧﴾ بـه دڵنیاییـش ئه‌وانـه‌ی پێـش وانیـش به‌درۆیـان دانـا (په‌یامـی خـوا)، ئنجـا ئایـا (سـزادان و) نكووڵییكردنـم (لـه

بەدرۆ دانانیان) چۆن بوو؟ ﴿١٨﴾ ئایا تەماشای باڵندان (مەلان)یان نەکردوە، لە سەرووویانەوە پانڕاخەرن (بۆ باڵەکانیان)و وێکیان دەهێننەوە (باڵەکانیان لێك دەدەن) و جگە لە (خوای) بە بەزەیی (بە هەواوە) نایانگرێ! بێگومان ئەو بینەری هەموو شتێکە ﴿١٩﴾ یان ئایا کێیە ئەو کەسەی سوپاتانە، جگە لە (خوای) بە بەزەیی، سەرتان دەخات! بێبڕوایان تەنیا لە لە خۆبایی بوون دان ﴿٢٠﴾ یان ئایا ئەو کەسە کێیە، ئەگەر ئەو (خوا) بژیوەکەی بگرێتەوە، بژیوتان دەدات! بەڵکو (بێبڕوایان) لەسەرکێشیی و سڵەمینەوەدا سەرەخەرییان کرد ﴿٢١﴾ ئایا کەسێك کە لەسەر رووی سەر بەرەو خوار دەڕوات، ڕاسترۆترە، یان کەسێك کە بە قیت و قنجیی بەڕێیەکی ڕاست دا دەڕوات؟ ﴿٢٢﴾ بڵێ (خوا) ئەو کەسەیە ئێوەی پێکەیاندوەو، بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانی بۆ ڕەخساندوون، بە کەمیی سوپاسگوزاریی بۆ خوا دەکەن ﴿٢٣﴾ بڵێ (خوا) ئەو کەسەیە ئێوەی بە زەویدا بڵاوکردۆتەوەو، بەس بۆ لای ویش کۆدەکرێنەوە ﴿٢٤﴾ (بێبڕوایەکان) دەشڵێن: (هاتنە دی) ئەو بەڵێنە (بەڵێنی زیندووکرانەوە) کەیە، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟ ﴿٢٥﴾ بڵێ: زانیاریی (ئەو بەڵێنە) تەنیا لە لای خوایەو، من تەنیا ترسێنەرێکی ئاشکرام ﴿٢٦﴾ ئنجا (کاتێك بەڵێنەکە هات و) لە نیزیکەوە دیتیان ئەوانەی بێبڕوا بوون، ڕوویان خراپ (و گرژ) بوو و (پێیان) گوترا: ئەمە بوو کە کاتی خۆی ئێوە داواتان دەکرد (و پەلەتان بوو بێ) ﴿٢٧﴾ بڵێ: ئایا پێم بڵێن: ئەگەر خوا خۆم و ئەوانەی لەگەڵمدان، فەوتاندینی یان بەزەیی پێمان دا هات، ئایا کێ بێبڕوایان لە ئازارێکی بە ئێش ڕزگار دەکات؟ ﴿٢٨﴾ بڵێ: ئەو (خوا) بە بەزەییەو بڕوامان پێی هێناو، پشتمان تەنیا بەو بەستوەو، ئێوەش لەمەودوا دەزانن کێیە ئەو کەسەی لە گومڕاییەکی ڕوون دایە! ﴿٢٩﴾ بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو (بە زەویدا)، ئایا کێ ئاوێکی ڕەوانتان بۆ دێنێ؟ ﴿٣٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تَبَٰرَكَ): (أَصْلُ البَرْكِ: صَدْرُ البَعِيْرِ، بَرَكَ البَعِيْرُ: أَلْقَى بَرْكَهُ، وَاعْتُبِرَ مِنْهُ مَعْنَى اللُّزُوم، وَالبَرَكَةُ: ثُبُوتُ الخَيْرِ الإلَهِيِّ فِي الشَّيء، وَتَبَارَكَ: تَنْبِيهٌ عَلَى مَا يُفِيضُهُ عَلَيْنَا مِنْ نِعَمِهِ)، (تَبَارَكَ)، لە (بَرْك)ەوە هاتوە، (بَرْك)یش، بە سینگی حوشتر دەگوترێ، چونکە حوشتر کە یەخ دەبێ، پێشێ سینگی دادەدات، (أَلْقَى بَرْكَهُ)، واتە: سینگی دادا، ئنجا لەبەر ئەوەی حوشتر کاتێك یەخ دەبێ، سینگی دەنێتە سەر زەوی و، بەوێوە دەچەسپێ و دەمێنێتەوە، لەوەوە مانای پەیوەست بوون وەرگیراوە، (البَرَكَةُ): بریتیە لە چەسپانی خێرو چاکەی خوایی لە شتێکدا، کە دەفەرموێ: (تَبَارَكَ): ئەمە ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەو چاکەو نیعمەتە مادديی و مەعنەوییانەی خوا بەسەرمانیان دا دەڕێژێ.

(طِبَاقًا): (المُطَابَقَةُ: أَنْ تَجْعَلَ شَيئاً فَوْقَ آخَرَ بِقَدَرِهِ، طِبَاقاً: بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْض)، (مُطَابَقَة): ئەوەیە شتێك لەسەر شتێك دابنێی بە ئەندازەی خۆی، (طِبَاقاً)، واتە: هەندێکی لەسەر هەندێك، چین لەسەر چین.

(تَفَٰوُتٍ): (التَّفَاوُتُ: الإخْتِلَافُ فِي الأَوْصَافِ: ﴿مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ﴾، أَي: لَيْسَ فِيهَا مَا يَخْرُجُ عَنْ مُقْتَضَى الحِكْمَةِ)، وشەی (تَفَاوُت): بە مانای جیاوازییە لە وەسفەکاندا، کە دەفەرموێ: ﴿مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ﴾، لە دروستکراوی (خوای) بەبەزەییدا، تەفاوت نابینی، یانی: شتێك نابینی کە لە حیکمەت بچێتە دەر، واتە: ناڕێکیی نابینی و، بێ یاسایی و بێ سیستمیی نابینی.

(فُطُورٍ): (أَصْلُ الفَطْرِ: الشَّقُّ طُولاً)، (فُطُور): بریتیە لەوەی شتێك بە باری درێژییدا بقلّیشێنی، قلّیشاندن، (فُطُورٍ: لا خِتِلَالُ وَالوَهِيُ فِيْه)، (فُطُور): بریتیە لە ناڕێکیی و بێ هێزیی لە شتێکدا.

(كَرَّتَيْنِ): (الكَـرُّ: العَطْـفُ عَـلَى الـشَّيءِ بِالـذَّاتِ أو بِالفِعْـلِ، وَجَمْعُـهُ كُـرُوْر)، (كَـرّ): بریتیـە لـە گەڕانـەوەو بادانـەوە بـۆ شـتێك، بـە خـود، یـان بـە كـردار، واتـە: خـودی ئـەو شـتە بگێڕدرێتـەوە بـۆ ئـەوێ، یاخـود كردەوەكـەی بگێڕدرێتـەوە (كَـرّ)، بـە (كُـرُوْر)، كـۆ دەكرێتـەوە.

(خَاسِئًا): (خَسَأَ البَـصَرُ: انْقَبَـضَ عَـن مَهَانَـةٍ)، (خَسَـأَ البَـصَرُ)، چاوەكـە هاتـەوە یـەك، بـە زەبوونیـی، بـە هیـچ لـە دەسـت نەهاتوویـی.

(حَسِيرٌ): (الحَـسْرُ: كَشْـفُ المَلْبَـسِ عَـمَّا عَلَيْـهِ، وَالحَـاسِرُ وَالمَحْسُـورُ: المَعْيَـا لانْكِشَـافِ قِـوَاهُ، وَحَـاسِر: حَـسَر بِنَفْسِـه قِـوَاهُ، وَمَحْسُـوْر: التَّعَـبُ حَـسَرَهُ)، (حَـسْر): بریتیـە لـە لابـردنی پۆشـاكێك لەسـەر ئـەوەی دایپۆشـیوە، (بـۆ وێنـە: (حَـسَرَ عَـن ذِرَاعِـهِ)، واتـە: قۆڵـی هەڵماڵیـی، پۆشـاكەكەی لەسـەر باسـكی لادا، (حَـاسِر وَمَحْسُـور)، هەردووكیـان بـە مانـای مانـدوو بـوون و مانـدوو بـوو، دێـن، لەبـەر ئـەوەی بابـای مانـدوو بـوو هێـزەكانی نەمـاون، (حَـاسِر)، كەسـێكە خـۆی هێـزەكانی خـۆی نەهێشـتبین و خـۆی مانـدوو كردبـێ، بـەڵام (مَحْسُـور)، كەسـێكە، ماندووبـوون هێـزی نەهێشـتبێ.

(بِمَصَابِيحَ): (مَصَابِيـحْ: جَمْـعُ مِصْبَـاح، وَهُـوَ الـسِّرَاجُ، وَالمِصْبَـاحُ: مَقَـرُّ الـسِّرَاجِ، وَالمَصَابِيْـحُ: أعْـلَامُ الكَوَاكِـبِ)، (مَصَابِيـح)، كـۆی (مِصْبَـاح)ە، بـە مانـای چـرا، (مِصْبَـاح)، بریتیـە لـە نشـینگەی چرایەكـە، واتـە: ئـەو شـۆقەی هەیـە، (مَصَابِيـحْ)، بـە ئەسـتێرە ناودارەكانیـش دەگوتـرێ.

(رُجُومًا): (جَمْـعُ رَجَـم: مَـا يُرْجَـمُ بِـه مِـنْ حِجَـارَة وَغَيْرِهَـا)، (رُجُـوْم)، كـۆی (رَجَـم)ە، یـانی: پێـدادراو، دەشـگونجێ كـۆی (رَجْـم) بـێ، واتـە: پێـدادان یـانی: چـاوگ بـێ، شـتێك كـە بـە شـتێك دادەدرێ، لـە بـەردو جگـە لـە بەردیـش، كـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی ئـەو پارچـە نەیـزەك و بڵێسـانەن، كـە لـە ئەسـتێرەو خڕۆكـەكان جیادەبنـەوە.

(ٱلسَّعِيرِ): (النَّار، لَهَبُ النَّار، خَبَا سَعِيْرُ النَّـار)، (سَعِيْر)، بـه مانـای ئاگـر دێ و، بـه مانـای بڵێسـەی ئاگریـش دێ، دەگوتـرێ: (خَبَا سَعِيْر النَّار)، بڵێسـەی ئاگرەکـە خەفـە بـوو، یاخـود کوژایـەوە.

(شَهِيقًا): (الشَّهِيْق: جَـذْبُ الهَـوَاءِ إلى الصَّـدْرِ، وَتَـرَدُّد النَّفَـسِ بِحَيْـثُ يُسْـمَعُ، والصَّوْتُ الشَّـدِيْد)، (شَـهِيْق): بـه چەنـد واتایـەك هاتـوە، یەکـەم: هـەوا خسـتنە نێـو سـییەکان، پێچەوانـەی (زَفِـيْر)، کـە بریتیـە لـە هـەوا دەرکـردن لـە سـییەکان، کەواتـە: (شَـهِيْق): هەناسـە هەڵمژینـە، بـەڵام (زَفِـيْر): هەناسـە دانەوەیـە، هەروەهـا (شَـهِيْق): بـه مانـای هەناسـەدانێك دێ کـە بناسرێ و، بـه مانـای دەنگێـکی بەهێزیـش دێ.

(تَفُورُ): دەکوڵـێ، یاخـود بـه قوڵـپ دێتـە دەرێ، (فَـارَ الـمَـاءُ يَفُـوْرُ فَـوْرَاً وَفَوَرَانَـاً: خَـرَجَ مِـنَ الأَرْضِ وَجَـرَى مُتَدَفِّقَـاً فَهُـوَ فَـوَّار)، ئاوەکـە دەرچـوو، دەردەچـێ، دەرچوون، (فَـوْرَاً وَفَوَرَانَـاً)، هەردووکیـان چاوگـن، ئاوەکـە لـەزەوی دەرچـوو و ڕۆیشـت بـە هەڵقوڵینـەوە، (فَـوَّار)، دەرقوڵیـوو بەهێـز.

(تَمَيَّزُ): بـە: (تَمَّيـزُ) و (تَمَايَـزُ)ش، خوێنراوەتـەوە، (تَقَطَّـع)، خەریکـە لێـك ببێتـەوەو بپچڕێ.

(ٱلْغَيْظِ ): (الغَيْظُ: شِدَّةُ الغَضَب)، (غَيْظ): بریتیە لە تووڕەیی توند و سەخت.

(فَسُحْقًا ): دووریـی، (السَّـحْقُ: تَفْتِيْـتُ الـشَّيء)، (سَـحْق): بریتیـە لـە هاڕینـی شـتێك و پارچـە پارچـە کـردنی، دەگوتـرێ: (أَسْـحَقَهُ اللـهُ: أي: جَعَلَـهُ سَـحِيْقَاً وَسَـحَقَهُ: جَعَلَـهُ مُفَتَّـةً)، (أَسْـحَقَهُ اللـهُ)، واتـە: خـوا بیـکات بـە (سَـحِيْق)، (سَـحِيْق)یش، واتـە: هـاڕدراو، یاخـود دوورخـراوە.

(ذَلُولًا ): (ذَلُـولًا: مِـنَ الـذِّل، ذَلُـوْل: لَيْـسَ بِصَعْبَـةٍ)، (ذِلّ) هەیـەو (ذُلّ) هەیـە، (ذُلّ)، واتـە: بـێ دەسـتەڵاتیی و داماویـی و گەردنکەچیـی، بـەڵام (ذِلّ)، بـۆ ئـاژەڵ بـەکاردێ واتـە: دەسـتە مۆیـی، (ذَلُـولًا)، واتـە: ئاژەڵێـکی دەسـتەمۆ، کـە دەفەرمـوێ: خـوا زەوی

(ذَلُول) كـردوە، واتـە: وەك چـۆن ئاژەڵێـك چەمـووش نیـە و بـە لـە باریـی پشـت دەباتـە ژێـر بـارو، بـار دەكـرێ، یاخـود خاوەنەكـەی سـواریی دەبـێ و دەچێتـە سـەر پشـتی، زەوییـش بەهەمـان شـێوەیە.

(مَنَاكِبِهَا): (المَنَاكِبُ: جَمْـعُ مَنْكِـب، مُجْتَمَـعُ مَـا بَـيْنَ العَضُـدِ وَالكَتِـفِ)، (مَنَاكِـب)، كـۆی (مَنْكِـب)ە، (مَنْكِب)یـش، ئـەو شـوێنەیە كـە قۆڵ و شـان پێكـەوە دەبەسـتێتەوە، باسـك و شـان، كەواتـە: (فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا)، یـانی: بـەلا شـانەكانی زەویـدا بـڕۆن.

(يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ): واتـە: بـە زەویتانـدا بەرێتـە خـوار، یـان زەویتـان لـە ژێـردا ڕۆبچوێنـێ، (خَسَـفَهُ اللـهُ وَخَسَـفَ هُـوَ، أَي: ذَهَـبَ وَغَـابَ)، (خَسَـفَهُ اللـه)، واتـە: خـوا بەزەویـدا بردیـە خـوار، بـەڵام (خَسَـفَ هُـوَ)، خـۆی بەزەویـدا چـووە خـوار، كەواتـە: (خَسَـفَ)، هـەم بـە (لازم) هاتـوە، هـەم بـە (متعدِّي)، (خَسَـفَهُ اللـه)، بـەركار خـوازە، خـوا بـە زەوی دا بردیـە خـوار، بـەڵام (خَسَـفَ هُـوَ)، ئەمـە (لازم)ە، واتـە: بـەركاری نـاوێ، خـۆی بەزەویـدا چـووە خـوار (أَي: ذَهَـبَ وَغَـاب)، واتـە: ڕۆیشـت و ون بـوو.

(تَمُورُ): (المَـوْرُ: الجَرَيـان السَّرِيـعُ، وَالمَـوْرُ: الـتُّرَابُ المُـتَرَدِّدُ بِـهِ الرِّيْـحُ، وَنَاقَـةٌ تَمُـوْرُ فِي سَـيْرِهَا فَهِـيَ مَـوَّارَةٌ)، (مَـوْر): بـە ڕۆیشـتنی خێـرا دەگوتـرێ، هەروەهـا (مَـوْر): بـەو گڵـە دەگوتـرێ كـە بـا دەیهێنـێ و دەیبـا، دەگوتـرێ: (وَنَاقَـةٌ تَمُـوْرُ فِي سَـيْرِهَا فَهِـيَ مَـوَّارَةٌ)، حوشـترێك كـە لـە ڕۆیشـتنەكەیدا بێـت و بچـێ و بسـووڕێتەوە، (فَهِـيَ مَـوَّارَةٌ)، ئـەو زۆر دەسـووڕێتەوە، یاخـود زۆر دێـت و دەچـێ.

(حَاصِبٗا): (الحَاصِـبُ: مَـكَانٌ حَاصِـب: أَي ذُو حَصْبَـاء، وَالحَاصِـب: الرِّيْـحُ الشَّـدِيْدة تَحْمِـلُ الـتُّرَاب وَالحَصْبَـاء)، دەگوتـرێ: (مَـكَانٌ حَاصِـب)، واتـە: (حَصْبَـاء)ی، لێیـە (حَصْبَاء)یـش، واتـە: چـەو و وردە بـەرد، هەروەهـا (حَاصِـب)، بـە مانـای بایـەكی بەهێزیـش دێ، كـە گڵ و چـەو لەگـەڵ خـۆی ڕادەماڵـێ.

(نَذِيرِ): (إِنْـذَار، مُنْـذِر)، (نَذِيْـر)، هـەم بـە مانـای ترسـاندن دێ، بـە چـاوگ، هـەم بـە مانـای (مُنْذِر)یـش دێ واتـە: ترسـێنەرو ئاگاداركـەرەوە.

(نَكِيرِ): (إنْكَار)، (نَكِيْر)، بە مانای نكوولّییلێكردن و، بە مانای سزایەك دێ ببێتە هۆی ئەوەی ئەو كەسەی سزا دەدرێ، بگەڕێتەوە لەو خراپەیەی دەیكات.

(صَٰٓفَّٰتٍ): (صَفَّ الطَّيْرُ فِي السَّمَاءِ: بَسَطَتْ أَجْنِحَتَهَا فِي طَيَرَانِهَا فَلَمْ تُحَرِّكْهَا)، (صَافَّات)، واتە: باڵی خۆیان پانڕاخستوە، چونكە (صَفَّ الطَّيْرُ فِي السَّمَاءِ)، واتە: باڵندەكان باڵەكانیان لە ئاسمان پان ڕاخستوەو نەیانجووڵاندوە، باڵندە كە دەفڕێ دوو حاڵەتی هەن: یان باڵەكانی لێك دەدات، ئەگەر بیەوێ بەرز بێتەوە، یان بە خێرایی بڕوات، جاری واشە باڵەكانی ڕێك دەكات و، ڕادەگرێ و بە هەواوە دەوەستێ، ئنجا ئەوە پێی دەگوترێ: (صَافَّات)، واتە: باڵندەكان باڵیان پانڕاخستوەو ڕاوەستاون.

(وَيَقۡبِضۡنَ): (أي: يُضَيِّقْنَ، يَضُمْنَ)، (يَقْبِضْنَ أي: يُضَيِّقْن)، واتە: باڵەكانیان تەنگ دەكەنەوەو دێننەوە یەك، (قَبَضَهُ أي: ضَيَّقَهُ، وَبَسَطَهُ أي: وَسَّعَهُ)، (قَبَضَهُ)، تەنگی كردەوە (بَسَطَهُ)، فراوانی كرد، (يَقْبِضْنَ)، واتە: باڵەكانیان دێننەوە یەك، ئنجا بۆیە خوا ﷻ بە كۆ هێناویەتی چونكە بۆ كۆی باڵندەكانە.

(غُرُورٍ): (غَرَّ يَغُرُّ غَرَارَةً وَغِرَّةً: جَهِلَ الأُمُورَ، وَغَفَلَ عَنْهَا فَهُوَ غِرٌّ، وَغَرَّ فُلَانَاً يَغُرُّ غَرَّاً وَغُرُوْرَاً: خَدَعَهُ وَأَطْمَعَهُ بَالْبَاطِل)، (غُرور)، واتە: لە خۆبایی بوون یان هەڵخەڵەتان، دەگوترێ: (غَرَّ يَغُرُّ غَرَارَةً وَغِرَّةً)، واتە: هەڵخەڵەتاو فریوی خوارد (جَهِلَ الأُمُورَ وَغَفَلَ عَنْهَا)، ئاگاداری كارەكان نەبوو و لێیان بێئاگا بوو، (فَهُوَ غِرٌّ)، ئەو هەڵخەڵەتاوە، فریو خواردوویە، (غَرَّ فُلَانَاً يَغُرُّ غَرَّاً وَغُرُوْرَاً)، واتە: فڵانەكەسی هەڵخەڵەتاندو فێڵی لێكردو بەشتێكی پووچ ئومێدەواری كرد، كە بوونی نیە.

(لَّجُّواْ): (لَجَّ فِي الأَمْرِ يَلِجُّ لَجَاجَاً وَلَجَاجَةً، أي: لَازَمَهُ وأَبَى أَنْ يَنْصَرِفَ عَنْهُ)، (لَجَّ فِي الأَمْرِ)، واتە: مكووڕ بوو لەسەر كارەكە، (يَلِجُّ لَجَاجَاً وَلَجَاجَةً)، هەم (لَجَاجَاً)، هەم (لَجَاجَة)، هەردووكیان چاوگن واتە: پێیەوە پەیوەست بوو، ئامادە نەبوو دەستی لێ هەڵبگرێ.

(عُتُوٍّ): (عَتَى يَعْتُوا عُتُوّاً وَعِتِيّاً: عَتَى أي: اسْتَكْبَرَ وَجَاوَزَ الحَدَّ)، واتە: خۆی بە زلگرت و لە سنوور دەرچوو، (فَهُوَ عَاتٍ)، ئەو لە سنوور دەرچووی خۆ بە زلگرە، (والجَمْعُ عُتَاة)، بە (عُتَاة)، کۆ دەکرێتەوە، واتە: لە سنوور دەرچووان.

کەواتە: (عَتَى يَعْتُوا عُتُوّاً وَعِتِيّاً)، واتە: لە سنوور دەرچوو، یان خۆی بە زلگرت، بە لە سنوور دەرچوون و خۆ بە زلگرتن و، بکەرەکەی (عَاتٍ)یە، کە کە بە (عُتَاة)، واتە: لە سنوور دەرچووان، یان خۆ بە زلگران، یان سنوور شکێنان، کۆ دەکرێتەوە.

(وَنُفُورٍ): (نَفَرَ مِنَ الشَّيءِ نُفُوراً وَنِيْفَاراً: فَزِعَ وْانْقَبَضَ غَيْرَ رَاضٍ عَنْهُ)، (نَفَرَ مِنَ الشَّيءِ نُفُوراً وَنِيْفَاراً)، واتە: لە شتەکە سڵەمیەوەو لێی دوورکەوتەوە، واتە: لێی داچڵەکیی و خۆی لێ دوورگرت و لێی ڕازیی نەبوو.

(مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ): واتە: لەسەر دەم و چاوی، لەپەوڕوو کەوتوە، (أَكَبَّ عَلَى الشَّيءِ: أَقْبَلَ عَلَيْهِ وُشُغِلَ بِهِ)، (أَكَبَّ عَلَى الشَّيءِ)، واتە: سەرقاڵی ئەو شتە بووە و ڕووی تێکرد، بەڵام (أَكَبَّ عَلَى وَجْهِهِ: انْقَلَبَ)، واتە: بەسەر دەم و چاویدا هەڵگەڕایەوە، (إنْكَبَّ)، دیسان ئەویش بە مانای کەوتن بەسەر دەم و چاودا، یاخود هەڵگەڕانەوە لە سەر دەم و چاو و بە پشتەوەدا، بۆ هەردووکیان بەکاردێ.

(سَوِيًّا): (السَّوِيُّ: المُسْتَوِي المُعْتَدِل، لاَ إِفْرَاطَ فِيْهِ وَلا تَفْرِيْط)، (سَوِيٌّ) و (مُسْتَوِي)، واتە: هاوسەنگ، کە نە زێدەڕۆیی تێدابێ نە کەمتەرخەمیی.

(ذَرَأَكُمْ): (أي: خَلَقَكَمْ، أو كَثَّرَكُمْ أو نَشَرَكُمْ)، (ذَرَأَ)، بە سێ واتایان هاتوە:

أ- ئێوەی وەدیهێناوە.

ب- یاخود ئێوەی زۆر کردوە.

ج- ئێوەی بڵاوکردۆتەوە.

(زُلۡفَةٗ): (الزُّلْـفُ: القُرْبَـةُ، وَالمَنْزِلَـةُ، وَالزُّلْفَـى: القُـرْبَى وَالمَنْزِلَـة)، (زُلْـف وَزُلْفَـى)، هەردووكيـان بـە مانـای نزيكيـی و پێگـەی نيزيـك دێـن.

(سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ): ئەوانـەی بێبـڕوان دەم و چاويـان گـۆڕا، خـراپ بـوو، (سَـاءَ يَسُـوءُ سَـوْءاً وَسَـوَاءً: لَحِقَـهُ مَـا يَشِـينُهُ وَيُقَبِّحُـهُ، وَنُسِـبَ ذَلِـكَ إلى الوَجِـهِ، حَيْـثُ إِنَّـهُ يَبْـدُو فِي الوَجْـه أَثَـرُ الـسُّرُورِ وَالغَـمِّ)، ﴿سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، واتـە: ئەوانـەی بێبـڕوان دەم و چاويـان تێكچـوو، خـراپ بـوو، واتـە: حاڵەتێـكی بەسـەرهات كـە ناشـيرين و دزێـوی بـكات، بۆيـەش پاڵدراوەتـە لای ڕوو، چونكـە لەسـەر ڕووی مـرۆڤ، هـەم شـوێنەواری دڵخۆشـيی و، هـەم شـوێنەواری خـەم و دڵتەنگيـی، دەردەكـەوێ.

(تَدَّعُونَ): (تَطْلُبُون)، داوا دەكەن.

(يُجِيرُ): (أَجَـارَهُ: حَـمَاهُ وَأَنْقَـذَهُ)، (يُجِـيْر)، دەيپارێـزێ، چونكـە (أَجَـارَهُ: حَـمَاهُ وَأَنْقَـذَهُ)، پاراسـتی و دەربـازی كـرد.

(غَوۡرٗا): (غَـارَ المَـاءُ يُغُـور غَـوْرَاً، أي: ذَهَـبَ فِي الأَرْضِ وَسَـفَل فِيْهَـا)، ئاوەكـە بـە زەويدا چـووە خـوار واتـە: تێيـدا ون بـوو و شـۆڕ بـۆوە بـە ناخـی زەويـدا.

(مَّعِينِۭ): (المَـاءُ المَعْيُـون)، ئاوێـك بەچـاو ببيـنرێ، ياخـود ئاوێـكی ڕەوان كـە بـڕوا، (مَعُـنَ المَـاءُ: سَـهُلَ وَسَـال فَهُـوَ مَعِـيْنٌ وَالجَمْـعُ: مُعْـن)، (مَعُـنَ المَـاء)، واتـە: ئاوەكـە ئاسـان بـوو و ڕۆيشـت (فَهُـوَ مَعِـيْنٌ)، ئاوەكـە ڕەوانـەو دەڕوا، (معـين) بـە (مُعْـن)، واتـە: ئـاوە ڕۆيشـتووەكان، ياخـود: ئـاوە ڕەوانـەكان، كـۆ دەكرێتـەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دەفەرمویٚ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپیٚکردنم بە ناوی خوایە، ئەوەش مەبەستی پیٚ ئەوەیە:

**١** - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

**٢** -- ئەم کارە بە پیٚی شەرعی خوای دادوەر و کارزان دەکەم.

**٣** -- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای میهرەبان دەکەم.

**٤** - ئەم کارە بۆ هیٚنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرٌ﴾، دوو سوورەت لە قورئاندا بەم وشەیە دەستیان پیٚکردوە، وەك دەست پیٚکردن ئەگەرنا لە نیٚو قەدیٚدا زیاتر هاتوە، بەلاٚم سوورەتی (**الفرقان**)و، ئەم سوورەتی (**الملك**)، بە (تَبَٰرَكَ)، دەستیان پیٚکردوە، سوورەتی (**الفرقان**)، جگە لە سەرەتایەکەی، دوو جاریش لە نیٚوەڕاستەکەیدا، وشەی (تَبَٰرَكَ) هاتوە: أ- ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِىٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرًا مِّن ذَٰلِكَ ﴿١٠﴾﴾، ب- ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى جَعَلَ فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجًا وَقَمَرًا مُّنِيرًا ﴿٦١﴾﴾.

وشەی (تَبَٰرَكَ)، وەك لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**الفرقان**)یشدا باسمان کردوە.

زانایان ئاوایان لیٚك داوەتەوە: (**أي: تَعَاظَمَ وَتَعَالَى وكَثُرَ خيرهُ**)، واتە: خوا بەرزەو مەزنەو خیٚرو بەرەکەت و پیٚزی زۆرەو بەردەوامە، ﴿ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾، ئەو زاتەی حوکمڕانیی و بالاٚ دەستیی لە دنیاو دوارۆژدا، تەنیا بە دەستی ویە، ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٍ قَدِيرٌ﴾، ئەویش لەسەر هەموو شتیٚك بە توانایە.

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلًا ﴾، ئـەو كەسـەی مـردن و ژیـانی هێناونـە دی، تاكـو تاقیتـان بكاتـەوە، كامەتـان كـردەوەی باشـترە، ئێمـە دوایـی لـە تەفسـیركردنی ئـەم سـووڕەتە موبارەكـەدا، وێـڕای مەسـەلە گرنگـەكان چەنـد (كورتـە باسـێك)یش دەخەینـەڕوو، بۆیـە لێـرەدا بـە خێرایـی بـە مانـا گشـتییەكەیدا دەڕۆیـن، كەواتـە: حیكمـەت لـە دروسـتكرانی مرۆڤدا، تاقیكردنەوەیـەتی بـە كـردەوە بـە كـردەوەی بـاش، وشـەی كـردەوە (**عمل**)یـش، هـەم بـە كـردەوەی دڵ و، هـەم بـە تەعبیـرو دەربڕینـی زمـان و، هـەم بـە جموجۆڵـی ئەندامەكانیـش دەگوتـرێ، ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ﴾، ئـەو زۆر بـاڵا دەسـتەو زۆریـش لێبوردەیـە.

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴾، ئـەو زاتـەی حـەوت ئاسـمانی بـە چیـن لەسـەر چینیـی دروسـتكردوون، (**طِبَـاق**)، واتـە: (**مُتَطابِقَـةً**)، چیـن لەسـەر چیـن، ﴿ مَّا تَرَىٰ فِى خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴾، لـە دروسـتكراوی (خـوای) بـە بەزەیـی دا ناڕێكیـی نابینـی، چـاو بگێـڕە بزانـە هیـچ ناڕێكیـی و كەلێـن و درز دەبینـی!.

﴿ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ ﴾، دوایـی چـاو بگێـڕە دوو جـاران، زانایـان دەڵێـن: (كَرَّتَيۡنِ)، لێـرەدا مەبەسـت تەنیـا دوو جـار نیـە، بەڵكـو واتـە: جـار لـە دوای جـار چـاو بگێـڕە، ﴿ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴾، چـاوت بـە دەركراویـی دەگەڕێتـەوە بـۆ لات، واتـە: هیچـی دەسـتگیر نەبـووە، ﴿ وَهُوَ حَسِيرٌ ﴾، لـە حاڵێكیشـدا كـە زۆر شـەكەت و مانـدوو بـووە.

﴿ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئاسـمانی نزیكترمـان بـە چرایـان ڕازاندۆتـەوە، كـە مەبەسـت پێیـان ئەسـتێرەكانە، ﴿ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ﴾، ئـەو ئەسـتێرانەمان كـردوون، بـە مایەی بـەرد بارانكردن و بڵێسـە بارانكردنی شـەیتانەكان، ئنجـا ئایـا ئەسـتێرەكان بـە تەواویـی و بـە خڕیـی بـە شـەیتانەكاندا دادەدرێـن؟ بـە دڵنیایـی نەخێـر، بەڵكـو مەبەسـت ئـەو پارچانـەن كـە لێیـان دەبنـەوە، كـە نەیـزەك و

بڵێسەکانن و، لە ئەستێرەو خڕۆکەکان جیا دەبنەوەو، دێنە نێو مەودای هێزی ڕاکێشانی زەوی و بەرگە هەوای زەویی و، بەو شێوەیە دێنە بەرچاوی ئێمەو، شەیتانەکانیان پێ تیر باران دەکرێن.

﴿ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴾، سزای کڵپەی دۆزەخیشمان بۆ شەیتانەکان ئامادە کردوە.

﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، بۆ ئەوانەش کە بێبڕوان بە پەروەردگاریان، سزاو ئازاری دۆزەخ هەیەو، خراپترین سەرەنجامیش ئەوێیە.

﴿ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا ﴾، کاتێك تێیفڕێ دەدرێن، گوێیان لە گرفەو لرفەی دەبێ، گوێیان لە هەناسە هەڵکێشانی دەبێ، ﴿ وَهِىَ تَفُورُ ﴾، لە حاڵێکدا کە دەکوڵێ و دەجۆشێ، ﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ﴾، (ئەو دۆزەخە) خەریکە لە ڕق و داخ و خەفەتان (لە بەرانبەر کافرەکاندا)، لێك بێتەوەو پارچە پارچە ببێ، یەکێك دەڵێ: خەریکە لە خەفەتی فڵانکەس دەپچڕێم، یان خەریکم دەقڵیشێم.

﴿ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴾، هەر کاتێك (دۆزەخ) کۆمەڵێك تێیفڕێ دەدرێن دۆزەخەوانەکان، ئەوانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن، لێیان دەپرسن: ئایا ترسێنەرو ورياکەرەوەتان بۆ نەهات؟

﴿ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ ﴾، گوتیان: با بە دڵنیایی ترسێنەرو ورياکەرەوەمان بۆ هات، کەچی ئێمە بە درۆمان داناو، گوتمان: خوا هیچ شتێکی دانەبەزاندوە، ﴿ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ كَبِيرٍ ﴾، ئێوە (ئەی ترسێنەرو وریا کەرەوەکان!) تەنیا لە گومڕاییەکی گەورەدان.

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ ﴾، گوتیشیان: ئەگەر بیستبامان، یاخود فانیبامان، یانی: هێزی بیستنمان بەهرەمان لێ وەرگرتبایەو لە خەڵکی دیکەمان بیستبایە، یان خۆمان هێزی عەقڵ و هۆشی خۆمانمان بەکارهێنابایە، ﴿ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، ئێستا لە نێو هاوەڵانی کڵپەی دۆزەخ دا نەدەبووین.

﴿ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، دانیان بە گوناهی خۆیاندا هێنا، ئنجا دووریی بۆ هاوەڵانی کڵپەی دۆزەخ.

ئەوان بەو شێوەیەن، بەڵام ئایا ئەوانەی سام و هەیبەتی خواو، شەرم و ڕێزو حورمەتی خوایان لە دڵدا هەبووە، چۆنن؟.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بە پەنامەکیی بەرامبەر بە پەروەرگاریان سام و هەیبەتیان هەیە، لێبوردنێکی تایبەت و پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە.

﴿ وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، قسەکەتان بە پەنهانیی بکەن، یاخود بە بەرزیی بیکەن، واتە: بە چپە قسە بکەن، یاخود دەنگی پێ هەڵبێنن و بەرزبکەنەوە، یەکسانە بۆ خوا، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، خوا نەك هەر قسەی بەرزو بە چپە دەزانێ و دەبیستێ، بەڵکو ئەو زانایە بە هاوەڵی سینەکان (ذَات)، بە مانای (صَاحِبة)یە، کە بە مانای (هاوەڵ)ە، شتێك کە هەمیشە لەگەڵ شتێك دایە، نهێنییەکان و خولیاکانیش لەبەر ئەوەی هەمیشە لە نێو دڵ و سینەکان دان، خوا ﷻ بە خاوەن و هاوەڵی سینەکانی داناون.

﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، ئایا کەسێك کە دروستیکردوە، نازانێ (بە دروستکراوی خۆی زانا نیە)؟، ﴿ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، لە حاڵێکدا ئەو زۆر پەنهانزانی شارەزایە؟ بە دڵنیایی با.

﴿ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا ﴾، (خوا) ئەو کەسەیە زەوی بۆ دەستەمۆ کردوون، وەك چۆن وڵاخێك دەستەمۆ دەبێ و، ڕام دەبێ، بە ئاسانیی دێتە ژێربارو مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ، خوا ﷻ زەوی بۆ ئاوا لێکردوون، کە وەك دوایی باسی دەکەین و، چەند جارێك باسمان کردوە، زەوی چەند جۆرە سوووڕانەوەیەکی هەن و، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دەستەمۆیە، ﴿ فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا ﴾، ئنجا بۆ کارو کاسبیی بە قەد پاڵەکانی و لاشانەکانی دا بڕۆن، ﴿ وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ ﴾،

لـە بژێـوی وێـش بخـۆن، ﴿ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾، (بـا لـە بیرتـان نەچـێ) گەڕانـەوەش بـەس بـۆ لای ویـە، بزانـن چـۆن دەچنـەوە خزمـەت خـوا.

﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئایـا دڵنیـان لـەوەی لـە سـەرێیە، واتـە: خـوا ﷻ لەسـەرەوەی دروسـتکراوەکانی خۆیـەتی، نـەك لـە نێـو ئاسـماندا بـێ بەڵکـو لەسـەرەوەیە، چونکـە (ٱلسَّمَآءِ)، یـانی: سـەرێ (فـوق)، ئـەو پـەروەردگارەی لـە لەسـەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیـەتی، ئایا لێـی دڵنیـان و ئەمینـن، ﴿ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ﴾، کـە بەزەویـدا بتانباتـە خـوار، ﴿ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴾، لـە حاڵێکـدا کـە گێـژ دەخـوات و خـول دەخـوات، یـان دێـت و دەچـێ؟

﴿ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا ﴾، یـان ئایـا دڵنیـا بـوون لـەو کەسـەی لـە سـەرێیە، بایـەکی چـەو ڕاماڵکـەرو گڵ و خۆڵڕاماڵکەرتـان بـۆ بنێـرێ، ﴿ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴾، ئنجـا ئـەو کاتـە دەزانـن ترسـاندن و وریاکردنـەوەی مـن چۆنـە!.

﴿ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی پێـش ئەوانیـش بـە درۆیـان دانـا، پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دانـا، پەیامـی خوایـان بـە درۆ دانـا، ڕۆژی سزاو پاداشـتیان بـە درۆ دانـا، ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، ئنجـا ئایا نکوڵییکـردن و ڕەخنەگرتنـی مـن (لێیـان و دوایـی سـزادانم بۆیـان) چـۆن بـوو! واتـە: وابـوو کـە هـەر نایەتـە وەصفکـردن.

ئنجـا دوای ئـەوەی سـەرنجی ڕاکێشـان بـۆ مێـژوو، جارێـکی دیکـە سـەرنجیان ڕادەکێشـێتەوە بـۆ گـەردوون: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ وَيَقۡبِضۡنَ ﴾، ئایـا نەیانڕوانیوەتـەوە باڵنـدان، (ٱلطَّيۡرِ)، کـۆی (طائـر)ە، واتـە: مەلـەکان، ئایـا سـەرنجی مـەل و باڵندەکانیـان نـەداوە، لەسـەرروویانەوە (صَٰٓفَّٰتٖ)، باڵیـان پانڕاخسـتوون، (وَيَقۡبِضۡنَ)، هەروەهـا باڵیـان دێننـەوە یـەك، ﴿ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾، جگـە لـە (خـوای) بـە بەزەیـی کـەس نایانگـرێ بـە هـەواوە، بـەڵام خـوا ﷻ سیسـتمێکی بـۆ

داناون، هەوای وا دروستکردوە، باڵندە بتوانێ پێیدا بفڕێ و بشتوانێ بمێنێتەوە بە هەواوەو، باڵندەشی وا خوڵقاندوە، کە ئێسقانەکانی سووکن و بۆشاییان تێدایە، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر پتەون، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**النحل**)دا، باسێکی تایبەتمان لە بارەی باڵندانەوە کرد، جۆرەکانی باڵندەو پێکهاتەی باڵندەو تایبەتمەندییەکانی.

﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا بینەری هەموو شتێکە، باڵندەشی وا خوڵقاندوە، بتوانێ بفڕێ و بە هەواوە بمێنێتەوە، وەك چۆن ماسیی و ژیاندارانی دەریاشی وا خوڵقاندوون، بتوانن بە نێو ئاودا بڕۆن و تێشیدا بژین و بگوزەرێنن.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ﴾، یان ئایا کێیە ئەوەی بۆتان دەبنە سەربازو سوپا، کە جگە لە (خوای) بەبەزەیی سەرتان بخەن، واتە: جگە لە خوا کێ بۆتان دەبێتە سوپاو سەرباز، سەرتان بخات و پشتتان بگرێ؟، ﴿إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ﴾[1]،بێبڕوایەکان تەنیا لە هەڵخەڵەتاویی و لە خۆبایی بوون و فریو خواردن دان.

﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ﴾، یان ئایا کێیە ئەو کەسەی ئەگەر ئەو (خوا) بژیوەکەی بگرێتەوە، بژیوتان بدات؟ یانی: تێکڕای بژیوەکان: هەواو، ئاوو، تیشکی خۆرو، سەرجەم ئەو بژیوانەی لە زەوی پەیدا دەبن، کێیە ئەوانەتان بۆ دابین بکات و بژیوتان بدات، ئەگەر خوا بژیوتان نەدات؟! بێگومان کەس، ﴿بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ﴾، بەڵکو ئەوانە بەردەوام بوون لە سنوور شکێنیی و سڵەمینەوەدا، (**لجاج، ولجاجة**)، یانی: مکووڕیی و سووریی لەسەر شتێك، بەڵکو ئەوانە لە سنوور شکێنیی و لە سڵەمینەوەدا، هەر بەردەوام و مکووڕن.

ئنجا خوا ﷻ دوو وێنەمان دەخاتە بەر چاو، بۆ بابای بێبڕوای هاوبەش بۆ خوا دانەرو، بۆ بابای خواناسی بڕوادار، بێبڕوایەکە وەك کەسێکە لەپەو ڕوو

---

(١) (إنْ) لابەرە (نافية)یە، بە مانای (ما)ی لابەرە.

لەسەر دەم و چاوی بڕواو، بڕوادارەکەش کەسێکە بە قیت و قنجیی و ڕێك و ڕاستیی بڕوا، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَمْشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، ئایا کەسێك کە لەسەر ڕووی لەپەو ڕوو کەوتووەو، لەسەر دەم و چاوی دەڕوات، چاکتر بە ڕێیە دەزانێ و، ڕێی ڕاستگرتووترە، یاخود کەسێك کە بە ڕێیەکی ڕاست داو، بە قیت و قنجیی دەڕوات؟! وەڵامەکەی دیارە.

﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمْ ﴾، (ئەی موحەممەد ﷺ!) پێیان بڵێ: ئەو (خوا ﷻ) ئەو زاتەیە کە ئێوەی پێگەیاندوە، (إنشاء) پێگەیاندنی پلە پلەیە، لەبەر ئەوەی ئێمە لە منداڵدانی دایکماندا، لە (نُطْفَة)وە، بۆ (عَلَقة) و بۆ (مُضْغَة)، پێ بە پێ پێدەگەین، دوایی وردە وردە هەراش و گەورە دەبین، یانی: خوا ﷻ ئێوەی پێ گەیاندوە بە پێگەیاندنی بە پلە پلە، ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ﴾، بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانیشی بۆ ڕەخساندوون، ﴿ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾، بە کەمیی سوپاسگوزاریی دەکەن، یاخود تەنانەت کەمیش سوپاسگوزاریی بۆ خوا ئەنجام نادەن.

﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، بڵێ: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە، کە ئێوەی لە زەویدا بڵاوکردۆتەوە، یان پێگەیاندوە، ﴿ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، تەنیا بۆ لای ویش کۆ دەکرێنەوەو خڕ دەکرێنەوە.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، (بێبڕوایەکان) دەڵێن: ئەو بەڵێنە کەنگێیە، (کاتی هاتنی ئەم بەڵێنە کەنگێیە)، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن؟، ﴿ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، بڵێ: زانیاریی ئەوە تەنیا لە لای خوایە، زانیاریی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی، تەنیا لە لای خوایە، ڕۆژی دوایی چ مەبەست قۆناغی یەکەم بێ، کە ئاخیر زەمان و تێك چوونی ئەم دنیاو گەردوونەیە، چ مەبەست قۆناغی دووەم بێ، کە قیامەت و هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوەو ئامادەسازییە بۆ لێپرسینەوەو سزاو پاداشت، زانیاریی هەبوون بە کاتی هاتنی ئەو بەڵێنە، تەنیا لە لای خوایە، ﴿ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، من تەنیا ورياکەرەوەو ترسێنەرێکی ڕوون و ئاشکرام، یاخود ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەرم.

ئنجا خـوا ﷻ یەکسـەر دەیانگوازێتـەوە بـۆ قیامـەت: ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً ﴾، کاتێـك لـە نیزیکـەوە بەڵێنەکەیـان بینـی، واتـە: بـە نزیکخراوەیـی هاتنـەدی بەڵێنەکەیان دی، یاخـود: سـزای خوایـان لـە نیزیکـەوە بینـی، ﴿ سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوان، ڕوویـان خـراپ بـوو، واتـە: ڕوویـان تێکچـوو و گـرژو مـۆن و ڕەش و تـاڵ بـوو، ﴿ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴾، گوتـراش: ئـا ئەمـە بـوو کـە زۆر داواتـان دەکـردو پەلەتـان لـێ دەکـرد.

﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا ﴾، (ئـەی موحەممـەد ﷺ!) پێیـان بفەرمـوو: بڵـێ: ئایا دەبینـن، هەواڵـم پێبـدەن، ئەگـەر خـوا مـن و ئەوانـەی لەگەڵـم دان، فەوتانـدنی و ئێمـەی مرانـد، ﴿ أَوْ رَحِمَنَا ﴾، یـان بەزەیـی لەگەڵـدا نواندیـن و، ئێمـەی سەرخسـت، لـە هـەردووك حاڵانـدا:

﴿ فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، ئایا کـێ بێبڕوایان لـە ئازارێکی بـە ئێـش دەربـازو قوتـار دەکات، واتـە: ئێمـە چ خـوا بمانباتـەوە، وەك ئێـوە خـەونی خراپـمان پێـوە دەبینـن، چ خـوا بەزەیـی پێمانـدا بێتـەوەو سـەرمان بخـات، لـە هـەردوو حاڵانـدا، ئێـوە سـزای بـە ئێـش هـەر چاوەڕێتانـە، ئنجا ئایـا کـێ دەربازتـان دەکات و کـێ پەناتـان دەدات؟!

کەواتـە: گـرەو لەسـەر ئـەوە مەکـەن، کـە ئێمـە لـە بەیـن بچیـن و سـەرمان بـە فەتـارەت بچـێ، چونکـە ئێمـە سـەربکەوین، یـان سـەرمان بـە فەتـارەت بچـێ، سـزای سـەخت و بـە ئێـش هـەر چاوەڕێـی ئێوەیـە، ﴿ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا ﴾، بڵـێ: ئـەو (خـوای) بـە بەزەییـە، بڕوامـان پێـی هێنـاو پشـتمان تەنیـا بـەو بەسـتوە، ﴿ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێـوەش دەزانـن کێیـە لـە گومڕاییـەکی ئاشـکرا دایـە.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا ﴾، بڵـێ: پێـم بڵێـن، هەواڵـم پـێ بـدەن، ئایـا دەبینـن ئەگـەر ئاوەکەتـان ڕۆچـوو بـە زەویـداو

ونبوو، ﴿فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ﴾، کێ ئاوێکی ڕەوانتان بۆ دێنێ، یان ئاوێك کە لە سەرچاوە دەردەقوڵێ و جۆ و جۆباری لێ هەڵدەبەسترێن، کێ ئەو ئاوەتان بۆ دێنێ، ئاوێکی شیرین و زوڵاڵ؟ بێگومان بێجگە لە خوا ﷻ ئەو نازو نیعمەتانە بەهیچ کەس دابین ناکرێن.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی بەرزیی و بە پێزیی و بەردەوامیی خێرو بەرەکەتی خواو، هەموو شت بە دەست بوونی لە دنیاو دوارۆژداو، ڕەخساندنی خوا مەرگ و ژیان بۆ تاقیکردنەوە، کە ئایا کێ کردەوەی باشترە؟ دروستکردنی حەوت چینە ئاسمان و، نەبوونی هیچ نارێکییەك لە دروستکراوی خوادا ﷻ، وێڕای پشكنین و سۆراخکردنی زۆر بۆ دۆزینەوەی کەم و کوڕیی و، ڕازێندرانەوەی ئاسمانی نیزیکتر لە زەوی بە ئەستێرە چرا ئاسایەکان و، بڵێسە بارانکردنی شەیتانەکانیش بە پارچەکانی ئەو ئەستێرەو خڕۆکانە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ﴿٢﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ﴿٤﴾ وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ﴾، بەرزو خاوەن پێزی بەردەوامە ئەو کەسەی حوکمڕانیی تەنیا هی ویە، پێشتریش گوتمان: (**تَبَرَكَ**)، لە (**بَرْك**)ەوە هاتوە، (**بَرْك**)یش بە مانای سینگی حوشتر دێ، حوشتر کە یەخ دەبێ، سینگ دادەداتە سەر زەویی و بە زەوییەوە دەنووسێ، هەندێکیش دەڵێن: (تبارك) لە (**بُرْكة**)وە هاتوە، (**بُرْكة**)ش، گۆماوێکە ئاوەکەی تێدا داوەستاوە، ئنجا (تبارك) چ لە (**برك**)ەوە هاتبێ، کە سینگی حوشترەو بە

زەویەوە دەنووسێ و دەچەسپێ، چ لە (بُرْكة)وە هاتبێ، کە ئاوەکەی تێدا ڕادەوەستێ، (بَرَكة)، بریتیە لە چەسپاندنی خێرو فەیزو بەخششی خوا لە شتێکدا، کەواتە: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾، واتە: بەرزەو خاوەن پێزی بەردەوامە، ﴿ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾، ئەو کەسەی حوکمڕانیی و باڵادەستیی تەنیا بە دەست ئەوە، **(الطبري)** ئەم ڕستە موبارەکە ئاوا تەفسیر دەکات: (**بِيَدِهِ مُلْكُ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَسُلْطَانُهُمَا، نَافِذٌ فِيهِمَا أَمْرُهُ وَقَضَاؤُهُ**)، واتە: حوکمڕانیی دنیاو دواڕۆژو باڵادەستیی تێیاندا، تەنیا بە دەست خوایەو، فەرمانی خواو بڕیاری خوا لە دنیاو دواڕۆژدا جێبەجێ بوویە.

٢)- ﴿وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، ئەویش لەسەر هەموو شتێك توانایە.

٣)- ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا﴾، (خوا) ئەو کەسەیە کە مردن و ژیانی هێناونە دی، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە، **(الطبري)** ئاوا ئەم ڕستە موبارەکە شیی دەکاتەوە، دەڵێ: (**فَأَمَاتَ مَنْ شَاءَ وَمَا شَاءَ، وَأَحْيَا مَنْ أَرَادَ وَمَا أَرَادَ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ، لِيَخْتَبِرَكُمْ فَيَنْظُرَ: أَيُّكُمْ لَهُ أَيُّهَا النَّاسُ أَطْوَعُ، وَإِلَى طَلَبِ رِضَاهُ أَسْرَعُ**)، واتە: خوا ﷻ دەمرێنێ ئەو کەسەی بیەوێ و هەر شتێك کە بیەوێ و، دەژیەنێ هەر کەسێ بیەوێ و، هەر شتێك بیەوێ، تاکو تاقیتان بکاتەوە، تەماشا بکات: کامەتان ئەی خەڵکینە! بۆی فەرمانبەرترن و، بۆ داواکردنی ڕەزامەندییەکەی خێراترن.

٤)- ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ﴾، ئەویش باڵادەستی لێبوردەیە، واتە: باڵادەست و زاڵە بۆ کەسێك کە لە فەرمانی دەربچێ بۆ سزادانی و، زۆریش لێبوردەیە بۆ کەسێك کە بەر فەرمانی بێ و گوێڕایەڵ بێ، خوا ﷻ بە لێبوردن و چاوپۆشیی و بەزەیی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ ۝٢﴾، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**التَّعْرِيفُ فِي:** ﴿ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ﴾، **تَعْرِيفُ الْجِنْسِ، وَفِي الْكَلَامِ تَقْدِيرٌ:** ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ ۝٢﴾ **لِتَحْيَوْا فَيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا، وَتَمُوتُوا فَتُجْزَوْا عَلَى حَسَبِ تِلْكَ الْبَلْوَى**)، (أل)ی سەر ﴿ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ﴾، بۆ ناساندنە، ناساندنەکەش

بۆ جینسە، واتە: خوا ﷻ هەم مردنی هێناوەتە دی، هەم ژیان، تاكو بژیین و خوا تاقیتان بكاتەوە، كامەتان كردەوەكەی باشترەو، دوایی بمرن و خوا بەپێی ئەو تاقیكردنەوەیەی داوتانە، سزاو پاداشتتان بداتەوە.

زانایان هەندێكیان ئاوا پێناسەی ژیانیان كردوە: (**الحَيَاةُ: قُوَّةٌ تَتْبَعُ اعْتِدالَ المِزاجِ النَّوْعِيِّ لِتَفِيضَ مِنها سائِرُ القُوى**)، واتە: ژیان هێزێكە شوێن هاوسەنگیی میزاج و سرووشت دەكەوێ، (هی هەر شتێك: مرۆڤە، ئاژەڵە، هەرچی هەیە)، تاكو بەهۆی ئەو ڕێكیی و هاوسەنگیی میزاجەوە هەموو هێزەكانی دیكە، لەوێوە پەیدابن، بۆ وێنە: دیتن و بیستن و خواردن و خواردنەوەو تا كۆتایی، (**والمَوْتُ: كَيْفِيَّةٌ عَدَمِيَّةٌ، هو عَدَمُ الحَياةِ عَمّا شَأْنُهُ أَنْ يُوصَفَ بِالحَياةِ أَوِ المَوْتِ، أَيْ: زَوالِ الحَياةِ عَنِ الحَيِّ**)، مردن چۆنیەتییەكی نەبوویە، كە بریتیە لە نەبوونی ژیان، بۆ شتێك كە بگونجێ بە ژیان یان مردن وەسف بكرێ، واتە: مردن بریتیە لە لاچوونی ژیان لە زیندوویەك.

ئنجا كە دەفەرموێ: خوا ژیان و مردنی هێناونە دی، واتە: زیندوویی دروستكردوە، ژیانداری دروستكردوەو ژیانی پێداوەو، كە دەفەرموێ: مردنی دروستكردوە، واتە: هۆكارەكانی مردنیشی ڕەخساندوون، ئەگەرنا مردن نەبوویەكە، دروستكردن پێیەوە پەیوەست نابێ.

هەڵبەتە یەكێك لە زانایان وادەڵێ، كە هەر ئەو ڕایەش زیاتر لە عەقڵ و فامی ئێمەوە نیزیكەو تێیەوە دەچێ.

هەندێكیش گوتوویانە: مردن دروستكراوێكی خوایە، لەو بارەوەش فەرمایشتێكی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نموونە دێننەوە، كە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا مردن لەسەر شێوەی بەرانێك دەخوڵقێنێ و ئەو بەرانە لە پێش چاوی دۆزەخییان و بەهەشتییان سەردەبڕدرێ و دەگوترێ: ئەی بەهەشتییەكان! ئەوە ژیانی هەمیشەییتانەو مردن كۆتایی هات، مردن نەماو، ئەی دۆزەخییەكان!

ئێوەش بۆ هەمیشە لە دۆزەخدان و مردن نەما[١]، بەڵام زانایانی دیکە دەڵێن: ئەوە تەعبیرێکی ڕەمزییە بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە، کە بەهەشتییان و دۆزەخییان هەر کامیان لە شوێنی خۆیاندا، بۆ هەمیشە ژیانێکی بەردەوام و نەپساوە یان دەبێ مردنیان بەسەر دانایە.

دوای ئەوەی خوا ﷻ خۆی وەسفکرد بە خێرو پایەی بەرزیی بەردەوام و بەخشینی بەردەوام و، بەوەی حوکمڕانی ڕەهای دنیاو دواڕۆژەو، لەسەر هەموو شتێ بە توانایەو، دوای ئەوەی خۆی وەسف کرد، بەوەی مردن و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو مرۆڤەکان تاقی بکاتەوە کامیان کردەوەی باشترە؟ ئنجا خۆی وەسفکرد بەوەی خاوەنی ئەو پەڕی زاڵیی و باڵادەستیی و ئەو پەڕی لێبوردنە، ئنجا لەسەر پێناسەکردن و وەسفکردنی خۆی بەردەوام دەبێ و دەفەرموێ:

٥)- ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا﴾، (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە حەوت ئاسمانی لەسەر یەکی هێناونە دی، (**طِبَاق**)، دەڵێ: (**طَبَقاً فَوْقَ طَبَق**)، (**طِبَاق**)، کۆی (**طَبَق**)ە، واتە: چین، (**طَبَاق**)یش یانی: چین لەسەر چین، یانی: (**بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْض**)، هەندێکی لەسەر هەندێکی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئاسمانەکان لەسەر یەکن، هەتا هەندێك لە زانایان دەڵێن: وەك چۆن توێکڵی پیواز هەر کامێکیان دەوری ئەوی دیکەی داوە، چینەکانی ئاسمانەکانیش بەو شێوەیەن.

---

(١) {يُؤْتَى بِالْمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ أَمْلَحَ، فَيُنَادِي مُنَادٍ، يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، وَكلُّهُمْ قَدْ رَأَوْهُ، ثُمَّ يُنَادِي: يَا أَهْلَ النَّارِ فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآه، فَيُذْبَحُ ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ خُلُودٌ، فَلاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّار خُلُودٌ، فَلاَ مَوْتَ ثُمَّ قَرَأَ (وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ، وَهَؤُلاَءِ فِي غَفْلَةٍ، أَهْل الدُّنْيَا، وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ)} أخرجه البخاري: ٤٤٥٣.

٦)- ﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ﴾، لە دروستکراوی (خوای) بە بەزەییدا ناڕێکیی نابینی، (تَفَاوُت)، خوێنراویشەتەوە: (تَفَوّت)، (تَفَاوُت وتَفَوّت)یش، هەردووکیان بە مانای ناڕێکیی و کەم و کوڕیی: (الإخْتِلَاف وَالنَّقْص)ن، یانی: پێکەوە نەگونجان و بێ یاسایی نابینی لە دروستکراوی خوای بە بەزەییدا.

٧)- ﴿فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ﴾، جار لە دوای جار چاو بگێڕە (بە دروستکراوی خوای بە بەزەییدا)، ئایا هیچ کەلێن و درز دەبینی؟ (الفَطْرُ: الشَّقُّ طُولاً و، الفُطُور: الوَهن، وَالفُطُور: الصُّدُوعُ وَالشُّقُوق)، (فَطْر)، بریتیە لە لەت بوون و قڵیشان بە باری درێژییدا، (قوماشێك دەقڵیشێنی، دارێك بەردێك دەقڵیشێنی بە باری درێژییدا)، هەروەها (فُطُور)، بە مانای بێهێزییش دێ و، (فُطُور). بە مانای درزو کەلێن و لەتبوونیش دێ، کە بە دڵنیایی هەمووی مەبەست پێی ئەوەیە: ناڕێکیی و بێ یاسایی نابینی لە دروستکراوی خوای بە بەزەییدا.

یانی: ئەم گەردوونە وەك دیوارێك وایە، کە ڕێك و تۆکمەو تەواوەو درزو کەلێنی تێدا نابینی، شەقبوونی تێدا نابینی.

کە دەفەرموێ: ﴿فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ﴾ یانی: (كَرِّرِ النَّظَرَ وَالتَّأَمُّلِ وَأَدِمِ الْمُلَاحَظَةَ هَلْ تَجِدُ نَقْصَاً فِي خَلْقِ اللهِ الرَّحْمَنِ؟!)، واتە: چاو بگێڕەو ڕامێنەو با سەرنجی بەردەوامت بێ، ئایا هیچ ناڕێکیی لە دروستکراوی خوای بە بەزەییدا دەبینی؟!

٨)- ﴿ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ﴾، دوایی دووجاری دیکە چاو بگێڕە، دوو کەڕەتی دیکە، کەڕەتی کوردیی ڕەنگە لە (كَرَّة)ی، عەرەبییەوە هاتبێ، (كَرَّتَيْن أي: رَجْعَتَين أُخْرَيَيْنِ ابْتِغَاء الخَلَلِ وَالفَسَاد وَالعَبَثِ، وَالمُرَادُ بِالتَّثْنِيَة: التَّكْرِير كَمَا فِي لَبَّيْكَ وسَعْدَيْكَ)، کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ﴾، دوایی دوو جاری دیکە چاو بگێڕە، (واتە: چاو بە دروستکراوەکانی خوادا بگێڕێ)، بە مەبەستی دۆزینەوەی کەم و کوڕیی و ناڕێکیی و عەیب و پووچیی لە دروستکراوی خوادا، بەڵام مەبەست لە دوو جار، دووبارە کردنەوەیەو مەرج نیە تەنیا

دوو بێ، سێ بێ، چوار بێ، دە بێ، وەك لە زمانی عەرەبییدا تەعبیرێكیان هەیە دەڵێ: (لَبَّيْكَ وسَعْدَيْكَ)، (لَبَّيْكَ أي: لَكَ تَلْبِيَةٌ بَعْدَ تَلْبِيَة، وسَعْدَيْكَ أي: لَكَ إسْعَادٌ بَعْدَ إسْعَاد)، واتە: جار لە دوای جار من لە خزمەت تۆدام، {(لَبَّيْكَ)، واتە: بەدەنگتەوە هاتم و لە خزمەت دام}، (سَعْدَيْكَ)، واتە: ئامادەم بۆ بەختەوەركردنی تۆ و جێبەجێكردنی فەرمانی تۆ، تاكو تۆ بەختەوەر بی، كەواتە: (لَبَّيْكَ وسَعْدَيْكَ)، هەرچەندە واتە: دوو تەلبیەو دوو ئیسعاد، بەڵام عەرەب كە بەكاریان هێناون، مەبەستیان ئەوە بووە: بەردەوام لە خزمەت دام و ئامادەم بۆ بەختەوەركردنی تۆ، نەك تەنیا دوو جاران.

كەواتە لێرە: ﴿ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ﴾ واتە: جار لە دوای جار، یانی: چەندان جار چاو بگێڕەو ورد بەوە كە كەم و كوڕیی بدۆزیەوە لە دروستكراوی خوای بە بەزەییدا، بەڵام ئایا سەرەنجام چۆن دەبێ؟

٩)- ﴿يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئًا﴾، چاوت بەدەركراویی و داماویی دەگەڕێتەوە بۆ لات.

١٠)- ﴿وَهُوَ حَسِيرٌ﴾، (أي: وَهُوَ مُعِيٌّ كَالٌّ)، لە حاڵێكدا كە ماندوو و شەكەت بووە، چاوت زۆر گەڕاوەو سەرنجی داوە كە كەم و كوڕییەك بدۆزێتەوە لە دروستكراوی خوای بە بەزەییدا، بەڵام چاوت بە دەركراویی و داماویی و بە دەست خاڵیی گەڕاوەتەوە بۆ لات، لە حاڵێكیشدا كە زۆریش ماندوو بووە، یانی: زۆر هەوڵی داوەو زۆر خۆی ماندوو كردوەو، كەم و كوڕییەك بدۆزێتەوە، بەڵام هیچی بۆ نەدۆزراوەتەوە، ئنجا وەك دوایی لە كورتە باسێكدا باس دەكەین، لە ڕاستییدا ئەمە ئیعجازێكی زانستیی زۆر گەورەی تێدایە، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: دروستكراوی خوای بە بەزەیی هەرچەندە زۆر سەرنج بدەی و چاو بگێڕی و سۆراخ و پشكنین بكەی، كەم و كوڕیی تێدا نابینی.

١١)- ﴿وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾، بە دڵنیایی ئاسمانی نیزیكترمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، (مَصَابِيْح)، كۆی (مِصْبَاح)ە، یانی: چرا، لێرە خوا ﷻ ئەستێرەكانی چواندوون بە چرایانەوە، (دُنْيَا)ش، (مُؤَنَّث)ی، (الأَدْنَى)، یانی: (أَقْرَب)، نیزیكتر، بەڵام بۆ

مێینە (**مُؤَنَّث**)یە، (**دُنْيَا**) بۆ (**مُؤَنَّث**) و (**أَدْنَى**)، بۆ (**مُذَكَّر**)ە، یانی: ئاسمانێك كە لە ئێوە نزیكترە (لە خەڵكی سەر زەوییەوە، نیزیكترە) بە چرایان ڕازاندوومانەتەوە.

١٢)- ﴿وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِ﴾، ئەو (ئەستێرا)نەمان گێڕاون بە بەردی بەرد باران پێكران بۆ شەیتانەكان، (**رُجُومٌ: جَمْعُ رَجَم، وَهُوَ فِي الأَصْلِ مَصْدَرٌ أُطْلِقَ عَلَى المَفْعُولِ، أَي: المَرْجُوم بِهِ**)، (**رُجُوم**)، كۆی (**رَجَم**)ە، كە لە ئەصڵدا چاوگە، یانی: بەرد بارانكردن و تیر بارانكردن، بەڵام بەكارهێنراوە بۆ بەركار، واتە: ئەو شتەی بەرد بارانی دەكرێ، كەواتە: (**رَجَم**)، یانی: پێ بەرد بارانكراو، بۆ شەیتانەكان، ئنجا ئایا ئەستێرەكان بە خڕیی بە شەیتانەكاندا دادەدرێن؟ بە دڵنیایی نەخێر، (**أَي: جَعَلْنَا شُهُبَهَا وأَجْزَاءَهَا المُنْفَصِلَةَ عَنْهَا رُجُوماً للشَّيَاطِيْن**)، واتە: بڵێسەكان و پارچەكانی، (كە نەیزەكیان پێ دەڵێن و) لێیان جیادەبنەوە (لە ئەستێرەو خڕۆكەكان)، بەوانە شەیتانەكان تیر باران و بەرد باران دەكەین، بۆ ئەوەی گوێ نەگرن لە قسەی فریشتان و، نەچن بۆ سەرێ و مەعلوومات نەهێنن، هی فریشتەكان بۆ فاڵچییەكان، كە دوایی خەڵك هەڵخەڵەتێنن.

١٣)- ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾، {وێڕای ئەوەی ئاوا بەو پارچە ئەستێرانە، ئەو شەیتانانە دەر دەكەین و سزایان دەدەین}، لە دواڕۆژیشدا ئازارو سزای كڵپەی دۆزەخمان بۆیان داناوە.

شایانی باسە: كە دەفەرموێ: ﴿يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ﴾، (**البَصَرُ**)، كە (ألْ)ی ناساندنی لەسەرە، (ألْ) لە جیاتی پاڵوەلادراو (**مُضَاف إليْهِ**)ە، یانی: (**يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ بَصَرُكَ**)، چاوی تۆ چاوت دەگەڕێتەوە بۆ لات بە دەركراویی و داماویی، ﴿وَهُوَ حَسِيرٞ﴾، لە حاڵێكدا زۆریش ماندوو و شەكەت بووە، بەڵام هیچ عەیب و كەم و كوڕیی لە دروستكراوی خوای بە بەزەییدا نەدۆزیونەوە.

# کورتە باسێک لە پێنج سەرنج دا

بەڕێـــــزان!

ئـەم کورتـە باسـە لـە بـارەی زیاتـر ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـای ئـەو پێنـج ئایەتـە موبارەکەوەیـە کـە مەسـەلەی یەکەمیـان لـێ پێـك دێ:

١- ئامانج و حیکمەتی مردن و ژیان، تاقیکردنەوەیەو، مردنیش لەبەر دەرخستنی باڵادەستیی خوا ﷻ پێشخراوە، خوا زۆر بە ڕوونیی لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًاۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾، واتە: (خوا ﷻ) ئەو کەسەیە کە مردن و ژیانی هێناونە دی، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترەو ئەو باڵا دەستی لێبوردەیە، کەواتە: ئێمە لەو سەر زەوییە داندراوین بۆ تاقیکردنەوە، ئەم ڕاستییە وێڕای ئێرە لە سووڕەتی (**هود**)یشدا، هاتوە: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾﴾، هەروەها لە سووڕەتی (**الكهف**)یشدا، هاتوە: ﴿إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾﴾، ئەم سێ تەعبیرە لە هەر سێ سووڕەتەکانی: (**هود و کهف**) و (**ملك**)یش دا هاتوون، ڕاستییەك لە هەموو قوڕئاندا یەك جاریش بێ، هەر تەواوە، بەڵام بێگومان ڕاستییەك لە سێ شوێندا بێ، زیاتر جێی بایەخە، کەواتە: ئێمە بۆ تاقیکرانەوە لەم سەر زەوییە داندراوین، ئایا بۆچی خوا ﷻ مردنی پێشخستوە؟ لە سۆنگەی ئەوەوە کە مردن زیاتر باڵادەستیی خوا دەگەیەنێ، چونکە هەموومان لە مردن دەترسێین و، هیچ دروستکراوێك حەز بە لە بەین چوون ناکات و حەز بە بوون و ژیان دەکات، بۆیە خوا مردنی پێشخستوە، واتە: بزانن کە ئێوە هی خۆتان نین و پەروەردگارو خاوەنێکتان هەیە، ئەوەتا دەتانمرێنێ بێ ئەوەی بتانەوێ و، ئەوەندەی بیەوێ دەتانژیەنێ، بەڵام حیکمەتی ژیاندنەکەتان بۆ ئێوە، ئەی مرۆڤ و جند! ئەوەیە کە تاقیتان بکاتەوە، لەم ژیانە کاتییەی دنیادا.

**٢-** حەوت ئاسمانەكان و سنووریان نازانین، كە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۝٣﴾، ئەو زاتەی حەوت ئاسمانی لەسەر یەكی چین چینی خوڵقاندوون، نازانین وەك زۆر جاری دیكەش گوتوومانە ئەو حەوت ئاسمانانە سنوورەكەیان كوێیە؟، ئەوەندە دەزانین كە خوا دەفەرموێ: ئاسمانی نیزیكترمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە، مانای وایە هەرچی ئەستێرەیەو كەهكەشانە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەكەمدایە، بەڵام ئایا سنووری ئاسمانی یەكەم لە كوێ كۆتایی دێ؟ نازانین، تاكو ئێستا زانست بەوە نەگەیشتوە، ئنجا ئاسمانەكانی دیكەش كە لەسەر ئاسمانی یەكەمەوەن: ئاسمانەكانی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، ئەگەر هی یەكەم نەزانین سنوورەكەی تا كوێیەو وردەكارییەكانی نەزانین، ئەوانی دیكە چاكتر نازانین، شایانی باسیشە: ئێمە لە هەر كام لە تەفسیری سوورەتەكانی: (**فصلت**) و (**الرحمن**)دا، هەروەها كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)یشداو، لە تەفسیری سوورەتی (**الأنعام**) یشداو، لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)یشدا، لە بارەی گەردوونەوەو، لە بارەی حەوت ئاسمانەكانەوە، قسەمان كردوە، بەڵام بە تایبەت لە تەفسیری سوورەتی (**فصلت**)و، لە تەفسیری سوورەتی (**الرحمن**)دا، لەو بارەوە ئەوەی كە زانیومانە بە پێویستمان زانیوەو مرۆڤ لەم ڕۆژگارەدا پێی گەیشتوە، خستوومانەتە ڕوو، واتە: تەفسیری ئەو سوورەتانەی كە باسی حەوت ئاسمانەكان و گەردووغان تێدا كردوون، ئەگەر بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف بیانڵێین: لە تەفسیری سوورەتەكانی: (**الأنعام**) و (**الأعراف**) و (**یونس**) و (**فصلت**)و، دواجار سوورەتی (**الرحمن**)دا، لەو بارەوە قسەمان كردوە.

**٣-** ئەم ئایەتانەی سوورەتی (**الملك**)و، ئایەتەكەی سوورەتی (**النمل**)، كە دەفەرموێ: ﴿صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَىۡءٍ ۝٨٨﴾، هەروەها ئایەتەكەی سوورەتی (**السجدة**)، كە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقَهُۥ ۝٧﴾، دیسان سوورەتی (**الأعلى**)، كە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٢﴾، هەموو ئەو ئایەتە موبارەكانە، وەك نموونە، ئیعجازێكی زانستیی مەزنیان تێدایە، چونكە لە هەموو ئەو ئایەتانەدا، خوا ﷻ زۆر بە ڕوون و ڕاشكاویی پێمان ڕادەگەیەنێ، كە دروستكراوەكانی

خۆی بەوپەڕی وردەکاریی و ڕێك و پێكیی دروستكردوون و، بەوپەڕی باشی دروستكراوەكانی خۆی هێناونە دی و، دەفەرمویٚ: ناڕێكیی لە دروستكراوی خوادا نیەو، ئەوپەڕی یاساداریی و سیستماتیكیی و وردەكاریی هەیە، خوا ئاوای فەرمووە، ئنجا كە تەماشای واقیعیش دەكەین، هەروایە، كەواتە: هەموو ئەو ئایەتە موبارەكانە، ئیعجازێكی زانستییان تێدایە، زانست دوای ئەوە زۆر بەرەو پێشەوە چووە، ئنجا بۆی دەركەوتوە، كە هەرچی خوا خوڵقاندوویەتی، بە باشترین شێوە خوڵقاندوویەتی، وەك لە سوورەتی (**النمل**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: دروستكراوی خوا كە هەموو شتێكی بە وردكاریی ڕەخساندوە، (**إتقان**)، واتە: وردەكاریی و ڕێك و پێكیی، بێ هەڵەیی و بێ كەم و كوڕیی، هەروەها لە ئایەتی (٧)ی سوورەتی (**السجدة**)دا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿٧﴾ ﴾، (خوا) هەرچی دروستیكردوە، بە باشترین شێوە دروستیكردوە، هەروەها ئایەتەكانی سوورەتی (**الأعلى**)، كە دەفەرموون: ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاك بگرە، ئەو زاتەی هەموو شتێكی هێناوتە دی، ئنجا ڕێكیخستوە (و چاكی كردوەو تێرو تەواوی كردوە)، هەروەها ئەو كەسەی ئەندازەگیریی بۆ هەموو شتێك كردوەو ڕێنمایی كردوەو خستوویەتە سەر ڕێی ڕاست.

لێرەش كە خوا دەفەرمویٚ: هەرچەندە زۆر سەرنج بدەی و چاو بگێڕیٚ و وردبیەوە، ناڕێكیی و بێ یاسایی لە دروستكراوی خوای بە بەزەییدا نابینی، ئەوەی خواش فەرموویەتی، لەسەدا سەد (١٠٠/١٠٠) وایە: مرۆڤ تەماشای جەستەی خۆی دەكات، تەماشای ئاسمانەكان دەكات، تەماشای زەوی دەكات، تەماشای بەرگە هەوا دەكات، تەماشای بەرگە ئاویی دەكات، تەماشای جیهانی ڕووەك و شیناورد دەكات، تەماشای عالەمی ژیانداران و زیندەوەران دەكات، هەرچی تەماشای دەكات، هەمووی بەوپەڕی ڕێك و پێكیی و وردەكاریی هێندراوەتە دی و، خوا ﷻ هەر شتێكی خوڵقاندوویەتی بە باشترین شێوە

خوڵقاندوویەتی، بۆ وێنە: لە زیندەوەران دوو پشکی بە جۆرێك دروستکردوە کە باشترین شێوەیە، بەڵێ دووپشك بەزەرە، هەروەها مار بۆ ئێمە بەزەرە، کە مەرج نیە تەنیا زیان و زەرپشیان هەبێ، سوودیشیان لێ وەردەگیرێ، بەڵام بۆ دوو پشك و مار، بەو شێوەیەی خوا خوڵقاندوونی، باشترین شێوەیە، هەروەها بۆ ئاژەڵان و، بۆ کۆی زیندەوەران و، بۆ گەردوون و خۆر و زەوی و مانگ و... هتد.

٤- بەرد بارانکردنی شەیتانەکان، بە پارچەکانی ئەستێرەو خڕۆکەکانە، نەك خودی خۆیان، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۝٥﴾، واتە: کردوومانن، (ئەو ئەستێرە خڕۆکانەمان کردوون) بە چاوگ بۆ لێوە بەرد بارانکردن و بڵێسە بارانکردنی شەیتانەکان، نەك خودی ئەستێرەو خڕۆکەکان خۆیان، ئێستا دەرکەوتوە کە ئەو پارچانەی لە خڕۆکەو ئەستێرەکان دەبنەوە، ئەستێرەکان لە ئەنجامی ئەوەدا کە دەتەقنەوە، پارچەیان لێ دەبنەوە، هەروەها خڕۆکەکان لە ئەنجامی خولانەوەو سووڕان دا، پارچەیان لێ دەبنەوەو، ئەو پارچانەش کە دێنە نێو مەودای هێزی کێشکردنی زەوی و بەرگە هەوای زەوییەوە، ئەوانەن کە وەك بڵێسە ئاگر دەردەکەون بۆ ئێمەو، جاری واش هەیە بە قەبارەی جۆراو جۆر دەکەونە سەر زەوی، کە ئێمە لە هەر کام لە تەفسیری سوورەتەکانی: **(الحجر و الشعراء و الصافات)**دا، لەو بارەوە قسەمان کردوە، کە چۆن شەیتانەکان بەهۆی ئەو بڵێسانەوەو، لەلایەن فریشتەکانیشەوە - وەك دوایی لە تەفسیری سوورەتی **(الجن)**یشدا، جارێکی دیکە پێی دەگەینەوە - تیر باران و بەرد باران دەکرێن، بۆ ئەوەی گوێ نەگرن لە قسەی فریشتان و، زانیاریی و هەواڵی ئاسمان لە فریشتەکانەوە نەدزن و، نەیهێنن بۆ کاهین و فاڵچییەکان.

٥- هەر کام لە مردن و ژیان، پێویستن، لەم بارەوەش بە چاکم زانی کە لەبەر ڕۆشنایی بەرگی دوازدەیەمی تەفسیری **(الجواهر في تفسير القرآن)**ی **(جوهري طنطاوي)**دا[1]، چەند سەرنجێکی خێرا بدەم لە دیاردەی ژیان و مردن، کە هەردووکیان پێویستن و

---

(١) ص: (٢٢٩ - ٢٣١).

خوای زاناو كارزان كە دایناون، لەبەر ئەوەیە كە مرۆڤ و ژیانداران، پێویستییان بە هەردووكیان هەیە، هەم بە ژیان، هەم بە مردن، لێرەدا كورتەی قسەكانی وی دێنم:

بێگومان حاڵەتی مردن و ژیان، لە نێو ژیانداران و لە نێو ڕووەكاندا، هەروەها هەر ئەو دووانەش ژیان و مردنیان بەسەردا دێ، ئنجا خوا ﷻ هەم ڕووەك، هەم ژیاندارانی یەكجار زۆر كردوون، تاكو ئەو زۆرییە قەرەبووی مردنەكەیان بۆ بكاتەوە، هەروەها مردنیشی بۆ داناون، بۆ ئەوەی ئەو مردنە جار جار سەر زەوییان لێ پاك بكاتەوە، ئەگەرنا بە دڵنیایی سەر زەوی هەمووی دادەگیرا بە ژیانداران و ڕووەكان، ئەگەر هاتباو مردن و حاڵەتی لە بەین چوونیان نەبووایە، ئێمە لەو بارەوە دوازدە (١٢) كورتە سەرنج دەدەین:

١- تۆوی دارخورما، هەروەها تۆوی گەنمەشامیی، ئەو دووانە، تۆوەكەیان هێندە زۆرە، ئەگەر هاتباو هەرچی تۆوی دارخورمایەو، هەرچی تۆوی گەنمەشامییە، هەمووی ڕوابایە، هەموو سەر زەوی دادەپۆشی و، بواری جموجۆڵ بۆ هیچ شتێكی دیكە نەدەمایەوە.

٢- ماسیی، ئەو گەرایەی لەنێو خۆیدا هەڵیگرتوە، كە بە عەرەبیی (**بطروخ**)ی پێ دەڵێن، هێندە زۆرە، ئەگەر هاتباو ئەو گەرای ماسییە، هەمووی بووبایە ماسیی، یانی: دەرفەتی بۆ ڕەخسابایەو، نەمردبایە، دەریا هەمووی دەبوو بە ماسیی، یەك پارچە ماسیی، چونكە هەر مێینەیەكی ماسی لە ساڵێدا، دوو ملیۆن گەراو هێلكە دادەنێ، ئنجا ئەگەر ئەو گەرایانە هەموویان بووبانە ماسیی، لە ماوەی ساڵێكدا تێكڕای دەریا هەمووی دەبوو بە ماسیی.

٣- هەر كام مێشوولەو كێچ، كە دوو جۆرە زیندەوەری زانراون، ئەگەر هاتباو لە بەین نەچووبانایە، بە سەرماو بە گەرماو تەمەنی كورت و، مابانەوە، هەر كامێك لەوانە، هەموو سەر زەوی دادەپۆشی.

٤- زانایەك بە ناوی (ولاس)، دەڵێ: جۆرە گیایەك هەیە، هەموو ساڵێك حەوتسەدو پەنجا هەزار(٧٥٠ ٠٠٠) دەنكە تۆویی لێ پەیدادەبێ، ئنجا ئەگەر هەر یەك پنجە گیا، لەو جۆرە گیایە سێ ساڵان بەردەوام بووایە نەمردبایە، هەموو سەر زەوی دادەپۆشی.

٥- هەندێك لە زیندەوەرە وردەكان، كە میكرۆب و بەكتریایان پێ دەڵێن، ئەگەر هاتباو پێنج ڕۆژان لەسەر یەك بەردەوام بوونایەو، نەمردبانایەو، لەسەر زاووزێ بەردەوام بوونایە، ئۆقیانووسەكانیان بە قووڵایی یەك میل واتە: (١٦٠٩)م دادەپۆشی.

٦- میكرۆبی نەخۆشیی كۆلێرا كە هەر بیست (٢٠) خولەكێك، دوو چەندان دەبێتەوە، ئەگەر یەك ڕۆژی بەسەردا بڕواو لەسەر ئەو حاڵ (**منوال**)ە، بەردەوام بێ، لە ماوەی یەك ڕۆژدا، كێشەكەی دەبێ بە (٧٣٦٦)تەن و، ژمارەی ئەو میكرۆبی كۆلێرایە دەبێ بە ژمارەیەك كە ژمارە یەك دابنێی و بیست و یەك (٢١)، سفری لە پێشەوە بێ (١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠).

٧- فیل كە لە هەموو ژیانداران كەمترو سستتر زاووزێ دەكات، لە بیست (٢٠) ساڵدا یەك بە چكەی دەبێ، یەكێك لە زانایان حیسابی كردوە ئەگەر هاتبا هەر جووتە فیلێك كە بە (٢٠) ساڵ یەكێكیان دەبێ، بەردەوام بوونایە، بۆ ماوەی (٧٥٠) ساڵ، نۆزدە ملیۆن (١٩،٠٠٠،٠٠٠) بە چكە فیلیان دەبوو، واتە: ئەگەر هەموویان گەورە بوونایەو زاووزێیان كردبایە، ئەوەندە دەبوون، بەڵام دەمرن و هێندە بەردەوام نابن.

٨- كوللە جاری وا هەیە بەسەر كشتوكاڵی خەڵكدا دێ و هیچ شتێك ناهێڵێ، خوا ﷻ وای داناوە، تەمەنیان كورتەو هەر كات زۆریش بوون، هەندێكیان هەندێكیان دەخۆن، چونكە ئەگەر بێت و هەر بەردەوام بن و بژین، هەرچی شینا وردە لەسەر زەوی نایهێڵن.

٩- مەحاڕ، كە قۆزاخەو گوێچكە شەیتانی پێ دەڵێن، لە ساڵێك دا شەست ملیۆن (٦٠،٠٠٠،٠٠٠) هێلكە دادەنێ، ئنجا ئەگەر هاتباو هەموویان مابانەوەو بۆ ماوەی ساڵێك، دوو ساڵ، بەردەوام بوونایە، قەبارەكەی لە گۆی زەوی گەورەترو دەبوو.

١٠- مێش كە ژیانی ئینسان تێكدەداو هەر مێینەیەكی مێش، پێنج تاكو شەش جار زاووزێ دەكات و، هەموو جارێ (١٢٠ - ١٥٠) گەرا دادەنێ، ئەگەر هەموویان ژیابانایە، بە دڵنیایی سەر زەوی تێكڕا دەبوو بە مێش، ئەگەر گریمان هەر مێشێك بۆ ماوەی مانگێك ژیابایە، بەڵام مێش تەمەنی چەند ڕۆژێكە.

**١١-** هەندێك لە ژیانداران لەسەر هەندێكیان دەژین، بۆیە ئەگەر یەكێكیان كە خۆراكی ئەوەی دیكەیە، نەما، یانی: خۆراكەكەی نەما، ئەوەی دیكەش نامێنێ، بۆ وێنە: مارەكان لە هەندێك لە وڵاتاندا لەسەر جرج و مشك دەژین، بۆیە ئەگەر جرج و مشكەكان نەمان، مارەكانیش دەمرن، چونكە خۆراكیان نامێنێ، دیسان ئەگەر پشیلە هەبن و مشك و جرجەكان بخۆن، دیسان خۆراكی مارەكان نامێنێ و، مارەكانیش لە بەین دەچن، كە ئەوەش جۆرێكە لە هاوسەنگیی، كە خوا ﷻ لە نێوان ژیاندارەكاندا هێناویەتە دی.

**١٢-** میكرۆبی نەخۆشیی مەلاریا، تەنیا لە ڕێی مێشوولەوە نەقڵ دەبێ، مێشوولەی (ئەنۆفلس)، ئنجا ئەگەر ئەو جۆرە مێشوولەیە نەبوو، نەخۆشیی مەلاریاش كە میكرۆبەكەی لە ڕێی ئەوەوە بڵاودەبێتەوە، ئەویش بڵاو نابێتەوە، بۆیە وەختێك ئەو مێشوولەیە، دەرمانێكی بۆ بەكاردەهێنرێ كە نەهێڵدرێ، مانای وایە ڕێگا دەگیرێ لە بڵاو بوونەوەی ئەو نەخۆشییەش.

كەواتە: هەم ژیان و هەم مردن، خوای كاربەجێ پەروەردگار بە هاوسەنگیی دایناون، هۆكارەكانی ژیانی زۆر كردوون و هۆكارەكانی مردنیش و، ئەو هاوسەنگییەش لە نێوان ژیان و مردندا، كە خوا ﷻ دایناوە بە سیستمێكی زۆر وردەو، بەهۆی ئەوەوەش ژیانی مرۆڤ دەگونجێ لەسەر زەوی بەردەوام بێ.

## مەسەلەی دووەم:

**بێبڕوایـان سـزای دۆزەخ چاوەڕێیانـەو، کاتێـك فـڕێ دەدرێنـە نێـوی، گرفـەو لرفـەی دەبیسـتن و دەکوڵـێ و، نیزیکـە لـە تووڕەیـی و پەسـتییان بەرانبەریـان، بپچڕێ و لێك بێتـەوە، هـەر کات پۆلێك لە بێبڕوایـان خرانە نێوی، دۆزەخەوانەکان لێیـان دەپرسـن: ئایـا ترسـێنەرو ورياکەرەوەتـان بـۆ نەهـات لەلایـەن خـواوە؟، ئەوانیـش دەڵێـن: بـا، ئنجـا دانیشـی پێدادێنـن، کـە ئەگـەر بیسـتبایان و فامیبایـان، بـەو دەردە نەدەچـوون:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۖ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون بە پەروەردگاریان، ئازاری دۆزەخ و خراپترین چارەنووسیان بۆ هەیە.

(ل)ی سەر ﴿ وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ﴾، (لَام التَّمْلِيْك)ە، واتە: ئەوانە دەبنە خاوەنی ئازارو سزای دۆزەخ، ئازارو سزای دۆزەخیش خراپترین شوێنە، خەڵکی بۆ لا بگەڕێتەوە، (الْمَصِيْر): ئەو شوێنەی خەڵك بۆی دەچێ، یان ئەو کاتەی خەڵك تێیدا کۆدەبنەوەو بۆی دەچن.

کـە دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بێبـڕوان بـە پەروەردگاریـان ئـازارو سـزای دۆزەخیـان بـۆ هەیـەو خراپتریـن سـەرەنجامە، واتـە: بێبـڕوان لـە جنـد و لـە مـرۆڤ، وەك لـە ئایەتـەکانی دیکـەدا هاتـوە.

ئنجا بزانین حاڵ و بارودۆخیان چۆنە! کە دەچن بەرەو دۆزەخ:

٢)- ﴿ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا ﴾، کاتێك فڕێ دەدرێنە تێی، تێیفڕێ دەدرێن، گوێبیستی (**شَهِيْق**) دەبن، لە لایەن دۆزەخەوە، (**شَهِيْق**)، (**إِدْخَالُ النَّفَسِ إِلى الصَّدْرِ وَالزَّفِيْرُ إِخْرَاجُهُ**)، (**شَهِيْق**): بریتیە لە هەناسە هەڵمژین، (**زَفِيْر**)یش بریتیە لە هەناسەدانەوە، کاتێك تێیفڕێ دەدرێن، گرفەو لرفەو هاشەو لووشەی دێ، چونکە (**شَهِيْق**): بریتیە لە هەناسە هەڵمژین، کاتێك تێیفڕێ دەدرێن، هەڵیان دەلووشێ، (**لَهَا**) لە: ﴿ سَمِعُواْ لَهَا ﴾دا، (**فِي مَحَل نَصْبٍ عَلَى الحَال**)، یانی: لە حاڵێکدا، (**كَائِنَاً لَهَا**)، ئەو هەناسە هەڵمژین (**شَهِيْق**)ە، هی دۆزەخە.

٣)- ﴿ وَهِيَ تَفُورُ ﴾، لە حاڵێك دا قوڵپە دەدات و دەکوڵێ، ئەمیش دیسان (**فِي مَحَل نَصْبٍ عَلَى الحَال**): (**أي: وَالحَال أنَّهَا تَغْلِي وَتَضْطَرِب**)، لە حاڵێکدا کە قوڵپ دەداو دەکوڵێ و دێت و دەچێ، چاوگی (**تَفُوْر**)یش (**فَوْرٌ**) و (**فَوَرَان**)ە.

٤)- ﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِ ﴾، نیزیکە لە پەستیی و تووڕەییان لێکبێتەوە، یانی: (**تَكَادُ تَتَقَطَّعُ وَيَنْفصل بَعْضُهَا عَن بَعْض**)، خەریکە دەپچڕێ و هەندێکی لە هەندێکی جیادەبێتەوە، (**الغَيْظُ: أَشَدُّ الغَضَب**)، (**الغَيْظ**)، ئەوپەڕی تووڕەیی و پەستیی و ڕق لێ هەڵسانە، وشەی (**تَمَيَّزُ**)، بە دوو جۆری دیکەش خوێندراوەتەوە: (**تَمِيْزُ**) و(**تَمَايَزُ**)، هەر سێکیان واتایان لێك نزیکە، واتە: لە داخ و خەفەت و زۆر پەستیی و قەڵسییان، خەریکە لێك بێتەوە، لە هەموو زمانەکاندا ئەو تەعبیرە هەیە، بۆ وێنە: لە کوردییدا دەڵێ: فڵانکەس خەریکە لە داخ و خەفەتان بپچڕێ، خەریکە لێك بێتەوە، خەریکە شەق دەبات، یەکێ دەڵێ: خەریکە شەق دەبەم.

٥)- ﴿ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ ﴾، هەر کاتێك پۆلێك (لە بێبڕوایان) خرانە تێی، تێیفڕێدران.

(**كُلَّمَا**)، لە دوو وشە پێکهاتوە: (**كُلّ**) و (**مَا**)، واتە: (**فِي كُلِّ وَقْتِ إِلْقَاء فَوْجٍ، سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا**: ﴿ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ ﴾)، لە هەر کاتی تێفڕێدانی کۆمەڵێکدا بۆ نێوی، دۆزەخەوانەکان یان سەرپەرشتیارانی دۆزەخ لێیان دەپرسن، لەو کۆمەڵە خەڵکە.

لـە ڕستەی پێشـێدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ ﴾، زانایـان دەڵێـن: لـە ڕووی ڕەوانبێژییـەوە، لێـرەدا دۆزەخ چوێـنراوە بـە کەسـێکی زۆر تـووڕەو زۆر ڕق هەڵسـاو، کـە هـەر شـتێك ڕقـی هەڵسـاندوەو پەسـت و تـووڕەی کـردوە، تۆڵـەی لـێ بسـتێنێ.

ئنجا هەر کاتێك کۆمەڵێك تێیفڕێ دران:

٦)- ﴿ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ ﴾، دۆزەخەوانەکان لێیان پرسین، واتە: سەرپەرشتیارەکانی دۆزەخ، چونکە (**خَزْنَة**)، کۆی (**خَازِن**)ە، یانی: کۆکەرەوە، (**وَأَصْلُ الْخَازِن: الَّذِي يخزنُ شَيْئًا، أَيْ: يَحْفَظُهُ فِي مَكَانٍ حَصِينٍ**)، وشەی (**خَازِن**)، بە مانای کۆکەرەوە دێ، ئەو کەسەی شتێك لە شوێنێك کۆ دەکاتەوەو دەیپارێزێ، خوای کاربەجێ لێرەدا وشەی (**خَزَنَة**)ی بەکارهێناوەو لە شوێنی دیکەدا، وشەی: (**الزَّبَانِيَّة**)ی بەکارهێناوە، لە سوورەتی (**العلق**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ ﴾، یانی: با ئەو خەڵکی کۆڕو مەجلیسەکەی خۆی بانگ بکات کە هاوکاری بن، ئێمەش (**الزَّبَانِيَّة**)، بانگ دەکەین (**زبَانِيَّة**)ش ناوونیشانی ئەوانەیە کە سەرپەرشتیی دۆزەخ و سزادانی بێبڕوایان و خراپەکاران دەکەن، لە دۆزەخدا، ئەوانەش ژمارەیان زۆر زۆرە، بەڵام بەرپرس و سەرپەرشتیارانیان نۆزدەن، وەك خوا دەفەرموێ: ئەوانەی دۆزەخ سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن نۆزدەن: ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾**المدثر**، ئنجا دۆزەخەوانەکان لێیان دەپرسن.

٧)- ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴾، {ئەمە پرسیارکردنێکە بۆ سەرزەنشتکردن و پەشێمان کردنەوەو سەرکۆنە کردن}، ئایا ترسێنەرو ورياکەرەوەتان بۆ نەهات؟ وشەی (**نَذِيْرٌ**)، لێرەدا بە مانای (**مُنْذِر**)ە، چونکە وشەی (**نَذِيْرٌ**)، دەشگونجێ بە مانای (**إِنْذَار**) بێ و، چاوگ بێ، بەڵام لێرەدا ناوی بکەر (**اسْم فَاعِل**)ەو، بە مانای (**مُنْذِر**)ە، ئایا ترسێنەرو وریاکەرەوەتان بۆ نەهات، ئایا کەس نەهات ئاگادارتان بکاتەوەو بتانترسێنێ؟.

٨)- ﴿ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ ﴾، گوتیان: با، بە دڵنیایی وریاکەرەوەو ترسێنەرمان (لەلایەن خوای پەروەردگارەوە) بۆ هات.

(بَـلَى: يُفِيْـدُ نَقِيْـضَ النَّفْـيِ فِي الإسْـتِفْهَام، فَجُمْلَـة: ﴿قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ﴾، تَأكِيْـدٌ)، ﴿قَالُوا۟ بَلَىٰ﴾، گوتیـان بـا، وشـەی (بَـلَى)، مانـای پێچەوانـەی ئـەوە دەگەیەنـێ کـە لابـراوە، ﴿أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ﴾، ئایـا ترسـێنەرتان بـۆ نەهاتـوە؟ گوتـراوە: (بَـلَى)، ئەمـە هەڵوەشـاندنەوەی لابـردن (نفي)ەکەیـە، واتـە: بـا، بەپێچەوانـەوە ترسـێنەرو وریاکەرەوەمـان بـۆ هـات، بۆیـە دوایـی کـە دەفەرمـوێ: ﴿قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ﴾، ئەمـە بـۆ جەختکردنـەوەو زیاتـر تـۆخ کردنـەوەی مانـای (بَلَى)یـە، ئەگەرنـا هـەر فەرمووبـای: (بَـلَى)، بـا، بۆمـان هـات، تـەواو بـوو، بـەڵام جەختـی دەکاتـەوە: ﴿قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ﴾، بـە دڵنیایـی ترسـێنەرو وریاکەرەوەمـان بـۆ هـات.

٩)- ﴿فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ﴾، کەچی ئێمە بە درۆمان داناو گوتمان: خوا هیچ شتێکی دانەبەزاندوە، (فَكَذَّبْنَا)، یانی: (فَكَذَّبْنَاهُ)، لێرەدا وەك لە قورئاندا بە زۆریی وایە، بەرکارەکەی قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی دەزانرێ (فَكَذَّبْنَا)، یانی: (فَكَذبْنَاهُ) أو (فَكَذَّبْنَا النَّذِيْر)، ئێمە ئەومان بە درۆ دانا، یاخود: ترسێنەرو وریاکەرەوەکەمان بە درۆ دانا، ﴿وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ﴾، گوتمان: خوا هیچ شتێکی دانەبەزاندوە، (مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ: أي مَا نَزَّلَ الله شَيْئَاً مِنَ التَّنْزِيْل)، واتە: خوا هیچ شتێکی لە قورئان دانەبەزاندوە، ئەی بابای ترسێنەرو وریاکەرەوە! تۆ لە خۆتەوە قسە دەکەی، قسەی گیرفانی خۆتە دەری دێنی.

١٠)- ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ كَبِيرٍ﴾، ئێوە تەنیا لە گومڕاییەکی گەورە دان، یانی: هەر کۆمەڵێك لە بێبڕوایان بە ترسێنەرەکەی خۆیانیان گوتوە: خوا هیچی دانەبەزاندوەو تۆ هەر لە خۆتەوە قسە دەکەی، کەواتە: هەموو کافرە دۆزەخییەکان، بە کۆی ترسێنەرو وریاکەرەوەکانیان «کە پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)» گوتوە: ﴿إِنْ أَنتُمْ﴾، یانی: (مَا أَنْتُمْ إلاَّ فِي ضَلَالٍ كَبِيْر)، چونکە (نزير) بە تاك هاتوە، بەڵام هەر کۆمەڵێك بە پێغەمبەرەکەی خۆیان گوتوە: خوا هیچی دانەبەزاندوە، کەواتە: بە کۆ پێیان گوتوون: ئێوە ئەی ترسێنەرو وریاکەرەوەکان، لە گومڕاییەکی گەورەدان، لێرەدا وشەی (كَبِيْر) کراوە بە سیفەت بۆ (ضَلَال)، هەرچەندە وشەی (كَبِيْر)، واتە: گەورە بۆ شتی جەستەیی و بەرهەستە کە دەبینرێ، بەڵام لێرەدا کە بەکارهێنراوە، یانی: زۆر بەهێزو ئەوپەڕی

توندو سەخت، واتە: ئێوە لە گومڕاییەکی زۆر بەهێز و سەخت و پتەو دان، یانی: ئەگەر گومڕاییەکەتان جیسم بووایە، کەلەشێکی زۆر گەورەی دەبوو، ئەو گومڕاییەی ئێوە تێیدان، زۆر زەبەلاح و بێڕەزایە.

١١)- ﴿ وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ ﴾، {ئەوانەی لە دۆزەخدان، سزادراوەکان}، گوتیشیان: ئەگەر کاتی خۆی بیستبامان یان فامیبامان.

١٢)- ﴿ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، ئێستا لە نێو هاوەڵانی کڵپە (ی دۆزەخ)دا نەدەبووین.

کە دەڵێن: ﴿ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ ﴾، مەبەستیان پێی بیستنێکە کە مرۆڤ لێی بەهرەمەند بێ، ئەگەرنا بێگومان گوێیان هەبووەو، قسەیان بیستوەو، عەقڵ و هۆشێکیشیان هەبووە بەکاری بێنن، بەڵام ئەگەر ئەو بیستنە، نەبێتە هۆی ئەوەی تۆ پەیامی خوا ببیستی، ئەو پەیامی خوایەی باسی حیکمەتی بوونی تۆ دەکات و، بووناسیی ڕاستەقینەت بۆ باس دەکات و لێت حاڵیی دەکات: تۆ لە کوێوە هاتووی و، بۆچی هاتووی و، دەبێ چۆن بژی و، بۆ کوێ دەچی؟ ئەگەر ئەوە نەبیستی کە لەلایەن خاوەنی خۆتەوە بۆت نێرراوەو، ترسێنەرو وریاکەرەوەی بۆ ناردووی و ئەو ڕاستییانە، ئەگەر لەویان وەری نەگری و، گوێ ڕانەدێری بۆ پەیامی خوا، هەروەها تێنەگەی و عەقڵی خۆت بەکارنەهێنی، یانی: نە لە خەڵکی دیکە ببیستی و، نە عەقڵ و هۆشی خۆشت بەکاربێنی، بە دڵنیایی سەرەنجامت خراپ دەبێ، واتە: ئێمە ئەگەر لە خەڵکی دیکەمان بیستبایە، یان خۆمان بیرمان کردبایەوەو، هۆشمان دابایە ئەو پەیامەی خوا، یان ئەگەر خۆشمان هۆشمان نەدابایە پەیامی خوا، لە کەسانێك کە لەو پەیامە تێگەیشتوون، گوێمان بۆ گرتبانایە، ﴿ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ ئێستا لە نێو هاوەڵانی کڵپەی دۆزەخدا نەدەبووین.

١٣)- ﴿ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ ﴾، ئنجا دانیان بە گوناهەکەیان داهێنا، (ف)، بە (**فَاء الفَصِيْحَة**)، ناو دەبرێ (**لأَنَّهَا تُفْصِح عَمَّا قَبْلَهَا**)، چونکە هی پێش خۆی دەگەیەنێ، واتە: سەرەنجام

ئێمە عەقڵی خۆمان بەکارنەهێناو، گوێشمان نەگرت، ئەو وریاکەرەوەیەش کە خوا بۆی ناردبووین، ئەویشمان بە درۆ داناو گوتمان: خوا هیچی دانەبەزاندوە، ئیدی سەرەنجام بەو دەردە چووین کە ئێستا بەدەستیەوە دەناڵێنین.

١٤)- ﴿فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾، ئنجا دووریی بۆ هاوەڵانی کڵپەی دۆزەخ، (**وَالسُّحْقُ: اسْمُ مَصْدَرٍ مَعْنَاهُ الْبُعْدُ، وَهُوَ هُنَا نَائِبٌ عَنِ الْإِسْحَاقِ، لِأَنَّهُ دُعَاءٌ بِالْإِبْعَادِ، فَهُوَ مَفْعُولٌ مُطْلَق نَائِبٌ عَنْ فِعْلِهِ، أَيْ أَسْحَقَهُمُ اللَّهُ إِسْحَاقًا**)، (**سُحْق**)، ناوی چاوگە، بە مانای دووریی، بەڵام لێرەدا وشەی (**سُحْق**)، کە ناوی چاوگە لە شوێنی (**إِسْحَاق**)، دانیشتوەو پاڕانەوەیە بۆ دوورخستنەوەو، بەرکاری ڕەهایە و لە جێی کردارەکەیەتی، یانی: (**أَسْحَقَهُمُ اللَّهُ إِسْحَاقًا**)، خوا ﷻ دووریان بخاتەوە (یان دووری خستنەوە)، بە دوورخستنەوە، یانی: دووریی لە خواوەو دوورخستنەوە بۆ هاوەڵانی کڵپەی دۆزەخ.

بێگومانیش ئەم ڕستە قورئانییە، ئەم ئایەتە موبارەکە، هەڵدەگرێ زۆر قسەی لەسەر بکرێن: دۆزەخییەکان دان بەوەدا دێنن، کە نە بیستوویانەو نە فامیویانە، مرۆڤ یان دەبێ خۆی عەقڵ و هۆشێکی هەبێ، بە کاری بێنێ بۆ لێتێگەیشتنی پەیامی خوا، یان دەبێ گوێ ڕادێرێ بۆ کەسانێك کە لە پەیامی خوا تێگەیشتوون.

بە واتایەکی دیکە مرۆڤ یان دەبێ بۆ خۆی بە ڕێیە بزانێ، یان دەبێ گوێ بۆ کەسانێ بگرێ کە بە ڕێیە دەزانن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾النحل، لە زانایان بپرسن، لە خاوەنانی زانست بپرسن، ئەگەر نازانن، یان دەبێ بۆ خۆت بزانی، یان دەبێ لە کەسێك کە زانایە پرسیار بکەی، بەڵام خۆشت نەزانی و لە زانایانیش نەپرسی، بە دڵنیایی لە نەفامیی و بێئاگایی و نەزانییدا دەمێنیەوە.

مەسەلەی سێیەم:

**ئەوانـەی بـە پەنامەكیـی و نادیاریـی لـە پەروەردگاریـان سـامكردوون، لێبـوردن و پاداشـتی گەورەیـان هەیـەو، خـواش قسـەی چپـەو بـەرز، وەك یـەك دەبیسـتێ و، ناشـگونجێ بـە دیهێنـەری پەنهانزانـی شـارەزا، هەمـوو شـتێك نەزانـێ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾ وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی سام و هەیبەتیان هەیە، بەرانبەر بە پەروەردگاریان بە پەنامەكیی، لێبوردن و كرێ و پاداشتێكی گەورەیان هەیە، دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی بێبڕوایانی نەفام و نەبیستی كرد، ئنجا باسی بڕواداران دەكات، بەڵام زۆر بە كورتیی پێناسەیان دەكات و، دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئەوانەی سامیان هەیە بەرامبەر بە پەروەردگاریان، (**الخَشْيَةُ: الخَوْفُ المَشُوبُ بَالتَّعْظِيْم**)، (**خَشْيَةُ**) ترسێكی تێكەڵە بە مەزن گرتن، بۆیە من وشەی (**خَشْيَة**)م، بە مانای سام و هەیبەت بەكارهێناوە، سام لە پەروەردگاریان، هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، كە دەشفەرموێ: (**بِالغَيْب**)، بە پەنامەكیی، یەكێك لە زانایان دەڵێ: (**بِالغَيْب: حَالٌ مِنَ الفَاعِل أو مَّن المَفْعُول**)، یانی: (**بالغيب**) حاڵە لە بكەر یان بەركار:

أ- (**خَاشِيْنَ رَبَّهُم وَهُم غَائِبُون عَنْهُ**)، سامیان هەیە بەرانبەر بە پەروەردگاریان لە حاڵێكدا كە نادیارن لە پەروەردگاریان، واتە: لە حاڵەتی پەنامەكیی دان.

ب- (**خَاشِيْنَ من ربِّهم وَهُو غَائِب عنهم**)، سام و هەیبەتیان بەرانبەر پەروەردگاریان هەیە، لە حاڵێكدا كە پەروەردگاریان نادیارە، لە پەنامەكییدایەو نایبینن.

یەكـەم: واتـە: خۆیـان لـە شـوێنێكن كـە كـەس نایانبینـێ، كەچـی سـام و هەیبەتیان بەرامبـەر بـە پەروەردگاریـان هەیە.

دووەم: پەروەردگاریان هەرچەندە ناشیبینن، سام و هەیبەت و ترسیان بەرامبەری هەیە، وەك لە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺدا هاتوە، دەفەرموێ: {سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ} (**أخرجه البخاري: ١٤٢٣، ومسلم: ١٠٣١**)، حەوتەمیان: {**وَرَجُلٌ ذَكَرَ الله خَالِياً فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ**}، پیاوێك لە شوێنێکی چۆڵدا یادی خوا دەکات و، چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دێ، کە کەسیش نایبینێ، هەروەها خوای بەرزی مەزن بۆ ئێمەی ئەهلی دنیا، بە چاوی سەر نایبینین و، لە حاڵەتی پەنامەکیی و نادیاریی دایە.

دەشگونجێ (**بِالغَيْب**)، وێڕای ئەو دوو واتایە، دوو واتای دیکەشی هەبن و سەرجەم دەبنە چوار مانا:

**١-** واتای یەکەمیان: لە حاڵێکدا کە نادیارن، لە پەروەردگاریان یانی: خۆیان لە شوێنێکی پەنامەکیی و نا دیارو پەنهانن.

**٢-** مانای دووەم: یاخود لە حاڵێکدا کە پەروەردگاریان لێیان پەنهانە.

**٣-** مانای سێیەمیان: سامیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، لە حاڵێکدا کە سزاو ئازاری پەروەردگاریان نابینن و، سزاو ئازارەکەی لێیان پەنهانە.

**٤-** مانای چوارەمیشیان: بە دڵ لە پەروەردگاریان دەترسێن، چونکە دڵ و دەروونی مرۆڤ پەنهانە، واتە: بە پەنهان و دیوی نەدیتراو و نەبینراویان، سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، نەك بە ڕواڵەت و جەستە.

﴿مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾، مادام وشەی (**كَبِيْر**) کراوە بە ئاوەڵناو (**وصف**) بۆ (**أجرٌ**)، پاداشتێکی گەورە، کەواتە: وەسفەکە دێتەوە بۆ (**مَغْفِرَة**)ش، یانی: (**مَغْفِرَة كَبِيْرَة**)، لێبوردنێکی گەورە، یان (**مَغْفِرَة عَظِيْمَة وَأَجْرٌ كَبِيْر**)، لێبوردنێکی مەزن و پاداشتێکی گەورە، وەك پێشتریش گوتمان: لێرەدا وشەی (**كَبِيْر**)، کە لە ئەصڵدا سیفەتە بۆ تەنەکان، بۆ جەستەکان، خوا ﷻ بە کاری هێناوە بۆ زۆریی و مەزنیی و باشیی و پەسندیی، کە دەفەرموێ: (**كَبِيْر**)، واتە: پاداشتێکی گەورەی وا کە ئەندازەکەی نازانرێ.

ئنجا خوا بە گشتیی مرۆڤەکان دەدوێنێ:

**٢)-** ﴿وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓ﴾، قسەکەتان پەنهان بکەن، یاخود دەنگی پێ بەرز بکەنەوە، (یەکسانە)، (**ظَاهِرُهُ: الأَمْرُ بالإِسْرَارِ وَالإِجْهَار، وَمَعْنَاهُ: لِيَسْتَوِ عِنْدَكُم إِسْرَارُكُمْ وَإِجْهَارُكُمْ، فَإِنَّهُ فِي عِلْمِ اللهِ سَوَاء**)، ﴿وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓ﴾ ڕواڵەتەکەی فەرمانکردنە بە قسەی پەنهان و قسەی دەنگی بەرز، بەڵام مانایەکەی ئەوەیە: با لە لاتان یەکسان بێ، قسەی پەنهان و چپەتان، لەگەڵ قسەی دەنگی بەرزتان، چونکە لە زانیاریی و لە پێزانینی خوادا یەکسانن.

**٣)-** ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، (خوا نەك هەر قسەی چپەو قسەی دەنگی بەرز دەبیستێ بەڵکو)، بە دڵنیایی زانایە بە هاوەڵی سینەکان، (**ذَات**)، بە مانای (**صَاحِبَة**) دێ، (**صُدُور**)یش، کۆی (**صَدْر**)ە، واتە: سینەکان، ئنجا کە لێرە دەفەرموێ: ﴿عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾:

**أ-** (**عليم**)، ڕێژگەی (**الفَعِيل**)ە.

**ب-** (**صُدُور**)یش، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرەو، مانای تێکڕاو هەمەگیر (**إِسْتِغْرَاق**) دەگەیەنێ.

**ج-** هەروەها وەسفکردنی نیازو خولیاو مەبەستەکان، بەوە کە هاوەڵی سینەکانن، هەمووی زۆر زێدەڕۆیی تێدایە، بۆ ئەوە کە خوا ﷻ هیچی لێ پەنهان نابێ، وەك جاری دیکەش گوتوومانە: خوا ﷻ نهێنییەکان و خولیاو بیرو فیکرەکان کە لە عەقڵ و هۆشەکان دان، بە (**ذَاتِ الصُّدُور**) ناوی بردوون واتە: (**صَاحِبَةُ الصُّدُور**)، هاوەڵی سینەکان، چونکە لە سینەکان جیانابنەوە، دیسان (**صَاحِب**)، بە مانای خاوەنیش دێ، وەك بووبنە خاوەنی سینەکان، یان هەمیشە هاوەڵی سینەکانن و لێیان جیانابنەوە، لە جیاتی بفەرموێ: (**إِنَّهُ عَلِيْمٌ بِالنَّوايا**)، یان (**بِخَفَايَا القُلُوب**)، فەرموویەتی: ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، لەبەر ئەوەی ئەو خولیاو نیازو مەبەستانە، هێندە لە سینەکاندا نیشتەجێ بوون، بوونەتە هاوەڵ و هاودەمیان و لێیان جیانابنەوە.

ئنجا دوایی خوا ﷻ بەڵگە دێنێتەوە، لەسەر ئەوەی هیچ شتێك لە خوا پەنهان نابێ، دەفەرمێ:

٤)- ﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ ﴾، ئایا کەسێك کە دروستکراوەکانی دروستکردوون، نازانێ؟ بێگومان با، بە هەموو شتێکیان زانایە.

٥)- ﴿ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾، لە حاڵێکدا ئەو زۆر پەنهانزانی زۆر شارەزایە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ ﴾، مانایەکەی سێ ئەگەری هەن:

١- وشەی (مَنْ)، یان بکەر (فاعل)ی (يَعْلَم)یە، ﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ ﴾ ئایا ئەو زاتەی هێناویەتە دی، زانا نیە؟.

٢- دەشگونجێ (مَنْ)، لێرەدا بەرکار (**مفعول به**) بێ، یانی: (**أَلَا يَعْلَم الله مَنْ خَلَقَهُ**)، ئایا خوا ﷻ ئەوەی دروستیکردوە، نایزانێ؟.

٣- یاخود: ﴿ أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ ﴾ ئایا ئەو زاتەی دروستیکردوە، شتە دروستکراوەکانی خۆی نازانێ؟.

لێرەدا خوا ﷻ نکوولیی لەوە کردوە کە لە حاڵێکدا بەدیهێنەری شتەکانە، بە شتەکان شارەزا نەبێ، یاخود لە حاڵێکدا کە شتەکان بەدیهێنراوی خوان و، خوا وەدیهێنەریانە، شارەزاو ئاشنا نەبێ، ﴿ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾ لە حاڵێکدا ئەو (**لَطِيْف**)ە، (**اللَّطِيْف: العَالِمُ بِدَقَائِق الأَشْيَاء**)، (**لطِيْف**)، ئەو کەسەیە شتە وردەکان بزانێ، بەڵام وشەی (**اللَّطِيْف**)، ئەگەر بە پەنهانزان و پەنهانکار لێك بدرێتەوە باشترە، واتە: ئەو زاتەی شتە پەنهانەکان دەزانێ و، کارەکانیشی بە پەنهانیی دەکات، (**خَبِيْر**)، (**العَالِمُ بِحَقَائِقِ الأَشْيَاء**)، زانا بە چییەتی شتەکان و ئاگاداریان، بەڵام وشەی (**خَبِيْر**)، زیاتر بۆ هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان و وردەکارییەکانی کردەوەکانیان بەکاردەهێنرێ، واتە: سیفەتی زانیاریی (**علم**)ی خوا پەیوەست دەبێ بە شتەکانەوە، بەڵام سیفەتی شارەزایی (**خَبِيْر**)ی خوا، پەیوەست دەبێ بە شەخصەکان وهەڵسوکەوتەکانیانەوە، بە زۆریی لەو سیاقانەدا خوا ﷻ باسی سیفەتی (**خَبِيْر**)، دەکات.

## مەسەلەی چوارەم:

**خـوا ﷻ زەوی بـۆ جنـدو مرۆڤـان ڕام و دەسـتەمۆ کـردوەو، بـە کەیفـی خۆیـان بەلاشـان و قـەد پاڵەکانیـدا دێـن و دەچـن و، لێـی بەهرەمەنـد دەبـن، ناشـبێ دڵنیابـن کـە خـوای بـەرز بـە زەویانـدا ڕۆبچوێنـێ و، ئـەو زەوییـە لـە بنیانـدا گێـژ بخـوات و، سـەرەنجام ڕۆبچـێ، یـان بایـەکی ڕامالْکـەری چـەوو زیخیـان بنێرێتـە سـەر، بـا سـەرنجی مێـژووش بـدەن، دەزانـن خـوا ﷻ چـۆن سـزای بـە درۆ دانـەرانی پێشـووی داوە، ئەوانـەی پێغەمبـەرانی خۆیـان (عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّـلَام)و، پەیامـەکانی خوایـان بـە درۆ دانـاون:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولًا فَٱمۡشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتەنە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولًا ﴾، (باس هەر باسی خوای بەرزە)، ئەو (خوا ﷻ)، ئەو کەسەیە کە زەوی بۆ ئێوە بە دەستەمۆ گێڕاوە، **(ذَلُولًا)**، لە وشەی ، **(ذَلَّ يَذِلُّ ذِلًّا)**ەوە، هاتوە، **(الذَّلُول: المُنْقَادُ الَّذِي يَذِلُّ لَكَ وَلَا يَسْتَصْعَبُ عَلَيْك)**، **(ذَلُول)**: بریتیە لەو ئاژەڵەی بۆ تۆ دەستەمۆ دەبێ و لێت چەمووش و یاخیی نابێ و، بە ئاسانیی دێتە ژێربار، بە کوردیی مانای **(ذَلُول)** دەبێتەوە بە دەستەمۆو ڕامکراو و، پێچەوانەکەی بریتیە لە: **(صَعْب)** و **(شَمُوس)**، یانی: جەنەگرو یاخییبوو، وشەی **(ذَلُول)**، هەم بۆ نێرینەو هەم بۆ مێینەش بەکاردێ، ئەگەرنا وشەی **(أَرْض)**: لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبی، ەوە مێینەی مەجازییە، بەڵام وشەی **(ذَلُول)**، بۆ مێ و نێر، بە کاردێ.

٢)- ﴿ فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا ﴾، ئنجا بە قەدپاڵ و لاشانەكانی دا بڕۆن، (مَنَاكِب)، كۆی (مَنْكِب)ە، واتە: شان، ١- هەندێ لە زانایان ئاوایان لێكداوەتەوە: (فَامْشُوا فِي جَوَانِبِهَا)، بە تەنیشتەكانی دا بڕۆن. ٢- هەندێكیان گوتوویانە: (فِي أَطْرَافِها)، بە لایەكانی دا، ٣-هەندێكیش گوتوویانە: بەشیوو دۆڵەكانی دا بڕۆن.

٣)- ﴿ وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ ﴾، لە بژیوی وی (خوای پەروەردگار)یش بخۆن، (مَنْكِب): (مُلْتَقَى الكَتِفِ مَعَ العَضُد)، ئەو شوێنەی شان لەگەڵ قۆڵدا پێكەوە دەبەستێتەوە، یانی: (سەرشان) كە لای مل و گەردن لەگەڵ قۆڵدا پێكەوە دەبەستێتەوە، بۆیە بایەك كە لەلایەكەوە بێ و، لەلایەكی دیكەوە نەیەت، پێی دەگوترێ: (الرِّيْحُ النَّكْبَاء)، واتە: بایەك كە لە لاشانێكەوەو لە لایەكەوە دێ.

كـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ ﴾ ڕاناوەكـە بـۆ خـوای پـەروەردگار دەچێتـەوە، كـە پێشـتر هاتـوە، ﴿ هُوَ ٱلَّذِي ﴾، خـوا ﷻ ئـەو كەسـەیە كـە زەوی بـۆ دەستەمۆ كـردوون، ئنجـا ئێـوە بەلاشـان و بـە قەدپاڵـەكانی زەویـدا بـڕۆن، ﴿ وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ ﴾ واتـە: كارو كاسـبیی بكـەن، بازرگانیـی بكـەن، كشـتوكاڵ بكـەن، ئاژەڵداریـی بكـەن، بـە هەمـوو شـێوەكانی بەهرەمەنـد بـوون، لـە زەوی بەهـرە وەربگـرن و سـەرەنجام لـە بژیـوی خـوا بخـۆن.

٤)- ﴿ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾، گەڕانەوەش تەنیا بۆ لای ئەوە، یانی: (إلى الله تَعَالَى النُّشُور)، گەڕانەوە تەنیا بۆ لای خوای بەرزە، واتە: لە گەرمەی ڕۆیشتنتان و جموجۆڵتان بە زەویدا، بۆ داواكردنی بژیوی خوای بژیودەر، بە هۆی كارو كاسبییەوە، لە بیرتان نەچێ كە هەر بۆ لای خواش ﷻ بڵاوەكرێنەوەو دەگەڕێنەوە.

لێـرەدا كـە خـوا ﷻ زەوی چوانـدوە بـە وڵاخێـكی دەسـتەمۆو ڕامكـراوەوە، وەك جـاری دیكـەش گوتوومانـە: ئـەم وێچواندنـە، یەكجـار پـڕ بـە پێسـتە، چونكـە وڵاخ جموجۆڵـی هەیـەو دێـت و دەچـێ، بـەڵام كـە دەسـتەمۆ و ڕامكـراو و ملكـەچ بـێ، بارەكـەی ناخـات، ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنـێ كـە زەوییـش جموجۆڵـی هەیـە، بـەڵام

لەگەڵ ئەوەشدا ملکەچ و ڕامکراوو دەستەمۆیەو، ئەوەی لەسەر پشتیەتی فڕێی نادات و نایخاتە خوار، وەك چۆن وڵاخی دەستەمۆ، باری سەر پشتی ناخاتە خوار، پێشتریش گوتوومانە:

١- زەوی بە دەوری خۆیدا خولانەوەیەکی هەیە، بە خێرایی سی (٣٠) کم لە خولەکێکدا، کە لە سەعاتێك دا دەکاتە: ٣٠ × ٦٠ = ١٨٠٠ کلم.

٢- هەروەها سووڕانەوەیەکی بە دەوری خۆردا، بە خێرایی سی (٣٠) کم لە چرکەیەکدا هەیە، یانی: شەست (٦٠) هێندەی خولانەوەی بە دەوری خۆیدا خێراتر، بە دەوری خۆردا دەسووڕێتەوە.

٣- سووڕانەوەیەکی دیکەشی هەیە لەگەڵ خۆردا، واتە: خۆرو کۆمەڵەکەی بە دەوری خڕۆکەی ڕاوەستاو (**الكوكب الجاثي**)دا.

٤- هەروەها لەگەڵ خڕۆکەی هەڵنیشتووشدا، جارێکی دیکە سووڕانەیەکی دیکەی هەیە، بە نێو چەقی کەهکەشاندا.

٥- دیسان لەگەڵ کەهکەشانیشدا، جارێکی دیکە هەمووی سووڕانەوەیەکی دیکەی هەیە، کە هەر خوا دەزانێ چەقەکەی کوێیە، بە مسۆگەریی زەوی ئەو پێنج سوڕانەوەیەی هەن، کەچی ئێمەش ناخاتە خوار، بۆیە خوا ﷻ تەشبیهی کردوە بە وڵاخەوە و، بەراوردی کردوە لەگەڵ وڵاخێکی دەستەمۆدا.

دوایی خوا دەفەرموێ:

٥)- ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ﴾، ئایا ئێوە دڵنیاو بێ ترس بوون، لەو زاتەی لە سەرەوەیە، کە بە زەویتاندا ڕۆبەرێتە خوار.

٦)- ﴿ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴾، لە حاڵێکدا کە دێت و دەچێ و گێژ دەخوات؟!.

٧)- ﴿ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗا ﴾، یان ئایا ئێوە دڵنیابوون لەو زاتەی لە ئاسمانە (لە سەرێیە)، بایەك کە وردە بەردی تێدان، (یاخود وردە بەردان

ڕادەماڵێ و زیخ و چەو ڕادەماڵێ) بنێرێتە سەرتان؟! دەشگونجێ (**حَاصِب**)، بە مانای هەورێك بێ كە وردە بەردان لەگەڵ خۆی دێنێ، یان هەورێك كە وردە بەردی تێدان، بەسەرتاندا ببارێنێ، ئایا لەوە دڵنیابوون ئەوەتان بنێرێتە سەر؟!.

ئەگەر ئەوەتان بنێرێتە سەر، چ بە زەویتاندا ڕۆبەرێ و ڕۆبچوێنێتە خوار، چ بایەكی وا یان هەورێكی وا تان بنێرێتە سەر:

٨)- ﴿فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ﴾، ئەو كاتە دەزانن ترساندنی من و ورياكردنەوەی من چۆنە!

٩)- ﴿وَلَقَدْ كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی پێش ئەوانیش بە درۆیان دانا، چییان بە درۆ دانا؟ خوای تاك و پاك باسی نەكردوە چییان بە درۆ دانا، لەبەر ئەوەی دیارە، یانی: (**كَذَّبَ الَّذِيْنَ مِن قَبْلِهِم رُسُلَهُمْ**)، پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆ دانا، یان: (**إِنْذَارَاتِ رَبِّهِمْ، أو رِسَالاَتِ رَبِّهِمْ**)، وریا كردنەوەكانیان، پەیامەكانی پەروەردگاریانیان بە درۆ دانان.

كە دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، ئەوانەی پێش ئەوان، واتە: كۆمەڵگا بێبڕوایەكان، گەلی نووح كە نووح ﷺ پێغەمبەریان بوو، گەلی عاد كە پێغەمبەرەكەیان هوود بوو، گەلی ثەموود كە پێغەمبەرەكەیان صاڵیح بوو، گەلی مەدیەن كە پێغەمبەرەكەیان شوعەیب بوو، گەلی لووط كە پێغەمبەرەكەیان لووط بوو، سەلامی خوا لەسەر هەموویان بێ، هەروەها ئەوانی دیكەش هەموویان دەگرێتەوە، لێرە هەر بە كورتیی باسی كردوون و لە شوێنەكانی دیكە، خوای بەرزو مەزن بە درێژیی باسی ئەو گەلانەی كردوە.

١٠)- ﴿فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ﴾، ئنجا ئایا نكوڵییكردنی من چۆن بوو؟ (**نَكِيْر**)، یانی: (**إِنْكَار**)، ئایا نكووڵییكردنی من لێیان چۆن بوو، واتە: ڕەخنەگرتنی من، دوای ئەوە خواش ﷻ ڕەخنەی لە شتێك هەبێ و نكووڵیی لێ بكات، بە دڵنیایی سزادانیشی بەدوادا دێ، بەڵام لێرەدا باسی سزایەكەی نەكردوە، هەر دەفەرموێ: نكووڵیی كردنی من و ڕەخنەگرتنی

من چۆن بوو؟ یانی: بەشێوەیەك بوو كە هەر باس ناكرێ، هێندە زەبەلاح و بێڕەزا بوو، كە وەسفكردن دەوری نادات (**لَا يُحِيْطُ بِه الوَصْفُ**).

ئـەو پرسـیاركردنەش بـۆ هەڕەشـەلێكردن و بـە مـەزن پێشـاندانە (**للتَّهْدِيْـد وَالتَّعظِيـم**).

شـایانی باسـە: لـە بـارەی ئـەم دوو ئایەتـە موبارەكـەوە: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾﴾، زانایـان زۆریـان قسـە كـردوە، بـۆ وێنـە:

**١-** هەندێكیان گوتوویانە: ئەمانە لە ئایەتە موتەشابیهەكانن، واتە: چەند مانایەكی وێكچوویان هەن و لەو ئایەتانەن كە دەبێ چۆن هاتوون، ئاوا بیانخوێنینەوەو لە مانایەكەیان نەكۆڵینەوە، لەبەر ئەوەی لە سەرووی عەقڵ و ئیدراكی ئێمەیە، كە بە تەواویی مانایەكەیان بزانین، وەك لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**آل عمران**)دا، بە تەفصیلْ باسی ئایەتە موتەشابیهو ئایەتە موحكەمەكانمان كرد: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ ﴿٧﴾﴾، واتە: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە كە كتێبی دابەزاندۆتە سەر تۆ، ئایەتی موحكەماتی تێدان (واتە: مانا ڕۆشن)، ئەوان بناغەی كتێب و قورئانن، هەندێك ئایەتی دیكەشی تێدا هەن، مانای وێكچوویان هەن، واتە: زیاتر لە مانایەكیان هەیەو، مانایەكانیان ڕۆشن نین، بۆ ئێمەو مانان، یان بۆ هەموو كەس ڕۆشن نین، بە هەرحاڵ لەو بارەوە قسەمان كردوە، ئنجا هەندێ لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا: ﴿مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾ لە ئایەتە موتەشابیهەكانەو، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {**آمِنُوا بِمُتَشَابِهِهِ**} (**أخرجه مسلم: ٣٨١**)، واتە: بڕوا بێنن بە ئایەتە موتەشابیهەكانی قورئان، ئەو ئایەتانەی زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن، یان چەند واتایەكی وێكچوویان هەن، مانایەكی ڕێك و ڕۆشنیان نیە، كە یەكسەر بڵێی ئەوە مانایەكەیەتی.

**٢-** هەندێكیان گوتوویانە: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ﴾، واتە: (**أَمْرُهُ فِي السَّمَاء**)، فەرمانەكەی لە ئاسمانە.

**٣-** هەندێکیان گوتوویانە: ﴿ مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، مەبەست پێی جیبریلە، جیبریل لە ئاسمانە، لەو بارەوە زۆریان قسە کردوون.

(**البیهقي**) لە کتێبی (**الإعتقاد**)دا[1]، هێناویەتی: (**قَالَ سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ: كُلُّ مَا وَصَفَ اللَّهُ بِهِ نَفْسَهُ فِي كِتَابِهِ، فَتَفْسِيرُهُ: قِرَاءَتُهُ وَالسُّكُوتُ عنه**)، هەموو ئەوەی خوای بەرز لە کتێبەکەی خۆیدا خۆی پێ وەسفکردوە، لێکدانەوەکەی هەر ئەوەیە بخوێنرێتەوەو لێی بێدەنگ بی.

ئەوەش ڕای ئەوە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەو ڕایە بۆ هەموو ئایەتەکانی قورئان کە باسی خوای پەروەردگار دەکەن، گونجاو نیە و، ئەو گوتوویەتی: وا سەلامەتترە.

**٤-** منیش پێم وایە کە ئەمە پێویست ناکات، نە بگوترێ: ئایەتی موتەشابیهەو، نە تەئویلیش بکرێ، بەوە کە مەبەست پێی جیبریلە، چونکە ڕەوتەکە مەبەست پێی خوای پەروەردگارە، بەڵام دەڵێم: بەداخەوە زۆرێك لە زانایان وشەی (**سَمَاء**)یان، تەنیا بە مانای ئەو مەخلووقە بەکارهێناوە، کە خوای باڵا دەست لە بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ۝٧ ﴾الرحمن، واتە: ئاسمانی بەرز کردۆتەوەو تەرازووی داناوە، - کە گوتوومانە: (**سماء**) بە تاك بێ، یان بە کۆ (**سَمَاوَات**)، یان بە: ﴿ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ ﴾، مەبەست پێی کۆی ئەو دروستکراوانەیە کە خوا خوڵقاندوونی، کە ئێستا زاراوەی بوونەوەر یان گەردوون (کون)ی بۆ بەکاردەهێنرێ -- بەڵام وشەی (**سَمَاء**)، وێڕای ئەو مەخلووقە کە دەزانین سنووردارە، واتایەکی دیکەشی هەیە، کە بریتیە لە (**فَوْق**)، سەرەوە، کەواتە: ئەگەر بڵێین: ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، ئایا دڵنیان لەوەی لەسەرێیە، لە سەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، چونکە زانایان دەڵێن: (**أَللهُ مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ، بَائِنٌ عَن خَلْقِهِ**)، خوا لەسەر عەڕشی خۆیەتی (بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە)و دوورە، یاخود لە دەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، خوای بێ وێنە لە سنووری دروستکراوەکانی دانیە، کە زۆرێك لەوانەی ئیددیعای ئەوە دەکەن، بە دوای

(١) ج١، ص:١١٨.

سەلەفی صاڵح کەوتوون، ئێستاش وا حاڵیین کە دەگوترێ: خوای تاك لە ئاسمانە، واتە: ئاسمان دەوری خوای داوە!! بەڵام بە دڵنیایی خوای بێ وێنە، لەوە بەرزو مەزنترە لە نێو بازنەی دروستکراوەکانی دابێ، خوا لە دەرەوەی بازنەی دروستکراوەکانیەتی، بۆیە کات بەسەر خوادا تێناپەڕێ و، خوای بێ هاوەڵ بە شوێن تەعبیری لێ ناکرێ، کەواتە: ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ ﴾، یانی: ئایا دڵنیان لەو زاتەی لەسەرەوەیە، یانی: (**سماء**) لێرەدا بە مانای دروستکراوەکان و ئەو ئاسمانە مەخلووقە نیە کە خوا دروستیکردوە، بەڵکو بە مانای لای سەرێ، یانی: ئەو زاتەی لە سەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بە هەموو مانای سەرێ، کە بۆ خوا ﷻ شایستەیەو گونجاوە.

## مەسەلەی پێنجەم:

بەس خوا ﷻ باڵندان لە هەوادا ڕادەگرێ، کە بە باڵ پانڕاخراویی و باڵ لێکدراویی دەفڕن، هیچ کەسیش جگە لە خوای بەبەزەیی نابێتە سوپاو دەستەڵات بۆ بێبڕوایەکان، کە سەریان بخات، هەروەها ئەگەر خوا بژیوەکەی خۆی بگرێتەوە، مرۆڤەکان بە گشتیی بژیودەریان نابێ و، بابای لەپەو ڕوو ڕۆیشتوو (لەسەر دەم و چاو ڕۆیشتوو)، لەگەڵ بابای بەڕێکیی ڕۆیشتوو، لەسەر ڕێی ڕاست و بەقیت و قنجیی، یەکسان نین، کە یەکەمیان وێنەی بێبڕوایەو، دووەمیشیان وێنەی بڕوادارە، بەڵام بێبڕوایان بوغڕاو سەرکێش و سڵەمیوەوەن لە هەق:

خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ﴾، {لێرەدا پرسیار کردن، بۆ نکووڵیلێکردنە}، ئایا سەرنجی باڵندانیان نەداوە لەسەرروویانەوە! واتە: وەك چۆن خوا ﷻ زەوی دەستەمۆ کردوە بۆ مرۆڤ و جند، کە لەسەری بێن و بچن، بە هەمان شێوە هەواشی دەستەمۆ کردوە بۆ باڵندان، کە تێیدا بفڕن و بێن و بچن، هەروەك ئاویشی دەستەمۆو ملکەچ کردوە بۆ ژیاندارە ئاوییەکان، لەوێدا مەلە بکەن و بێن و بچن، ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا﴾، پرسیارکردنەکە بۆ نکووڵیلێکردنە، چونکە ئەوانە وەك کەسێك دانراون، کە نکووڵیی بکات، ئەگەرنا نکووڵییان نەکردوەو، وە نەبێ تەماشای باڵندانیان نەکرد بێ، بینیویانن و تەماشایان کردوون، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ دەرس و پەندێکیان وەرنەگرتوە، لە فڕینی باڵندان بە

نێو هەواداو، بیریان نەکردۆتەوە کە خوا ﷻ چۆن سیستمی بۆ داناون و، بە ڕێك و پێکیی ئەو باڵندانەی خوڵقاندوون، بە شێوەیەك کە بتوانن بە هەوادا بفڕن، لەبەر ئەوەی بیریان لێ نەکردۆتەوەو تێوەی ڕا نەماون، وەك هەر تەماشایان نەکرد بێ وایە.

ئنجا ئەو باڵندانەش خوا وەصفیان دەکات:

٢)- ﴿ صَـٰٓفَّـٰتٍ وَيَقۡبِضۡنَ ﴾، باڵیان پان ڕاخستوەو باڵیشیان دێننەوە یەك، (**صَافَّات: بَاسِطَاتٍ أَجْنِحَتَهُنَّ فِي الْجَوِّ عِنْدَ طَيَرَانِهَا، وَيَقْبِضْنَ أَيْ: يَضْرِبْنَ بِهَا جُنُوبَهُنَّ**)، جاری وایە باڵەکانیان لە هەوادا پان ڕادەخەن، (**وَيَقْبِضْنَ**)، جاری واش هەیە باڵەکانیان لە تەنیشتەکانیان دەدەن و دەیانهێننەوە یەك، (**صَافَّات**) کۆی (**صَافَّة**)یە، واتە: ڕیز بوو، یاخود: پانڕاخستوو، (**وَيَقْبِضْنَ**)ش بە کرداری هێناوە، چونکە باڵ پان ڕاخستنەکە، حاڵەتێکی وەستاوی هەیە، بەڵام باڵ لێکدانەکە، حاڵەتی جووڵاوی هەیە، ئەمی بە کردار (**فعل**) هێناوەو، ئەویشی بە ناو (**إسم**) هێناوە.

٣)- ﴿ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَـٰنُ ﴾، تەنیا (خوای) بە بەزەیی دەیانگرێ، هەڵبەتە مەبەست لە گرتنی خوای بە بەزەیی، بۆیان، ئەوەیە کە خوا ﷻ ئەو باڵندانەی بە شێوەیەك خوڵقاندوون بتوانن بفڕن: ئێسقانەکانیان بۆشایی تێدایە، پەڕەکانیان زۆر بەهێزن، هەروەها چۆنیەتیی فڕین، خوا ﷻ فێری کردوون، چۆن بفڕن و باڵ لێکبدەن، کەواتە: گرتنی خوا بۆیان یانی: خوا بە شێوەیەك دروستیکردوون و، هەواشی بە شێوەیەك لێکردوە، کە بتوانن پێیدا بفڕن، ئەگەرنا ئەوە نیە خوا ﷻ یەك بە یەك بچێ، دەستی بە هەر باڵندەیەکەوە بێ.

٤)- ﴿ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ بَصِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بینەری هەموو شتێکە، **(القرطبي)** دەڵێ: **(قَالَ أَبُو جَعْفَرٍ النَّحَّاسُ: يُقَالُ لِلطَّائِرِ إِذَا بَسَطَ جَنَاحَيْهِ: صَافٌّ، وَإِذَا ضَمَّهُمَا فَأَصَابَا جَنْبَهُ: قَابِضٌ، لِأَنَّهُ يَقْبِضُهُمَا)**، ئەبوو جەعفەری نەححاس گوتوویەتی: باڵندە ئەگەر باڵەکانی لێك بکاتەوە، پێی دەگوترێ: **(صَافٌّ)**، واتە: باڵ لێککردووەوە، باڵ پانڕاخستوو، بەڵام ئەگەر باڵەکانی لێك بدات لە دوو تەنیشتەکانی خۆی بدات، پێی دەگوترێ: **(قَابِض)**، واتە: باڵ پێکەوە نووسێنەر، لێرەدا خوا ﷻ بە شێوەی درێژە پێدان **(إطْنَاب)**، باسی باڵندانی کردوە، بەڵام لە سووڕەتی **(النحل)**دا، کە پێشتر هێنامان، لەوێ بە کورتیی هێناویەتی، کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنجی باڵندانیان نەداوە کە دەستەمۆو مل پێکەچکراون لە هەوای سەرێ، تەنیا خوا دەیانگرێ، لەوەدا نیشانە هەن بۆ بڕواداران، بۆچی لەوێ ئاوا بە کورتیی هاتوە؟

لە سووڕەتی **(النحل)**دا، کە پێش ئەم سووڕەتی **(الملك)**، دابەزیوە، لەوێ خوا بە کورتیی ئاگاداری کردوونەوە و لە بارەی باڵندانەوە، سەرنجی ڕاکێشاون، ئنجا کە باش بەهرەمەند نەبوون و پەندیان وەرنەگرتوە، خوا ﷻ لەم سووڕەتەدا درێژەی بۆ پێداون و، وردتر لەو بارەوە بۆیان دواوە.

ئێمە لەبەر ڕۆشنایی ئایەتەکەی سووڕەتی **(النحل)**دا، کورتە باسێکمان لە بارەی باڵندانەوە کردوە، کورتە باسێکی باشمان کردوە: باڵندەکان چەند جۆرن و پێکهاتەی باڵندەو، چۆنیەتیی فڕین و تا دوایی.

شایانی باسە: ئەم ئایەتەی ئێرە، لەگەڵ ئەوەی سووڕەتی **(النحل)**دا، چوار جیاوازییان هەن:

١- لە هی ئێرەدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ ﴿١٩﴾ ﴾، بەڵام لە هی سووڕەتی (النحل) دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ ﴿٧٩﴾ ﴾.

٢- لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ ﴿١٩﴾﴾، بەڵام لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ ﴿٧٩﴾﴾، بەڵام لێرە باسی ﴿مُسَخَّرَٰتٍ﴾، ناکات، تەنیا دەفەرموێ: ﴿فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ﴾، لەسەرووویانەوەن، باڵیان پان ڕادەخەن و باڵیشیان لێك دەدەن.

٣- لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ﴿٧٩﴾﴾، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ ﴿١٩﴾﴾.

٤- لەوێ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾﴾، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾﴾، ئەو چوار جیاوازییەیان هەن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسێکی دیکەو دەفەرموێ:

٥)- ﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ﴾، یان ئایا کێن ئەوانەی دەبنە سەرباز بۆ ئێوەو، جگە لە (خوای) بە بەزەیی سەرتان دەخەن؟ واتە: ئەگەر خوا سەرتان نەخات، کێن ئەوانەی لە جیاتی خوا، یان جگە لە خوا سەرتان دەخەن؟ لێرەشدا دیسان پرسیارکردن بۆ نکووڵیلێکردنە، واتە: کەس بۆتان نابێتە سەربازو سوپا، پشتتان بگرێ.

٦)- ﴿إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ﴾، بێبڕوایەکان تەنیا لە لە خۆبایی بووندان.

کە دەفەرموێ: ﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى﴾، ئامانجی ئەم تەعبیرە: (**تَحْقِيْرٌ لَهَا بِحَيْثُ لاَ تُعْرَف**)، ئەمە بە کەم دانانەو بێ بایەخ تەماشاکردنە، یانی: هەر نەناسراون و نازانرێ کێن! پرسیارکردنەکەش بۆ نکووڵیلێکردن و دەستەپاچە پێشاندانی ئەوانە.

(**الْغُرُورُ: ظَنُّ النَّفْسِ وُقُوعِ أَمْرٍ نَافِعٍ لَهَا بِمَخَائِلِ تَتَوَهَّمهَا**)، (**غُرُورُ**): بریتیە لەوەی مرۆڤ گومان بەرێ بەوەی هەندێ شت بۆی بە سوود دەبن، هەر بە وەهم و خەیاڵ پێی وابێ ئەو شتانە هەن و، لە واقیعدا بوونیان نەبێ.

٧)- ﴿ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ﴾، یان كێیە ئەو كەسەی بژیوتان دەدات، ئەگەر خوا بژیوەكەی خۆی بگرێتەوە؟ بژیوی خوا ﷻ پێش هەموو شتێ، تیشكی خۆرە، ئنجا هەوایە، ئنجا ئاوە، ئنجا ئەوەیە كە لە زەوی پەیدا دەبێ، ئەوە وەك بژیوی ماددیی و، بژیوە مەعنەوییەكانیش، وەحیی خوای پەروەردگارەو، ئیلهام و خورپەی فریشتەكانە كە خوا دەیخاتە دڵی بڕوادارانەوەو، عەقڵ و هۆش و هەستەوەرەكانن، یانی: ئەگەر خوا بژیوی ماددیی و مەعنەوییتان لێ بگرێتەوە، كێ بژیوتان دەدات؟!.

٨)- ﴿ بَل لَّجُّواْ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴾، بەڵكو ئەوان مكووڕ بوون لە سنوور بەزاندن و، سەرپێچیی كردن و، لە سڵەمینە لە هەقدا، (**العُتُوّ: مُجَاوَزَة الحَدّ فِي العِصْيَان، وَالتَّكَبّر وَالطُّغْيَان**)، (**عتو**) بە دوو شێوە مانا كراوە:

أ- سنوور بەزاندن لە سەرپێچییدا.

ب- خۆ بەزلگریی و یاخیبوون.

(**وَالنُّفُور: هُوَ الإشْمِئْزَازُ مِنَ الشَّيْءِ وَالْهُرُوبُ مِنْهُ**)، (**نُفُور**)، بریتیە لە بێزاریی بەرانبەر بە شتێك و ڕاكردن لێی و لێدووركەوتنەوەی، بە كوردیی ئەگەر بڵێین: (**نُفُورٌ**)، واتە: سڵەمینەوە، مانایەكەی ڕێك دێتەوە، (**لَجُّوا**)، (**اللُّجاج واللَّجُّ: الإشْتَداد فِي النِّزَاعِ وَالْخِصَامِ**)، (**لُجاج و لَجّ**)، هەردووكیان بە مانای سەختیی لە ناكۆكیی و دوژمنایەتیی و دووبەرەكییدان.

دوایی خوا دەفەرموێ:

٩)- ﴿ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ ﴾، ئایا كەسێك لەپەوڕوو لەسەر دەم و چاوی دەڕوات، ڕاستەڕێ بووە.

١٠)- ﴿ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، یاخود كەسێك كە بە قیت و قنجیی و، بە ڕێكیی دەڕوات لەسەر ڕێیەكی ڕاست؟ واتە: ئایا كەسێك كە بە ڕێیەكی ڕاست دا دەڕوا بە قیت و قنجیی و، بە ڕێك وەستاویی، باشتر دەتوانێ بە ڕێیەدا بڕوات، یان كەسێك كە لەپەو ڕوو كەوتوەو لەسەر دەم و چاوی دەڕوات؟ (**وأَهْدَى مُشْتَقٌّ مِنَ الْهُدَى، وَهُوَ**

**اسْمُ تَفْضِيلٍ مَسْلُوبُ الْمُفَاضَلَةِ، لِأَنَّ الَّذِي يَمْشِي مُكِبًّا عَلَى وَجْهِهِ لَا شَيْءَ عِنْدَهُ مِنَ الإهْتِدَاءِ)**، وشەی (**أَهْدَى**)، هەرچەندە لە (**هُدَى**)وە، داتاشراوەو ناوی هەڵبژاردن (**اسْمُ تَفْضِيلٍ**)ە، بەڵام لێرەدا بەرانبەرەکەی نادیدە گیراوە، چونکە کەسێك کە لەپەو ڕوو دەڕوات، هیچ بەڕێ زانین و ڕێ ڕاستگرتنی نیە، تاکو ئەوەی بەقیت و قنجیی دەڕوات، بەسەر ئەودا هەڵبژێردرێ، واتە: بێگومان ئەو کەسەی بەقیت و قنجیی بە ڕێیەکی ڕاستدا دەڕوات، ئا ئەوە ڕێی ڕاستی گرتوەو بە ڕێیە دەزانێ و، ئەوەی دیکە سەرگەردانە، خواش ﷻ لێرەدا وێنە دێنێتەوە بە بابایەکی لەپەو ڕوو ڕۆیشتوو، کە لەسەر دەم و چاو و، لەسەر چەنگان بڕوات، کە ئەوە وێنەیەکە بۆ مرۆڤی بێبڕوا، بەڵام ئەوەی دیکە کە بە قیت و قنجیی لەسەر ڕێیەکی ڕاست دەڕوات، وێنەیە بۆ مرۆڤی بڕوادار، مرۆڤی بڕوادار تەماشای ئاسمانێ دەکات و بەر پێی خۆی دەبینێ، بەم لاو لادا دەڕوانێ، بەڵام کەسێك کە سەری بەرەو خوارەو لەسەر دەم و چاوی دەڕوات، وەك ئاژەڵێك، بە دڵنیایی بابای وا نە دەتوانێ سەر بەرەو ئاسمان هەڵببڕێ و، نە چاکیش بەو لاو لادا بڕوانێ.

## مەسەلەی شەشەم:

**بەس خوا ﷻ بیستن و چاوو عەقڵەکانی ڕەخساندوون بۆ مرۆڤان، بەڵام مرۆڤ کەم وایە سوپاسگوزاریی بکات بۆ خوا، هەر خواش مرۆڤی بە زەویدا بڵاوکردوونەوەو، هەر ئەویش کۆیان دەکاتەوە، بێبڕوایانیش لە کاتی هاتنی بەڵێنی قیامەت دەپرسن؟ بەڵام زانیاریی هاتنی کاتی قیامەت، بەس لە لای خوایەو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەرکی تەنیا ترساندن و وریاکردنەوەیەو، کاتێکیش بێبڕوایان لە نزیکەوە هاتنی ئەو بەڵێنە دەبینن، کە قیامەتە، ڕوویان تێکدەچێ و پێیان دەگوترێ: ئەمە بوو کە پەلەتان دەکردو داواتان دەکرد:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَـٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَـٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ ﴾، بڵێ: ئەو (خوا ﷻ) کەسێکە ئێوەی پێگەیاندوە، (إنْشَاء) هەم بە مانای پەیداکردن دێ و، هەم بە مانای پێگەیاندنی پلە پلە دێ، بەڵام مانای دووەمیان ڕاسترە، بگرە ڕاستە، یانی: خوا ﷻ ئێوەی پێگەیاندوە.

لێرەدا خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا، پێشێ سەرنجی ڕاکێشان بۆ ئەوە کە دەگونجێ زەوییان لە بندا، ڕۆبەرێتە خوار، دوایی سەرنجی ڕاکێشان بۆ ئەوە کە دەگونجێ بایەکی بەردو چەو ڕامالکەریان بۆ بنێرێ، ئنجا سەرنجی ڕاکێشان بۆ مێژوو، دوایی سەرنجی ڕاکێشان بۆ باڵندان، دواتر سەرنجی ڕاکێشان بۆ دەستە پاچەییان لە بەرانبەر دەستەڵاتی خوادا، کە ئایا کێ دەبێتە سوپاو

هێزیان؟ دوایی سەرنجی ڕاكێشان بۆ ئەوە كە ئەگەر خوا ﷻ بژیویان لێ بگرێتەوە، كێ بژیویان دەدات؟ ئنجا سەرنجی ڕاكێشان بۆ ئەوە كە مرۆڤێك كە بە ڕێی خوادا دەڕوات، وەك كەسێكە بە ڕێیەكی ڕاست و بە قیت و قنجیی بڕوا، بەڵام مرۆڤی بێبڕوا، وەك بابایەك وایە كە لەپەوڕوو لەسەر چنگان دەڕوا، ئنجا خوای زاناو توانا جارێكی دیكە، سەرنجیان ڕادەكێشێ بۆ دروستكران و پێگەیەنرانی خۆیان و بەهرەمەندكرانیان لە هێزەكانی: بیستن و دیتن و عەقڵ و هۆش، تاكو خوای میهرەبان لە هەموو دەرگایانەوەو لە سەرجەم دەروازانەوە هیدایەتیان بەرێتە نێو عەقڵ و دڵەوەو، چاكەكانی خۆیان بخاتە بەر چاو.

٢)- ﴿وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ﴾، هەروەها (خوا) بیستن و چاوەكان و عەقڵەكانیشی بۆ ڕەخساندوون، (**السَّمْع**) چاوگە، یانی: حاڵەتی بیستنی بۆ ڕەخساندوون، (**أَبْصَارَ**) كۆی (**بَصَر**)ە، یانی: خوا چاوەكانی بۆ ڕەخساندوون، (**الْأَفْئِدَةَ**)ش كۆی (**فُؤَاد**)ە، كە زۆر لە زانایان بە (**قُلُوب**)یان لێك داوەتەوە، بەڵام وەك زۆرجار گوتوومە: (**الْأَفْئِدَةَ**)، كۆی (**فُؤَاد**)ەو بە مانای عەقڵە، واتە: زەین و هۆش، كە دڵ چەقی ویستن و نەویستنە، بەڵام عەقڵ چەقی دەركردن و زانینە، بۆیەش خوا ﷻ لە هەموو قورئاندا زەم و مەدحی (**فُؤَاد وَأَفْئِدَة**)ی نەكردوە، بەڵام زەم و مەدحی دڵی كردوە، دڵ چەقی ویستن و نەویستنە و ئەگەر چاكەی بوێ، مەدح دەكرێ و، خراپەی بوێ، زەم دەكرێ، بەڵام عەقڵ چەقی زانین و دەرككردنە، دەرككردن لەزاتی خۆیدا، نە چاكەو نە خراپە، بەڵكو دوایی ئەو شتەی دەركت كردوە، هەڵوێستت لە بەرانبەری دا چۆن دەبێ، ئەوە پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە، بە هەردووك دیوی ئەرێنیی و نەرێنیی دا.

٣)- ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾، بە كەمیی سوپاسگوزاریی دەكەن، وشەی (**قَلِيل**)، (**صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالْفِعْل**) ﴿قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ﴾، سیفەتێكی چوێنراوە بە كردارەوە، دەشگونجێ (**مَا**) لابەرە (**نَافِيَة**) بێ، یانی: كەمیش سوپاسگوزاریی ناكەن، بەڵام هی یەكەمیان ڕاسترە، بە كەمیی سوپاسگوزاریی دەكەن، چونكە كەمێكیان هەر هەبوون، دوایی ئیمان بێنن، یاخود كەمێك لە بێبڕوایەكان كە ئیمانیشان نەهێناوە، چاكەكانیان هەر لە خوا زانیون.

٤)- ﴿ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بڵێ: ئەو (خوا ﷻ) كەسێكە ئێوەی لە زەویدا بڵاوكردۆتەوە، یان لە زەویدا زۆر كردوە، (ذَرْأ)، أ- بە مانای دروستكردن (خَلْق)و، ب- بە مانای زۆركردن (تكثیر)و، ج- بە مانای بڵاوكردنەوە (نشر) دێ و، مانای بڵاوكردنەوەو زۆركردن، زیاتر دەگەیەنێ.

٥)- ﴿ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، هەر بۆ لای ئەویش كۆ دەكرێنەوەو خڕ دەكرێنەوە، كە (الجَارّو المَجْرُور) پێشخراوە، یانی: (تُحْشَرُونَ إِلَيْهِ)، مانای كورتهەڵێنان دەگرێتەوە، تەنیا بۆ لای خوا كۆ دەكرێنەوە.

٦)- ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، دەشڵێن: ئەو بەڵێنە كەنگێیە! ئەگەر لە ڕاستانن! واتە: ئەو كاتەی بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی دانراوە، كەنگێیە، ئەگەر لە ڕاستانن، وشەی (الْوَعْدَ)یش، (مَصْدَرٌ بِمَعْنَى اسْم المَفْعُول: المَوْعُود)، واتە: ئەو بەڵێن پێدراوە كەنگێیە، ئەگەر لە ڕاستانن، لێرەدا ڕووی بێباوەڕیەكەیان دواندنیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ و بڕوادارانە.

٧)- ﴿ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾، بڵێ: زانیاریی تەنیا لە لای خوایە، وشەی (الْعِلْمُ)، كە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (عهد)ە، واتە: زانیارییەكە، زانیاریی لە بارەی ئەو بابەتەوە، تەنیا لە لای خوای بەرزی مەزنە.

٨)- ﴿ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، من تەنیا ورياكەرەوەو ترسێنەرێكی ڕوونكەرەوەم، یاخود: ڕوون و ئاشكرام، چونكە وەك زۆرجار گوتوومانە: وشەی (مُبِيْن)، ئەگەر لە (أَبَانَ)ی، (قَاصِر ولازِم)ەوە بێ، واتە: ڕوون و ئاشكرا، بەڵام ئەگەر لە (أَبَانَ)ی، تێپەڕێنەرە (مُتَعَدِّي)یەوە بێ، یانی: ڕوونكەرەوە.

ئنجا یەكسەر خوا ﷻ لێرەوە دەیانگوازێتەوە بۆ قیامەت:

٩)- ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، ئنجا كاتێك بینییان واتە: ئەو بەڵێنەیان بینی، ئەوانەی بێبڕوان ڕوویان خراپ بوو، تێكچوو، (زُلْفَةً)، یانی: بە نیزیكیی (الزُّلْفَةُ: اسْمُ مَصْدَرِ زَلَفَ إِذَا قَرُبَ، وَهُوَ مِنْ بَابِ تَعِبَ، أَيْ رَأَوْهُ شَدِيدَ الْقُرْبِ مِنْهُمْ)،

(**زُلْفَةً**): ناوی چاوگە لە (**زَلَفَ**)وە، یانی: (**قَرُبَ**)، نیزیك بۆوە، واتە: لە نیزیكەوە دیتیان ئەو بەڵێن پێدراوە، كە ڕۆژی دواییە، ﴿ سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، (**سِيْئَت**)، بە بكەر نادیار (**مَجْهُوْل الفاعل**) هاتوە، ئەوانەی بێبڕوان ڕوویان خراپ بوو، تێكچوو، (**فَلَمَّا**)، (**لَمَّا: للتَوْقِيْت، أي سِيئَت وُجُوهِهِم بِرُؤيَتِهِم الْوَعْدَ**)، واتە: دەم و چاویان تێكچوو، گۆڕاو ڕەش و تاڵ بوو، لە كاتێكدا بەڵێنەكەیان بینی، (**سِيْئَت**)، بە (**سِيَيَت**)یش، خوێنراوەتەوە.

١٠)- ﴿ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴾، گوتراش: ئا ئەوە بوو كە ئێوە پێشتر داواتان دەكرد، (**تَدَّعُونَ**)، خوێنراویشەتەوە: (**تَدْعُون**)، (**تَدَّعُونَ**)، یانی: (**تُطَالِبُون**)، داواتان دەكرد، بەڵام (**تَدْعُون**)، یانی: بانگتان دەكرد بۆتان بێ.

كە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَأَوۡهُ ﴾، (**ف**)ی (**فَلَمَّا**)، (**فَصِيحَةٌ لِأَنَّهَا اقْتَضَتْ جُمْلَةً مَحْذُوفَةً تَقْدِيرُهَا: فَحَلَّ بِهِمُ الْوَعْدُ، فَلَمَّا رَأَوْهُ إِلَخْ، أَي رَأَوْا الْمَوْعُود بِهِ**)، (**ف**) ڕوونكەرەوەیە چونكە ڕستەیەكی قرتێنراوی خواستووە و زەننەكەی: بەڵێنەكە بەسەریاندا هاتە دی، كاتێك بینییان ئەوانەی بێبڕوا بوون، دەم و چاویان تێك چوو و، ڕەش و تاڵ بوو، شڵەژان، یانی بەڵێندراوەكەیان دی، (**سِيْئَت**)، (**وسِيئَتْ بُنِيَ لِلنَّائِبِ، أَيْ سَاءَ وُجُوهَهُمْ ذَلِكَ الْوَعْدُ بِمَعْنَى الْمَوْعُودِ**)، ئەو بەڵێنە دەم و چاوی تێكدان، بەڵام بۆیە بە بكەر نادیار (**مجهول الفاعل**) هاتوە، چونكە یانی ئەو بەڵێنەی هاتوە، كە قیامەتە دەم و چاوی تێكداون، ئەگەر بە (**تَدَّعُونَ**)، بخوێنرێتەوە، (**مُضَارِعُ ادَّعَى: أي طَلَبَ بِإلحاح وَضُمِّنَ (تَدَّعُونَ)، مَعْنَى تُكَذِّبون بِسَبَب (ب)**)، كە دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴾، مادام (**تدَّعون**) بە (**ب**)، بەركاری خواستوە، مانای (**تُكَذِّبونِ**)یشی خراوەتە نێو، واتە: ئەوە بوو كە زۆر داواتان دەكرد بێ و، بەدرۆشتان دادەنا، ئێستاش فەرموون لەگەڵیدا ڕووبەڕوون.

شایانی باسە: ئێمە دوایی چەند كورتە باسێك لە بواری چەند زانیارییەك لە بارەی بیستن و دیتن و عەقڵەوە دەكەین، لە كۆتایی تەفسیركردنی ئایەتەكاندا.

## مەسەلەی حەوتەم:

بێبڕوایەکان هەردەم خۆزگەیان بە فەوتانی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دەخواست، خواش پێی دەفەرمووێ: بڵێ: ئەگەر خوا خۆم و شوێنکەوتوانیشم بفەوتێنێ، کێ ئێوەی بێبڕوا لە ئازاری بە ئێش قوتار دەکات؟ بڕوادارانیش بڕوایان بە خوای میهرەبانەو، پشتیان بەو قایمەو ناحەزانیش لەمەودوا حاڵیی دەبن، کە لە گومڕایی ڕوون دا بوون و، ئەگەر خوا ئاوی شیرین و زوڵاڵیش بە زەویدا بەرێتە خوار، هیچکەس ئاوێکی زوڵاڵ و ڕەوانیان بۆ ناهێنێ:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴿٣٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

لە کۆتاییدا خوا ﷻ لەبەر ئەوەی کە بێبڕوایەکان هەمیشە خەونیان بەوەوە دەبینی، کە موحەممەد ﷺ لە کۆڵیان بێتەوەو بمرێ و کۆتایی بە هەموو شتێك بێ، خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:

١)- ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ ﴾، پێیان بڵێ: ئایا دەبینن [یاخود هەواڵم پێ بدەن، یان ئایا دەزانن] ئەگەر خوا ﷻ خۆم و ئەوانەی لەگەڵمدان، فەوتاندنی و لە بەینی بردین، (وەك ئێوە پێتان خۆشەو حەز دەکەن).

٢)- ﴿ أَوْ رَحِمَنَا ﴾، یاخود بەزەیی لەگەڵمان بەکارهێنا، بەوەی دوامان بخات و جارێ نەمانمرێنێ، یاخود ئەگەر ئێمەی فەوتاند، لێمان خۆشبێ و بەزەیی پێمان دابێ، یاخود بەزەیی بە ئێمەدا هاتەوەو ئێمەی سەرخست.

٣)- ﴿ فَمَن يُجِيرُ ٱلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾، (لە هەمووو حاڵاندا) كێ بێبڕوایان لە ئازارێكی بە ئێش پەنا دەدات و دەپارێزێ؟، لێرەدا كە دەفەرمووێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَهۡلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ ﴾، بڵێ: ئایا دەزانن ئەگەر خوا من و ئەوانەی لەگەڵ مندا فەوتاندینی، بۆچی وشەی (هَلَاك)ی بەكارهێناوە بۆ مردن؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: ئەوە لەگەڵدا ڕۆیشتنی زاراوەو وشەكانی ئەوانە، گوتوویانە: بە هیلاك بچێ، یان بە هیلاك دەچێ، چونكە هەندێك لە زانایان دەڵێن: مردن هەر مردنە، بەڵام (هَلَاك)، مردنێكی خراپە، كە ئەوان وایان چاوەڕێ كردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە مردنێكی خراپ بمرێ، ئنجا بەپێی عەقڵی ئەوان و بەپێی وشەكانی ئەوان، تەعبیرەكەی هێناوە، بەڵام لە هەمووو حاڵاندا: ئایا كێ بێبڕوایان لە ئازارێكی بە ئێش دەرباز دەكات؟ لێرەدا لە جیاتی بفەرمووێ: (فَمَن يُجيرُكُم)، چونكە ڕووی دواندن لە كافرەكانە، فەرموویەتی: ﴿ فَمَن يُجِيرُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، كە ئەمە پێی دەگوترێ: (وَضْعُ المُظْهَر مَوْضِع المُضْمَرِ)، دانانی وشەی ئاشكرا لە جێی وشەی ڕاناو یان وشەی شێردراوە.

(يُجِيْرُ): (أجَارَهُ يُجِيره: أي: حَمَاه يَحْمِيهِ)، پەنای دا، پەنای دەدات، بۆیەش فەرموویەتی: ﴿ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، بۆ ئەوەی بیانناسێنێ كە ئایا ئێوەی بێبڕوا، كێ پەناتان دەدات لە ئازارێكی بە ئێش؟.

٤)- ﴿ قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَا ﴾، بڵێ: ئەو (خوا) بە بەزەییە، بڕوامان بەو هێناوەو پشتمان بەس بەو بەستوە، (إيمَان و تَوَكُّل)، دوو شتی پێكەوە پەیوەستن و، هەر كەسێ ئیمانی بە خوا بوو، پشتیشی پێ دەبەستێ.

٥)- ﴿ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾، لە مەودوا بۆتان دەردەكەوێ، كێیە لە گومڕاییەكی ئاشكرادایە، خوێندراویشەتەوە: (فَسَيَعْلَمُونَ)، ئنجا ئەگەر (فَسَتَعْلَمُونَ) بێ، واتە: هەر لەسەر دواندنی كافرەكان بەردەوامە، ئێوە لە مەودوا دەزانن كێ لە گومڕاییەكی ڕوون دایە، بەڵام ئەگەر (فَسَيَعلمونَ) بێ، ئەوە ئاوڕدانەوەیە لە دواندنی ئەوان و نادیدە گرتنیانە: لە مەودوا دەزانن و لێیان گەڕێ!.

٦)- ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا ﴾، بلێ: ئایا دەبینن، دەزانن، هەواڵم پێ بدەن، ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو، (غَوْر)، بە مانای چاوگە، بەڵام ئاوەکەی پێ وەصفکراوە، لەبەر زێدەڕۆیی کردن، یانی: (أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَائِرَاً)، واتە: (ذَاهِبَاً، غَائِباً)، بە زەویدا چووە خوار ونبوو، پەنهان بوو.

٧)- ﴿ فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ﴾، ئایا کێ ئاوێکی ڕەوانتان بۆ دێنێ؟ وشەی (مَعِيْن)، بە چەند جۆرێك مانا کراوە:

أ- ئیبنو عەبباس گوتوویەتی: (بِمَاء مَعِيْن أي: بِمَاءٍ عَذْبٍ)، (أخرجه الطبري: ٣٤٦١٩) ئاوێکی شیرین و زوڵاڵ.

ب- سەعیدی کوڕی جوبەیر گوتوویەتی: (بِمَاء مَّعِيْن : أي بِمَاءٍ ظَاهِرٍ)، (أخرجه: الطبري: ٣٤٦٢٠)، ئاوێکی بەرچاوو بینراو.

ج- قەتادەش (بِمَاء مَعِيْن )ی، بە: (المَاءُ المَعِيْنُ: الجَارِي)، (أخرجه: الطبري: ٣٤٦٢١) ئاوێکی بیندراوی ڕەوان، لێك داوەتەوە.

هەندێك لە تەفسیرەکان لێرەدا شتێکیان هێناوە، بۆ وێنە: (البحر المديد في تفسير كتاب الله المجيد)[1]، دەڵێ: (قُرِئَت الآيَةُ عِنْد مُلْحدٍ، فَقَال: نَأْتِي بِالْمِعْوَلِ وَالفُؤُوسِ، فَذَهَبَتْ عَيْنَاهُ تِلْكَ اللَّيْلَة وَعمِيَ، وَقِيْلَ: إِنَّهُ مَحَمَّد بِنُ زَكَرِيَّا المَتَطَبِّب، أَعَاذَنَا اللهُ مِن سُوءِ الأدَبِ مَعَ كِتَابِ الله تَعَالَى)، واتە: ئەم ئایەتە لە لای مولحیدێك خوێندراوەتەوە، ئەویش گوتوویەتی: (نَأْتِي بِالْمِعْوَلِ وَالفُؤُوسِ)، ﴿ فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ٣٠ ﴾، گوتوویەتی: پاچ و بێڵان دێنی [سەرئەنجام: ئاوەکە بە پاچ و بە بێڵ و خاکەنازان دێتەوە] ئیدی هەر ئەو شەوە ئاوی چاوانی ڕۆیشتوەو کوێر بوون، گوتراوە: ئەو کەسەی ئەو قسەیەی کردوە موحەممەدی کوڕی زەکەریای خۆ بە پزیشکزان بووە، خوا پەنامان بدات لە ئەدەبی خراپ لەگەڵ کتێبی خواو فەرمایشتی خوای بەرزی باڵادەستدا.

---

(١) ج٨، ص١٠٢.

لێـرەدا کۆتایـی بـە تەفسـیری سـوورەتی (الملـك) دێنیـن، بـەڵام سـێ (کورتـە بـاس)، کـە چەنـد زانیارییـەك دەگرنـە خۆیـان لـە بـارەی بیسـتن و دیـتن و عەقڵـەوە، دەخەینـەڕوو، لـە بـارەی بیسـتنەوە یـازدە وردە زانیارییـمان ڕەچـاو کـردوون و، لـە بـارەی دیتنـەوە شـەش وردە زانیاریـی و، لـە بـارەی عەقڵیشـەوە پێنـج و، هەموویـان دەبـن بـە بیسـت و دوو (٢٢)[1].

## کورتە باسێک لە بارەی هەندێک وردەکاریی (بیستن)ەوە

ئێمـە لێـرەدا نامانـەوێ باسـی کۆئەندامـی گـوێ و بیسـتن (**جهاز السمع والأذن**) بکەیـن، کـە ئـەوە کتێبێـکی سـەربەخۆی دەوێ، وەك لـە مەوسـووعەی: (ئیـمان و ئیلحـاد)دا، بـە تەفصیـڵ لـەو بـارەوە قسـەمان کـردوە، بـەڵام تەنیـا هەندێـك وردە زانیاریـی دەخەینـەڕوو:

١- بیستن لە وردترین هەستەوەرەکانی مرۆڤەو، هەتا ئێستا نەزانراوە چۆن مرۆڤ دەتوانێ ئاوازێکی خۆش لەگەڵ دەنگە دەنگ و دەنگێکی ناخۆش دا، لێك جیابکاتەوە، هەردووکیشیان هەر دەنگن، بەڵام دەنگێك کە ئاوازی هەیە، وەك دەنگی مۆسیقا، یان جریوەی چۆلەکەیەك، یاخود خوێندنی بولبولێك، یان قاسپەی کەوێك و، قووقەی کەڵەشێرێك، یان گمەی کۆترێك، لەگەڵ هەراو زەناو دەنگێکی ناخۆش و بێزارکەر، بیستن لێکیان جیا دەکاتەوە، کە هەمووشیان هەر شەپۆلی دەنگیین و ئەو نێوەندەی هەردووك جۆرە دەنگەکانی پێدا دێن، هەر هەوایە.

٢- ئەگەر هەوا نەبووایە، بەهیچ جۆرێك دەنگ نەدەبوو، هەر بۆیەش ئەوانەی دەچنە سەر مانگ، یاخود لە سوڕگە (قدار)دا بە دەوری زەویدا دەسووڕێنەوەو لە مەودای

---

(١) ئێمـە ئـەم کورتـە باسـانە هەموویـان بـە پوختەیـی، بـەڵام بـە داڕشـتنەوەی خۆمـان لـە تەفسـیرەکەی (د. محمـد راتـب النابلـسي، ج ١٠، ص (٢١ و ٢٢ و ٢٣))، هێناومانـن.

کێشکردنی زەوی دەچنەدەر، لەوێدا بەلاسلکی پێکەوە قسە دەکەن، چونکە هەوای لێ نیە، تاکو هەوا دەنگەکەیان نەقڵ بکات، ئنجا ئەگەر هەوا نەبێ، دەنگ نابێ، نەك هەر بینین نابێ، بەبێ هەوا دەنگیش هەر نابێ، ئێمە کاتێك قسە دەکەین، وەك چۆن بەردێك کە فڕێدەدەیە نێو ئاوێکەوە، شەپۆلان دەدات، شەپۆلێك دوایی شەپۆلێکی دیکەو ...هتد، شەپۆلەکانی دەنگیش بەهەمان شێوە، کە دەنگ بەرز دەبێتەوە، بە ئەندازەی دەنگ بەرزکردنەوەکە، هەوایەکەش شەپۆلەکان دەدات و، شەپۆلەکانی هەوا ئەو دەنگە دەگەیەنن بە گوێی بیسەر.

٣- لە چاکەکانی خوا لەسەر ئێمە ئەوەیە، کە ئەو شەپۆلە دەنگییە، دوای ئەوە وردە وردە خامۆش دەبێتەوە، ئەگەر وانەبووایەو هەرچی دەنگە هەرمابایە، لە هەواداو، هەمووی بەر گوێی مرۆڤ کەوتبایە، ئەو کاتە لە هەر شوێنێکی دنیا، بەڵکو لە هەر شوێنێکی گەردووندا دەنگێك هەبووایە، دەهاتە نێو گوێی ئینسانەوە: دەنگی هەورە تریشقەیەو برووسکەیەك لەوپەڕی دنیا، لەو سەری دنیا دەنگی تەقینەوەیەك، دەنگی هاڕەو نەڕڕەیەك، هەموو ئەوانە، ئەگەر دەنگەکان وردە وردە خامۆش نەبوونایەو، هێواش نەبوونایەوەو هەموویان هاتبانە نێو گوێی ئینسان، ئینسان یەکجار بێزارو ناڕەحەت دەبوو.

٤- بەشی بینراوو دەرەوەی کۆئەندامی گوێ، پێی دەگوترێ: سەیوان، وەك چەتری گوێیەو دەنگەکە کۆ دەکاتەوە، ئنجا ئەویش دەبینین قۆرت و پێچ و لاریی و تێدا هەیە، ماددەی گوێش واتە: سەیوانی گوێ، نە گۆشتی تەواوەو نە ئێسقانیشە، بەڵکو ماددەی کرۆژ کرۆژەیە، کە ئەگەر ئێسق بووایە، دەنگەکە بە ڕەقیی، دەبیستراو، ئەگەر گۆشت بووایە، دەنگەکەی دەمراند، بەڵام کرکڕاگەیەو لە نێوان ئێسقان و گۆشتدایە.

٥- دوای ئەوەی سەیوانی گوێ، چەتری گوێ، ئەو دەنگە کۆ دەکاتەوە، ئنجا وردە وردە، بە نێو جۆگەلەی گوێدا دەیبات و دەچێ بە پەردەی گوێ دەکەوێ، کە ئەویش سێ ئێسقانەکانی گوێ پێیەوە بەستراون، کە چەکوش و سندان و ئاوزینگن، ئنجا پەردەی گوێ کە لەرییەوە، بەهۆی هەوایەکەوە، ئەو ئێسقانانەش دەلەرنەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا، بیستن دروست دەبێ.

٦- ئەو سێ ئێسقانانەی گوێ، ئەو دەنگەی دێتە نێویان، هەتا بیست (٢٠) هێندەی خۆی لێ دەکەن، ئەگەر دەنگەکە کپ بێ، هەتا بیست هێندەی گەورە دەکەن، یانی: ئەگەر بچووك و نزم و کەم بێ، بەپێچەوانەشەوە: ئەگەر زۆر بەرز بێ، هەتا بیست هێندە دەگونجێ کپ بکرێتەوە، مەرج نیە یەکسەر بگاتە بیسەرەکە، بەڵکو بە پێی ئەوەی دەنگەکە پێویستە چەند گەورە بکرێ، یاخود ئەگەر گەورە بێ، چەند کپ بکرێتەوە، چونکە ئەگەر هەر بە کپیی بێ، نابیسترێ و دەبێ گەورە بکرێ، ئەگەر زۆریش بە گەورەیی بێ، مایەی جاڕزبوونە، بۆیە لە ڕێی ئەو سێ ئێسقانانەوە: چەکوش و سندان و ئاوزینگ، دەنگەکە دەستکاریی دەکرێ، کە لە نێو ئامێرەکانی مرۆڤدا[1]، هیچ شتێکی وا نیە، کە بۆ خۆی ئەو دەنگە دەستکاریی بکات، نزمی بکاتەوە، یاخود بەرزی بکاتەوە.

٧- دوایی ئەو دەنگە بە پێچاو پێچەکانی گوێدا دەڕوات، کە چل هەزار (٤٠،٠٠٠) پێچاو پێچی بیستنی تێدا هەیە، هەندێکیان دەنگەکە گەورە دەکەن و، هەندێکیان نزمی دەکەنەوە، بەپێی پێویستیی، ئنجا ئەوانەش هەموویان پەیوەستن بە دەمارەکانی بیستنەوە، هەتا دەنگەکە لە ڕێی ئەو جۆگەلانەوە، دەگاتە نێو گوێی نێوەوە **(الأذن الداخلية)**.

٨- ئنجا تاکو ئێستا زانیاریی دەستە پاچەیە وەک پێشتریش گوترا کە چۆن جیاوازیی دەکرێ بە دەنگێك کە دەنگێکی خۆشەو، مرۆڤ پێیخۆشە گوێی بۆ ڕادێرێ و، دەنگێك کە جاڕزکەرو بێزارکەرە، چۆن ئەو دوو دەنگە لێك جیادەکرێنەوە؟!.

٩- دوایی گوێی نێوەڕاست **(الأذن الداخلية)**، ئەو دەنگە دەگوازێتەوە بۆ مێشك و مێشك لێی تێدەگات، ئەو دەنگە چییەو مانای چییە؟!

١٠- جێی سەرسووڕمانە کە لە نێو گوێدا، لە نێو کۆئەندامی بیستن دا، شوێنێك هەیە، دەنگەکانی تێدا دەپارێزرێن، بۆ وێنە: کەسێك کە ئاشناتە، دەنگەکەی پارێزراوە لە کۆئەندامی بیستنتدا، کە ئەگەر لە تاریکییشدا گوێت لە دەنگی بێ، یەکسەر

---

(١) واتە: ئەوانەی دەستکردی مرۆڤن.

دەنگەکەی دەناسییەوە کێیە، یان ئەگەر دەنگی پشیلەیەك، یان وشەی مارێك، یاخود دەنگی سیسرکەیەك، لەبەر ئەوەی ئەو دەنگە لەوێدا پارێزراوە، ئەگەر دەنگەکان نەپارێزرابانایە، ئەو کاتە نەتدەتوانی خاوەنی دەنگەکان، یان سەرچاوەی دەنگەکان لە یەك جیا بکەیەوە.

**١١-** بۆچی خوا ﷻ دوو گوێی بۆ مرۆڤ داناون؟ لەبەر ئەوەی ئەگەر ئینسان تەنیا یەك گوێی هەبووایە، ئەو لایەی دەنگەکەی لێوەدێ، سەرچاوەی دەنگەکەی نەدەزانی، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە مرۆڤ دوو گوێی هەن، لە هەردوو گوێیەکانەوە دەنگەکە وەردەگیرێ و، ئەگەر چرکەیەك بکەیە (١٦٢٠) بەش، ئەو دەنگە لە ماوەی کەمتر لەوەشدا، ئەو مرۆڤە هەست دەکات بە سەرچاوەی دەنگەکە، بەڵام ئەگەر تەنیا یەك گوێ بووایە، ئەوە نەدەکرا، بەڵام لەبەر ئەوەی لە دوو لایانەوە دەنگەکە دێ، دەزانرێ ئەو دەنگە ئایا لە پشتەوەیە، لە پێشەوەیە، لە کام لاوەیە؟ بەهۆی ئەوەوە کە لە دوو ڕێوە دەنگەکە دەبیسترێ، ئەوەش حیکمەتێکی ئەوەیە کە مرۆڤ دوو گوێی هەن، حیکمەتێکی دیکەش ئەوەیە ئەگەر بیستنی گوێیەکیشی لەدەستدا، ئەوەی دیکەیان بمێنێ.

## كورتە باسێک دەربارەی وردەكاریی بینین

پێشـتریش باسـمانكرد، كـە ئێمـە لێـرەدا نامانـەوێ باسـی كۆئەندامـی چـاوو چۆنیەتیـی دیـتن و، پێكهاتـەی چـاو بكەیـن، كـە ئـەوە وردەكاریـی زۆری هەیـەو، پێویسـتیی بـە شـوێنێكی تایبـەت دەكات[1]، بەڵام تەنیـا چەند زانیارییـەك، دەخەینەڕوو:

١- یەكێك لە پێكهاتەكانی چاو بریتیە لە بیلبیلە (قرنية)، كە پەردەیەكی ڕوونە، پزیشكەكان ناویان لێناوە: كیفی سەخاوەتمەند (**الغِلاَفُ النَّبيل**)، بۆچی؟ چونكە ئەو پەردە ڕوونە، وردە دەمارەكانی خوێنی تێدا نین، بۆ ئەوەی ڕوون بێ، بەڵام ئایا خانەكانی بیلبیلە (**قرنية**) چۆن خۆراكیان بۆ دەچێ؟ ئەگەر خانەكانی وەك خانەكانی دیكەی جەستە بوونایە، دەبووایە بە دەمارەكانی خوێنەوە پەیوەست بن و لە ڕێی ئەو دەمارانەوە خواردنیان بۆ بچێ، بەڵام ئەو كاتەش دەبووایە لە پشت تۆڕێكی دەمارانەوە شتەكان ببینی، بۆیە دیتنەكە لێڵ دەبوو، یاخود هەر نەدەگونجا، یاخود ڕوون نە دەبوو، بۆیە خوا ﷻ خانەكانی ئەو ئەندامەی چاو كە بیلبیلە (**قرنية**)ی پێ دەڵێن، ئەو پەردە ڕوونەی وا لێكردوە، كە هەر خانەیەك خواردن دەدات بە خانەیەك و لێشیەوە بۆ تەنیشتەكەی و دەستە خوشكەكەی دەگوازرێتەوە، بۆ ئەوەی پێویست بەوە نەكات لە ڕێی دەمارەكانی خوێنەوە، خواردنیان بۆ بچێ، بەڵكو هەموویان بە تەنیشت یەكەوەن و خواردن دەچێ بۆ ئەو و، ئەو دەیدات بە ئەو، ئەو دەیدا بە ئەو، بەو شێوەیە بە تەنیشت یەكەوەن، وەك چۆن خشتەكانی دیوارێك یەكدی مەحكەم دەكەن و، پێویست ناكات شتێكی دیكە لە نێوانیاندا هەبێ، ئەوانیش بە هەمان شێوەن.

٢- پێكهێنەرێكی دیكەی چاومان هەیە، پێی دەگوترێ: گلێنە (**القزحية**)، ئنجا لە (**قزحية**)دا، عەدەسەی چاو هەیە، كە پزیشكەكان تێیدا سەرسامن، چونكە عەدەسەی چاو لە چاودا چەسپاوەو لە شوێنی خۆیەتی، بەڵام لەگەڵ دیتنی شتەكاندا دەسووڕێ، ئەو گلێنەیە:

---

(١) لە مەوسوعەی: (دڕەوشاوەیی ئیمان و پوپەڵیی ئیلحاد) دا بە بەدرێژایی لە بارەیەوە دواین.

أ- لەگەڵ دیتنی شتەکاندا بەو لادا دەسووڕێ و بەولادا دەسووڕێ.

ب- بەپێی ئەندازەی ئەو تیشك و ڕووناکییەی هەیە، ڕەفتار دەکات، ڕەفتارێکی ئۆتۆماتیکیی، ئەگەر شتەکە تاریك بێ، زیاتر دەکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕووناکیی زیاتری بچێتەتێ و باشتر ببینێ، بەڵام ئەگەر زۆر ڕۆشن بێ، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی چاو دێتەوە یەك، ئەها ئەگەر ئینسان شتێکی زۆر ڕووناك دەبینێ، چاوی دێتەوەیەك، ئەگەر شتێکی تاریکیش بێ، چاوت زیاتر دەکەیەوە، ئەوەش هەمووی بەبێ ئەوەی تۆ بیری لێبکەیەوە، ئەو جووڵەیە لە گلێنە (قزحية)دا ڕوو دەدات، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، خوای پەروەردگار وای ڕێکخستوە.

بۆ وێنە: ئێمە یاریی تۆپی پێ دەبینین، یان یاریی تێنس دەبینین، ئەو تۆپە لەبەر دەستی یان پێی یاریزانەکاندا دێ و دەچێ، چ تۆپی پێ و، چ باڵەو، چ تێنس لەسەر مێز کە دەکرێ، ئەو تۆپە دێت و دەچێ و، ئەو چاوە شوێنی دەکەوێ، بێ ئەوەی تۆ بیری لێ بکەیەوە، یانی: بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی جووڵ جووڵەیەکی خودیی و لە خۆیەوە.

٣- پێکهێنەرێکی دیکەی چاو هەیە، کە بریتیە لە تۆڕی چاو (شبكية)، ئەو تۆڕی چاوە، لە دە (١٠) چین پێکهاتوە، بەس چینی کۆتاییان لە (١٣٠) ملیۆن خانەی خڕیلەو درێژکۆڵە. (المحروطية والطولية) پێکهاتوە، ئنجا ئەو خانە بازنەیی و درێژکۆڵانە، هەموویان پەیوەست دەبنەوە بە تۆپەڵە دەمارێکی چاویی، کە ژمارەیان نۆ سەد هەزار (٩٠٠،٠٠٠) دانەیە، ئەویش پەیوەست دەبێتەوە بە مێشك، تاکو مێشك ئەو وێنەیەی دەکەوێتە بەرچاوی بیخوێنێتەوە، واتە: تۆڕی چاو لە دە چین پێك دێ، بەس چینی کۆتاییان لە (١٣٠ ملیۆن) خانەی درێژکۆڵەو مەیلەو خڕ پێك دێ، کە ئەوانیش پەیوەستن بە نۆ سەد هەزار ڕیشاڵی دەمارەوە، ئنجا ئەویش وەك کێبڵێك پەیوەست دەبێتەوە بە مێشك و. ئەو وێنانە لە ڕێی ئەو دەمارانەوە دەگەن بە مێشك و، مێشك تێی دەگات: ئەو وێنەیە وێنەی چییە، چۆنە، قەبارەی، ڕەنگی، هەتا دوایی؟!.

٤- ئێمە شتەکان کە دەبینین، یەکەم: بە قەبارەی خۆیان دەیانبینین، دووەم: بە ڕەنگی خۆیان دەیانبینین، سێیەم: لە باری ئاسایی خۆیاندا دەیانبینین، بۆ وێنە: شتێك ئەگەر ڕێك وەستا بێ، تۆ بە ڕێکیی دەیبینی و قەبارەکەشی چەندە، ئاوا دەیبینی، هەروەها درێژییەکەی چەندەو، پانییەکەی چەندەو، ئەستوورییەکەی چەندەو، بەو ڕەنگەی خۆی لەسەریەتی دەیبینێ، ئەگەر سەوزە، ئەگەر شینە، ئەگەر سپییە، ئەگەر ڕەشە، ئەگەر تێکەڵە، ئنجا لە باری ئاسایی خۆیدا دەیبینی، یانی: ئەگەر تۆزێ لار بووبێتەوە، دەزانی لار بۆتەوە، ئەگەر چەمابێتەوە دەزانی چەماوەتەوە، بۆ وێنە: مرۆڤ تەماشای هەزار کەس بکات، یەك ملیۆن کەس بکات، هەر کامێکیان بە ڕەنگی خۆی دەبینێ و، بە قەبارەی خۆی دەیبینێ و، لە دۆخی وەستانی ئاسایی خۆیدا دەیبینێ، چونکە خوا ﷻ شتەکەی بۆ ئاسان کردووین، بۆیە ئێمە دەڵێین: ئەوە شتێکی زۆر سادەیە، بەڵام بێگومان هیچ کامیرایەك نیە لە دنیادا، بتوانێ بەو شێوەیە بێ، بەڵام خوا ﷻ وای بۆ ڕەخساندووین، کە بە بێ ئەوەی ئەرك بکێشین، هەموو شتەکان وەك خۆیان و لە دۆخی خۆیانداو، بە ڕەنگی خۆیان و بە قەبارەی خۆیان و بە ئەندازەی خۆیان، بە ژمارەی خۆیان، ئەگەر لێیان وردبیەوە، دەیانبینین.

٥- چاو دەتوانێ جیاوازیی لە نێوان پلەکانی ڕەنگدا بکات، بۆ یەك ڕەنگ دەتوانێ جیاوازیی بکات لە نێوان هەشتسەد هەزار (٨٠٠،٠٠٠) پلەی ڕەنگ دا، واتە: هەر لە ڕەنگی سەوز هەشتسەد هەزار، پلە، دەتوانێ لێك بکاتەوە، هەروەها بۆ شین و ڕەش و مۆرو سوورو بۆ هەموو ڕەنگەکان (٨٠٠) هەزار پلە، بە ڕەنگێکی زۆر وردو، بە قەبارەی زۆر وردو بەشێوەی خۆی، هەڵبەتە ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەندازەی ساغیی چاوو مەودای ئەو شتەی دەبینرێ.

٦- شەشەمین زانیاریی و کۆتایی لە بارەی چاوەوە کە دەمانەوێ بیخەینەڕوو، ئەوەیە: خوا ﷻ وەك چۆن دوو گوێی بۆ مرۆڤ ڕەخساندوون، بۆ ئەوەی سەرچاوەی دەنگەکە بزانێ، کە ئەگەر هەر یەك گوێ بووایە، نەیدەتوانی ئینسان دەتوانێ ئەزمووونی بکات، گوێیەکت بگرە، ئەو دەنگانەی دێن، سەرچاوەکەیان نازانی هەر دەنگەو دێ، بەڵام

بەهۆی ئەوەوە کە دوو گوێن و ئەو جیهازەی لە نێو مێشك دا هەیە، کە (١٦٢٠/١) چرکەیەکدا بەراورد دەکات لە نێوان دوو دەنگەکانی کە بە دوو گوێیەکان دەبیسترێن، یەکسەر دەزانی سەرچاوەی ئەو دەنگە لە کوێیە، ئنجا بۆ چاویش بە هەمان شێوە، ئەگەر مرۆڤ بەس یەك چاوی هەبووایە، شتەکانی زیاتر بە یەك لا دەبینی، یاخود بە یەك ڕووبەر دەبینی، بەڵام ئێستا لەبەر ئەوەی دوو چاون، هەم درێژیی دەبینی، هەم پانیی دەبینی و، هەم قووڵایی دەبینی، چونکە هەر کامیان وێنەکە دێنێ، ئنجا بەهۆی ئەو نێوانەیانەوە کە بە هەردووکیان دەیبینن، قووڵایی و ئەستوورایی شتەکان دەبینی، ئینسان دەتوانی ئەزموونی بکات: دەست بخە سەرچاوێکت و تەماشای شتێك بکە بە جۆرێکی دەبینی، دوایی دەست بخە سەر چاوەکەی دیکەت و، تەماشای هەمان شت بکە، لەو لاوەتر دەیبینی، بە لای کەمەوە هەشت نۆ دە سانتیمیان بەینە، ئنجا ئەو بەینە بەهۆی دیتنی دوو چاوەکانەوە، نامێنێ و ڕێك دەیبینی، ئەگەرنا تۆ چاوێکت دابخە، بە چاوێکت تەماشا بکە، بۆ وێنە: تەماشای ئەو قەڵەمە دەکەی لەلایەك دەیبینی، دوایی بە چاوەکەی دیکەت لەلایەکی دیکە دەیبینی و، بەولادا دەچێ، بەڵام کە بەهەردووکیان دەیبینی، ڕێك لە دۆخی ئاسایی وەستاوی خۆیدا دەیبینی، واتە: ئەگەر مرۆڤ دوو چاوی نەبوونایە، زۆر بە زەحمەت دەیتوانی دەزوویەك بە دەرزییەکەوە بکات، بەگشتیی شتەکان لە دۆخی ئاسایی خۆیاندا ببینێ.

## کورتە باسێک دەربارەی عەقڵ و مێشک

ئنجا دێینە سەر خستنەڕووی هەندێك وردە زانیاریی، کە پێنج وردە زانیاریی، لە بارەی عەقڵ و مێشکەوە، هەڵبەتە عەقڵ بریتیە لە فام و هۆش و بیرکردنەوەو، هەموو ئەو پرۆسانەی دیکە، وەك هەڵگرتنی زانیارییەکان و، پاراستنیان و، شیکردنەوەی شتەکان و، گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و، پێشبینیی کردنی داهاتوو، ئەوانە هەموویان کارەکانی عەقڵن و، ئەوەی تاکو ئێستا زانست بۆی دەرکەوتوە، ئەوەیە کە ئەوانە هەموویان پەیوەندییان بە مێشکەوە هەیە، یانی: دەماغ کە لە نێو کەللەی سەردایە، کە ئەوەش شتێکی دیکەی زۆر حەکیمانەی خوای پەروەردگارە، خوا ﷻ ئەندامەکانی مرۆڤ هەتا هەستیارترو گرنگترو بایەخدارترو پێویستتر بن، لە شوێنی مەحکەمتردا داناون، وەك دەبینین: عەقڵی خستۆتە نێو کەللەی سەرەوە، کە ئێسقانەکانی زۆر مەحکەمن و، زۆر کەس وادەزانێ کەللەی سەر هەمووی یەك پارچە و یەك ئێسقانە، بەڵام وانیەو چەندان پارچە ئێسقانەو بەیەکەوە پەیوەست کراون، بۆ ئەوەی ئەگەر یەکێکیان زیانی هێنا، ئەوەی دیکە هەمووی درزنەبا، وەك گۆزەیەك کە دەشکێ هەمووی دەشکێ، یان شووشەیەك کە دەشکێ هەمووی دەشکێ، بەڵکو کەللەی سەر چەند پارچە ئێسکێکەو، بە هەموویان کەللەی سەر پێك دێنن و، زۆریش مەحکەمەو خوای کارزان مێشکی لەوێدا داناوە، هەروەها دڵ و جەرگ و سییەکانی خستوونە نێو قەفەزەی سینگەوە، هەروەها چاوی خستۆتە نێو چاڵی چاوەوە، کە ئێسقانێکە هەموومان کەللە سەری مرۆڤی مردوومان بینیوە، چاڵی چاو ئێسقانێکە کۆڵدراوە، چاو خراوەتە ئەوێ، هەروەها گوێ، شوێنەکەی زۆر مەحکەمەو لە نێو کەللەی سەردایە.

١- یەکەمین زانیاریی لە بارەی مێشکەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ خستوویەتە مەحکمترین شوێنی جەستەوە، کە کەللەی سەرە.

٢- زانیارییەکی دیکە ئەوەیە کە لە مێشکدا سەدو چل ملیار (١٤٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) خانە هەیە، پێیان دەگوترێ: خانە پاڵدەرەوەکان **(الخلایة الإستنادیة)**، کە تاکو ئێستا زانستی پزیشکگەریی و توێکاریی ئەرکی ئەو سەدو چل (١٤٠) ملیار، خانەیەی باش بۆ دەرنەکەوتوە، واتە: مێشك تاکو ئێستا خۆی نەناسیوەو، پەی بە هەموو نیهێنییەکانی خۆی نەبردوە، بەڵام ئێمە بە عەقڵ و مێشك دەزانین و، بیر دەکەینەوەو، زانیارییەکان لەوێدا کۆدەکەینەوە، شتمان بەبیر دێتەوەو، پێشبینیی دەکەین و، شیی دەکەینەوەو... هتد.

٣- زانیارییەکی دیکە ئەوەیە کە لە نێو مێشکدا چواردە (١٤) ملیار خانە هەن، پێیان دەگوترێ: خانە توێکڵییەکان **(الخلایة القِشْرِیّة)**، کە خەیاڵکردن و، وێناکردن و، دادوەریی کردن و، زانیاریی هەڵگرتن و، شیکردنەوەو بیرکردنەوە، ئەوانە هەموویان پەیوەندییان بەو (١٤) ملیار خانەیەوە هەیە، ئینسان ئەگەر بیر بکاتەوە: ئەگەر گریمان ئەو (١٤) ملیار خانەیەش، کە زانیاریی هەڵگرتنیان تێدایە، وەك خانەکانی دیکەی جەستە مردبانایەو نوێبووبانەوە، مرۆڤ هەر بەین بەین، هەرچی زانیاریی هەیەتی، هەمووی فۆرمات دەبۆوە، وەك کۆمپیوتەر، دوایی دەبووایە دووبارە هەمووی فێر بێتەوە! بۆ وێنە: بابایەکی پزیشك کە چەندان ساڵ خوێندوویەتی، تاکو پسپۆڕیی لە بوارێکدا پەیدا کردوە، ئەگەر ئەو چواردە ملیار خانانەی مێشك، کە یەکێك لە کارەکانیان ئەوەیە هەرچی زانیارییە، ئەوان هەڵیدەگرن، ئەگەر هاتباو خانەکانی مێشکیش وەك خانەکانی دیکەی جەستە نوێبووبانەوەو مردبان و، هی دیکەیان هاتبایەوە جێ، دەبووایە بەردەوام مرۆڤ خەریکی ئەوەبووایە زانیارییەکانی دووبارە بکاتەوە، بەڵام ئەو خانانەی مێشك خوا ﷻ وای خوڵقاندوون، گۆڕانیان بەسەردا نایەت و نامرن، وەك خانەکانی جەستە، بەڵکو چەسپاون و هەر کامێکیان مردیش، هیچ نایەتەوە جێی و کۆتایی پێ دێ، هەروەها خوا وای خوڵقاندوون، ئەگەر هەندێکیان مردن، هەندێکیان کاری یەکدی دەکەن و هەوڵ دەدەن ئەو کەلێنە پڕ بکەنەوەو قەرەبووی بکەنەوە.

جارێکی دیکەش دەڵێین: ئەگەر هاتباو ئەو (١٤) ملیار خانەیەش وەك خانەکانی دیکەی جەستە مردبانایە، کە هەرچی کاری بیر کردنەوەو زانیاریی هەڵگرتن و دادوەریی کردن و پێشبینیی کردن و ...هتد، پەیوەندیی بەوانەوە هەیە، دەبووایە پزیشك، ئەندازیار، پارێزەر، بازرگان، جووتیار، قوتابی و مامۆستا، هەموو ئەوانە بەردەوام خەریکبان، زانیارییەکانی خۆیان فێر ببنەوەو دووبارەیان بکەنەوە، کە ژیان بەو شێوەیە هەر نەدەچووە سەر، بەڵکو دەبووایە هەر کاتێك کەسێك دەهات بۆ لات، دووبارە بڵێی: ئەرێ جەنابت کێ بووی، ئەگەر نیزیکترین کەسیشت بێ، چونکە زانیارییەکە سڕاوەتەوەو ڕۆیشتوە!! بەڵام خوا ﷻ وای خوڵقاندوون، ئەو خانانەی مێشك، کە نامرن و زانیارییەکانیش لە نێویاندا پارێزراون.

٤- زانیارییەکی دیکە لە بارەی مێشکەوە ئەوەیە، کە ئەگەر مرۆڤێك دەوری شەست (٦٠) ساڵ بژی، لەو ماوەیەدا هۆشدان (**ذاكرة**)ی کە زانیاریی تێدا کۆ دەکرێتەوە دەتوانێ حەفتا (٧٠) ملیار زانیاریی و وێنە لە خۆیدا کۆ بکاتەوە، زانیاریی و وێنە بە بیستنەوەو، وێنەی دیتن و، وێنەی بۆنکردن و، وێنەی قەبارە، لە حاڵێکدا کە ئەو هۆشدان (**ذاكرة**)یە، بە قەدەر دەنکە نیسکێکە، کەچی دەتوانێ (٧٠) ملیار زانیاریی و وێنە -- کە مەبەستمان بەس وێنەگرتن نیە، بەڵکو تام و بۆن و ڕەنگ و قەبارەو دەنگ و هەموو ئەوانە – حەفتا ملیار دانە لە خۆیدا کۆ بکاتەوە، لە ماوەی شەست (٦٠) ساڵ تەمەنی مرۆڤدا.

٥- زانیارییەکی دیکەش، کە زۆر زۆر گرنگە، ئەوەیە کە لە نێو مێشکدا، ئەو زانیاریانە لە سێ شوێناندا هەڵدەگیرێن، واتە: لە هۆشدان (**ذاكرة**)دا:

١- شوێنێکیان کە بە ئاسانیی دەستی دەگاتێ بە ئاسانیی دێتەوە یادی.

٢- شوێنێکیان مام ناوەندییە.

٣- شوێنێکیشان دوورە، بۆ وێنە: ناوی منداڵەکانت و ئیشەکەت و پسپۆڕییەکەت لە کارەکەتدا، هەموو ئەو شتانەی ڕۆژانە ئیشت پێیانە، هۆشدان (**ذاكرة**)، ئەو زانیاریانە

لە نیزیکترین شوێندا دادەنێ، کە بە ئاسانیی دەستت بیانگاتێ، بەڵام زانیارییەکانی دیکە کە بە پەلە پێویست نین، بۆ وێنە: ژمارە تەلەفۆنێك، ناوی شوێنێك، یان زانیاریی لە بارەی کەسێکەوە، کە زوو پێویستییت پێی نیە، ئەوە لە نێوەڕاستدا دادەنرێ و، ئەوانەش کە کەم وا هەیە کارت پێیان بێ، مێشك لە شوێنێك دا هەڵیاندەگرێ کە دوورە دەستەو لاچەپە، چونکە کەمتر ئیشت پێیان دەبێ.

٦- زانیارییەکی دیکە لە بارەی مێشکەوە ئەوەیە، کە بە ئەندازەی ئەوەی مرۆڤ گرنگیی بە شتێك دەدات، شتێکی لە لا گرنگ و بایەخدارە، ئەو شتەی ئاسانتر دێتەوە یاد، یاخود باشتر لە مێشکیدا پارێزراوە، یانی: شتێك هەتا بەلاتەوە گرنگتر بێ و، زیاتر جێی بایەخ بێ، مێشك باشتر هەڵیدەگرێ و چاکتر دەیپارێزێ، بۆیە جاری وایە کەسێك کە قسەیەکی لامسەرلایی دەکات، یان شتێکی، دەبیستی بەلاتەوە گرنگ نیە، یان پێت خۆش نیەو حەزی لێ ناکەی، زوو لە بیرت دەچێتەوە، بەڵام شتێك کە زۆر جێی مەبەست و بایەخت بێ و خۆشت بوێ، بۆ وێنە: کەسێکت زۆر خۆشبوێ، یان هەواڵێك کە بەلاتەوە جێی بایەخە، مێشك باشتر دەیپارێزێ، واتە: ئەندازەی گرنگییدانی تۆ بە شتێك، مێشك وادارەدەکات هۆشدان **(ذاكرة)** وادارەدەکات، ئەو زانیارییە باشتر بپارێزێ، ئنجا ئەگەر وێنەی کەسێکە، ئەگەر دەنگیەتی، ئەگەر تایبەتمەندییەکیەتی، یان زانیارییەکەو هەواڵێکە، هەمیشە ئەندازەو پلەی بایەخدان و گرنگییدانی مرۆڤ بە شتەکان، مێشك وادارەدەکات، کە ئەو شتانە باشتر بپارێزێ و، دوایی ئاسانتر بە دەستیانەوە بدات و بیانهێنێتەوە پێش.

ئەمانە چەند وردە زانیارییەك بوون لە بارەی هەر کام لە کۆئەندامی بیستن و دوو گوێیەکان و، کۆئەندامی دیتن و، هەردوو چاوەکان و، کۆئەندامی مێشك، کە وەك گوتمان: مێشك بریتیە لە چەق و ئامرازی عەقڵ و هۆش و بیرکردنەوەو و، هەموو ئەو پرۆسانەی پەیوەندییان بە عەقڵ و هۆشەوە هەیە.

لێرەدا کۆتایی بەم دەرسەمان دێنین و، بەم دەرسەش کۆتایی بە کۆی تەفسیری سوورەتی (الملك)، دێنین.

لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە: کـە بـە لوتـف و کەرەمـی بـێ سـنووری خـۆی یارمەتییـمان بـدات، هەرچـی زیاتـر بیـر بکەینـەوەو ڕامێنیـن و وردبینـەوە، لـە هـەردوو کتێبـی بینـراو و بیسـتراوی خـۆی، کتێبـە بینراوەکـەی کـە گەردوونـە، بـە خۆشـمانەوەو، کتێبـە بیستراوەکەشـی کـە قورئانـە، بێگومـان ئێمـە هەتـا لـە کتێبـی بیـنراوی خـوا زیاتـر ڕامێنیـن، لـە گـەردوون دروسـتکراوەکانی خـوا، باشـتر دەزانیـن خـوا چـی دروسـتکردوەو، چۆنـی دروسـتکردوە؟ هەروەهـا تاکـو زیاتـر سـەرنجی کتێبـی بیسـتراوی خـوای پەروەردگاریـش بدەیـن، کـە قورئانـە، زیاتـر دەزانیـن خـوا ﷻ چـی فەرمـووەو، چۆنی فەرمـووە؟ هیـچ گومانیش لەوەدا نیـە، کە هەتـا زانیاریی زیاتـر پـەردە لەسـەر نهێنییـەکانی کتێبـی بیـنراوی خـوا هەڵداتـەوەو، زیاتـر کەشـف بـن، ڕاسـتیی و تێـرو تەواویـی کتێبـی بیسـتراوی خـواو، فەرمایشـتی خـوا، زیاتـر دەردەکـەوێ، هـەروەك ئایەتەکـەی سـوورەتی **(فصلت)**، کـە پێشـتر تەفسـیرمان کـرد، دەفەرمـوێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ ﴾، ﴿ سَنُرِيهِمْ ﴾، لـە مـەودا پێشـانیان دەدەیـن، چییـان پێشـان دەدەیـن؟، ﴿ ءَايَٰتِنَا ﴾، نیشـانەکانمان ﴿ فِى ٱلْءَافَاقِ ﴾، لـە ئاسـۆیەکاندا واتـە: لـە گـەردوون و لـە دەوربەریانـدا ﴿ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ ﴾ هەروەهـا لـە خۆشـیاندا ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴾، ﴿ حَتَّىٰ ﴾، لێـرەدا:

أ- دەگونجێ بۆ گەیشتن بە ئامانج **(لبلوغ الغاية)** بێ، واتە: تاکو سەرەنجام بۆیان دەرکەوێ، کە هەقە.

ب- دەشگونجێ ﴿ حَتَّىٰ ﴾، لێرەدا بە مانای: **(كي)** بێ، **(كي يَتَبَيَّنَ لَهُم)** تاکو بۆیان دەرکەوێ کە هەقە، چی هەقە؟ یانی: تاکو بۆیان دەرکەوێ کە قورئان هەقە، هەتا نیشانەکانی خوا لە ئاسۆیەکان و لە خودی خۆشماندا زیاتر دەربکەون، ڕاستیی و تەواویی ئەو قورئانە پتر دەردەکەوێ، قورئان هەندێك ئاماژەی تێدا هەن، بەخۆشمان و بەدەوروبەریشمان، زیاترو چاکتر ڕاستیی کتێبی خوامان بۆ دەردەکەوێ، یاخود: تاکو هەقانیەتی خوای بەرز، پەروەردگاریەتیی و، بەدیهێنەرێتیی و، تەنیا خاوەندارێتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی

خوامان زیاتر بۆ دەرکەوێ، دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾، ئایا بەس نیە بۆ پەروەردگارت، کە ئاگاداری هەموو شتێکەو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوە، خوایەك کە چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوەو، ئاگاداری هەموو شتێکە، ئەو خوایە ئەو فەرمایشتەی فەرمووە، کەواتە: ئەو فەرمایشتەی خوا، ئاماژەی بە هەر شتێك لە شتەکانی کە خوا دروستیکردوون، کردبێ، ڕێك وەك خۆی کە هەیە، ئاوا ئاماژەی کردوە، بۆیە تاکو پەردە زیاتر لەسەر دروستکراوەکانی خوا هەڵبدرێتەوە، هەقانییەت و ڕاستیی و تێرو تەواویی فەرمایشتی خوا، زیاتر دەردەکەوێ، هەروەها هەتا بە دروستکراوەکانی خوا ئاشناتر بین، بە بەدیهێنەرو پەیداکەرو داهێنەرو ڕەخسێنەری ئەو شتانەش، کە خوا باڵادەستە، ئاشناترو زاناتر دەبین.

خوا زیاتر تەوفیقمان بدات کە لە هەردوو کتێبی قورئان و گەردوون، زیاتر شارەزا بین و بەر چاو ڕوون بین، تاکو هەم بزانین خوا ﷻ چی دروستکردوەو، چۆنی دروستکردوە؟! هەم بشزانین خوا ﷻ چی فەرمووەو چۆنی فەرمووە؟!..

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

مسوڵمانانی بەڕێزو خۆشەویست!

ئەمڕۆ کە (٢٩) ڕەمەزانی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر: (٢٠٢٠/٥/٢٢)ی زایینی، لە شاری هەولێر، خوا پشتیوانمان بێ، دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سوورەتی (القلم)، سەرەتا پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە موبارەکە لە حەوت (٧) بڕگەدا دەخەینەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (القلم) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە باوترین ناوی بریتییە لە (**سورة القلم**)، بەڵام دوو ناوی دیکەشی بۆ بەکارهێنراون:

**یەکەم:** سوورەتی (**ن وَالقَلَم**).

**دووەم:** سوورەتی نوون(**ن**).

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە لە شاری مەککە دابەزیوە، هەرچەندە هەندێك لە زانایان بە سوورەتێکی مەدینەییان داناوە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری نیزیك بە یەکدەنگیی بۆچوونیان وایە مەککەییە، لە سەرەتای قورئانی مەککەییشدا دابەزیوە، وەك دواتر بۆمان دەردەکەوێ لە کاتی تەفسیری ئایەتەکاندا.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

ژمـارەی ئایەتەكانـی پەنجـاو دوو (٥٢) ئایەتـە، كـەس نەیگوتـوە پەنجـاو یەكـە (٥١)، یـان پەنجـاو سـێیە (٥٣)، یـان كەمـتر یـان زیاتـر.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ڕیزبەندیـی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە لـە دابەزینـدا، بـە گوێـرەی قسـەی جابیـری كـوڕی زەیـد، ژمـارە دوویـەو لـە دوای سـوورەتی **(العلـق)** دابەزیوە، دوایـی **(المزمل)** ئنجـا **(المدثـر)**، یـانی: یەكەمیـن سـوورەتێك كـە دابەزیـوە، پێنـج ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی **(العلـق)**ن، دوایـی ئـەم سـوورەتە دابەزیـوە، ئنجـا سـوورەتی **(المزمـل)**، ئنجـا سـوورەتی **(المدثـر)**، بـەڵام بەپێـی بۆچوونـی عائیشـە دایكـی بڕواداران خـوا لێـی ڕازی بـێ و، جابیـری كـوڕی عەبدوڵـڵا خـوای بـە بەزەیـی لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ، پێشـێ ئـەو پێنـج ئایەتـەی سـەرەتای **(العلـق)** لـە ئەشـكەوتی حیـڕادا بـۆ سـەر دڵـی موبارەكـی پێغەمبـەر ﷺ دابەزیـون، كـە بەسـەرهاتەكەی لـە صەحیحـی بوخاریـیدا هاتـوە، كـە جیبریـل عليه السلام سـێ جـاران پێغەمبـەری خاتـەم بـە خۆیـەوە دەگوشـێ و پێـی دەڵـێ: بخوێنـە، ئەویـش دەفەرمـوێ: خوێنـدەوار نیـم، جـاری سـێیەم یـان چـوارەم پێـی دەڵـێ: بخوێنـە، ئەویـش دەفەرمـوێ: چـی بخوێنـم؟ دەفەرمـوێ: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ۝٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ۝٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ۝٥﴾، دوایـی سـوورەتی **(المزمـل)** دابەزیـوە، دوای ماوەیـەك لـە وەسـتانی وەحیـی، ئنجـا مـن ئـەو بۆچوونـەی عائیشـەو جابیـری كـوڕی عەبدوڵـڵام زیاتـر بـە دڵـە، وەك عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ لـەو بـارەوە لـە صەحیحـی بوخاریـیدا هاتـوە كـە گوتوویەتـی: {**أَنَّ أَوَّلَ مَـا أُنْـزِلَ سُـورَةُ:** ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ۝١﴾، **ثُـمَّ فَـتَرَ الْوَحْـيُ ثُـمَّ نَزَلَـتْ سُـورَةُ الْمُدَّثِّـرِ**}، لـە قورئـان یەكەمیـن سـوورەتێك كـە دابـەزی سـوورەتی **(اقْـرَأْ بِاسْـمِ رَبِّـكَ)** بـوو، دوای ئـەوە وەحیـی وەسـتا، ئنجـا سـوورەتی **(الْمُدَّثِّـرِ)** دابـەزی.

جابیـری کـوڕی عەبدوڵـلا (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) گوتوویەتـی: {أَنَّ سُـورَةَ الْمُدَّثِّـرِ نَزَلَـتْ بَعْـدَ فَـتْرَةِ الْوَحْـيِ}.

سـووڕەتی (**المدثـر**) دوای دابڕانـی وەحیـی -- ئایـا چەنـد ڕۆژێـك بـووە، چەنـد هەفتەیـەك بـووە - دابەزیـوە.

بـەڵام وا پێدەچـێ و وای تێدەگـەم لـە دوای ئایەتەکانـی سـەرەتای سـووڕەتی (**العلـق**) سـووڕەتی (**المزمـل**) دابەزیبـێ، کـە خـوای زانـاو توانـا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ١ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ٢ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ٣ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ٥﴾ **المزمـل**، ئنجـا دوایـی سـووڕەتی (**المدثـر**) دابەزیبـێ، چونکـە لـە سـووڕەتی (**المدثـر**)دا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢﴾ **المدثر**، ئـەی ئـەو کەسـەی خـۆت لـە نوێنـەوە پێچـاوە! هەڵسـەو خەڵـك بترسـێنەو ئاگاداریان بکـەرەوە، بـەڵام سـووڕەتی (**المزمـل**) تەنیـا فەرمانکردنـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەك خـودی خـۆی، لـە ڕووی شـەو نوێـژو پەرستشـی زیاتـرو قوڕئانخوێندنـەوە، کـە پەیوەندیـی خـۆی زیاتـر لەگـەڵ خـوادا مەحکـەم بـکات، دوایـی لـە قۆناغێکـی دیکـەدا سـووڕەتی (**المدثـر**) دابەزیـوە.

هەروەهـا پێـم وایـە ئـەم سـووڕەتە ماوەیـەك دواتر دابەزیبـێ، نـەك وەك جابیری کـوڕی زەیـد دەڵـێ: دووەمیـن سـووڕەت بـێ، مـن پێـم وایـە ماوەیەکـی پێیچـووە تاکـو دابەزیـوە، (**المزمـل**) و (**المدثـر**) هاتـوون، ڕەنگـە سـووڕەتی دیکـەش دابەزیـبن، دەگونجـێ ئـەم سـووڕەتە بـە پێـی نێوەڕۆکەکـەی کـە تەماشـای دەکەیـن، کاتێـك بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ دابەزیبـێ، کـە خـۆی و هاوەڵانـی گەیشـتبنە قۆناغێکـی سـەخت و دژوار، هەووەهـا سـووڕەتی (**العلـق**) یـش، هەرچەنـدە پێنـج ئایەتەکـەی سـەرەتای یەکەمیـن ئایەتێکـن دابەزیبنـە سـەر دڵـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بـەڵام ئایەتەکانـی دوایـی، ئەگـەر سـەرنجیان بدەیـن: دەزانیـن دواتـر دابەزیـون، ئەمـەش دەقـی کـۆی ئایەتـەکانی ئـەو سـووڕەتەیە: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢

﴿اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَىٰ ﴿٦﴾ أَن رَّآهُ اسْتَغْنَىٰ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الرُّجْعَىٰ ﴿٨﴾ أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰ ﴿١٠﴾ أَرَأَيْتَ إِن كَانَ عَلَى الْهُدَىٰ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَىٰ ﴿١٢﴾ أَرَأَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٣﴾ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ اللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ﴿١٩﴾﴾ **العلق**.

هەر دیارە ئەو ئایەتانەی دوایی سوورەتی (**العلق**): (٦ - ١٩)، کاتێك دابەزیون کە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتۆتە نێو بگرەو بەردە، لەگەڵ ئەهلی کوفرداو، کەوتۆتە حاڵەتی هەڕەشە لێکرانەوەو، بەسەرهاتەکەی لە سیرەی ئیبنو هیشامیش دا هاتوە.

بۆیە من پێم وایە هەر کام لە سوورەتەکانی (**المزمل**) و (**المدثر**) بە دوای یەکدا پێش سوورەتی (**القلم**) دابەزیون، وەك لە سیرەی ئیبنو هیشام و، لە صەحیحی بوخارییشدا هاتوە.

کەواتە: ئەوەی هەندێك لە زانایان دەیڵێن، مەرج نیە بە ڕەهایی وەربگیرێ، ئەوانیش ئەگەر شتێکیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستبێ، ئەگەرنا کەوتۆتە سەر تێوەڕامانی خۆیان و، هەڵسەنگاندنی خۆیان، کە ئایا ئەو سوورەتە دەگونجێ کەی دابەزیبێ، کامیان پێش کامیان بێ و، کامیان دوای کامیان بێ؟ هەر بۆیەش ڕیزکردنی سوورەتەکانی قورئان بە پێی ڕیزبەندیی دابەزینیان نیە، بەڵکو بە هەندێك ئیعتیباری دیکەیە، یەکێك لە ئیعتیبارەکان بریتیە لە قەبارەی سوورەتەکە، سوورەتی (**الفاتحة**) دیارە کە وەك سەردێرو پێڕستی قورئان وایە، بۆیە لە پێشەوەیە، دوای وی لە ڕووی قەبارەوە سوورەتی (**البقرة**)یان داناوە، کە لە هەموویان گەورەترە، هەڵبەتە دوایی سوورەتی (**النساء**) لە (**آل عمران**) گەورەترە، بەڵام (**آل عمران**) پێشخراوە، چونکە دەگونجێ لە ڕووی ڕیزبەندیی دابەزینەوە، پێش (**النساء**) کەوتبێ، ئنجا (**النساء**) و (**المائدة**)، ئنجا سوورەته

مەككییـەكانی: **(الأنعـام) و (الأعـراف)** لــە ڕووی قەبـارەوە گەورەتـرن، یانــی: ڕیزكردنـی سـووڕەتەكان لـە موصحەفدا زیاتـر، تەماشـای قەبارەیـان كـراوە، ئەگەرنا تەماشـای ڕیزبەندیـی دابەزینیـان بكردایـە، دەبووایـە سـووڕەتەكانی: **(البقـرة، آل عمـران، النسـاء، المائـدة)** كەوتبانـە دواتـر.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی:

ئـەم سـووڕەتە بـە گشـتیی هەمـان نێـوەڕۆك و سرووشـتی قوڕئانـی مەككەیـی هەیـە، دەتوانیـن بڵێیـن: پەنجـاو دوو (٥٢) ئایەتەكـەی ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە بـۆ سـێ تـەوەر دابـەش بـوون:

**تـەوەری یەكـەم:** ئایەتەكانـی: (١ - ١٦)، باسـی پێغەمبەرایەتیـی موحەممـەد ﷺ و، پووچەڵكردنـەوەی تۆمەتـی ناحەزانـی، كـە بـە شـێت و سـەرگەردانیان داناوە، لـە میانـی ئەمەشـدا باسـی بابایەكـی ملهـوڕ لـە كافـرەكان كـراوە، كـە نـۆ سـیفەتی زۆر خراپـی لـێ هەڵـدراون، ئایەتەكانـی خـوای بـە ئەفسـانەی پێشـینان داناون و خـواش هەڕەشـەی نیشـانە لەسـەر لـووت دانانـی لـێ دەكات: ﴿ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ ١٦ ﴾.

**تـەوەری دووەم:** ئایەتەكانـی: (١٧ - ٣٣)، كـە دەكاتـە حەڤـدە (١٧) ئایـەت و، باسـی بەسـەرهاتی خاوەنانـی باخەكەیـە، كە چـۆن ویسـتوویانە بەر لـەوەی هەژاران و نـەداران پـێ بزانـن، بەرهەمـی باخەكەیـان بچنـن و ببـڕن، بـەڵام كاتێـك ئـەوان لـە شـیرینی خـەو دابـوون، خـوا ﷻ بەڵایەكـی بـۆ باخەكەیـان نـاردوە، بەڵایەكـی وێرانكـەرو، باخەكـە بۆتـە زەوییەكـی ڕووتەنـی سـووتماك و هەرچـی بەروبومیـوەی هەبـووە، سـووتاوەو بووەتـە قەرەبـرووت، ئەوانیـش دوایـی پەشـێمان بونـەوەو، ئومێدیـان خواسـتوە كـە خـوای كاربەجـێ باشـتر لـە باخەكەیانیـان پـێ بـدات.

**تەوەری سـێیەم:** ئایەتەكانی: (٣٤ - ٥٢)، ئەو نۆزدە (١٩) ئایەتە، چەند مەسـەلەیەكی جـۆراو جـۆری تێـدان، بـەڵام لـە بازنـەی باسـی ڕۆژی دواییـدا، كـە بێبڕوایـان، ڕەنجەڕۆ

دەبن و، لە کۆتاییشدا ئامۆژگاریی خوا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە خۆڕاگر بێ، لە هەڵوێستی پەلەکردن و کەم تەحەممولانەدا وەك یونووس عليه السلام نەبێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ ﴾، دواییش جارێکی دیکە خوای بەرز لەم ئایەتەدا گەڕاوەتەوە بۆ سەر ئەسڵی مەبەست، کە سوورەتەکە پێی دەست پێکرد، کە دژایەتی کافرەکانە بۆ قورئان و، بۆ پێغەمبەری خواش ﷺ.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە هەشت تایبەتمەندییمان لێ خستوونەتە ڕوو:

تایبەتمەندیی یەکەم: تەنیا لەم سوورەتەدا خوا سبحانه وتعالى سوێندی خواردوە بە قەڵەم و بەوەی پێی دەنووسرێ، سوێند لەسەر خوراوەکەش (**المقسم عليه**) ئەوەیە کە موحەممەد ﷺ شێت نیە، وەك ناحەزانی گوتوویانە، ئەمە لە ئایەتەکانی: (١ - ٢) ی سەرەتادا هاتوە.

تایبەتمەندیی دووەم: تەنیا لەم سوورەتەدا پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ پێناسەکراوە بەوەی: بێگومان تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴿٤﴾ ﴾.

تایبەتمەندیی سێیەم: تەنیا لەم سوورەتەدا یەکێك لە ناحەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نۆ (٩) سیفەتی خراپ وەسف کراوە بە دوای یەکدا، لە ئایەتەکانی: (١٠ - ١٣).

تایبەتمەندیی چوارەم: بەسەرهاتی هاوەڵانی باخەکە (**أصحاب الجنة**) تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتەکانی: (١٧ - ٣٣) دا.

تایبەتمەندیی پێنجەم: تەعبیری: ﴿ يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ ﴾، ئەو ڕۆژەی لاق وەدەردەخرێ (یان لوولاق وەدەردەخرێ)، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە لە

ئایەتی ژمارە (٤٢)دا، کە زانایان مشت و مڕیی زۆریان لەسەری بووە: ئایا ئەمە مەبەست پێی سیفەتێکی خوایە، یاخود تەعبیرێکە عەرەب بەکاریان هێناوە بۆ کاتی تەنگانەو سەغڵەتیی؟ دوایی باسی دەکەین.

تایبەتمەندیی شەشەم: تەعبیری: ﴿ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ ﴾، وەك هاوەڵی نەهەنگەکە مەبە، کە مەبەست یونووسە عليه السلام، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٤٨) دا.

تایبەتمەندیی حەوتەم: تەعبیری: ﴿ وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ ﴾،

تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە (٥١)دا، واتە: ئەوانەی بێبڕوان خەریکن بە چاوەکانیان بتخلیسکێنن (یاخود بتفەوتێنن)، کاتێك کە گوێبیستی قورئان دەبن.

تایبەتمەندیی هەشتەم: چەند وشەیەك تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوون:

**یەکەم:** ﴿ الْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ ﴾ بە مانای جادوو لێکراو، یاخود شێت، یان دەست لێ وەشێنراو.

**دووەم:** ﴿ هَمَّازٍ ﴿١١﴾ ﴾ عەیب لە خەڵکگر، ئنجا چ لە پاشەملە، چ بەرەو ڕوو، زانایان لەوەدا ڕاجیاییان هەیە.

**سێیەم:** ﴿ مَشَّاءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ ﴾ واتە: دووزمان، یان دووڕوو، یان قسەهێنەرو قسەبەر، (نَمِيْم: **مَنْ نَمَّ لَكَ، نَمَّ عَلَيْكَ**)، (**نميم**): قسە هێنان و بردن، (**مَشَّاء بنَمِيم**) واتە: ئەو کەسەی قسە دەهێنێ و دەبات.

**چوارەم:** ﴿ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ ﴾ واتە: نارەسەن، یاخود: خاوەن زەنەم، واتە: شتێك کە پێیدا شۆڕ بووبێتەوە، وەك ئەوەی بەلای گوێی مەڕدا شۆڕ دەبێتەوە.

**پێنجەم:** ﴿ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ ﴾ واتە: نیشانە لەسەر لووتی دادەنێین، **(الخرطوم)** بە مانای لووتی فیلە، بەڵام لێرەدا دەگونجێ ئەو کەسە لووتی مەیلەو درێژ بووبێ، واتە: ئەو لووتە درێژەی، وەك هی فیلە، نیشانەی لەسەر دادەنێین، دەشگونجێ ئەمە هەر تەعبیرێکی مەجازیی بێ، وەك یەکێك بە یەکێك دەڵێ: دوایی داغت دەکەم، مەرج نیە داغی بکات، یانی زەبرێکت لێ دەدەم.

**شەشەم:** ﴿ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: باغی بڕدراوو چندراو، میوەکەی لێ کرابێتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: وەك بەرە بەیان، هەندێك گوتوویانە: وەك شەو.

**حەوتەم:** ﴿ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ ﴾، باغەکە، بڕەرانی میوەکەی.

**هەشتەم:** ﴿ حَرْدٍ ﴿٢٥﴾ ﴾، بە مانای چنینی باغ، یان بە مانای تووڕەبوون دێ.

**نۆیەم:** ﴿ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ ﴾، بە مانای کەفیل و ئۆباڵدار دێ.

**دەیەم:** ﴿ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: کەسێك زۆر دڵی پڕ خەفەت و داخەو، خەفەت و داخەکەی لە نێو دڵی خۆیدا قەتیس کردوەو، گرتوویەتی تاکو دەرنەچێ.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە بە پێی تەوەرو نێوەڕۆکی ئایەتەکان دابەشمان کردوە بۆ سێ دەرس:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١٦)، کە نێوەڕۆکەکەیان بریتیە لە جەختکردنەوە لەسەر پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ و بەرپەرچدانەوەی پڕوپاگەندەی ناحەزانی و، هۆشداریی دان بە پێغەمبەر ﷺ کە بەقسەی ناحەزانی نەکات و، نەکەوێتە ژێر کاریگەرییان، وەسفکردنی بەشێك لە ناحەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نۆ (٩) سیفەتی زۆر خراپ.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٧ - ٣٣)، باسی خاوەنانی باخەکەیە، کۆمەڵە خەڵکێك بوون باخێکیان هەبووە دوایی بەسەرهاتەکەیان دێنین کە بڕیاریان

داوە حاصـەڵات و میـوەو بەرهەمـی باخەکەیـان بچنـن، بـەر لـەوەی هـەژار و نـەدارەکان بەسـەریان وەربـن، سـەرەنجام ناردنـی خـوا ﷻ بـۆ بەڵایەکـی دەوەردەر لـە کاتێکـدا ئـەوان لـە شـیرینی خـەو دابـوون و، سـزا درانیـان و لـە بەیـن چوونـی باخەکەیـان، باخەکەیـان وەك دەشـتێکی سـوورو سـەقەتاڵە، یاخـود پەرێزێـك کـە هیچـی لـێ نەمابێـت، یاخـود سـووتماتێك شـوێنێك کـە سـووتاوە ئـاوای لێهاتـوەو، پەشـێمان بوونەوەیـان و، داواکردنیـان لـە خـوا ﷻ کـە لـە باخەکەیـان باشـتریان پـێ بـدات.

**دەرسـی سـێیەم:** ئایەتەکانـی کۆتایـی (٣٤ - ٥٢) پێکهاتـوە، باسـی سـەرەنجامی خێـری پارێـزکاران و، یەکسـان نەبوونـی مسـوڵمانان لەگـەڵ تاوانبارانـدا و، پووچەڵکردنـەوەی قسـەی بێبڕوایـەکان لـەو بـارەوەو، سـەرەنجامی شـوومی چاوەڕێکەریـان هـی بێبڕوایـان و، ئامۆژگارییکردنـی خـوا بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ کـە خۆڕاگـرو پشـوو درێـژ بـێ و وەك یونـوس نەبـێ کـە لـە هەڵوێسـتێکی دا پەلـەی کرد و تەنگـە پرێسـکە بـوو، بۆیـە خـوا لـە زاری نەهەنگدا بەنـدی کـرد، وەك سـزادانێك، بـەڵام دوای ئـەوە گەڕایـەوە بـۆ لای خـوای پـەروەردگارو، پاکیـی بـۆ خـوا دەربـڕی و، دانـی بـە هەڵـەی خـۆی داهێنـا، خـوا ﷻ دەرووی خێـری لـێ کـردەوەو.

هەروەهـا دەرخسـتنی ئەوپـەڕی ڕق و کینـەی بێبڕوایانـی ناحـەزی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەرانبـەری، کـە تەنانـەت خەریکـن بـە نیـگای چاوەکانیـان هەڵیخلیسـکێنن، یاخـود ئەوەنـدە بـە ڕقـەوە تەماشـای دەکـەن، دەیانـەوێ هـەر بـە چاوەکانیـان بیفەوتێنـن، یاخـود بیخلسـکێنن و تووشـی ئـازارو نارەحەتیـی بکـەن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە شـازدە (١٦) ئایەتـی سـەرەتای سـووڕەتی **(القلـم)** پێـك دێ، لـەو شـازدە (١٦) ئایەتـەدا، خـوا ﷻ نـۆ (٩) بابـەتی گـەورەو گرنگـی پەیوەسـت بـە پێغەمبەرایەتیـی موحەممـەد ﷺو پەیامەکەیـەوە، دەخاتـەڕوو:

**بابەتـی یەکـەم:** لـە ئایەتەکانـی: یـەك و دوو (١ - ٢)دا، خـوا ﷻ سـوێند دەخـوات بـە قەڵـەم و بـەوەی پێـی دەنووسـن، کـە ئـەی موحەممـەد ﷺ! تـۆ بـە هـۆی چاکـەی پەروەردگارتـەوە شـێت نـی، چونکـە کافـرەکان هیـچ ڕەخنـەو گلەیـی و تێبینییـەکان لەسـەر موحەممـەد ﷺ نەبـوو، هەتـا نەیفەرمـوو: مـن پێغەمبـەرم، ئنجـا بەهـۆی پێغەمبەراتییەکـەوە تۆمەتـی، شـێتیی و جادووگەریـی و فاڵچیەتیـی و شـاعیرییان دەدایـە پـاڵ، بۆیـە خـوای بـێ هاوتـا دەفەرمـوێ: تـۆ بەهـۆی چاکـەی پەروەردگارتـەوە «کـە پلـەی پێغەمبەرایەتییـە» شـێت نـی، ئەمـەش یەکێکـە لـە واتایەکانـی ئـەو ئایەتـە.

**بابەتـی دووەم:** کـە لـە ئایەتـی ژمـارە سـێ (٣)دا هاتـوە، خـوای بـێ وێنـە بـە پێغەمبـەری خاتـەم ڕادەگەیەنـێ: تـۆ پاداشـتێکی بـێ کۆتایـی و نەبـڕاوەت هەیـە، کە بـە دڵنیایـی مەبەسـت پێـی پاداشـتی ڕۆژی دواییـە، هەرچەنـدە لـە دنیاشـدا خـوای بەخشـەر پێغەمبـەری خاتەمـی پاداشـت کـردوەو، پاداشـتی داوەتـەوەو سـەری خسـتوەو، ئـەو پەیامـەی پێیـدا ناردوە بـۆی چەسـپاندوە، بـەڵام پاداشـتی نەبـڕاوە، دەبـێ هـەر لـە ژیانێکـی نەبـڕاوەدا بـێ کـە ڕۆژی دواییـە.

**بابەتـی سـێیەم:** کـە لـە ئایەتـی ژمـارە (٤)دا هاتـوە، ڕاگەیاندنـی ئـەو ڕاسـتییە مەزنەیـە کـە پێغەمبـەری خاتـەم **(علیـه الصلاة والسـلام)** لەسـەر ڕەوشـت و ئاکارێکـی یەکجـار مـەزن و بـەرزە: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾.

**بابەتی چوارەم:** کە لە ئایەتەکانی: پێنج و شەش (٥ و ٦)دا هاتوە، ئەوەیە کە خوای زاناو توانا بەڵێن بە پێغەمبەرەکەی دەدات: ﴿فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ۝٥ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ۝٦﴾، تۆش دەبینی و ئەوانیش دەبینن، کامەتان جادوو لێکراوە، کامەتان سەرگەردان و سەر لێشێواو و شێتە؟! وشەی (**المفتون**) بە هەموو ئەو واتایانە هاتوە.

**بابەتی پێنجەم:** کە لە ئایەتی ژمارە حەوت (٧)دا هاتوە، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە تەنیا خوا ﷻ دەزانێ کێ لە ڕێی ئەو لایداوەو، بەس ئەویش زانایە بە ڕێ ڕاستگرتووان: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ۝٧﴾.

**بابەتی شەشەم:** کە لە ئایەتەکانی: هەشت و نۆ (٨ و ٩)دا هاتوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ لە پێغەمبەری خۆی ﷺ قەدەغە دەکات، بە قسەی بێبڕوا بە درۆ دانەرەکانی پەیامی خواو کتێبی خواو دیداری خوا بکات، کە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ نەرمکێشیی بکات، ئەوان ئامادەن نەرمکێشیی بکەن، چونکە کەسێك کە لەسەر ناهەق و باتیڵە، زۆر دەربەست نیە، دەستیشی لێ هەڵبگرێ، یاخود واز لە هەندێکی بهێنێ، بەڵام ئەهلی هەق ئامادەنین دەستبەرداری تۆزقاڵێك لە هەقەکەی خۆیان بن، بە ڕێککەوتن و هەقی نیوەچڵ ڕازی نین و، بە: (**أنصاف الحلول**) ڕێککەوتن لەوەدا کە لە نێو قەدێ، بگەنە یەکدی، ڕازی نین.

**بابەتی حەوتەم:** کە لە ئایەتەکانی: دە تاکو چواردە (١٠ - ١٤)دا هاتوە، وەسفکردنی هەندێك لە ناحەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نۆ (٩) سیفەتی زۆر خراپ: ﴿وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ مَّهِينٍ ۝١٠ هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ۝١١ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ۝١٢ عُتُلِّۭ بَعۡدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ۝١٣ أَن كَانَ ذَا مَالٖ وَبَنِينَ ۝١٤﴾.

سیفەتی یەکەم و دووەم: ﴿وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ مَّهِينٍ﴾، بەقسەی هەر زۆر سوێند خۆرێکی سووك و بێ بایەخ مەکە.

سیفەتی سێیەم: ﴿هَمَّازٖ﴾، عەیبگرو ڕەخنەگر لە خەڵك، یاخود شکێنەری خەڵك لە پاشەملە یاخود بەرەو ڕوو.

سیفەتی چوارەم: ﴿ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ﴾، دوو زمانیی دەكات، قسە لە نێوان خەڵكی دا دێنێ و دەیبات.

سیفەتی پێنجەم: ﴿ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ ﴾، خێرو چاكە لە خەڵك دەگرێتەوەو زۆر دەست دەگرێتەوە، لەوەی خێرو چاكە تووشی خەڵك بكات، ئنجا ئەمە دەگونجێ مەبەست خێری ماددیی بێ، واتە: ماڵ و سامان لە خەڵك دەگرێتەوەو هاوكاریيان ناكات، دەشگونجێ (خَیر) مەبەست پێی چاكەی مەعنەویی بێ، واتە: زۆر ڕێگرە لە خەڵك كە تووشی خێرو چاكەی مەعنەویی ببن، كە ڕووكردنە ئیسلامە.

سیفەتی شەشەم: ﴿ مُعۡتَدٍ ﴾، تێپەڕێنەرە، سنووربەزێنە، بۆ مافی ئەوانی دیكە پێشێلكەرە.

سیفەتی حەوتەم: ﴿ أَثِيمٍ ﴾، زۆر گوناحكارە.

سیفەتی هەشتەم: ﴿ عُتُلِّۭ ﴾، چەند واتایەكیان بۆ هێناون: بۆ وێنە: دڵڕەق، زۆرخۆر، واتە: هەم بە هەندێك سیفەتی مەعنەویی خراپیان مانا كردوە، هەم بە هەندێك سیفەتی بەرهەستی خراپ.

سیفەتی نۆیەم: ﴿ زَنِيمٍ ﴾، واتە: ناڕەسەن، یاخود كەسێكە كە زەنەمەی هەیە، وەك چۆن مەڕ پارچە گۆشتێك بە لای گوێیدا بەربۆتەوە، ئەو كەسەش دیارە ئەو نیشانەیەی هەبووە، دەشگونجێ (زنیم): سیفەتێكی مەعنەویی بێ، واتە: ناڕەسەنە، ڕەسەن نیەو نانەجیبە، ئنجا ئایا ئەوە كەسێكی دیارییكراو بووە، یان چەند كەسێكی دیارییكراو بوون؟ دوایی باسی دەكەین، مەرج نیە تەنیا یەك كەسی دیارییكراو بووبێ، چونكە لەو بارەوە كە ئایا مەبەست پێی ئەبوو جەهلە، یان وەلیدی كوڕی موغیرەیە، یان ئەزری كوڕی حاریسە؟ خوای بەرز دەری نەخستوە، بۆیە دەگونجێ بەسەر زیاتر لە كەسێكدا - هەر كەسێك خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ - بچەسپێ.

ئنجا خـوای پـەروەردگار باسـی ئـەوە دەكات: ﴿ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴾، واتـە: بەهـۆی ئـەوەوە كـە خاوەنـی مـاڵ و سـامان و خاوەنـی كـوڕان و قەڕەباڵغییـە، بـە قسـەی مەكـەو فەرمانبەریـی بـۆ مەكـە، ئنجـا ئـەو كەسـە عادەتـی وابـووە: ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ ﴾،

كاتێك ئایەتەكانـی ئێمـەی بەسـەردا بخوێندرێنـەوە دەڵـێ: ئەفسـانەی پێشـینانە، لـە كۆتایـی دا خـوای دادگـەر دەفەرمـوێ: ﴿ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ ﴾.

ئێمـە نیشـانە لەسـەر لووتـی دادەنێیـن، ئەمـەش هـەم دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ڕواڵەتـی واتایەكـەی بـێ، وەك بـاوەو گوتـراوە: لووتـی بـە بڕیـن بچـێ، هەندێـك دەڵێـن: لـە جەنگـی بـەدردا شمشـێر بـەر لووتـی كەوتـوەو، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی مانـا مەعنەوییەكـەی بـێ، وەك یەكێـك بـە یەكێـك دەڵـێ: داغـت دەكـەم، یـان گوێـت دەبـڕم، بێگومـان مەبەسـت پێـی مانـا ڕواڵەتییەكـەی نیـە واتـە: زەبرێكـت لـێ دەدەم و تووشـی ئازارێكـت دەكـەم.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ نٓ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّواْ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، نوون، سوێند بە قەڵەم و بەوەی دەینووسن ﴿١﴾ تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ!) بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە (کە پێغەمبەرایەتییە) شێت نی ﴿٢﴾ بێگومان پاداشتێکی نەبڕاوەشت هەیە لە ڕۆژی دوایی دا ﴿٣﴾ بەڕاستیی تۆ لەسەر ڕەوشت و ئاکارێکی مەزنی ﴿٤﴾ لەمەودوا تۆش دەبینی و ئەوانیش دەبینن شێتیی و (سەرگەردانیی) لە کامتان دایە! ﴿٥﴾ بە دڵنیایی پەروەردگارت خۆی زاناترە بەو کەسەی لە ڕێی ئەو ون بووە (و لایداوە) ﴿٦﴾ ئەویش بە ڕێی ڕاستگرتووان زاناترە ﴿٧﴾ ئنجا (ئەی موحەممەد ﷺ!) بە قسەی بەدرۆ دانەران مەکە (گوێڕایەڵییان مەکە) ﴿٨﴾ حەزیان کرد نەرمکێشیی بکەی و ئەوانیش نەرمکێشیی بکەن ﴿٩﴾ هەروەها گوێڕایەڵی هەر زۆر سوێند خۆرێکی سووکەڵە (و ڕیسوا) مەبە ﴿١٠﴾ زۆر غەیبەتکەری قسە هێنەرو بەر ﴿١١﴾ زۆر دەستگرەوە لە خێرو چاکە ﴿١٢﴾ سنوورشکێنی گوناحبار، زبرو ناقۆڵاو، دوای ئەوەش نارەسەن ﴿١٣﴾ (بەقسەی مەکە) لە سۆنگەی ئەوەوە کە خاوەنی سامان و کوڕانە ﴿١٤﴾ کاتێك ئایەتەکانمانی بەسەردا خوێنرانەوە، گوتی: ئەفسانەکانی پێشینانە ﴿١٥﴾ لەمەودوا سەر لووتی نیشانەدار دەکەین ﴿١٦﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(غَيْرَ مَمْنُونٍ): (أَي: غَيْـرَ مَعْـدُودٍ، أَوْ بِغَيْرِ حِسَـابٍ، أَوْ غَـيْرَ مَقْطُـوعٍ وَلَا مَنْقُـوص)، (غَيْرَ مَمْنُونٍ): بـە چەنـد تەعبیرێـك واتـا كـراوە: نەژمێـردراو، بەبـێ ژمـاردن، بـێ كۆتایـی و بـێ ئـەوەی كـەم و كورتیـی تێدا هەبێ، وشـەی (مَمْنُون) لـە ئەصڵدا لـە وشـەی (مَنّ) هاتـوە، بـە مانـای (قَطْع) بڕیـن، كەواتـە: (غَيْـرَ مَمْنُـون)، واتـە: (غَيْـرَ مَقْطُـوعٍ)، یاخـود نەژمێـردراوو حیسـاب نەكـراوە (بِغَيْرِ حِسَـابٍ).

(خُلُقٍ): (الخَلْـقُ وَالْخُلُـقُ: فِي الأَصْـلِ وَاحِـدٌ كَالـشَّرْبِ وَالـشُّرْبِ، وَالـصَّرْمِ وَالـصُّرْمِ، لَكِـنْ خُـصَّ الْخَلْـقُ بِالأَشْـكَالِ، وَالصّـورِ المُدْرَكَـةِ بِالْبَـصَرِ، وَخُـصَّ الْخُلُـقُ بِالقِـوَى وَالسَّـجَايا المُدْرَكَـةِ بِالْبَصِـيرَة)، وشـەی (خَلْقُ وخُلُقُ) لـە ڕیشـەدا یەكـن، وەك (شَرْب وشُرْب) كـە هەردووكیـان بـە مانـای خواردنـەوە دێـن، (صَرْم وصُرْم) هەردووكیـان بـە مانـای بڕیـن یـان چنیـن دێـن، بـەڵام وشـەی (خَلْق) تایبـەت كـراوە بـەو وێنـەو دیمەنانـەوە كـە بـە چـاو دەبینرێـن، وشـەی (خُلُق)یـش تایبەتكـراوە بـەو هێـزو ئاكارانـەوە كـە بـە چـاوی عەقـڵ هەسـتیان پـێ دەكـرێ، واتـە: شـتی مەعنەوییـن.

كەواتـە: (خُلُـق) واتـە: ئـاكارو ڕەوشـتێك كـە بـە عەقـڵ و فیكـر لـە مرۆڤـدا دەبینـرێ، هـەروەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبەریشـدا ﷺ هاتـوە، كـە تەماشـای ئاوێنـەی كـردوە فەرموویەتـی: {اللَّهُـمَّ كَمَا أَحْسَـنْتَ خَلْقِي فَحَسِّـنْ خُلُقِـي} (أخرجه ابـن حبـان: ٩٥٩، قـال شـعيب الأرنـؤوط: حديـث صحيـح بشـاهده)، ئـەی خوایـە! وەك چـۆن شـێوەو دیمەنـت جـوان كـردووم، ڕەوشـت و ئاكاریشـم جـوان و پەسـەند بكـە.

(ٱلْمَفْتُونُ): سـەرگەردان، یـان سـەرگەردانكراو، یـان جـادوو لێكـراو، (الْفِتْنَـةُ: كَقَوْلِـكَ لَيْـسَ لَـهُ مَعْقُـولٌ، أَي: عَقْـلٌ)، (فتنـة) وەك ئـەو قسـەیەتە: (لَيْـسَ لَـهُ مَعْقُـولٌ)، (مَعْقُـولٌ): مەبەسـت پێـی عەقڵـە، واتـە: عەقڵـی نیـە، (مَيْسُـور)یش یـانی:

ئاسانکراو، کە بە مانای (**یُسْر**) دێ، واتە: ئاسانیی و، (**مَعْسُور**) بە مانای (**عُسْر**) دێ واتە: زەحمەتیی، لێرەشدا (**مَفْتُون**) بە مانای (**فِتْنَة**) دێ، کە دەفەرموێ: ﴿ بِأَيِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴾، کامتان فیتنەن، یان کامتات سەرگەردانیی و سەرلێشێواویی، یاخود شێتیی و نەفامیی تێدایە.

(تُدْهِنُ): (**الإِدْهَانُ مِثْلُ التَّدْهِين، أَدْهَنَهُ أَدْهَنَ يُدْهِنُ، دَهَّنَ يُدَهِّنُ، الْمُدْهَنُ مَا يُجْعَلُ فِيهِ الدُّهْنُ**)، ( **إدهان**) وەک (**تدهین**) ە- لەمانادا- (**أَدْهَن يُدهن**) (**دَهَّن يُدَهِّن**) وەک یەکن،(**مُدْهَنُ**) شتێکە چەور بکرێ، یاخود ڕۆنی تێ بدرێ، (**لَكِنْ جُعِلَ عِبَارَةً عَنِ الْمُدَارَاةِ**)، بەڵام دوایی بە مانای موداڕا و ساچاندن و هەڵکردن، دێ.

چونکە ئەگەر بویسترێ شتێك نەرم بکرێتەوە، چەور دەکرێ و ڕۆنی لێ دەدرێ، پێست کە وشك دەبێتەوە، یان هەر شتێکی دیکە بۆ ئەوەی نەرم بێتەوە، ڕۆنی تێ دەدەن، واتە: بێبڕوایەکان خۆزگە دەخوازن کە تۆ نەرمکێشیی بکەی و لەگەڵیاندا گونجاو بی، بچیە سەر ڕێی ئەوان، ئەوانیش بە هەمان شێوە لەگەڵ تۆدا گونجاو دەبن و دێنە سەر ڕێی تۆ، ئەوان بە ئاسانیی دەستبەرداری باتیڵەکەی خۆی دەبن، ئەگەر تۆ تۆزێك دەستبەرداری بەشێك لە هەقەکەی خۆتیی.

(حَلَّافٍ): زۆر سوێند خۆر، (**يَعْنِي مِكْثَارٍ مِنَ الْحَلِف، وَشيءٌ مُحْلِفٌ، أَيْ: يَحْمِلُ الإِنْسَانَ عَلَى الْحَلِفِ**)، (**حَلاّف**)زۆر سوێند خۆر، ئنجا دەگوترێ: (**شَيءٌ مُحْلِفٌ**) شتێکی سوێند بە مرۆڤ خۆر یانی: مرۆڤ ناچار بکات زۆر سوێندی لەسەر بخوات.

(مَهِينٍ): (**الْمَهَانَةُ: الضُّعْفُ وَالذُّل**)، (**مَهانة**): بە مانای کەم بایەخ و سووك دێ، چونکە وشەی (**مَهَانَةُ**) بە مانای بێ هێزیی و زەبوونیی دێ، کەواتە: (**مَهِين**) ئەو کەسەیە بێ هێزیی و زەبوونیی تووش بووە.

(هَمَّازٍ): (**الْهَمْـزُ كَالْعَـصْرِ، هَمَـزْتُ الـشَّيء فِي كَفِّـي، وَهَمْـزُ الإِنْسَـانِ: اغْتِيَابُـهُ**)، (**همـز**) وەك گوشین وایـە، (**همز**)یـش مانایەکـەی لـەوەوە نیزیکە، شـتێك لە دەسـتی خۆتـدا، ڕابگووشـی و تێکیبشـکێنی، دەگوتـرێ: (**هَمَـزْتُ الـشَّيء فِي كَفِّـي**) شـتەکەم لـە دەسـتی خۆمـدا گووشـی، یـان وردم کـرد، کـە دەگوتـرێ: (**هَمَـزَ فُـلَانٌ فُلَانـا**) فڵانکـەس غەیبەتـی فڵانکـەسی کـردو پاشـملە شـکاندی، هەندێکیـش گوتوویانـە: (**هَمْـز**) بریتیـە لـەوەی کـە پاشـملە بـێ، بـەڵام (**لَمْـز**) ئەوەیـە بـەرەو ڕوو بـێ، بـەڵام وا پـێ دەچـێ بەپێـی ئـەوەی خـوا ﷻ لـە ئایـەتی (١١)ی سـوورەتی (**الْحُجُـرَات**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَلْمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾، ڕووبـەڕوو عەیـب لـە یەکـدی مەگـرن، دیسـان خـوای دادگـەر دەفەرمـوێ: ﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١ ﴾ **الهمـزة**، لەسـەر کێشـی (**فُعَلَة**)یـە کـە بـۆ زێدەڕۆییـە، واتـە: سـزای سـەخت بـۆ هـەر کەسـێك کـە پاشـملە بـە خراپـە باسـی خەڵـك دەکات و، دەیـەوێ بیانشـکێنێ، ڕووبـەڕووش تانەیـان لـێ دەدات و دەیـەوێ بیانشـکێنێ.

(مَشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ): زۆر قسـە هێنـەر و بـەرە، (**النَّـمُّ: إِظْهَـارُ الْحَدِيـثِ بِالْوِشَـايَةِ وَأَصْـلُ النَّمْنَمَـةِ: الْهَمْـسُ وَالْحَرَكَـةُ الْخَفِيفَـة**)، وشـەی (**نَـمّ**): بریتیـە لـە دەرخسـتنی قسـە بـە شـێوەی گواسـتنەوەی بـۆ کەسـێکی دیکـە بـۆ نێـوان تێکـدان، وشـەی (**نمنمـة**): بـە قسـەی چپـە دەگوتـرێ، هەروەهـا بـە جووڵەیەکـی سـووکیش دەگوتـرێ، کەواتـە: وشـەی (**نَـمَّام**) وەك پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: {**لَا يَدْخُـلُ الْجَنَّـةَ نَمَّامٌ**} (**أخرجه مسـلم: ٣٠٣، عَـنْ حُذَيْفَـةَ رضي اللـه عنـه**)، (**نمّـام**): کەسـێکە قسـەی کەسـێك بۆ کەسـێکی دیکە دەبـات، بـۆ ئـەوەی نێوانیـان تێکبـدات، بۆیـە گوتـراوە: (**مَـنْ نَـمَّ لَـكَ، نَـمَّ عَلَيْـكَ**)، هەر کەسـێك قسـەی خەڵـك بـۆ تـۆ بێنـێ، هـی تـۆش بـۆ خەڵکـی دەبـات، ئنجـا (**مَشَّـاء**) لـە (**مَـشْي**)ەوە هاتـوە، واتـە: کەسـێك کـە زۆر قسـەی خەڵـك دێنـێ و دەبـات.

(مُعْتَدٍ): (**الإِعْتِـدَاءُ مُجَـاوَزَةُ الْحَـدِّ**)، (**إِعْتِـدَاءُ**): سنوورشـکاندن و تێپەڕانـدن لـەو سـنوورەی دیاریکـراوە، ئنجـا بـە شـەرع دیارییکرابـێ، یـان بـە عەقـڵ، یـان بـە عـورف.

(أَثِيمٍ): لەسەر كێشی (فَعِيل)ە، وەك: عەزیز و ڕەحیم، بۆ زێدڕۆییە لە (آثِم) دا، (آثِم) بە مانای گوناهبار دێ، (أَثِيمٍ) یانی: زۆر گوناهبار، وەك (رَاحِم) واتە: بە بەزەیی، بەڵام (رَحِيم) واتە: زۆر بە بەزەیی، (**الإِثْمُ وَالأَثَامُ اسْمٌ لِلأَفْعَالِ المُبْطِئَةِ عَنِ الثَّوَابِ**)، وشەی (**الإِثْمُ، وَالأَثَامُ**) ناون بۆ ئەو كردەوانەی مرۆڤ لە پاداشت دوادەخەن، واتە: گوناه و تاوان.

(عُتُلٍّ): (**العَتْلُ: الأَخْذُ بِمَجَامِعِ الشَّيْءِ وَجَرُّهُ بِقَهْرٍ كَعَتْرِ الْبَعِيرِ، وَالْعُتُلُّ: الأَكُولُ المَنُوعُ الَّذِي يَعْتِلُ الشَّيْءَ عَتْلاً**)، (عَتْل): بریتیە لەوەی شتێك بەزۆر هەمووی بگری و ڕایكێشی، وەك چۆن حوشتر ڕادەكێشرێ، وشەی (**الْعُتُلُّ**) هەم بە مانای بابایەكی زۆرخۆرو، هەم بە مانای كەسێك كە تەنیا بۆ خۆی خواردن قۆرخ دەكات، زۆر خۆرەو نایدات بە كەس، (**عتل**) بە كەسێك دەگوترێ كە سیفەتی جەستەیی خراپی هەبێ و، وێڕای وی، بە مانای كەسێكیش دێ، كە لە ڕووی مەعنەوییەوە سیفەتی خراپی هەبێ، وەك زبریی و ڕەقیی.

(زَنِيمٍ): (**الزَّنِيم وَالمُزَنَّمُ: الزَّائِدُ فِي الْقَوْمِ وَلَيْسَ مِنْهُمْ، تَشْبِيهاً بِالزَّنَمَتَيْنِ مِنَ الشَّاةِ وَهُمَا المُتَدَلِّيتَانِ مِنْ أُذُنِهَا وَمِنَ الْحَلْقِ**)، (زنيم و مُزَنَّم) واتە: كەسێك كەلە كۆمەڵە خەڵكێك زیادەو، لەوان نیە، بەڵام خۆی بەوانەوە پەیوەست كردوە، كە لێرەدا چوێنراوە بەو دوو پارچە گۆشتە زیادەی بەلای گوێی مەڕدا دێنە خوارێ، یان جاری وایە بەلای قوڕگیدا، دێنە خوار.

هەندێك لە ئاژەڵان گۆشتی زیادەیان دێتە خوارێ، ئنجا كەسێكیش كە لە عەشیرەتێك یان نەتەوەیەك نیە، بەڵام خۆی خستۆتە نێو ئەوانەوە ئەوەی پێ دەگوترێ.

(سَنَسِمُهُۥ): (**الْوَسْمُ: التَّأْثِيرُ وَسِمَةُ الأَثَرُ، وَسَمْتُ الشَّيء وَسْماً أَيْ: أَثَّرْتُ فِيهِ بِسِمَةٍ**)، (وَسْم): بە مانای شوێن دانانە لەسەر شتێك، (سِمَة) بە مانای شوێنەوارە، (**وَسَمْتُ الشَّيء وَسْماً**) شوێنكەم لەسەر ئەو شتە داناو، شوێنەوارم لەسەر بەجێهێشت.

(ٱلۡخُرۡطُومِ): (أَنْفُ الْفِيلِ فَسُمِّيَ أَنْفُهُ خُرْطُوما اسْتِقْبَاحاً لَهُ)، (خرطوم): لە ئەسڵدا لووتی فیلە، کە ئێمە پێی دەڵێین: لووت، بەڵام لە ئەسڵدا ئەوەی خورتوومە بۆ فیل، وەك زار وایەو شتی پێ دەخوات، بۆیەش لووتی ئەو کەسە خوای زاناو شارەزا زەمی کردوە، بە خورتووم ناوبراوە، بۆ دزێو پیشاندانی، یان ئەو کەسە کەسێك بووە لووتی درێژ بووە، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە ئێمە نیشانە لەسەر لووتی دادەنێین، بەڵام لە جیاتی (أَنْف) خوای بەرز وشەی (خُرْطُوم) بۆ بەکارهێناوە، لەبەر ئەوەی ڕەنگە لە ڕووی قەبارەو کەلەشەوە، وەك فیلێك گەورە بووبێ.

کەواتە کە دەفەرموێ: (سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ): (أَيْ نُلْزِمُهُ عَاراً لَا يَنْمَحِي عَنْهُ)، ئێمە بە پەندێکی دەبەین، یاخود زەبرێکی لێ دەدەین، هەرگیز ئەو زەبرەی لەبیر نەچێتەوەو، ئەو شوێنەوارە لەسەری لانەچێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

بەڕێـــــــزان!

سێ ڕیوایەتم هێناون بۆ هۆی هاتنە خواری ئەم دوو ئایەتە موبارەکەی خوا تیاندا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾﴾ **القلم.**

**١- ڕیوایەتی یەکەم: {عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ قَالَ: قَالَ مَرْوَان بن الحكم لما بَايع النَّاس ليزِيد: سُنَّةُ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: إِنَّهَا لَيْسَتْ بِسُنَّةِ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَلَكِنَّهَا سَنَةُ هِرَقْلَ، فَقَالَ مَرْوَانُ: هَذَا الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ: ﴿وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا ﴿١٧﴾﴾، قَالَ: فَسَمِعَتْ ذَلِكَ عَائِشَةُ رضي الله عنها، فَقَالَتْ: إِنَّهَا لَمْ تَنْزِلْ فِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، وَلَكِنْ نَزَلَ فِي أَبِيكَ: ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾﴾} (أخرجه الدر المنثور: ج١، ص٢٤٦، ونسبه لابن مردويه، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣ ص٤٥٣).**

واتە: ئەبوو عوسمانی نەهدیی گێڕاویەتەوە، دەڵێ: کاتێك خەڵك بەیعەتی دا بە یەزیدی کوڕی موعاویە، (دیارە بە زەبرو زۆر)، مەڕوانی کوڕی حەکەم کە والی موعاویە بوو، لەسەر مەدینە، گوتی: ئەو بەیعەت دانەی خەڵك بە یەزید، هەروەك ڕێبازەکەی ئەبوو بەکر و عومەر وایە، {وەك چۆن ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، پێشنیاری کرد عومەر لە دوای خۆی جێنشینی مسوڵمانان بێ، ئەگەر مسوڵمانان پێیان چاك بێ، خەڵکیش پێشنیارەکەیان پێ چاك بوو، بەڵام موعاویە بە زۆر بەیعەتی بۆ یەزیدی کوڕی وەرگرت، ئنجا مەڕوانی کوڕی حەکەم کە خزمی موعاویە بووە، گوتی: ئەو ڕەفتارەی موعاویەش هەروەك ڕەفتارەکەی ئەبوو بەکر وایە کە عومەری پێشنیار کرد، موعاویەش ئەوەتا پێشنیار دەکات یەزیدی کوڕی خەلیفە بێ[1]}، ئنجا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوو بەکر (خوا لە

---

(١) کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (قیاسی کەشکێ لە مەشکێ)، ئەبوو بەکر و عومەر لە کوێ

خۆی و بابی ڕازی بێ) لەوێ بوو، گوتی: ئەوە ڕێبازی ئەبوو بەکر و عومەر نیە، بەڵکو ڕێبازی هیرەقلە، {و حوکمی میراتیی و بنەماڵەییە}، مەڕوانی کوڕی حەکەم گوتی: ئەوەبوو کە ئەو ئایەتەی لە بارەوە هاتە خوار {واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوو بەکر}، کە لە سووڕەتی (**الأحقاف**) دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾.

ئەو کەسەی بە باب و دایکی گوت، ئۆف بۆ ئێوە! ئایا بەڵێنم پێ دەدەن زیندوو ببمەوەو، چەندان سەدەش لە پێش مندا ڕابردوون، ئەوە هەر ئەفسانەی پێشینانە {واتە: من زیندوو نابمەوە}.

{گوتی: ئەم ئایەتە لە بارەی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوو بەکر دابەزی، هەڵبەتە مەڕوانی کوڕی حەکەم ڕاستی نەکردوە}، عائیشەش خوا لێی ڕازی بێ، گوێی لێ دەبێ و دەڵێ: ئەم ئایەتە لە بارەی عەبدوڕڕەحمانەوە نەهاتۆتە خوار، بەڵام لە بارەی بابتەوە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوار: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ ﴾القلم. (واتە: لە بارەی حەکەمی کوڕی عاصەوە هاتۆتە خوارەوە، کە دەکاتە بابی مەڕوان).

**٢-** ڕیوایەتی دووەم: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما: ﴿ عُتُلٍّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ ﴾ **قَالَ: «رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ لَهُ زَنَمَةٌ مِثْلُ زَنَمَةِ الشَّاةِ»**} **(أخرجه البُخَاري: ٤٩١٧)**

---

(خوا لێیان ڕازی بێ) و موعاویە و یەزیدی کوڕی لەکوێ؟ کە ئەبوو بەکر تەنیا پێشنیار بوو کردی، لە نەخۆشیی مەرگیدا نامەیەکی نووسیبوو هەرکات مردم، ئەگەر خەڵك پێیان چاك بوو لە دوای من عومەرم پێ باشە، جێنشینی مسوڵمانان بێ، کە ئەگەر ئەبوو بەکریش پێشنیاری نەکردبایە هەر ئەویان پێ چاك بوو و بەیعەتیان پێ دەدا، بەڵام موعاویە بەزۆر یەزیدی کوڕی وەک حوکمڕان بەسەر موسڵماناندا چەسپاند!!

واتـە: لـە ئیبنـو عەبباسـەوە ﭭ گێڕدراوەتـەوە، دەربـارەی ئـەم ئایەتـە: ﴿ عُتُلِّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ ﴾، گوتوویـەتی: پیاوێکـە لـە قوڕەیـش گۆشـتێکی زیـادەی هەبـوو، وەك گۆشـتی زیـادەی مـەڕ، {کـە بـەلای گوێیـدا بەردەبێتـەوە}.

لـە کوردەواریـی خۆمانـدا دەڵێـن: مـەڕی گـوێ گـوار، واتـە: گۆشـتێکی زیـادە بـەلای گوێیـدا بەمـلاو بەولایـدا دێتـە خـوار.

٣- ڕیوایەتی سێیەم: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﭭ: **قَالَ: نَزَلَ عَلَى النَّبِيِّ** ﷺ: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ ﴾، **فَلَمْ نَعْرِفْهُ حَتَّى نَزَلَ عَلَيْهِ بَعْدَ ذَٰلِكَ: زَنِيمٍ، فَعَرَفْنَاهُ لَهُ زَنَمَةٌ كَزَنَمَةِ الشَّاةِ**} (**أخرجه الطبري في جامع البيان: ج٢٩ ص١٧، الإستيعاب في بيان الأسباب ج٣ ص٤٥٤، وذكره السيوطي في الدر المنثور ج٨ ص١٤٨، وزاد نسبتَهُ لابن مردويه**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﭭ لـە بـارەی ئـەم فەرمایشـتەی خـواوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ ﴾، دەڵـێ: نەماندەزانـی مەبەسـت پێـی کێیـە، تاکـو دوایـی ئـەوەش دابەزیـە سـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ عُتُلِّۭ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ ﴾، واتـە: لـە دوای ئـەم سیفەتە خراپانـە، زەنیمیشـە، ئـەو کاتـە ناسـیمان مەبەسـت پێـی کێیـە، پیاوێك بوو گۆشـتێکی زیـادەی هەبـوو، وەك گۆشـتی زیـادە، کـە بـەلای گوێـی مـەڕدا دێتـە خـوار، ئنجـا زانیـمان کـە ئـەم ئایەتانـە مەبەسـت پێـی ئـەون.

هەڵبەتـە ئەمـە یەکێـك لـە واتاکانیەتـی، هەندێکیـش لـە زانایـان وەك باسـی دەکەیـن دەڵێـن: (**زَنِيمٍ**) واتـە: ناڕەسـەن، یاخـود لەگـەڵ هۆزێـك نەبـێ و خـۆی خسـتبێتە گـەڵ ئـەوان.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، ئـەوەش مەبەسـتی ئەوەيـە:

١- ئەم كارە تەنیا بۆ خوای تاك و پاك دەكەم.

٢- ئەم كارە بە پێی شەرعی خوای كارزان دەكەم.

٣- ئەم كارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەكەم.

٤- ئەم كارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوای بێ هاوەڵ ئەنجام دەدەم.

﴿نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ﴾، نـوون، {نـوون پیتێکـە لـە بیسـت و هەشـت پیتەكـەی کـە زمانـی عەرەبییـان لـێ پێکهاتـوە}، سـوێند بـە قەڵـەم و بـەوەی دەینووسـن واتـە: خەڵـك دێـڕەكان دەنووسـن، (سَطْر) بـە مانـای ڕیزکردنـی شـتێكەو بـە مانـای دێڕیش دێ، لەبـەر ئـەوەی وشـەكان ڕیـز دەكرێـن بـە تەنیشـت یەكـەوە، دێڕەكانیش بـە پێنـووس دەنووسرێـن، واتـە: سـوێند بـە پێنـووس و بـەو دێڕانـەی بـە پێنـووس دەیاننووسـن، خەڵـك دەیاننووسـن.

هەڵبەتـە ئـەم سـووڕەتە كۆتـا سـووڕەتە، كـە بـە پیتـە پچـڕ پچـڕەكان دەسـت پـێ دەكات و لـە هەمـوو قورئانـدا، بیسـت و نـۆ (٢٩) سـووڕەت، بـەو پیتانـە دەسـت پـێ دەكـەن، دوو سـووڕەتیان مەدینەییـن كـە بریتیـن لـە: **(البَقـرة وآل عمـران)** هەردووكیـان بـە (الٓمٓ) دەسـت پـێ دەكـەن و، بیسـت و حـەوت سـووڕەتەكەی دیكـە هەموویـان مەككەییـن، كـە ئێمـە لـە سـەرەتای سـووڕەتی (یونـس)دا كورتـە باسێكی تاڕاددەیـەك تێـرو تەسـەلمان لـە بـارەی ئـەو سـووڕەتانەوە كـردوە، كـە بـەو پیتانـە دەسـت پـێ دەكـەن، هەندێكیـان بـە یـەك پیـت دەسـت پـێ دەكـەن، كە سـێ

سـووڕەتن: (**ص، ق، ن**) و، هەندێکیـان بـە دوو پیـت دەسـت پێدەکـەن کـە ئـەوان زۆرن، بـۆ نموونـە: (**طـس، یـس، طـه، حـم**)، (**حـم**) حەوتیـان هـەر لـە ڕیـزی یەکـن و، هەندێکیـان بـە سـێ پیتـان دەسـت پێدەکـەن وەك: (**الـر، طسـم، الم**)و، هەندێکیـان بـە چـوار پیتـان دەسـت پـێ دەکـەن وەك: (**المـص، المـر**)و، هەندێکیـان بـە پێنـج پیـت دەسـت پـێ دەکـەن کـە دوو سـووڕەتن: یەکێکیـان سـووڕەتی مەریەمـە (**کهیعـص**)، ئـەوی دووەمیـان سـووڕەتی شـوڕایە (**حـم. عسـق**)، هەروەهـا لـە سـەرەتای سـووڕەتی (**الشـعراء**)دا، جارێکـی دیکـە قسـەمان لـەو بـارەوە کردۆتـەوە، ڕوونتریـن واتـاش بـۆ ئـەو پیتانـە، ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ دەیـەوێ بـە مرۆڤـەکان بفەرمـوێ: ئـەو فەرمایشـتەو ئـەم قوڕئانـەی بـۆم دابەزانـدوون کـە سـەد و چـواردە سـووڕەتە، شـەش هـەزارو دوو سـەد و سـی و شـەش (٦٢٣٦) ئایەتـەو، حەفتـاو حـەوت هـەزارو چـوار سـەد و نـەوەد (٧٧٤٣٩) وشـەیە، سێسـەدو بیسـت و یـەك هـەزار سـەدو هەشـتا (٣٢١١٨٠) پیتـە، ئـەم قوڕئانـە هـەر لـەو پیـت و دەنگانـە پێـك دێ، کـە ئێـوە پێیـان دەنووسـن و پێیـان دەدوێـن، ئنجـا بـەوە بزانـن کـە ئـەم فەرمایشـتە بێژەرەکـەی خـوای بـەرزی مەزنـە، کـە ئێـوەش ئـەو پیـت و دەنگانەتـان لەبـەر دەسـتدا هـەن، بـەڵام خـوا ئـەم فەرمایشـتەی خـۆی لـێ پێکهێنـاون، کەچـی ئێـوە قسـەی ئاساییان پـێ دەکـەن، کەواتـە: بزانـن کـە ئـەم فەرمایشـتە نـە موحەممـەد ﷺ خـۆی گوتوویەتـی و، نـە هیـچ کەسـێکیش فێـری کـردوەو، نـە هەڵیشیبەسـتوە، بەڵکـو خـوا لـە ڕێـی جیبریلـەوە بـۆی دابەزانـدوە، کەواتە: هەمـان ئەو کەرەسـتەیەی ئـەو فەرمایشـتەی لـێ پێکهاتـوە، کـە پیـت و دەنگەکانـن لەبـەر دەسـتی ئێوەشـدا هـەن، بـەڵام ئێـوە ناتوانـن نـەك قوڕئانێکـی ئـاوا بێنـن، بەڵکـو دە(١٠) سـووڕەتی وابێنـن، بگـرە تەنانـەت سـووڕەتێکیش بێنـن.

ئنجـا خـوا کـە دەفەرمـوێ: سـوێند بـە پێنـووس و بـەوەی دەینووسـن، ئەمـە سـوێندەکەیە، ئایـا سـوێند لەسـەر خـوراو (**مقسـم علیه**)ەکـە چییـە؟ ﴿ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ﴾، تـۆ بەهـۆی چاکـەی پەروەردگارتـەوە (ئـەی موحەممـەد ﷺ!)

شێت نی، بۆیەش خوا وا دەفەرموێ، چونکە کافرەکان تۆمەتێکیان زۆر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دووبارە دەکردەوە، کە دەیانگوت: شێتە، چونکە شتێکی دەفەرموو، پێچەوانەی عورف و عادەت و نەریت و کلتوور و فەرهەنگ و هەموو شتێکی ئەوان بوو، دەیانگوت: ئەوە شێتە، هەڵبەتە گەورە گەورەکان و بڕیار بەدەستەکانیان زانیویانە، موحەممەد ﷺ لە عەقڵ و ئەدەب و زیرەکیی و بلیمەتییەوە پێچراوە، بەڵام بۆیە وایان دەگوت، تاکو خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەیان هەڵخەڵەتێنن و چاوپێچکیان بخەنە سەرچاوان، نە دەکرا بڵێن: هیچ کەس لە موحەممەد ﷺ عاقڵتر و تێگەیشتووتر نەبووە، هیچ کەس لەو ئەدەب بەرزتر و ڕاستگۆتر نەبووە، کەواتە: ئێستا کە دەڵێ پێغەمبەرم ﷺ، وەك چۆن پێشتر هەر ڕاستی دەکرد، ئێستاش هەر ڕاست دەکات، نەدەکرا ئاوا بڵێن، بەڵکو دەبووایە بڵێن: شێت بووەو تێکچووە، جاری واش بوو دەیانگوت: کاهین و فاڵچییەو لە خۆیەوە قسە دەکات، یان شەیتانەکان فێری دەکەن، جاری واش بوو دەیانگوت: جادووگەرە، جاری واش بوو دەیانگوت: شاعیرە، ئەها قورئان وەك شیعر دەچێ، جاری واش بوو دەیانگوت: خەڵکی دیکە فێری کردوە، ئەو تۆمەتانە هەموویان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵبەستران، بەڵام ئەوەی زۆر دووبارە کراوەتەوەو، تانەدان بووە لە عەقڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیانگوت: شێتە، بۆیەش لە چەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا ئەو تەعبیرەی ئەوان، دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە، ﴿مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾﴾ الدخان، ئنجا کە لێرەدا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ﴾، تۆ بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە شێت نی، واتە: تۆ بەهۆی ئەوەوەی خوا ئەو چاکەیەی لەگەڵ تۆ کردوەو کردوویی بە پێغەمبەر ﷺ، بەهۆی ئەو پێغەمبەراتییەوە، تۆ شێت نەبووی.

یاخود: سوێند بەچاکەی پەروەردگارت تۆ شێت نی، هەروەها واتای دیکەیشی هەن، لە مەسەلە گرنگەکاندا شییان دەکەینەوە.

﴿ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ پاداشـتێکی نەبـڕاوەت هەیـە، پاداشـتێك کـە کۆتایـی نایـەت.

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ لەسـەر ڕەوشـتێکی مەزنـی، واتـە: تـۆ خاوەنـی ڕەوشـت و ئـاکارو ئەدەبێکـی زۆر گـەورەو مەزنـی، هەڵبەتـە وشـەی مـەزن بـۆ شـتی قەبـارەدار بەکاردەهێـنرێ، بـەڵام لێـرەدا خوازراوەتـەوە بـۆ شـتی مەعنەویـی، واتـە: ڕەوشـت و ئاکارێکـی بـەرزو پەسـندو جـوان، دواییـش کورتـە باسـێك لـە بـارەی ڕەوشـتبەرزیی پێغەمبـەری خاتەمـەوە ﷺ دەکەیـن.

﴿ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ﴾، لەمـەودوا تـۆش دەبینـی و ئەوانیـش دەبینـن، واتـە: تـۆش دەزانـی، ئەوانیـش دەزانـن، تـۆش بـۆت دەردەکـەوێ و، ئەوانیـش بۆیـان دەردەکـەوێ.

﴿ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ﴾، کامتـان شـێتیی و سـەرگەردانیی و سەرلێشـێواوییتان تێـدا هەیـە، وەك گوتمـان: (**المَفْتُـون**) بـە مانـای فیتنـەدار دێ، کـە لێـرەدا یانـی: سەرلێشـێوان و سـەرگەردانیی و حـاڵ خراپیـی لـە کامتانـدا هەیـە، لەمـەودوا تـۆش دەزانـی و دەبینـی، ئەوانیش دەزانـن و دەبینـن، ئنجا ئێسـتا لـە ڕاستییدا بـاش بـاش زانـرا کـە موحەممـەد ﷺ ئـەو پەیامـەی لـە خـواوە هێنابـووی، هـەر ئـەوە هەقـی ڕەهایـە، ناحـەزو دوژمنەکانیشـی کـە تانەیـان لـێ دەداو دژایەتییـان دەکـرد، ئێسـتا دەرکەوتـوە کـە ئەوانـە سـەرگەردان و سەرلێشـێواو و مـاڵ وێـران بـوون.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی پـەروەردگاری تـۆ زاناتـرە بـەو کەسـەی لـە ڕێـی وی لایـداوە، سـەرگەردان بـووە لـە ڕێـی ڕاسـت لایـداوە، هەروەهـا پەروەردگاریشـت زاناتـرە بـە ڕێـی ڕاسـتگرتووان، کەسـانێك کـە ڕێـی ڕاسـتیان گرتـوە کـە خـۆت و شـوێنکەوتووانتن.

﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴾، ئـەم (**ف**)ە، لـە ڕووی ڕێزمانـی عەرەبییـەوە دەگونجـێ بـە (**الفـاء الفصيحـة**) دابـنرێ (**لأنهـا تُفْصِـحُ عـما قبلهـا**) واتـە: مـادام پـەروەردگارت

زاناتـره بـەوەی گومڕایـەو، بـەوەی ڕێـی ڕاسـتی گرتـوەو، خـوای پەروەردگاریـش تـۆی خسـتۆته سـەر ئـەو ڕێیـە ڕاسـتەی خـۆی، کەواتـە: حـاڵ کـە بـەم شـێوەیە، فەرمانبەریـی بـەدرۆ دانـەران مەکـە، واتـە: گوێڕایەڵییـان مەکـە، یاخـود (ف)ەکـە (**فاء تفریـع**)ە، واتـە: بینـا لەسـەر ئـەوەی ڕابـرد، تـۆ گوێڕایەڵیـی بـەدرۆ دانـەران و بێبڕوایـان مەکـە.

﴿ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴾، ئـەوان حـەز دەکـەن، ئەگـەر تـۆ نەرمکێشـیی بکـەی، ئەوانیـش نەرمکێشـیی بکـەن، ئەگـەر تـۆ دەسـتبەرداری هەندێـك لـەو هەقـە بـی، کـە خـوا پێیـدا ناردووی، ئەوانیـش ئامادەن دەسـتبەرداری بەرنامـەو بیرۆکەکانـی خۆیـان بـن، واتـە: ئەگـەر تـۆ بـۆ ئـەوان نەرمکێشـیی بکـەی و لێیـان بچیـە پێـش، ئەوانیـش زۆر لـە تـۆ دێنـە پێـش، چونکـە کەسـێك کـە لەسـەر ڕێـی باتیڵـە، دەربەسـت نیـە، ئەگـەر هەموویشـی واز لـێ بێنـێ.

﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴾، هەروەهـا گوێڕایـەڵ مەبـە بـۆ هەمـوو کەسـێکی سـوێند خـۆر، کـە سـووك و چـرووك و کـەم بایەخـە، بـە زۆرییـش وایـە کەسـێك زۆر سـوێندی خـواردن، سـووکیش دەبـێ، چونکـە دیـارە متمانـەی بـە قسـەکەی خـۆی نیـە، بۆیـە ئـەو وتاربێـژ و بانگـەوازکارو ئامۆژگارییکارانـەی زۆر سـوێندان دەخـۆن، زۆرم لـە دڵ قورسـە، چونکـە زۆر سـوێند خواردن، نیشـانەی بـاوەڕو متمانە بەخۆنەبوونـە، هەندێك لـە زانایانـی ئێمـە نـە بەڕاسـت و نـە بـەدرۆ سـوێندیان هەر نەخـواردوە، ئەوانـەش کـە زۆر سـوێندان دەخـۆن، نازانـن کـە خـوا بابای زۆر سـوێند خـۆری زەم کـردوە لـە قوڕئانـداو، بـە سـووکی دانـاوە.

﴿ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍۭ بِنَمِيمٍ ﴾، زۆر غەیبەتکـەرو پاشـملە باسـی خەڵککـەرە، تانـە لێدەریانـەو، زۆریـش قسـە دێنـێ و دەبـات (**یـمشي بالنَّمیمـة**) واتـە: قسـە هێنـەر و بـەرە و دوو زمانیـی دەکات، (**نمیـم**) لـە (**نَمنمـة**)ەوە هاتـوە، واتـە: قسـەی چرپـە، یـان جووڵەیەکـی سـووك کـە کەمـتر هەسـتی پـێ بکـرێ.

﴿ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴾، زۆر دەستگرەیەوە لە خێرو چاکە، یاخود زۆر ڕێگرە لە خێر، (**خَيْر**) دەگونجێ بە مانای ماڵ و سامان بێ، ماڵ و سامانێك كە دێتە دەستی زۆر دەستی پێوە دەگرێ، هەر هیچی هەڵناوەرێ بۆ خەڵك، یاخود (**خَيْر**) بە مانای چاكەی مەعنەوییە واتە: زۆر ڕێگرە لەو خێرو بەرەكەتەی كە خوا بە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ناردوویەتی كە ئیسلامە، ڕێی لێ دەگرێ و ناهێڵێ خەڵك ڕووی تێ بكات و، (**مُعْتَدٍ**) سنوور شكێن و تێپەڕێنەرە، (**أَثِيمٍ**) زۆر گوناحكارە.

﴿ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴾، قەڵەو و زۆرخۆر و زۆرخۆرەوەیە، یاخود: زۆر زبرو قسە ڕەق و دڵڕەقە، ئنجا زەنەمەشی هەیە، زەنەمە بریتیە لەو زێدە گۆشتەی بەملاو لەولای گوێی مەڕدا دێنە خوارێ، یاخود (**زَنِيم**) ئەوەیە لە هۆزێك نیە، بەڵام خۆی خستۆتە نێو ئەوان و ڕەسەن نیە، بەڵكو نانەجیب و ناڕەسەنە.

﴿ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴾، هەر لەبەر ئەوەی خاوەنی سامان و كوڕانە (تۆ بە قسەی مەكەو گوێڕایەڵی مەبە)، یاخود: لە ئەنجامی ئەوەدا كە خاوەنی سامان و كوڕانە.

﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴾، كاتێك ئایەتەكانی ئێمەی بەسەردا خوێندرانەوە گوتی: ئەمە ئەفسانەی پێشینانە.

﴿ سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُومِ ﴾، {خوا ﷻ دەفەرموێ:} لەمەودوا نیشانە لەسەر لووتی دادەنێین، ئەمەش یان مانا ڕواڵەتییەكەی مەبەستە كە دەڵێن: ئەو كەسەی ئەو ئایەتەی لە بارەوە هاتۆتە خوار لە جەنگی بەدردا، زەبرێكی شمشێر بەر لووتی كەوتوە، واتە: نیشانەدار كراوە، یاخود مەبەست پێی مانا مەعنەوییەكەیەتی، وەك چۆن یەكێك بە یەكێك دەڵێ: داغت دەكەم، یان دەڵێ: زەبرێكت لێ دەدەم، قەت لەبیرت نەچێتەوە، واتە: لەمەودوا ئێمە بەڵاو كارێكی بەسەر دێنین، بۆی دەبێتە نیشانە.

دوایی باس دەکەین، کە ئەم نۆ سیفەتە، خوا ﷻ بۆ کەسێکی دیارییکراو فەرمووونی، کە زانایانی مێژوو هەندێکیان دەڵێن: وەلیدی کوڕی موغیرە بووەو، هەندێکیان دەڵێن: نەزری کوڕی حاریسەو، هەندێکیان دەڵێن: ئەبولحەکەمی کوڕی هیشامە، کە نازناوی ئەبوو جەهلی وەرگرتوە، یاخود کەسێکی دیکەیە، یان مەبەست پێی جۆرە کەسێکە ئەو سیفەتانەی تێدابن، نەوەك کەسێکی دیارییکراو، بەڵکو جۆرێك لە خەڵك، کە من ئەوەی دووەمیانم زیاتر بە عەقڵەوە دەنووسێ، چونکە خوا ﷻ لەسەرەتاوە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴾، بەقسەی هەموو کەسێکی زۆر سوێند خۆری سووك، مەکە، کەواتە: مەرج نیە، یەك کەس بێ و، هەر کەسێك خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ دەیگرێتەوە، با ئەو نۆ سیفەتە بەسەر کەسێکی دیاریکراوییش دا زیاتر بچەسپن، بەڵام هەر کەسێکی دیکەش خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ، دەیگرێتەوە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**سوێند خواردنی خوای بەرزی مەزن، بە قەڵەم و دێڕە پێ نووسراوەكانی، كە موحەممەد ﷺ وەك ناحەزانی گوتوویانە: شێت نیەو، پاداشتێكی نەبڕاوەی هەیەو، لەسەر ڕەوشت و ئاكارێكی بەرزو مەزنەو، لەمەودوا ئەویش و ناحەزانیشی دەبینن و دەزانن كێ شێتیی تێدایە، بۆیە نابێ بە قسەی بە درۆ دانەران بكات، كە حەز دەكەن نەرمكێشیی بكات، تاكو ئەوانیش نەرمكێشیی بكەن و، دەستبەرداری بەرنامەو بیرۆكەكانی خۆیان بن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ٤ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ٥ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ٦ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٧ فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٨ وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ٩﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾، نوون سوێند بە قەڵەم و بەوەی دەینووسن، (ن) نوون یەكێكە لەو بیست و هەشت پیتەی زمانی عەرەبییان لێ پێك دێ و، قورئانیان لێ پێكهاتوەو، ئەی خەڵكینە! لەبەر دەستی ئێوەش دا هەن، وەك كەرەستەی خاو، بەڵام ئێوە قسەی ئاساییان پێ دەكەن، خواش ﷻ فەرمایشتێكی پێ فەرموون و لێ پێكهێناون، كە قورئانەو دەستەوسانكەرە، ئێوە لە بەرانبەریدا دەستە پاچەن، كە نەك قورئانێكی وا بێنن، بەڵكو دە سوورەتی، بەڵكو وێنەی سوورەتێكیشی بێنن، كەواتە: بزانن ئەم قورئانە فەرمایشتی خوایە، ﴿وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾، سوێند بە قەڵەم و

بەوەی دەینووسن: (**وَمَا يَسْطُرُونَ: يَعْنِي وَالَّذِي يَسْطُرُون**)، کەواتە: (**مَا: مَوْصُولَة**): (**يَعْنِي: وَالَّذِي يَسْطُرُونَهُ**)، سوێند بەوەی دەینووسن، کە مەبەست پێی ئەو دێڕانەیە کە بە قەڵەم دەنووسرێن، دەشگونجێ (**مَا: مَصْدرية**) بێ بۆ چاوگ بێ، (**يَعْنِي وَالْقَلَمِ وَسَطْرَهُم**)، سوێند بە قەڵەم و بە نووسینەکەیان، ئنجا ئەمە سوێند پێ خوراوەکەیە، قەڵەم و ئەو دێڕانەی بە قەڵەم دەیاننووسن، ئەمە سوێند پێ خوراو (**مُقْسَمٌ بِهِ**) ەکەیە.

ئایا سوێند لەسەر خوراو (**مُقْسَمٌ عَلَيْهِ**)ەکە چییە؟.

**٢)- ﴿مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ﴾، (ئەی موحەممەد ﷺ!) بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە تۆ شێت نی، ئەمە سێ واتایان بۆ لێکداونەوە:**

**واتـای یەکـەم:** تـۆ بەهـۆی چاکـەی پەروەردگارتـەوە، کـە بریتیـە لـە پێغەمبەرایەتیـی، شـێت نـی، واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ! تـۆ پێـش ئـەوەی وەحییـت بـۆ بـێ و بکرێـی بـە پێغەمبـەر، کۆمەڵگایەکـەی خـۆت ئەوپـەڕی متمانەیـان بـە تـۆ هەبـوو، پێیـان دەگوتـی: ئەمیـن، ڕاوێژیـان بـە تـۆ دەکـرد، بـە بەڵگـەی ئـەوەی کاتێـك لێیـان بـوو بـە کێشـە، کـێ بـەردە ڕەشـەکە دابنێتـەوە، دوایـی کۆبوونـەوەو خەریـك بـوو ناکۆکیـی توندیـان لەسـەر ئـەوە پەیدابـێ، هـەر کام لـە هـۆزەکان دەیگـوت: دەبـێ ئێمـە شـەڕەفی دانانـی بـەردە ڕەشـەکەمان لـە شـوێنی خـۆی دا، پـێ ببـڕێ، دوای ئـەوەی لافاوێـك لـە کەعبـەی دابـوو و ڕووخاندبـووی، کەعبەیـان چـاك کردبـووەوە و گەیشـتبوونە ئـەوەی بـەردە ڕەشـەکە دابنێنـەوە، دوایـی هاتنـە سـەر بڕیارێـك: شـوێنێکیان دیاریـی کـردو گوتیـان: هـەر کەسـێك یەکـەم کـەس هـات، ئـەو دەکەیـن بـە دادوەر، ئنجـا دیـار بـوو موحەممـەد ﷺ هـات، ئـەوەش لـە سـاڵی سـی و پێنجـی تەمەنـی پێغەمبـەردا، واتـە: پێنـج سـاڵ پێـش ئـەوەی ببێتـە پێغەمبـەر، گوتیـان: (**جَـاءَ الأَمـين، جَـاءَ الأَمـين**)، پیـاوە دەسـت پـاك و چاکەکـە هـات و کردیانـە دادوەر، پێغەمبەریـش ﷺ فەرمـووی: عەبایـەك بێنـن، یـان پۆشـاکێك بێنن، بـەردە ڕەشـەکەی لـە نێـو دانێـن، لـە هـەر هۆزێکیـش نوێنەرێـك بـا بـێ، چمکێکـی

پۆشاکەکە بگرێ و بەرزی بکەنەوە، ئنجا منیش خۆم بەردە ڕەشەکە دادەنێم، ئەوانیش هەموویان بەم شێوە دادوەرییە ڕازیی بوون.

کەواتە: ئەی موحەممەد ﷺ! تۆ چ گۆڕانێکت بەسەردا هاتوە، تۆ هەر ئەو پیاوە ڕاستگۆ و ئەمین و پاك و چاکە بووی، ئایا ئێستا تەنیا بەوەی خوا چاکەی لەگەڵ تۆدا کردو، کردووی بە پێغەمبەر ﷺ، ئایا بەهۆی پێغەمبەرایەتییەوە شێت بووی؟ کە پێشتر شێت نەبووی، ئایا دوای ئەوەی بوویە پێغەمبەری خوا ﷺ و لە عەقڵ و کەماڵ زیاد کردوەو کەمت نەکردوە، ئەدی چۆن نەیارەکانت ئەو تۆمەتەت دەدەنە پاڵ؟!

**واتای دووەم:** تۆ بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە شێت نی، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە خوا تۆی کردۆتە پێغەمبەری خۆی ﷺ، شێتیی لە تۆدا نیە، ئەگەر هەر کەسێکی دیکە بگونجێ شێتیی ڕووی تێ بکات، شێتیی ڕوو لە تۆ ناکات.

**واتای سێیەم:** سوێند بە چاکەی پەروەردگارت تۆ شێت نی.

**٣)-** ﴿وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ﴾، بە دڵنیایی تۆ پاداشتێکی نەبڕاوەت هەیە، (**غير ممنون**) بە چەند واتایەك هاتوە:

**أ**- (**غَيْرَ مَمنون: أي غَيْرَ مَقْطوع ولا مَنْقوص**)، یانی: پاداشتێکت هەیە نە دەبڕێ و نە کەم و کورتیی تێدایە.

**ب**- (**غَيْرَ مَمنون: أي غَيْرَ مَحْسوب**) بۆت ناتژمێردرێ، چونکە شتی کەم دەژمێردرێ، بەڵام شتێك کە زۆربێ، دەپرسرێ: چەندە؟ دەگوترێ: ناژمێردرێ.

**ج**- (**غَيْرَ مَمنون: غَيْرَ مُكَدَّر بِالمَنِّ**)، تۆ پاداشتێکت هەیە لێڵ ناکرێ بەهۆی منەت لەسەر کردنتەوە، من ئەم مانایەم زۆر بە دڵەوە نانووسێ، چونکە بێگومان خوا چاکەی لەسەر هەموو کەس هەیەو، چاکەی بەسەر پێغەمبەری خواوەش ﷺ لە هی هەموو کەس

مەزنترە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾ ﴾، ئنجا ئەگەر خوا منەت بەسەر بەندەی خۆیەوە بكات، بۆ بەندە شانازییە، ئەوە مرۆڤەكانن ئەگەر منەت لەسەر یەكدی بكەن، خراپە، بەڵام ئێمەی دروستكراو هەر منەتباری خوای پەروەردگارو بەدیهێنەرین، لە ڕاستییدا هیچ بەندەیەكی خوا بەوەی كە خوا منەتی لەسەر دەكات، بۆی نوقسانیی نیە، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**الحُجرات**) دەفەرمویٚ: ﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا۟ ۖ قُل لَّا تَمُنُّوا۟ عَلَىَّ إِسْلَٰمَكُم ۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَىٰكُمْ لِلْإِيمَٰنِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: عەڕەبە خێڵەكییەكان منەتت لەسەر دەكەن (ئەی موحەممەد ﷺ! كە ئیسلام بوون و بە ڕواڵەت هاتوونە نێو ئیسلامەوە)، بڵێ: ئیسلامەتییەكەتانم لەسەر مەكەنە منەت، بە چاوم دامەدەنەوە، بەڵكو خوا منەتی لەسەر ئێوە هەیەو، چاكەی لە چاوی ئێوەدا هەیە كە ئێوەی ڕاستە ڕێ كردوە بۆ ئیمان، ئەگەر ڕاست بكەن ئیمانداربن.

٤)- ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾، بە دڵنیاییش تۆ لەسەر ڕەوشتێكی مەزنی، واتە: ڕەوشتی بەرز و ئاكاری مەزن، بۆ تۆ وەك وڵاخەو وەك چۆن كەسێك دەچێتە سەر پشتی وڵاخێك بە كەیفی خۆی پێی دەچێ بۆ ئەملاولاو دەیهێنێ و دەیبات، ڕەوشتی بەرزو ئاكاری پەسەندیش لەبەر دەستی تۆدا وایە، وەك چۆن مێوێك یان قوڕێك لە دەستی كەسێكدایەو، بە كەیفی خۆی شتی لێ دروست دەكات، ڕەوشتی جوانیش لەبەر دەستی تۆدا ئاوایە.

٥)- ﴿ فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴾، لەمەودوا تۆش بۆت دەردەكەوێ و، ئەوانیش بۆیان دەردەكەوێ، تەبەڕیی لە زەححاكەوە هێناویەتی: (**يَعْنِي: تَرَى وَيَرَوْن**)، (**أخرجه الطبري: ٣٤٦٦٢**) یانی: تۆش دەبینی و ئەوانیش دەبینن، ئەسڵی واتایەكەی ئاوایە، بەڵام جاری واش هەیە بینین بە مانای زانینە[1]، لێرەش دا هەردوو واتایەكەی لەگەڵدا دەگونجێن، چونكە لە داهاتوودا هەم پێغەمبەری خاتەم ﷺ سەرەنجامی خۆی بینی و، هەم سەرەنجامی ئەوانیشی بینی و، هەم بە چاوی سەر واقیعەكەی بینی و هەم

---

(١) زانایان بۆ ئەوە دەڵێن: (الرُّؤيَةُ ههنا قَلْبِيَّةٌ وَلَيْسَت بَصَرِيَّة)، واتە: بینین لێرەدا دەروونییەو چاویی نیە.

بە عەقڵ و دڵیش زانی، هەروەها ئەوانیش، یەکێك لە زانایانیش دەڵێ: (**ضُمِّنَ تُبْصِرُ ويُبْصرون مَعْنَى: تُوقِن وَيُوقِنُوْن بِسَبَب التَعْدِيَته بِالبَاء أي: فَسَتَعْلَم يَقِيناً**) واتە: (**تبُصِر وَيُبْصِرُوْن**) مانای (**تُوقِنُ وَيُوقِنُون**)ی خراوەتە نێو، لەبەر ئەوەی بەرکاری خواستوە بەهۆی پیتی (**ب**)ەوە.

٦)- ﴿ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴾، {لەمەودوا تۆش دەزانی و ئەوانیش دەزانن، تۆش دەبینی ئەوانیش دەبینن، تۆش دڵنیا دەبی ئەوانیش دڵنیا دەبن}، کامەتان شێتیی تێدایە، (ب) ش لە وشەی (**بِأَيِّكُم**)دا، دەگونجێ بە مانای (**فِي**) بێ، (**أَيْ: فِي أَيِّكُم**) کامتان شێتیی و سەرگەردانیی تێدایە، یاخود (**بِأَيِّكُمُ الْمَفْتُون: أَيْ فِي أَيِّ الْفَرِيقَيْنِ المَجْنُون**) واتە: هەڵخەڵەتێنراو، شێتکراو، لەنێو ئێوەدایە (تۆ و شوێنکەوتووانت)، یاخود کافرەکان شێتیان تێدایە؟ یاخود (**الْمَفْتُون بِمَعى: جُنُون**) واتە: ئایا شێتیی لە تۆدا هەیە، یاخود لەواندا هەیە؟.

(**الطبري**) دەڵێ: (**الْمَفْتُون: الفُتُونُ بِمَعْنَى: المَصْدَر**)، (**مفتون**) بە مانای چاوگە، واتە: سەرگەردانیی و شێتیی لە ئێوەدا هەیە، یاخود لەنێو ئەواندا هەیە؟.

خاوەنی: (**البَحْرُ الْمَدِيد فِي تَفْسِيرِ كِتَابِ اللهِ الْمَجِيد**)[1]، دەڵێ: ئەم تەعبیرە (**بِأَيِّكُمُ الْمَفْتُون**) دوو ئەگەری هەن:

**یەکەم:** (**بَاء زَائِدَةٌ، أي: أَيُّكُمُ الْمَفْتُون**)، (ب) زیادکراوە بۆ جەختکردنەوە، واتە: تۆش دەبینی و ئەوانیش دەبینن، تۆش دڵنیا دەبی و ئەوانیش دڵنیا دەبن لە داهاتوودا، کامتان سەرلێشێواو و شێت و سەرگەردانن.

**دووەم:** (**بِأَيِّكُمُ الْمَفْتُون: أَيْ بِأَيِّكُمُ الْفِتْنَة، فَالْمَفْتون مَصْدرٌ مِثْلُ مَعْقُول وَعَقل**)، (**مفتون**) بە مانای فیتنە دێ، واتە: سەرگەردانیی و سەرلێشێواویی، کەواتە: (**مَفْتُون**) لێرەدا چاوگە وەك (**مَعْقُول**) واتە: عەقڵ.

---

(١) ج٨، ص١٠٨.

٧)- ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت خۆی زاناترە، کێ لە ڕێی ئەو لایداوەو سەرگەردان بووەو هەر خۆیشی زاناترە بە ڕێی ڕاستگرتووان، (**يَعْنِي: السَّالِكِينَ طَرِيقَ الهُدى**)، ئەوانەی ڕێی ڕاستیان گرتوە.

٨)- ﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴾،{(**ف**) بۆ (**تَفْرِيع**)}، ئنجا بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد، فەرمانبەریی بە درۆ دانەران مەکە، (**الطَّاعَةُ: قُبُولُ مَا يَنْبَغِي عَمَلُهُ وَوقوع تُطع فِي حَيِّز النَّهِي يَقْتَضِي النَّهِي عَن جِنْسِ الطَّاعَة**)، (**طاعة**) بریتیە لە قبووڵ کردنی ئەوەی دەبێ ئەنجام بدرێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: (**فَلَا تُطِع**)، (**تُطِع**) لە ڕستەیەکدا هاتوە کە (لا)ی لابەرە (**ناهية**)ی لە پێشەوەیە، ئەوەش مانای ئەوەیە: هەرچی تێکڕای فەرمانبەریی و گوێڕایەڵییە بۆ ئەوانی مەکە، بۆ ئەوانەی بە درۆ دانەرن بۆ پەیامی خواو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

٩)- ﴿ وَدُّوا۟ لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ﴾، ئەوانە خۆزگە دەخوازن و حەز دەکەن، تۆ نەرمکێشیی بکەی و ئەوانیش نەرمکێشیی بکەن، ئەوانە خۆزگە دەخوازن تۆ نەرم بی لە ئایینەکەتدا، ئەوانیش نەرم دەبن لە ئایین و بەرنامەو ڕێبازەکانی خۆیاندا.

یانی: ئەگەر تۆ دەستبەرداری تۆزێك لەو هەقە ببی، کە پێتە، ئەوانیش بە مەمنوونیی دەستبەرداری ناهەقیی و باتیڵەکەی خۆیان دەبن.

(**تُدْهِنُ فَيُدْهِنُون: مُشْتَقٌّ مِنَ الإِدْهَانِ وَهُوَ الملاينة وَالْمُصَانَعَةُ، وَحَقِيقَةُ هَذَا الْفِعْلِ أَنْ يُجْعَلَ لِشِيءٍ دُهْناً إِمَّا لَتلْيِنيه أَوْ لِتَلْوِينِهِ، وَمِنْ هاذَين المَعْنيين تَفَرَّعْت مَعَانِي الإِدهَان، كَمَا أَشَارَ إِلِيهِ الراغب**)، وشەی (**إدهان**): (**تُدْهِنُ فَيُدْهِنُون**) هەردووکیان لە چاوگی (**إدْهَان**)ەوە هاتوون، (**إدْهَان**)یش بریتیە لە نەرمیی و خۆ گونجاندن، چییەتی ئەو کردارەش، ئەوەیە شتێك ڕۆنی تێبکرێ، یان بۆ نەرمکردنی، یان بۆ ڕەنگکردنی، ئنجا لەم دوو واتایەوە (لە نەرمکردن و ڕەنگکردنەوە) هەموو مانایەکانی (**إدْهَان**) هاتوون، وەك ڕاغیبی ئەصفەهانیی ئاماژەی بۆ کردوە، (لە کتێبەکەی ناودارەکەی خۆی (**مُفْردات ألفاظ القرآن**)دا.

لێرەدا پێویستیە پێناسەیەکی کورتی (**مُداراة**) و (**مُداهنة**) بکەین:

**(المُدَارَاة: تَكُونُ عَلَى حِسَابِ الدُّنْيَا، والْمُدَاهَنَةُ: تَكُونُ عَلَى حِسَابِ الدِّين).**

مودارات لەسەر حیسابی دنیا دەبێ، واتە: تۆ فشار لە دنیایەکەت دەکەی بۆ ئەوەی ئایینت سەلامەت بێ، بەڵام موداهەنە لەسەر حیسابی ئایین دەبێ، فشار لە ئایینت دەکەی، بۆ ئەوەی دنیات بۆ دەستەبەر بێ و چاك بێ.

بۆیە من ئاوا پێناسەی (**المُدَارَاة والْمُداهَنَة**)م کردوەو گوتوومە: (**المُدَارَاة: أَنْ تَضْغَطَ عَلَى دنيَاكَ مِنْ أَجْلِ دِينِك، والْمُدَاهَنَةُ: أَنْ تَضْغَطَ عَلَى دِينكَ مِنْ أَجْلِ دُنيَاكَ**).

واتە: مودارات (ساچاندن و خۆگونجاندن)، ئەوەیە فشار لە دنیایەکەت بکەی، بۆ ئەوەی ئایینت سەلامەت بێ، بەڵام موداهەنە بە پێچەوانەوە، ئەوەیە کە فشار بێنی بۆ ئایینەکەت و، دەستبەرداری ئەندازەیەك لە ئایینەکەت ببی، بۆ ئەوەی دنیاو بەرژەوەندییە دنیاییەکانت سەلامەت و پارێزراو بن.

سێ دەقی سوننەت لە کۆتایی ئەم مەسەلەی یەکەمەدا:

**یەکەم:** لە بارەی قەڵەمەوە: {**قَالَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ** رضي الله عنه**: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ فَقَالَ: اكْتُبْ، فَقَالَ: مَا أَكْتُبُ؟ قَالَ: الْقَدَرَ، وَمَا كَانَ وَمَا هُوَ كَائِن إِلى الأَبَد**} **(أخرجه أبو داود: ٤٧٠٠، والترمذي: ٢١٥٦، ٣٣١٩، وأحمد: ج٥، ص: ٣١٧، وأبو يعلى: ٢٣٢٩، والطبراني في الأوسط، والبيهقي، وقال الهيثمي في المجمع: رجال أبي يعلى ثقات، وله شاهد مرسل أخرجه الطبري: ٣٤٥٤٠ عن معاوية بن قرة الحديث الحسن، بهذه الشواهد، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود).**

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت رضي الله عنه دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: یەکەمین شتێك کە خوا دروستی کرد بریتی بوو لە قەڵەم، ئنجا پێی فەرموو: بنووسە، گوتی: چی بنووسم؟ فەرمووی: قەدەر (واتە: ئەندازەگیرییەکانی خوا)و ئەوەی ڕابردوەو ئەوەی دەبێ هەتا هەتایە.

**دووەم:** لە بارەی ئەوەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾.

**أ-** {**عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ رضي الله عنها، فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ! أَخْبِرِينِي بِخُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ، أَمَا تَقْرَأُ الْقُرْآنَ، قَوْلَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ:** ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾} (**أخرجه مسلم: ٧٤٦، والطبري: ٣٤٦٥٦**).

واتە: سەعدی کوڕی هیشام دەڵێ: چوومە لای عائیشە دایکی بڕواداران (خوا لێی ڕازی بێ) گوتم: ئەی دایکی بڕواداران! هەواڵم پێ بدە ڕەوشت و ئاکارو هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ گوتی: ڕەوشتی ئەو بریتی بوو لە قورئان، ئایا قورئان ناخوێنی، فەرمایشتی خوای بەرز: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾، بە دڵنیایی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی؟!.

**ب-** (**عَنْ أَبِي عَبْدِ اللَّهِ الجَدَلِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رضي الله عنها: كَيْفَ كَانَ خُلُقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: «لَمْ يَكُنْ فَاحِشًا وَلَا مُتَفَحِّشًا وَلَا صَخَّابًا فِي الأَسْوَاقِ، وَلَا يَجْزِي بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ»**) (**أخرجه الترمذي: ٢٠١٦، قال أبو عيسى: هذا حديث حسن صحيح**).

واتە: ئەبوو عەبدوڵڵای جەدەلیی رضي الله عنه دەڵێ: پرسیارم لە (دایکمان) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کرد، ئایا ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ گوتی: پیاوێکی قسە ناشیرین نەبوو و، لە بەرانبەر قسەی ناشیرینی خەڵکیشدا قسەی ناشیرینی نەدەکرد، لە بازاڕدا دەنگی بەرز نەدەکردەوە (هاوارو دەنگە دەنگ بکات) و، لە بەرانبەر خراپەدا خراپەی نەدەکرد، بەڵکو لێبوردن و چاوپۆشیی دەکرد.

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردن بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە گوێڕایەڵی هەر بابایەکی زۆر سوێند خۆری، سووکی، غەیبەتکەری، قسە هێنەرو بەری، ڕێ لە چاکە گری، سنوور بەزێنی، گوناهکاری ملهوڕی، نارەسەن نەبێ، بەهۆی هەبوونی سامان و کوڕانەوە، کە قوڕئان بە ئەفسانە دادەنێ و، لەمەودواش خوا ﷻ سەرلووتی مۆر دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ﴾، (خوای میهرەبان پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ و دەفەرموێ:} هەروەها بە قسەی هەر زۆر سوێند خۆرێکی سووك مەکە، (**حَلَّاف**) ڕێژگەی زێدەڕۆییە بۆ (**حَالِف**)، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَنْ كَانَ حَالِفًا، فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ أَوْ لِيَصْمُتْ**}، (**أخرجه البخاري: ٦٦٤٦، ومسلم: ١٦٤٦**) واتە: هەر کەسێك سوێند دەخوات، با سوێند بە خوا بخوات، یان بێدەنگ بێ، واتە: سوێند بە جگە لە خوا نەخوات، وەك خەڵك ڕاهاتوە، دەڵێن: بە سەری تۆ، بە سەری فڵانکەس، بە قەبری فڵانکەس، بە کەعبەی پیرۆز و، بە پێغەمبەرو... هتد، کە هیچیان سوێندیان پێ ناخورێ و، سوێند بە خوا، یان بە یەکێك لە سیفەتەکانی خوای بەرز دەخورێ، بۆیەش سوێند بە قوڕئان دەخورێ، چونکە قوڕئان فەرمایشتی خوایە، بەڵام خوا ﷻ بۆ خۆی سوێند بەهەر شتێک دەخوات، ویستی خۆیەتی، خوا بەدیهێنەری هەموو شتەکانە، سوێند بە هەنجیرو زەیتوون و، بە قەڵەم و نووسین و، مانگ و خۆرو ئەستێرەکان و، ڕووداوەکانی قیامەت دەخوات، کە سوێندیش دەخوات بە شتەکان، بۆ سەرنج ڕاکێشانی ئێمەیەو، بۆ دەرخستنی گرنگیی ئەو شتانەیە.

(**حَلَّاف**)یش واتە: زۆر سوێند خۆر، کە لێرە خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرمویْ: فەرمانبەریی هەر کەسێکی زۆر سوێند خۆری سووك و بێبایەخ مەکە، (**مَهِين: أَيْ حَقِير، أَوْ ذُو مَهانَة، أَوِ الْوَضِيع**)، (**مَهِين**) واتە: سووك، کەم بایەخ، نزم و پەست، عادەتیش وایە کەسێك زۆر سوێند بخوات، سووك دەبێ، چونکە سوێند خواردن، بریتیە لەوەی کە قسەکەی خۆت پشتڕاست دەکەیەوە بە هۆی سوێندێکەوە، ئنجا ئەگەر متمانەت بە قسەکەی خۆت هەیە، پێویست ناکات سوێندان بخۆی، لە کاتێکدا کە پێویست بێ، بە هەر حاڵ سوێند خواردنیش هەیەو، ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (**المائدة**)دا باسێکی تایبەتمان لە بارەی سوێند خواردن و سڕینەوە (**كفارة**)ی سوێندەوە خستۆتەڕوو، بەڵام بە بۆنەو بەبێ بۆنە، بە هۆکارو بەبێ هۆکار، کەسێك هەر سوێندان بخوات، مانای وایە متمانەی بە قسەی خۆی نیە، وەك پێشتریش ئاماژەم پێداوە: ئەو وتاربێژو مەلاو بانگەوازکارانەی بە ناوی ئیسلامەوە قسە دەکەن و، زۆر سوێندان دەخۆن، با بزانن کە زۆر سوێند خواردن دەبێتە هۆی سووك بوونیان و، مانای وایە تۆ دوێندراوەکانی خۆت، ئەوانەی قسەیان بۆ دەکەی و، قسەکانت دەبیستن، پێت وایە متمانەیان بە تۆ نیە، بۆیە ئەوەندە سوێندیان بۆ دەخۆی! گرنگ ئەوەیە خوا زۆر سوێند خواردنی لەگەڵ سووکییدا پێکەوە باسکردوون! ئەوە دوو سیفەت لە نۆ (٩) سیفەتە خراپەکانی ئەو کەسە.

٢)- ﴿ هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٍ ﴾، زۆر شکێنەری قسە هێنەروبەر، (**همّاز**) و (**مَشّاء**) لەسەر ڕێژگەی زێدەڕۆیی (**صيغة المبالغة**)ن، (**هَمَزَهُ: أَيْ اغْتَابَهُ**) واتە: پاشملە باسیکرد، کەواتە: (**هَمَّاز**) واتە: زۆر غەیبەتکەر، پاشملە بە خراپە زۆر باسی خەڵککەر، (**الْهَمْزُ: الإِغْتِيَابُ**)، پاشملە باسی خەڵکردن بە خراپە.

هەندێکیش گوتوویانە: (**هَمْزُ**): بریتیە لە تانە لێدان لە ڕووبەڕوو، بەڵام وا پێدەچێ (**هَمْزُ**) و (**هَمَّاز**) کەسێك بێ پاشەملە بە خراپ باسی خەڵك دەکات.

بەڵام (لَمَّاز) كە ئەویش لە (لَامِز)ە كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾الحجرات، عەیب لە خۆتان مەگرن، (لَمز) ئەوەیە كەسێك ڕووبەڕوو عەیبی لێ بگری، بەڵام (هَمز) ئەوەیە پاشملە بە خراپە باسی بكەی، لە سووڕەتی (الهُمَزَة)دا خوای پەروەردگار كەسێك كە پاشملە باسی خەڵكی دەكات، پێشیخستوە، چونكە ئەو سیفەتە زیاتر لە خەڵكدا هەیە، تاكو ڕووبەڕوو تانەدان لە خەڵك و عەیب گرتن: ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١﴾الهمزة، (هُمَزَة ولُمَزَة) لەسەر كێشی (فُعَلَة) بۆ زێدەڕۆیی واتە: سزای سەخت بۆ هەر كەسێك كە پاشملە زۆر باسی خەڵك دەكات بە خراپەو، بەرەو ڕووش زۆر تانەیان لێ دەدات.

(مَشَّاء بِنَمِيم: يَعْني يَمْشي بالنميمَة)، (مَشَّاء)یش ڕێژگەی زێدەڕۆیی (مَاشي)یە یانی: ڕۆیشتوو، (مَشَّاء) واتە: زۆر ڕۆیشتوو، یانی: زۆر قسە هێنەرو بەرە، (نَمِيم) لە (نَمنمة)ەوە هاتوە، (النَّمنمة: الصَّوْتُ الخفيُّ وَالْحَرَكَةُ الخفيَّة)، دەنگێكی كپ و جووڵەیەكی بە ئەسپایی، پێغەمبەری خواش ﷺ لە بارەی قسەهێنان و بردنەوە فەرموویەتی: {لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ}، (أخرجه البخاري: ٦٠٥٦، أبو داود: ٤٨٧١، الترمذي: ٢٠٢٦)، واتە: بابای قسە هێنەروبەر ناچێتە بەهەشت، (نَمَّامٌ) واتە: كەسێك كە زۆر قسە دێنێ و دەبات، ئەویش هەر ڕێژگەی زێدەڕۆییە.

كەواتە: (مَشَّاء بِنَمِيم) واتە: ئەو كەسەی زۆر قسان (قسەی خراپ) دێنێ و دەبات لە نێوان خەڵكدا، بۆ ئەوەی نێوانیان تێك بدات.

ئەوەش سیفەتەكانی: سێیەم و چوارەم لە نۆیەكان.

٣)- ﴿مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ﴾، زۆر ڕێگری چاكەی دەستدرێژكاری گوناهكار، (منَّاعٍ) كە لەسەر ڕێژگەی زێدەڕۆییە، دوو واتای هەن:

أ- (خَيْر) ئەگەر بە مانای ماڵ و سامان بێ، واتە: ماڵ و سامانێك كە لەبەر دەستیدایە زۆر تێیدا چرووكەو، لە دەستی نایەتە دەرێ و هیچی لێ هەڵناوەرێ.

**ب-** ئەگەر (**خَيْر**) بە مانای شتی مەعنەویی بێ، مەبەست پێی ئیسلامەتییە، یان هەر شتێکی دیکەی چاك، واتە: زۆر ڕێگرە لە خەڵك ڕووبکەنە شتی چاك کە ئیسلامە، یان بۆ هەر شتێکی دیکەی چاك، پەرچ و کۆسپە لەبەردەمیاندا، (**مَعْتد: يعني مُتَجَاوِزٌ للحَدِّ**) واتە: سنوور بەزێن و سنوور شکێن (**أَثِيمْ**) واتە: خاوەن گوناهە، (**أَثِيمْ**) دێتەوە سەر (**أَثُومْ**) کە (**أَثِيمْ**) لەسەر کێشی (**فَعيل**)ە، بەڵام بە مانای (**فَعول**)ە، (**آثم**) واتە: گوناهکار، بەڵام (**أَثِيم**) واتە: زۆر زۆر گوناهکار، وەك (**رَاحِم**) یانی: بەبەزەیی، بەڵام (**رَحيم**) واتە: زۆر زۆر بەبەزەیی، هەمیشە ئەو کێشانە بۆ زێدەڕۆیین.

ئەوانەش سیفەتەکانی: پێنجەم و شەشەم و حەوتەم.

٤)- ﴿ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴾، زبرو وشك و ڕەق، دوای ئەوەش: نارەسەن، (**عُتلّ**) زانایان چەند مانایەکیان بۆ لێکداوەتەوە:

**یەکەم:** (**الغَلِيْظ الجَافِي**) واتە: بابایەکی زبری وشکی ڕەق.

**دووەم:** (**الأَكُول الشَّرُوب القَوِيُّ الشَّدِيدُ**) واتە: زۆرخۆری زۆر خۆرەوەی، زۆر بەهێزو سەخت.

**سێیەم:** (**الفَاحِشُ السَّيءُ الخُلُق**) واتە: بابایەکی قسە ناشیرینی ڕەوشت دزێو.

کەواتە: (**عُتُلّ**): یان مەبەست پێی سیفەتی جەستەییە، کە زۆر خۆریی و زۆر خواردنەوەیەو قەڵەوییە، یاخود: مەبەست سیفەتی مەعنەوییە کە بریتیە لە قسەی نارێککەرو، ڕەوشت دزێو و سیفەت خراپ.

(**زَنيم**) زانایان زۆر قسەیان لە بارەی زەنیمەوە کردووە:

**١-** هەندێك گوتوویانە: (**الزَّنيم: المُلْصق بالقَوْم**)، (**زنيم**) کەسێکە لە هۆزو نەتەوەیەك نیە، بەڵام خۆی خستۆتە نێو ئەوان و، خۆی بە ئەوانەوە پەیوەست کردوە.

**٢-** هەندێك گوتوویانە: (**الدَّعِيُّ**) واتە: کوڕی بابی خۆی نیە، زۆڵە، بیژوویە (**وَلَدُ الزِّنَى**).

٣- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: (زَنيم: رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ كَانَتْ لَهُ زَنَمَةٌ كَزَنَمَةِ الشَّاةِ) پیاوێك بوو لە قوڕەیشییەکان، زێدە گۆشتێکی هەبوو وەك زێدە گۆشتی مەڕ (کە بەلای گوێیدا دێتە خوار)، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: مەڕی گوێ بە گوارە، واتە: وەك گوارە وایە بەملاولای گوێیدا دێتە خوار، ئەو کابرایەش زێدە گۆشتێکی لەوێ هەبووەو، خوای پەنهانزانیش بۆیە وای باسکردوە، تاکو بناسرێ، وەك لە هۆی هاتنە خوارەکەی دا باسمان کرد، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەو سیفەتانەی باسکران نەماندەزانی مەبەست پێییان کێیە، هەتا خوا فەرمووی: ﴿بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ﴾، ئنجا زانیمان مەبەست پێی فلانکەسە کە زێدە گۆشتی لەملاو لەولای هەبووە.

٤- هەندێك گوتوویانە: (زَنيم: يُعْرَفُ بِالشَّرِّ كَمَا تُعْرَفُ الشَّاةُ بِزَنَمَتِهَا) کەسێك کە بە خراپە ناسراوە وەك چۆن مەڕ بەهۆی ئەو زێدە گۆشتەی بەلای گوێیدا دێتە خوارێ (کە زەنەمەی پێ دەڵێن) دەناسرێ.

٥- هەندێك گوتوویانە: (اللَّئِيمُ الَّذِي يُعْرَفُ بِلُؤْمِهِ كَمَا تُعْرَفُ الشَّاةُ بِزَنَمَتِهَا) واتە: بابایەکی ناڕەسەنی نانەجیب کە بەخراپییەکەی و بێ فەڕییەکەی دەناسرێ، وەك چۆن مەڕ بەو زێدە گۆشتەی پێی دەگوترێ: زەنەمە، دەناسرێ.

ئەوانەش سیفەتەکانی: هەشتەم و نۆیەم.

٥)- ﴿أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ﴾، هەر لەبەر ئەوەی خاوەنی ماڵ و سامان و خاوەنی کوڕانە، ئەی موحەممەد ﷺ! تۆ نەچی بە قسەی بکەی، کە خاوەنی ماڵ و سامان و کوڕانە، بەڵام ئەم هەموو سیفەتە خراپانەشی هەن، بە قسەی مەکەو، مەکەوە ژێر کاریگەرییەوە.

یاخود: ﴿أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ﴾، پەیوەندیی بە دواوە هەیە، واتە: هەر بەهۆی ئەوەوە کە خاوەن سامان و کوڕان بوو:

٦)- ﴿ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا خوێندرانەوە گوتی: ئەوە ئەفسانەی پێشینانە، یانی: بەهۆی ئەوەوە کە ماڵ و سامانی هەبوو، بوغرا بوو بوو، ئەو ئایەتانەی ئێمەی بە ئەفسانەی پێشینان دادەنان.

کەواتە: ﴿ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴾، أ- دەگونجێ پەیوەست بێ بە پێشیەوە، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە خاوەنی ماڵ و سامانەو، خاوەنی کوڕان و قەڕەباڵغیی و خزم و کەسە، ئەو هەموو سیفەتە خراپانەشی تێدا هەن، تۆ بە قسەی مەکەو فەرمانبەریی مەکە.

ب- یاخود: لە ئەنجامی ئەوەدا کە خاوەنی کوڕان و ماڵ و سامان و قەڕەباڵغیی بوو، کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا خوێندرانەوە گوتی: ئەوە ئەفسانەی پێشینانە.

شایانی باسە: ﴿ أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ ﴾، بە دوو شێوەی دیکەش خوێندراوەتەوە:

خوێندنەوەی یەکەم: (ءان كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ) ئەمە بۆ پرسیارکردنە: ئایا هەر لەبەر ئەوەی خاوەنی سامان و کوڕان بوو، کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا خوێندرانەوە، گوتی: ئەفسانەی پێشینانە؟ یان: ئایا لەبەر ئەوەی خاوەنی سامان و کوڕانە، تۆ بە قسەی دەکەی؟.

خوێندنەوەی دووەم: (**أَأَنْ كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ**) کە ئەمەش بۆ پرسیار کردنە واتە:

أ- ئایا لەبەر ئەوەی خاوەنی سامان و کوڕانە، تۆ بە قسەی دەکەی و فەرمانبەریی دەکەی؟.

ب- ئایا لەبەر ئەوەی خاوەنی سامان و کوڕانە بوغرا بووەو، کاتێك ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دەخوێندرێنەوە دەڵێ: ئەمە ئەفسانەی پێشینانە؟ (**أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ: أَبَاطِيلُهُمْ وَتُرَّهَاتُهُمْ**) واتە: قسەی پووچ و هەڵبەستراوی پێشینان.

٧)- ﴿ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴾، (مادام وایە) ئێمە نیشانە لەسەر لووتی دادەنێین، (**الْخُرْطُومِ**) ئەلیف و لامی لەسەرەو ئەم (**أل**)ە: (**عِوَضٌ عَنِ الإِضَافَة، يَعْنِي سَنَسِمُهُ عَلَى خُرْطُومِهِ**)، نیشانەداری دەکەین لەسەر لووتی، کە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمە مەبەست

پێی دنیایە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتوویەتی: (**وَقَدْ خُطِمَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ يَوْمَ بَدْرٍ بِالسَّيْفِ، فَلَمْ يَزَلْ مَخْطُومًا إلى أن مات**)، ئەو کەسەی ئەو ئایەتە لە بارەیەوە هاتۆتە خوار لە جەنگی بەدردا، زەبرێك بەر لووتی کەوت، لووتی بڕاو هەتا مرد هەر بەو شێوەیە بوو، بەڵام هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (**سَنَسِمُهُ عَلَى الْخُرْطُوم أي سَنَسِمُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَنْفِهِ سِمَةً يُعْرَفُ بِهَا**) لە ڕۆژی قیامەتدا نیشانەیەك لەسەر لووتی دادەنێین کە پێی بناسرێ، (**سَنَسِمُهُ**) لە: (**وَسَمْتُهُ وَسْمًا وَسِمَةً، إِذَا أَثَّرْتَ فِيهِ بِسِمَةٍ وَكَيٍّ**)، (**سنسمه**) لەوەوە هاتوە: نیشانەدارم کرد، شوێنکەم لەسەر دانا، کاتێك شوێنکە لەسەر شتێك دادەنێی، ئنجا بە سووتاندن یان بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان بێ.

لە کۆتایی ئەم مەسەلەیەشدا دەڵێین: ئایا ئەو کەسە کەسێکی دیارییکراو بووە، یاخود جۆرە کەسێکە؟ زانایان دوو بۆ چوونیان هەن:

بۆچوونی یەکەم: هەندێکیان گوتوویانە: کەسێکی دیارییکراو بووە، ئنجا ئایا ئەو کەسە دیارییکراوە کێ بووە؟ ١- هەندێکیان گوتوویانە: ئەخنەسی کوڕی شەریقە بووە، ئیبنو جەریری تەبەری دەڵێ: (**هُوَ الْأَخْنَسُ بْنُ شَرِيقٍ أَصْلُهُ مِنْ ثَقِيفٍ ، وَعِدَادُهُ فِي بَنِي زُهْرَةَ: لأَنَهُ التحق بِهِمْ حَتَّى كَانَ مِنْهُم فِي الجَاهِلِيَة، ولذا سُمِيَ زَنِيماً للصُوقِهِ بَالقَوْم، وَلَيْسَ مِنْهُم**)، واتە: ئەو کەسە ئەخنەسی کوڕی شەریقە، ئەسڵی خۆی خەڵکی هۆزی سەقیفە، بەڵام لە هۆزی بەنوو زوهرەدا سەرژمێر کراوە، واتە: بەوانەوە پەیوەست بووە، لەسەردەمی نەفامییدا چۆتە گەڵ ئەوان، هەر بۆیەش پێی گوتراوە: زەنیم، چونکە بە بەنی زوهرەوە پەیوەست بووەو لەوانیش نەبووە، لە هۆزێکی دیکە بووە.

٢- هەندێکیش گوتوویانە: وەلیدی کوڕی موغیرەیە، (**إدّعَاهُ أبُوه بَعْدَ ثَمَانِيَةَ عَشْرَة مِنْ مَوْلِدِه وَهَذَا رَأي الأكْثَر**)، مەبەست پێی وەلیدی کوڕی موغیرەیە کە بابی دوای هەژدان (واتە: هەژدە مانگان، یان هەژدە ساڵان) دوای ئەوەی لە دایك بوو، ئنجا دەعوای کرد، بابی زانراو نەبوو، وەلیدی کوڕی موغیرەش گوتوویەتی: کوڕی منە، دیارە زینای لەگەڵ ئافرەتێکدا کردوەو ئەوی لێ پەیدابووە، ئەمە ڕای زۆربەیە.

٣- هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی ئەبوو جەهلە.

٤- هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی ئەسوەدی کوڕی عەبدو یەغووسە.

بۆچوونی دووەم: لێرەدا خوای زاناو کاربەجێ باسی جۆرە کەسێك دەکات، نەك کەسێکی دیارییکراو، بە بەڵگەی ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾﴾ (**كُلَّ**) هەر کەسێك، کەواتە: ئەمە کەسێکی دیارییکراو نیە، بەڵکو هەر کەسێك خاوەنی ئەو سیفەتانە بێ، دەیگرێتەوە.

ئنجا ڕەنگە ئەو سیفەتانە یەکێك لەو چوار کەسە، یان جگە لە ئەوان، زیاتر بەسەریدا چەسپیبێ، بەڵام مەرج نیە خوا ﷻ مەبەستی پێی کەسێکی دیارییکراو بووبێ، ئەگەرنا وشەی هەر (**كُلَّ**)ی لەسەرەتاوە نەدەهێنا.

خوڵاصەو کورتەی مانای ئەو ئایەتانەش ئەوەیە: کە ئەهلی هەق، موحەممەد ﷺ سەرمەشقیانە، کە بەجوانترین و بەرزترین ڕەوشت و ئاکار ناسراوەو، ئەهلی باتیڵیش ئەو جۆرە کەسانە سەرمەشقیانن، کە خاوەنی ئەم هەموو سیفەتە ناشیرین و ناقۆڵاو دزێو و خراپانەن.

## کورتە باسێک لە بارەی ڕەوشتبەرزیی پێغەمبەر ﷺ و، ڕەفتارپەستیی ناحەزانییەوە

بەڕێـــــزان!

ئێمە لە حەوت بڕگەدا ئەم کورتە باسە دەخەینە ڕوو، لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتی چواری سووڕەتی (**القلم**)دا، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾، بەڕاستیی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی (ئەی موحەممەد ﷺ!)، دیارە ئەویش بۆ بەرپەرچدانەوەی تۆمەتی بێبڕوایەکان بوو، کە دەیانگوت: موحەممەد ﷺ سەرگەردانە، یان دەیانگوت: جادووی لێکراوە، یان دەیانگوت: شێتە، یان جادووگەرە، لە وەڵامی هەموو ئەو تۆمەتانەدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾، بەڕاستیی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی مەزنی، واتە: ئەو ڕەوشت و ئاکارو سیفەت بەرزییەی تۆ ئەی موحەممەد ﷺ! بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تۆ ڕاست و ساغی لەگەڵ خواو خەڵکداو، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تۆ ڕەوانەکراوی خوای، چونکە ئەگەر بگونجێ هەر شتێکی دیکە بە زۆر لە خۆکردن (**تكلُّف**) و خۆئەزیەتدان و، بە ڕواڵەت وا خۆپێشاندان، لە خۆدا بهێندرێتە دی، بەڵام ڕەوشتی بەرزو مەزن، بە واتای فراوانی ڕەوشتی بەرزو مەزن، کە هەم خەسڵەتە دەروونییە بەرزەکان دەگرێتەوە، هەم ئاکارو ڕەفتارە بەرزە ڕواڵەتییەکان دەگرێتەوە، هەم لە مامەڵە لەگەڵ خەڵکداو، پێش ئەوەش لە مامەڵە لەگەڵ خوادا ﷻ، خۆڕازاندنەوە بە هەموو ئەو خەسڵەت و ئاکارە بەرزو جوانە مەعنەویی و ڕواڵەتییانەی پێویستن، هەروەها خۆ دوورگرتن لە هەموو ئەو شتانەی پێچەوانەی خەسڵەتە پەسندە مەعنەوییەکان و، ئاکارو ڕەوشتە پەسەندە ڕواڵەتییەکانن، ئەوە تەنیا بە کەسێك دەکرێ، کە پەیوەست بێ بە خوای پەروەردگارەوەو، بەبێ پەیوەستیی بە خواوە ﷻ وەك بەندایەتیی

بۆ خوا کردن، مرۆڤ ناتوانێ بەهەمـوو ڕەوشـتە بەرزو پەسـەندە دەروونیـی و ڕواڵەتییـەکان ڕازاوە بـێ و، لـە هەمـوو خەسـڵەت و ئـاکارو ڕەفتـارە دەروونیـی و ڕواڵەتییـە خراپـەکان، پـاك و بژارکـراو بـێ، کـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بـەو شـێوەیە بـووە.

## بڕگەی یەکەم: پێناسەر ڕەوشت بەرزیی و ڕەوشت نزمیی:

ئێمـە لـە مەوسـووعەی: (خووڕەوشـتی ئیسـلامیی لەبـەر ڕۆشـنایی قوڕئـان و سـوننەتدا) بـە درێژیـی باسـی سـەد و پەنجـاو پێنـج (١٥٥) موفـڕەدەی ڕەوشـتی بـەرزو جوانمـان کـردوە، هەروەهـا ئاماژەمـان بـە پێچەوانەکانیـان داوە، دیسـان لـە کتێبـی: (ئـەدەب و ڕەوشـتە کۆمەڵایەتییەکان)یـش دا هـەر ئاماژەمـان بـەوە کردۆتـەوە، وێـڕای ئـەوان نامیلکەیەکیشـمان هەیـە بـە نـاوی: (خـوو ڕەوشـتیی بـەرزو پەسـند، سـەنگی مەحەکـی مسـوڵمانەتییە)، بـەڵام لێـرەدا لـە قـەدەر ئـەم تەفسـیرە، ئـەم کورتـە باسـە دەخەینـە ڕوو.

یەکێـك لـە ڕوونکەرەوەکانـی قوڕئـان کـە ئیبنـو عەجیبەیـە لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1] پێناسـەیەکی هێنـاوە پێـم جـوان بـوو، ئەگەرنـا زانایـان زۆر باسـی ڕەوشـتی بەرزو جوانیان کردوە، کە پێناسەکەی چۆنە؟ دەڵێ:

**(حَقِيقَـةُ الْخُلُـقِ، مَلَكَـةٌ لِلنَّفْـسِ، تَصْـدُرُ عَنْهَـا الأَفْعَـالُ بِسُـهُولَةٍ، مِـنْ غَـيْرِ فِكْـرٍ وَلَا رَوِيَّـة، فَخَـرَجَ الصَّـبْرُ؛ لِأَنَّـهُ بِصُعُوبَـةٍ، وَالْفِكْـرَةُ؛ لِأَنَّهَـا بِرَوِيَّـة، ثُـمَّ يُنْظَـرُ فِي تِلْـكَ الأَفْعَـالِ الصَّـادِرَةِ عَـنْ تِلْـكَ الْمَلَكَـةِ؛ فَـإِنْ كَانَـتْ سَـيِّئَةً، كَالْغَضَـبِ، وَالْعَجَلَـةِ، وَالْكِـبْرِ، وَالْفَظَاظَـةِ، وَالْغِلْظَـةِ، وَالْقَسْـوَةِ، وَالْبُخْـلِ، وَالْجُبْـنِ، وَغَـيْرِ ذَلِـكَ مِـنَ الْقَبَائِـحِ، سُـمِّيَ خُلُقـاً سَـيِّئاً، وَإِنْ كَانَـتْ تِلْـكَ الأَفْعَـالُ حَسَـنَةً، كَالْعَفْـوِ، وَالْحِلْـمِ، وَالْجُـودِ، وَالصَّـبْرِ، وَالرَّحْمَـةِ، وَلِيـنِ الْجَانِـبِ، وَتَحَمُّـلِ الأَذَى، سُـمِّيَ خُلُقـاً حَسَـناً)**/ واتـە: حەقیقـەتی خووڕەوشـت (چ بـە بـاری چاکـە دا بـێ،

---

(١) الْبَحْرُ الْمَدِيد فِي تَفْسِيرِ الْقُرْآن الْمَجِيد: ج٨، ص١٠٦.

چ بـە بـاری خراپـەدا)، حاڵەتێکـە لـە دەروونـدا کـە ڕەفتـارو کـردەوەکان بـە ئاسـانیی لێـوەی هەڵدەقوڵـن، بـێ ئـەوەی خاوەنەکـەی بیریـان لـێ بکاتـەوەو ڕابمێنـێ، (بۆیـە بـە بۆچوونـی ئـەو) خەسـڵەتی ئارامیـی لـە پێناسـەی ڕەوشـت دەچێتـە دەرێ، چونکـە بەخـۆ ئەزیەتـدان مـرۆڤ دەتوانـێ خۆڕاگـر بـێ، هەروەهـا بیرکردنـەوەش لێـی دەچێتـە دەرێ، چونکـە ئەویـش پێویسـتیی بـە تێوەڕامـان هەیـە، {دەڵـێ: ڕەوشـت ئەوەیـە بەبـێ بیـر لێکردنـەوەو، خـۆ ئەزیەتـدان، یەکسـەر لـە مرۆڤـەوە دەربچـێ}، ئنجـا دوایـی تەماشـا دەکـرێ، ئـەو کـردەوەو هەڵسـوکەوت و ڕەفتارانـەی لـە مـرۆڤ دەردەچـن، لـەو حاڵەتـە دەروونییـەوە دەردەچـن، ئەگـەر خـراپ بـن، وەك: تووڕەیـی، پەلەکـردن، خۆبەزلگریـی، قسـە ڕەقـی، دڵڕەقیـی، بـێ بەزەیـی، چرووکیی، ترسـنۆکیی و، جگـە لەوانـەش لـە ڕەوشـتە خراپـەکان، ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: ڕەوشـتی خـراپ، بـەڵام ئەگـەر ئـەو کـردەوەو ئاکارانـە چـاك بـن، وەك: لێبـوردن، هێدیـی و مەندیـی، بەخشـندەیی، خۆڕاگریـی، بەزەیـی، نـەرم و نیانـی، پشـوو درێژیـی، تەحەممولکردنـی ئـازاری خەڵـك، ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: ڕەوشـتی جـوان.

ڕەخنـەم لـە ئـەو پێناسـەیە ئەوەیـە کـە ئـەو دەڵـێ: ئارامگرتـن و بیرکردنـەوە لـە پێناسـەی ڕەوشـتی جـوان دەچنـە دەرێ، دواییـش هـەر خـۆی لـە ڕیـزی ڕەوشـتە جوانەکانـدا، ئارامگرتنیشـی هێنـاوەو ئـەوەش دژ یەکییـە، قسەکەشـی ڕاسـت نیـە کـە ئـارام گرتـن و بیرکردنـەوە، لـە بازنـەی ڕەوشـتی جـوان بچنـە دەرێ، چونکـە ڕەوشـتی جـوان حاڵەتێکـە ڕیشـەکەی لـە دەرووندایـە، بـەڵام مـەرج نیـە پێویسـتیی بـە خـۆ ئەزیەتـدان و زۆر لـە خۆکـردن نەبـێ، هەروەهـا پێویسـتیی بـە بیـر لێکردنـەوە نەبـێ!

ڕەوشـت بریتیـە لـەو سیفەتە مەعنەویـی و، ئـاکارە ڕواڵەتییانـەی لـە مرۆڤـەوە دەردەچـن، ئنجـا ئەگـەر چـاك بـن، ئـەوە دەگوترێ: ئـەو مرۆڤە ڕەوشـتێکی پەسـندو چاکـی هەیـەو، ئەگـەر خراپیـش بـن، دەگوتـرێ: فڵانکـەس ڕەوشـت و هەڵسـوکەوت و ڕەفتارێکـی خراپـی هەیـە.

## بڕگەی دووەم: سەرچاوەی ڕەوشتبەرزیی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بووە؟

بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا بە ڕەوشتی بەرزو مەزن پێناسەی دەکات، ڕەوشتە بەرزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێوە هاتوە؟

هەر لەسەرچاوەی پێشوودا[1]، لە زانایەکەوە بەناوی عەبدوڕڕەحمان ئەلعارف واتە: (**العارف بالله**) عاریف هەر نازناوی بووە، دەیهێنێ کە گوتوویەتی:

**(كَانَ ﷺ عَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ؛ لِشَرْحِ صَدْرِهِ بِالنُّورِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾﴾ الشرح، وَلِحَدِيثِ شَرْحِ صَدْرِهِ، وَشَقِّهِ وَتَطْهِيرِهِ، وَنَزْعِ حَظِّ الشَّيْطَانِ مِنْهُ، ثُمَّ إِفْرَاغِ الْحِكْمَةِ وَالنُّورِ فِيهِ، حَتَّى مُلِئَ بِذَلِكَ، فَكَانَ شَيْئاً مَحْضاً للهِ تَعَالَى، لَا تَعَلُّقَ لَهُ بِغَيْرِهِ، فَنَاسَبَ الْقُرْآنَ، وَصَارَ خُلُقاً لَهُ، مَنْقُوشاً فِيهِ، مِنْ غَيْرِ رَوِيَّة، وَلَا تَكسب فِي ذَلِك، بَلْ طُبِعَ عَلَى ذَلِك، وَسَرَى فِيه أَمْر الوحي، وَجرى عَلَى مقْتَضاه فِي جَمِيْع أحواله، وَلِذَلكَ تَجِدُ السُّنَةَ مُشْرَعَةً مِنَ القُرْآنِ، وَخَارِجَةً مِنْهُ خُرُوج اللبنِ مِن الضَّرْعِ، وَالزُّبَدِ مِن اللَّبَنِ، فَصَار متخلّقاً بالقرآن، وفي الحَقِيقَة متخلّقاً بخُلق الله، وَمَظْهرَ أَوْصَافه، وَمَجْلاة سِرِّهِ وَشَأنِهِ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ ﴿١٠﴾﴾ [الفتح] الآية، ومَن رآه فَقَدْ رَأى الحقَّ، والله أعلم، فَعَائِشَة رَضِيَ اللهُ عَنْهَا احْتَشَمَت وَسَتَرَت حَيْث عبَّرت بالقُرْآن، وَلَمْ تَقُلْ كَانَ خُلُقُهُ خُلُقَ الرَّحْمَن).**

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە لەسەر ڕەوشتێکی مەزن بوو، چونکە خوا ﷻ سینەی گوشاد کردبوو بە ڕووناکیی، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ﴿١﴾﴾ **الشرح**، ئایا سینەتمان بۆ گوشاد نەکردووی؟ وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە لە باسی لەتکردنی سینەی دا و پاككردنەوەی و، داڕنینی پشك و بەشی شەیتان لێی، دوایی پڕکردنی لە حیکمەت و لە ڕووناکیی {کە ئەو دەقەی سوننەت، هەر ڕوونکردنەوەی ئەو ئایەتە موبارەکەیە}، هەتا

---

(١) الْبَحْرُ الْمَدِيد فِي تَفْسِيرِ الْقُرْآن الْمَجِيد: ج٨، ص١٠٧.

پێغەمبـەری خـوا ﷺ سینەو دڵـی پڕ بـوو بـوو لـە نـوور و لـە حیکمـەت و، بـوو بـوو بـە شـتێکی سـاغ بـۆ خـوا ﷻ، پەیوەندیـی بـە هیـچ شـتێکی دیکـەی جگـە لـە خـواوە نەمابـوو، هـەر بۆیـە حاڵەتەکـەی وابـوو لەگـەڵ قورئانـدا ڕێـك بـوو، قورئـان بـۆی بـوو بـوو بـە ڕەوشـت و ئـاکارو تییـدا بـوو بـوو بـە نیـگار، بەبـێ ئـەوەی بیـر بکاتـەوە، یاخـود خـۆی ئەزیـەت بـدات، بەڵکـو خـوا ﷺ لەسـەر ئـەوە سرووشـتاندبووی و، وەحیـی لـە دڵ و دەروونـی دا دەڕۆیشـت، بـوو بـوو بـە خـوازراوی سرووشـتەکەی لـە هەمـوو حاڵەکانـی دا، هـەر بۆیـە ڕێبـازی پێغەمبەریش ﷺ لـە قورئانـەوە هەڵقـوڵاوەو، لەوێـوە دەرچـووە، وەك چـۆن شـیر لـە گوانـی ئـاژەڵ دەردەچـێ، یـان وەك چـۆن ڕۆن لـە نێـو شـیر دێتـە دەرێ، بۆیـەش ئـەو ﷺ ڕازاوە بـوو بـوو بـە ڕەوشـتە قورئانییـەکان و بـوو بـوو بـە دەرخـەری سیفەتەکانی خـواو، درەوشـێنەرەوەی نهێنیـی خـواو کاری خـوا، وەك لـە ئایەتـی ژمـارە دە (١٠) ی سـوورەتی فەتـح دەردەکـەوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَـٰهَدَ عَلَيْهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾﴾، هـەر کەسـێك پێغەمبـەری خـوای ﷺ بینیبایـە ئەگـەر بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ تەماشـای کردبایـە، خـوای پـەروەردگاری تێـدا دەبینـی، {واتـە: سـیفەتەکانی خـوای تێـدا دەدیـتن}، خـواش زاناتـرە، بۆیـەش عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ، جۆرێـك لـە خۆپارێزیـی کـردوە، کاتێـك کـە پرسـیاری لێکـراوە لـە بـارەی ڕەوشـتی پێغەمبـەرەوە ﷺ گوتوویەتـی: {**كَانَ خُلُـقُ نَبِـيِّ اللَّـهِ الْقُـرْآنَ**}، ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـوا قورئـان بـوو، نەیگوتـوە: {**كَانَ خُلُـقُ نَبِـيِّ اللَّـهِ خُلُـقَ الرَّحْمَـنِ**}، ڕەوشـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەمـان سـیفەتەکانی خـوای بـە بەزەیـی بـوون.

دەڵێـم: ئـەم تەعبیـرەش تاڕادەیـەك ڕێـی تێدەچـێ، بـەڵام زانایـان بۆیـە خۆیـان لـەوە پاراسـتوە، چونکـە کۆمەڵێـك لـە سـیفەتەکانی خـوا ﷻ تایبەتـن بـە خـوای پـەروەردگارەوە، وەك: بەدیهێنەرایەتیـی و، پەروەردگاریەتیی و، تەنیا پەرسـتراویەتیی و، نـاو و سـیفەتەکانی کـە تایبەتـن بـە خـواوە، هەروەهـا ئـەوەی مـرۆڤ پێـی

دەگوترێ: (**خُلق**) هەڵسوکەوتی بەرجەستەیی و ماددییە، بەڵام خوای بەرز دیارە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ **الشورى**، ئەگەرنا ئەوە ڕاستە، کە خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ بە هەندێك لە سیفەتەکان، کە سیفەتی خۆیشینی، وەسفکردوە وەك دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾﴾ **التوبة**، خوای بێ وێنەش خاوەنی ئەوپەڕی پەرۆشیی و بەزەییە، پێغەمبەریشی ﷺ بەوە پێناسە کردوە، بەڵام بێگومان پەرۆشیی و بەزەیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەدەر خۆی و، هی خوای پەروەردگاریش کە بێ سنوورەو ڕەهایە، ئەوانیش بەپێی ڕەهایی و بێ سنووری خواو سیفەتەکانیی.

## بڕگەی سێیەم: بنەمایەکانی ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ:

زانایان زۆریان لەو بارەوە قسە کردوون، (إبن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (**وَاعْلَمْ أَنَّ جُمَاعَ الْخُلُقِ الْعَظِيمِ الَّذِي هُوَ أَعْلَى الْخُلُقِ الْحَسَنِ، هُوَ التَّدَيُّنُ، وَمَعْرِفَةُ الْحَقَائِقِ، وَحِلْمُ النَّفْسِ، وَالْعَدْلُ، وَالصَّبْرُ عَلَى الْمَتَاعِبِ، وَالإعْتِرَافُ لِلْمُحْسِنِ، وَالتَّوَاضُعُ، وَالزُّهْدُ، وَالْعِفَّةُ، وَالْعَفْوُ، وَالْجُودُ، وَالْحَيَاءُ، وَالشَّجَاعَةُ، وَحُسْنُ السَّمْتِ، وَالتُّؤَدَةُ، وَالْوَقَارُ، وَالرَّحْمَةُ، وَحُسْنُ الْمُعَامَلَةِ وَالْمُعَاشَرَةِ. وَالْأَخْلَاقُ كَامِنَةٌ فِي النَّفْسِ وَمَظَاهِرُهَا تَصَرُّفَاتُ صَاحِبِهَا فِي كَلَامِهِ، وَطَلَاقَةِ وَجْهِهِ، وَثَبَاتِهِ، وَحُكْمِهِ، وَحَرَكَتِهِ وَسُكُونِهِ، وَطَعَامِهِ وَشَرَابِهِ، وَتَأْدِيبِ أَهْلِهِ وَمَنْ لِنَظرِهِ، وَمَا يَتَرَتَّبُ عَلَى ذَلِكَ مِنْ حُرْمَتِهِ عِنْدَ النَّاسِ، وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ وَالسُّمْعَةِ. وَأَمَّا مَظَاهِرُهَا فِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَفِي ذَلِكَ كُلِّهِ وَفِي سياسته أُمَّتِهِ، وَفِيمَا خُصَّ بِهِ مِنْ فَصَاحَةِ كَلَامِهِ وجوامع كلمه**).

ئیبنو عاشوور یەکێکە لە زانا موعتەبەرەکانی ماناکانی قورئان دەڵێ: بزانە: کۆکەرەوەی ڕەوشتی مەزن، کە بریتیە لە بەرزترینی ڕەوشت و ئاکار،

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٢، ص (٦٤،٦٥).

بریتیـن لەمانـە [لـەم نـۆزدە بنەمایـە]، دوایـی هەمـوو ڕەوشـتە بـەرزو جوانـەکان دەگەڕێنـەوە بـۆ ئەوانـە {ئـەو لـە تەفسـیرەکەیدا ژمـارەی بـۆ دانەنـاون}:

**یەکەم:** دینداریی {بەندایەتیی بۆ خوا}.

**دووەم:** زانینی ڕاستییەکان.

**سێیەم:** ئارامیی دڵ و دەروون.

**چوارەم:** دادگەریی.

**پێنجەم:** خۆڕاگریی لەسەر ماندوویی و ناڕەحەتییەکان.

**شەشەم:** دان پێداهێنانی چاکەی چاکەکاران.

**حەوتەم:** خۆ بەکەمگریی.

**هەشتەم:** دنیا بەکەمگریی.

**نۆیەم:** خۆ پاکڕاگرتن.

**دەیەم:** لێبوردن.

**یازدەیەم:** سەخاوەت و بەرچاوتێریی.

**دوازدەیەم:** شەرم و شکۆ.

**سێزدەیەم:** ئازایەتیی و بوێریی.

**چواردەیەم:** شێوەی جوان {شێوەی دەروونیی جوان، شێوەی مەعنەویی جوان، نەك مەبەست قەد و قیافەو لەش و لار بێ، یانی هەڵسوکەوتی جوان بە گشتیی}.

**پازدەیەم:** هێدیی و مەندیی و پەلە نەکردن.

**شازدەیەم:** ویقارو سەنگینیی.

**حەڤدەیەم:** بەزەیی.

**هەژدەیەم:** هەڵسوکەوتی جوان.

**نۆزدەیەم:** مامەڵەی باش لەگەڵ نزیکان و ئەوانەدا کە زۆر تێکەڵن.

{دوایی دەڵێ:} دیارە ڕەوشتە بەرزو جوانەکان لە دەروونی مرۆڤدا شێردراون، بەڵام ئەوەی لە مرۆڤدا دەبینرێ، ڕواڵەتەکانی ڕەوشتی جوانن، کە لە قسەکردنی، لە ڕووخۆشیی، لە چەسپاویی، لە حوکمدانی، لە جووڵەی، لە ڕاوەستانی، لە خواردن و خواردنەوەی، لە ڕاهێنانی نزیکانی خۆیدا، لەسەر ڕەوشتی جوان، هەروەها ئەوەی لەسەر ئەوە بنیات دەنرێ، لەوەدا کە ڕێزی لە لای خەڵك هەیەو، خەڵك بە چاکە باسی دەکەن و ناوبانگی باشی بۆ پەیدادەبێ، بەڵام شوێنەوارەکانی ڕەوشتی جوان لە پێغەمبەری خوادا ﷺ لەوانەدا لە هەموویان دایە، وێڕای ئەوەش لەوەدا کە ئۆممەتەکەی خۆی سەرپەرشتیی کردوە، (هەموو کەسیش ئەوەی ناکەوێتە دەست کە سەرپەرشتیی خەڵك و کۆمەڵگا بکات)، هەروەها ئەوەش کە تایبەتکراوە بە پێغەمبەرەوە ﷺ لە زمانپاراویی و، لە وشە کۆکەرەوەکان بۆ مانای زۆر [کاتێك فەرمایشتی کردوە].

## بڕگەی چوارەم: بە نسبەت ناحەزانی پێغەمبەری خواوە ﷺ:

پێشتر باسمان کرد کە خوا ﷻ باسی کەسێکی دیارییکراو، یان باسی جۆرە کەسێك دەکات و، نۆ سیفەتی خراپی لێ هەڵدەدات:

سیفەتی یەکەم و دووەم: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾**القلم**، (**الْحَلَّافُ: يَعْنِي كَثِيْرَ الحَلِف بالحَق وَالبَاطِل**)، کەسێك کە زۆر سوێند بخوات بە هەق و بە ناهەق، خوا ﷻ ڕێگریی لەوە کردوە، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَانِكُمْ أَن تَبَرُّوا وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ ۗ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾ ﴾، خوا ﷻ مەکەن بە شتێك هەمیشە سوێندی پێ بخۆن.

ئنجـــا

سیفەتی خراپی دووەم: (**مَهِين**)ە، لە ناحەزانی پێغەمبەردا ﷺ چ کەسێکی دیارییکراو بێ، چ جۆرە کەسێك بێ، زەجاج گوتوویەتی: (**وَالْمَهِينُ: فَعِيْل لِمَن**

فیـه مَهَانَـة)، (**مهـین**) لەسـەر کێشـی (**فعیـل**)ە، بـە مانـای (**مَهَانـة**)ە، واتـە: سـووکیی و بـێ بایەخیـی، ئنجـا (**مَهَانـة**) بـە دوو واتـا لێکیانداوەتـەوە:

واتـای یەکـەم: (**القَّلةُ وَالحَقَـارَة في الـرَّأْيِ وَالتَّمْييـزِ**) کەسـێکە لـە عەقـڵ و لـە لێـك جیاکردنـەوەی چاکـەو خراپـەدا کەمیـی هەبـێ.

واتای دووەم: (**الحَقِيرُ عِنْدَ النَّاس**) کەسێك لە لای خەڵك سووك و کەم بایەخ بێ.

سـیفەتی سـێیەم: (**الهَـمَّازُ: العَيَّـابُ الطَّعّـان في غِيَـابِ النَّـاس أو في وَجْهِهِـم**) (**هَـمّاز**): بریتیـە لـە تانـە لـە خەڵکـدەرو، شـکێنەری خەڵـك چ کاتێـك کـە نادیـارە لێیـان و، چ لـە حاڵەتـی ڕووبـەڕوو بوونـەوەدا، پێشـتریش، گومـان زیاتـر حاڵەتـی غەیبـەت و پاشـملە باسـکردن دەگرێتـەوە.

سـیفەتی چـوارەم: (**مَشَّـاءٍ بِنَمِيـمٍ: أي يَمْـشِي بِالنَّمِيمَـةِ للإِفْسَـادِ بَيْنَهُـم**)، زۆر قسـە دەهێنـێ و دەبـا بـۆ ئـەوەی بەینـی خەڵکـی تێکبـدات.

سـیفەتی پێنجـەم: (**مَنَّـاعٍ لِلْخَـيْرِ**) (**مَنَّـاعٍ صِيْغَـة مُبَالَغَـة مَانِـع**) واتـە: زۆر ڕێگـرە لـە خەیـر، (**خَـيْر**) دەگونجـێ بـە مانـای مـاڵ و سـامان بـێ واتـە: مـاڵ و سامانەکەی خـۆی زۆر دەسـت پێـوە دەگرێ و نایبەخشـێ، یاخود (**خَيْر**) مەبەسـت پێـی چاکەی مەعنەویی بـێ، واتـە: زۆر ڕێگـری خەڵکـە لـەوەی ڕووبکەنـە خێـر و چاکـە کـە ئیسـلامەتییە.

سـیفەتی شەشـەم: (**مُعْتَـدٍ**) واتـە: سـنوور بەزێـن، وەك ئـەو کەسـەی سـنوور بـۆ لای خەڵـك دەبەزێنـێ و، سـنووری هـەق دەبەزێنـێ، دەسـتدرێژیی دەکاتـە سـەر مافەکانـی ئەوانـی دیکـە.

سـیفەتی حەوتـەم: (**أَثِيـمٍ**) واتـە: زۆر گوناهـکار، صیغـەی موبالەغەیـە لـە (**آثـم**) واتـە: گوناهـکار، لـە هیـچ گوناهێـك ناسـڵەمێتەوەو ناپرینگێتـەوە.

سـیفەتی هەشـتەم: (**عُتُـلٍّ**) بریتیـە لـە ڕەوشـت دزێـو، ئنجـا دەگونجـێ لـە ڕووی مەعنەوییـەوە بـێ و، مەبەسـت پێـی بابەیەکـی توندو تیـژی زبری دڵڕەقی قسـە ڕەق

بێ، دەشگونجێ سیفەتی خراپەو سەرزەنشتکردن بێ لە ڕووی جەستەییەوەو، مەبەست پێی بەهێزی قەبەی ورگ زلی زۆرخۆری زۆرخۆرەوە بێ.

سیفەتی نۆیەم: (**زَنِيمٍ**) واتە: کەسێك لە کۆمەڵە خەڵکێك نیەو خۆی بەوانەوە پەیوەست کردوە، چونکە (**زنمة**): زیادە گۆشتێکە بەلای گوێی مەڕدا دێتە خوار، یاخود (**زَنِيمٍ: الَّذِي يُعْرَف بَالشَّرِّ وَاللُّؤم كَمَا تُعْرَفُ الشَّاة بِزَنَمَةٍ**) کەسێك کە بە خراپەو ناڕەسەنیی و نانەجیبیی ناسراوە، هەروەك چۆن مەڕێك بەو زێدە گۆشتەی بەلای گوێیدا بەربۆتەوە، دەناسرێ.

کەواتە: ئەوانە ڕەوشت و ئاکارە ناپەسندو دزێوو قەڵب و خراپەکانی ناحەزەکانی پێغەمبەر بوون و، بەس بە بەراوردکردن لە نێوان ڕەوشتەکانی پێغەمبەرو، ڕەوشت و هەڵسوکەوتە دزێو و ناشیرینەکانی ناحەزەکانی دا، دەزانرێ کێ لەسەر هەقەو کێ لەسەر ناهەقە؟.

## بڕگەی پێنجەم: چەند فەرمایشتێك لەبارەی ڕەوشتەوە:

ئێمە چوار فەرمایشتان لەو بارەوە دێنین، ئەگەرنا فەرمایشت لەو بارەوە زۆر زۆرن، لە شوێنانەدا کە پێشتر ئاماژەمان پێیاندا، بە دوور و درێژیی لەم بارەوە قسەمان کردوە:

فەرمایشتی یەکەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**اتَّقِ اللَّـهِ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ**} (**أخرجه أحمد: ٢١٣٩٢، والترمذي: ١٩٨٧، وقال: حسن صحيح، والدارمي: ٢٧٩١، والحاكم: ١٧٨، وقال: صحيح على شرط الشيخين، ووافقه الذهبي**)، واتە: لە هەر حاڵ و شوێنێك بووی، پارێز لە خوا بکەو، بە دوای خراپەدا چاکە بکە، دەیسڕێتەوەو، لەگەڵ خەڵکدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بکە.

فەرمایشتی دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**مَا مِن شَيْءٍ أَثْقَل فِي مِيزَانِ المُؤْمِنِ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ، وَإِنَّ اللَّهَ لَيُبْغِضُ الفَاحِشَ البَذِيءَ**} (**أخرجه الترمذي: ٢٠٠٢، وغيره، وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ**).

واتە: هیچ شتێك لە تەرازووی بڕوادار لە ڕۆژی قیامەتدا، لە ڕەوشتی جوان قورسترو گرانتر نیە، خوای بەرزیش ڕقی هەڵدەستێ لە هەر کەسێکی قسە ناشیرینی زمان شڕ.

فەرمایشتی سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي المِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الخُلُقِ، وَإِنَّ صَاحِبَ حُسْنِ الخُلُقِ لَيَبْلُغُ بِهِ دَرَجَةَ صَاحِبِ الصَّوْمِ وَالصَّلَاةِ**} (**أخرجه: الترمذي: ٢٠٠٣، وصححه الألباني في صحيح سنن الترمذي**).
واتە: هیچ شتێك کە لە تەرازوودا دادەنرێ لە ڕەوشتی جوان قورسترو گرانتر نیەو، هاوەڵی ڕەوشتی بەرزو جوان، دەگاتە پلەی کەسێك هەمیشە شەوانە شەو نوێژ دەکات و، ڕۆژووی سوننەتیش ناپسێنێتەوە، واتە: ئەو ڕۆژانەی سوننەتن هەموویان دەگرێ، ئەو کەسەی ڕەوشتی بەرزو جوان بێ، با ئەو خواپەرستییانەشی هێندە نەبن، واتە: شەونوێژکەر نەبێ، یان ڕۆژووگری سوننەت نەبێ بەو جۆرەی باسکرا، بەڵام دەگاتە پلەی ئەو.

فەرمایشتی چوارەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ القِيَامَةِ أَحَسِنَكُمْ أَخْلَاقًا، وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ القِيَامَةِ الثَّرْثَارُونَ وَالمُتَشَدِّقُونَ وَالمُتَفَيْهِقُونَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ عَلِمْنَا الثَّرْثَارُونَ وَالمُتَشَدِّقُونَ، فَمَا المُتَفَيْهِقُونَ؟ قَالَ: «المُتَكَبِّرُونَ»**}، (**أخرجه: الترمذي**: ٢٠١٨، **وصححه الألباني في صحيح الترمذي**). واتە: بە دڵنیایی لە خۆشەویستترینتانتان لە لام و نزیکترینتان لێمەوە، لە ڕووی دانیشتنەوە، لە ڕۆژی دواییدا، ئەوانەتانن کە ڕەوشتیان جوانترە، بە دڵنیاییش بوغزاوترینتان لەلام و دوورترینتان لە ڕووی پێگەوە لێم لە ڕۆژی دواییدا، زۆر بلێیان و پڕ بە زار قسەکەران (**مُتَشَدِّق**)،

(کەسێك کە بە کەشخەو دەمارەوە قسە دەکات و قسەی قەڵەو و زل دەکات، بە ئەنقەست نەك هەر دەنگەکەی وابێ)، خۆبەزلگرانن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دەزانین زۆر بڵێیان و کەسانێك کە بە کەشخەو دەمارەوە قسە دەکەن، کێن، ئایا (**متفیقهون**) کێن؟ فەرمووی: ئەوانیش خۆبەزلگرەکانن.

## بڕگەی شەشەم:

لە هەموو قورئاندا، ئەم ڕستەیە: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾، تەنیا لەم ئایەتی ژمارە چواری سوورەتی (**القَلَم**)دا هاتووەو، لە هەموو قورئانیشدا بێبڕوایەکان و ناحەزەکانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ تەنیا لەم چەند ئایەتەدا، بە نۆ خەسڵەتی نزم و پەستیان پێناسە کراون، کەواتە: ڕەوشتی جوان سەنگی مەحەکە، بۆ بابای ڕاست و ساغ لەگەڵ خواو لەگەڵ خەڵکداو، ڕەوشتی خراپیش سەنگی مەحەك و پێوەرە، بۆ ناحەزانی پێغەمبەران (**صلى الله عليهم وسلم**)، ناحەزانی ئایین و پەیامی خوا، تەماشای ڕەوشتیان بکە، جاری وایە ڕەنگە بە ڕواڵەت ڕەوشتی خۆیان جوان بکەن، بەڵام کە دەچیە نێو ناخیانەوەو لە ژیانی پەنهانیان ئاگادار دەبی، ئنجا بۆت دەردەکەوێ کە ئەوان زبڵدانێکن پڕە لە خەسڵەتە نزم و پەستەکانی وەك: خۆبەزلگریی و خۆپەسندیی و دنیا پەرستیی و ئارەزوو پەرستیی و بێ ڕەحمیی، تا کۆتایی هەموو ئەو سیفەتە نزم و پەستانە.

پێشتریش ئاماژەم پێدا -پێم وایە- لەسۆنگەی ئەوەوە لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا خوای کارزان باسی جۆرە کەسێك دەکات، کە دژ و ناحەزی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە نۆ لە سیفەتە قەڵب و ناشیرینەکانی، دوای ئەوەی باسی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات بە ڕەوشتی مەزن و بەرزو پەسند، بۆ ئەوەی دیار بێ ڕەوشتبەرزیی و ڕەوشت مەزنیی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵگەی ڕاستییەتی، هەروەك ڕەوشت دزێویی و ئاکار خراپیی ناحەزانیشی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەسەر ڕێیەك و بەرنامەیەکی پووچ و خراپن.

## بڕگەی حەوتەم و کۆتایی:

گوڵبێـژێ لـە ڕەوشـتە بـەرزو پەسـەندەکانی پێغەمبـەری خوا ﷺ: سـی و یـەك (٣١) فەرمـوودە لـە هەشـت بڕگـەدا لـە بـارەی ڕەوشـتەکانی پێغەمبـەرەوە ﷺ لەبـەر تیشـکی (**الشَّـمَائل المُحمديّـة، صفـات النبـي الجسـمية والخُلُقِيَّـة، للإمـام أبي عيـسى محمـد بـن السـورة الترمـذي**)، کـە لـە سـاڵی (٢٠٩)ی کۆچیـی دا لـە دایـك بـووەو لـە (٢٧٩)ی کۆچییـدا وەفاتـی کـردوە، ئێمـە تەنیـا لـەو بوارانـەدا کـە دیارییـمان کـردوون، ئامـاژە دەکەیـن بـە ژمارەیـەك لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ یـان بـە دەقەکانـی سـوننەت کـە لـە بـارەی ڕەوشـت و ئاکارەکانـی پێغەمبـەرەوە هاتـوون، لـە هەشـت بـواردا:

### ١- (بَـابُ مَـا جَـاءَ فِي تَعَطُّـرِ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ)، باسـێك لـە بـارەی بۆنـی خۆشـی پێغەمبـەری خوا ﷺ:

ئێمە سێ فەرموودە لەو بارەوە دێنین:

**یەکەم:** {**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ** رضي الله عنه **قَالَ: «كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ** ﷺ **سُكَّةٌ يَتَطَيَّبُ مِنْهَا»**} (**أخرجه الترمذي في الشمائل: ٢١٦ ، و أبو داود: ٤١٦٢، معنى: سُكَّةٌ نَوْعٌ مِنَ الطِّيب أو وعاء من الطيب**).

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك رضي الله عنه، (کـە دە سـاڵ خزمەتـی پێغەمبـەری کـردوە)، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـوککەیەکی هەبـوو لێیـەوە بۆنی خۆشـی لە خـۆی دەدا.

سـوککە جۆرێکـە لـە بۆنـی خـۆش، یاخـود قووتەیـەك بـووە، بۆنـی خۆشـی تێکـردوە، پێدەچـێ مانـای دووەمیـان ڕاسـتتر بـێ، کەواتـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گرنگیـی داوە بـە خـۆ بۆنخۆشـکردن.

**دووەم:** {**عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ** رضي الله عنه**، لَا يَرُدُّ الطِّيبَ، وَقَالَ أَنَسٌ** رضي الله عنه: **«إِنَّ النَّبِيَّ** ﷺ **كَانَ لَا يَرُدُّ الطِّيبَ»**} (**أخرجه البخاري: ٢٥٨٢، والترمذي: ٢٧٨٩**).

واتە: ثومامەی كوڕی عەبدوڵلا دەڵێ: ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ عادەتی وابوو ئەگەر بۆنی خۆشی پێ درابایە، بەرپەرچی نەدەدایەوە، {واتە: وەری دەگرت}، ئەنەسیش ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ بۆنی خۆشی ڕەتنەدەكردەوە، واتە: ئەگەر پێی درابایە وەری دەگرت.

**سێیەم:** {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طِيبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَطِيبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ»**} **(أخرجه الترمذي: ٢٧٨٧، وقال: هذا حديث حسن، والنسائي: ٥١١٧)**.

واتە: ئەبوو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆنی خۆشی پیاوان ئەوەیە كە بۆنەكەی دیار بێ و ڕەنگەكەی شێردراوەبێ، بەڵام بۆنی خۆشی ئافرەتان، ئەوەیە ڕەنگەكەی دیار بێ و بۆنەكەی پەنهان بێ.

هی ئافرەتان ڕەنگەكەی دیار بێ، وەك قەنەفڵ و مێخەك و خەناوكەو خەنەو... هتد، هی پیاوانیش ئەوەیە كە ڕەنگەكەی دیار نەبێ، بەڵام بۆنەكەی بڕوا.

## ٢- (بَابُ كَيْفَ كَانَ كَلَامُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ)، باسێك دەربارەی فەرمایشتكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بووە؟:

لەو بارەیەوەش ئەم دوو فەرموودەیە دێنین:

**یەكەم:** {**عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْرُدُ سَرْدَكُمْ هَذَا، وَلَكِنَّهُ كَانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلَامٍ بَيِّنٍ فَصْلٍ، يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ»**} **(أخرجه الترمذي: ٣٦٣٩، وقال: هذا حديث حسن، وحسنه الألباني)**.

واتە: دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئێوە قسەی ڕیز نەدەكرد {واتە: قسان بە دوای یەكدا بكات و تێكیان بخات و نەیانپسێنێتەوە}، بەڵكو قسەیەكی ڕوونی دەكرد، كەسێك لە لای دانیشتبایە دەیتوانی قسەكانی لەبەر بكات.

**دووەم:** {**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعِيدُ الْكَلِمَةَ ثَلَاثاً لِتُعْقَلَ عَنْهُ»**} (**أخرجه الترمذي: ٣٦٤٠، وقال: هذا حديث حسن صحيح غريب، قال الألباني: حسن صحيح**).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کە قسەیەکی دەکرد، سێ جاران دووبارەی دەکردەوە، تاکو لێی بفامرێ.

واتە: ئەوەندەی پێویست بکات، پێغەمبەری خوا قسەی دووبارەی کردۆتەوە، ئنجا جاری وابووە دوو کەڕەت دووبارەی کردۆتەوەو، جاری وابووە سێ کەڕەت دووبارەی کردۆتەوەو، ئەنەس باسی سێ جار دەکات.

## ٣- (بَابُ مَا جَاءَ فِي ضُحِكِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ)، باسێك دەربارەی پێکەنین و زەردەخەنەی پێغەمبەری خوا ﷺ:

ئێمە لەو بارەوەش سێ فەرموودەمان هێناون:

**یەکەم:** {**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ تَبَسُّمًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»**} (**أخرجه: الترمذي: ٣٦٤١، قال: حسن غريب**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزء ﷺ دەڵێ: هیچ کەسم نەدیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەردەخەنەتر بووبێ و، دەم بە پێکەنینتر بووبێ.

**دووەم:** {**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَ: «مَا كَانَ ضُحْكُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا تَبَسُّمًا» قَالَ أَبُو عِيسَى: «هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ مِنْ حَدِيثِ لَيْثِ بْنِ سَعْدٍ»**} (**أخرجه الترمذي: ٣٦٤٢، وقال: هذا حديث صحيح غريب، وقال الألباني: صحيح**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنینەکەی تەنیا زەردەخەنە بووە.

واتە: بە قاقا پێ نەکەنیوە، بەڵام جاری واش هەبووە بەدەنگ پێکەنیوە، وەك هەندێك لە فەرموودەکاندا دەبینرێ، بەڵام بەزۆریی پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەردەخەنە پێکەنیوە).

سێیەم: {عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: «مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ، وَلَا رَآنِي إِلَّا ضَحِكَ»} (أخرجه البخاري: ٣٦١١، ومسلم: ٢٤٧٥، والترمذي: ٣٨٢٠).

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێ: لەو کاتەوەی مسوڵمان بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کات منی نەخستۆتە پشتی پەردە (واتە: یەکێك لە خانەوادەکەیان لەگەڵی تێکەڵ بوو)، نەشیبینیوم مەگەر لە ڕوومدا پێکەنیوەو زەردەخەنەی کردوە.

## ٤- (بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ مِزَاحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ)، باسێك لە بارەی قسەی خۆشکردن و گاڵتەکردنی پێغەمبەرەوە ﷺ:

لەو بارەوە شەش فەرمووده دێنین:

یەکەم: {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: «يَا ذَا الْأُذُنَيْنِ»، يَعْنِي يُمَازِحُهُ} (أخرجه أحمد: ١٢١٨٥، وأبو داود: ٥٠٠٢، والترمذي: ١٩٩٢، وقال: صحيح غريب، وصححه الألباني).

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەی خاوەنی دوو گوێیەکان! واتە: قسەی خۆشی لەگەڵ کردوە.

ئەگەرنا هەموو کەسێك هەر دوو گوێی هەن، یانی: پێغەمبەری خوا ﷺ کە قسەی خۆش و سوعبەتیشی کردوە، هەر هەقی فەرمووە وەك بۆ خۆی فەرموویەتی.

دووەم: {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، قَالَ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُخَالِطُنَا حَتَّى يَقُولَ لِأَخٍ لِي صَغِيرٍ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟»، لِأَنَّهُ كَانَ لَهُ نُغَيْرٌ يَلْعَبُ بِهِ فَمَاتَ، فَحَزِنَ الْغُلَامُ عَلَيْهِ فَمَازَحَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟»} (ومعنى النغير: فرخ العصفور) (أخرجه أحمد: ١٢٢٢٠، والبخاري: ٥٧٧٨، ومسلم: ٢١٥٠، والترمذي: ٣٣٣، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٣٧٢٠، وابن حبان: ٢٣٠٨).

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەگەڵـمان تێکـەڵ بـوو، هەتـا بـە برایەکـی بچووکـم کـە نـاوی عومەیـر بـوو دەیفەرمـوو: ئـەی عومەیـر نوغەیرەکـەت چـی لێهـات؟ چونکـە بەچکـە چۆلەکەیەکـی هەبـوو گاڵتـەی لەگەڵـدا دەکـرد، دوایـی بەچکـە چۆلەکەکـەی لـێ مـردوو ئـەو کـوڕەش بچـووك بـووەو بـۆی دڵتەنـگ بـوو، ئنجـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە دەیگەیشـتێ گاڵتـەی لەگـەڵ دەکـردو دەیفەرمـوو: ئـەی عومەیـر بەچکـە چۆلەکەکـەت چـی لێهـات؟

**سێیەم:** {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا، قَالَ: «إِنِّي لَا أَقُولُ إِلَّا حَقًّا»**} (**أخرجه أحمد: ٨٤٦٢، والترمذي: ١٩٩٠، وقال: حسن صحيح، والبخاري في الأدب المفرد: ٢٦٥**).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ دەڵـێ: هـاوەڵان گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! جـاری وایـە تـۆ گاڵتـەو قسـەی خۆشـمان لەگـەڵ دەکـەی، فەرمـووی: بەڵـێ، بـەڵام تەنیـا هـەق دەڵێـم، واتـە: گاڵتەکـردن و قسەکردنەکەشـم لـە شـیرازەو ڕاسـت و حـەق ناچێتـە دەر.

نـەك وەك هەندێـك کـەس هـەر بـۆ ئـەوەی خەڵـك بـە پێکەنیـن بێنـن، شـت هەڵدەبەسـتن یـان شـتی ناڕاسـت دەڵێـن، یـان شـتی زۆر زێدەڕۆیـی لێکـراو، کـە هەمـوو کەسـێك دەزانـێ درۆیـە، دەیڵێـن، حاشـای پێغەمبـەری خـوا ﷺ.

**چوارەم:** {**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا اسْتَحْمَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنِّي حَامِلُكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ؟ فَقَالَ ﷺ: «وَهَلْ تَلِدُ الْإِبِلَ إِلَّا النُّوقُ»**} (**أخرجه أحمد: ١٣٨٤٤، وأبو داود: ٤٩٩٨، والترمذي: ١٩٩١، وقال: حسن صحيح غريب، وأبو يعلى: ٣٧٧٦، والضياء: ١٨٩٩، وقال: إسناده صحيح**).

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﷺ دەڵـێ: پیاوێـك داوای لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـرد کـە وڵاخێکـی سـواریی بـۆ بڕەخسـێنێ، (داوای لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـرد سـواری حوشـترێکی بـکات)، ئەویـش ﷺ فەرمـووی: سـواری بەچکـە حوشـترێکت

دەکـەم، ئەویـش گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! چـی لـە بەچکـە حوشـتر بکـەم؟ ئەویـش ﷺ فەرمـووی: ئایـا حوشـترانی گـەورەش هـەر بەچکـەی حوشـتر نیـن؟.

ئـەو پیـاوە وایزانیـوە پێغەمبـەری خـوا ﷺ حوشـترێکی گچکـەی دەداتـێ بـە کەڵکـی سـواری نایـەت، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا ﷺ مەبەسـتی ئـەوە بـووە حوشـترێکت دەدەمـێ کـە لـە حوشـتران بـووە، بـا گـەورەش بـێ هـەر بەچکـەی حوشـترانە.

**پێنجەم:** {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ كَانَ اسْمُهُ زَاهِراً، وَكَانَ يُهْدِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ هَدِيَّةً مِنَ الْبَادِيَةِ، فَيُجَهِّزُهُ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ زَاهِرًا بَادِيَتُنَا وَنَحْنُ حَاضِرُوهُ» وَكَانَ ﷺ يُحِبُّهُ وَكَانَ رَجُلًا دَمِيماً، فَأَتَاهُ النَّبِيَّ ﷺ يَوْمًا وَهُوَ يَبِيعُ مَتَاعَهُ فَاحْتَضَنَهُ مِنْ خَلْفِهِ وَهُوَ لَا يُبْصِرُهُ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ أَرْسِلْنِي. فَالْتَفَتَ فَعَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ فَجَعَلَ لَا يَأْلُو مَا أَلْصَقَ ظَهْرَهُ بِصَدْرِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ عَرَفَهُ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ يَشْتَرِي هَذَا الْعَبْدَ» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِذًا وَاللَّهِ تَجِدُنِي كَاسِدًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَكِنْ عِنْدَ اللَّهِ لَسْتَ بِكَاسِدٍ» أَوْ قَالَ: «أَنتَ عِنْدَ اللَّهِ غَالٍ»} **(أخرجه أحمد: ١٢٦٦٩، وابن حبان: ٥٧٩٠، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين).**

واتـە: ئەنـەسی کـوڕی مالیـك ﷺ دەڵـێ: پیاوێـك بیاباننشـین بـوو نـاوی زاهیـر بـوو، دەهـات بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ دیارییەکـی بـۆ دەهێنـا، (ئـەو شـتانەی لـە بیابـان هـەن، ئەگـەر شیرێك بـووە، ماسـتێك بـووە، سـپیەمەنییەك بـووە، یاخـود جـۆرە شـتێك بـووە لـە بەرهەمـی بیاباننشـینەکان)، پێغەمبەریـش ﷺ هـەر کاتێـك دەیویسـت بـڕوا، شـتێکی بـۆ سـاز دەکـرد، (هەڵبەتـە باشـتر لـە دیارییەکـەی خـۆی)، ئنجـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەیفەرمـوو: زاهیـر بیاباننشـینی ئێمەیـەو، ئێمـەش شارنشـینی ئەویـن، (ئـەو لەوێـوە شـتمان بـۆ دەهێنـێ، ئێمـەش لەوێـوە شـتی پـێ دەدەیـن)، پێغەمبـەر ﷺ ئـەو پیـاوەی خۆشدەویسـت و پیاوێکـی نابەرچاویـش بـوو (جـوان نەبـووە)، ڕۆژێـك پێغەمبـەر ﷺ هـات بـۆ لای کاتێـك کـەل و پەلەکـەی خـۆی

دەفرۆشت، پێغەمبەریش ﷺ بەبێ ئەوەی زاهیر ببینێ، لە پشتەوە گرتی (لە باوەشی گرت)، ئەویش گوتی: بەرم بدە، ئەوە کێیە؟ پێغەمبەریش ﷺ بەری نەدا تاکو ماوەیەك، دوایی ئاوڕیدایەوە تەماشای کرد پێغەمبەرە ﷺ، ئنجا کە پێشتر دەیگوت: بەرمبدە، هەر زیاتر پشتی بە سینگی پێغەمبەرەوە ﷺ دەنووساند، کاتێك کە ناسیی، پێغەمبەریش ئاوا لە باوەشی گرتبوو فەرمووی: کێ ئەم بەندەیە دەکڕێ؟ [پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی کۆیلە نەبووە، بەڵام وشەی (عبد) بەندەو کۆیلەش دەگرێتەوەو هەمووشمان بەندەین]، پیاوەکەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بە خوا ئەگەر بمفرۆشی نرخێکی کەم دەکەم، (لەبەر ئەوەی بەدیمەن نابەرچاو بووە)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵام تۆ لە لای خوا نرخت کەمت نیە، یاخود فەرمووی: تۆ لە لای خوا زۆر گرانی و بە نرخی.

چونکە خوای دادگەر تەماشای نێوەڕۆکی مرۆڤەکان دەکات، ئەگەرنا ڕواڵەتەکان بۆ خۆی خوڵقاندوونی و جۆراو جۆری خوڵقاندوون، بەڵام ئەوەی نرخ و بەها بۆ مرۆڤ پەیدا دەکات، ئەوەیە کە خۆی بەدەستی دێنێ، نەك ئەوەی دەستی تێیدانیە، کە ڕواڵەت و دیمەن و قیافەکەیەتی.

**شەشەم:** {**عَنِ الْحَسَنِ الْبَصْرِي** رضي الله عنه **قَالَ: أَتَتْ عَجُوزٌ إِلَى النَّبِيِّ** ﷺ ، **فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُدْخِلَنِي الْجَنَّةَ، فَقَالَ: «يَا أُمَّ فُلَانٍ! إِنَّ الْجَنَّةَ لَا تَدْخُلُهَا عَجُوزٌ» قَالَ: فَوَلَّتْ تَبْكِي، فَقَالَ: «أَخْبِرُوهَا أَنَّهَا لَا تَدْخُلُهَا وَهِيَ عَجُوزٌ» إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ:** ﴿إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾﴾ **الواقعة**} (**أخرجه الترمذي: ٢٤٠، مرسلاً، وحسنه الألباني**).

واتە: حەسەنی بەصرایی رضي الله عنه، دەڵێ: پیرەژنێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لە خوا بپاڕێوە بمخاتە بەهەشت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەی دایکی فڵان! (دیارە کونیەکەی زانیوە)، پیرەژن ناچنە بەهەشت، ئیدی پیرەژنەکەش ڕۆیشت و دەستی کرد بە گریان، (پێغەمبەریش

ﷺ سوعبەتی لەگەڵ کرد)، فەرمووی: هەواڵی پێ بدەن ئەو کاتێك دەچێتە بەهەشت، پیرەژن نیە، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ: ئێمە ئافرەتانی بەهەشتمان پێگەیاندوون، کردوومانن بە کچ، مێردی خۆیان خۆشدەوێ و، هاوتەمەنن لەگەڵ مێردەکانیاندا.

واتە: کاتێك دەچێتە بەهەشت، دەبێتەوە بە کچ و تەمەنێکی کەمی هەیە.

## ٥- (بَابُ مَا جَاءَ فِي تَوَاضُعِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ)، باسی ئەوەی لە بارەی خاکیەتیی پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوە:

لەو بارەوەش پێنج فەرموودان هەڵدەبژێرین:

فەرموودەی یەکەم: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: **لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ، إِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ فَقُولُوا: عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ**} (أخرجه الطيالسي: ٢٤، والحميدي: ٢٧، وأحمد: ١٥٤، والدارمي: ٢٧٨٤، والبخاري: ٣٢٦١، والترمذي في الشمائل المحمدية: ٣٣١، وأبو يعلى: ١٥٣، وابن حبان: ٦٢٣٩).

واتە: ئیبنو عەبباس دەگێڕێتەوە لە عومەری کوڕی خەتتابەوە رضي الله عنهما، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زێدەڕۆیی مەکەن لە مەدحمدا وەك چۆن نەصڕانییەکان لە پێهەڵاگوتن و مەدح کردنی عیسای کوڕی مەریەمدا تێیانپەڕاند، من تەنیا بەندەم، بڵێن: بەندەی خواو ڕەوانەکراوی خوا.

واتە: وەك نەصڕانییەکان نەچن لە سنووری بەندایەتیی مبەنە دەرێ، ئەوان گوتیان: عیسا کوڕی خوایە، پاکیی بۆ خوا.

فەرموودەی دووەم: {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً، فَقَالَ: «اجْلِسِي فِي أَيِّ طَرِيقِ الْمَدِينَةِ شِئْتِ أَجْلِس إِلَيْكِ»} (أخرجه أحمد: ١٢٢١٨، ومسلم: ٢٣٢٦، وأبو داود: ٤٨١٨، وابن حبان: ٤٥٢٧).

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﷺ دەگێڕێتـەوە: ئافرەتێـك هـات بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ پێیگـوت: ئیشـێکم بـە تۆیـە، ئەویـش ﷺ فەرمـووی: لـە هـەر ڕێیەکـی مەدینـەدا، (لـە هـەر کووچـەو کۆڵانێـك) حـەز دەکـەی (بـۆ تـۆ نزیکـە) دابنیشـە، منیـش دێـم لەگەڵـت دادەنیشـم و کارەکـەی خۆتـم پـێ بڵـێ.

فەرمـوودەی سـێیەم: {**عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ ﷺ قَـالَ: «كَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ يَعُـودُ الْمَرِيـضَ، وَيَشْـهَدُ الْجَنَائِـزَ، وَيَرْكَـبُ الْحِمَارَ، وَيُجِيبُ دَعْـوَةَ الْعَبْـدِ، وَكَانَ يَـوْمَ بَنِـي قُرَيْظَةَ عَـلَى حِـمَارٍ مَخْطُـومٍ بِحَبْـلٍ مِـنْ لِيـفٍ وَعَلَيْـهِ إِكَافٌ مِـنْ لِيـفٍ»**} (**أخرجـه الترمـذي: ٣٢، وضعفـه، وقـال الألبـاني: ضعيـف**).

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەردانی نەخۆشـانی دەکـردو، لـە بـە خـاك سـپاردنی جەنازانـدا ئامـادە دەبـوو، سـواری گوێدرێـژ دەبـوو، ئەگـەر کۆیلەیەکیـش دەعوەتـی کردبایـە (یـان بانگـی کردبایـە بـۆ ماڵەوەیـان) وەڵامـی دەدرایـەوەو دەچـوو بـۆ لای، لـە جەنگـی بەنـوو قورەیـزەدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـواری گوێدرێژێـك بـوو بـوو، کـە ڕێشـمەکەی لـە پووشـی دارخورمـا بـوو، کورتانێکـی لەسـەر بـوو، کورتانەکـەش لـە پووشـی دارخورمـا بـوو.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کەل و پەلەکانی سادە بوون، مەبەستی پێی ئەوەیە.

فەرمـوودەی چـوارەم: {**عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ ﷺ قَـالَ: «لَـمْ يَكُـنْ شَـخْصٌ أَحَـبَّ إِلَيْهِـمْ مِـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ» قَـالَ: «وَكَانُـوا إِذَا رَأَوْهُ لَـمْ يَقُومُـوا، لِمَا يَعْلَمُـونَ مِـنْ كَرَاهَتِـهِ لِذَلِـكَ»**} (**أخرجـه أحمـد: ١٣٦٤٨، والبخـاري في الأدب المفـرد: ٩٤٦، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده صحيـح عـلى شرط مسـلم، والترمـذي: ٢٧٥٤، وفي الشـمائل: ٣٣٥، وقـال: هـذا حديـث حسـن صحيـح غريـب، وصححـه الألبـاني**).

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﷺ دەڵـێ: هیـچ کەسـێك لـە لای هـاوەڵان، لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەلایـان خۆشەویسـتتر نەبـوو، بـەڵام کاتێـك دەیانبینـی، یـان کـە دەهاتـە کـۆڕ و مەجلیس، ئەگـەر دانیشـتبان، هەڵنەدەسـتان، چونکـە دەیانزانـی پێـی ناخۆشـە.

واتە: هاوەڵان لەبەر یەكدی هەڵدەستان و هەرچەندە هیچ كەسیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە لا بەڕێزترو خۆشەویستتر نەبووە، بەڵام كە زانیویانە پێی ناخۆشە، ڕەنگە چەند جاران پێی فەرمووبن: لەبەرم هەڵمەستن، نەوەك زێدەڕۆییەكی تێدا بكەن، یەكێكیان ڕكووعیشی بۆ بەرێ، وەك لە صەحیحی بوخاریی دا هاتووە، موعازی كوڕی جەبەل لە شام گەڕابووەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! كڕنووشت بۆ نەبەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ بە سەرسووڕمانەوە فەرمووی: بۆچی؟ گوتی: ڕۆمەكان كڕنووش دەبەن بۆ حوكمڕانەكانیان، بەڵام تۆ پێغەمبەری خوای! فەرمووی: نەخێر ئەی موعاز كڕنووش بۆ جگە لە خوا نابردرێ.

بۆیەش ئەو فەرموودانە بە زۆریی لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە هاتوون چونكە گوتوویەتی: من منداڵێكی دە ساڵان بووم، دایكم منی برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەنەس كوڕێكی وریایە، با خزمەتت بكات، ئیدی دە ساڵان لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، بۆیە زۆر وردەكاریی ژیانی پێغەمبەری ﷺ زانیوە.

فەرموودەی پێنجەم: {**عَنْ عَمْرَةَ بِنْت عَبْدُالرَحْمَن، قَالَتْ: قِيلَ لِعَائِشَةَ: مَاذَا كَانَ يَعْمَلُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: «كَانَ بَشَرًا مِنَ الْبَشَرِ، يَفْلِي ثَوْبَهُ، وَيَحْلُبُ شَاتَهُ، وَيَخْدُمُ نَفْسَهُ»**} (**أخرجه أحمد: ٢٦٢٣٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح**).

واتە: عەمڕەی كچی عەبدوڕڕەحمان (وا پێ دەچێ كچی عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف بێ رضي الله عنه)، دەڵێ: بە (دایكمان) عائیشە گوترا: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوە چی دەكرد؟ ئەویش گوتی: مرۆڤێك بوو وەك مرۆڤەكان، پۆشاكی خۆی دەدۆزی {ئەو كاتە دیارە كێچ و ئەسپێ هەبوون}، مەڕەكەی خۆی دەدۆشی، بۆ خۆشی خزمەتی خۆی دەكرد.

واتە: هەندێك ئیش و كار كە هی خۆی بوون بۆ خۆی دەیكردن، وا باشە مرۆڤ، تاكو بتوانێ كەمتر ئەرك بخاتە سەر خەڵكی، ئنجا خێزانە، كوڕە، كچە، هەر كەسێك، واباشە خۆی وردەكارەكانی خۆی بكات.

## ٦- (بَابُ مَا جَاءَ فِي خُلُقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ) باسی ئەوەی لە بارەی ڕەوشتی پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووە:

لەو بارەوەش نۆ (٩) دەقان دێنین، هەر چەندە ڕەنگە هەندێکیان دووبارە بن:

فەرمووده‌ی یەکەم: {عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: دَخَلَ نَفَرٌ عَلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فَقَالُوا لَهُ: حَدِّثْنَا أَحَادِيثَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَاذَا أُحَدِّثُكُمْ؟ كُنْتُ جَارَهُ «فَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ بَعَثَ إِلَيَّ فَكَتَبْتُهُ لَهُ، فَكُنَّا إِذَا ذَكَرْنَا الدُّنْيَا ذَكَرَهَا مَعَنَا، وَإِذَا ذَكَرْنَا الْآخِرَةَ ذَكَرَهَا مَعَنَا، وَإِذَا ذَكَرْنَا الطَّعَامَ ذَكَرَهُ مَعَنَا، فَكُلُّ هَذَا أُحَدِّثُكُمْ عَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»} (أخرجه الترمذي في الشمائل: ٣٤٣، وفيه من هو لين الحديث، وضعفه الألباني).

واتە: خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێ: چەند کەسێك هاتن بۆ لای زەیدی کوڕی سابیت ﷺ، گوتیان: لە بارەی فەرمایشتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ قسەمان بۆ بکە، ئەویش گوتی: ئنجا چیتان بۆ باس بکەم! من دراوسێی بووم، کاتێك وەحیی دادەبەزیە سەری، بانگی دەکردم بۆم دەنووسیەوە، ئەگەر ئێمە باسی دنیامان کردبایە، ئەویش لەگەڵی باس دەکردین و، باسی دواڕۆژمان کردبایە، لەگەڵی باس دەکردین و باسی خواردنمان کردبایە، لەگەڵی باس دەکردین، هەموو ئەوەی دەیڵێم، لە بارەی پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆتان باس دەکەم.

فەرمووده‌ی دووەم: {عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ وَحَدِيثِهِ عَلَى أَشَرِّ الْقَوْمِ يَتَأَلَّفُهُمْ بِذَلِكَ، فَكَانَ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ وَحَدِيثِهِ عَلَيَّ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنِّي خَيْرُ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ أَبُو بَكْرٍ؟ قَالَ: «أَبُو بَكْرٍ» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ عُمَرُ؟ فَقَالَ: «عُمَرُ»، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ عُثْمَانُ؟ قَالَ: «عُثْمَانُ»، فَلَمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَصَدَقَنِي فَلَوَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ سَأَلْتُهُ} (أخرجه الترمذي في الشمائل: ٣٤٤، وحسنه الألباني).

واتە: عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر کەسێك خراپترینی خەڵکیش بووایە، ڕووی تێدەکردو فەرمایشتی لەگەڵ دەکرد، بەوە دڵی ڕادەگرتن، زۆریش ڕووی لە من دەکردو قسەی لەگەڵدا دەکردم، هەتا ڕۆژێك گومانم وابرد: من لە هەموو خەڵك باشترم، ڕۆژێك پێمگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من باشترم یان ئەبوو بەکر؟ فەرمووی: ئەبوو بەکر، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من باشترم یان عومەر؟ فەرمووی: عومەر، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من باشترم یان عوسمان؟ فەرمووی: عوسمان، کاتێك لە پێغەمبەری خوام پرسی، ئەویش بەڕاستیی وەڵامی دامەوە، حەزم دەکرد لێم نەپرسیبایە.

فەرمموودەی سێیەم: {**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «خَدَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ فَمَا قَالَ لِي أُفٍّ قَطُّ، وَمَا قَالَ لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ لِمَ صَنَعْتَهُ؟ وَلَا لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ لِمَ تَرَكْتَهُ؟ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقًا، وَلَا مَسَسْتُ خَزًّا قَطُّ، وَلَا حَرِيرًا، قَطُّ، وَلَا شَيْئًا كَانَ أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَا شَمَمْتُ مِسْكًا قَطُّ وَلَا عِطْرًا، كَانَ أَطْيَبَ مِنْ عَرَقِ النَّبِيِّ ﷺ»**} (**أخرجه الترمذي: ٢٠١٥، وفي الشمائل: ٣٤٥، قال: هذا حديث حسن صحيح، وصححه الألباني**).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: دە ساڵان خزمەتی پێغەمبەری خوام کرد (وەك مێرد منداڵێك کە دایکی هێناویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی ناردوە بە دوای کەسێکدا ئیشێکی پێکردوە، بچۆ بە فلانکەس وابڵێ، ئەو شتانەی پێکردوون)، هەرگیز پێی نەفەرمووم: ئۆف (وشەیەکە بۆ بێزاریی دەربڕین)، هەرگیز شتێکم کردبێ پێی نەفەرمووم: بۆچی کردووتەو، شتێکم ئەگەر واز لێ هێنابێ نەیفەرمووە: بۆچی وازت لێ هێناوە؟.

[بێگومان ئەگەر کارێکی خراپی کردبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مەیکەو، ئەرکێکی چواندبێ، ئاگاداری کردۆتەوە، بەڵام مەبەستی ئەوەیە بە

تووڕەیـی پێـی نەفەرمـووە، یـان بەشـێوەیەکی بێزاریـی، یـان بـە شـێوەیەك دڵـی برەنجێنـێ پێـی نەفەرمـووە، بـۆ ئـەوەی بـە هەڵـە لـەم دەقـە تێنەگەیـن!

چونکـە عومـەری کـوڕی ئەبـوو سـەلەمە دەڵـێ: مـن لـە خزمـەت پێغەمبـەردا بـووم نانـم دەخـوارد، دەسـتم لـە قاپەکـە گێـڕا، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: {**يـا غُـلَامُ، سَـمِّ اللـهَ، وَكُلْ بيَمِينِـكَ، وَكُلْ مـمَّا يَلِيـكَ**} ئـەی ڕۆڵـە! نـاوی خـوا بێنـە (دیـارە نـاوی خـوای نەهێنـاوە)، لـە پێـش خۆتـەوە بخـۆو بـە دەسـتی ڕاسـتبخۆ (دیـارە بەدەسـتی چـەپ خواردوویەتـی).

کەواتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر شـتێکی ناڕێـك لـە پێـش چاوی کرابـێ، بـە دڵنیایـی لێـی بێدەنـگ نەبـووە].

دوایـی ئەنـەس دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە هەمـوو کـەس ڕەوشـتی جوانـتر بـوو، مـن هەرگیـز دەسـتم لـە هیـچ قوماشـێك کـە ئاوریشـمی تێکـەڵ بـێ و لـە هیـچ ئاوریشـمێك و لـە هیـچ شـتێك نـەداوە، لـە دەسـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەرمـتر بووبـێ، هەروەهـا هیـچ میسـکێك و هیـچ عەترێکـم بـۆن نەکـردوە کـە لـە ئارەقـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆنخۆشـتر بووبـێ، [چونکـە هەمیشـە بۆنـی خۆشـی لـە خـۆی داوەو، خـۆی لـە خواردنـی هەمـوو ئـەو شـتانە پاراسـتوە کـە بـۆن ناخۆشـن].

فەرمـوودەی چـوارەم: {**عَـنْ أَنَـسِ بْـنِ مَالِـكٍ، عَـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ أَنَّـهُ كَانَ عِنْـدَهُ رَجُـلٌ بِـهِ أَثَـرُ صُفْـرَةٍ قَـالَ: وَكَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ لَا يـكَادُ يُواجِـهُ أَحَـدًا بِـشَيْءٍ يَكْرَهُـهُ، فَلَـمَّا قَـامَ قَـالَ لِلْقَـوْمِ: «لَـوْ قُلْتُـمْ لَـهُ يَـدَعُ هَـذِهِ الصُّفْـرَةَ»**} (**أخرجـه أحمـد: ١٢٥٩٥، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده حسـن**).

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك رضي الله عنه لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ دەگێڕێتـەوە کـە پیاوێـك لـە لای بـوو، شـوێنەواری زەردییەکـی پێوەبـوو، [یـان زەعفـەران بـووە، یـان ڕەنگێکـی زەرد بـووە لـە خـۆی داوە، یـان جـۆرە بۆنێکـی زەرد بـووە، ئـەو بۆنانـەش کـە لـە خـۆ دەدرێـن، ئەگـەر ڕەنگیـان دیاربـێ، زیاتـر هـی ئافرەتانـن]،

پێغەمبەریش ﷺ نزیك بوو هیچ کەسێك کە شتێکی پێ ناخۆش بێ، ڕووبەڕوو پێی نەڵێ، [دەڵێم: هەندێك کەس ئەگەر تێیڕانەبینیبێ، پێی نەگوتوە، بەڵام ئەگەر کەسێك تێیڕابینیبێ، پێیگوتوە، ئەوەتا عەمری کوڕی عاص لێی دەپرسێ: من چاکترم، یان ئەبوو بەکر؟ دەفەرموێ: ئەبوو بەکر، یان ئەوەی عومەری کوڕی ئەبوو سەلەمە [پێغەمبەری خوا ﷺ ]فەرموویەتی: ئاوا مەخۆ، ناوی خوا بێنەو بەدەستی ڕاستبخۆو لە پێش خۆتەوە بخۆ]، کاتێك هەڵسا پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکەکەی فەرموو، دەبووایە پێی بڵێن ئەو زەردایيە واز لێ بهێنێ، (واتە: ڕەنگی زەرد لە خۆی نەدات).

فەرموودەی پێنجەم: {**عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ شَيْئًا قَطُّ إِلَا أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَا ضَرَبَ خَادِمًا أَوِ امْرَأَةً»**} (**أخرجه مسلم: ٢٣٢٨، وأبو داود: ٤٧٨٦، وابن ماجه: ١٩٨٤**).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز بە دەستی خۆی لە هیچ شتێکی نەداوە، مەگەر لە پێناوی خوادا جەنگ بکات و، نە لە خزمەتکارێکی داوەو، نە لە هیچ هاوسەرێکی خۆیشی داوە.

فەرموودەی شەشەم: {**عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُنْتَصِراً مِنْ مَظْلَمَةٍ ظُلِمَهَا قَطُّ، مَا لَمْ يُنْتَهَكْ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ تَعَالَى شَيْءٌ، فَإِذَا انْتُهِكَ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ شَيْءٌ كَانَ مِنْ أَشَدِّهِمْ فِي ذَلِكَ غَضَبًا، وَمَا خُيِّرَ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ مَأْثَمًا»**} (**أخرجه البخاري ٦٤٠٤، ومسلم: ٢٣٢٧**).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە ستەمێکی لێ کرابێ، تۆڵە بستێنێتەوە، مادام قەدەغەیەکی خوا نەشکێنرابێ، بەڵام کاتێك قەدەغەکانی خوا دەشکێنران، لە هەموو کەس زیاتر تووڕە دەبوو، هەروەها هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك نەکراوە لە نێوان دوو شتاندا، مەگەر کامەی ئاسانە، ئەوەی هەڵبژاردوە ئەگەر گوناح نەبووبێ.

مەبەستی دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، ئەوەیە کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لەسەر خودی خۆی تووڕە نەبووەو، هەقی خۆی لە خەڵك نەکردۆتەوە، بۆ وێنە: یەکێك لە هاوەڵان هاتوە قسەیەکی بێ جێی کردوە، عەڕەبێکی خێڵەکیی هاتوە مامەڵەیەکی ناشایستەی کردوە، بەشێوەیەکی ناگونجاو بانگی کردوە، یان جارێك عەڕەبێکی خێڵەکیی عەبایەکەی ڕاکێشاو ملی سوور کردەوە، یەکێکی دیکە پێی گوت: بێنە بەشم بدە لەو دەستکەوتە، نە ماڵی بابتەو نە ماڵی دایکتە! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ڕاست دەکەی ماڵی باب و دایکم نیە، یانی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر خۆی لە خەڵك تووڕە نەبووەو، هەقی خۆی لە خەڵك نەکردۆتەوە، بەڵام ئەگەر شتێکی ناشەرعیی و ناهەقیی کرابێ، تووڕە بووەو هەقی چەسپاندوەو، ناهەقیشی پووچاندۆتەوە.

فەرموودەی حەوتەم: {**عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: «بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ» أَوْ «أَخُو الْعَشِيرَةِ» ، ثُمَّ أَذِنَ لَهُ، فَأَلَانَ لَهُ الْقَوْلَ، فَلَمَّا خَرَجَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ مَا قُلْتَ ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ؟ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ»**} (**أخرجه البخاري: ٥٧٠٧، ومسلم: ٢٥٩١، والترمذي: ١٩٩٦، وقال: حسن صحيح**).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت بێتە ژوورەوە، منیش لە لای بووم، لەو کاتەدا فەرمووی: ئەوە خراپترین کوڕی هۆزەکەیە، یان خراپترین برای هۆزەکەیە، دوایی مۆڵەتی دا، کاتێك هات قسەی نەرمی لەگەڵ کرد، کاتێك ڕۆیشت، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەوەت فەرموو کە فەرمووت، دواییش قسەی نەرمت لەگەڵدا کرد؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! خراپترین کەس کەسێکە خەڵك وازی لێ بێنێ، یان پشتگوێی بخات لەبەر خراپییانی.

واتە: مەرج نیە کە من ڕێزم لە هەر کەسێك گرت، لەبەر ئەوە بێ کە بەڕێزو چاك بێ، بەڵکو جاری وایە تاکو لە خراپییەکەی سەلامەت بی، دەگونجێ وەك مودارا ڕێز لە هەندێك کەس بگری، با شایستەی ڕێزیش نەبێ.

فەرموودەی هەشتەم: {عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: قَالَ الْحُسَيْنُ ﵁: سَأَلْتُ أَبِي، عَنْ سِيرَةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي جُلَسَائِهِ، فَقَالَ: « كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دَائِمَ الْبِشْرِ، سَهْلَ الْخُلُقِ، لَيِّنَ الْجَانِبِ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ، وَلَا صَخَّابٍ وَلَا فَحَّاشٍ، وَلَا عَيَّابٍ وَلَا مُشَاحٍ، يَتَغَافَلُ عَمَّا لَا يَشْتَهِي، وَلَا يُؤْيِسُ مِنْهُ رَاجِيهِ، وَلَا يُخَيَّبُ فِيهِ، قَدْ تَرَكَ نَفْسَهُ مِنْ ثَلَاثٍ: الْمِرَاءِ، وَالْإِكْثَارِ، وَمَا لَا يَعْنِيهِ، وَتَرَكَ النَّاسَ مِنْ ثَلَاثٍ: كَانَ لَا يَذُمُّ أَحَدًا وَلَا يَعِيبُهُ، وَلَا يَطْلُبُ عَوْرَتَهُ، وَلَا يَتَكَلَّمُ إِلَّا فِيمَا رَجَا ثَوَابَهُ، وَإِذَا تَكَلَّمَ أَطْرَقَ جُلَسَاؤُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُءُوسِهِمُ الطَّيْرُ، فَإِذَا سَكَتَ تَكَلَّمُوا لَا يَتَنَازَعُونَ عِنْدَهُ الْحَدِيثَ، وَمَنْ تَكَلَّمَ عِنْدَهُ أَنْصَتُوا لَهُ حَتَّى يَفْرُغَ، حَدِيثُهُمْ عِنْدَهُ حَدِيثُ أَوَّلِهِمْ، يَضْحَكُ مِمَّا يَضْحَكُونَ مِنْهُ، وَيَتَعَجَّبُ مِمَّا يَتَعَجَّبُونَ مِنْهُ، وَيَصْبِرُ لِلْغَرِيبِ عَلَى الْجَفْوَةِ فِي مَنْطِقِهِ وَمَسْأَلَتِهِ، حَتَّى إِنْ كَانَ أَصْحَابُهُ لَيَسْتَجْلِبُونَهُمْ وَيَقُولُ: إِذَا رَأَيْتُمْ طَالِبَ حَاجَةٍ يَطْلُبُهَا فَأَرْفِدُوهُ، وَلَا يَقْبَلُ الثَّنَاءَ إِلَّا مِنْ مُكَافِئٍ، وَلَا يَقْطَعُ عَلَى أَحَدٍ حَدِيثَهُ حَتَّى يَجُوزَ فَيَقْطَعُهُ بِنَهْيٍ أَوْ قِيَامٍ} (أخرجه الترمذي في الشمائل: ٣٥١، الطبراني في الكبير: ٤١٤، حديث ضعيف).

واتە: حەسەنی کوڕی عەلی ﵄ دەڵێ: حوسەین ﵁ گوتی: لە بابم پرسی [واتە: لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبی پرسیوە] لە بارەی هەڵسوکەوتی پێغەمبەرەوە ﷺ لەگەڵ ئەوانەی لە کۆڕدا لەگەڵیدادەنیشن، عەلی گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە ڕوو خۆش بوو، ڕەوشتی ئاسان بوو، نەرم و نیان بوو، قسە ڕەق و دڵـڕەق نەبوو، دەنگ بەرزکەرەوەو قسەی ناشیرینکەو ڕەخنەگر نەبوو، ڕووی لە خەڵك وەرنەدەگێڕاو، شتێك کە ئارەزووی لێ نەبووایەو بە دڵی نەبووایە خۆی لێ بەسەرەوە نەدەبرد، (نادیدەی دەگرت)، هەر کەسێك پێی ئومێدەوار بووایە نائومێدی نەدەکردو بەدەست بەتاڵیی بەڕێی نەدەکرد، (هەر نەبێ قسەیەکی خۆشی بۆ دەکرد، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ هەرچی داوای

لێکراوە، نەیبووە بیبەخشێ)، لە خۆیدا سێ شتی نەدەکردن: شەڕە قسەی لەگەڵ خەڵك نەدەکردو، زۆری قسە نەدەکردن و، شتێك كە پێوەی پەیوەست نەبووایە قسەی لە بارەوە نەدەکرد، لە ڕووی خەڵکیشەوە وازی لە سێ شتان هێنابوو: زەمی کەسی نەدەکرد، عەیبی لێ نەدەگرت و، بەدوای عەیبی کەس دا نەدەگەڕاو، هەر کاتێك فەرمایشتی کردبایە تەنیا قسەیەکی دەکرد، کە ئومێدەوار بووایە پاداشتی هەبێ، کاتێك ئەو فەرمایشتی دەکرد ئەوانەی لە خزمەتی دا دانیشتبوون، بێ دەنگ دەبوون، وەك باڵندە لەسەر، سەریان هەڵنیشتبێ، کاتێك ئەو بێدەنگ دەبوو، ئنجا ئەوان قسەیان دەکرد، لە لای پێغەمبەر ﷺ شەڕە قسەیان نەدەکرد، کەسێك لە کۆڕی پێغەمبەردا ﷺ قسەی کردبایە، ئەوانی دیکە هەموویان بێدەنگ دەبوون، تاکو لێ دەبووەوە، قسەی هەموویان وەك قسەی یەکەمیان بوو (واتە: هەموویان بە گرنگیی پێدان و بایەخ پێدانەوە گوێیان بۆ قسەی یەکدی دەگرت، لە کۆڕی پێغەمبەردا ﷺ)، پێدەکەنی بەو شتەی ئەوان پێی پێدەکەنین، شتێك ئەوان سەرسامیان پێی دەربڕیبایە، ئەویش پێی سەرسام دەبوو، بابای نامۆ و نەشارەزا کە دەهات، ئەگەر قسەیەکی کردبایە، یان داوایەکی کردبایە نەگونجاو و زبر بووایە، ئارامی لەسەر دەگرت، تەنانەت هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ پێیان خۆشبوو خەڵکی عەڕەبی خێڵەکیی بێن [دەیانگوت: ئەوان هەندێك پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن و، هەندێك شت دەڵێن و هەندێك شتی لێ داوا دەکەن، ئێمە پێمان عەیبە. لە خۆیان نەوەشاندۆتەوە، ئنجا ئەوان لە ئەنجامی ئەوەدا کە عەڕەبە خێڵەکییەکان هەندێك شتیان لە پێغەمبەر ﷺ دەپرسی، سوودیان دەبینی و بۆیان دەردەکەوت]، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر کەسێکتان بینی، کارو پێویستییەکی هەبوو بۆی جێبەجێ بکەن، لە کەسی قەبووڵ نەدەکرد ستایشی بکات، مەگەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کردبایە، قسەی کەسی نەدەبڕی هەتا خۆی قسەکەی تەواو دەکرد، یاخود کۆڕەکە کۆتایی پێدەهات.

فەرمـوودەی نۆیـەم: {عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِيَ اللـهُ عَنْهَـا: «أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ كَانَ يَقْبَـلُ الْهَدِيَّـةَ وَيُثِيـبُ عَلَيْهَـا»} (أخرجـه البخـاري: ٢٥٨٥، وأبـو داود: ٣٥٣٨).

واتـە: دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەگێڕێتـەوە: کـە پێغەمبـەر ﷺ دیاریـی لـە خەڵـك وەردەگـرت و، پاداشتیشـی لەسـەر دەدایـەوە.

## ٧- (بَـابُ مَـا جَـاءَ فِي حَيَـاءِ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ)، بـاسی ئـەوەی لـە بـارەی شـەرم و شـكۆی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ هاتـوە:

لەو بارەوەش تەنیا ئەم دەقە دێنین:

فەرمـوودەی یەکـەم: {عَـنْ أَبِي سَـعِيدٍ الْخُـدْرِيِّ ﵁ قَـالَ: «كَانَ النَّبِـيُّ ﷺ أَشَـدَّ حَيَـاءً مِـنَ الْعَـذْرَاءِ فِي خِدْرِهَـا، وَكَانَ إِذَا كَـرِهَ شَـيْئًا عَرَفْنَـاهُ فِي وَجْهِـهِ»} (أخرجـه البخـاري: ٦١١٩، ومسـلم: ٢٣٢٠).

واتـە: ئەبـوو سـەعیدی خودریـی ﵁ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە کچی پشـت پـەردە بـە شـەرم و شـکۆتر بـوو، ئەگـەر شـتێکی پـێ ناخـۆش بووایـە، لـە ڕوویـدا دەمانزانـی.

واتـە: مـەرج نیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەمـوو شـتێکی دەربڕیبـێ و هەمـوو شـتێکی فەرمووبـێ، بـەڵام ئەگـەر شـتێك جێـی شـەرم بووایـە، ﷺ ڕووی لـێ لادەداو، کـە تەماشـای دەم و چـاوی پێغەمبەرمـان دەکـرد ﷺ دەمانزانـی ئـەو شـتەی پێیخۆشـە، یـان پێیناخۆشـە.

## ٨- (بَـابُ مَـا جَـاءَ فِي أَسْـمَاءِ رَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ)، بـاسی ئـەوەی لـە بـارەی ناوەکانـی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ هاتـوە:

لەو بارەوەش ئەم دوو دەقە دێنین:

فەرمـوودەی یەکـەم: {عَـنْ جُبَـيْرِ بْـنِ مُطْعِـمٍ ﵁، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: «إِنَّ لِي أَسْـمَاءً أَنَـا مُحَمَّـدٌ، وَأَنَـا أَحْمَـدُ، وَأَنَـا الْمَاحِـي الَّـذِي يَمْحُـو اللَّـهُ بِيَ الْكُفْـرَ، وَأَنَـا الْحَـاشِرُ

الَّـذِي يُحْـشَرُ النَّـاسُ عَـلَى قَدَمِـي، وَأَنَـا الْعَاقِـبُ وَالْعَاقِـبُ الَّـذِي لَيْسَ بَعْـدَهُ نَبِـيٌّ»} (أخرجه مالـك: ١٨٢٣، وأحمـد: ١٦٧٨٠، ومسـلم: ٢٣٥٤، والترمـذي: ٢٨٤٠، وقـال: حسـن صحيـح، والنسـائي في الكـبرى: ١١٥٩٠، والدارمـي: ٢٧٧٥، وابـن حبـان: ٦٣١٣).

واتـە: جوبەیـری کـوڕی موتعیـم ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: مـن چەنـد ناوێکـم هـەن: مـن نـاوم موحەممـەدەو، نـاوم ئەحمەدەو، نـاوم ماحییـە، کە خوا کوفـرم پـێ دەسـڕێتەوەو لادەبـاو، نـاوم حاشیرە، خەڵـك بـەدوای منـدا کۆدەکرێنەوەو حـەشر دەکرێـن، (پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێشـیان دەکـەوێ فەرمایشـت لەگـەڵ خـوادا دەکات، ئنجـا خـوای پـەروەردگار دەسـت دەکات بە لێپرسـینەوەو حیسـاب و کیتابیان)، هەروەهـا نـاوم عاقیبـە، عاقیبیـش ئـەو کەسـەیە لـە دوای ئـەو هیـچ پێغەمبەرێـك نایە.

واتە: پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ کۆتا پێغەمبەرە.

فەرمـوودەی دووەم: {عَـنْ حُذَيْفَـةَ ﷺ قَـالَ: لَقِيتُ النَّبِـيَّ ﷺ فِي بَعْـضِ طُـرُقِ الْمَدِينَةِ فَقَـالَ: «أَنَـا مُحَمَّـدٌ، وَأَنَـا أَحْمَـدُ، وَأَنَـا نَبِـيُّ الرَّحْمَـةِ، وَنَبِـيُّ التَّوْبَـةِ، وَأَنَـا الْمُقَفَّـى، وَأَنَـا الْحَـاشِرُ، وَنَبِـيُّ الْمَلَاحِـمِ»} (أخرجـه الترمـذي في الشـمائل: ٣٦٧، وحسـنه الألبـاني).

واتـە: حوزەیفـە ﷺ دەڵـێ: لـە هەندێـك لـە کۆڵانەکانـی مەدینـە بـە پێغەمبـەر ﷺ گەیشـتم، فەرمـووی: مـن موحەممـەدم و، مـن ئەحمـەدم و، مـن پێغەمبـەری ڕەحمەتـم، مـن پێغەمبـەری گەڕانـەوەو تەوبـە وەرگرتنـم و، مـن موقەففـام (**الْمُقَفَّـى: الَّـذِي قَفَّـى آثَـارَ مَـن سـبَقه مِـنَ الأَنْبِيَـاء**) واتـە: شـوێنکەوتووی شـوێنەواری پێغەمبەرانـی پێشـووم، (**وَأَنَـا الْحَـاشِرُ**)، مـن کۆکەرەکـەم {واتـە: لەسـەر داواو تکاکردنـی پێغەمبـەر ﷺ خـوای بـاڵا دەسـت دەسـت دەکات بـە لێپرسـینەوەی خەڵـك، لـە قیامـەت دا، یاخـود: یەکەمیـن کـەس کـە زینـدوو دەبێتـەوە لـە ڕۆژیـی دواییـدا بـۆ کاتـی حـەشرو حیسـاب پێغەمبـەری کۆتاییـە}، هەروەهـا مـن پێغەمبەری جەنـگ و ڕووبـەڕوو بوونەوەکانـم (لـە پێنـاوی خـوای پـەروەردگاردا).

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــــزان!

ئـەم دەرسـەمان لـە حەڤـدە (١٧) ئایـەت پێـك دێ، ئایەتەكانـی: (١٧ - ٣٣)، هەمووشـیان لـە بـارەی هاوەڵانـی باخەكـە (**أَصْحَـابُ الجنَّـة**)وەن، كـە بڕیاریـان داوە لـە كاتـی هەڵگرتنـەوەی حاصـەڵات و بەرهەمـی باخەكەیانـدا، بـە پەنهانیـی كار بكـەن، تاكـو بەشـی نـەداران و هەژارانـی لـێ نـەدەن، خـواش ﷻ لـە كاتێكـدا لـە شـیرین خـەودا بـوون، بەڵایەكـی گشـتگیری ناردۆتـە سـەر باخەكەیـان و، وەك پەرێزێكـی سـوور و سـەقەتاڵە - پەرێزێـك كـە هیچـی لـێ نەمابـێ - ی لێهاتـوە، یـان وەك زەوییەكـی سـووتماك كـە سـووتابێ، خـوای دادگـەر لەسـەر ئـەو نیەتـە خراپەیـان سزای داون و بەڵایەكـی گـەورەی بەسـەر هێنـاون، بـەڵام دوایی پەشـێمان بوونـەوەو، كەوتوونـە گلەیـی و گازانـدە لـە نێـو خۆیانـداو، ڕاشـیان گەیانـدووە كـە بـۆ لای خـوا ئارەزوومەندبـن و ئومێدیشـیان خواسـتوە خـوا ﷻ چاكـتر لـەو باخـەی وەك سـزا درانێـك لێیـان سـتێندراوەتەوە، پێیـان بـدات.

﴿ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئێمە ئەوان (بێبڕوایان)مان تاقیکردنەوە وەك چۆن خاوەنانی باخەکەمان تاقیکردنەوە، کاتێك سوێندیان خوارد لە کاتی چوونە نێو بەیانیدا میوەکەیان دەچنن ﴿١٧﴾ هیچیشی لێ نابوێرن (بۆ نەدارانی بهێڵنەوە) ﴿١٨﴾ (لە ئەنجامی ئەو بڕیارەیاندا( یەکسەر )باخەکەیان( بەڵایەك (ی گشتگیر)ی لە پەروەردگارتەوە بەسەرهات، (دایپۆشی)، لە کاتێکدا ئەوان خەوتبوون ﴿١٩﴾ ئیدی (باخەکەیان) وەك پەرێزێکی سووتماکی لێهات ﴿٢٠﴾ ئنجا لە بەیانی (زوو)دا بانگی یەکدییان کرد﴿٢١﴾ کە ئەگەر ئێوە چنەر (و لێکەرەوە)ی (میوەو بەری باخەکەتانن) زوو بڕۆن بۆ کێڵگەو مەزرایەکەتان ﴿٢٢﴾ ئنجا بە چپەو پێکەوە دوانی پەنهانەوە دەرچوون ﴿٢٣﴾ (بە یەکدییان دەگوت:) ئەمڕۆ نابێ هیچ نەدارێك لێتان وە ژوور (باخەکەتان) بکەوێ ﴿٢٤﴾ ئنجا ڕۆیشتن (و پێیان وابوو) لەسەر ڕێگرتن و نەهێشتن (ی بەهرەمەندبوونی هەژاران لە بەروبوومی باخەکەیان) تواناداړن ﴿٢٥﴾ بەڵام کاتێك بینییان (بۆتە قەرەبرووت) گوتیان: ئێمە ڕێ لێ تێکچووین، (ئەمە باخەکەی ئێمە نیە) ﴿٢٦﴾ (پاشان کە زانییان باخەکەیانە وای بەسەرهاتوە، گوتیان:) بەڵکو ئێمە زیانبارو بێ بەشین ﴿٢٧﴾ چاکترینەکەیان گوتی: ئەدی پێم نەگوتن دەبووایە (خوا) بە پاك بگرن (لەوەی سەرپێچیی لە فەرمانی بکەن و نەداران بێ بەش بکەن!) ﴿٢٨﴾ گوتیان: پاکیی بۆ پەروەردگارمان، بەڕاستیی ئێمە ستەمکاربووین ﴿٢٩﴾ ئنجا بە گلەیی و گازەندە کردنەوە ڕوویان لە یەکدی کرد ﴿٣٠﴾ (گوتیان:) هاوار بۆ ئێمە، بێگومان ئێمە (لە خوا) یاخیی بووین ﴿٣١﴾ بەڵکو پەروەردگارمان لەو (باخە) باشترمان بداتێ (و بۆمان قەرەبوو بکاتەوە) بە دڵنیایی ئێمە بەرەو لای (چاکەو بەخششی) پەروەردگارمان ئارەزوومەندین ﴿٣٢﴾ ئازارو سزا (یەکەمان بۆیان) بەم شێوەیە بوو، ئازاری (مەنزڵگای) کۆتایی (لەوە) گەورەتریشە (بۆ کەسانێك نەگەڕێنەوە) ئەگەر زانیبایان ﴿٣٣﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بَلَوۡنَٰهُمۡ): واتـە: تاقیـمان کردنـەوە، جەڕباندمانـن، دەگوتـرێ: (**بَلَوْتُـهُ أَيْ: اخْتَبَرْتُهُ**) تاقیـم کـردەوە، جەڕبانـدم (**وَسُـمِّيَ الْغَـمُّ بَـلَاءً، لأَنَّـهُ يُبْـلي الجِسْـمَ**) خـەم و خەفـەت بۆیـە پێـی گوتـراوە: (**بَـلَاء**) چونکـە جەسـتەی مـرۆڤ بێهێـز دەکات و دەیتوێنێتـەوە.

(لَيَصۡرِمُنَّهَا): (**الـصَّرْمُ: القَطِيْعَـة**) دابـڕان، (**وَالصَّريـمَة: قِطْعَـةٌ مُنْصَرِمَـةٌ مِـنَ الرَّمْـلِ**) (**صَريـم**): بەشـێکە لـە کۆمێـك، گردۆلکەیەکـی لم، کـە دابڕابـێ لـە باقـی لمەکـە، (**الأَشْـجَار الصَّرِيمَـةُ: يَعْنـي المَـصْروم حَمْلُهَـا**)، ئـەو درەختانـەی میوەکەیـان چـنراوە، هەروەهـا شـەوگاریش پێـی دەگوتـرێ: (**صَرِيـم**).

(وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ): (**أَيْ: لَا يَتْـرُكُونَ شَـيْئًا**)، هیچـی لـێ بەجـێ ناهێڵـن، چونکـە (**الإِسْـتثناءُ**) یانـی: هەڵـەواردن، کـە دەفەرمـوێ: (**وَلَا يَسْـتَثْنُون**) یانـی: هیچـی لـێ هەڵناوێـرن بـۆ هـەژاران بیهێڵنـەوە، ئەمـە ئەسـڵی واتایەکـەی، بـەڵام لـە زاراوەی زانایانـی ڕێزمانـی عەرەبییـدا دەڵـێ: (**الإِسْـتثناءُ: إِيْـرَادُ لَفْـظٍ يَقْتَـضي رَفـع بَعْـض مَـا يُوجِبُـهُ عُمُـومِ اللَّفْـظِ المُتَقَـدِّمِ**)، هـەڵاواردن لـە ڕووی ڕێزمانـی عەرەبییـەوە بریتیـە لـە: هێنانـی بێژەیـەك کـە خوازیـاری ئەوەبـێ هەندێـك لـەوەی بێژەیەکـەی پێشـتر خواسـتوویەتی، هەڵیبگـرێ، دەگوتـرێ: (**جَـاءَ القَـوْمُ إِلَّا مُحَمَّـدٌ**) خەڵکەکـە هات جگە لـە موحەممـەد، واتـە: موحەممـەد هەڵداوێـررێ لـەوەی لەگـەڵ خەڵکەکـەدا هاتبـێ، هەروەهـا (**الإِسْـتثناءُ**) بـە مانـای گوتنـی (**إِنْ شَـاءَ اللـه**)ش هاتـوە، (**وَلَا يَسْـتثنون يَعْنِـي وَلَا يَقُولُـونَ: إِنْ شَـاءَ اللـه**) ئەگـەر خـوا حـەز بـکات، ئەگـەر خـوا بیـەوێ.

(طَآئِفٞ): (**الطَّـوْفُ: المَـشِي حَـوْلَ الشَّـيءِ، وَطَائِـف أَيْ: بَـلَاء وَنَائِبَـة**)، (**طـوف**) بریتیـە لـە بـە دەوری شـتێکدا سـووڕان، ئنجـا (**طَائِف**)یـش بـە بەڵایـەك دەگوتـرێ کـە دەوری شـتێك بـدات، واتـە: ئابڵووقـەی بـدات و هیچـی جـەب نـەداو هەمـووی لـە بەیـن بـەرێ.

(كَالصَّرِيمِ ): (**الصَّرِيـم: المَقْطُـوعُ الثَّمَـر**)، (**صريـم**): باخێـك كـە میوەكـەی چنرابـێ و لێكرابێتـەوە، (**صَرِيـم**) بـە مانـای شـەوگاریش دێ و، بـە مانـای لمیـش دێ، كـۆ لمێـك لـە لمەكـەی دیكـە دابڕابـێ.

(يَتَخَافَتُونَ ): واتـە: بـە چپـە، یـان بـە پەنهانیـی پێكـەوە قسـەیان دەكـرد، (**الخَفْـتُ إِسْرَارُ النُّطـقِ**)، (**خفـت**): بریتیـە لـەوەی كـە قسـەكردن پەنهـان بكـرێ، بـە كوردیـی (چپـە)ی پـێ دەڵێـن، هەروەهـا سركـە سرك و فسـكە فسكیشـی پـێ دەڵێـن.

(حَرْدٍ): (**الْحَـرْدُ: الـمَنْعُ مِـنْ شِـدَّةِ الغَضَـب**)، (فـرْد)ڕێ لێگرتـن لـە كاتـی ئەوپـەڕی تووڕەییـدا، هەروەهـا (**حَـرْد**) بـە مانـای (**إمتِنَاع**)یـش دێ، یانی: نەهێشـتن، دەگوترێ: (**حَـرِدَ أَيْ غَضِـبَ**)، بۆیـە (**حَـرْد**) بـە مانـای تووڕەبوونیش دێ.

(تُسَبِّحُونَ ): (**أَيْ تَحْمَدُونَـهُ وَتَشْـكُرُونَهُ**)، خـوا بـە پاكبگـرن و سوپاسـگوزاریی بـۆ بكـەن، ئنجـا بـە پاكگرتنـی خـوا لـەو مەقامـەدا واتـە: خـوا بـە پاكبگـرن لـەوەی لـە فەرمانـی دەربچـن و لێـی یاخیـی بـن، هەندێكیـش گوتوویانـە: وشـەی (**تَسْـبِيْح**) لێـرەدا بـە مانـای گوتنـی: (**إن شـاء الله**)یـە.

(يَتَلَاوَمُونَ ): واتـە: لـە نێـو خۆیانـدا گلەیـی و گازانـدەیـان لـە یەكـدی دەكـرد، (**اللَّـوْمُ: عَـذْلُ الإِنْسَـانِ بِنِسْبَتِهِ إِلَى مَـا فِيـهِ لَـوْمٌ**)، بـە كوردیـی دەڵێیـن: لۆمەكـردن، سـەركۆنەكردن، سەرزەنشـتكردن، وشـەی (**لَـوْم**) بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ سـەركۆنە بكـرێ، بـەوەی پـاڵ بدرێتـە لای شـتێك، كـە ڕەخنـە لـێ گیـراوە.

(يَاوَيْلَنَآ): (**الْوَيْـلُ: القُبْـحُ، وَيُطْلَـقُ عَـلَى التَّحَـسُّرِ**)، واتـە: ئـەی وەیلەكـەی ئێمـە! لـە كوێـی وەرە، ئنجـا (**وَيْـل**) بـە مانـای خـەم و خەفـەت و ناڕەحەتیـی و ئـازار و مەینەتیـی دێ.

(طَاغِينَ ): لـە (**طَغَـى**)ەوە هاتـوە، (**طَاغِـين، طَاغُـون**) هەردووكیـان كـۆی (**طَاغِـي**)، واتـە: لـە سـنوور دەرچـوو، (**طَغَـى أَيْ: جَـاوَزَ الْحَـدَّ**) لـە سـنوور دەرچـوو، یـان لـە سـەرپێچیی كردنـدا سـنووری بەزانـد.

(رَاغِبُونَ): (أَصْلُ الرَّغْبَةِ: السَّعَةُ فِي الشَّيْءِ، وَرَغِبَ فِيهِ: حَرَصَ عَلَيْهِ)، وشەی (رَغْبَة) لە ئەسڵدا بریتیە لە فراوانیی لە شتێكدا، ئنجا دەگوترێ: (رَغِبَ فِيهِ) یانی: سوور بوو لەسەر ئەو شتە، بەڵام ئەگەر بگوترێ: (رَغِبَ عَنْهُ) واتە: كەیفی پێی نەهات و ئارەزووی لێ نەبوو.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

مانای گشتیی ئەم حەڤدە (١٧) ئایەتە موبارەكە، بەسەرهاتی خاوەنانی باخەكەیان گرتۆتە خۆیان، لەم حەڤدە ئایەتەدا خوا ﷻ بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە، وا پێدەچێ ئەو بەسەرهاتەی ئەو باخە، شتێكی باو بووبێ لە نێو نەتەوەی عەرەبدا، كە كاتی خۆی قورئان بۆ یەكەمجار لە نێویاندا دابەزیوە، ئنجا ئێمە بەر لەوەی بێینە سەر ڕوونكردنەوەی چەمك و واتای گشتیی ئایەتەكان، ئەم دوو گێڕدراوەیە دێنین، كە هەردووكیان تەبەریی لە تەفسیرەكەی خۆیدا هێناونی:

**یەكەم:** {**عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: هُمْ نَاسٌ مِنَ الْحَبَشَةِ كَانَتْ لِأَبِيهِمْ جَنَّةٌ كَانَ يُطْعِمُ الْمَساكِينَ مِنْهَا، فَلَمَّا مَاتَ أَبُوهُمْ، قَالَ بَنُوهُ: وَاللهِ إِنْ كَانَ أَبُونَا لَأَحْمَقَ حِينَ يُطْعِمُ الْمَساكِينَ، فَأَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ، وَلَا يَسْتَثْنُون، وَلَا يُطْعِمونَ مِسْكِينًا**}، (**جامع البيان: ٣٤٧٢٨**).

واتە: عیكریمە دەڵێ: ئەمە باسی كۆمەڵە خەڵكێكە خەڵكی حەبەشە بوون، بابیان باخێكی هەبووە، كە لە بەرهەمی ئەو باخە، (ئایا باخی دارخورما بووە، ترێ بووە، هەنجیر بووە، میوەكانی دیكە بووە، وێڕای ئەوەی باخ بووە، ڕەنگە دانەوێڵەو كشتوكاڵیش بووبێ)، یارمەتیی نەداران و هەژارانی لەو باخە داوە، بەڵام كاتێك خاوەن باخەكە كۆچی دوایی كردوە، كوڕەكانی گوتوویانە:

بە خوا بابمان نەفام و کەودەن بووە، کاتێك لەو باخەی خۆمان خواردنی داوە بەو نەدارانە، ئنجا سوێندیان خوارد کە دەبێ ئەوان لە کاتی پێگەیشتنی میوەی باخەکەیاندا، بەیانی زوو بچن باخەکە ببڕن و هیچی لێ هەڵناوێرن (واتە: هیچی بۆ هەژاران و نەداران نەهێڵنەوە)، ئیدی سەرەنجام لەسەر ئەو نیەتە خراپەیان، خوا ئەو بەڵایەی بەسەر باخەکەیان هێناوە.

دووەم: {**عن سعید بن جُبَیرٍ، قال: هِيَ أَرْضٌ بِالْیَمَن یُقَالُ لَهَا ضَرْوَان مِنْ صَنْعَاء عَلَى سِتَّةِ أَمْیَالٍ**}، (**جامع البیان: ٣٤٧٣٤**).

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر، دەڵێ: ئەو باخە لەسەر زەمینێك بووە لە یەمەن پێی گوتراوە: زەڕوان، کە شەش میل لە شاری صەنعاوە دوور بووە.

میلێك هەزار و شەستسەد و نۆ (١٦٠٩) مەترە، واتە: دەوری دە (١٠) کیلۆمەتر لە شاری صەنعاوە دوور بووە، هی پیاوێك بووە یارمەتیی هەژاران و نەدارانی لێداوە، دوای کۆچی دوایی خۆی کوڕەکانی بڕیاریان داوە بەشی کەسی لێ نەدەن، سەرەنجام خوا ئەو بەڵایەی بەسەر باخەکەیان هێناوەو، کاتێ: کە بەرەو باخەکەیان چوون بە حیساب بۆ ئەوەی میوەکەی بچنن، تەماشا دەکەن، بۆتە زەوییەکی سوور و سەقەتاڵەو هیچی لێ نەماوە، بۆتە پەرێزێك، یاخود: بۆتە زەوییەکی سووتماك.

خواش ﷻ ئاوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ﴾، ئێمە ئەوانمان تاقیکردۆتەوە، واتە: بێبڕوایەکانی مەککەو، دەوروبەری مەککە، کۆمەڵگایەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن خاوەنانی باخەکەمان تاقیکردنەوە، واتە: ئەوانەش لە زلە زلان و لە خەڵکی ساماندارى مەککە، کە دەوڵەمەندمان کردوون، ئیمکانیەتمان بۆ ڕەخساندوون، وەك چۆن ئەو باخەمان دابوو بە خاوەنانی ئەو باخە، بەڵام ئەوان لەبەر ئەوەی سوپاسگوزاریی خوایان لەسەر نەکرد، بەڵکو نیەتی خراپیان هێنابوو، کە عادەتی بابیان هەڵبوەشێننەوە، کە یارمەتیی هەژاران

و نەدارانی لە بەرهەمی باخەکە دەدا، ئەوان گوتیان: لەمەودوا یارمەتیی هیچ هەژارێك نادەین، بۆیە خوا ﷻ سزای دان، واتە: ئەی بێبڕوایەکانی مەککە و جگە لە مەککەش، ئێوەش وریا بن! ئەو ماڵ و سامان و سەروەتەی کە خوا بۆی ڕەخساندوون، بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان کەوتبێتە دەستتان، بە هەق یان بە ناهەق، گرنگ ئەوەیە ئاگاتان لێی بێ، بەو ماڵ و سامان و دەسەڵاتە و بەو نیعمەتانەی خوا پێیداون، تاقی دەکرێنەوە، ئنجا ئەگەر شوکری خواتان لەسەر نەکرد، وەك گوتراوە: (**الشُّكْرُ سِيَاجُ النِّعَم**)، سوپاسگوزاریی پەرژینی بەخششەکانەو دەیانپارێزێ، وەك چۆن باخ ئەگەر پەرژینی هەبێ، پارێزراو دەبێ و زەرِ ناکرێ، بەهەمان شێوە بەخششەکانیش ئەگەر سوپاسی خوایان لەسەر بکرێ، پارێزراو دەبن و، هەر بەخششێك شوکری خوات لەسەر نەکرد، مانای وایە خستووتە بەر مەترسیی لە بەین چوون.

ئنجا دێتە سەر بەسەرهاتی خاوەنانی باخەکە: ﴿إِذۡ أَقۡسَمُواْ لَيَصۡرِمُنَّهَا مُصۡبِحِينَ﴾، یاد بکەوە کاتێك سوێندیان خوارد، بەیانی زوو دەبێ باخەکە ببڕن واتە: بەرەکەی بچنن و بەرهەمەکەی هەڵگرنەوە.

﴿وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ﴾، سوێندیشیان خوارد هیچی لێ هەڵناوێرن و، هیچی لێ بەجێ نەهێڵن، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ﴾، یانی: نەشیانگوت: ئەگەر خوا بیەوێ (**إن شاء الله**)، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر بە عەقڵەوە دەچەسپێ، کە مەبەست ئەوەبووە: هیچی لێ بەجێ ناهێڵن، (**يَعني: وَلَا يَتْرُكُونَ مِنْهَا شَيْئًا لِلْمَسَاكِين**)، هیچی لێ بەجێ ناهێڵن بۆ هەژاران و نەداران، وەك عادەتی بابیان، ئەوان لەو خەیاڵپڵاوە دابوون، بڕیاریان دا کە بەیانی زوو دەچن، دەیچنن، بێ ئەوەی جاریٚ هەژارو نەدارەکان بزانن، کە ئەوانیش زانیویانە کاتی چنینی ئەو باخە، کەیە، دیارە ساڵانە لە کاتی چنینی باخەکەدا هەژارو نەدارەکان چوون، کە ئەوانیش بەشی خۆیان هاوکاریی بکرێن، کوڕەکان گوتوویانە: بەیانی زوو دەچین پێش ئەوەی خەڵك بێدار بێتەوە.

ئنجا کاتێك ئەوان ئەو بڕیارەیان دا: ﴿ فَطَافَ عَلَيۡهَا طَآئِفٞ مِّن رَّبِّكَ وَهُمۡ نَآئِمُونَ ﴾، بەڵایەك لە پەروەردگارتەوە دابەزیە سەری، لە حاڵێك دا ئەوان لە شیرین خەودابوون، بەڵای خوا بۆ باخەکە هات، (**طَائِف**) بە مانای دەورە دەرە، بەڵام خوازراوەتەوە بۆ بەڵاو مەینەتیی، چونکە بەڵاو مەینەتییش دەوری ئەو کەسە یان ئەو شتە دەدات، ئابلووقەی دەداو جەبی ناداو، ناهێڵێ بەملاولادا بڕوات.

﴿ فَأَصۡبَحَتۡ كَٱلصَّرِيمِ ﴾، ئیدی ئەو باخە، وەك چنراوی لێهات، یاخود: وەك دەشتێکی لماویی لێهات، یاخود وەك زەوییەکی سووتماکی لێهات، کە شتێکی لێ سووتێنرابێ، دەگوترێ: بووبە سووتماك، بوو بە قەرەبرووت، یاخود: وەك پارچەیەك لە شەوی تاریکی لێهات، پەرێز کە سووتا، ڕەش دادەگەڕێ، وەك چۆن شەو ڕەشە ئەویش ڕەش دادەگەڕێ.

﴿ فَتَنَادَوۡاْ مُصۡبِحِينَ ﴾، بەیانی زوو کاتێك چوونە نێو بەیانییەوە، بانگی یەکدییان کرد، وا پێدەچێ هەموویان خاوەن ژن و ماڵ بووبن، بانگی یەکدییان کرد.

﴿ أَنِ ٱغۡدُواْ عَلَىٰ حَرۡثِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰرِمِينَ ﴾، کە وەرن بچن بۆ لای کێڵگەکەتان، ئەگەر ئێوە چنەرو بڕەری باخەکەتانن، (**حَرْث**) لە ئەسڵدا بە مانای کێڵان دێ، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ زەوییەك کە بکێڵدرێ، واتە: مەزراو کێڵگەکەتان کە باخەکەی لێیە، ئەگەر ئێوە چنەرو بڕەری بەری باخەکەتانن بڕیارتان داوە، بچن، بازوو بڕۆین، (**غَدَ**) یانی: بەیانی زوو دەرچوو بەرەو ئەو شوێنە.

﴿ فَٱنطَلَقُواْ وَهُمۡ يَتَخَٰفَتُونَ ﴾، ڕۆیشتن لە حاڵێکدا بە چپە قسەیان دەکرد، بۆ ئەوەی خەڵك گوێی لێ نەبێت، گوێ بیستی ئەوە نەبێ کە ئەو کوڕانە دەچن ئەو باخەیان دەچنن و، بەدوایان بکەون.

﴿ أَن لَّا يَدۡخُلَنَّهَا ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكُم مِّسۡكِينٞ ﴾، بە چپە قسەیان دەکرد: ئەمڕۆ نابێ یەك نەداریش بێتە لاتان، لێتان بەژوور بکەوێ لە باخەکەتان، زوو بیچنن بۆ ئەوەی یەك نەداریش فریا نەکەوێ بێ، تاکو هاوکاریی بکرێ.

﴿ وَغَدَوْاْ عَلَىٰ حَرْدٍ قَـٰدِرِينَ ﴾، بەیانی زوو ڕۆیشتن بە تووڕەییەوە، پێیان وابوو توانادارن باخەکەیان بچنن، بێ ئەوەی کەس پێ بزانێ، یاخود (**حَـرد**) بە مانای تووڕەییە واتە: تووڕەبوون لە کردەوەی بابیان، کە ساڵانە بەشی هەژاران و نەدارانی لە بەرهەمی ئەو باخە داوە.

﴿ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴾، کاتێك باخەکەیان بینی، گوتیان: بەڕاستیی ئێمە ڕێ لێ تێکچووین، ئەم ڕێ لێ تێکچوونەش دوو واتای هەن:

**أ**- واتە: ڕێی باخەکەمان لێ تێکچووەو ئەمە باخی ئێمە نیە، تەماشایان کرد پەرێزی سوور و سەقەتاڵە، یاخود تەماشایان کرد زەوییەکی سووتماکەو بۆتە قەرەبرووت گوتیان: ئەمە باخەکەی ئێمە نیە!

**ب**- یاخود گوتیان: ئێمە ڕێمان لێ تێکچووە، لێتێکچوونی مەعنەویی، واتە: ئێمە گومڕابووین کە ئەو بڕیارە خراپەمان دا، ئەو نیەتە خراپەمان لێ هێناو ئاوا خوا سزای داوین.

﴿ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴾، بەڵکو ئێمە بێ بەشکراوین، پێشتر گوتیان: ڕێمان لێ تێکچووە، دوایی کە دڵنیابوون باخەکەی خۆیانە، گوتیان: باخەکەی خۆمانە، بەڵام بێ بەش بووین و زیانبار بووین، یاخود گوتیان: ئێمە گومڕاین لە ڕووی مەعنەوییەوە، دوایی گوتیان: بە هۆی گومڕاییەکەمانەوە، ئێمە بێ بەش کراوین، واتە: دەستخەڕۆو ڕەنجەڕۆ بووین.

﴿ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴾، (**أَوْسَط**) واتە: باشترین، چونکە نێوەندی هەر شتێك باشترینی ئەو شتەیە، باشترینەکەیان ئەوەی لە هەموویان باشترو عاقڵتر و بۆ خوا صوڵحاوتر بوو گوتی: ئایا پێم نەگوتن: دەبێ خوا بە پاك بگرن، واتە: خوا بە پاك بگرن لەوەی سەرپێچیی بکەن؟ خوا فەرموویەتی: لە ماڵ و سامانتاندا بەشی هەژارو نەداران هەیە، دەبووایە خوا لەوە بەبەرزتر بگرن، کە فەرمانەکەی بەو شێوەیە پشتگوێ بخەن، پێتان وابێ فێڵ لەو

هەژار و نەدارانە دەکەن، ئەدی نازانن ئەو هەژارو نەدارانە، خوایەکیان هەیە لەسەریان بەجوابە؟!.

﴿ قَالُواْ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾، وەك گوتراوە: {لە دوای بارانان کەپەنەك}، یان وەك عەرەب دەڵێن: (**بَعْد خَرَابِ بَصرة**)، گوتیان: پاکیی بۆ پەروەردگارمان بەڕاستیی ئێمە ستەمکاربووین، ستەممان کرد لە خۆشمان و لەو هەژار و نەدارانەش کە ئەوانیش بەهرەیەکیان وەردەگرت، لەبەر تۆزە بەهرەیەك کە هەژار و نەدارەکان لە باخەکامانیان وەردەگرت، بەشی خۆشمان فەوتا، وەك پێشینان گوتوویانە: {نۆ گای خۆی بە گایەکی خەڵکیەوە لە گا گێرەدا دەخنکێنێ}، کاتی خۆی گا گێرەیان کردوە، ئنجا هی وا هەبووە گایەکی لە ماڵە دراوسێیەکەی وەرگرتوە، کە بیخاتە گەڵ گایەکانی خۆی، کە بە ڕیز گاگێرەیان پێ بکات، کاتی خۆی دەڕاسە نەبووە و جەنجەڕ نەبووە، بە گاو ئێستر و ماین و کەر، گاگێرەیان کردوە، ئەو خەرمانەیان شێلاوە، تاکو کاودانەکەی لێك جیابێتەوە، ئنجا هی وا هەبووە گایەکی لە ماڵە دراوسێکەی وەرگرتوەو، ئەوەندە ڕقی لەو ماڵە دراوسێیە بووە، هەر گایەکانی ئاو نەداون، هی خۆی نۆ گا بوون، هی ماڵە دراوسێکەی گایەك بووە، بۆ ئەوەی گای ماڵە دراوسێکە بخنکێنێ، نۆی خۆیشی خنکاندوون لە تینووان، ئنجا کاتێك کەسێك لەبەر ئێرەیی و بوغزو غەرەز، زیانێکی گەورە لە خۆی بدات، بەهۆی ئەوەوە کە دەیەوێ زیانێك لە کەسێکی دیکە بدات، دەڵێن: فڵانکەس نۆ گای خۆی بە گایەکی خەڵکەوە لە گا گێرەدا دەخنکێنێ، ئەو خاوەنانی باخەش ڕێك وایان لێ هاتوە.

﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴾، ئنجا هەندێکیان ڕوویان لە هەندێکیان کرد، گلەیی و گازەندەیان لە یەکدی کرد.

﴿ قَالُواْ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴾، گوتیان: ئەی سزای سەختمان! یاخود: ئەی هاوار بۆ ئێمە، یاخود: ئەی خراپیی بۆ ئێمە، بەڕاستیی ئێمە سنوورشکێن و سنوور بەزێن بووین.

﴿ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴾، نیزیکە پەروەردگارمان باشتر لەو باخەمان بۆ بگۆڕێ، واتە: لە جیاتی ئەم باخە باخێکی باشترمان بداتێ، بەدڵنیایی ئێمە هەر بەرەو لای پەروەردگارمان واتە: بەرەو لای بەخشش و چاکەی پەروەردگارمان ئارەزوومەندین.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾، ئاوابوو سزادانەکە، ئاوایە سزادانی خوا بۆ کەسانێك کە چاویان لە خراپەو تاوان و لادانەو، ئازارو سزای ڕۆژی دوایی گەورەتریشە، ئەگەر بزانن، کە خوا ﷻ سزادانی بۆ بەندەکانی، کەمێکی لە دنیا دایە، بایی ئەوەندەی بسڵەمنەوە لە گوناهان، وەك دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾الروم، واتە: خراپەو ئاشووب و تێکدان وشکانیی و دەریای گرتەوە، بە هۆی کردەی دەستی خەڵکەوە، تاکو بەشێك لە سزای کردەوەکانیان پێ بچێژێ بەڵکو بگەڕێنەوە، دەرهاویشتەی خراپەکانیان و ستەم و لادانەکانیان کە لە دنیادا وەك سزایەك دێتەوە ڕێیان، ئەوە بەشێکی کەمی سزایەکەیانەو، سزای گەورە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێیانە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾السجدة، واتە: بە دڵنیایی ئێمە بە سزای نیزیکترو کەمتر سزایان دەدەین، پێش سزای گەورەتر، بەڵکو بگەڕێنەوە.

خوا ﷻ وایکردوە کە هەندێك لە گوناهو تاوانەکان، بە تایبەتی ستەم و ئەوەی پەیوەندیی بە مافی خەڵکەوە هەیە، هەر لە دنیادا ئەندازەیەك سزا هەبێ، بۆ گوناهو تاوان و ستەم و دەستدرێژییەکان، تاکو ببێتە سڵەماندنەوەو پرینگاندنەوەیەك بۆ خەڵك لە ستەم و دەستدرێژیی و خراپە، بەڵام بەدڵنیایی سزای گەورە لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێیانە.

زانایـان لێـرەدا پرسـیارێکیان کـردوە: ئایـا ئـەو خاوەنانـی باخـە، کـە خـوا بـەم شـێوەیە باخەکـەی لـێ فەوتانـدوون و لـە کۆتایـی دا دەڵێـن: ﴿إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ﴾، ئێمـە بـەرەو لای پەروەردگارمـان ئارەزوومەندیـن، هەروەهـا دانیـان بـە سـتەمی خۆیـان داهێنـاوە، دەبـێ خـوا ﷻ لێیـان خـۆش بووبـێ و، ئـەو چاوەڕوانییـەی هەیانبـووە لـە خـوای بەخشـەر، خـوا چاوەڕوانییەکـەی بـۆ جێبەجـێ کردبن و، باشتر لـە باخەکەیانـی پێدابنـەوەو بـۆی قەرەبـوو کردبنـەوە؟! چونکـە بەپێـی ئایەتـەکان، دیـارە ئـەوان بـڕوادارو مسـوڵمان بـوون، هەڵبەتە)رووداوەکـە پێـش ئیسـلام بـووە، بـەڵام ئـەوە بـۆ خـوا ملکـەچ بـوون، چونکـە ئەوەتـا خـوا بـە پاکگرتـن لـە قسـەکانیان دا هەیـەو، پاشـان لۆمەکردنـی یەکدییـان هەیـە، ئنجـا دانیـان بەهەڵـەی خۆیـان داهێنـاوە، دوایـی چاوەڕوانییـان لـە ڕەحمـەت و بەزەیـی خـوا هەبـووە، کـە خـوا بۆیـان قەرەبـوو بکاتـەوە، ئـەو هەسـت و نەسـتانەو، ئـەم هەڵوێسـتانەش هەموویـان هـی کەسـانێکی بـڕوادارو خواناسـن، زانایـان لـەو بـارەوە ڕایـان جیایـە:

لە هەندێك لە هاوەڵان، یان لە هەندێك لە زانایانی تابیعین ئەو پرسیارە کراوە، کە ئایا سەرەنجامی ئەوانە چۆن بووە، خوا لێیان خۆش بووە؟ هەروەها ئایا خوا بۆی قەرەبوو کردوونەوە؟ دیسان ئایا لە ڕۆژی دوایی دا خوا ﷻ سزایان نادات، لەبەر ئەوەی دانیان بە هەڵەی خۆیان داهێناوە؟ ئەو زانایە گوتوویەتی: پرسیارێکی قورست لێکردم واتە: بەپێی ئایەتەکان دەرناکەوێ بە کام لایە دایە، خوا ﷻ بە نەزانراویی سەرەنجامەکەیانی هێشتۆتەوە، بەڵام ئەوەی من تێیدەگەم ئەوەیە کە خوا ﷻ لەسەر ئەو نیەتە خراپەیان، سزای داون، چونکە جاری وایە خوا لەسەر نیەتی خراپ، مرۆڤ سزا دەدا، بەڵام نیەتێکی خراپ کە خاوەنەکەی دڵی خۆی لەسەر چەسپاندبێ و، بەسەرهاتی خاوەنانی باخەکەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نیەتی خراپیش، ئەگەر مرۆڤ دڵی خۆی لەسەر چەسپاندو بڕیاری یەکجارەکیی دا کە بیکات، خوا مرۆڤی لەسەر سزا دەدات، با کردەوە خراپەکەشی نەکردبێ، بەڵام کە کردەوە خراپەکەی نەکردوە، لەبەر ئەوەی نەیتوانیوەو دەستی پێ ڕانەگەیوە، نەك کردەوە خراپەکەی نەکردبێ و لێی پەشێمان

بووبێتەوە، ئەگەر لێی پەشێمان بووبێتەوە، فەرمایشتی ڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە، کە لە جیاتی ئەو نیەتە خراپەی لەو کردەوە خراپەی هێناوە، مادام لێی پەشێمان بێتەوە، خوا چاکەیەکی بۆ دەنووسێ، بەڵام کاتێك کردەوە خراپەکەی بۆ نەکرێ، لەبەر ئەوەی بۆی نەکراوەو پێ ڕانەگەیوە، ئەوە وا پێدەچێ بە گوناح بۆی دابنرێ و شایستەی سزادانیش بێ.

ئەمەش بۆچوونی خۆمەو لە تەفسیرەکاندا نەمبینی، کە ئەوان بە هیچ لایاندا یەکلاییان نەکردۆتەوە کە: ئایا ئەوانە دوایی خوا لێیان خۆشبووەو چاوپۆشیی لێکردوون بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە؟ بە نسبەت دنیاشەوە: ئایا ئەو چاوەڕوانییەی لە خوایان هەبووە، خوا چاوەڕوانییەکەی بۆ هێناونە دی، یان نا؟ من وای تێدەگەم بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە، بە پێی ئایەتەکان وا پێدەچێ خوا لێیان خۆشبووبێ، چونکە لەسەر نیەتە خراپەکەیان خوا سزای داون، کەواتە: سزای خۆیان لە دنیادا وەرگرتووەو، فەرمایشتی پێغەمبەریش هەیە وەك یاسایەکی گشتیی، کە خوا هەر کەسێك خراپەیەك بکات لە دنیاداو پێی سزای دا، ئەوە دەبێتە کەفارەتی، بەڵام ئەگەر پێی سزا نەدرا و خەڵك پێی نەزانی، یاخود دەستەڵاتی شەرعیی پێی نەزانی، ئەوە دەکەوێتە نێوان خۆی و خوا، ئەگەر تەوبە بکات، تەوبە هەموو شتێك دەسڕێتەوەو، ئەگەر تەوبەشی لێ نەکات و نەگەڕێتەوە، دەگونجێ خوا سزای بدات و دەشگونجێ لێی خۆشبێ، بەڵام ئەوانە لەسەر نیەتە خراپەکەیان و بڕیارە خراپەکەیان، خوا سزای داون، کەواتە: ئەوەیان لەسەر لاچووە.

هەروەها ئەوپەڕی لێبووردەیی و بەخشین و کەرەم و بەزەیی و سۆز و پەرۆش لە لای خوای پەروەردگارە، ئەوانەش کە دەڵێن: ئێمە ستەمکار بووین و سنوور بەزێن بووین، دوایی ئومێدیان وایە کە پەروەردگاریان بەباشتر بۆیان قەرەبوو بکاتەوەو دەڵێن: ئێمە بەرەو پەروەردگارمان ئارەزوو مەندین، وا پێدەچێ خوای زۆر بەرزی مەزن و میهرەبان، ئەو هەموو چاوەڕوانیی و

پەشێمان بوونەوەیەی لێوەرگرتبن و، لە ژیانی دنیاشدا بۆی قەرەبوو کردبنەوە.

دوایی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ ٱلۡعَذَابُ ﴾، ئەوە سزادانە بۆ کەسانێك کە لە دنیادا خراپە دەکەن، ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾، سزای مەنزڵگای کۆتایی گەورەتریشە ئەگەر بزانن، ئەوە مەرج نیە بەس بۆ ئەوان بێ، چونکە هەندێك لە زانایان بۆیە یەکلاییان نەکردۆتەوەو هەڵیان بڕیوە، کە لە ڕۆژی دوایی دا خوا لێیان خۆشبووبێت، چونکە دەڵێن: خوا فەرموویەتی: سزای مەنزڵگای کۆتایی گەورەتریشە، ئەگەر بزانن، واتە: ئەو سزایەی چاوەڕێیان دەکات! بەڵام بێگومان لێرەدا خوا وەك بنچینەیەکی گشتیی فەرموویەتی، نەك تەنیا بە نسبەت خاوەنانی ئەو باخەوە، واتە: بێگومان سزای خوا لە ڕۆژی دواییدا گەورەترە لە سزادانی لە دنیادا، ئەوێ سزادانی ئەسڵییەو، لەوەی کە لە دنیادا بەندەکان لەسەر هەندێك لە لادان و تاوان، سزا دەدات، زۆر گەورەترە ئەگەر بزانن، ئەمە وەك بنچینەیەکی گشتیی خوا دەیفەرموێ و مەرج نیە بۆ ئەوان بێت، چونکە ئەوان مادام پەشێمان بوونەوەو گەڕانەوەو دانیان بە هەڵەی خۆیان داهێنا، خوا لێیان خۆشبووە، وەك چۆن باب و دایکمان ئادەم و حەووا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، خوا مەدحیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ ﴾البقرة، واتە: ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتن، ئنجا خوا لێیخۆشبوو، وشەکانیش ئەوانە بوون: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾الأعراف، گوتیان: پەروەردگارمان! ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبووری و بەزەییت پێمان دا نەیەت، لە زیانباران دەبین، خوای بەبەزەییش لێیان خۆشبووە.

کەواتە: بەندە کە دانی بە تاوان و هەڵەی خۆی داهێنا، خوای میهرەبان لێیخۆش دەبێ، کەوابێ: بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە خوا لێیان خۆش بووە، ئەوەش کە دەفەرموێ: سزای قیامەت گەورەتریشە، واتە: سزای خوا لە ڕۆژی

دوایـی دا، گەورەتـرە لـە سـزای خـوا لـە دنیـادا، بـەڵام مـەرج نیـە هـەر کەسـێك لـە دنیـادا خـوا سـزای دا، لـە ڕۆژی دواییشـدا سـزای بـدا، مـادام دوای ئـەوەی خـوا سـزای داوە، پەشـێمان بۆتـەوەو لەگـەڵ خـوادا ئاشـت بۆتـەوەو، چاوەڕوانیـی لـە بەزەیـی خـوادا هەبـووە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خـوای کارزان کۆمەڵـگای بێبـڕوای ڕۆژگاری پێغەمبـەری ﷺ تاقیکردۆتـەوە، وەك هـی هاوەڵانـی باخەکـە، کـە سوێندیان خـوارد، بەیانـی زوو بەرەکـەی بچنـن و، هیچـی لـێ نەهێڵنـەوە بـۆ نـەداران، ئنجـا لـە کاتێکـدا ئـەوان لـە شـیرین خـەو دابـوون، خـوای دادگـەر بەڵایەکـی نـاردە سـەر باخەکەیـان و بـوو بـە سـووتماك و، وەك شـەوی تاریـك، یاخـود پەرێزێـك کـە ئـەو کشـتوکاڵەی لـێ بـووە، دروابێتـەوەو هەڵگیرابـێ، ئـاوای لێهـات:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەوانمان تاقیکردەوە، جەڕباندمانن، وەك چۆن هاوەڵانی باخەکەمان تاقیکردەوەو جەڕباندمانن، یەکێك لە زانایان ئاوا ئەم ئایەتە موبارەکە مانا دەکات دەڵێ: (**امْتَحَنّاهُمْ أيْ: أَهْلَ مَكَّةَ وَمَنْ حَوْلَهَا، بالأمْوَالِ وَالبَنِيْن، كَمَا اخْتَبَرْنَا أَصْحَاب الجَنَّة، وَالجَنَّةُ هِيَ الْبُسْتَان**)، واتە: ئێمە خەڵکی مەککە، کۆمەڵگای ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ و دەوروبەریمان تاقیکردنەوە، بە ماڵ و سامان و کوڕان و قەڕەباڵغیی، وەك چۆن هاوەڵانی باخەکەمان تاقیکردەوە، (**جنة**)ش واتە: باخێك میوەو کشتوکاڵی تێدابێ و بەرهەمداربێ.

فەرمایشتێکی پێغەمبەر لەو بارەوە هەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك لە بێبڕوایەکانی مەککە تووڕە دەبێ و دەفەرمووێ: {أَللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ وَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ} (**أخرجه البخاري: ٨٠٤، ومسلم: ٢٩٤**).

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە بووە کە ئەم نزایەی کردوە لە بێبڕوایەکانی مەککە، فەرموویەتی: ئەی خوایە! زەبری خۆت لەسەر موزەڕ[1] توند بکەو، سالانێك وەك سالانی یوسوف {واتە: ڕۆژگاری یوسوفیان} بەسەر دابێنە، واتە: سالانی گرانیی و قات و قڕیی، بێگومانیش نزای پێغەمبەریان لەسەر قبووڵ بووەو زۆر کەوتوونە سەغڵەتییەوە.

ئنجا خوا ﷻ بەسەرهاتەکە دەخاتە ڕوو، هی هاوەڵانی باخەکە:

**٢)-** ﴿ إِذۡ أَقۡسَمُواْ لَيَصۡرِمُنَّهَا مُصۡبِحِينَ ﴾، کاتێك سوێندیان خوارد بەیانی زوو دەیڕنن (میوەکەی دەچنن)، (**الطبري**) دەڵێ: (**إِذْ حَلَفُوا لَيَجُدُنَّ ثَمَرَتَهَا حِيْنَ دُخُولِهِمْ فِي الصَّبَاح**)، هاوەڵانی ئەو باخە سوێندیان خوارد کە میوەکەی دەچنن، کاتێك دەکەونە نێو بەیانی، واتە: بەیانی زوو بەرەکەی دەڕنن.

**٣)-** ﴿ وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ ﴾، هیچیشی لێ ناهێڵنەوە، (**وَلَا يَتْرُكُونَ مِنْهَا شَيْئَاً**)، هیچی لێ ناهێڵنەوە لە بەرو میوەکەی، واتە: هیچی لێ بەجێ ناهێڵن بۆ هەژارو نەداران.

واتایەکی دیکەی: ﴿ وَلَا يَسۡتَثۡنُونَ ﴾ نەشیانگوت: (**إن شاء الله**)، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر دێتە بەر دڵ، دەگوترێ: (**إِسْتِثْنَاهُ**) واتە: هەڵیواردو جیای کردەوە، واتە: هیچی لێ جیاناکەنەوەو هیچی لێ ناهێڵنەوە بۆ هەژار و نەداران، وەك عادەتی بابیان کە پێشتر بەسەرهاتەکەمان باسکرد، کە هاوەڵانی ئەو باخە کوڕانی پیاوێك بوون لە ناوچەیەك بە ناوی زەڕوان کە شەش میل لە شاری صەنعای یەمەنەوە دوورە، پیاوێك بووە، باخێکی هەبووە پیاوێکی بۆ خوا صوڵحاو بووە، هەمیشە لە کاتی چنین و ڕنینی حاصەڵاتی باخەکەدا،

---

(١) موزەڕ: مُضَر، دووەم هۆزی سەرەکیی عەرەب، کەعەرەب (ربيعة) و (مُضر) بوون.

بەشی هەژاران و نەدارانی لێداوە، دوایی کە بابیان نەماوە، کوڕەکان گوتوویانە: بابی ئێمە تاکو ئێستا کەودەن و نەفام بووە، کە لە هەق و مافی خۆی، لە موڵك و ماڵی خۆی بەشی هەژارو نەدارانی لێداوە، ئێمە بەیانی زوو دەچین و دەیچنین، دیارە کاتی چنینی بووەو، بڕیاریاندا کە هیچیشی لێ نەدەن بە هەژار و نەداران و، کارێك بکەن هیچ هەژارو نەدارێك فریا نەکەوێ، لێیان بە ژوور باخەکە بکەوێ، بۆ ئەوەی ناچارو ڕووگیری بن، شتێکی بدەنێ، ئیدی ئەوان ئەو بڕیارە خراپەیان داوەو، خواش ﷻ بە هۆی ئەو نیەتە خراپەیانەوە، بەڵای بەسەر باخەکەیان هێناوەو، باخەکەیان لە دەست چووە.

٤)- ﴿ فَطَافَ عَلَيۡهَا طَآئِفٞ مِّن رَّبِّكَ ﴾، لە پەروەردگارتەوە بەڵایەکی دەورەدەری بەسەر هات، (**طَائِف: أي بَلَاءٌ مُحِيْط فَهُوَ صِفَةٌ لموصوفٍ مَحْذوفٍ**) کە دەفەرموێ: ﴿ فَطَافَ عَلَيۡهَا طَآئِفٞ ﴾، بەڵایەکی دەورەدەرو گەمارۆدەری بەسەرهات، بەسەر باخەکەدا، کەواتە: (**بلاء**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، ﴿ فَطَافَ عَلَيۡهَا طَآئِفٞ مِّن رَّبِّكَ ﴾، (**يَعْنِي مِنْ جِهَةِ رَبِّكَ**): لە لایەن پەروەردگارتەوە، یانی: بەڵایەکە خوای دادگەر ناردی.

٥)- ﴿ وَهُمۡ نَآئِمُونَ ﴾، لە حاڵێك دا ئەوان خەوتبوون، ئەم ڕستەیە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە لە شوێنی حاڵ دایە، لە حاڵێکدا ئەوان خەوتبوون، لێرەدا پێویست ناکات بفەرموێ: بە شەوێ، لەبەر ئەوەی بە زۆریی عادەتی خەڵك وایە، بە شەوێ خەوتوە، کەواتە: بەڵایەکە بەشەوێ بەسەریان هاتوە، ئەوانیش یان ئێوارە یان هەر شەوێ بڕیاریان داوە، کە بەیانی زوو بچن باخەکەیان بچنن، بێ ئەوەی هیچ هەژار و نەدارێك لێیان بە ژوور بکەوێ، ئنجا هەر ئەو شەوە، دوای بڕیارەکەیان خوا بەڵایەکی دەورەدەر و گەمارۆدەری ناردوە بۆ باخەکەیان و باخەکەیان فەوتاوە.

٦)- ﴿ فَأَصۡبَحَتۡ كَٱلصَّرِيمِ ﴾، باخەکەیان وەك چنراوی لێهات، (**الصَّرِيمُ: الأَرْضُ المَحْصُود زَرْعُهَا**)، کێڵگەیەك زەوییەك کشتوکاڵەکەی دوورابێتەوەو چنرابێ، حاصەڵاتەکەی هەڵگیرابێ و هیچی لێ نەمابێ:

أ- ئەمە ئەسڵی واتایەکەیەتی.

ب- هەروەها وشەی (**صَريم**) بە مانای شەویش هاتوە، واتە: وەك شەوی تاریکی لێهات، کە ئەو کاتە مانای وایە ئەم واتایە خوازراوەتەوە، واتە: چۆن شەوی تاریك هیچی لێ نابینی، ئەو باخەی ئەوانیش هیچت لێ نەدەبینی.

ج- یاخود: کە سووتاوە، بە بەڵایەکی سووتێنەر بووە، بۆ وێنە: هەورە تریشقەیەك لێیداوە، بۆیە باخەکە بۆتە سووتماك، وەك چۆن شەو تاریکە، پەرێزی ئەو باخەی ئەوانیش، تاریك بووەو ڕەش داگەڕاوە.

د- هەروەها (**صَريم**) بە مانای بەیانیش هاتوە، وەك چۆن بەیانی لە شەو جیا دەبێتەوەو دادەبڕێ واتە: ئەو باخەش ئاوا دابڕابوو لە میوەو بەرەکەی خۆی و هیچی پێوە نەمابوو.

### مەسەلەی دووەم:

**یەکدی بانگکردنی هاوەڵانی باخەکە لە بەیانی زوودا، کە بچن بۆ چنینی میوەو بەرهەمی باخەکەیان و، پێکەوە چپە کردنیان کە کارێك بکەن، هیچ نەدارێك نەچێتە لایان لە کاتی ڕنینی میوەی باخەکەیاندا، بۆ ئەوەی لە بەرهەمەکەیان کەم نەبێتەوە، ئیدی ڕۆیشتن و چوون و پێیان وابوو لەسەر ڕێگرتن لە بەهرەمەند بوونی نەداران لە باخەکەیان، توانادارن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَتَنَادَوْا مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ اغْدُوا عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَانطَلَقُوا وَهُمْ يَتَخَافَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا عَلَىٰ حَرْدٍ قَادِرِينَ ﴿٢٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿فَتَنَادَوْا مُصْبِحِينَ﴾، لە کاتێکدا دەچوونە نێو بەیانیی، بانگی یەکدییان کرد، **(فَتَنَادوا)**، **(ف: للتَفْرِيْع عَلَى (أقْسَموا))**، **(ف)** بۆ لقێکە جیادەبێتەوە لە وشەی **(أقسَموا)** سوێندیان خوارد، ئنجا لە ئەنجامی سوێند خواردنەکەیاندا: ﴿فَتَنَادَوْا مُصْبِحِينَ﴾، بەیانی یەکدییان بانگکرد کە باخەکەیان بچنن و، بەشی هیچ نەدارێکی لێ نەدەن، **(يَعْنِي فَلَمَّا أصْبَحُوا تَنَادَوا لإنْجَاز مَا بَيَّتُوْا عَلَيْهِ أمْرَهُم، وَتَنَادي (تَفاعل) مَن النداء، ويفهم مِنْه تَحْرِيْض بَعْضُهُم بَعْضَاً)**، کاتێك ڕۆژیان کردۆتەوە یەکدییان بانگکردوە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی بەشەوێ بڕیاریان بۆ داوە، وشەی **(تَنَادِي)** لەسەر کێشی **(تَفَاعُل)**ە، بۆ بەشداریی و هاوبەشییە لە بانگکردنداو، لێی وەردەگیرێ کە هەندێکیان هەندێکیان هاندابێ و یەکدییان بانگ کردبێ.

٢)- ﴿أَنِ اغْدُوا عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَارِمِينَ﴾، {یەکدییان بانگ کرد} کە زوو بڕۆن بەرەو کێڵگەکەتان، ئەگەر ئێوە چنەرو لێککەرەوەی میوەو بەرهەمی باخەکەتانن، **(الغُدُوُّ: الخُرُوجُ وَالمُغَادَرَةُ لِمَكَان فِي غُدْوَةِ النَّهَارِ أي أوَّله)**، **(غدوٌّ)**: بریتیە لە دەرچوون

و بەجێهێشتنی شوێنێك لە كاتی بەیانیی زوودا، (**غدوة**)ش، واتە: بەیانییەكەی زوو، (**أَن**) لە: (**أن اغدوا**)دا، (**تَفْسِيْرِيَة**) بۆ ڕوونكردنەوەیە، یەكدییان بانگ كرد: كە زوو بڕۆن بۆ كێڵگەكەتان، (**إِنْ**) هەرچەندە (**إن الشَّـرْطِيَة**)یە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی بە مەرج گرتن و هەڵواسین (**تعليق**) نیە، بەڵكو مەبەست پێی ئەوەیە: ئەگەر دەتانەوێ بۆ باخەكەتان بڕۆن، زوو بڕۆن، واتە: پەلە بكەن و سستیی مەكەن، (**حَرث**) بە مانای شەقكردنی زەوی دێ، (**حَرَثَ الأَرْضَ**) واتە: زەوییەكەی كێڵا، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی كێڵگەو مەزرایە، لەبەر ئەوەی كێڵگەو مەزرا دەكێڵدرێ، دوایی میوەیە، دارو درەختە، لێی دەنێژرێ و، دانەوێڵەیە یان تۆوی تەڕەكارە، لێی دەچێنرێ، دوای ئەوەی زەوییەكە دەكێڵدرێ و خۆش دەكرێ.

**٣)- ﴿ فَٱنطَلَقُواْ وَهُمۡ يَتَخَٰفَتُونَ ﴾**، ئنجا دەرچوون لە حاڵێك دا پێكەوە چپەیان دەكرد، بە پەنهانیی قسەیان دەكرد، (**إِنْطِلَاق**): (**الإِنْطِلَاق: الحَرَكَةُ بِسُرْعَة بَعْدَ التَوْقُّف**)، شتێك وەستابێ، دوایی بەخێرایی دەربچێ، پێی دەگوترێ: (**إِنْطِلَاق**)، (**يَتَخافتون: التَّخَافُت مِن خَفَت إِذَا أَسَّر الكَلَام**)، (**تخافت**) لە (**خَفَتَ الكلام**) بە پەنهانیی قسەی كرد، ا هاتووە، بە كوردیی پێی دەڵێن: چپە، سركە، فسكە فسك، بە پەنامەكیی پێكەوە قسەكردن، بۆیەش بە چپە قسەیان كردوە، تاكو دەرو دراوسێ گوێیان لێ نەبێ لە كاتی دەرچوونیاندا، یان هەژارو نەداران كە بەڕێیەدا دەڕۆن، گوێیان لێ بێ كە ئەوە هاوەڵانی باخەكە دەچن باخەكەیان بچنن و، بەدوایان بكەون و شتێك دەستگیر بكەن!.

**٤)- ﴿ أَن لَّا يَدۡخُلَنَّهَا ٱلۡيَوۡمَ عَلَيۡكُم مِّسۡكِينٌ ﴾**، كە ئەمڕۆ هیچ نەدارێك لە باخەكەتان دا لێتان وەژوور نەكەوێ، ئاوا چپەیان دەكرد، (**أَن**)، پێی دەڵێن: (**أَن التَّفسيرية**) واتە: بۆ ڕوونكردنەوە، ئایا چپە كردنەكەیان بۆچی بوو؟ ڕوونی دەكاتەوە كە چپە كردنەكەیان بۆ ئەوە بوو، كە بە دڵنیایی نابێ ئەمڕۆ یەك نەداریش لێتان وەژووری باخەكە بكەوێ، تەنانەت هەژارو نەدارێكیش، چ جای وەك سەردەمی بابیان، هەموو هەژارو نەدارەكان بێن و هەر كەسە بەشی خۆی پێ بدات.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا الْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ﴾ وەك بڵێی ڕێ گرتنەکە ئاڕاستەی هەژارو نەدارەکە کراوە، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە: ئێوە کارێکی وابکەن، هیچ هەژارو نەدارێك فریا نەکەوێ بێت، ئەمەش وەك ئەوەیە کە لە زمانی عەرەبیی دەڵێی: (لَا أعْرِفَنَّكَ تَفْعَلُ كَذَا)، نەتناسم ئەو کارە بکەی، واتە: تۆ ئەو کارە نەکەی، دوایی من بتناسم ئەو کارەت ئەنجام دابێ.

کەواتە: کارێکی وا بکەن، هیچ نەدارێك لێتان وە ژووری باخەکە نەکەوێ لە کاتی چنینیدا، لێرەشدا قەدەغە کردنەکە پەیوەست کراوە بە نەدارەکەوە، بۆ زێدەڕۆیی کردن لە ڕێگرتن لە نەدارەکان، کە لە باخەکەیان بەهرەمەند بن، کە لە ڕاستییدا ڕێگرتنەکە لە هەژارو نەدارەکان نەبووە، بەڵام بۆیە بەوانەوە پەیوەست کراوە، واتە: کارێکی وا بکەن، هێندە دووربینیی بکەن و هێندە بەزوویی بڕۆن و بە گورج و گۆڵیی بچن باخەکەتان بچنن، وەك ڕێتان گرتبێ لە هەژارو نەدارەکان کە بێنە نێو باخەکەتانەوە.

٥)- ﴿وَغَدَوْا عَلَىٰ حَرْدٍ قَادِرِينَ﴾، زووش ڕۆیشتن پێیان وابوو تواناداران ڕێ بگرن، یاخود: (**حَرْد بِمَعْنَى: سُرْعَةٍ وَقَصْدٍ قَوِيٍّ**) واتە: ڕۆیشتن بە خێرایی و بە دڵدامەزراوییەکی تەواوەوە، کە بەشی هیچ هەژارو نەدارێکی لێ نەدەن، (**حَرد**) بە مانای تووڕەییش دێ، بەتووڕەیی ڕۆیشتن واتە: تووڕەبوون لە کردەوەی بابیان کە لە ساڵانی ڕابردوودا بەشی هەژاران و نەدارانی لە بەرهەمی ئەو باخەیان داوە، ئنجا وشەی (**حَرد**) کە لێرەدا بەکارهاتوە، یەکێکە لە ڕووەکانی ئیعجازی قورئان، کە بەس لە فەرمایشتی خوادا شتی وا دەبینرێ، ئەگەر خوا فەرمووبای:

أ- (**وَغَدَوْا عَلَى مَنْعٍ قَادِرِينَ**).

ب- (**عَلَى غَضَبٍ**).

ج- (**عَلَى سُرْعَةٍ**).

**د-** (**قَصدٍ قَوِيٍّ**) تەنیا یەكێك لەو واتایانەی دەگرتەوە، بەڵام لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿وَغَدَوۡاْ عَلَىٰ حَرۡدٖ قَٰدِرِينَ﴾، وشەی (**حرْد**): ١- بە مانای ڕێ لێگرتن دێ.

**٢-** بە مانای تووڕەیی دێ.

**٣-** بە مانای نیازو مەبەستێكی مەحكەم دێ لەسەر كردنی شتێك.

**٤-** بە مانای خێرایی كردن دێ، كەواتە: ئێستا مانای ئەم ئایەتە موبارەكە ئاوای لێ دێ: ﴿وَغَدَوۡاْ عَلَىٰ حَرۡدٖ قَٰدِرِينَ﴾، (**يَعْنِي: انْطَلَقُوا بسُرْعَةٍ غَاضِبِيْنَ وَحَازِمِيْنَ عَلَى المَنْعِ**)، بە خێرایی و بە تووڕەیی دەرچوون و، دڵی خۆیان چەسپاند بوو، لەسەر ڕێ لێگرتنی هەر نەدارێك، كە بێتە نێو باخەكەیان و هاوكاریی بكەن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**لە کاتی بینینی باخەکەیاندا، سەرەتا پێیان وابوو ڕێیان لێ ون بووەو، ئەو شوێنەوارە هی باخەکەیان نیە، دوایی کە زانیویانە، شوێنەواری باخی ئەوانە، دڵنیابوون کە بێ بەش بوون، ئنجا باشترەکەیان لۆمەی کردن، کە هەرچەندە پێیگوتن: خوا بە پاك بگرن، بەڵام بەقسەیان نەکردوە، ئنجا دانیان بە ستەمی خۆیان داهێنا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓاْ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴾، کاتێك باخەکەیان بینی، گوتیان: ئێمە ڕێ لێ تێکچووین، دەگوترێ: (**ضَلَّ الطَّرِيْقَ أي: ضَيَّعَهُ وَفَقَده**) واتە: ڕێگاکەی ون کرد، زایەی کرد، هەروەها دەگوترێ: (**ضَلَّ أي: فَقَدَ طَرِيْقَ الهُدَى**)، ڕێی ڕاستی ونکرد، (**ضَالُّونَ**): لێرەدا بە مانای ڕێ لێ تێکچوونی ڕواڵەتییە، واتە: ڕێی باخەکەمان لێ ونبووەو، ئەم باخە هی ئێمە نیە، بەهەڵە هاتووین، یاخود مەبەستیان ڕێ لێ تێکچوونی مەعنەویی بووە، واتە: ئێمە کە بڕیارماندا بەشی هەژاران و نەداران لەم باخەمان نەدەین، گومڕاو سەرگەدارن بووین، ڕێمان لێ تێکچوو، نەدەبوو ئەو بڕیارەمان دابایە.

٢)- ﴿ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴾، بەڵکو ئێمە بێبەشکراوین، (**حُرِمَ أي: فَقَد نَصِيْبَهُ وَحَظَّهُ**)، پشك و بەشەکەی فەوتا لە دەستی چوو، ئەوەش لەگەڵ هەردوو واتایەکەدا دەگونجێ:

أ- ئەگەر مەبەستیان ئەوەبێ ڕێمان لێ تێکچووە، پێشتر وایانزانیوە ڕێیان لێ تێکچووەو ئەو پەرێزە سوورو سەقەتاڵە و سووتماکە باخی ئەوان نیە، بەڵام دوایی کە بۆیان دەرکەوتوە نەخێر ڕێیەکەش ڕاستەو باخەکەش هی ئەوانە، ئنجا گوتوویانە: ئێمە ڕێمان لێ تێکنەچووە، بەڵکو ئێمە بێ بەش و ڕەنجەڕۆو دەستخەڕۆ بووین.

ب- ئەگەر مەبەستیش لە ڕێ لێ تێکچوون، ڕێ لێ تێکچوونی مەعنەویی بێ، سەرگەردانیی و سەر لێشێواویی بێ، کە ئەو بڕیارە هەڵەیان داوە، ئەو کاتە ڕستەی: ﴿ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴾، واتە: زیاتر لەوەی ڕێمان لێ تێکچووە، هەر دەستخەڕۆو ڕەنجەڕۆش بووین و هیچمان بۆ نەمایەوە، بۆیە ئەحمەد کوڕی عەتائوڵڵای ئەسکەندەریی قسەکەی جوانە کە دەڵێ: (**مَنْ لَمْ يَشْكُر النّعمَ، فَقَدْ تَعَرَّضَ لِزَوَالِها، وَمَنْ شَكَرَهَا، فَقَدْ قَيَّدَهَا بِعِقَالِها**)، هەر کەسێك سوپاسگوزاریی چاکەکان نەکات، ئەوە چاکەکانی خستوونە بەر مەترسیی لە بەین چوون، بەڵام هەر کەسێك سوپاسگوزارییان لەسەر بکات، ئەوە بە پەتی سوپاسگوزاریی بەستوونیەوە، ڕێ نادات لە دەستی بچن، خوای دادگەرییش وەك یاسایەکی گشتیی خۆی لەو بارەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ ﴾**إبراهيم**، واتە: یاد بکەوە کە پەروەردگارت ڕایگەیاند: ئەگەر سوپاسگوزارییم بۆ بکەن، بۆتان زیاد دەکەم، {واتە: ئەگەر لەسەر چاکەکان سوپاسگوزارییم بکەن، چاکەکانتان بۆ زیاد دەکەم}، بەڵام ئەگەر سپڵەیی بکەن سزای من توندە، واتە: ئەگەر سپڵەیی بنوێنن و چاکەکانی خوا نانەدیدە بگرن، نەیانگێڕنەوە بۆ خواو، سوپاسگوزارییان لەسەر نەکەن، سزای خوا توندەو بەشێك لە سزادانی خواش، ئەوەیە ئەو چاکەیەتان لێ وەربگرێتەوە.

٣)- ﴿ قَالَ أَوْسَطُهُمْ ﴾، باشترینیان گوتی، (**أَوْسَطهم: أَفْضَلَهُمْ وَأَقْرَبُهُم إلى الخَيْرِ**)، واتە: باشترینیان و نزیکتریان لە چاکەوە، (**الوَسَطُ: يُطْلَقُ عَلَى الأخْيَرَ وَالأفْضَلِ**)، (**وَسَط**): بەکاردەهێنرێ بۆ چاکترو باشتر، دەگوترێ: (**هُوَ مِنْ وَسَطِ قَوْمِهِ**)، فڵانکەس لە چاکترینی کۆمەڵەکەی خۆیەتی.

ئەوەیان کە لە هەموویان باشتر بوو، گوتی:

٤)- ﴿ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴾، ئایا پێم نەگوتن دەبووایە خوا بە پاك بگرن، کەواتە: لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە یەکێك لەو برایانەو لەو کوڕانە، کە لە هەموویان چاکتر

بووه، له پێش بڕیاره هەڵەکەیاندا پێی گوتوون: خوا به پاك بگرن، یانی: خوا به پاك بگرن، لەوەی سەرپێچیی لێ بکەن، (**هَلاّ تُسَبِّحُونَ اللهَ عَمَلًا، مِنْ أَنْ يُعْصَى مِنْ خِلَال عَدَمِ الإِنْفَاقِ عَلى مُسَتَحِّقيْن**)، دەبووایه خوا به پاك بگرن به کردەوه لەوەی سەرپێچیی لێ بکرێ لەمیانی خەرج نەکردن و ماڵی خۆنەبەخشین به کەسانێك که شایستەی پێ بەخشرانن.

٥)- ﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ﴾، گوتیان: پاکیی بۆ پەروەردگارمان به دڵنیایی ئێمه ستەمکاربووین (پاش بارانان کەپەنەك)، ئنجا خوایان به پاکگرت، وەك وەڵامدانەوه بۆ داوای چاکترینەکەیان، که دەگونجێ برای گەورەیان بووبێ، دەشگونجێ برای نێوەنجییان بووبێ، هەروەها دەگونجێ برای گچکەیان بووبێ، گرنگ ئەوەیه له هەموویان چاکتر بووه، برایەکانی سەرەنجام دانیان به هەڵەو تاوانەکەی خۆیان داهێنا، بێگومانیش نیەته خراپەکەیان و بڕیاره خراپەکەیان، چەنده خراپ بووه، ئەو پەشێمان بوونەوەو پاکیی بۆ خوا دەربڕین و، ستەم له ملی خۆکردن و، خۆ به تاوانبار له قەڵەم دانەش، ئەوەنده چاك بووه.

## مەسەلەی چوارەم:

**سەرزەنشتی یەکدی کردنیان و، دانهێنانیان بە یاخیی بوون و بوغڕابوونیانداو، هیوا خواستنیان بەوەی خوا لە باخەکەیان باشتریان پێ بدات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ﴾، هەندێکیان ڕوویان لە هەندێکیان کرد بە لۆمەو سەرکۆنەکردن و گلەیی و گازاندە لە یەکدی کردنەوە، (**الإِقْبَالُ: حَقِيقَته الْمَجِيءِ إِلَى الْغَيْرِ مِنْ جِهَةِ وَجْهِهِ، وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِنَ الْقُبُلِ وَهُوَ مَا يَبْدُو مِنَ الْإِنْسَانِ مِنْ جِهَةِ وَجْهِهِ، وُهُوَ كِنَايَةٌ عَنِ العِنَايَةِ وَالإِهْتِمَامِ**)، (إقبال): بریتیە لەوەی بچی بۆ لای کەسێك لە لای ڕوویەوە، (**إِقْبَال**): وەرگیراوە لە (**قُبُل**)، کە بریتیە لەوەی لە مرۆڤ دەردەکەوێ لە کاتێکدا ڕووت تێ دەکات، ئەمەش کینایەیە بۆ گرنگیی پێدان و بایەخ پێدان، واتە: بە گرنگیی و بایەخ پێدانەوە ڕوویان لە یەکدی کردو، سەرکۆنەو سەرزەنشتی یەکدییان کرد.

٢)- ﴿قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ﴾، گوتیان: ئەی هاوار بۆ ئێمە! یاخود: ئەی خراپیی بۆ ئێمە، یاخود، ئەی سزای ئێمە، بە دڵنیایی ئێمە یاخیی و سنوور شکێن و گومڕابووین، چونکە (**طَاغِيْن**) کۆی (**طَاغِي**)یە، ئەویش لە (**طَغَى**)ەوە هاتوە، (**طَغَى، يَطْغَى، فَهُوَ طَاغٍ**)، (**وَالطُّغْيَانُ: تَجَاوُزُ الْحَدِّ فِي العِصْيَان**)، (**طغيان**)یش سنوور شکاندنە لە سەرپێچیی و بێ فەرمانییدا.

واش پێدەچێ لۆمە کردنەکە، هەر هی چاکترینەکەیان بووبێ کە لۆمەی برایەکانی کرد، چونکە بەس ئەو ئامۆژگاریی کردبوون، کە خوا بە پاك بگرن و سەرپێچیی لێ نەکەن، بەڵام بە قسەیان نەکردبوو.

(وَاللَّوْمُ: إِنْكَارٌ مُتَوَسِّطٌ عَلَى فِعْلٍ أَوْ قَوْلٍ، وَهُوَ دُونَ التَّوْبِيخِ وَفَوْقَ الْعِتَابِ)، لە زمانی عەرەبییدا، ئەو وشانە: (**لوم، توبیخ، عتاب**)، هەر کامیان واتای خۆی هەیە، زمانی کوردیی و زمانەکانی دیکەش بە بەراورد لەگەڵ زمانی عەرەبییدا، هەژارن، وشەی (**لَوْم**) بریتیە لە نکووڵیکردنێکی میانگیر لەسەر قسەیەك یان کردەوەیەك، (**لَوْم**) کەمترە لە (**تَوْبِيخ**)، واتە: سەرزەنشتکردن و لە سەرووی (**عِتَاب**)ەوەیە، کە بریتیە لە گلەیی، ئێمە لە کوردیی دا بۆ هەموان وشەی: گلەیی و جاری وایە سەرزەنشتیش بەکاردێنین، (**عِتَاب**) بریتیە لە نەرمە گلەیی، (**لَوْمُ**) لەو بەهێزترەو (**تَوْبِيخ**)یش لەو بەهێزترەو، بریتیە لە سەرکۆنەو سەرزەنشتکردنێکی بەهێز.

**٣)-** ﴿ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ ﴾، نیزیکە پەروەردگارمان بە باشتر بەوە بۆمان بگۆڕێ، (**يُبْدِلَنا**) خوێنراوەتەوەش: (**يُبَدِّلَنَا**) کە مەبەستیان ئەوە بووە لە دنیادا خوا باخێکی باشتر لەوەی خۆیانیان پێ بدات، لەو باخەی لێی ستاندوونەوە، یانی: ئەو باخەمان لەدەست چوو، ئومێدمان وایە. خوا ﷻ لە بەدەل و جێداری ئەوەدا باخێکی باشترمان پێ بدات.

**٤)-** ﴿ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بەرەو لای پەروەردگارمان ئارەزوومەندین.

ئەم ڕستەیە لەو ئایەتە، سێ واتایان هەڵدەگرێ:

**یەکەم:** ئەمە جۆرێکە لە ملکەچ بوون و گەڕانەوە بۆ لای خوا.

**دووەم:** ئومێدەواربوونە بە خوا کە پێیان ببەخشێ.

**سێیەم:** دەشگونجێ ئەمە گەڕانەوەیەك بێ بۆ لای خوا -- ئەگەر گومانی خراپیان پێ بەرین بە هاوەڵانی باخەکە - وەك گەڕانەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان کە لە کاتی سەغڵەتیی و تەنگانەدا دەگەڕانەوە، بەڵام دوایی کە لە تەنگانەو سەغڵەتیی دەردەچوون، دەگەڕانەوە سەر دۆخی پێشێیان کە بریتی بوو لە کوفرو هاوبەش بۆ خوا دانان.

ئیبنو عاشوور لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] لە (ابْنُ الْفَرْسِ)ەوە دێنێ و دەڵێ:
**(قَالَ ابْنُ الْفَرْسِ فِي «أَحْكَامِ الْقُرْآنِ»: اسْتَدَلَّ بِهَذِهِ الْآيَةِ أَبُو مُحَمَّدٍ عَبْدُ الْوَهَّابِ، عَلَى أَنَّ مَنْ تَعَمَّدَ إِلَى نَقْصِ النِّصَابِ قَبْلَ الْحَوْلِ قَصْدًا لِلْفِرَارِ مِنَ الزَّكَاةِ أَوْ خَالَطَ غَيْرَهُ، أَوْ فَارَقَهُ بَعْدَ الْخِلْطَةِ، فَإِنَّ ذَلِكَ لَا يُسْقِطُ الزَّكَاةَ عَنْهُ خِلَافًا لِلشَّافِعِيِّ. وَوَجْهُ الْإِسْتِدْلَالِ بِالْآيَةِ أَنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ قَصَدُوا بِجَذِّ الثِّمَارِ إِسْقَاطَ حَقِّ الْمَسَاكِينِ، فَعَاقَبَهُمُ اللَّهُ بِإِتْلَافِ ثِمَارِهِم).**

واتە: ئیبنو فەڕس لە کتێبی ئەحکامی قوڕئاندا گوتوویەتی: ئەم ئایەتە بە بەڵگە لەسەر ئەوە هێنراوەتەوە، کە هەر کەسێك بە ئەنقەست بیەوێ، ئەندازەی زەکات لێکەوتنی ماڵەکەی کەم بکاتەوە، (کە ئەگەر زێڕ بێ، بیست میسقاڵە و ئەگەر دانەوێڵە بێ، پێنج ویسقە و ئەگەر حوشترو ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن بێ، دیارییکراوە)، پێش ئەوەی ساڵی بەسەردا بسووڕێتەوە، ئەندازەکەی کەم بکاتەوە، بۆ ئەوەی زەکاتی لێ نەکەوێ وەك ڕاکردن لە زەکات، یاخود ماڵەکەی لەگەڵ هی یەکێکی دیکەدا تێکەڵ بکات، یاخود کە لەگەڵ هی کەسێکی دیکەدا تێکەڵ بوو، لێی جیابێتەوە، {کە ئەگەر پێکەوە بن زەکاتیان لێ بکەوێ و، ئەگەر لێی جیابێتەوە زەکاتی لێ نەکەوێ}، لە هەموو ئەو حاڵانەدا زەکاتەکەی لەسەر لاناچێ، چۆنیەتیی بەڵگە هێنانەوەکەش ئەوەیە کە خاوەنانی باخەکە، ویستوویانە میوەی باخەکەیان ببڕن بەرەو بەیانی زوو، تاکو مافی هەژارو نەدارەکان بفەوتێنن، بۆیە خوا ﷻ بەوە سزای داون، کە باخەکەی هەموو لە دەست هێناونە دەرو میوەی باخەکەیان فەوتاوە.

کەواتە: کەسێکیش بیەوێ هەق و مافی زەکات پێدراوان، بفەوتێنێ، بە هەر کام لەو سێ حاڵەتەی باسکران، نیصابەکە بە جۆرێك لە جۆرەکان کەم بکاتەوە، یان لەگەڵ یەکێکدا تێکەڵ بێ، یان کە لەگەڵی دا تێکەڵ بووە، لێی جیابێتەوە، یان بە هەر شێوەیەکی دیکە، بەوە زەکاتی لەسەر لاناچێ و، زەکاتەکە هەر لە ماڵ و سامانەکەیدا دەبێ.

---
(١) التحرير والتنوير: ج٢٢، ص٨٩.

## مەسەلەی پێنجەم:

**ئـەوەی بەسـەر هاوەڵانـی باخەکـەدا هـات، سـزای دنیایـی بـوو، سـزای ڕۆژی دواییـش هەیـە بـۆ سـەرپێچییکاران و، گەورەتریشـە ئەگـەر بزانـن:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)-** ﴿ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ﴾، ئەوە سزادانەکە بوو، (**العَذَاب**) (أل)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ (عهد)ە، واتە: سزایەکەی خوا بۆ سەرپێچییکاران ئاوایە، یاخود ئەلیف و لامەکە قەرەبووی پاڵوەلادراو (**مُضَاف إليه**)ی کردۆتەوە (**كَذَلِكَ عَذَابُ رَبِّك أو عَذَابُ الله**)، سزای پەروەردگارت یان سزای خوا، ئاوایە، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە هیچ گوناحێك بەبێ سزاو تۆڵە ناڕواو، هیچ لادانێك بەبێ ڕاستکردنەوە ناڕوا.

**٢)-** ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾، سزاو ئازاری مەنزڵگای کۆتایی گەورەتریشە، ئەگەر بزانن، وەك خوای بەرز دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَدْنَىٰ دُونَ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَكْبَرِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾**السجدة**، بە دڵنیایی سزایان دەدەین بە سزای کەمتر یان نزیکتر، پێش سزای گەورەتر {کە لە ڕۆژی دوایی دایە}، بەڵکو بگەڕێنەوە، ئەمەش مەبەست پێی ئەوەیە: با بێبڕوایانێك کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون، نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون، چ نیعمەتی ماددیی وەك: سەروەت و سامان، دەسەڵات، قەڕەباڵغیی، چ نیعمەتی مەعنەویی وەك: هێمنیی و ئاساییش، لەشساغیی، با پەند وەربگرن و چاکەو نیعمەتەکانی خوا لەسەرپێچیی خوادا بەکارنەهێنن و، مافی خاوەن مافان نادیدە نەگرن، چونکە ئەگەر وابکەن، هەم لە دنیادا سزای خوا چاوەڕێیانە، هەم لە ڕۆژی دواییشدا.

هەموو ئەو قسانەی کە هاوەڵانی باخەکە کردوویانن:

**١-** پەشێمان بوونەوەیان.

٢- خۆ بەستەمكار لە قەڵەم دانانیان.

٣- پاكیی بۆ خوا دەربڕینیان.

٤- دانهێنانیان بەسەركێشیی و یاخیی بوونیاندا.

٥- ئومێدەواربوونیان بە بەزەیی خوا، كە خوا بۆیان قەرەبوو بكاتەوە.

٦- ئارەزوومەندیان بۆ لای خوا ﷻ.

هەموو ئەوانەش ئەوە دەیەگەنن و ئەو بۆچوونە بەهێزتر دەكەن، كە خوا ﷻ لەسەر ئەو نیازو مەبەست و بڕیارە خراپەیان، سزای داون و بەوەش گوناهەكەیان لێ سڕاوەتەوە.

دواییش كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾، ئەمە بەیانكردنی یاسایەكی گشتیی خوایە، نەك مەبەست ئەوەبێ كە حەتمەن ئەوانە سزای ڕۆژی دوایی چاوەڕێیان دەكات، بەڵكو بەو سزایەی خوا داونی لەسەر ئەو نیەتە خراپەیان، پاك بوونەوە وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هەیە: هەر كەسێك خراپەو تاوانێك بكات و خوا سزای بدات لەسەری، یان سزای شەرعیی بەسەردا بچەسپێنرێ، دەبێتە هۆی پاكبوونەوەی [1]، ئەوانەش خوا سزای داون و سزای خوا بۆتە هۆی پاكبوونەوەیان، كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ ٱلۡعَذَابُۖ ﴾، واتە: سزادانی خوا بۆ كەسانێك سەرپێچیی لێ بكەن لە دنیادا، ئاوایە، بەڵام دوایی كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴾، سزای مەنزڵگای

---

(١) {عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه، وَكَانَ شَهِدَ بَدْرَاً، وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ، وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئَاً فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِن ذَلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَه اللهُ، فَهُوَ إِلَى اللهِ، إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ، وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ} (أخرجه البخاري: ١٨).

کۆتایـی گەورەتریشـە ئەگـەر بزانـن، واتـە: بـۆ کەسـانێك کـە لـە هەڵـەو کـەم و کوڕییەکانیـان دەسـت هەڵنەگـرن و پەشـێمان نەبنـەوە، بـەڵام هاوەڵانـی باخەکـە پەشێمان بوونـەوەو دانیـان بـە تاوانـی خۆیـان داهێنـاوەو پاکییـان بۆ خـوا دەربڕیوە.

کەواتـە: وا پێدەچـێ ئەوانـە سـەرەنجام خێربووبـن، بـەڵام خـوا ﷻ بەسـەرهاتەکەیانی گێڕاوەتـەوە، تاکـو خەڵـك پەندیـان لێوەربگـرێ و وەك ئـەوان نـەکات، ئەگەرنـا دوایـی پەشـێمان بوونەوەکەیـان، قەرەبـووی ئـەوەی بـۆ کردوونـەوەو، هـەر کەسـێکیش بـە بەزەیـی خـوا ئومێـدەوار بـێ لـە دنیـاو دوارۆژدا، خـوا نائومێـدی نـاکات، وەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە: هـەر کەسـێك دەسـت بـەرەو خـوا بـەرز بکاتـەوەو لێـی بپاڕێتـەوە، خـوا دەسـتی بـە خاڵیـی بـەڕێ ناکاتـەوە[1]، ئنجـا یـان:

أ- ئەوەی داوای دەکات پێی دەدات.

ب- یاخود باشتر لەوەی پێ دەدات.

ج- یاخود بە ئەندازەی ئەوە بەڵای لێ دەفع دەکات.

د- یاخود لە ڕۆژی دواییدا بەو ئەندازەیە پاداشتی دەداتەوە.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

---

(١) {عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِّي عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ حَيِيٌّ كَرِيمٌ يَسْتَحْيِي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا خَائِبَتَيْنِ} (أخرجه أحمد: ٢٣٧٦٥، والترمذي: ٣٥٥٦، وقال: حسن غريب، والحاكم: ١٩٦٢، وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي: ٢٩٦٥، وأبو داود: ١٤٨٨، وابن حبان: ٨٧٦).

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان نـۆزدە (١٩) ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (**القلم**) دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٣٤ - ٥٢)، لـەو نـۆزدە (١٩) ئایەتـەدا چـوار بابـەت خراونـە ڕوو:

**بابەتـی یەکـەم:** لـە هەشـت ئایەتەکانـی: (٣٤ - ٤١)دا، باسـی ئـەوە کـراوە کـە پارێـزکاران پاداشـتیان بەهەشـتی پـڕ نـازو نیعمەتـە، ناشـکونجێ خـوا ﷻ بـۆ خـوا ملکەچانـی چاکـەکار لەگـەڵ یاخییانـی تاوانبـاردا، وەك یـەك دابنـێ، ئـەوە دژی عەقـڵ و زگماکـەو، هیـچ بەڵگەیەکـی وەحییشـی لەسـەر نیـە.

**بابەتـی دووەم:** شـەش ئایەتـان لـە خـۆی دەگـرێ، ئایەتەکانـی: (٤٢ - ٤٧)، بـاسی هەڕەشـەکردن لـە بێبڕوایانـی تاوانبـاری بـە درۆ دانـەری قورئـان، کـە لـە ڕۆژی قیامەتـدا دووچـاری زەبوونیـی و داماویـی دەبـن و، لـە دنیاشـدا هیـچ بیانـوو و پاسـاوێکی کافربوونیـان نیـەو نەبـووە.

**بابەتـی سێیەم:** لـە سێ ئایەتەکانـی: (٤٨ - ٥٠)، پێـک دێ، بـاسی فەرمانکردنـی خـوای بـەرزی مـەزن بـە پێغەمبـەری کۆتایی خـۆی موحەممـەد ﷺ کە وەك هاوەڵی ماسـییەکە نەبـێ، «پێغەمبـەر (یونـس) ﷺ» کـە پەلـەی کـردو، دوایـی لـە سـکی ماسـییەکەدا پاڕایـەوەو پاکیـی بـۆ خـوا دەربـڕی، ئەگەرنـا بـە سەرزەنشـتکراویی فـڕێ دەدرایـە دەشـت، بـەڵام دوایـی خـوا هەڵیبـژارد و لـە بەنـدە چاکەکانـی خـۆی گێـڕا.

**بابەتـی چـوارەم:** لـە دوو ئایەتەکانـی کۆتایـی: (٥١ - ٥٢) پێـك دێ، بـاسی بێبڕوایانـی داخ لـە دڵ، کـە ئەوەنـدە لـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ پەسـت و قەڵـس بـوون، لـە کاتـی بیسـتنی قورئانـدا نیزیـك بـوو بـە نیـگای چاوەکانیـان بیخلیسـکێنن و، بـە شـێتیان دادەنـا، لـە حاڵێکـدا کـە قورئـان بیرخەرەوەیـە بـۆ تێکـڕای جیهانییـان.

﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ فَذَرْنِى وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بێگومان بۆ پارێزكاران لە لای پەروەردگاریان باخە پڕ نازو نیعمەتەكان هەن ﴿٣٤﴾ ئنجا ئایا (بۆ خوا) ملكەچان وەك تاوانباران لێ دەكەین (لە مامەڵە كردندا)؟ ﴿٣٥﴾ چیتانە! چۆن دادوەریی دەكەن؟ ﴿٣٦﴾ یان ئایا كتێبێكتان هەیە، تێیدا دەخوێننەوە (و تێیدا هاتوە) ﴿٣٧﴾ كە بە دڵنیایی هەرچی هەڵیبژێرن بۆ ئێوە هەیە؟ ﴿٣٨﴾ یان ئایا سوێندو پەیمانێكتان لەسەرمان هەیە، هەتا ڕۆژی قیامەت كە هەرچی بڕیار بدەن، بۆتان هەیە (لە مەنزڵگای كۆتاییدا)؟ ﴿٣٩﴾ لێیان بپرسە: كامیان هۆباڵدار (و كەفیل)ی ئەوەیە كە دەیڵێن؟ ﴿٤٠﴾ یان ئایا هاوبەشیان هەن، (لە پەرستنی خواداو تكاكاریانن)؟ ئنجا ئەگەر لە ڕاستانن با هاوبەشەكانیان بێنن ﴿٤١﴾ ئەو ڕۆژەی (لەبەر سەغڵەتیی و سەختیی) لاق

هەڵدەکرێ و (بێبڕوایان) بۆ کڕنووش بردن بانگ دەکرێن، (داوایان لێ دەکرێ کڕنووش بۆ خوا بەرن)، بەڵام ناتوانن ﴿٤٢﴾ (لە حاڵێکدا) چاوەکانیان ترس و لەرز و زەبوونیی دایگرتوون و، (پێشتریش) ساغ بوون و، داوایان لێ دەکرا کڕنووش ببەن (بۆ خواو کڕنووشیان نەدەبرد) ﴿٤٣﴾ ئنجا لە من و لەو کەسە گەڕێ، کە ئەم فەرمایشتە بە درۆ دادەنێ، بێ ئەوەی پێ بزانن پەلکێشیان دەکەین (بەرەو سزا) ﴿٤٤﴾ هەروەها مۆڵەتیان دەدەم (چی دەیانەوێ بیکەن)، بەڕاستیی نەخشەو پلانی من پتەوە ﴿٤٥﴾ یان ئایا (ئەی موحەممەد! ﷺ هۆی بڕوا نەهێنیان ئەوەیە کە) داوای کرێیان لێ دەکەی و بەهۆی باجدانەوە بارگرانن! ﴿٤٦﴾ (یان ئایا بۆیە بڕواناهێنن) کە نادیار دەزانن، ئنجا (بۆ یەکدی) دەینووسن! ﴿٤٧﴾ ئنجا (مادام وایە) بۆ بڕیاری پەروەردگارت خۆڕاگر (و پشوو درێژ) بەو (لە پەلەکردن و کەم حەوسەڵەییدا)، وەك هاوەڵی نەهەنگەکە (یونوس) مەبە، کاتێك بە دڵپڕیی بانگی (خوای) کرد (و لێی پاڕایەوە) ﴿٤٨﴾ ئەگەر چاکەیەك لە پەروەردگاریەوە فریای نەکەوتبایە، بەسەرزەنشتکراویی فڕێ دەدرایە دەشت و سەحراوە ﴿٤٩﴾ کەچی (دوایی کە پەشێمانیی دەربڕی) پەروەردگاری هەڵیبژاردو لە (بەندە) چاکەکانی گێڕا ﴿٥٠﴾ هەروەها ئەوانەی بێبڕوابوون، نیزیکە کاتێك گوێبیستی زیکر دەبن، بە (نیگای پڕ کینەو ئیرەیی) چاوەکانیان بتخلیسکێنن و، دەڵێن: بێگومان ئەو شێتە ﴿٥١﴾ لە حاڵێکدا ئەو (قورئان)ە، تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان ﴿٥٢﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێک لە وشەكان

(تَدْرُسُونَ): (**دَرَسْتُ العِلْمَ: تَناوَلْتُ أَثَرَهُ بِالْحِفْظِ، وَلَمَّا كَانَ تَناولُ ذَلِكَ بِمُدَاوَمَةِ القِرَاءةِ، عُبِّرَ عَنْ إدَامَةِ القِرَاءةِ بِالْدَّرْسِ**)، (**دَرَسْتُ العِلْمَ**): شوێنەوارەكەیم بە لەبەركردن وەرگرت، ئنجا لەبەر ئەوەی لەبەركردنی شوێنەواری زانست، بەهۆی بەردەوام بوون لەسەر خوێندنەوە وە دەستگیرو دەستەبەر دەبێ، بۆیە بە بەردەوام بوون لەسەر خوێندنەوە گوتراوە: دەرس، كەواتە: (**تَدْرُسُون يَعْنِي: تَقْرَؤُنَ**) دەخوێننەوە.

(زَعِيمٌ): (**أي: المُتَكَفِّل، وَالرئِيْس**)، (**زعيم**): بە مانای ئۆباڵدار، كەسێك شتێك بە ئەستۆوە بگرێ و بیخاتە ئۆباڵی خۆی، هەروەها (**زعیم**) بە مانای سەرۆكیش دێ، لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیی ئەوانەی سەرۆكیانە، وە ئەستۆی گرتوە.

(سَاقٍ): (**السَّاقُ مِنَ الحَيْوَانِ مَا بَيْنَ الرُّكْبَةِ وَالقَدَمِ، وَمِنَ الشَّجَرَةِ وَنَحْوِهَا مَا بَيْنَ أَصْلِهَا إلى مُتَشَعَّب فُرُوعِهَا**)، (**سَاق**): لە ژیاندارانداا بە نێوان ئەژنۆ و پێ، دەگوترێ، [بەهەمووی: بە عەرەبیی دەگوترێ: (**رجل**)، بە كوردیی: لاق، بەڵام بە نێوان ئەژنۆ و پێ دەگوترێ: (**سَاق**) بە كوردیی پێی دەڵێن: لوولاك] بەڵام بە نسبەت درەخت و ئەوانەوە كە قەدیان هەیە، وەك دەغڵ و دان، (**سَاق**): بریتیە لە نێوان ڕەگ و ڕیشەكانی هەتا لق و پۆپ و گەڵا بڵاوەكانی، بە هەمووی دەگوترێ: (**سَاق**).

(تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ): واتە: زەبوونیی دایاندەپۆشێ، دەگوترێ: (**رَهَقَ الشَيْءَ رَهْقَاً: غَشِيَهُ**)، واتە: ئەو شتەی داپۆشی، كەواتە: (**تَرْهَقُهُم ذِلَّةٌ**) زەبوونیی دایاندەپۆشێ، وەك چۆن پۆشاكێك بەسەر شتێك دادەی، ئاوا زەبوونیی و مەینەتیی دایاندەپۆشێ.

(سَلِمُونَ): واتـە: سـاغ بـوون، (سَـالِم: سَـلِمَ يَسْـلَمُ سَـلاَمَاً وَسَـلاَمَةً: بَـرِيءَ، وَسَـلَم لَـهُ: خَلَـصَ، وَهُـوَ سَـالِم وَسَـلِيْم)، (سَـالِمُون) كـۆی (سَـالم) دەگوتـرێ: (سَـلِمَ يَسْـلَمُ سَلاَمَاً وَسَـلاَمَةً) سـاغ بـوو، سـاغ دەبـێ، سـاغيی، واتـە: (بَـرِئَ) سـاغ بـوو، (وَسَـلَم لَهُ: خَلَـصَ) بـۆی سـاغ بـووەوە، (وهـو سـالم) ئـەو سـاغە، (سَـالِم وَسَـلِيْم) هەردووكيـان بـە مانـای سـاغ، دێـن.

(وَأُمْلِي لَهُمْ): واتـە: ڕسـتيان بـۆ درێـژ دەكـەم، (الإمْـلاَءُ: الإمْـدَادُ، أُمْـلِي لَهُـمْ أي: أُمْدِدْهُـم)، مۆڵەتيـان دەدەم و ڕسـتيان بـۆ درێـژ دەكـەم و دەرفەتيـان دەدەم.

(كَيْدِى): (الكَيْـدُ: ضَرْبٌ مِـنَ الإحْتِيَـالِ، وَقَـدْ يَكُـون مَمْدُوحـاً أو مَذْمُومَـاً)، (كيـد): جۆرێكـە لـە فێـڵ، ئنجـا جاری وا هەيە پەسـند كـراوەو، جـاری وايە سەرزەنشـتكراوە، ستايشـكراو ياخـود سەرزەنشـتكراو دەبـێ، ئەگـەر بـۆ چاكـە بـێ، چاكـەو، ئەگـەر بـۆ خراپـە بـێ، خراپە.

(مَتِينٌ): (الـمَتِيـنُ: الـمَتْنَانُ مُكْتَنِفَا الصُّلْبِ، وَبِهِ شُبِّهَ الـمَتْنُ مِنَ الأرْض، مَتُـنَ أي: قَـوِيَ مَتْنُـهُ)، (مَتنـان) بـە هـەردوولای پشـت دەگوترێـن، زەوييەكـی پتـەو بـەوەوە ناونـراوە، وەك پشـتی مـرۆڤ پتـەوە، (مَـتُنَ أي، قَـوِيَ مَتْنُـهُ) واتـە: پشـتی بەهێـزە، ئنجا دوايـی وشـەی مەتينيـان بەكارهێنـاوە بـۆ بەهێزيـی بەڕەهايـی.

(مَّغْرَمٍ): (مَغْـرَم: الغُـرْمُ: مـا يَنُـوبُ الإنْسَـان في مَالِـه مِـنْ ضَررٍ لِغَيْرِ جِنَايَـة مِنْـهُ أو خِيَانَـة)، (غُـرْم وغَرَامَـة): بريتيـە لـەو ئەنـدازە زيانبارييـەی ڕوو لـە مـاڵ و سـامانی مـرۆڤ دەكات، بـێ ئـەوەی تاوانێكـی ياخـود ناپاكييەكـی كردبـێ و پێـی دەگوتـرێ: بـاج لـێ سـتێنران، (غُـرِمَ غَرْمَـاَ وَمَغْرَمَـاً، أُغْـرَمَ فُـلَان غَرَامَـة)، هـەم بـە سـيانيی (ثـلاثي) هاتـوە، هـەم بـە چواريـی (رباعـي)، (غُـرِمَ فُـلاَن) واتـە: فڵانكـەس باجـی لـێ وەرگيـرا، (أُغْـرِم فُـلاَنٌ غَرَامَـة) واتـە: فڵانكـەس غەڕامـە كـرا، ياخـود باجـی لێوەرگيـرا، بـەڵام ئـەوە لـە حاڵێـك دا كـە بـە ناهـەق بـێ، پێـی دەگوتـرێ: (غُـرِم غَرْمـاً).

(مُثْقَلُونَ): بارگـران کـراو، دەگوتـرێ: (**أَثْقَلـهُ الغُـرْمُ وَالـوِزْرُ، فَهُـوَ مُثْقَـلٌ**)، واتـە: گونـاح، یاخـود بـاج پشـت و شـانی گـران کـرد، (**فَهُـوَ مُثْقَـلٌ**)، ئـەو بارگرانـە، یـانی: ئەرکێکـی قورسـی خراوەتـە سـەر شـان.

(مَكْظُومٌ): (**الكَظَـمُ: مَخْـرَجُ النَفَـسِ**)، (**كَظَـم**): شـوێنی هەناسـە لـێ دەرچوونـە، (**وَالكُظُـوم: احْتِبَـاسُ النَّفَـسِ، وَيُعَبَّـرُ بِهَـا عَـنِ السُّـكُوتِ**)، (**كظـوم**) بریتیـە لـەوەغ ئینسـان هەناسـەی خـۆی بگـرێ، بەکاریـش هێـنراوە بـۆ بێدەنگیـی، دەگوتـرێ: (**كَظَمَ فُـلَانٌ أي: حَبَـسَ نَفَسَـهُ**)، واتـە: هەناسـەی خـۆی گـرت، (**وَكَظْـمُ الغَيْـظِ: حَبْسُـهُ**)، پەسـتیی خۆگرتـن، کەسـێك کـە زۆر تـوورەو پەسـت دەبـێ، بـەڵام تووڕەییەکـەی دەرنابـڕێ و حەپسـی دەکات، پێـی دەگوتـرێ: (**كَظِيْـم أو مَكْظُـوم**)، (**كَظِيْـم**) لەسـەر کێشـی (**فعيـل**)ەو، (**مَكْظُـوم**) لەسـەر کێشـی (**مفعـول**)، (**مَكْظُـوم**) کەسـێکە ناچـار کرابـێ ڕقەکـەی خـۆی یاخـود هەناسـەکەی خـۆی حەپـس بـکات، بـەڵام (**كَظِيْـم**) لەسـەر کێشـی (**فعيـل**)ە، بـە مانـای (**فاعـل**) کەسـێکە تووڕەییەکـەی خـۆی قـوت دابێتـەوە، هەڵبەتـە (**كَظِيْـم**) صیغـەی موبالەغـەی (**كَاظِـم**)ە، کەسـێك نەفەسـی خـۆی گرتبـێ، یـان تووڕەیـی خـۆی حەپـس بـکات و دەری نەبـڕێ.

(تَدَارَكَهُ)، لـە فریـای هاتبایـە، (**أَدْرَكَ: أي بَلَـغَ أقْـصَى الشَّـيءِ، وَأدْرَكَ الصَّبِـيُّ: بَلَـغَ غَايَـةَ الصِّبَـا**)، واتـە: (**أَدرك**) گەیشـتە ئەوپـەڕی ئـەو شـتە، دەگوتـرێ: (**أَدْرَك الصَّبِـيُّ**) مێـرد منداڵەکـە گەیشـتە ئەوپـەڕی قۆناغـی منداڵیـی و هەرزەکاریـی، یانـی: باڵـغ بـووەو قۆناغـی منداڵیـی و هەرزەکاریـی تێپەڕانـدوە.

(بِالْعَرَاءِ): (**العَـرَاءُ: مَـكَانٌ لَا سُتَـرَةَ فِيْـهِ**)، (**عَـرَاء**): دەشـت و سـارا، شـوێنێکە هیـچ پۆشـاکێکی لـێ نەبـێ، لـە کوردییـدا دەڵێیـن: دەیخاتـە گـۆڕێ، یـان دەیخاتـە دەشـت و سـارا، کـە هیـچ پەنایەکـی نیـە خـۆی تێبگـرێ.

(مَذْمُومٌ): (**ذَمِيْـم: لَحِقَـهُ الـذَّمُّ وَهُـوَ ضِـدُّ المَـدْح**)، (**مذمـوم**) کەسـێك کـە سەرزەنشـتکران پێـوەی پەیوەسـت بـووە، یانـی: سەرزەنشـتکراو و ڕەخنـە لێگیـراو.

(فَٱجۡتَبَٰهُ): (أي اصْطَفَاهُ) هەڵیبژارد.

(لَيُزۡلِقُونَكَ): (زَلَـقَ: دَحَـضَ، وَزَلِقَـت رِجْلُـهُ، وَأَزْلَقَهَـا غَيْـرهُ)، (زَلَـق): بـە مانـای شـوێنی خلیسـك، (زَلِقَـت رِجْلُـهُ) پێـی خلیسـکا، (أَزْلَقَهَـا غَيْـرهُ) جگـە لـە خـۆی خلیسـکاندی (لَيُزْلِقُونَـكَ) خەریکـن بتخلیسـکێنن، بـە نیـگای چاوەکانیـان، ئەوەنـدە بـە تووڕەیـی و پەسـتیی سـەرنجت دەدەن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــــزان!

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ لـە ئایەتەکانـی پێشـێدا، هـەم باسـی پێغەمبـەری خاتەمـی ﷺ کـرد، هـەم باسـی تۆمـەت و قسـەی پووچـی نەیارەکانـی کـردو، پێغەمبـەری کۆتایـی خـۆی بـە خاوەنـی ڕەوشـتی مـەزن پێناسـە کـردو، نەیارەکانـی بـە کۆمەڵێك سـیفەتی خـراپ، کـە سـەرجەم نـۆ سـیفەت بوون، پێناسـە کـردن، دوایی بەسـەرهاتی خاوەنانـی باخەکـەی گێڕایـەوە، ئنجـا لـە کۆتاییـدا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾، بـە دڵنیایـی بـۆ پارێـزکاران لـە لای پەروەردگاریـان، باخـە پـڕ نـاز و نیعمەتـەکان هـەن، واتـە: ئەگـەر لادەران و لاڕێیـان و تاوانبـاران، سـزاو جەزرەبـەی خـوا چاوەڕێیـان دەکات، بـەڵام پارێـزکاران ئەوانـەی خۆیـان پاراسـتوە، لە هەر شـتێك کـە خـوا پێـی ناخۆشـە، هـەر لـە کوفـرو شـیرك و نیفاقـەوە بگـرە، تاکـو گوناهـو تاوانـە گـەورەکان، بەڵکـو گوناهـە گچکەکانیـش، کـە گوناهـە گـەورەکان دوو جـۆرن: یـان چواندنـی ئەرکەکانـن، یاخـود شـکاندنی قەدەغەکانـن، زۆر کـەس وادەزانـێ گوناهـی گـەورە، تەنیـا کوشـتن و زینـاو درۆ و بوختـان و غەیبـەت و ئەوانەیـە، بـەڵام گوناهـی گـەورە بـەر لـەوەی شـکاندنی قەدەغـەکان بـێ، چواندنـی ئەرکەکانـەو، لـە ڕاسـتییدا بەهـۆی چواندنـی ئەرکەکانـەوە، مـرۆڤ قەدەغەکانیـش دەشـکێنێ، وەك

خـوای پەنهانـزانێ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾﴾العنكبـوت، بێگومـان نوێـژ قەدەغـە دەكات لـە هەرچـی گوناحـی ناقـۆڵاو خراپـە، كەواتـە: ئەگـەر نوێژكـەر بـووی و ئەركـی نوێـژت نەچوانـد، قەدەغـەی خراپـەو مونكەریـش ناشـكێنی.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ﴾، ئایـا ئێمـە ملكەچـان، وەك تاوانبـاران دادەنێیـن؟ واتـە: ناگونجـێ ئەوانـەی بـۆ خـوا ملكەچـن و بـە ڕێـی خـوادا دەڕۆن و، ئەوانـەی تاوانبـارو لادەرن، وەك یەكیـان مامەڵـە لەگـەڵ دا بكەیـن.

﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾، چیتانـە چـۆن دادوەریـی دەكـەن؟ لێـرەدا خـوا ﷻ بەڵگەیەكـی عەقڵیـی و زگماكیـی دەهێنێتـەوە، یـانی: هـەر بـە عەقـڵ و زگماكـی خۆتـان دەزانـن، كـە ناگونجـێ كەسـێك كـە بـۆ خـوا ملكەچـەو، كەسـێك كـە تاوانبارە، لـە یـەك تـەرازوودا دابنرێـن و، وەك یـەك مامەڵـە بكرێـن.

﴿أَمْ لَكُمْ كِتَـٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ﴾، ئنجـا كـە بەڵگـەی عەقڵییتـان نیـە، ئایـا بەڵگـەی نەقڵیـی و بەڵگـەی سرووشـتان هەیـە، یـان ئایـا كتێبێكتـان هەیـە كـە تێیـدا بخوێننـەوە؟.

چـی تێـدا بخوێننـەوە؟ ﴿إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾، كـە هەرچـی ئێـوە هەڵیبژێـرن، بۆتـان هەبـێ، ئایـا كتێبێكـی واتـان لەبـەر دەسـتەو خـوا كتێبێكـی وای دابەزانـدوە؟ ﴿أَمْ لَكُمْ أَيْمَـٰنٌ عَلَيْنَا بَـٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۙ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ﴾، یـان ئایـا ئێـوە سـوێندانێكتان[1] لەسـەرمان هـەن، كـە ئـەو سـوێندانە هەتـا ڕۆژی قیامەتـێ دەوام بكـەن، كـە هەرچـی ئێـوە بڕیـار بـدەن، بۆتـان هەبـێ، ئایـا سـوێندێكی وامـان بـۆ خـواردوون و بەڵێنێكـی وامـان پێـداون؟

---

(١) سوێندان: كۆی سوێندەو مانای (أَیمان) كۆی (یمین)ە،

﴿ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴾، لێیـان بپرسـە، کامیـان ئۆباڵـدارو کەفیلـی ئەوەیـە، کـە ئێمـە بەڵێنێکـی وامـان پێدابـن؟ واتـە: ئەمـە جۆرێکـە لـە توانـج تێگرتـن و گاڵتـە پێکـردن، کێیـان دەتوانـێ بڵـێ: مـن ئۆباڵـدارو کەفیلـی ئـەوەم کـە خـوا بەڵێنێکـی وای بـە ئێمـە داوە؟!.

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ فَلْيَأْتُوا بِشُرَكَائِهِمْ إِن كَانُوا صَادِقِينَ ﴾، یـان ئایـا هاوبەشـیان هــەن، (بـۆ خـوا دایاننـاون)، یـان: ئایـا هاوبەشـیان هــەن لـەو بیرۆکـەو بیـرو ڕایانـەدا، کەسیان هەیە بەشدار بێ لەگەڵیان، ئەگەر لە ڕاستانن با هاوبەشـەکانیان بێنـن، هاوبەشـەکانیان واتـە: ئەوانـەی کردوویانـن بـە هاوبـەش بـۆ خـوا لـە بەندایەتیـی بـۆ کردنـدا، یاخـود هاوبەشـەکانیان کـە هـاوڕاو هاوبەشـن لـەو بیـرو بۆچوونـە نەفامانـەو نەزانانـەدا.

﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى السُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴾، یەکسـەر خـوا ﷻ لـە دنیـاوە دەیانبـات بـۆ قیامـەت، کـە ئێـوە ڕۆژێکـی ئـاوا چاوەڕێتانـەو واز لـەو خۆهەڵخەڵەتاندنـە بێنـن، ئـەو شـتەی ئێـوە دەیڵێـن، پێچەوانـەی عەقـڵ و زگـماك و وەحیـی خوایـەو، هیـچ بەڵگەیەکتـان بەدەسـتەوە نیـە، کەواتـە: خۆتـان هەڵگـرن بـۆ ئـەو ڕۆژە، ئـەو ڕۆژەی لاق هەڵدەکـرێ و وەدەردەخـرێ و، بانـگ دەکرێـن بـۆ کڕنـووش بـردن، بـەڵام ناتوانـن، ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ ﴾، ئەمـە تەعبیرێکـە عـەڕەب بەکاریـان هێنـاوە بـۆ کاتـی سـەختیی و ناڕەحەتیـی، چونکـە عـادەت وایـە کەسـێك کـە دەکەوێتـە نێـو ناڕەحەتیـی، خـۆی هەڵـدەکاو خـۆی گـورج و گـۆڵ دەکات، بـۆ ئـەوەی لـە کاتـی ڕاکـردن، یـان لـە کاتـی پەلاماردانـدا، پۆشـاکەکەی لەبـەر لاقـی نەئاڵقـێ، یـان لـە کاتـی پەڕینـەوە بـە نێـو ئاوێکـدا، لاقـی هەڵکـردوە بـۆ ئـەوەی پۆسـاکی تـەڕ نەبـێ، گرنـگ ئەوەیـە لاق دەرخسـتن، تەعبیرێـك بـووە بـۆ سـەختیی و ناڕەحەتیـی، بۆیـە هیـچ پەیوەندیـی بـەوەوە نیـە کـە **(سَـاقٍ)** یەکێـك بـێ لـە سیفەتەکانی خـوا، وەك هەندێـك لەوانـە گوتوویانـە، کـە زێدەڕۆیـی دەکـەن لـە چەسپاندنی ئـەو سیفەتانەدا کـە پێیـان دەڵێـن: **(الصفـات الخبريـة)** وەك

(**عـین، وجـه، یـد**) ئەوانـە زێدەڕۆیـی دەكـەن و تێدەپەڕێنـن، چونكـە جـاری وایـە خـوا ﷻ تەعبیرێكـی بەكارهێنـاوە، مەبەسـتی پـێ سـیفەتێكی خـۆی نەبـووە، بـۆ وێنـە: ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾**الطـور ٤٨**، مەبەسـتی ئـەوە نیـە كـە خـوا چەنـدان چـاوی هـەن! هەروەهـا لـە شـوێنێكی دیكـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ٣٩ ﴾**طـه**، لێـرەدا بـە تـاك دەیهێنـێ، لـەوی دیكـەدا بـە كـۆ دەیهێنـێ، كەواتـە: مەبەسـت پێـی چاودێرییكـردن و ئـاگا لـێ بوونـە، یـان كـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ ﴾**الفتح: ١٠**، لێـرەدا خـوا ﷻ وشـەی (**یـد**) بـە تـاك هێنـاوە، هەروەهـا بـە دووانیشـی هێناوە: ﴿ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّ ﴾**ص: ٧٥**، دیسـان بـە كۆشـی هێنـاوە: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ٧١ ﴾**یـس ٧١**، ئنجـا ئایـا دەگونجـێ بگوتـرێ: خـوا دەسـتێكی هەیـەو، دووان و، كۆمەڵێـك دەسـتی هـەن؟ هەمـوو ئـەو تەعبیرانـە مەبەسـت پێیـان ئەوەیـە: چاكـەی خـوا بەسـەر ئەوانـەوە هەیـە، ئـەو تەعبیرانـەش لـە زمانـی عەرەبییـدا هاتـوون، وەك: (**لفـلانٍ یـدٌ عـليَّ**)، فڵانكـەس چاكەیەكی بەسـەر منـەوە هەیـە، ئنجـا كـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّ ﴾**ص: ٧٥**، واتـە: ئادەمـم بـە گرنگیـی پێدانـەوە خوڵقانـدوە، یەكێـك بـە یەكێكـی دیكـە دەڵـێ: بەدەسـتی خـۆم ئـەوەم كـرد، كـە مـەرج نیـە بـە دەسـتی خـۆی بووبـێ، یانـی: بـە گرنگیـی پێدانـەوە.

﴿ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ ﴾، بانـگ دەكرێـن بـۆ كڕنـووش بـردن، وەك سەرزەنشـتكردن و تەریـق كردنـەوەو شـەرمەزاركردن، دەگوتـرێ: كڕنـووش بـۆ خـوا بـەرن، بـەڵام ناتوانـن.

﴿ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ ﴾، چاوەكانیـان تـرس و لـەرز دایگرتـوون و زەبوونیـی دایپۆشـیون، كاتی خۆیـشی سـاغ بـوون و بانـگ دەكـران بـۆ كڕنـووش بـردن، واتـە: لـە ژیانـی دنیـادا، لـەو كاتـەدا سـاغ بـوون و دەیانتوانـی كڕنـووش بـەرن، كەچـی بانـگ دەكـران و كڕنووشـیان نەدەبـرد، ئێسـتاش كـە داوایـان لـێ دەكـرێ بـۆ زیاتـر شـەرمەزاركردن، ناتوانـن.

﴿ فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا الْحَدِيثِ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، لـه مـن و لـەو کەسـە گـەڕێ کـە ئـەم فەرمایشـتە بـە درۆ دادەنـێ، (بـۆ منـی لـێ بگـەڕێ)، بـێ ئـەوەی بـە خۆیـان بزانـن پەلکێشـیان دەکەیـن واتـە: پلـە پلـەو وردە وردە، واوەیـان دێنیـن بـەرەو سـزا.

﴿ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴾، هەروەهـا مۆڵـەت و بواریـان دەدەم، بێگومـان نەخشـەو پلانـی مـن زۆر بەهێـزو پتـەوە، بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ ئـەم گەردوونـە و ژیانـی مـرۆڤ لـە نێویـدا، هەمـووی بـە سیسـتم و یاسـا دانـاوە.

﴿ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴾، یـان ئایـا بۆیـە بـڕوا ناهێنـن، چونکـە کـرێ و پاداشـتێکیان لـێ داوا دەکـەی و، ئـەوان بەهـۆی ئـەو باجـەوە کـە لێیـان داوا دەکـەی و، بەهـۆی ئـەو زیانـەوە کـە لێیـان دەکـەوێ، بەهـۆی ئـەو ماڵـەوەی بەناهـەق لێیـان داوا دەکـەی، بارگرانـن {(**مُثْقَل**) یانـی: بـاری شـان گرانکـراو}، بۆیـە بـڕوا ناهێنـن؟

﴿ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴾، یـان {بۆیـە بـڕوا ناهێنـن} چونکـە نادیـارو پەنهانیـان لەلایـە، دەینووسـن، واتـە: ئایـا دەزانـن لـە قیامەتـێ بەهەشـت بـۆ ئـەوان هەیـە، وەك چـۆن بـۆ ملکەچـان بـۆ خـواو بـڕواداران هەیـە؟ نەخێـر هیـچ کام لـەو دوو ئەگـەرەش نیـە، هیـچ کام لـەم دوو پەرچەشـیان لـە ڕێ دا نیـن.

﴿ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴾، ئنجـا کـە حـاڵ ئاوایـە (ئـەی موحەممـەد ﷺ!) بـۆ بڕیـارو فەرمانـی پـەروەردگارت خۆڕاگربـەو وەك هاوەڵـی نەهەنگەکـە مەبـە، کاتێـك بـە پەسـتیی و بێزارییـەوە {لـە خەڵکەکـەی} - لـە خـوا - پاڕایـەوە، مەبەسـت پێـی یونوسـە سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ، کـە بەسـەرهاتەکەی: لـە سـووڕەتی یونوسـداو، لـە سـووڕەتی (**الأنبيـاء**)داو، لـە سـووڕەتی (**الصافات**)یـش دا، هاتـووەو، لـە چەنـد شـوێنێکی دیکـەش لـە قورئانـدا نـاوی هاتـوە، ئێمـە لـە تەفسـیری سـووڕەتی یونوسـدا هەمـوو ئـەو ئایەتانـەی لـە

بارەی یونوسەوە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، هاتوون، هێناومانن، کورتە باسێکمان لە بارەیەوە لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، کردوە، خوای میهرەبان بە ۆێغەمبەری کۆتایی دەفەرمووێ: تۆ وەك هاوەڵی نەهەنگەکە مەبە، لە کاتێکدا بە توورەیی و پشوو سواریی و پەستیی بانگی کرد، واتە: بانگی خوای پەروەردگاری کرد لە نێو زاری نەهەنگەکەدا.

﴿لَّوْلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ﴾، ئەگەر چاکەیەك لە پەروەردگاریەوە لە فریای نەهاتبایەو نەیگەشتبایە، فڕێ دەدرایە دەشتەوە لە حاڵێکدا کە سەرزەنشتکراوە، واتە: نەهەنگەکە دەری دەهاویشت و ئەو کاتەش گلەیی و سەرزەنشتی دەهاتە سەر.

﴿فَٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾، بەڵام پەروەردگاری هەڵیبژاردو، لە چاکەکانی گێڕا، بەهۆی ئەوەوە کە خوای بە پاکگرت و خەتای لە ملی خۆی کرد، وەك لە سوورەتی (**الأنبياء**)دا دەفەرمووێ: ﴿وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾﴾، بەو شێوەیە خوای بە پاکگرت و گوتی: بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە، پاکیی بۆ تۆ من لە ستەمکاران بووم، (کە پەلەم کردو خەڵکی نەینەوام بەجێ هێشت، بێ ئەوەی مۆڵەت لە تۆ وەربگرم ئەی خوای پەروەردگار!)، یونوس ئیجتیهادێکی کردوە لە بەرانبەر دەقێکدا کە خوا فەرموویەتی: خەڵکی نەینەوا بانگەواز بکە، بەڵام کە خەڵکەکە بە دەنگیەوە نەهاتوون، یاخود ئازاریان داوەو نارەحەتیان کردوە، توورە بووەو بەجێیهێشتوون، بێ ئەوەی مۆڵەت لە خوای پەروەردگار وەربگرێ، لەسەر ئەوەش خوا ﷻ لە سکی نەهەنگدا زیندانیی کرد، هەتا لەوێدا پەشێمان بووەوەو، پاکیی بۆ خوا دەربڕی و، دانی بەهەڵەو ستەمی خۆی داهێنا، ئنجا خوا ﷻ دەربازی کرد، دوایی پەروەردگاری هەڵیبژاردو گێڕاشی لە چاکان واتە: لە پێغەمبەران صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، چاکیی پێغەمبەران صەڵات و سەلامی

خوایان لەسەر بێ لە لووتکە دابووە، هیچکەس وەك پێغەمبەران پاك و چاك بۆ خوا صوڵحاو نەبووە.

﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴾، نیزیکە ئەوانەی بێبڕوابوون بە چاوەکانیان بتخلیسکێنن، واتە: هێندە بە تووڕەیی و پەستیی تەماشات دەکەن، خەریکن بە دیدەی چاوەکانیان بتخلیسکێنن، یاخود بتفەوتێنن، یاخود خەریکن چاوێنییت بکەن واتە: چاوت لێ بدەن، وەك دوایی باسی دەکەین، لە کاتێکدا گوێبیستی زیکر دەبن، گوێبیستی قورئان دەبن، لەو کاتەدا زیاتر ڕقیان لە تۆ هەڵدەستێ و بە چاوی پڕ ڕق و کین تەماشات دەکەن، یاخود دەیانەوێ چاوت لێ بدەن، وەك کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: بەچاوەوە بوو، یان چاو لێیدا، یان چاو و زار لێیدا، سەربارەش دەڵێن: بە دڵنیایی ئەو شێتە.

﴿ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾، لە حاڵێکدا (کە ئەم قورئانە) تەنیا بیرخەرەوەیە، ناوبانگ و شەرەف و پێگەی بەرزە بۆ تێکڕای جیهانییان، هەر کەسێك لە جیهانییان دەست بەم قورئانەوە بگرێ و لێی تێبگات و تێیدا پێ بگات، پێی بەرز دەبێتەوەو، پێی هۆشیار دەبێتەوەو، قورئان پەندو ئامۆژگارییە بۆ تێکڕای جیهانییان.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پارێزکاران جێگایان بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتەو، یەکسانکردنی مسوڵمانان و تاوانباران، دژی عەقڵ و زگماك و وەحییە، بێبڕوایان مەگەر بیرۆکە ئەفسانەییەکانیان، ئەگەرنا هیچ بنەمایەکیان نیە بۆ ئەو لاف لێ دانانەیان و بیرۆکەی ئەفسانەییش نابێتە بنەما بۆ هیچ شتێك:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، بە دڵنیایی بۆ پارێزکاران لە لای پەروەردگاریان باخە پڕ نازو نیعمەتەکان هەن، (**جَنَّات**) کۆی (**جَنَّة**)یەو بە مانای باخ و بێستان دێ، ئنجا باخ کە بە عەرەبیی (**بُستان**)ی پێ دەڵێن، بریتیە لەوەی درەختی میوەی تێدابێ، سەوزایی و تەرەکاری تێدابێ، دانەوێڵەی تێدابێ، گوڵ و گوڵزاری تێدابێ، ئەوانەی هەموویان تێدابن.

لێرەدا کە دەفەرموێ: (**جَنَّاتِ النَّعِيْم**)، (**جَنَّاتِ**): پاڵدراو (**مُضَاف**)ە، (**نَعِيْم**) پاڵ بۆ لادراو (**مُضَاف إِلَيْهِ**)ە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بەهەشتەکان بە نازو نیعمەتەکانەوە ناسراون، واتە: لەو باخانەدا تەنیا نازو نیعمەت هەیە بۆ کەسانێك، ئەو باخانە دەبنە موڵکیان.

٢)- ﴿ أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، {لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ حەوت بیرۆکەی پووچی بێبڕوایەکان دەخاتە ڕوو، ئەمە یەکێکیانە}، ئایا بۆ خوا ملکەچان وەك تاوانباران لێ دەکەین؟ ئەم پرسیارکردنە پرسیار کردنی سەرزەنشتکردن و بەهەڵە دانان و نکووڵیلێکردن (الإِسْتِفْهَام: للتَوْبِيْخ وَالتَّخْطِئَة والإنكار)، واتە: ناگونجێ بۆ خوا ملکەچان، وەك تاوانبارێك کە لە خوا یاخیین، مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ و ناگونجێ بیانخەینە تەرازوویەکەوەو پێکیان هەڵسەنگێنین، (أَيْنَ الثُّرَيَّاء مِنَ الثَّرَى) ئەستێرە لە کوێ و خۆڵ لە کوێ؟ وەك کوردەواریی دەڵێن: نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە، (ئاسمان: سەرێ، ڕێسمان: زەوی).

٣)- ﴿ مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴾[1]، چیتان لێهاتوە، چۆن بڕیار دەدەن؟ واتە: ئایا ئێوە عەقڵ و هۆشتان لە لای خۆتان ماوە؟ ئایا عەقڵ و هۆشتان تێکنەچووە؟ چیتانە کە بەم شێوە بڕیار دەدەن! چونکە کافرەکانی مەککە کاتێك تەماشای مسوڵمانانیان دەکرد، ڕەش و ڕووت و کۆیلەو بێ دەسەڵاتن، دەیانگوت: ئایا ئەوانە دەچنە بەهەشتێ و ئێمە دەچینە دۆزەخ؟ ئەگەر ئەوان بچنە بەهەشتێ، ئێمە لە پێش واندا دەچین، ئنجا خوا ﷻ بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەکەی ئەوان دەفەرموێ: ﴿ أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، ئایا ئەو بۆ خوا ملکەچانە، با ڕەش و ڕووت و سادەش بن، وەك ئەو تاوانبارانە تەماشا دەکەین، با دەوڵەمەند و دەسەڵاتداریش بن؟ بۆچی پێتان وایە تەرازوو و پێوەری لای خوا، وەك هی ئێوەیە، کێ دەوڵەمەند بێ، لە لای خوا خۆشەویستتر بێ و کێ دەسەڵاتدارتر بێ، لە لای خوا خۆشەویستتر بێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوڵەمەندییەکەی و دەسەڵاتەکەی بە زوڵم و ستەم و خۆسەپاندن و قۆرخکاریی و گەندەڵیی پەیدا کردوە؟ بۆیە دەفەرموێ: ﴿ مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴾، چ شتێکتان بۆ پەیدابووە، چۆن دادوەریی دەکەن، هەر لەبەر ئەوەی لە دنیادا ساماندارترن و بەدەسەڵاتترن، لەگەڵ ئەوەشدا کڕنووش بۆ خوا نابەن و ڕوو لە خوا ناکەن و، لەگەڵ ئەوەشدا پابەند نین بە شەریعەتی خواوە، لەگەڵ ئەوەشدا بڕواتان بە دیداری خوا نیەو، بڕواتان بە پێغەمبەری خوا و پەیامی خوا نیە، پێتان

---

(١) مَا لَكُمْ: أيُّ شَـيءٍ حَصَلَ لَكُمْ، چیتان بۆ پەیدا بووە؟

وایە لەگەڵ ئەو مسوڵمانانەدا یەکسانتان دەکەین؟ ﴿كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾، (**إسْتِفْهَامٌ إنْكَارِيٌّ لِحَالَة حكمه، وَهُوَ إسْتِفْهَام إنْكَارِيٌّ ثَانٍ**)، ئەمە پرسیارکردنێکی نکووڵیلێکرانەو ڕەخنە لێگرانەیە بۆ چۆنیەتیی دادوەریی کردنەکەیان، کە ئەمە دووەمین پرسیارلێکردنی نکووڵییلێکەرانە.

٤)- ﴿أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ﴾، یان ئایا ئێوە کتێبێکتان هەیە، نووسراوێکتان هەیە، تێیدا دەخوێننەوە، واتە: ئەگەر لە ڕووی عەقڵییەوە بەڵگەیەکتان بەدەست نیە، ئایا لە ڕووی نەقڵییەوە بەڵگەیەکتان بەدەستەوە هەیە، ئایا کتێبێکی خواتان لەبەر دەستدا هەیە، خوا شتێکی وای فەرمووبێ، کە چاك و خراپ، تاوانبارو فەرمانبەردار بۆ خوا، وەك یەك بن؟ (**تَدْرُسُون: الدَرْسُ تَناوُلُ أثَرِ العِلْم**)، (**درس**) بریتیە لەوەی شوێنەواری زانست و زانیاریی وەربگیرێ و، چونکە ئەگەر کەسێك بیەوێ شوێنەواری زانیاریی وەربگرێ و لەبەری بکات، دەبێ بیخوێنێتەوە، بۆیە لەوەوە وشەی (**تَدْرُسُون**) بە مانای (**تَقْرَؤُون**) خوێندن و لێکۆڵینەوەیەو، ئێستاش هەر بەکاردەهێنرێ، (**يَدْرُسُ**) واتە: دەخوێنێتەوەو لێی دەکۆڵێتەوەو لێی ورد دەبێتەوە، ئنجا ئەوەی پێشێ سەرزەنشتکردن و نکووڵییلێکردن لە قسەکانیان بوو، ئنجا دەگوازێتەوە بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوەی درۆ دەکەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ﴾ ئایا نووسراوێکتا هەیە کە تێیدا دەخوێننەوە؟.

٥)- ﴿إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾، کە بۆ ئێوە لەو کتێبەدا هەیە، هەرچی هەڵیبژێرن؟ ئایا کتێبێکی واتان هەیە، کە هەرچی ئێوە بتانەوێ و، دڵ پەسندی ئێوە بێ، لەوێدا هەبێ؟ (**هَذِهِ الجُمْلَة فـي مَوْضِعِ مَفْعُول تَدْرُسون، أي: تَدْرُسُونَ هَذهِ العِبَارَة**) ئەم ڕستەیە: ﴿إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ﴾ دەبێتە بەرکار بۆ (**تَدْرُسُون**) واتە: تێیدا دەخوێننەوە کە ئێوە هەرچی هەڵیبژێرن، بۆ ئێوە هەیە لەو کتێبەدا؟ کە بە دڵنیایی ئەمەش هەر بیرۆکەیەکی دیکەی ئەفسانەیی ئەوان بووە.

٦)- ﴿ أَمْ لَكُمْ أَيْمَنٌ عَلَيْنَا بَلِغَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴾، یان ئایا ئێوە سوێندانێکتان لەسەر ئێمە هەن، {سوێندمان بۆ خواردوون و بەڵێنمان پێداون}، هەتا ڕۆژی قیامەت، کە هەرچی بڕیار بدەن، بۆتان هەبێ؟ واتە: شتی وانیە.

ئەو دوو (إِنَّ)یە، ئەوەی پێشێ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴾ ئەوەی دووەم دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴾ هەقی خۆیان بوو (أَنَّ) بن و بگوترێ: (أَنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ)، و (أَنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ) بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە (ل) هەیە: (لَمَا تَخَيَّرُونَ) ئەوی دیکە (لَمَا تَحْكُمُونَ) لەبەر ئەوە فەتحەی هەمزەکە کراوە بە ژێر، چونکە ئەو (ل) تایبەتە بە (إِنَّ)وە، بۆیە سەر (**فتحة**)ی هەمزەکە کراوە بە ژێر (**كسْرة**).

٧)- ﴿ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَلِكَ زَعِيمٌ ﴾، لێیان بپرسە کامیان ئۆباڵداری ئەوەیە، واتە: کامیان کەفیلی ئەوەیە ئێمە سوێندێکی ئاوامان بۆ خواردوون، بەڵێنێکی ئاوامان پێداون، ئەمە جۆرێکە لە گاڵتە پێکردنیان، یاخود (**زَعِيمٌ**) یانی: سەرپەرشتیاری ئەوە کە بەڵێنی وایان پێدرابێ و سوێندێکی وایان بۆ خورابێ، واتە: وتەبێژ بە ناوی ئەو خەڵکەوە، کێیان وتەبێژە، یان کێیان سەرپەرشتیارە، یاخود کێیان ئۆباڵدارە، لێیان بپرسە؟

٨)- ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ فَلْيَأْتُوا بِشُرَكَائِهِمْ إِن كَانُوا صَدِقِينَ ﴾، یان ئایا هاوبەشانێکیان هەن (بۆ خوا لە پەرسترانی دا)، دەبا هاوبەشەکانیان بێنن ئەگەر لە ڕاستانن، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- ئایا پەرستراوانێکیان هەن، کە دەیانکەنە هاوبەش بۆ خوای بەرز؟.

ب- ئایا هاوبەشانێکیان هەن، کە لەو جۆرە بیروبۆچوونانەدا کەسانێك هاوڕایان بن و بەشداریان بن لەو جۆرە بیرکردنەوەیەدا؟ دەبا هاوبەشەکانیان بێنن، ئەگەر لە ڕاستانن.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَكُمْ أَيْمَنٌ عَلَيْنَا بَلِغَةٌ إِلَى يَوْمِ الْقِيَمَةِ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴾ (**بَالِغَةٌ أي: مُتَنَاهِيَةُ التَّوْكِيد**) واتە: پێی گەیبێتە ئەوپەڕی جەخت لەسەر کرانەوە،

**(أَيْـمَان)** کـۆی **(يَـمِيْن)**ە، بـەڵام مەبەسـت پێـی بەڵێـن و پەیمانـە، واتـە: بەڵێـن و پەیمانێـك بـە سـوێند جەختـی لەسـەر کرابێتـەوە **(عُهُـوْد مُؤَکَّـدَةٌ بِالأَيْمَـان)** یـانی: بەڵێـن و پەیمانانێکـمان پێدابـن کـە بـە سـوێندان جەختیـان لەسـەر کرابێتـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، واتـە: ئـەو بەڵێـن و پەیمانانـەی پێیانـدراون، تاکـو ڕۆژی قیامـەت، واتـە: تاکـو کۆتایـی بـڕ بـکات، ئایـا بەڵێنـی وامـان پێـداون؟ بـە دڵنیایـی نەخێـر، وەك گوتمـان: ئەمـە هەمـووی جۆرێکـە لـە گاڵتـە پێکـردن، واتـە: ئایـا ئێمـە بەڵێـن و پەیمانێکـی وامـان پێـداون، کـە سـوێندمان بـۆ خواردبـن، ئـەو بەڵێـن و پەیمانـە بـۆ ئێمـە پابەندکـەر بـێ، هەتـا ڕۆژی دوایـی؟ نەخێـر ئـەو بیرۆکانـەی ئـەوان هەموویـان ئەفسـانەیین و هیچیـان وانیـن.

لێرەدا خوا ﷻ چوار ئەگەری پووچی ئەو بێبڕوایانەی هێناون:

**یەکەم:** هەبوونی بەڵگەی عەقڵیی، وەك دەفەرموێ: ﴿ مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴾، چیتانە چۆن بڕیار دەدەن، واتە: هۆش و عەقڵتان لە کوێیە؟

**دووەم:** نەبوونی بەڵگەی نەقڵیی، وەك دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ ﴾، ئایا کتێب و نووسراوێکتان هەیە تێیدا بخوێننەوە؟ ئەوەشیان نیە.

**سێیەم:** ئەوە کە لەلایەن خواوە بەڵێنیان پێدرابێ: ﴿ أَمۡ لَكُمۡ أَيۡمَٰنٌ عَلَيۡنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمۡ لَمَا تَحۡكُمُونَ ﴾، ئایا بەڵێنتان پێدراوە، بەڵێنێکی وا کە بە سوێندان جەختی لەسەر کرابێتەوە، بەردەوام بێ تاکو کۆتایی؟ زۆر جاران: ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، تەعبیری پێ دەکرێ بۆ کۆتایی شتێك، نەخێر بەڵێنی ئاوایان پێ نەدراوە بە زارەکیی، واتە: نە بەڵگەی عەقڵییان هەیە، نە بەڵگەی نووسینیان هەیە، نە بەڵگەی زارەکیی، کە پەیمان و بەڵێنێکی وایان پێدرابێ.

**چوارەم:** ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَآءُ ﴾، ئایا هاوبەشیان هەن، هاوبەش لەو بیرو ڕایانەدا، یاخود هاوبەشێکانێك کە کردوویانن بە هاوبەشی خوا لە پەرستران دا؟.

پیتی (ف) کە دەفەرموێ: ﴿ فَلۡيَأۡتُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ ﴾ (ف: **فَصِيْحَة لأنَّهَا أفْصَحَت عَنِ شَرْطٍ مُقَدَّرٍ، أي: إنْ كَانَ ذَلِكَ كَذَلِكَ، فَلْيَأتُوا بشُرَكَائِهِم**) (ف) (**فصيحة**) یە چونکەم مەرجێکی مەزەننەکراو دەگەیەنێ، یانی: ئەگەر ئەوە بەو شێوەیە، دەبا هاوبەشەکانیان بێنن.

خاوەنی کتێبی: (**إعراب القرآن الكريم**)، (**محي الدين درويش**)[1] دەڵێ:

(**سَبْعَة اسْتِفْهَامَات وَقد خَرَجَت عَنْ مَعْنَاهَا الأصْلِي إلى الإنكَار وَالتَّوْبِيْخ والتَّقْرِيْع عَلى مَا أرْجَفُوا بِه مِنْ زَعْمِهِم: أنَّ الله فَضَّلنَا عَلَيْكُمْ في الدنيا، فَلَا بُدّ مِن أنْ يُفَضّلنَا عَلَيْكُم فِي الآخِرَة، أو عَلَى الأقَل إنْ لَمْ يَحْصُل التَّفْضِيل، فَلَا أقَلَّ مِن المُسَاواة: الإستِفهَام الأول:** ﴿ أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، **الإسْتِفهَام الثاني:** ﴿ مَا لَكُمۡ ﴾، **الإستِفهَام الثالث:** ﴿ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴾، **الإستِفهَام الرابع:** ﴿ أَمۡ لَكُمۡ كِتَٰبٞ فِيهِ تَدۡرُسُونَ ﴾، **الإستِفهَام الخامس:** ﴿ أَمۡ لَكُمۡ أَيۡمَٰنٌ عَلَيۡنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّ لَكُمۡ لَمَا تَحۡكُمُونَ ﴾، **الإستِفهَام السادس:** ﴿ سَلۡهُمۡ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴾، **الإستِفهَام السابع:** ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَآءُ فَلۡيَأۡتُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ ﴾).

لێرەدا خوا ﷻ حەوت پرسیاری کردوون کە لە مانای ئەسڵیی خۆیان براونەدەر، (تۆ کە پرسیار دەکەی، چاوەڕێی وەڵام دەکەی، بەڵام لێرەدا ئەو حەوت پرسیارە، هیچیان مەبەست پێیان ئەوە نیە چاوەڕێی وەڵام بێ، بەڵکو هەموویان) مەبەست پێیان: نکووڵیلێکردن و سەرزەنشتکردن و ڕەخنە لێگرتنە، لەسەر ئەو بیروبۆچوونە ئەفسانەییانەیان [ئەو کاتە هی زلەزلەکانی قوڕەیش، کە ئەم قوڕئانە لەو ژینگەو کۆمەڵگەیەدا دابەزیوە، بەڵام کافرە ملهوڕەکانی ئێستاو پێش ئێستاو دوای ئێستاش هەر دەگرێتەوە، هەروەك مسوڵمانە سادەکانی ئێستاو پێش ئێستاو دوای ئێستاش دەگرێتەوە]، کە دەیانگوت: خوا ئێمەی لە دنیادا بەسەر ئێوەدا هەڵبژاردوە، (ماڵ و سامان و دەسەڵاتی زیاتری پێداوین و

---

(١) ج١٠، ص(١٨١ ، ١٨٢).

دیارە ئێمە لە لای خوا خۆشەویستین)، کەواتە: دەبێ لە ڕۆژی دواییش دا هەر ئێمە بەسەر ئێوەدا هەڵبژێرێ، یان بەلای کەمەوە، ئەگەر هەڵیشمان نەبژێرێ، ئێمەش وەك ئێوە هەر دێینە بەهەشت و لەگەڵ ئێوەدا یەکسان دەبین، بۆیە خوا ﷻ حەوت جۆرە پرسیارکردنی لێرەدا هێناون:

**یەکەم:** دەفەرموێ: ﴿ أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ ﴾، ئایا مسوڵمانان و ملکەچان، وەك تاوانباران یەکسان دەکەین؟.

**دووەم:** ﴿ مَا لَكُمْ ﴾، چیتانە، عەقڵتان لە کوێیە؟

**سێیەم:** ﴿ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾، چۆن دادوەریی دەکەن و بڕیار دەدەن؟

**چوارەم:** ﴿ أَمْ لَكُمْ كِتَابٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، ئایا کتێب و نووسراوێکتان هەیە، تێیدا دەخوێننەوە، کە هەرچی ئێوە هەڵیبژێرن، بۆ ئێوە هەیە؟.

**پێنجەم:** ﴿ أَمْ لَكُمْ أَيْمَانٌ عَلَيْنَا بَالِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾، ئایا ئێوە سوێندانێکتان لەسەر ئێمە هەن، واتە: بەڵێن و پەیمانێك کە بە سوێندان دڵنیا کرابنەوە، کە هەتا کۆتایی هەرچی ئێوە بتانەوێ بۆ ئێوە هەبێ؟

**شەشەم:** ﴿ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴾، لێیان بپرسە کامیان ئۆباڵدارو دەمڕاستی ئەوەیە؟.

**حەوتەم:** ﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ فَلْيَأْتُوا بِشُرَكَائِهِمْ إِن كَانُوا صَادِقِينَ ﴾، یان ئایا هاوبەشانێکیان هەن، لە بیرو ڕایەکانیاندا، یاخود هاوبەشانێکیان هەن لە پەرستنی خوادا، با هاوبەشەکانیان بێنن ئەگەر ڕاست دەکەن.

مەسەلەی دووەم:

لـە ڕۆژی دواییـدا کـە تەنگانەیەکـی گەورەیـە بـۆ بێبڕوایـان، داوایـان لـێ دەکـرێ کڕنـووش بـۆ خـوا ببـەن، بـەڵام بۆیـان نالـوێ و چاویـان تـرس و لـەرزو زەبوونیـی دایدەپۆشـێ، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە لـە دنیـادا سـاغ و سـەلامەت بـوون و داوایـان لـێ دەکـرا کڕنـووش بـەرن، بـەڵام کڕنووشـیان بـۆ خـوا نەبـردو بەندایەتییـان بـۆ خـوا نەدەکـرد:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾، ئەو ڕۆژەی لاق دەردەخرێ، خوێندراویشەتەوە: (**يَوْمَ تَكْشِفُ عَنْ سَاقٍ**)، ئیبنو عەبباس وای خوێندۆتەوە، ئەو ڕۆژەی لوولاك دەردەخات، یانی: سەختی لاق دەردەخات، جارێ ئێمە کۆی بڕگەکان شی دەکەینەوە، دوایی هەڵوێستەیەکی تایبەت لەبەردەم ئەم ڕستە موبارەکەدا دەکەین.

(**الطبري**) دەڵێ: (**يَقُولُ تَعَالَى ذِكْرُهُ:** ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾، **قَالَ جَمَاعَةٌ مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ مِنْ أَهْلِ التَّأْوِيلِ: يَبْدُو عَنْ أَمْرٍ شَدِيدٍ**)، ئەو ڕۆژەی لاق هەڵدەکرێ، تەبەری دەڵێ: کۆمەڵێك لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان، لە ئەوانەی قورئانیان ڕوونکردۆتەوە، گوتوویانە: (**يَبْدُو عَنْ أَمْرٍ شَدِيدٍ**) ئەو ڕۆژە بارودۆخێکی سەخت دێتە گۆڕێ و دەردەکەوێ.

**٢)-** ﴿وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ﴾، بانگ دەکرێن بۆ کڕنووش بردن، بەڵام ناتوانن، هەڵبەتە قیامەت شوێنی بەندایەتیی بۆ خوا کردن و ئەرکدار (**مكلّف**) بوون نیە، بەڵام ئەمە بۆ سەرزەنشتکردنیانە، ئەگەرنا دنیا شوێنی تێدا تاقیکرانەوەو داوا

لێکرانی کڕنووش بردنەو دواڕۆژ هی ئەوە نیە، بەڵام تەنیا وەك سەرزەنشتکردن و شەرمەزارکردن، داوایان لێ دەکرێ کڕنووش بەرن، خواش ﷻ دەزانێ کە ناتوانن.

٣)- ﴿خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾، چاوەکانیان ترس و لەرز دایگرتوون، چاوەکانیان بە ترس و لەرزن، (**خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ**)، لە ڕووی ڕێزمانییەوە لە شوێنی (**حال**) دایە، بۆیە مەنصووبە (**خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ أي: ذَلِيْلَةً مُتَوَاضِعَةً**) چاوەکانیان زەبوون و ملکەچن.

٤)- ﴿تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞ﴾، زەبوونییان بەسەر هەڵکشاوە، (**أي: تَعْلُوهُمْ وَتَغْشَاهُم ذِلَة وَحَسْرَة وَنَدَامَة**)، زەبوونیی و پەشێمانیی و داخ و خەفەت و مەینەتیی دایپۆشیوون.

٥)- ﴿وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە (لە ژیانی دنیادا) بانگ دەکران بۆ کڕنووش بردن و ساغ و سەلامەتیش بوون، (**أي: مُعَافُوْن مِنَ العِلَلِ أصِحّاء**) هیچ نەخۆش نەبوون و ساغ و تەندروست بوون، بانگ دەکران کڕنووش بۆ خوا بەرن لە دنیادا، بەڵام کڕنووشیان نەدەبرد، لێرە کە پێیان دەگوترێ: کڕنووش بۆ خوا ببەن، تەنیا وەك سەرزەنشتکردنە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار دەزانێ کە لێرە ناتوانن، چونکە لە دنیادا نەیانکردوە.

## هەڵوەستەیەک لە بارەی ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾ ەوە

لە بارەی ئەم ڕستە موبارەکەوە کە گوتمان: هەڵوێستەیەکی لە بارەوە دەکەین ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾، **(القرطبي)** دەڵێ: **(وَقِيلَ: سَاقُ الشَّيْءِ أَصْلُهُ الَّذِي بِهِ قِوَامُهُ، كَسَاقِ الشَّجَرَةِ وَسَاقِ الْإِنْسَانِ)**، گوتراوە: (ساق) بنەڕەت و کەلەشی شتە، وەك قەدی درەخت و لوولاکی مرۆڤ.

ئنجا ئایا ئەو تەعبیرە مەبەست پێی چییە؟! تەبەڕیی لەو بارەوە لە سێ لە زانایانەوە، سێ قسەی هێناون:

**یەکەم:** لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: (﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾ **قَالَ: هُوَ يَوْمُ حَرْبٍ وَشِدَّةٍ**)، **(جامع البيان: ٣٤٧٦٦، عَنِ ابْنِ عَبَّاس** ﷻ**)**، ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾، گوتوویەتی: ئەم تەعبیرە بۆ ڕۆژی جەنگ و ڕۆژی سەختیی بەکارهاتوە، یانی: قیامەتیش ڕۆژێکی سەختەو دژوارە، مەبەست پێی ئەوەیە.

**دووەم:** **(وَكَانَ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﷻ **يَقُول: يُكْشَفُ عَنْ أَمْرٍ عَظِيمٍ، أَلا تَسْمَعِ العرب تَقُول: وَقَامَتِ الْحَرْبُ بِنَا عَنْ سَاقٍ)** **(جامع البيان: ٣٤٧٦٨)**.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷻ دەڵێ: **(يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ)** واتە: کارێکی مەزن دەردەکەوێ، چونکە عەڕەب گوتوویانە: **(وَقَامَتِ الْحَرْبُ بِنَا عَنْ سَاقٍ)** جەنگ کەوتە سەر پێ بۆ ئێمە، واتە: جەنگ بەرپابوو و هاتە سەر لاق.

**سێیەم:** **(عَنْ مُجَاهِدٍ:** ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾ **قَالَ: شِدَّةُ الْأَمْرِ وَجِدُّهُ، قال ابْنُ عَبَّاسٍ** ﷻ**: هِيَ أَشَدُّ سَاعَةٍ فِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)** **(جامع البيان: ٣٤٧٧١)**.

موجاهید گوتوویەتی: بریتییە لە سەختیی کارێك و جیددیی بوونی، ئیبنو عەبباس ﷻ دەڵێ: ئەو کاتە سەختترین کاتە لە ڕۆژی قیامەتدا.

(**القرطبي**) لە بارەی ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾ ەوە، دەڵێ: (**وَقَرَأَ» ابْنُ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾ **بِتَاءِ مُسَمَّى الْفَاعِلِ، أَيْ تَكْشِفُ الشِّدَّةُ أَوِ الْقِيَامَةُ، عَنْ سَاقِهَا، كَقَوْلِهِمْ: شَمَّرَتِ الْحَرْبُ عَنْ سَاقِهَا، قَالَ الشَّاعِرُ: فَتَى الْحَرْبِ إِنْ عَضَّتْ بِهِ الْحَرْبُ عَضَّهَا ... وَإِنْ شَمَّرَتْ عَنْ سَاقِهَا الْحَرْبُ شَمَّرَا**).

واتە: (**ابن عباس**) بە (**تَكْشِفُ عن ساقٍ**)ی خوێندۆتەوە، واتە: سەختیی یان قیامەت لاقی هەڵدەکات، وەك گوتراوە: (**شَمَّرَتِ الْحَرْبُ عَنْ سَاقِهَا**) جەنگەکە لاقی خۆی دەرخست، شاعیریش گوتوویەتی: (**فَتَى الْحَرْبِ إِنْ عَضَّتْ بِهِ الْحَرْبُ عَضَّهَا ... وَإِنْ شَمَّرَتْ عَنْ سَاقِهَا الْحَرْبُ شَمَّرَا**) گەنجی جەنگ ئەگەر جەنگ گەزی ئەویش دەیگەزێ و، ئەگەر لاقی خۆی دەرخست ئەویش لاقی خۆی بۆ هەڵدەکا، پێی بۆ هەڵدەکاو، خۆی بۆ گورج و گۆڵ دەکات.

هەر (**القرطبي**) دەڵێ: (**وَعَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما **أَيْضًا وَالْحَسَنُ وَأَبِي الْعَالِيَةِ» تُكْشَفُ» مَعْنَى يُكْشَفُ وَمِنْهُ: أَكْشَفَ الرَّجُلُ فَهُوَ مُكْشَفٌ**)، ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما و حەسەنی بەصڕایی و ئەبولعالیە خوێندوویانەتەوە: (**تُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ**) چونکە هەر شتێك لە جەستەی مرۆڤدا دووان بێ، مێینەی مەجازیی (**مؤنث مجازي**) یە، وەك چاو و دەست و ساق و گوێ، خوێندراوەتەوەش: (**تُكْشِفُ عَنْ سَاقٍ**) ئەو کاتەش لە: (**أَكْشَفَ**)ەوە هاتوە (**أَكْشَفَ، يُكْشِفُ، فَهُوَ مُكْشَفٌ**)، دەریخست، دەری دەخات، ئەو دەرخراوە.

شەوکانیی دەڵێ: (**قَالَ ابْنُ قُتَيْبَةَ: أَصْلُ هَذَا أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا وَقَعَ فِي أَمْرٍ عَظِيمٍ يَحْتَاجُ إِلَى الْجِدِّ فِيهِ شَمَّرَ عَنْ سَاقِهِ، فَيُسْتَعَارُ الْكَشْفُ عَنِ السَّاقِ فِي مَوْضِعِ الشِّدَّةِ**) واتە: ئیبنو قوتەیبە گوتوویەتی: ڕیشەی ئەم تەعبیرە لەوەوە هاتوە، کە پیاو کاتێك دەکەوێتە کارێکی مەزنەوەو پێویستیی بەوە دەبێ تێیدا زۆر هەوڵ بدات، لاقی خۆی هەڵدەکات، ئنجا لێرەدا لاق هەڵکردن، خوازراوەتەوە بۆ هەر شتێك سەخت بێ.

کەواتە: ﴿يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ﴾ هيچ پەيوەنديى بە خواى پەروەردگارەوە نيە، كە ئەوە سيفەتێكى خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بێ، خوا نەيفەرمووە: (**يَوْمَ أَكْشِفُ عَنْ سَاقٍ**)، ئەو ڕۆژەى لاق هەڵدەكەم!، ئەو ڕۆژەى لاق هەڵدەكرێ واتە: ڕۆژێكى سەخت و دژوارە، عەرەب ئەو تەعبيرەيان بەكارهێناوەو، هيچ پەيوەنديى بە يەكێك لە سيفەتەكانى خواى بەرزو مەزنى بێ وێنەوە، نيەو هەر مشت و مڕێك لەو بارەوە بێ پاساوەو، خواى بەرزو بێ وێنە بە شێوازو تەعبيرى ديكە باسى سيفەتەكانى خۆى دەكات.

مەسەلەی سێیەم:

**هەڕەشەکردنی خوا لە بێبڕوایان و ڕوونکردنەوەی پەلکێشکردنی بۆیان و، بوار پێدانی بۆیان و، نەبوونی هیچ پەرچ و لەمپەرێك لەبەردەم بڕوا هێنانیان دا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا الْحَدِيثِ ۖ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمْلِي لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿فَذَرْنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا الْحَدِيثِ﴾، لە من و لەو کەسە بگەڕێ کە بڕوای بەم فەرمایشتە نیە، ئەم فەرمایشتە بە درۆ دادەنێ، ﴿بِهَٰذَا الْحَدِيثِ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی قورئان بێ، دەشگونجێ مەبەستی پێ ئەو قسەیە بێ، کە باسی زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشتی قیامەت دەکات، کە ئەویش هەر لە قورئاندا هەیە، لە من و لەو گەڕێ، واتە: بۆ منی لێ گەڕێ و وازی لێ بێنە، بزانە چۆنی سزا دەدەم!.

٢)- ﴿سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن پەلکێشیان دەکەین، واتە: پەلکێشیان دەکەین بەرەو سزا، (**الْإِسْتِدْرَاجُ: اسْتِنْزَالُ الشَّيْءِ مِنْ دَرَجَةٍ إِلَى أُخْرَى فِي مِثْلِ السُّلَّمِ**)، (**اسْتِدْرَاجْ**): ئەوەیە شتێك پلە پلە بێنیە خوارێ، وەك چۆن بە پەیژەو قادرمەیەك دا دەیهێنیە خوارێ، واتە: منیش ئاوا پەلکێشیان دەکەم و لە سزا نیزیکیان دەخەمەوە، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، چونکە مرۆڤ بێ ئەوەی هەست پێ بکات، وردە وردە بەرەو مەرگ دەڕوات، بە نسبەت بێبڕوایانەوە بەرەو مەرگ و دوایی بەرەو قۆناغی بەرزەخ، کە تێیدا سزا دەدرێن و، دوایی قۆناغی قیامەت.

٣)- ﴿وَأُمْلِي لَهُمْ﴾، مۆڵەتیشیان دەدەم، ڕستیان بۆ درێژ دەکەم، (**وأُمْلِي: مُضَارِعُ أَمْلَى، مَقْصُوراً بِمَعْنَى أَمْهَلَ وَأَخَّرَ، وَهُوَ مُشْتَقٌّ مِنَ الْمَلَا مَقْصُورًا، وَهُوَ الْحِينُ وَالزَّمَنُ، وَمِنْهُ قِيلَ**

لِلَّيْلِ وَالنَّهَارِ: الْمَلَوَانِ، فَيَكُونُ أَمْلَى بِمَعْنَى طَوَّلَ فِي الزَّمَانِ، وَمَصْدَرُهُ إِمْلَاءٌ) وشەی (أُمْلِي) کرداری (مُضَارِعٌ)ە، لە کرداری (أَمْلَى)وە، هاتوە، (بِمَعْنَى أَمْهَلَ وَأَخَّرَ) واتە: مۆڵەتی داو دوایخست، (أَمْلَى)ش داتاشراوە لە وشەی (مَلَا)وە، بەبێ هەمزە کە بە مانای کات دێ، بۆیە بە شەو و ڕۆژان گوتراوە: (الْمَلَوَانِ) واتە: دوو کاتەکان، ئنجا (أَمْلَى) (بِمَعْنَى طَوَّلَ فِي الزَّمَانِ) واتە: کاتیان دەدەمێ یان ڕستیان بۆ درێژ دەکەمەوەو مۆڵەتیان دەدەم، چاوگەکەی (إملاء)ە.

٤)- ﴿إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ﴾، بە دڵنیایی فێڵی من، (نەخشەی من) زۆر بەهێزو پتەوە.

٥)- ﴿أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ﴾، یان ئایا تۆ داوای کرێ و پاداشتیان لێ دەکەی، (بۆیە بڕوا ناهێنن)، ئەوان لەبەر باجدان بارگرانکراون و باری شانیان قورس بووە؟ (مُثْقَل) واتە: بارگرانکراو، شانگرانکراو، (الْمُثْقَلُ: الَّذِي حُمِّلَ عَلَيْهِ شَيْءٌ ثَقِيلٌ)، (مُثقَل) کەسێکە شتێکی قورسی خرابێتە سەر شان.

٦)- ﴿أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ﴾، {یان بۆیە بڕوا ناهێنن} چونکە پەنهانیان لە لایەو ئنجا ئەوان دەینووسن، (دەزانن کە سەرەنجامی چاکیان هەیە، بۆیە بڕوا ناهێنن)؟، (أي: أعِنْدَهُمْ عِلْمُ الغَيْب)، ئایا زانیاریی پەنهانیان لە لایە، وشەی (عِلْمُ) کە پاڵدراو (مضاف)ە، قرتێنراوە، چونکە بەڕەوت و سەلیقە دەزانرێ، ئایا پەنهان دەزانن، وشەی (عِنْدَهُم) کە پێشخراوە، بۆ ئەوەیە کە تایبەتمەند بوون بگەیەنێ، واتە: ئایا زانیاریی پەنهان تەنیا لە لای ئەوانەو دەینووسن؟ (يَكْتُبُونَ: يَفْرِضُونَ وَيُعَيِّنُونَ) پێویستی دەکەن و دیاریی دەکەن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾البقرة: ١٨٣، (أي: فَرَض وأَوجَبَ)، کەواتە: ئایا ئەوان زانیاریی پەنهانیان لەلایە و بەکەیفی خۆیان بۆ خۆیانی دەنووسن، سەرەنجامیان چۆن دەبێ و چۆن نابێ؟ یاخود: ئایا زانیارییە پەنهانەکە کە لەلایانە دەینووسن بۆ یەکدی؟ نەخێر نە تۆ بەرانبەر و قەرەبوویان لێ داوا دەکەی، تاکو باری سەر شانیان گران بکەی، بۆ ئەوەی بڕوا نەهێنن و، نە زانیاریی پەنهانیشیان لە لایە کە بەکەیفی خۆیان بۆ خۆیانی بنووسن، کەواتە: بڕوا نەهێنانەکەیان هیچ کۆسپ و لەمپەرو پەرچێکی لەبەردەم دا نیە.

## مەسەلەی چوارەم:

**فەرمانكردنی خوا بە پێغەمبەری خاتەم كە بۆ فەرمانی خوا خۆڕاگر بێ و، لە پەلەكردن و كەم حەوسەلەیی دا، وەك یونوسی هاوەڵی نەهەنگەكە نەبێ، كە بە دڵپڕیی و بێزاریی لە خوا پاڕایەوەو، ئەگەر چاكەی خوا فریای نەكەوتبایە، بە سەرزەنشتكراویی فڕێ دەدرایە ساراو دەشت، بەڵام بەهۆی ژیوانبوونەوەو پاڕانەوەیەوە، خوا هەڵیبژارد و لە صاڵحانی گێڕا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾ لَّوْلَا أَن تَدَارَكَهُ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِ لَنُبِذَ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ ﴿٤٩﴾ فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿٥٠﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ﴾، خۆڕاگربە بۆ حوكمی پەروەردگارت، واتە: بۆ فەرمانی پەروەردگارت، كە پەروەردگارت تۆی ناردوە پەیامی خوا بگەیەنی، تەحەممولی ناڕەحەتییەكانی گەیاندنی پەیامی خوا بكە، یاخود: خۆت ڕابگرە، هەتا دادوەریی پەروەردگارت لە ڕۆژی دواییدا دێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی فەرمانی پەروەردگار بێ، بە ناردنی پێغەمبەری كۆتایی، بەوە كە پەیامی خوا بگەیەنێ.

٢)- ﴿وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ﴾، وەك هاوەڵی نەهەنگەكە مەبە، كە یونوسی كوڕی مەتتایە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، (**الصَّاحِبُ: الَّذِي يَصْحَبُ غَيْرَهُ، أَيْ يَكُونُ مَعَهُ فِي بَعْضِ الْأَحْوَالِ أَوْ فِي مُعْظَمِهَا**)، (**صاحب**): ئەو كەسەیە كە هاوەڵیی كەسێك دەكات، هاودەمی دەبێ و لەگەڵی دەبێ، لە هەندێك لە كاتەكان، یان لە زۆربەی كاتەكاندا، ئنجا لەبەر ئەوەی یونوسیش صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، ماوەیەك لەگەڵ نەهەنگەكە دابوو، بۆیە خوا بەو ناوە، ناوی هێناوە.

٣)- ﴿إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ﴾، كاتێك پاڕایەوەو بانگی (پەروەردگاری) كرد، لە حاڵێكدا كە پڕ بوو لە تووڕەیی و پەستیی، یاخود پڕبوو لە مەینەتیی و ناڕەحەتیی و پەشێمانیی.

بەهۆی ئەوەوە كە بەبێ مۆڵەت و بەبێ بواردانی خوای پەروەردگار ئەو خەڵكەی بۆ لایان نێررابوو، كە خەڵكی نەینەوا بوون، وەك لە فەرمایشی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بەجێیهێشتوون، وشەی (**مَكْظُومُ**) لەسەر كێشی (**مفعول**) لە (**كَظْم**)ەوە هاتوەو، ئەسڵی خۆیشی لە (**كَظَم**)ەوە هاتوە، (**كَظَم: يَعْنِي مَخْرَجَ النَّفَس**)، ئەو شوێنەی هەناسەی لێوە دەردەچێ، ئنجا ئەگەر مرۆڤ قوڕگی بگیرێ، مانای وایە هەناسەكەی حەپس دەبێ، لە بنەڕەت دا لەوەوە هاتوە كە كوندەو مەشكەیەك پڕ بكەی لە شلەمەنییەك و لە ئاوێك و دوایی زارەكەی ببەستی، دەگوترێ: (**كَظَمَ السِّقَاء**) واتە: مەشكەكەی پڕ كردو زارەكەی بەست، ئنجا مرۆڤیش ئەگەر هەناسەی بگیرێ، یان هەناسەی حەپس بكات، یاخود تووڕەییەك لە دڵی داهەبێ و دەری نەبڕێ، (**مكظوم**)ی پێ دەگوترێ، بەڵام ئەگەر ناچار كرابێ تووڕەییەكەی خۆی حەپس بكات (**كَاظِم وكَظِيم**)ی پێ دەگوترێ: ئەگەر خۆی تووڕەییەكەی خۆی حەپس كردبێ، یاخود هەناسەی خۆی ڕاگرتبێ، (**كَاظِم وكَظِيم**) یش ناوی بكەر (**إسم فاعل**)ن.

٤)- ﴿لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ﴾، ئەگەر چاكەی پەروەردگاری لە فریای نەكەوتبایەو پێی نەگەیبایە، فڕێ دەدرایە دەشت، بە سەرزەنشتكراویی و لۆمەكراویی، (**التَّدَارُكُ: تَفَاعُلُ مِنَ الدَّرَكِ بِالتَّحْرِيكِ وَهُوَ اللَّحَاقُ، وَالنَّبْذُ: الطَّرْحُ وَالتَّرْكُ**)، ﴿لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ﴾، (**تدارك**) تەفاعولە لە (**دَرَك**) و بە مانای پێگەیشتن دێ، واتە: ئەگەر چاكەو بەزەیی خوا پێی نەگەیشتبایە، (**النَّبْذُ: الطَّرحُ وَالتَرَكُ**)، (**نَبْذ**) فڕێدان و وازلێهێنانە، (**لَنُبِذ بالعراء**) یانی: فڕێ دەدراو وازی لێ دەهێنرا لە دەشتدا، لە حاڵێكدا لۆمە كراوەو سەرزەنشتكراوە، لەبەر ئەوەی فەرمانی خوای شكاندوە.

(**العَـرَاء: الْفَضَـاءُ الْخَـالِي**)، (**عَـراء**) شـوێنێكی چۆڵـە كـە هیچـی لـێ نەبـێ، یـان هیـچ شـتێكی پۆشـەری لـێ نەبـێ بـۆ مـرۆڤ.

٥)- ﴿ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، سەرەنجام پەروەردگاری هەڵیبژاردو لە بەندە چاکەکانی گێڕا.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، هەرچەندە وشەی نیعمەت هاتووە، بەڵام نەیفەرمووە: (**تَدَارَكتهُ**) کردارەکە بۆیە بە نێر (مُذكَّر) هاتووە، چونکەی وشەی (**نعمة**) مێینەی مەجازییەو مێینەی ڕاستەقینە نیە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ ﴾، (ف)ەکە ڕوونکەرەوە (**فَصيحَة**)یە: (**وَفَّقَهُ اللهُ لِلتَّوْبَة وَالتَّسْبِيْحِ وَالإعْتِرافِ بَالخَطَإِ، فَاجْتَبَاهُ**)، خوا ﷻ تەوفیقی دا پەشێمان بێتەوەو، خوا بە پاك بگرێ و، دان بە هەڵەی خۆی دابێنێ، لە ئەنجامی ئەوەشدا خوا هەڵیبژارد، لە چاکانی گێڕاو خستیە ڕیزی بەندە چاکەکانەوە، کە بە پلەی یەکەم: پێغەمبەرانن صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**خستنە ڕووی بوغزو کینەی بێڕەزای کافران بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ لە کاتی بیستنی قوڕئانداو، تۆمەتبارکردنیان بۆی بە شێتیی، لە حاڵێکدا کە قوڕئان بیرخەرەوەی سەرجەم مرۆڤایەتییە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٥٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِن يَكَادُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَارِهِمْ﴾، نیزیکە ئەوانەی بێبڕوابوون بە چاوەکانیان بتخلیسکێنن، کاتێك کە گوێبیستی زیکر (قوڕئان) بوون، (**لَيُزْلِقُونَكَ**) خوێندراوەتەوەش: (**لَيَزْلِقُونَكَ**)، (**زَلَقَ يَزْلِقُ، وَأَزْلَقَ يُزْلِق، زَلَقَهُ وَأَزْلَقَهُ، زَلَقًا وَإِزْلَاقًا أي: أَزَالَهُ عَنْ مَكَانِه**) هەم وشەی (**زَلَق**)، هەم وشەی (**أَزلَق**) هەردووکیان بە تێپەڕێنەر بۆ بەرکار (**المتعدّي إلى المفعول**) هاتوون، (**زَلَقَهُ**)، واتە: خلیسکاندی (**وَأَزْلَقَه**)ش واتە: خلیسکاندی، بۆیەش بەهەردوو شێوەکە خوێندراوەتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَكَادُ﴾، (**إِنْ**) (**إِنْ: الْمُخَفَّفَةِ مِن المُثَقَّلة للتَأكِيْد**)، (**إِنْ**) لە ئەسڵدا لە (**إِنَّ**)ەوە هاتوە، (**إِنَّ المُثَقَّلة**) قورسکراو، بەڵام لێرەدا سووککراوەو هەر بە مانای جەختکردنەوەیە، ئنجا جیاوازیی نێوان (**إِنْ**) ئەگەر بۆ لابردن (**نَفي**) و بە مانای (**ما**) بێ و، ئەگەر بۆ جەختکردنەوە بێ، (ل)ە: (**لَيُزْلِقُونَكَ**)، بەهۆی ئەو لامەوە دەزانین ئەو (**إِنْ**)ە (**مُخَفّفة**)یە لە (**مُثَقَّلَة**) و جەختکردنەوەیە، واتە: بە دڵنیایی نیزیکە ئەوانەی بێبڕوان بە چاوەکانیان بتخلیسکێنن.

٢)- ﴿لَمَّا سَمِعُوا الذِّكْرَ﴾، لە کاتێکدا گوێبیستی یادی خوا دەبن، یان گوێبیستی قوڕئان دەبن، (**لَمَّا ظرف لَيُزْلِقُونَكَ**)، (**لمّا**) کاتە بۆ وشەی (**لَيُزْلِقُونَكَ**) یان (**لَيَزْلِقُونَكَ**) لەو کاتەدا خەریکن دەتخلیسکێنن.

٣)- ﴿ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴾، دەشڵێن: بە دڵنیایی ئەو شێتە، واتە: موحەممەد ﷺ حاشای ئەو.

٤)- ﴿ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴾، ئەو (قورئان)ەش تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان، یاخود ناوو ناوبانگە بۆ جیهانییان، زیکر هەم بە مانای بیرخەرەوە دێ، واتە: ڕاستییەکانیان بیر دەخاتەوە، هەم بە مانای شەرەف و ڕێز و پایەی بەرز دێ، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (وَمَا هُوَ)، ڕاناوەکە بۆ موحەممەد دەچێتەوە، هەرچەندە باسی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاشکاویی نەکراوە، بەڵام بە سیاق دەزانرێ، کە دەفەرموێ: (إِنَّهُ لَمَجْنُونٌ) ئەمە دیارە ڕاناوەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتەوە، چونکە ئەو بووە زیکرەکەی خوێندۆتەوە، ئنجا هەندێك گوتوویانە: ڕاناوی (هُوَ)ش دەچێتەوە بۆ موحەممەد ﷺ و، موحەممەد بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، شەرەف و ڕێزە بۆ هەموو جیهانییان، هەردوو واتایەکەش گونجاون، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی قورئان بێ، چونکە لە چەند شوێنان دا، خوا ﷻ قورئانی بە زیکر ناوهێناوە: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾الحجر (٩).

کە لێرەدا دەفەرموێ: کافرەکان خەریکە بە چاوەکانیات بتخلیسکێنن: (لَيُزْلِقُونَكَ)، زانایان مانای ئەمەیان بە چەند شێوەیەك تەعبیر کردوە:

**یەکەم:** (**لَيَعْتَانُونَكَ بِعُيُونِهِمْ، فَيُزِيلُونَكَ عَنْ مَقَامِكَ الَّذِي أَقَامَكَ اللَّهُ**)، خەریکن بە چاویان چاوێنییت بکەن و چاوت لێ بدەن و، لەو شوێنەی خوا تۆی تێدا داناوە، لاتبەرن.

**دووەم:** (**أَيْ يَنْفُذُونَكَ مِنْ شِدَّةِ نَظَرِهِمْ**)، خەریکن بە چاوەکانیان تۆ کون بکەن.

**سێیەم:** (**يَصْرَعُونَكَ**)، بە چاوەکانیان بتخەن.

**چوارەم:** (**يَرْمُونَكَ**)، بە چاوەکانیان تۆ بنگێون و لێت بدەن.

**پێنجەم:** (**لَيُهْلِكُلُونَكَ**)، خەریکن بە چاوەکانیان بتفەوتێنن.

**شەشەم:** (**لَيَقْتُلُونَكَ**)، خەریکن بە چاوەکانیان بتکوژن.

بەڵام وشەی (**زَلَق**) كە لە سوورەتی (**الكهف**)دا هاتوە، واتە: شوێنێكی خلیسك و لووس كە خەڵك لێی بخلیسكێ، یانی: ئەوان خەریكن تۆ بخلیسكێنن و هەڵتبنگوێنن و بتكەوێنن.

(**القرطبي**) دەڵێ: (**وَأَنَّ مُرَادَهُمْ بِالنَّظَرِ إِلَيْهِ قَتْلُهُ، وَلَا يَمْنَعُ كَرَاهَةُ الشَّيْءِ مِنْ أَنْ يُصَابَ بِالْعَيْنِ عَدَاوَةً حَتَّى يَهْلِكَ**)، كە دەفەرموێ: بە چاوەكانیان خەریكن بتخلیسكێنن، مەبەستیان پێ كوشتنیەتی و، لەبەر ئەوەی زۆر ڕقیان لێی هەڵساوە، ئەمە ڕێگر نیە كە بە دوژمنایەتیی چاوی لێ بدەن هەتا دەفەوتێ.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مرۆڤ كاتێك چاو لە شتێك دەدات، كە پێی سەرسام بێ و خۆشیبوێ و پێی گرنگ و چاك بێ، بەڵام ئەوان كە ڕقیان لە موحەممەد ﷺ بووە، ناگونجێ چاوی لێ بدەن! بەڵام قورتوبیی دەڵێ: ئەوە ڕاست نیە، بەڵكو ڕق هەڵسان لە شتێك ڕێگر نیە لەوەی چاوی لێبدرێ، قسەكەی قورتووبییشم پێ ڕاستە.

## کورتە باسێک لە بارەی چاولێدانەوە

شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سووڕتی یوسوف، لە تەفسیری ئایەتی شەست و حەوت (٦٧)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغْنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍۖ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾یوسف، واتە: ئەی کوڕەکانم هەمووتان لە یەك دەرگاوە مەچنە ژوور (لە یەك دەروازەی شارەکەوە) و لە چەند دەروازەیەکی جیا جیاوە بچن، ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەستی یەعقووب عليه السلام ئەوەبووە کە بە چاوەوە نەبن، ئەو یازدە کوڕەی، کە یەکیان لە میسر بووە: یوسوف، بەڵام ئەو دەیە، دە کوڕ بە شان و شەوکەت پێکەوە بچنە ژوور شارێك، ترساوە بە چاوەوە بن و چاوێنیی بن.

لەوێ کورتە باسێکمان لە بارەی چاوو زارەوە کردوە، کە هەق و ڕاستەو، کاریگەریی هەیەو، ئەوەی لەوێ گوتوومانە دووبارەی ناکەینەوە، بەڵام لە بارەی ئەوەوە کە چاو لێدان، یان بە چاوەوە کردن، یان چاووزارلێدان، ڕاستە، چەند فەرمایشتێك دێنین ڕاستەوخۆ لە: (**المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص ١٠٤٣٤ و ١٠٤٣٥**)و، هەر بە کورتیی مانایان دەکەین:

(**ابن كثير**) لە ژێر ناوونیشانی: (**إصابة العين حق**) چاولێدان، یاخود: بەچاو ئەنگاوتن، یاخود: بەچاوەوە کردن، هەق و ڕاستە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەدا: ﴿ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَٰرِهِمْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون خەریکن بە چاوەکانیان تۆ بکەوێنن و بتخلیسکێنن و بتفەوتێنن، دەڵێ: (**وَفِي هَذِهِ الْآيَةِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الْعَيْنَ إِصَابَتُهَا وَتَأْثِيرُهَا حَقٌّ بِأَمْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، كَمَا وَرَدَتْ بِذَلِكَ الْأَحَادِيثُ الْمَرْوِيَّةُ مِنْ طُرُقٍ مُتَعَدِّدَةٍ كَثِيرَةٍ**)، واتە: لەم ئایەتەدا بەڵگە هەیە، لەسەر ئەوەی چاولێدان و بەچاوەوەکردن و کاریگەریی چاو، هەقەو چەسپاوە،

بـە فەرمـان و مۆڵەتـی خـوا عزوجـل، وەك لـەو بـارەوە چەنـدان فەرمایشـت گێڕراونـەوە، منیـش حـەوت دانـە لەوانـەی (**ابـن کثـیر**) هێناونـی، دەیانهێنـم:

فەرمـوودەی یەکـەم: {**عَـنْ بُرَيْـدَةَ بْـنِ الْحُصَيْـبِ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: «لَا رُقْيَـةَ إِلَّا مِـنْ عَـيْنٍ أَوْ حُمَّـةٍ»**} (**أخرجـه أحمـد: ١٩٩٢٢، وأبـو داود: ٣٨٨٤، والترمـذي: ٢٠٥٧، البخـاري: ٥٣٧٨، والبـزار: ٣٥٩٧**).

واتـە: بورەیـدەی کوڕی حوصەیـب گوتوویـەتی: پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: ڕوقیـەو دوعاکـردن نیـە، مەگـەر بـۆ چـاو یـان بـۆ ژاردار (دووپشـك، یـان مـار، کەسـێك پێـوەی درابـێ، یاخـود کەسـێك بـە چـاوەوە بووبـێ، ڕوقیـە بـۆ ئـەو دوو شـتانە بەتایبـەت هەیـە).

لێـرەدا زانایـان دەڵێـن: مەبەسـتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەوە نیـە کـە ڕوقیـە تەنیـا بـۆ ئـەو دووانـە هەیـە، بەڵکـو بـۆ ئـەو دووانـە زۆر کاریگەریـی هەیـە.

فەرمـوودەی دووەم: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: {**الْعَيْنُ حَـقٌّ، وَلَـو كَانَ شيءٌ سـابَقَ الْقَـدَرَ سَـبَقَتْهُ العَـيْنُ، وإذا اسْتُغْسِـلْتُمْ فاغْسِـلُوا**} (**أخرجـه مسـلم: ٢١٨٨، وابـن حبـان: ٦١٠٧، والترمـذي: ٢٠٦٢، وقـال: حسـن صحيـح غريـب، والنسـائي في الكـبرى: ٧٦٢٠**).

واتـە: چـاو لێـدان هـەق و چەسـپاوەو، ئەگـەر شـتێك پێـش قـەدەر کەوتبایـەوە، چـاو پێشـی دەکەوتـەوە، (ئەوەنـدە بەخێرایـی کاریگەریـی هەیـە)، هـەر کاتێکیـش داواتـان لێکـرا خۆتـان بشـۆن، خۆتـان بشـۆن.

ئەمـە پێویسـتیی بـە ڕوونکردنـەوە هەیـە: کەسـێك کـە چـاو لـە کەسـێك دەدات، چـاو لێدراوەکـە (**معیـون**) بـەوە چـاك دەبـێ، کـە بابـای چاولێـدەر (**عائـن**) لە پشـتێن بـەرەو ژێـری خـۆی بشـوات و، ئاوەکـە کـە لێـی دەچۆڕێتـەوە، بابـای چـاو لێـدراو، خـۆی پـێ بشـوات، چـاك دەبێـت[1].

---

(١) ئـەو وردەکارییـە لـە دەقـی چـوارەم دا هاتـوە، کـە (إبـن ماجـە) بـە ژمـارە: ٣٥٠٩، هێناویـەتی و ئەلبانیـی بـە ڕاسـت (صحیح)ی دانـاوە.

فەرمـوودەی سـێیەم: {عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﭬ قَـالَ: كَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ يُعَـوِّذُ الْحَسَـنَ وَالْحُسَـيْنَ يقـول: «أعيـذ كـما بِكَلِمَاتِ اللَّـهِ التَّامَّـةِ، مَـنْ كُلِّ شَـيْطَانٍ وَهَامَّـةٍ، وَمَـنْ كُلِّ عَـيْنٍ لَامَّـةٍ، وَيَقُـولُ هَكَـذَا كَانَ إِبْرَاهِيـمُ يُعَـوِّذُ إِسْـحَاقَ وَإِسْـمَاعِيلَ عَلَيْهِـمَا السَّـلَامُ} (أَخْرَجَـهُ ابـن حبـان: ١٠١٢، قـال شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده صحيـح).

واتـە: ئیبنـو عەبباس ﭬ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دوعـای بەسـەر حەسـەن و حوسـەیندا دەخوێنـد، دەیفەرمـوو: پەناتـان پـێ دەگـرم بـە وشـە تەواوەکانـی خـوا، لـە هـەر شـەیتانێك و هـەر جڕوجانەوەرێـك و، لـە هـەر چاوێکـی لێـدەرو پیـس، دەشـیفەرموو: ئیبراهیمیـش بـەم شـێوەیە ئیسـحاق و ئیسـماعیلی دوعـا لـێ دەخوێنـدن و، پەنـای پـێ بـە خـوا دەگرتـن، سـەلامی خوایـان لـێ بـێ.

فەرمـوودەی چـوارەم: {عَـنْ أَبِي أُمَامَـةَ أَسْعَدَ بْـنِ سَـهْلِ بْـنِ حُنَيْـفٍ قَـالَ: مَـرَّ عَامِـرُ بْـنُ رَبِيعَـةَ بِسَـهْلِ بْـنِ حُنَيْـفٍ وَهُـوَ يَغْتَسِـلُ، فَقَـالَ: لَـمْ أَرَ كَالْيَـوْمِ وَلَا جِلْـدَ مُخَبَّـأَةٍ ، فَمَا لَبِـثَ أَنْ لُبِـطَ بِـهِ، فَأُتِيَ بِـهِ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ فَقِيـلَ لَـهُ: أَدْرِكْ سَـهْلًا صَرِيعًـا، قَـالَ: «مَـنْ تَتَّهِمُـونَ بِـهِ» قَالُـوا: عَامِـرَ بْـنَ رَبِيعَـةَ، قَـالَ: «عَـلَامَ يَقْتُـلُ أَحَدُكُـمْ أَخَـاهُ؟ إِذَا رَأَى أَحَدُكُـمْ مِـن أَخِيـهِ مـا يُعْجِبُـهُ، فَلْيَـدْعُ لَـهُ بِالْبَرَكَـةِ» ثُـمَّ دَعَـا بِمَـاءٍ، فَأَمَـرَ عَامِـراً أَنْ يَتَوَضَّـأَ فَيَغْسِـلُ وَجْهَـهُ وَيَدَيْـهِ إِلَى الْمِرْفَقَـيْنِ وَرُكْبَتَيْـهِ وَدَاخِلَـةَ إِزَارِهِ، وَأَمَـرَهُ أَنْ يُصَـبَّ عَلَيْـهِ، قَـالَ سُـفْيَانُ قَـالَ مَعْمَـرٌ عَـنِ الزُّهْـرِيِّ: وَأَمَـرَ أَنْ يُكْفَـأَ الْإِنَـاءُ مِـنْ خَلْفِـهِ} (أخرجـه ابـن ماجـه: ٣٥٠٩، وصححـه الألبـاني).

واتـە: عامیـڕی کـوڕی ڕەبیعـە بـە لای سـەهلی کـوڕی حونەیفـدا ڕابـرد، لـە کاتێکـدا سـەهلی کـوڕی حونەیـف خـۆی دەشـۆرد، عامیـری کـوڕی ڕەبیعـە (دیـارە بابایەکـی وا بـووە خەڵکـی لـە چـاو بـردوە) گوتـی: ئەمـڕۆ کەسـم نەبینیـوە ئەوەنـدە پێسـتی جـوان بـێ، تەنانـەت کچـی پشـت پـەردەش، پێسـتی ئەوەنـدە ناسـك و نـەرم و جـوان نەبـووە، ئیـدی زۆری پـێ نەچـوو، یەکسـەر سـەر و ملـی تێکشـکا (سـەهلی کـوڕی حونەیـف نەخـۆش کـەوت)، بردیانـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوتیـان: فریـای

سـەهل بکـەوە کەوتـوە، ئەویـش فەرمـووی: کێـی پـێ تۆمەتبـار دەکـەن؟ گوتیـان: عامیـری کـوڕی ڕەبیعـە (شـتێکی ئـاوای گوتـوە لـە کاتێکـدا ئـەو خـۆی شـۆردوە)، ئەویـش ﷺ فەرمـووی: بۆچـی یەکێکتـان برایەکـەی خۆی دەکـوژێ، ئەگـەر یەکێکتان شـتێکی لـە برایەکـەی بینـی، کـە پێـی سەرسـام بـوو، بـا دوعـای بەرەکەتـی بـۆ بـکات (بڵـێ: خوایـە! پیـت و پێـزی تێبخـە)، دوایـی بانگـی کـرد ئاوێکیان بـۆ هێنـا، فەرمانی کـرد بـە عامیـری کـوڕی ڕەبیعـە [ئـەو کەسـەی چـاوی لێدابـوو] کـە دەسـتنوێژ بگـرێ، دەم و چـاوی و دەسـتەکانی تاکـو ئانیشـکەکانی، پاشـان ئەژنۆیەکانـی و ژێـر پۆشاکەکەشـی (واتـە: پشـتێن بـەرەو ژێـری) بشـوات و، فەرمانـی کـرد ئاوەکـە بەسـەر سـەهل دا بکـرێ، ئنجـا لـە ڕیوایەتێکـدا دەڵـێ: لـە پشـتەوەڕا بـە دەفرەکـە پێیـان داکـرد، لـە ڕیوایەتـی دیکـەدا دەڵـێ: وەك هیـچ دەردی نەبووبـێ، چـاك بـوو.

فەرمـوودەی پێنجـەم: {**عَـنْ أَبِي سَـعِيدٍ الْخُـدْرِيِّ رضي اللـه عنـه، قَـالَ: كَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ يَتَعَـوَّذُ مِـنْ أَعْـيُنِ الْجَـانِّ وَأَعْـيُنِ الإِنْـسِ، فَلَـمَّا نَزَلَـتِ الْمُعَوِّذَتَـانِ أَخَـذَ بِهِـمَا وَتَـرَكَ مَـا سِـوَى ذَلِـكَ**} (**أخرجـه الترمـذي: ٢٠٥٨، والنسـائي: ٥٤٩٧، وابـن ماجـه: ٣٥١١، وصححـه الألبـاني**).

واتـە: ئەبـوو سـەعیدی خودریـی (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە چـاوی پیسـی مرۆڤـەکان و چـاوی پیسـی جندەکانیـش هەندێـك دوعـای بەسـەر خۆیـدا دەخوێنـدن، بـەڵام دوای ئـەوەی (**الْمُعَوِّذَتَـانِ**): {سـوورەتی (**الفلـق**) و سـوورەتی (**النـاس**)} هاتنـە خـوار، ئـەو دوو سـوورەتەی دەخوێنـدن (کـە یـازدە ئایەتـن) و، وازی لـە دوعایەکانـی دیکـە هێنـا.

فەرمـوودەی شەشـەم: {**عَـنْ أَسْـمَاءَ بِنْـتِ عُمَيْـسٍ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْهَـا قَالَـتْ قُلْـتُ: أَيْ رَسُـولَ اللَّـهِ إِنَّ بَنِـي جَعْفَـرٍ تُصِيبُهُـمُ الْعَيْنُ، أَفَأَسْـتَرْقِى لَهُـمْ؟ قَـالَ: «نَعَـمْ وَلَـوْ كَانَ شَيْءٌ يَسْبِقُ الْقَـدَرَ لَسَـبَقَتْهُ الْعَيْنُ»**} (**أخرجـه أحمـد: ٢٧٥١٠، والترمـذي: ٢٠٥٩، وقـال: حسـن صحيح، وأخرجـه أَيْضَـاً والنسـائي فـي الكـبرى: ٧٥٣٧، واللفـظ لـه**).

واتە: ئەسمائی کچی عومەیس (هاوسەری جەعفەری کوڕی ئەبی تاڵیب ﷺ، کە لە جەنگی موئتەدا شەهید دەبێ، منداڵی هەتیوی هەبوون)، چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! منداڵەکانی جەعفەر چاو لێیان دەدا، (دیارە بەرچاو و جوان بوون)، ئایا ڕوقیەو دوعایان بۆ بخوێنم؟ فەرمووی: بەڵێ، چونکە هەر شتێك پێش قەدەر کەوتبایە چاو بوو (کاریگەریی چاو پێشی دەکەوتەوە).

فەرموودەی حەوتەم: {**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَهَا أَنْ تَسْتَرْقِيَ مِنَ الْعَيْنِ**} (**تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين**).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردوە دوعا بخوێنێ بۆ ئەوەی لە چاوی پیس، چاووزار، پارێزراو بێ.

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە بە لوتف و کەرەمی خۆی، لە چاوی پیس و حەسوودیی حەسوودان، هەموو لایەکمان بپارێزێ و بە دوورمان بکات..

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## دەستپێک

مسوڵمانانی بەڕێزو خۆشەویست!

ئەمڕۆ کە (٥) شەووالی ساڵی (١٤٤١) کۆچییە، بەرانبەر: (٢٠٢٠/٥/٢٨) زایینی، لە شاری هەولێر، خوا پشتیوانمان بێ، دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سوورەتی (الحاقة)، سەرەتاش پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە موبارەکە لە حەوت (٧) بڕگەدا دەخەینەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الحاقة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم موحەممەددا ﷺ ناوی (**سُورَةُ الْحَاقَّةِ**)ی بۆ بەکارهاتوە، وەك لە موصحەفەکان و سەرچاوەکانی تەفسیرو سوننەتدا هاتوەو، ئەم دەقەش لەو بارەوە هەیە: {**عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ** رضي الله عنه، **قَالَ: «خَرَجْتُ يَوْمًا بِمَكَّةَ أَتَعَرَّضُ لِرَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَبْلَ أَنْ أُسْلِمَ، فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَبَقَنِي إِلَى الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَوَقَفْتُ خَلْفَهُ، فَاسْتَفْتَحَ سُورَةَ الْحَاقَّةِ، فَجَعَلْتُ أَعْجَبُ مِنْ تَأْلِيفِ الْقُرْآنِ، فَقُلْتُ: هَذَا وَاللَّهِ شَاعِرٌ، «أَيْ قُلْتُ فِي خَاطِرِي»، فَقَرَأَ:** ﴿وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾﴾ الحاقة، **قُلْتُ: كَاهِنٌ، فَقَرَأَ:** ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٣﴾﴾ الحاقة، **إِلَى آخِرِ السُّورَةِ، فَوَقَعَ الْإِسْلَامُ فِي قَلْبِي كُلَّ مَوْقِعٍ»**} **(أخرجه أحمد: ١٠٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده ضعيف لانقطاعه).**

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دەڵێ: بەر لەوەی مسوڵمان ببم، ڕۆژێك لە مەككە ڕۆیشتم، ڕێ بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگرم، (گێچەڵی پێبکەم) بینیم

پێش من کەوتبوو بەرەو مزگەوتی حەرام، (دیارە دەبێ کاتێك بووبێ نوێژی بە دەنگی بەرزی تێدا خوێندبێ، شێوان بووە، یان بەیانی بووە، یان خەوتنان بووە)، لە پشتیەوە وەستام، سوورەتی (الْحَاقَّة)ی دەست پێکرد، دەستم کرد بە سەر سورمان لە پێکهاتەی قورئان، (لە ڕەوانبێژیی و پاراویی و پڕ مانایی)، لە دڵی خۆمدا گوتم: بە خوا ئەوە شاعیرە، دوایی ئەوەی خوێند: ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ ﴾الحاقة، ئەوە قسەی شاعیرێك نیە، بە کەمیی بڕوا دێنن، لە دڵی خۆمدا گوتم: وا پێدەچێ کاهین بێ، ئنجا دووبارە ئەوەی خوێند: ﴿ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾الحاقة، هەروەها قسەی بابایەکی کاهینیش نیە، کەم پەند وەردەگرن، دابەزێنراوە لە پەروەردگاری جیهانییانەوە، هەتا کۆتایی سوورەتەکە، ئیدی ملکەچیی بۆ خوا (ئیسلام) زۆر کەوتە دڵمەوە.

شایانی باسە: (الْفَيْرُوزَ آبَادِيُّ) لە کتێبی (بَصَائِرِ ذَوِي التَّمْيِيزِ)دا گوتوویەتی: ئەم سوورەتە پێشی گوتراوە: (سُورَةُ السِّلْسِلَةِ).

هەروەها (الجَعْبَرِي) لە مەنزوومەکەی خۆیدا کە لە بارەی ڕیزبەندیی سوورەتەکانەوە، هۆنراوەیەکی هەیە، گوتوویەتی: ناوی (الْوَاعِيَةَ)شی بۆ بەکارهێنراوە[1].

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

بە یەکدەنگیی زانایان ئەم سوورەتە مەککەییەو، بەپێی هەواڵەکەی (**عُمر بن الخطاب**)یش، دەبێ بەلای کەمەوە لە ساڵی پێنجەمەوە دابەزیبێ، ئەگەر زووتریش نەبێ، چونکە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دوای کۆچی ژمارەیەك لە هاوەڵان بۆ حەبەشە، لە ساڵی پێنجەمدا، مسوڵمان بووە، وەك لە (**السيرة النبوية لابن هشام**)دا هاتووە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢، ص١١٠.

ئنجا لەو بارەوە ئەم دەقە هەیە: {**عَنْ عَبْدِ اللهِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ الْحَاقَّةِ بِمَكَّةَ**} (**أخرجه السيوطي في الدر المنثور: ج٨، ص٢٦٣، ونسبه لابن الضَّرَيْسِ وَالنَّحَّاسُ وَابْنُ مَرْدَوَيْهِ وَالْبَيْهَقِيِّ، وَقَالَ: وَأَخْرَجَ ابْنُ مَرْدَوَيْهِ عَنِ ابْنِ الزُّبَيْرِ مِثْلَهُ، انظر: الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٥**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄، دەڵێ: سوورەتی (**الْحَاقَّةِ**) لە مەککە دابەزیوەو، (**ابن مردويه**) لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە هەمان شتی هێناوە، واتە: ئەویش گوتوویەتی: ئەم سوورەتە لە مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە دابەزینداو لە موصحەفدا:

ڕیزبەندیی ئەم سوورەتە لە دابەزیندا، ژمارە (٧٧)ە، پێش سوورەتی (**المعارج**)و، دوای سوورەتی (**الملك**) دابەزیوە، لە موصحەفیشدا ژمارە (٦٩)یە، بەڵام ئەگەر ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتیی، یاخود پێش ئەوەش دابەزیبێ، نابێ لە ڕیزبەندیی دابەزیندا ژمارەکەی (٧٧) بێ، چونکە ڕێی تێناچێ لە پێنج ساڵی سەرەتای پێغەمبەرایەتییدا (٧٧) سوورەت دابەزیبن، بۆیە ئەگەر ئەو ڕیوایەتەی لە عومەرەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، هێنامان سەنەدەکەی ڕاست بێ و، چەسپاو بێ، دەبێ ڕیزبەندیی ئەو سوورەتە لە دابەزیندا زووتر بێ، بۆ وێنە: لە بیست (٢٠) سوورەتەکان یان لە سی (٣٠) سوورەتەکان بێ، چونکە هەموو سوورەتە مەککەییەکان ژمارەیان هەشتاو حەوت (٨٧) سوورەتە، ئنجا ئەگەر بە پێنج ساڵان حەفتاو حەوت (٧٧) سوورەت دابەزیبن، ناگونجێ لە ماوەی حەوت (٧) ساڵ، یاخود هەشت ساڵی دوایی دا - کە قۆناغی مەککە هەمووی سێزدە (١٣) ساڵ بووە - تەنیا دە (١٠) سوورەت دابەزیبن، ئەوە شتێکی نامەتیقییە، بۆیەش کاتێك بیرو ڕای زانایان دێنین، لە بارەی هەندێك شتەوە، دەبێ پێکیان بگرین بەراوردیان بکەین، ئەو کاتە ڕەنگە بگەینە هەندێك ئەنجامگیریی ڕاست و دروستتر، ئێمە هەمیشە ڕیزبەندیی دابەزین لە جابیری

کوڕی زەیدەوە دێنین، زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان لەو بارەوە پشتیان بەو بەستوە، بەڵام ئەویش مەرج نیە لە هەموو شتێکدا پێکابێتی و، سەرەنجام مێژووی دابەزینی سووڕەتەکان، زانایان قسەیان لێ کردوەو، بەگشتیی شتێکی تارادەیەك ئیجتیهادییە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، لەسەر ئەوە کۆکن کە ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە پەنجاو دوو (٥٢)یە، نە کەمترو نە زیاتر.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سووڕەتە جگە لە سێ (٣) ئایەتی سەرەتای، کە سێ جاران وشەی **(الحاقة)**یان تێدا بەکارهاتوە: ﴿ٱلۡحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٣﴾، جگە لەو سێ ئایەتە، ئایەتەکانی دیکە، چل و نۆ (٤٩) ئایەتەکە، لە بارەی سێ بابەتەوە دەدوێن، بەم شێوەیە:

**بابەتی یەکەم:** نۆ ئایەتەکانی: (٤ - ١٢)، باسی بێبڕوایی هەردوو گەلی سەموود و گەلی عادو، سەرەنجام فەوتێنرانیانە، یەکەمیان بە هاڕژنێکی بێڕەزاو، دووەمیان بە بایەکی لە ڕادده بەدەر بەهێزو سارد، هەروەها هەر لەو نۆ (٩) ئایەتەدا، باسی فەوتێنرانی فیرعەون و پێشووەکانی فیرعەون، یاخود کۆمەڵەکەی فیرعەون و، شارە هەڵگێڕدراوەکانی گەلی **(لوط)**یش، کە بە گرتنێکی زۆر توند گیراون و سزا دراون، باسی ئەوەش کراوە.

دیسان هەر لەو نۆ (٩) ئایەتەی سەرەتادا، ئاماژەیەکی کورت بە کەشتییەکەی نووح (عَلَيْـهِ السَّلام) و دەربازکرانی نووح و هاوەڵانی کە باب و باپیرانی تێکڕای مرۆڤانیان (مرۆڤانی دوای خۆیان) تێدابوون، باسی ئەوانە کراوە.

**بابەتی دووەم:** کە بیست و پێنج (٢٥) ئایەتەکانی: (١٣ - ٣٧) دەگرێتەوە، باسێکی خەست و خۆڵی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەتەوە، کراوە، ئنجا باسی ڕانوێنرانی مرۆڤان و هێنرانە پێشیان و بەسەردا دابەشکرانی نامەو لیستی کردەوەکانیان و، بە دەستی ڕاست وەرگرتنەوەی بڕواادارانی چاکەکار، بۆ لیستی کردەوەکانیان و، بڕوانامەکانیان و، بە دەستی چەپ وەرگرتنەوەی بێبڕوایانی خراپەکار بۆ بڕوانامەو لیستی کردەوەکانیان و، نیشتەجێ بوونی هەر کامیان لە شوێنی شایستەی خۆیاندا، باسی ئەوانە کراوە.

**بابەتی سێیەم و کۆتایی:** کە پازدە (١٥) ئایەتی کۆتایی، ئایەتەکانی: (٣٨ - ٥٢) دەگرێتەوە، باسی هەرکام قورئان و پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ بەڵام بە تێکەڵیی و، خستنەڕووی ئەو ڕاستییە، کە قورئان فەرمایشتی دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانییانە، بە فریشتەیەکی بەڕێزدا، کە جیبریلە **(علیە السلام)** دایبەزاندوەو، نە شیعری شاعیرێکەو نە قسەی فاڵچییەکەو، ئەگەر گریمان لە فەرزی مەحاڵدا موحەممەد ﷺ قسانێکی بە ناوی خواوەش هەڵبەستبانایە، خوای دادگەر زۆر بە سەختیی سزای دەداو، ڕەگی گەردنی دەپچڕاندو، هیچ کەسیش نەیدەتوانی بەرگریی لێ بکات، بەڵام قورئان بیرخەرەوەیە بۆ پارێزکاران و، مایەی خەفەت و پەشێمانییە بۆ کافران و، هەقێکی جێی دڵنیاییە، جگە لەوە هیچی دیکە نیە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

چوار تایبەتمەندییمان خستوونە ڕوو، بۆ جیا کردنەوەی ئەم سوورەتە لە سوورەتەکانی دیکە:

**١)**- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ئەوە کراوە کە لە کاتی لەتبوون و بێ هێز بوونی ئاسماندا، فریشتەکان لەسەر قەراغ و کەنارەکانی دەبن، لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا: ﴿وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَآ﴾، فریشتەکان لەسەر کەنارەکانی ئاسمان دەبن (لە ڕۆژی قیامەتدا).

٢)- باسی هەڵگیرانی عەرشی خوا کراوە، لە ڕۆژی دوایی دا، لە لایەن (هەشتانەوە): ﴿ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ١٧ ﴾، واتە: عەرشی پەروەردگارت لەو ڕۆژەدا هەشت لە سەروویانەوە هەڵیدەگرن، ئەویش هەر لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا، دیارە لە سوورەتی (غافر) و، لە شوێنی دیکەدا، باسی عەرشی خواو هەڵگرانی عەرشی خوا کراوە، بەڵام تەنیا لێرەدا دیارییکراوە کە هەشت (٨) جۆرە دروستکراو، یان کۆمەڵە دروستکراو «واش پێدەچێ هەر فریشتەکان بن» عەرشی خوا هەڵدەگرن.

٣)- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی زنجیرێکی حەفتا (٧٠) گەزیی و، ئاڵێنرانی لە بابای بێبڕوا کراوە، وەك لە ئایەتی ژمارە (٣٢)دا: ﴿ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ٣٢ ﴾، واتە: دوایی بیخەنە نێو زنجیرێکەوە، کە ئەندازەکەی حەفتا (٧٠) گەزە، یان حەفتا باڵە، یان حەفتا باسکە.

٤)- چەند وشەیەك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

١- ﴿ ٱلۡحَآقَّةُ ﴾: کە سێ جاران دووبارە بۆتەوە، لە ئایەتەکانی: (١ و ٢ و ٣)دا.

٢- ﴿ حُسُومٗا ﴾: واتە: بەردەوام و نەپساوە، لە ئایەتی ژمارە (٧)دا هاتوە.

٣- ﴿ صَرۡعَىٰ ﴾: واتە: مردووانی کەوتوو، تخێڵ بوو، ئەویش هەر لە ئایەتی ژمارە (٧) دا هاتوە.

٤- ﴿ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴾: واتە: گرتنێکی زیاد، واتە: زیاد لە عادەتی ئاسایی، یاخود زیاد لەو سزادانانەی کە گەلانی پێشووی پێ سزا داون، لە ئایەتی ژمارە (١٠)دا.

٥- ﴿ وَاهِيَةٞ ﴾: کە ئاسمانی پێ وەسفکراوە، واتە: بێ هێز، یاخود شل و پل، یان داڕووخاو، لە ئایەتی ژمارە (١٦)دا.

٦- ﴿ هَآؤُمُ ﴾: واتە: ها بگرن (بخوێننەوە)، ﴿ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴾، لە ئایەتی ژمارە (١٩)دا.

٧- ﴿ غِسۡلِينٖ ﴾: واتە: کێم و زووخاو، یاخود چڵك و چەپەری داشۆراوی جەستەی دۆزەخییان، لە ئایەتی ژمارە (٣٦)دا.

٨- ﴿ٱلْأَقَاوِيلِ﴾: (أقاوِيل) كۆی (أَقوَال)ە، و (أَقوَال)یش كۆی (قَول)ەو (أقاوِيل) كۆی كۆیە، واتە: قسەكان، لە ئایەتی ژمارە (٤٤)دا.

٩- ﴿ٱلْوَتِينَ﴾، (وَتِين) واتە: ڕەگی لامل، یاخود خوێنبەر، ئەوەی خوێن دەبات بۆ جەستە، كە ئەگەر ئەوە ببڕدرێ، مرۆڤ بە یەكجاریی كۆتایی پێ دێ، لە ئایەتی ژمارە (٤٦)دا.

١٠- ﴿حَٰجِزِينَ﴾، (حَاجِزين: حَجَزَهُ أَي: مَنَعَهُ)، كەواتە: ﴿حَٰجِزِينَ﴾، واتە: بەرگرییكار، یاخود نەهێڵەران، كەسانێك نەهێڵن شتێك ببێ، لە ئایەتی ژمارە (٤٧)دا.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

كۆی پەنجاو دوو(٥٢) ئایەتەكانی ئەم سوورەتەمان، هەر بەپێی نێوەڕۆكی ئایەتەكان كە سێ بابەت بوون، بۆ سێ دەرسان دابەش كردوون:

**دەرسی یەكەم:** كە ئایەتەكانی: (١ - ١٢) دەگرێتەوە، باسی ﴿ٱلْحَآقَّةُ﴾، كە یەكێكە لە ناوەكانی ڕۆژی دوایی و، باسی بێبڕوایی و فەوتێنرانی گەلەكانی سەموودو عادو، گەلی فیرعەون و گەلی لووط.

**دەرسی دووەم:** كە (٢٥) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (١٣ - ٣٧)، باسی هاتنی ڕۆژی دوایی و، پێكداكێشرانی زەویی و چیایەكان و، شەق بوونی ئاسمان، چوونە قەراغی ئاسمانی فریشتەكان و، ڕانوێندرانی مرۆڤان، پاشان دابەشكرانی نامەی كردەوەكان بەسەر مرۆڤەكانداو، چاكەكاران بە دەستی ڕاستیان نامەی كردەوەكانیان وەردەگرنەوەو، خۆشحاڵ دەبن، خراپەكاران و بێبڕوایان بە دەستی چەپ و ناخۆشحاڵ دەبن و، باسی سزای ئەوانەی بەدەستی چەپیان نامەی كردەوەكانیان دەدرێتەوە.

**دەرسی سێیەم:** كە (١٥) ئایەتی كۆتایی سوورەتی **(الحاقة)** دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (٣٨ - ٥٢)، سوێند خواردنی خوا بە بینراو و نەبینراوان، لەسەر ڕاستیی

لـە خـواوە هاتنـی قورئـان و، قسـەی شـاعیرو کاهیـن نەبـوونی و، هەڵنەبەسـترانی لـە لایـەن موحەممـەدەوە ﷺ و، ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە کـە ئەگـەر گریـمان موحەممـەد قسـانێکی بەنـاوی خـواوە هەڵبەسـتبانایە، خـوا زۆر بـە سـەختیی سزای دەداو، هیـچ کەسـێك نەیدەتـوانی بەرگرییـکاری بـێ و، نەهێڵـێ ئـەو سـزایەی بـدرێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرســە لــە دوانــزە (١٢) ئایـەتی سـەرەتای (**الحاقـة**) پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (١ - ١٢) كــە دوای ســێ جــار ناوهێــنانی (**الحاقــة**) «ئەویــش هــەر نــاوی ڕۆژی دواییــە» بــاسی بــە درۆ دانــان و ســەرپێچیی كــردنی هــەر كام لــە: گــەلی ســەموود و، گــەلی عــادو، گــەلی فیرعــەون و دارو دەســتەكەی، یاخــود پێشــووەكانی و، شــارە هەڵگێڕراوەكانــی گەلــی لــووط، بــۆ پێغەمبــەرانی خۆیــان (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، كــراوە، دوایــی بــاسی تۆفانەكــەی نــووح و هەڵگیــرانی نــووح (**علیه السلام**) خــۆی و شــوێنكەوتووانی لــە كەشــتییەكەدا، كــە شــوێنكەوتووەكانیشی دەبنــەوە بــە پێشــووانی هەمــوو مرۆڤایەتیــی، بــاسی ئــەوە كــراوە، بۆیــەش دەڵێیــن: شــوێنكەوتووانی نــووح كــە لــە كەشــتییەكەدا هەڵگیــراون و دەربــاز كــراون، بریتیــن لــە پێشــینانی هەمــوو مرۆڤایەتیــی، چونكــە خــوا ﷻ لــە ســوورەتی (**الصافــات**)دا دەفەرمــوێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتــە: تەنیا وەچەكــەی ئەومــان هێشــتەوە، ئەوانیــش ئەوانــە بــوون كــە لەگەڵیــدا ســواری كەشــتییەكە بــوون.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱلْحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌۢ بِٱلْقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾ وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، کارەساتە چەسپاوەکە ﴿١﴾ کارەساتە چەسپاوەکە چییە؟ ﴿٢﴾ چی پێی زانینیوی کارەساتە چەسپاوەکە چییە؟ ﴿٣﴾ گەلی سەموودو گەلی عاد داچڵێکێنەر(ی خەڵك)یان بە درۆ دانا ﴿٤﴾ ئنجا گەلی سەموود بە هاڕژنە لە ڕاددە بەدەرەکە فەوتێنران ﴿٥﴾ گەلی عادیش بە زریانێکی یەکجار ساردو بەهێزی لە سنوور دەرچوو فەوتێنران ﴿٦﴾ خوا حەوت شەوو هەشت ڕۆژی بەردەوام و نەپساوە ناردیە سەریان (و، لە دژیان بەکاری هێنا)، لە ئەنجامدا خەڵکەکەت دەدی بە مردوویی تخێڵ بوون، وەك بنکە دارخورما کلۆرەکان ﴿٧﴾ ئنجا ئایا هیچ کەسێکیان لێ دەبینی مابێ؟ ﴿٨﴾ هەروەها فیرعەون و گەلەکەی و ئەوانەی پێش وی و ئاوەدانییە هەڵگێڕدراوەکانیش تاوانیان کرد ﴿٩﴾ سەرپێچییان لە ڕەوانەکراوی پەروەردگاریان کرد، ئەویش بە گرتنێکی زێدە سەخت گرتنی و سزای دان ﴿١٠﴾ لە کاتی تۆفانەکەی نووحیش دا کاتێك ئاوەکە لە سنوور دەرچوو، ئەی خەڵکینە! پێشینەکانی ئێوەمان لە نێو کەشتییە بە نێو ئاو ڕۆیشتووەکەدا هەڵگرت ﴿١١﴾ تاکو ئەو کەشتیی و ڕووداوە مەزنەتان بۆ بکەینە بیرخەرەوەو، هەر گوێیەکی بیسەرو وەرگر، تێی بگات ﴿١٢﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلْحَاقَّةُ): (أَصْلُ الحَقِّ: المُطَابَقَةُ وَالمُوَافَقَة، الحَقُّ: الثَّابِت، أَحْقَقْتُ كَذَا: أَثْبَتُّهُ)، (حاقَة): لە ئەصڵدا لە هەقەوە هاتوە، وشەی (هەق) واتە: شتێك لەگەڵ شتێكدا پڕ بە پێست و گونجاو بێ، هەروەها وشەی (حق) بە مانای چەسپاو بەكاردێ، دەگوترێ: (أَحْقَقْتُ كَذَا: أَثْبَتُّهُ)، ئەو شتەم چەسپاند، لە (مختار الصحاح)دا دەڵێ: (الحَاقَّةُ: القِيَامَةُ وَسُمِّيَت بِذَلِكَ لأَنَّ فِيها حَوَاقُّ الأُمُورِ)، (حاقة) مەبەست پێی ڕۆژی دواییە (قیامەت) بۆیەش بەو ناوە ناو نراوە، چونكە كارە هەقەكانی تێدان.

(وَمَآ أَدْرَىٰكَ): (الدِّرَايَةُ: المَعْرِفَةُ المُدْرَكَةُ بِضَرْبٍ مِنَ الخَتْلِ)، (وَمَآ أَدْرَىٰكَ) واتە: چ شتێك بە تۆی زانینیوە؟ چ شتێك وای كردوە تۆ بزانی؟ ئنجا (دِرَايَة) بە مانای ناسینێكە بە شێوەیەكی وردەكارانە زانرابێ، كەواتە: (وَما يُدرِيكَ: يَعنِي وَما يُعلِمُكَ) چ شتێك تۆی لەوە ئاگادار كردۆتەوە؟ یان چ شتێك بە تۆی زانینیوە؟

(بِٱلْقَارِعَةِ): (القَرْعُ: ضَرْبُ الشَّيءِ عَلَى الشَّيء)، (قَرع): بریتیە لەوەی شتێكی ڕەق بەسەر شتێكدا بكوتی و زرینگەی لێبێ، (القارِعَة يَعنِي: الشَّدِيدَةُ مِن شَدَائِدِ الدَّهرِ)، سەختییەك لە سەختییەكانی ڕۆژگار، لەڕاستییدا (قارعَة)، واتە: كارەساتە ڕاچڵەكێنەرەكە، ئەوەی خەڵك ڕادەچڵەكێنێ، ئەگەر دەنگێكی بە قووەت ببیستی دادەچڵەكێی ڕادەچڵەكێی.

(بِٱلطَّاغِيَةِ): (الطَّاغِيَة) كارەساتێكی لە سنوور دەرچوو، لە (طُغيان)ەوە هاتوە، (الطُّغيانُ: تَجَاوزُ الحَدِّ فِي العِصْيَان)، (طُغيان) بریتیە لە سنوور دەرچوون لەسەرپێچیی كردندا، لە ئەصڵدا ئەوە ماناكەیەتی و لە (طَغَى)ەوە هاتوە، (أَي: خَرَجَ مِنَ الحَدِّ فِي العِصيَان)، (طاغِيَة) لێرەدا: (إِشَارَةٌ إلى الطُّوفَانِ المُعَبَّرِ عَنْهُ بِقَولِهِ:

﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴾)، وشەی (طاغِيَة) ئاماژەیە بۆ تۆفانەکەی نووح بەوە تەعبیری لێکراوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ ﴾، ئێمە کاتێك ئاوەکە یاخیی بوو لە سنوور دەرچوو (لە سنووری ئاسایی)، ئێوەمان لە ڕۆیشتووەکەدا (لە کەشتییە بەنێو ئاو ڕۆیشتووەکەدا) هەڵگرت.

(صَرۡصَرٍ): (الصَّرُّ: الشَّدُّ، والصُّرَّةُ: ما تُعْقَدُ فِيهِ الدَّراهِمُ)، (صَرّ) لە ئەصڵدا بە مانای بەستن و گرێدانە، (صُرَّة) بەو پرێسکەیە دەگوترێ کە درەمی دەهاویشترێن و گرێ دەدرێ، (صَرْصَرٍ: مِنَ الصَّرّ لِما فِي البُرُودَةِ مِنَ الشِّدَّةِ وَالتَّعَقُّدِ)، (صَرْصَرٍ) لە (صَرّ)ەوە هاتوە، لەبەر ئەوەی سەرما توندیی و سەختیی، تێدایە.

(عَاتِيَةٍ): (العُتُوُّ: النُّبُوُّ عَنِ الطَّاعَةِ)، (عَاتِيَة) لە (عُتُوّ)ەوە هاتوە، (عُتُوّ)یش دووریيە لە فەرمانبەریی، (العاتِي: المُجاوِزُ الحَدَّ فِي الإِسْتِكْبَارِ، وَالعَاتِي: الجَبَّار)، (عاتِي): سنوور بەزێن لە خۆ بەزلگریيداو، (عاتِي) بە مانای مل بە خەڵك کەچکەر (داپڵۆسێنەر)، (عَاتِيَة)ش سیفەتی بایەکەیە، ﴿ بِرِيحٍ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴾، واتە: بایەكی لە سنوور دەرچوو، لە سنووری بای ئاسایی دەرچوو.

(سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ): واتە: بە سەریدا زاڵ کردن (سَلَّطَهَا عَلَيْهِم)، (التَّسخِيرُ عَلَيهِم: التَّذلِيل)، (تَسْخِير): یانی: گەردن پێ کەچکردن و ڕام و دەستەمۆ کردن، واتە: ئەو بایە ڕام و دەستەمۆ کرابوو بۆ فەرمانی خوا، بەڵام زاڵ کرابوو بەسەر گەلی عاددا، (سَخَّرَهُ اللهُ وَسَلَّطَها عَلَيهِم) خوا ئەو بایەی ڕام و دەستەمۆ کردبوو بۆ جێبەجێ کردنی ئەوەی لێی دەوێ و، زاڵی کردبوو بەسەر گەلی عاددا.

(حُسُومًا): واتە: بەردەوام (نەپساوە)، دەگوترێ: (حَسَمَهُ أَي: قَطَعَهُ)، کەواتە: (حُسُومًا) دەشگونجێ بە مانای: ئەو بایە یەکجاریی ئەوانی دەبڕی، بێ، چونکە (حَسْم) بە مانای (قَطْع)یش دێ، هەروەها (حُسُومًا) دەشگونجێ بە مانای (مُتَتَابِعَةً)، واتە: بە دوای یەکداو بەبێ پسانەوە ئەو بایە دەهات، هەروەها (حُسُوم) بە مانای (شؤم)یش دێ، واتە: نەگبەت و بێ خێر، هەروەها (الحُسام:

**السَّيفُ القاطِع**) شمشێرێکی بڕندە، دیارە ئەو بایەی خوا بۆ گەلی عادی ناردوە، ئەو سیفەتانەی تێدا بوون: هەم بەردەوام بووە، هەم بڕیونی، هەم بایەکی بێ خێرو نەگبەت بووە.

(صَرْعَىٰ): (**الصَّرْعُ: الطَّرْح، وَالصَّرِيعُ: المَصرُوعُ، وَقَومٌ صَرْعَى أي: هَلْكَى**)، (**صَرْع**) بە مانای فڕێدان و خستنە، بەڵام بە مردوویی، (**صَرِيع**) بە مانای (**مَصرُوع**)ە، لەسەر کێشی (**فَعِيل**)ە، بە مانای (**مَفعُول**)، واتە: مرێندراوو لەگەڵ مردندا تخێڵ کراو، (**قَومٌ صَرعَى**) واتە: کۆمەڵێکی فەوتاو، کۆمەڵێك کە فەوتاون و تخێڵ[1] و تەخت بوون لە سەر زەوی.

(أَعۡجَازُ نَخۡلٍ): (**أَعْجَاز**) کۆی (**عَجُز**)ە، (**عَجُزُ الإنْسَانِ: مُؤَخَّرُهُ**)، (**عَجُز**) واتە: پشتەوەی مرۆڤ، (أَعۡجَازُ نَخۡلٍ) واتە: بنکەکانی دار خورمایەکان، وشەی (**عَجُزَ**) بە (**أَعْجَاز**) کۆ دەکرێتەوە، (**نَخل**)یش (**إسمُ جَمعِ نَخلَةٍ**)، ناوی کۆیە بۆ (**نَخْلَة**)، بە تاکەکەی دەگوترێ: (**نَخْلَة**)، واتە: یەك دار خورما، بەڵام بۆ کۆیەکەی دەگوترێ: (**نَخل**)، (أَعۡجَازُ نَخۡلٍ) واتە: بنکە دار خورمایەکان، کۆتەرە دار خورمایەکان، ئەو خەڵکەش کەوتبوون، وەك کۆتەرە دار خورمایەکان کەوتبوون.

(خَاوِيَةٍ): (**أي: سَاقِطَة، أو خالِيَة، أَصْلُ الخَواءِ: خَوِيَّة بَطنُهُ مِنَ الطَّعام**)، وشەی (**خَواء**) لە ئەصڵدا بە مانای بۆشایی و بەتاڵییە، دەگوترێ: (**خَوِيَّة بَطنُه مِنَ الطَّعام**)، سکی لە خواردن خاڵیی بووە، واتە: برسیەتی، ئنجا (**خاوِيَة: جَمعُ خاوٍ**)، ﴿أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٍ﴾، (**خاوِيَة**) کۆیە، بۆ (**خاوٍ**) واتە: (**ساقِطٍ**)، چونکە دەگوترێ: (**عَجُزٌ خاوٍ**)، واتە: بنکێکی کەوتوو.

کەواتە: ﴿أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٍ﴾، بنکە دارخورما کەوتووەکان، یاخود: بۆشەکان، کلۆرەکان، چونکە (**خاوِيَة**) هەم بە مانای (**ساقِطَة**) دێ، هەم بە مانای کلۆرو بۆش، دێ.

---

(١) تخێڵ: لەسەر پشت کەوتوو، یان لەسەر سك کەوتوو.

(وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ): واتە: هەڵگێڕدراوەکان، (**المُدُنُ المُؤتَفِكات**)، یان (**القُرى المُؤتَفِكات**)، لە (**إفك**)ەوە هاتووە، (**إفْك: كُلُّ مَصرُوف عَن وَجهِهِ الَّذِي حَقّهُ أن يَكُونَ عَلَيهِ**)، (**إفك**): بریتیە لە هەر شتێك كە لەو ڕووەوەی پێویستە لە سەری بێ، لابدرێ، لەوەوە (**مُؤتَفِكات**) بە مانای (**مُنقَلِبات**) هەڵگێڕدراوەکان هاتووە، لەبەر ئەوەی شتێك لە حاڵەتی ئاسایی لادرا، بۆ وێنە: خانووێك بناغەکەی لە خوارێیەو دیوارەکانی لەسەری دانراون و، سەربانەکەی لەسەرێیە، بەڵام کاتێك هەڵدەگێڕدرێتەوە، سەربانەکەی دەکەوێتە بنەوەو، بناغەکەی دادە ڕووخێ و، دیوارەکانیشی بە پێوە دەمێننەوە.

(بِٱلْخَاطِئَةِ): واتە: بە گوناح و تاوان، دەگوترێ: (**خَطِأَ، يَخْطَأُ، خِطْأً، وَخَطَأً**)، واتە: گوناحی کرد، گوناح دەکات، گوناح کردن، وەك لە سوورەتی (**الإسراء**) دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: منداڵەکانتان لە ترسی هەژاریی مەکوژن، ئێمە بژیوی ئەوان و ئێوەش دەدەین، بەدڵنیاییی کوشتنیان گوناهێکی گەورەیە.

هەڵبەتە (**خَطِأَ، يَخْطَأُ**) بەمانای گوناحی کرد بە ئانقەست، بەڵام: (**أَخْطَأَ، يُخْطِئُ، إخْطَاءً، فَهُوَ مُخْطِئ**) جیایە لە (**خَطِأَ، يَخطَأُ، خِطأً، وَخَطَأً**)، (**أَخطَأَ، إخْطَاءً، فَهُوَ مُخْئ**)، واتە: هەڵەی کرد، هەڵە دەکات، ئەو هەڵەیە، (**أَخطَأَ**) بۆ شتێکە کەسێك نەیەوێ ئەو گوناهە بکات، بەڵام وای لە دەست بقەومێ واتە: نیەتی گوناح کردنی نەبێ و هەڵە بێ، (**القَتْل الخَطَأ**) لەوەوە هاتووە، کە کەسێك شتێك دەبینێ، وا دەزانێ نێچیرێکەو تفەنگێکی تێدەگرێ، دوایی بە کەسێك دەکەوێ، کە مەبەستی نەبووە ئەو کەسە بکوژێ، ئەوە پێی دەگوترێ: کوشتنی هەڵە، بەڵام کەسێك نیشان لە کەسێك دەگرێتەوە، دەشیناسێ و لێی دەدات، پێی دەگوترێ: کوشتنی بە ئانقەست (**القَتْلُ العَمْد**).

(أَخْذَةً رَّابِيَةً): واتە: گرتنێکی زێدە، (**الرَّبوَةُ وَ الرَّابِيَةُ، كَأَنَّها رَبَتْ بِنَفسِها فِي مَكانٍ**)، (**رَبوَة**) و (**رَابِيَة**) بە گردۆلکە دەگوترێ، واتە: ڕەبیە، بە سەنگەرێك دەگوترێ

لەسەر گردێك لێدرابێ، كە بە (ربایا) كۆ دەكرێتەوە، واتە: سەنگەرەكانی كە لەسەر گردو بەرزاییەكانن، ئنجا (رَبْـوَة) و (رَابِيَـة) بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، یانی: خۆی بەرزی كردۆتەوە لە ئاستی زەوی، (رَبَى: أي: زَادَ وَعَلَا)، واتە: زیادی كردو بەرز بووەوە (أَخۡذَةً رَّابِيَةً): واتە: گرتنێكی بەرز، گرتنێكی بەرزتر لە ئاستی گرتنەكانی خوا ﷻ بۆ گەلە پێشووەكان.

(تَذۡكِرَةً): (التَّذكِـرَةُ: مـا يُتَذَكَّـرُ بِـهِ الـشَّيءُ)، (تَذْكِـرَة): ئەوەیە بەهۆیەوە شتێكت بێتەوە یاد، (وَهُـوَ أَعَـمُّ مِـنَ الدِّلاَلَـةِ والأَمـارَةِ)، وشەی (تَذْكِـرَة) بیركەوتنەوە مانایەكەی گشتییترە لە: (دِلالَة)یان (دَلالَـة) گەیاندن و (أَمـارَة) نیشانە.

(وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ): گوێیەكی وەرگر و تێگەیشتوو تێبگات، (الوَعِـيُ: حِفْـظُ الحَدِيـثِ وَنَحوِه، يُقـالُ: وَعَيتُـهُ فِي نَفـسِي، والإِيعـاء: حِفـظُ الأَمتِعَـةِ في الوِعـاءِ، قـالَ تَعـالَى: ﴿وَجَمَعَ فَأَوۡعَىٰٓ ١٨﴾ المعـارج)، وەعیی بریتییە لە وەرگرتنی قسەو پاراستنی، (وَعَيتُـهُ فِي نَفـسِي) واتە: لە دڵی خۆمدا هەڵمگرت ئەو قسەیە، پاراستم، بەڵام وشەی (إيعـاء): بریتییە لەوەی شتێك لە دەفرێك، توورەگەیەك (وِعـاء)دا، شتێك كە كەل و پەلی تێدەكرێ، تێیبهاوێی و تێیدا بپارێزرێ، وەك خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَجَمَعَ فَأَوۡعَىٰٓ ١٨﴾ المعـارج، باسی بابایەكی بێبڕوا دەكات، دەفەرمووێ: ماڵ و سامانی كۆكردۆتەوەو هەڵیگرتوە لە توورەكەدا، یان لە قاسەدا، هەر خەریكی ژماردن و هەڵگرتنیەتی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەویش مەبەستی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوای تاک و پاک دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوای کارزان دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوای میهرەبان ئەنجام دەدەم

﴿ ٱلْحَاقَّةُ ﴾: **(الحاقة)**، یانی: کارەساتە چەسپاوەکە، یان کارەساتە چەسپێنەرەکە، وەك دوایی باسی دەکەین، ﴿ مَا ٱلْحَاقَّةُ ﴾، **(الحاقة)** چییە؟ کارەساتە چەسپاوەکە، یان کارەساتە چەسپێنەرەکە چییە؟ ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَاقَّةُ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانینیوەو وایکردوە بزانی **(الحاقة)** چییە؟ هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ باسی نەکردوە چییە، بەڵام **(الحاقة)** یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، کە حەقەکانی تێدا دەچەسپێن، کارەساتێکە بەسەر گەردووندا دێ و، چەسپاوەو هەر دێ، بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە، خوا ڕۆژی دوایی، بە زۆر وشان ناو ناوە، لەبەر ئەوەی کارەساتێکی یەکجار گەورەو مەزنە، ناوی زۆری هەن.

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ وَعَادٌۢ بِٱلْقَارِعَةِ ﴾، گەلی سەموودو گەلی عاد بێبڕوابوون بە داچڵەکێنەر، داچڵەکێنەریان بە درۆ دانا، **(قَارِعَة)**ش یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی.

﴿ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا۟ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴾، ئنجا هەرچی گەلی سەموودە، بە (**طاغِيَة**) فەوتێندران، (**طاغِيَة**) واتە: لە سنوور دەرچوو، یاخیبوو، سنووربەزێن، کە بە دڵنیاییی لێرەدا وشەی (**طاغِيَة**) سیفەتە بۆ وەسفکراوێکی قرتێندراو، وەك: (**صَيحةٍ طاغِيَة**)، هاڕژنێکی لە سنوور دەرچوو، یاخود (**رَجفَةٍ طاغِيَة**)، لەرزینەوەیەکی لە سنوور دەرچوو، یاخود (**صَاعِقَةٍ طاغِيَة**)، بڵێسە ئاگرێکی لە سنوور دەرچوو، خوای باڵادەست ئەو سزایەی گەلی سەموودی پێ فەوتاندوە، بە هەموو ئەو وشانە پێناسەی کردوە، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (الحجر)دا بەسەرهاتی صاڵح (**عَلَيْهِ السَّلام**) و گەلەکەی سەموودمان باسکردوە، لەوێدا هەموو ئەو وشانەی خوا بەکاری هێناون بۆ فەوتاندنی گەلی سەموود، هێناومانن و ئەو ڕاستییەمان ڕوونکردۆتەوە، کە هەموو ئەو وشانە تێك ناگیرێن، بەڵکو هەر کامێکیان تەعبیر دەکات لە گۆشەیەك و لە ڕوویەکی ئەو سزاو بەڵایەی بەسەر گەلی سەموود هاتوەو پێی فەوتاون.

﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴾، بەڵام گەلی عاد بە بایەکی زۆر ساردی بەهێزی لە سنوور دەرچوو فەوتێندران، ﴿ صَرْصَرٍ ﴾، بە مانای: زۆر سارد دێ و، بە مانای: زۆر بەهێزیش دێ، ﴿ عَاتِيَةٍ ﴾ش لە (**عَتا**)ەوە هاتوەو ئەویش لە (**عُتُوّ**)، واتە: لە سنوور دەرچوون و سنوور بەزاندن و یاخیبوون، ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو بایەی خوا ناردوویەتی، لە فریشتەکانیش یاخیی بووەو بە قسەی فریشتەکانیشی نەکردوە! بەڵام پێم وانیە ئەو مانایە ڕاست بێ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە بایەك بووە، وەك بای ئاسایی نەبووە، بەڵکو بایەکی لە سنوور دەرچوو بووە، لە بازنەو سنووری بای ئاسایی چۆتە دەرێ، ﴿ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا ﴾، خوا ئەو بایەی ملکەچ کردو بەسەر وانیدا زاڵکرد، حەوت شەوو هەشت ڕۆژان بەردەوام، یاخود: ﴿ حُسُومًا ﴾، واتە: زۆر نەگبەت و بێ خێر بووە، یاخود: یانی: ئەو بایە ئەوانی دەبڕی.

﴿فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ﴾، ئنجا تۆ خەڵکەکەت دەبینی، ﴿ٱلْقَوْمَ﴾، (أل)ەکەی بۆ ناساندنەو بۆ (عهد)ە، واتە: خەڵکەکە، ئەو خەڵکەی گەلی عادت دەبینی کەوتبوون، تخێڵ بوو بوون و فەوتا بوون، ﴿كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ﴾، هەر وەك کۆتەرە دار خورما کلۆرەکان وابوون، یاخود: وەك بنکە دار خورما کەوتووەکان وابوون، ﴿فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ﴾، ئنجا ئایا هیچ کەسێکت تێدا دەبینن، مابێ؟ یان: ئایا هیچ کۆمەڵێکی ماوت تێدا دەبینین؟ واتە: کەست لێ نەدەبینین و گەلی عاد، کەسیان نەما.

﴿وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَـٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ﴾، هەروەها فیرعەون و ئەوانەش کە لەپێشەوەی بوون و، شارە هەڵگێڕدراوەکانیش تاوان و گوناهیان کرد، ﴿وَمَن قَبْلَهُۥ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**وَمَـن قِبَلَـهُ**)، ئەوانەی لە لای بوون، یانی: ئەوانەی لەگەڵ فیرعەوندا بوون، ئەوانەش هەموویان تاوانێکی زۆر خراپیان کرد، ﴿فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ﴾، ئنجا سەرپێچییان لە نێردراوی پەروەردگاریان کرد، ﴿فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً﴾، خوا ﷻ گرتنی بە گرتنێکی زۆر زێدە، گرتنێك کە زێدە بوو لە گرتنەکانی خوا ﷻ بۆ گەلە پێشووەکان، لەبەر ئەوەی ئەوانە لە گەلەکانی دیکە ملهوڕترو یاخییتر بوون، خواش گرتنەکەی بۆ ئەوان توندتر بووە، چونکە گەلی عاد بوون دەیانگوت: ﴿مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ...﴿١٥﴾﴾**فصلت**، کێ لە ئێمە بەهێزترە! زۆر بە خۆیان دەنازی.

﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَـٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ﴾، ئنجا خوا ﷻ باسی ئەو ڕووداوە گشتگیرە مێژووییە دەکات کە بریتیە لە تۆفانەکەی نووح، ئەوەشمان دێنێتەوە یادو دەفەرموێ: ئێمە کاتێك ئاوەکە لە سنوور دەرچوو، ئێوەمان لە ڕۆیشتووەکەدا (بە نێو ئاو ڕۆیشتووەکەدا هەڵگرت) مەبەست پێی کەشتییەکەیە، ﴿ٱلْجَارِيَةِ﴾ش، دیسان سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، واتە: (**حَمَلْنَاكُم فِي السَّفِينَةِ الجَارِيَة**)، لە کەشتییە بە نێو ئاو ڕۆیشتووەکەدا ئێوەمان هەڵگرت، ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: کوا ئێمە سواری کەشتیی نووح بووین؟ بەڵام مەبەست ئەوەیە باب و

باپیرانی ئێوەمان لەو کەشتییەدا هەڵگرت و ئەگەر باب و باپیرانتان بەو کەشتییە دەرباز نەکرابان، ئێوەش پەیدا نەدەبوون، چونکە مرۆڤایەتیی لە دوای نووح، هەمووی وەچەی نووحە، واتە: هەمووی وەچەی ئەوانەیە کە لەگەڵ نووحدا، سواری کەشتییەکە بوو بوون.

ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ ئەوەمان بۆ باس دەکات؟ دەفەرمووێ: ﴿لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ﴾، بۆیە ئەو بەسەرهاتەتان بۆ باس دەکەین، تاکو بۆتان بکەینە بیرخەرەوە، ﴿وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ﴾، هەروەها تاکو گوێیەك کە وەردەگری و دەبیستێ، ئەویش تێبگات و وەریبگرێ و پەندی لێ وەربگرێ.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**ناونانی ڕۆژی دوایی بە (الحاقة)و، پرسیارکردن لە بارەیەوە، بە مەبەستی مەزنیی و بێڕەزایی پێشاندانی، ئەو ڕووداوەو، ئەو ڕۆژە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٣﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

**١)- ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾**، چەسپاوەکە، **(الحَاقَّة: السَّاعَةُ والقِيَامَةُ الواجِبَةُ الوقُوع، وَهُوَ اسمُ فاعِلٍ مِنْ حَقَ الشَّيءُ أَي: وَجَبَ، والحَقُّ وَالحَقَّةُ، ثَلاثُ لُغاتٍ)**، وشەی **(حاقَّة)** بە مانای **(سَاعَة)**: ئاخیر زەمان و، بە مانای **(قِيامَة)** هەڵسێنرانەوەو زیندووکرانەوە دێ، ئەو ئاخیر زەمان و قیامەتەی پێویستە ڕوو بدەن، وشەی **(حاقَّة)**ش ناوی بکەر **(إسم فاعِل)**ە، **(مِن حَقَّ الشَّيءُ أَي ثَبَتَ وَوَجَبَ)**، واتە: شتەکە چەسپاو پێویست بوو، ئنجا **(حَق)** و **(حَقَّة)** و **(حاقَّة)**، سێ وشەن هەر سێکیان بە مانای شتی چەسپاو و پێویست بوو، بەکاردێن.

**٢)- ﴿مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾**، حاققە چییە؟! **(فـي الإستِفهامِ تَعظِيمٌ لِشَأنِ الحَاقَّةِ وَتَهوِيلٌ لأَمرِها أَيُّ: أيُّ شَيءٍ السَّاعَةُ الحَاقَّة؟)**، لە پرسیار کردن لە بارەی **(حاقَّة)**وە، بە مەزن پێشاندان و بێڕەزا پێشاندانی هەیە، یانی: ئایا ئەو ڕووداوەی پێویست بووەو چەسپاوە، چییە؟

**٣)- ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾**، چ شتێك بە تۆی زانینیوە **(حاقَّة)**، چییە؟ نەك چ شتێك بە تۆی زانیوە، چونکە بە تۆی زانیوە واتە: بە تۆی ناسیوە، بەڵام بە تۆی زانینیوە، واتە: وای لە تۆ کردوە بیزانی، کە لەوانەیە بۆ یەکەم جار بێ ئەو وشەیە بەندە بەکاری بێنێ، مەبەستم ئەوە نیە بەس لێرە بەکارم هێنابێ، بە تۆی زانینیوە، یان بەتۆی زاناندوە،

یانی: وایکردوه تۆ بزانی (أَيُّ شَيءٍ عَرَّفَكَ وأَدراكَ، أَيُّ شَيءٍ الحَاقَّة؟)، چ شتێك بە تۆی ناساندوەو تۆی زاناندوە (الْحَاقَّة)، بریتیە لەچی؟

با تۆزێك سەرنجی هەندێك قسەی زانایان بدەین، لە بارەی وشەی (الْحَاقَّة)ەوە:

١- (إِبن عاشور) دەڵێ: (الْحَاقَّةُ صِيغَةُ فَاعِلٍ مِنْ: حَقَّ الشَّيْءُ إِذَا ثَبَتَ وُقُوعُهُ، وَالْهَاءُ فِيهَا لَا تَخْلُو عَنْ أَنْ تَكُونَ هَاءَ تَأْنِيثٍ، فَتَكُونُ الْحَاقَّةُ وَصْفًا لِمَوْصُوفٍ مُقَدَّرٍ مُؤَنَّثِ اللَّفْظِ، أَوْ أَنْ تَكُونَ هَاءَ مَصْدَرٍ عَلَى وَزْنِ فَاعِلَةٍ، مِثْلَ الْكَاذِبَةِ لِلْكَذِبِ، وَالْخَاتِمَةِ لِلْخَتْمِ، وَالْبَاقِيَةِ لِلْبَقَاءِ، وَالطَّاغِيَةِ لِلطُّغْيَانِ، الْحَاقَّةُ مُبْتَدَأٌ ومَا مُبْتَدَأٌ ثَانٍ، والْحَاقَّةُ الْمَذْكُورَةُ ثَانِيًا خَبَرُ الْمُبْتَدَأِ الثَّانِي، وَالْجُمْلَةُ مِنَ الْمُبْتَدَأِ الثَّانِي وَخَبَرِهِ، خَبَرُ الْمُبْتَدَأِ الْأَوَّلِ، ومَا اسْمُ اسْتِفْهَامٍ مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّهْوِيلِ وَالتَّعْظِيمِ).

جار جار لە ڕووی ڕێزمانییشەوە قسە لەسەر ئایەتەکان دەکەین، بۆ ئەوەی مانایەکە ڕۆشنتر بێ بۆ کەسانێك کە شارەزای زمانی عەرەبیین، لە وردەکاریی ڕستە بەندیی و پێکهاتەی زمانەوانیی ئایەتە موبارەکەکان شارەزاتر بن، جار جار ئاماژەش بەو لایەنە دەکەم، بەپێی ئەوەی لە قسەی ڕوونکەرەوانی قورئاندا دەیبینین، ئەگەر بزانم شتێك زۆربەیان گرنگییان پێداوە، ئێمەش گرنگییەکی پێ دەدەین.

(إِبن عاشور) دەڵێ: (حاقَّة)، ڕێژگەی بکەرە لە (حَقَّ الشَّيءُ)وە هاتوە، (حَقَّ الشَّيءُ: أَي ثَبَتَ وقُوعُهُ)، واتە: شتەکە بوونەکەی، ڕوودانەکەی چەسپا، ئنجا (ها) یەکەی (الحاقَّة) لە دوو حاڵ بەدەر نیە:

أ- یان (ها)ی مێینەیە، ئەو کاتە دەبێ (حاقَّة)، وەسف بێ بۆ وەسفکراوێکی مەزەندە کراو، کە مێینە بێ، {واتە: بێژەکەی مێینە بێ، مێینەی مەجازیی بێ، وەك (الحادِثَة)، (الحادِثَةُ الحَاقَّة)، یان (القِيامَةُ الحاقَّة)، یان (السَّاعَةُ الحَاقَّة)، واتە: ئەو ڕووداوەی چەسپاوە، یان پێویستە ببێ، یان ئەو قیامەتەی پێویستە بێ، یان ئەو ئاخیر زەمانەی پێویستە بێ}.

**ب-** ئەگەری دووەم ئەوەیە کە (ها)ی چاوگ بێ لەسەر کێشی (فاعل)، وەك (**الكَاذِبَة**)، بۆ (**كَذِب**) درۆ، (**الكَاذِبَة**) یانی: درۆ، (**خاتِمَة**) بۆ (**خَتم**) کۆتایی، چاوگە، (**الباقِيَة**) بۆ (**بَاقِي**)، ماوە، مانەوە، (**الطَّاغِيَة**) بۆ (**طُغيَان**)، واتە: لە سنوور دەرچوون.

لە ڕووی ڕێزمانییشەوە:

کە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾، ئەمە دەبێتە نیهاد (**مُبتَدأ**)، (**ما الحاقَّة**)، (ما) نیهادی دووەمە، ﴿ٱلۡحَآقَّةُ ۝٢﴾، دەبێتە گوزارە بۆ نیهادی دووەم، ڕستەکەش هەمووی دەبێتە گوزارە بۆ نیهادی یەکەم، وشەی (ما) ﴿مَا ٱلۡحَآقَّةُ﴾، ناوی پرسیار کردنەو لە بێرەزایی پێشاندانی شتێکدا بەکارهێنراوە.

ئەمە قسەی (**ابن عاشور**)ە لە بارەی وشەی (**حاقَّة**)و پێکهاتەی ئەو دوو ڕستەیەوە: (ٱلۡحَآقَّةُ، مَا ٱلۡحَآقَّةُ).

٢- (**الطبري**) دەڵێ: (**الحَاقَّةُ: السَّاعَةُ الَّتِي تَحِقُّ فِيهِ الأُمُورُ وَيَجِبُ فِيهِ الجَزاءُ عَلَى الأَعْمَال**)، (**حاقَّة**): ئەو کاتەیە کە کارەکانی تێدا دەچەسپن و سزاو پاداشت لەسەر کردەوەکان لەوێدا پێویست دەبێ.

٣- (**الشَّوكَاني**) دەڵێ: (**الحَاقَّةُ: الأَمرُ الَّذِي يَحِقُّ فِي القِيامَةِ، وَهِيَ تَحِقُّ فِي نَفْسِهَا مِنْ غَيرِ شَكٍّ**)، ئەو کارەی لە قیامەتدا دەچەسپێ و، بێگومان ئەویش لە زاتی خۆیدا بەبێ دوو دڵیی دەچەسپێ، واتە: ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت و هەڵسانەوەوە.

٤- (**القرطبي**): پێنج ڕای هێناون لە بارەی ﴿ٱلۡحَآقَّةُ﴾ەوە، بۆچی ئەو ناوە لە ڕۆژی دوایی نراوە؟

**یەکەم:** (**الأُمُورُ تُحَقُّ فِيها**)، کارەکان لەو ڕۆژەدا دەچەسپن.

**دووەم:** (**تَكُونُ مِن غَيرِ شَكٍّ**)، لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی چەسپاوە بەبێ دوو دڵیی، واتە: لەبەر ئەوەی ڕۆژەکە بۆ خۆی چەسپاوەو کارەساتەکە چەسپاوە.

**سێیەم:** (**أَحَقَّت لِأَقْوَامٍ الْجَنَّةَ، وَأَحَقَّتْ لِأَقْوَامٍ النَّارَ**)، ئەو ڕووداوەی ئەو ڕۆژە: بۆ کۆمەڵانێك بەهەشت پێویست دەكات و دەچەسپێنێ و، بۆ کۆمەڵانێکیش دۆزەخ و ئاگریان بۆ دەچەسپێنێ.

**چوارەم:** (**كُلُّ إِنْسَانٍ يَصِيرُ حَقِيقاً بِجَزَاءِ عَمَلِهِ**)، هەموو مرۆڤێك لەو ڕۆژەدا شایستە دەبێ بە سزاو پاداشتی کردەوەکانی.

**پێنجەم:** (**حَاقَقْتُهُ أَيْ: غَالَبْتُهُ فَغَلَبْتُهُ، فَالْقِيَامَةُ حَاقَّةٌ لِأَنَّهَا تَحُقُّ كُلَّ مُحَاقٍّ فِي دِينِ اللَّهِ بِالْبَاطِلِ**)، (**حَاقَقْتُهُ**) واتە: (**غَالَبْتُهُ**)، واتە: لەگەڵیدا بوو بە کێشەم و بەسەریدا زاڵ بووم، ئنجا قیامەتیش بۆیە پێی دەگوترێ: (**حاقَّة**)، چونکە هەر مشت و مڕ کەرێك بە ناهەق لە بارەی ئایینی خواوە شەڕە قسە بکات، بەسەریدا زاڵ دەبێ.

لە بارەی﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾ەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە هاتوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، (**القرطبي**) هێناویەتی و، زۆربەی تەفسیرەکانیش ئاماژەیان پێکردوە:

(**رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﵄**، كُلُّ شَيْءٍ فِي الْقُرْآنِ:** ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾**، فَقَدْ أَدْرَاهُ، وَكُلُّ شَيْءٍ مِنْ قولە: (وَمَا يُدرِيكَ) فَقَدْ طَواه عنه، وَقَالَ الرَّاغِبُ كُلُّ:** ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾**، فَقَد عُقِبَ بِبَيَانِه:** ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ۝١٠ نَارٌ حَامِيَةُۢ ۝١١ ﴾**القارعة**).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: هەر شتێك لە قورئاندا خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾، خوا فێری پێغەمبەری کردوە ﷺ پێی زانینیوە، بەڵام هەر شتێك لە فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: (**وَما يُدرِيكَ**) چ شتێك پێت دەزانێنێ! ئەوە زانیارییەکەی لە پێغەمبەر ﷺ پەنهانکراوە.

[ئەوەش هەڵهێنجانی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەو بە تێوەڕامان و ئیستیقڕای ئەو شوێنانەی ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾ و (**وَما يُدرِيكَ**)یان تێدا هاتوە].

ڕاغیبی ئەصفەهانیی گوتوویەتی: هەموو ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ ﴾یەك کە لە قورئاندا هاتوە، لە دوایەوە ڕوونکردنەوەکەی هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ

﴿مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌ ﴿١١﴾﴾ القارعة، تـۆ چووزانـی ئـەوە چییـە؟ ئاگرێـکی زۆر گەرمـە.

ئاگریـش بـۆ خـۆی هـەر گەرمـە، بـەڵام خـوا ﷻ ئاگرێـك بـە گەرمیـی، وەسـف بـکات واتـە: گەرمییـەکی نائاسـایی، نـەك ئـەو گەرمییـەی دەیزانیـن، کـە وەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە[1]: ئاگـری دۆزەخ حەفتـا هێنـدەی ئاگـری دنیـا گەرمـە، کـە زانایـان دەڵێـن: ئـەو وشـەی (حەفتـا)ش بـۆ زۆرییـە، ئەگەرنـا مـەرج نیـە، ڕێـك حەفتـا هێنـدە گـەرم بـێ، دەگونجـێ کەمـتر بـێ و دەگونجـێ زیاتریـش بـێ.

(١) {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُـولَ اللـهِ صـلى اللـه عليـه وسـلم قَـالَ: نارُكـمْ جُـزْءٌ مِـنْ سَـبْعِيَن جُـزْءًا مِـنْ نَـارِ جَهَنَّـمَ، قِيـلَ: يَـا رَسُـولَ اللـهِ! صـلى اللـه عليـه وسـلم إِنْ كَانَـتْ لَكَافِيَـةً! قَـالَ: فُضِّلَـتْ عَلَيْهِـنَّ بِتِسْـعَةٍ وَسِـتِّينَ جُـزْءًا، كلُّهُـنَّ مِثْـلُ حَرِّهَـا} أخرجـه أحمـد: ١٠٢٠٤، والبخـاري: ٣٠٩٢، ومسـلم: ٢٨٤٣، والترمـذي: ٢٥٨٩.

مەسەلەی دووەم:

**بـە درۆ دانـانی گـەلی سـەموودو گـەلی عـاد، بـۆ قیامـەت، یـان بـۆ ڕۆژی داچڵەکێنـەرو، فەوتێـنرانی گـەلی سـەموود بـە هاڕژنێـکی بێـڕەزاو، گـەلی عادیـش بـە بایـەکی زریـانی ساردو لـە سـنوور بـە دەر، سـەرەنجام خەڵکەکـە وەك کۆتـەرە دار خورمـای کلـۆر بـە مردوویـی تخێـل بـوو بـوون و کەوتبـوون:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ﴿٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ﴾، سەموودو عاد داچڵەکێنەریان بە درۆ دانا، **(قارِعَةُ)** یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، هەروەك چۆن **(حاقَّة)**ش یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی دوایی، ئنجا **(قارِعَة)** وەك پێشتر گوتمان: لە **(قَرْع)**ەوە هاتوە، **(قَرع)**یش بریتیە لەوەی شتێك لە شتێك بدەی، زرینگەی بێ و دەنگی بێ، دەنگێك کە مرۆڤ داچڵەکێنێ، واتە: **(القارِعَةُ: القِيامَةُ الَّتي تَقرَعَ النَّاسَ بِالإفزاعِ وَالأهوال)**، ئەو قیامەت و ڕۆژی دواییەی خەڵك دادەچڵەکێنێ بە ترساندنیان و بە سامناکییەکانی، ئەو شتە سامناکانەی تێیدا دێنە دی.

بۆیـە خـوا ﷻ فەرموویـەتی: ﴿كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ﴾، لـە جیـاتی بفەرمـوێ: **(بِالحاقَّـة)**، بـۆ ئـەوەی بزانـرێ ئـەو **(حاقَّة)**یـەی یەکێکـە لـە نـاوەکانی ڕۆژی دوایـی، وێـڕای ئـەوە ڕۆژی دوایـی ناوێـکی دیکـەشی هەیـەو بریتیـە لـە **(قارِعَـة)**، دیسـان بـۆ ئـەوەی بشـزانرێ: وێـڕای ئـەوەی ئـەو کارەسـاتە وەك چـۆن سـزاو پاداشـتەکان

دەچەسـپێنێ و، ڕووداوێکـە چەسـپاوە، بەهەمـان شـێوە ڕووداوێـکی داچڵەکێنـەرو ڕاچڵەکێنەریشــە.

ئنجـا خـوا ﷻ بـاسی سـەرەنجامی هـەر کام لـە گـەلی سـەموودو گـەلی عـاد دەکات، دەفەرمــوێ:

**٢)-** ﴿ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ ﴾، ئنجا هەرچی گەلی سەمووود بوون، بە کارەساتێکی لە سنوور بەدەر فەوتێندران، (**الطَّاغِيَة: الواقِعَةُ المُجاوِزَةُ للحَدّ**)، واتە: ڕووداوێکی سنوور بەزێن، کە لە قورئان دا: (**الصَّيحَةُ وَالصَّاعِقَةُ وَالرَّجفَةُ وَالزَّلزَلَة**)، هەموو ئەو ناوانە بۆ ئەو سزایەی گەلی سەموودی پێ سزا دراوە، بەکارهێنراون، (**صَيحَة**) واتە: هاڕژن، دەنگێکی زۆر بێرەزا، (**صاعقَة**) واتە: ئاگرو بڵێسەیەك کە لە ئاسمان بێتە خوار، (**رَجفَة**) واتە: داچڵەکێنەرو ڕاچڵەکێنەرێکی گەورە، (**زَلزَلَة**) واتە: لەرزاندنەوە، بوومەلەرزە، هەموو ئەو وشانە بەکارهێنراون بۆ ئەو بەڵایەی خوا بۆ گەلی سەموودی ناردوە، واش پێدەچێ پێشێ دەنگێکی گەورە بووبێ، دوایی ئەو دەنگە گەورە بۆتە لەرزینەوە، ئەویش بۆتە هۆی ڕاتەکاندن، ئنجا ئەویش بۆتە هۆی ئاگرێکی بڵێسەدار، یان: لە ئەصڵدا ئاگرێکی بڵێسەدار بووەو هاتۆتە خوار بۆیان و، دەنگێکی گەورەی لێ پەیدابووەو، لەرزینەوەی لێ پەیدابووەو، تەقینەوەی لێ پەیدابووە، بۆیە خوا ﷻ لە هەر سووڕەتەداو، لە هەر سیاقەدا، وشەیەك کە تەعبیر لە لایەنێکی دەکات و لەگەڵ ئەو دۆخەدا دەگونجێ، هێناویەتی، کە بە هەموویان دیمەنەکەمان چاك دەخەنە بەر چاو، لە تەفسیری سووڕەتی (الحجر)یش دا، بەسەرهاتی گەلی سەموودمان بە تەفصیل باسکردوە.

کەواتـە: (**طَاغِيَـة**) واتـە: لـە سـنوور دەرچـوو (**بِالصَّيحَـةِ الطاغِيَـة**)، یـان (**الواقِعَـةِ الطَّاغِيَـة**)، هاڕژنـە لـە سـنوور دەرچووەکـە، ڕووداوە لـە سـنوور دەرچووەکـە.

**٣)-** ﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴾، بەڵام گەلی عاد بە بایەکی زۆر ساردی بەهێزی لە سنوور دەرچوو، یان زۆر توند هەڵکردوو، فەوتێنران، وشەی: ﴿ صَرْصَرٍ ﴾، بە چەند جۆرێك مانا کراوە:

أ- (**شَدِيدة الصَّوت، لَها صَرصَرَةٌ تَحْرِقُ بِبَرْدِها**)، ﴿صَرْصَرٍ﴾، یانی: دەنگی بەهێزی هەیە و سیڕە سیڕی دێ، بە ساردییەکەی دەسووتێنێ.

ب- (**شَدِيدَة الهُبُوب، شَدِيدَة الصَّوت**)، بایەك كە زۆر بە توندیی هەڵیكردبێ و دەنگەكەی زۆر بەهێز بێ.

ج- (**شَدِيدَة البَرد**)، بایەك زۆر سەخت و سارد بێ.

كەواتە: ئەو بایە بایەك بووە: هەم زۆر سارد بووە، هەم زۆر بەتوندیی هەڵیكردوە، هەم دەنگەكەی زۆر بەهێز بووە، كە دەفەرموێ: ﴿عَاتِيَةٍ﴾، سنووری بەزاندبوو و یاخیبوو بوو بە مل گەلی عاددا (**يَعني: عَتَت عَلَى عادٍ فَما قَدَرُوا عَلَى رَدِّها وَالخَلاصِ مِنها**)، بەسەر گەلی عاددا یاخیی بوو بوو لێیان هار بوو بوو، كە نەیانتوانی بەرپەرچی بدەنەوەو لێشی دەرباز بن.

٤)- ﴿سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ﴾، (خوا) ملكەچی كردبوو و بەسەریان دا زاڵی كردبوو.

﴿سَخَّرَهَا﴾، بە مانای ملكەچی كردبوو، كە بۆ خوا ملكەچ بوو، بەڵام بۆ گەلی عاد، خوا بەسەریاندا زاڵیكردبوو (**يَعني: سَخَّرَها وَسَلَّطَهَا عَلَيهِم**)، ملكەچی كردبوو ڕام و دەستەمۆی كردبوو و بەسەر وانیدا زاڵ كردبوو، لەوانی بەردابوو.

٥)- ﴿سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا﴾، حەوت شەوو هەشت ڕۆژان، بەردەوام و بێ پسانەوە، هەروەها ﴿حُسُومًا﴾، وێڕای: أ- بەردەوام، ب- بە مانای بڕینیش دێ، واتە: دەیبڕین، ج- هەروەها بە مانای بێ خێرو نەگبەتیش دێ، بایەكی بێ خێرو نەگبەت بوو، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فِيٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ ...﴿١٦﴾﴾**فصلت**، لە ڕۆژانێكی نەگبەت و بێخێردا، یانی: بۆ ئەوان ڕۆژانێكی نەگبەت و بێ خێر بوون، چونكە خۆیان نەگبەت و خراپ بوون، ئەگەرنا كات (**زمن**) لە خودی خۆیدا، چاك و خراپی نیەو بێ لایەن (**مُحايد**)ە.

٦)- ﴿فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ﴾، {دوای ئەو حەوت شەوو هەشت ڕۆژە} خەڵكەكەت لەوێدا بە مردوویی و تخێلیی دەدی، ﴿ٱلْقَوْمَ﴾، واتە: خەڵكەكە، (أل)كەی بۆ ناساندنەو

ناساندنی (عهد)ە، واتە: خەڵکەکە، خەڵکی گەلی عادت دەبینی ﴿فِيهَا﴾،یانی: ١- لە شارو وڵاتەکەیان دا، ٢- یاخود لە سەر زەوی، ٣- یاخود لەو بایەدا، کە خوا بەسەریدا هەڵکردبوون ﴿صَرْعَىٰ﴾، (صَرْعَى: جَمعُ صَرِيع أَي: هَلكَى)، (صَرِيع) بە مانای مردووەو، لەگەڵ مردنیشدا کەوتوو و تخێڵ بوو.

٧)- ﴿كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ﴾، وەك کۆتەرە دارخورما لە کلۆرەکان بوون، یاخود: کۆتەرەدار خورما کەوتووەکان، وشەی ﴿أَعْجَازُ﴾، کۆی (عَجُز)ە، کە بە دواوەی هەر شتێك دەگوترێ، لێرەش دا: (يَعني: أُصُولُ النَّخلِ)، بنکە دارخورمایەکان، (نَخل)یش ناوی کۆیە بۆ (نَخلَة)، یانی: یەك دار خورما، واتە: وەك کۆتەرەدار خورمایەکان بوون، بەڵام ئەو کۆتەرەدار خورمایانە چۆن بوون؟ ﴿خَاوِيَةٍ﴾، ئەمیش هەم بە مانای (ساقِطَة) دێ، کەوتووەکان، هەم بە مانای (خالِيَة) دێ، کلۆرو بۆشەکان ﴿خَاوِيَةٍ﴾، کۆی (خاوي)ە، یانی: بۆش و کلۆر.

٨)- ﴿فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ﴾، ئایا کەسێکت لێ دەبینین، مابێ؟ (فَهَل تَرَى لَهُم مِن نَفسٍ باقِيَة)، ئایا هیچ کەسێکت لێ دەبینین، لە نێویان دا مابێ؟ واتە: هیچ کەست نەدەبینی، ئەم پرسیار کردنە پرسیارکردنی نکووڵییلێکردنەو وەڵامەکەی لە نێو خۆی دایە، (باقِيَة) لێرەدا بۆ نەفس دەچێتەوە، یانی: (فَهَل تَرَى لَهُم مِن نَفسٍ باقِيَة)، یاخود (باقِيَة) لەسەر کێشی (فاعِلة)یەو چاوگە، یانی: (فَهَل تَرَى لَهُم مِن بَقاء)، ئایا هیچ مانەوەت لێ دیتن؟ وەك (طاغِيَة) و (خاتِمَة) و (كاذِبَة) کە بە مانای: یاخیبوون (طُغيَان) و، درۆ (كَذِب) و، کۆتایی (خَتم)، دێن.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە: تۆ هیچ کەسێکت لەوان نەدەبینی مابێ، ئەویش سێ ئەگەری هەن:

أ- (باقِيَة) بچێتەوە بۆ وەسفکراوێکی قرتێنراو، یانی: (فَهَل تَرَى لَهُم مِن نَفسٍ باقِيَة).

ب- یاخود: (هَل تَرَى لَهُم مِن مَجمُوعَةٍ باقِيَة)؟ ئایا هیچ کۆمەڵێکی ماوت لێ دەبینین؟.

ج- یاخود: (باقِيَة) چاوگەو بە مانای مانەوەیە، ئایا هیچ مانەوەت لێ دەبینین؟ نەخێر.

لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم کە لە هەندێك تەفسیراندا هەندێك شت دێنن، هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان باش سەرنجیان نەداون و لێیان ورد نەبوونەوە، ئەگەرنا نەدەبوو ئەو شتانە بێنن، بۆ وێنە: (**البحرُ المَديد في تَفسِير القُرآن المَجِيد**)ی (**إبنُ عَجِيبة**)[1]، دەڵێ:

(**وَكَانَت أَجْسَامُهُم طِوالاً تَبلُغُ مِئَةَ ذِرَاعٍ أَو مِئَتَيْن، وَلِذَلِك شُبِّهوا بَالنَّخْل**)، واتە: کەلەشەکانیان زۆر درێژ بوون، سەد گەز یاخود دوو سەد گەز دەبوون، بۆیە چوێنراون بە دار خورمایانەوە! دەڵێم: ئەگەر وابێ، دەبووایە دارخورما بەوان بچوێندرێن، چونکە دارخورما ئەگەر زۆر بەرز بێ، ئەو پەڕەکەی سی گەز دەبێ، یانی: پازدە مەتر دەبێ، بەڵام ئەگەر ئەوان سەد گەزو دوو سەد گەز، یانی: پەنجا مەترو سەد مەتر بووبن، دەبێ بڵێین: دارخورما وەك وان دەچێ، بۆیە ئەوە ئەفسانەیەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیەو پشت ئەستوور نیە، بە هیچ بەڵگەیەك، هەڵبەتە لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە کە ئادەم باڵای شەست گەز بووە، (**سِتُّونَ ذِرَاعَاً**)، بەڵام ئەوە بە نسبەت ئادەمەوە (**عَلَيْهِ السَّلام**) ئەویش وادیارە لە هەموو وەچەکەی بە قەدو قیافەو باڵای بەرزتر بووبێ، ئنجا گەیشتۆتە شەست زیڕاع کە دەکات دەوری سی مەتر، بەڵام ئەوە کە باڵای گەلی عاد سەدو دوو سەد گەز بووبێ، واتە: چەند هێندەی ئادەمیش بەرز بووبن، شتی وا لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەهاتوەو، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

---

(١) ج٨، ص١٢١.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هەروەها فیرعەون و گەلەکەی و ئەوانەی پێش وانیش، تاوانی گەورەیان کرد، کە سەرپێچییان لە نێردراوی پەروەردگاریان کردو، سەرەنجام خوا ﷻ بە گرتنێکی لە ڕادەبەدەر گرتنی:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوْا۟ رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴿١٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَجَآءَ فِرْعَوْنُ وَمَن قَبْلَهُۥ وَٱلْمُؤْتَفِكَٰتُ بِٱلْخَاطِئَةِ﴾، فیرعەون و ئەوانەی پێش وی و هەڵگێڕدراوەکانیش تاوانیان کرد، (**خَاطِئَة**) واتە: هەڵەو تاوان، واش پێدەچێ ئەوە وەسفی وەسفکراوێکی قرتێندراو بێ، واتە: (**بِالفِعلَةِ الخاطِئَة**)، کردارێکی تاوانیان کرد، یاخود (**خاطِئَة**) هەر بە مانای تاوان (**خَطِيئَة**) دێ، یان (**الخاطِئة**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، بەڵام بە کۆ: (**الأَفعال الخاطِئَة**)، کردەوە خراپەکانیان کردن.

دەشگونجێ (**خاطِئَة**) وەك پێشتریش باسمان کرد، چاوگ بێ، واتە: تاوانیان کرد، واتە: (**خاطِئَة**) لەسەر کێشی (**فاعِلَة**)یەو، بە مانای چاوگە، وەك (**كاذِبَة**) و (**خاتِمَة**) و (**طاغية**)، وشەی ﴿وَمَن قَبْلَهُۥ﴾، واتە: ئەوانەی لە پێش ویشدا بوون، کە هەموو گەلەکان دەگرێتەوە، ئەوانەی پێش فیرعەون بوون، ئەو گەلە یاخییانە، خوێندراویشەتەوە: (**وَمَن قِبَلَهُ**)، واتە: ئەوانەی لەلای ویەوە بوون (**وَمَنْ عِنْدَهُ**)، کە مەبەست پێی دارو دەستەکەیەتی، واتە: ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لە شوێنکەوتووان و سەربازەکانی، (**المُؤتَفِكات**) وەك پێشتریش گوتمان: هەڵگێردراوەکان (**المُنقَلِبات**) مەبەست پێی شارو ئاوەدانییەکانە کە لووطیان (**عَلَيْهِ السَّلام**) بۆ ڕەوانە کرابوو، دیسان (**المُؤتَفِكات**)یش سیفەتی

وەسفکراوێکی قرتێندراوە، یانی: (**المُدُنُ المُؤتَفِكات، القُرَى المُؤتَفِكات**)، یان (**القُرَى المُنقَلِبَة، المُدُنُ المُنقَلِبَة**) ئاوەدانییە هەڵگێڕدراوەکان، سەرەوبن کراوەکان، ئەوانە چییان کرد؟

٢)- ﴿ فَعَصَوْا رَسُولَ رَبِّهِمْ ﴾، سەرپێچییان لە نێردراوی پەروەردگاریان کرد، واتە: هەر کۆمەڵگایەك لەوانە سەرپێچییان کرد؟ لەو پێغەمبەرەی خوا ﷻ، کە وەك نێرراوو نوێنەری خۆی بۆی نارد بوون.

ئنجا ئایا خوا چی لێکردن؟

٣)- ﴿ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً ﴾، (خواش ﷻ) یەکسەر دوای ئەوە بەگرتنێکی زێدە گرتنی.

(ف) بۆ بەدواداهاتن (**تعقیب**)، یاخود بۆ جەزا (**جزاء**)یە، یانی: لە سزای ئەوەدا خوا گرتنی، گرتنێکی زێدە، (**رَابِيَة أَي: زائِدَةٍ في الشِّدَّة**)، لە سەختییدا زۆر زیاد بوو (**كَمَا زَادَت قَبَائِحهُم في القُبْحِ**)، وەك چۆن خراپەکانی وان لە دزێوییدا زێدەییان هەبوو، ئەو سزایەش کە خوا ئەوانی پێ سزادا، زێدەیی هەبوو لە سەختیی دا، دەگوترێ: (**رَبَّ الشَّيءُ يَرِبُّ أَي: زَادَ يَزِيدُ**)، شتەکە زیادی کرد، زیاد دەکات.

وشەی ﴿ رَّابِيَةً ﴾، ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە، لە (**رَبَى يَربُوا**)ەوە هاتوە، بەڵام لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ سەختیی و نارەحەتیی و توندیی.

دوای ئەوەی خوای کاربەجێ باسی ئەزموونی تاڵ و سەرەنجامی دژواری، هەر کام لە گەلی عادو سەموودی کرد، ئنجا باسی فیرعەون و ئەوانی پێش فیرعەونی کرد، یاخود ئەوانەی لەگەڵ فیرعەوندا بوون، هەروەها شارو ئاوەدانییەکانی کە لووطیان (**عَلَيْهِ السَّلام**) بۆ ڕەوان کرا، کە وەك چۆن ئەوان زگماکی خۆیان هەڵگێڕابۆوە، لە جیاتی ئەوەی پیاویان لەگەڵ ئافرەتدا غەریزەی جینسیی خۆی تێر بکات و بە شێوەیەکی شەرعیی، ئەوان هەڵسابوون نێربازییان دەکرد، ئەوان

فیـطرەتی خۆیـان هەڵگێڕابـۆوەو، خـوای پەروەردگاریـش ئاوەدانییـەكانی ئـەوانی هەڵگێڕانـەوە (**الجَـزاءُ مِـن جِنـسِ العَمَـل**)، وەك زانایـان گوتوویانـە: سـزاو تۆڵـە بەپێی جـۆری كردەوەكەیـە.

## مەسەلەی چوارەم:

**خـوای میهرەبـان لـە کاتی لـە سـنوور دەرچـوونی ئـاو و تۆفـانی نووحـدا (عَلَيْـهِ السَّـلام) مرۆڤـەکانی لـە کەشـتییە بەنێـو ئـاو ڕۆیشـتووەکەدا هەڵگرتـن، تاکـو ئـەو کەشـتییەو بەسـەرهاتەکەی بۆیـان ببێتـە بیـر خـەرەوەوەو، هـەر گوێیـەکی تێگەیشـتوو تێبـگات و وەریبگـرێ و، لێـی بەهرەمەنـد بـێ:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴿١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴾، بێگومان ئێمە کاتێك ئاوەکە لە سنوور دەرچوو، یاخیی بوو، لە (کەشتییە بە نێو ئاو) ڕۆیشتووەکەدا هەڵمانگرتن، (**الطُّغْيَانُ: مُسْتَعَارٌ لِلشِدَّةِ الخَارِقَة تَشْبِيهاً لَها بِطُغيانِ الطَّاغِي**)، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلْمَآءُ ﴾، (**طُغيان**) یاخیبوون، خوازراوەتەوە بۆ سەختیی و توندیی یاسادڕی ئاوەکە، کە چوێنراوە بە یاخیبوونی بابای یاخییەوە، واتە: وەك چۆن کەسێك یاخیی دەبێ و لە سنوور دەردەچێ، ئەو ئاوەش بوو بە لافاوو تۆفانێك کە بە تۆفانی نووح مەشهوورەو لە سنوور دەرچوو، ئێمەش کاتێك ئاوەکە لە سنوور دەرچوو و زۆر بوو، ﴿ حَمَلْنَٰكُمْ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴾، ئێوەمان لە ڕۆیشتووەکەدا هەڵگرت، لەو شتەدا کە بەنێو ئاودا دەڕوات، مەبەست لە ﴿ ٱلْجَارِيَةِ ﴾، کەشتییە ڕۆیشتووەکە (**السَّفِينَةُ الجَارِيَة**)یە، و (**جارِيَة**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێندراوە، یانی: لە نێو کەشتییە بەنێو ئاودا ڕۆیشتووەکەدا هەڵمانگرتن، (**الجارية**) ئەوەیە کە بەنێو ئاودا دەڕوات (**جَرَى الماءُ، وَجَرَى فـي الماءِ**)، ئاوەکە ڕۆیشت و، بە نێو ئاوەکەدا ڕۆیشت، کەواتە: (**جارِيَة**) هەر دیارە کە کەشتییە، خوای کاربەجێ لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (**إِنَّا حَمَلناكُم فى السَّفِينَةِ الجَارِيَةِ فِي الماءِ**)، هەر فەرموویەتی: ﴿ فِى ٱلْجَارِيَةِ ﴾، چونکە ئەوەی بەنێو ئاودا دەڕوات، هەر کەشتییە،

وشەی ﴿ طَغَا ﴾، مانا ئەصڵییەکەی خۆی: (إِرتَفَعَ وَعَلَا)، ئاوەکە هەڵساو بەرز بۆوەو لە سنووری ئاسایی و سرووشتیی خۆی چووە دەر، هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: (طَغَا عَلَى المَلَائِكَةِ الخزنة لِغَضَبِهِ لله، فَلَم يَقدِرُوا عَلَى حَبْسِهِ)، ئاوەکە لە ئەو فریشتانەی کۆکەرەوەی ئاون و سەرپەرشتیاری ئاون، یاخیبوو، وەك تووڕە بوون لەبەر خوا، لەوانەی لە خوا پەروەردگاریان یاخیبوو بوون، بۆیە فریشتەکان دەرەقەتی نەهاتن کە کۆنترۆڵی بکەن! بەڵام من ئەو مانایەم پێ هەڵەیەو لەڕاستییدا هیچ شتێك لەو فریشتانەی سەربازی خوان، یاخیی نابێ و، مانایەکەی هەر ئەوەیە کە ئەو ئاوە زۆر لە سنوور دەرچووە، لە سنووری ئاوی ئاسایی کە ئێمە دەیبینین، بۆ سزادانی ئەوانەی سنوورەکانی خوایان بەزاندبوون.

٢)- ﴿ لِنَجْعَلَهَا لَكُمْ تَذْكِرَةً ﴾، بۆ ئەوەی ئەو کەشتییە (یان ئەو بەسەرهاتە) بۆ ئێوە بکەینە بیرخەرەوە (ئەی خەڵکینە!)، (قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: كَانَتْ أَلْوَاحُهَا عَلَى الْجُودِيِّ، وَالْمَعْنَى: أَبْقَيْتُ لَكُمْ تِلْكَ الْخَشَبَاتِ حَتَّى تَذْكُرُوا مَا حَلَّ بِقَوْمِ نُوحٍ، وَإِنْجَاءَ اللَّهِ آبَاءَكُمْ)[1].

ئیبنو جورەیج گوتوویەتی: تەختەکانی (واتە: پاشماوەی کەشتییەکە) لەسەر چیای جوودیی مابوونەوە، یانی: ئێمە ئەو تەختانەمان (کە شوێنەواری ئەو کەشتییەبوون) هێشتبوونەوە، تاکو ئێوە ئەوەی بەسەر گەلی نووح هاتووەو، چۆن خوا باب و باپیرانی ئێوەی دەرباز کردوە، بیری لێ بکەنەوەو یادی بکەنەوە.

ئێمە بەسەرهاتی نووح (عَلَيْـهِ السَّلام)و گەلەکەیمان لە تەفسیری سووڕەتی هووددا بە درێژیی باسکردوەو، لە کاتی تەفسیر کردنی سووڕەتی (العنكبوت) یشدا، ئەو ئایەتە موبارەکەی دەفەرمووێ: ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ ﴾العنكبوت، واتە: نووح خۆی و هاوەڵانی کەشتییەکەمان دەرباز کردن و کردمان بە نیشانە بۆ جیهانییان، لەوێ باسمان کردوە، کە

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، للقرطبي: ج٢١ ص١.

شـوێنەواری ئـەو کەشـتییە، ئێسـتاش لەسـەر چیـای جوودیـی مـاوە، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: پێشـینەکانی ئەو ئۆممەتـەی پێغەمبەری خوا ﷺ شـوێنەوارەکەیان بینیـوە، ئنجـا وەك لـە تەفسـیری سـوورەتی هـوودا باسـم کـردوە، لـە ڕێـی مانگـە دەسـتکردەکانەوە کـە تەماشـایان کـردوە، ئێسـتاش شـوێنەواری ئەو کەشـتییە لەسـەر چیـای جوودیـی مـاوە، لـەوێ بـە تەفصیـڵ باسـم کـردوەو، ئەنـدازەی کەشـتییەکەش: درێژیـی و پانیـی وبەرزیـی و چەنـد قـات بـووەو، چـۆن بـووەو، بـەراورد کـردنی لەگـەڵ ئـەو زانیارییانـەی لـە پەیـمانی کۆنـدا، ئێسـتاش هـەن لەگـەڵ شـوێنەواری ئـەو کەشـتییەدا کـە ئێسـتاش ماوەتـەوە، باسـمان کـردوە کـە پێکەڵپێـك و وەك یەکـن.

خـواش دەفەرمـوێ: ئەوەمـان بـۆ کـردن بـە بیرخـەرەوە ئـەو کەشـتییە، یاخـود: بەسـەرهاتی نـووح (عَلَيْـهِ السَّـلام) و گەلەکـەی تاکـو بۆتان ببێتـە مایەی پونـد و عیبرەت.

٣)- ﴿ وَتَعِيَهَآ أُذُنٌ وَٰعِيَةٌ ﴾، هەروەها تاکو گوێیەك کە وەرگرە، وەری بگرێ، یانی: بۆ ئەوەی گوێیەك کە بیسەرو پارێزەرە، بۆ ئەوەی لە لای خواوە هاتوە، بیپارێزێ و هەڵیبگرێ، چونکە وەحیی بریتیە لە زانیاریی هەبوون بە بیستراوەکان، واتە: بۆ ئەوەی هەر کەسێك خاوەنی هێزێکی بیستنی پارێزەر بێ و تێگەیشتوو بێ، ئەو هەواڵە بزانێ و سەرەنجام لێی بەهرەمەند ببێ، چونکە هەواڵ زۆرن، بەڵام گوێی وەرگر کەمن و، پەند زۆرن، بەڵام پەند وەرگر کەمن!

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی بـێ سـنووری خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە گوێیـەکی وەرگرمـان هەبـێ و، عەقڵێـکی پەنـد وەرگرمـان هەبـێ، خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی بـێ هاوتـای خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ، کـە پەنـد لـە هەڵـەو کـەم و کوڕییـەکانی خەڵـك وەربگریـن و، بمانپارێـزێ لـەوەی ببینـە پەندێـك خەڵـك دەرسـمان لـێ وەربگـرێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان بیسـت و پێـنـج (٢٥) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١٣ - ٣٧)، هـەر (٢٥) ئایەتەکـەش لـە بـارەی ڕۆژی دووایيەوەن، بە هـەردوو قۆناغی ئاخیر زەمـان و هەڵسـانەوە (**السَّـاعَة وَالقِيَامَـة**)و، ڕانوێـنرانی مرۆڤـان بـۆ لێپرسرانـەوەو، وەرگرتنـەوەی بـڕوادارانی چاکـەکار لیسـتی کردەوەکانیـان بـە دەسـتی ڕاسـتیان و، بێبڕوایـانی خراپەکاریـش بـە دەسـتی چەپیـان، سـەرەنجام نیشـتەجێ بوونی بـڕواداران لـە بەهەشـتداو، بێبڕوایـان لـە دۆزەخـداو، تۆزێـك بـە درێژیـی باسـکردنی ئـەو ئـازار و مەینەتییـەی دۆزەخییـەکانی تێـدان، لەگـەڵ هـۆکاری چوونـە نێـو دۆزەخیـان و، بـەو جـۆرە سـەختە سـزا درانیـان.

﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴿١٦﴾ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَآ ۚ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِى جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِى سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەر کات فوو بە کەڕەنادا کرا، یەك فوو ﴿١٣﴾ زەویی و چیایەکانیش هەڵگیران (بەرزکرانەوە)و یەك پێکدادران، پێکدادران (وردو خاش کران) ﴿١٤﴾ ئنجا لەو ڕۆژەدا کارەساتە (بێ وێنە) کە ڕوویدا ﴿١٥﴾ ئاسمانیش شەق و پەق بوو، سەرەنجام ئەو (ئاسمان) لەو ڕۆژەدا بێهێزو لەبەر یەکهەڵوەشاوە ﴿١٦﴾ فریشتەکانیش لەسەر لێوارو قەراغەکانێی و، لەو ڕۆژەشدا عەرشی پەروەردگارت هەشت لەسەریانەوە هەڵیدەگرن ﴿١٧﴾ لەو ڕۆژەدا (ئێوەی مرۆڤ) ڕادەنوێنرێن، هیچ (کردەوەیەکی) شێردراوەتان لە خوا پەنهان نابێ ﴿١٨﴾ هەر کەس نووسراوەکەی بدرێتەوە دەستی ڕاستی، دەڵێ: ها بیگرن نووسراوەکەم بخوێننەوە! ﴿١٩﴾ بێگومان من دەمزانی کە تووشی لێپرسینەوەکەم دەبم ﴿٢٠﴾ ئنجا ئەو جۆرە کەسە لە ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی دایە ﴿٢١﴾ لە باخێکی بڵنددا ﴿٢٢﴾ میوەو بەرەکانی نیزیکن ﴿٢٣﴾ پێیان دەگوترێ: بخۆن و بخۆنەوە بە ئاسوودەیی و بێ گرفت، بە هۆی ئەوەوە کە (کرداری باش) لە ڕۆژانی ڕابردوودا پێشتانخستوە ﴿٢٤﴾ بەڵام کەسێك نووسراوەکەی بدرێتەوە دەستی چەپی، دەڵێ: خۆزگە نووسراوەکەمم وەرنەگرتبایەوە ﴿٢٥﴾ هەروەها نەمزانیبایە لێپرسینەوەکەم چییەو چۆنە؟ ﴿٢٦﴾ ئەی بریا مردنەکەم کۆتایی پێ هێنەر بووایە ﴿٢٧﴾ سامانەکەم سوودی پێنەگەیاندم ﴿٢٨﴾ دەسەڵاتەکەمم (فەوتا) لە دەستم چوو ﴿٢٩﴾ (بە فریشتان دەگوترێ:) بیگرن ئنجا کۆتی بکەن ﴿٣٠﴾ دوایی بیخەنە نێو دۆزەخەوە ﴿٣١﴾ دوایی بیخەنە نێو زنجیرێکەوە درێژییەکەی حەفتا گەزە ﴿٣٢﴾ چونکە ئەو بڕوای بە خوای مەزن نەبوو ﴿٣٣﴾ هانی خەڵکیشی نەدەدا لەسەر خواردن پێدانی نەدار ﴿٣٤﴾ ئەمڕۆش لێرە هیچ دۆستێکی دڵسۆزی نیە ﴿٣٥﴾ هەروەها هیچ خۆراکێکیشی نیە جگە لە زووخاو ﴿٣٦﴾ ئەویش تەنیا تاوانباران دەیخۆن ﴿٣٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلصُّورِ): (قَرنٌ يُنْفَخُ فِيهِ)، (صُور): (من بە کەڕەنا مانام کردوە)، قۆچێکە فووی پێدا دەکرێ، واتە: لە شێوەی قۆچ دایە، فریشتەیەك بە ناوی ئیسرافیل، یان (صَاحبُ القرن) وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ فووی پێدا دەکات، جاری یەکەم فووی پێدا دەکات، ئاخیر زەمان دەقەومێ و، جاری دووەم فووی پێدا دەکات، قیامەت دێتە ئاراوە.

(دَكَّةً): (الدَّكُّ: الأَرْضُ اللَّيِّنَةُ السَّهْلَةُ، دُكَّت الأَرْضُ دَكًّا: جُعِلَت بِمَنزِلَةِ الأَرض اللَّيِّنَةِ)، وشەی (دَكّ) بە زەوییەکی نەرمی ئاسان دەگوترێ، دەگوترێ: (دُكَّت الأَرضُ دَكًّا) واتە: زەوییەکە وەك زەوییەکی نەرم و ئاسانی لێکرا، ورد و خاش کرا، ئنجا شتێك کە وردو خاش دەبێ، نەرم دەبێ و زبریی نامێنێ.

(ٱلْوَاقِعَةُ): (الوُقُوعُ: ثُبُوتُ الشَّيء وسُقُوطُهُ)، (وُقُوع): بریتیە لە چەسپانی شتێك و کەوتنە خواری شتێك، (ٱلْوَاقِعَةُ) کارەساتەکە، ڕووداوەکە کە ڕوو دەدات.

(وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ): ئاسمان لەت و پەت بوو، (الشَّقُّ: الخَرْمُ الوَاقِعُ في الشَّيء، قيل: شَقَقتُهُ بِنصفَينِ)، (شَقّ): بریتیە لە قلێشێك کە لە شتێکدا دەبێت، دەگوترێ: (شَقَقتُهُ بِنصفَينِ)، واتە: قڵیشاندم بۆ دوو لەت، یان لەتم کرد.

(وَاهِيَةٌ): (الوَهيُ: شَقٌّ في الأَدِيمِ وَالثَّوبِ وَنَحوِهِما، وَكُلُّ شَيء استَرخَى رِباطُهُ فَقَد وَهيَ)، (وَهي): بە مانای بێهێزیی و نەرم و شلیی دێت، (شَقٌّ في الأَدِيمِ وَالثَّوبِ وَنَحوِهِما)، (وَهي): بریتیە لە لەت کردنی چەرم و پۆشاك و وێنەی ئەوان، هەر شتێك کە دادەکەوێ، یاخود ئەو شتانەی ڕایانگرتوە، ڕاگرەکانی بێهێز دەبن، دەگوترێ: (وَهِيَ)، ئاسمانیش لەو ڕۆژەدا بێهێزو لەت و پەت دەبێ.

(وَٱلْمَلَكُ): (المُتَوَلِّي مِنَ المَلائِكَةِ شَيْئاً مِنَ السِّياسَاتِ، يُقالُ لَهُ: مَلَك، وَمِنَ البَشَرِ يُقالُ لَهُ: مَلِك، فَكُلُّ مَلَكٍ مَلائِكَةٌ، وَلَيسَ كُلُّ مَلائِكَةٍ مَلَكاً، نُحُو مَلَكُ المَوت)، (مَلَك): بریتیە لەو فریشتانەی کاروبارێکیان پێ سپێردراوە، هەر فریشتەیەك كارو بارێكی پێ سپێردرا، پێی دەگوترێ: (مَلَك) و، ئەگەر مرۆڤ بێ پێی دەگوترێ: (مَلِك)، واتە: حوكمڕان، كار بەدەست، ئنجا هەموو مەلەكێك مەلائیكەیە، بەڵام مەرج نیە هەموو مەلائیكەیەك مەلەك بێ، واتە: مەرج نیە هەموو فریشتەیەك سەرپەرشتییكردن و كاروبار هەڵسووڕاندنی پێ سپێردرابێ، ڕەنگە كارێكی جێبەجێكردن (تنفیذ)ی پێ سپێردرابێ، وەك (مَلَكُ المَوت)، فریشتەی مەرگ.

(أَرْجَآئِهَا): (أَرْجَاء: جَمْعُ رَجَا، رَجَا البِئرِ وَالسَّماءِ: جَانِبُها)، (أَرجاء) كۆی (رَجا)یە، (رَجا) بە مانای قەراغ و لێوارە، دەگوترێ: (رَجَا البِئرِ)، واتە: قەراغی بیرەكە، یان (رَجَا السَّماءِ)، واتە: لێواری ئاسمان (أرجاء) تەنیشتەكان.

(تُعْرَضُونَ): ڕادەنوێنرێن، دەهێنرێنە گۆڕێ، (عَرَضْتُ الشَّيءَ عَلَى البَيْعِ، وَعَلَى فُلانٍ، وَلِفُلانٍ)، دەگوترێ: (عَرَضتُ الشَّيء عَلَى البَيْعِ) شتەكەم بۆ فرۆشتن ڕانواند، (عَرَضتُ الشَّيء عَلَى فُلانٍ ولفلانٍ)، شتەكەم پێشانی فڵانكەس داو، بۆم ڕانواند، وەك لە سووڕەتی (البقرة)دا هاتوە: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ ...﴿٣١﴾﴾البقرة، خوا ناوەكانی پێشانی فریشتەكان دان، واتە: ناوبراوەكانی ڕانواندن لەسەریان، كە ناوەكانیانی پێ بفەرموون.

(خَافِيَةٌ): (خَفِيَ الشَيء خُفيَةً: إِستَتَرَ، وَخِفَاءُ: مَا يُستَرُ بِهِ كَالغِطاءِ)، (خَافِيَة)، واتە: پەنهان، دەگوترێ: (خَفِيَ الشَيء خُفيَةً)، واتە: شتەكە پەنهان بوو، شێردرایەوە، (خِفاء) هەر شتێكە كە شتێكی پێدابپۆشرێ، وەك (غِطاءِ) واتە: (خِفاء) و (غِطاءِ) هەردووكیان بە مانای شتێكن شتێكیان پێ دابپۆشرێ و پەنهان بكرێ.

(هَآؤُمُ): (هاء: لِلتَّنبِيه وَ هاء كَلِمَةٌ فِي مَعْنَى خُذ، وَهُو نَقِيض: هاتِ أَي: أَعطِ)، (هَاؤم) واتە: ها بگرن، (ها) بۆ ئاگادار كردنەوەیە، هەروەها وێڕای ئەوەش

(ها) وشـەیەکە بـە مانـای گرتـن و پێچەوانـەی (**هاتِ**)یـە، واتـە: بێنـە، بمدەیـە، بـەڵام (هـا) واتـە: (**خُـذ**) بگـرە، ئنجـا (**هَـاؤمُ**) بـۆ کۆیـە، واتـە: هـا بگـرن، ﴿ هَآؤُمُ ٱقْرَءُواْ كِتَٰبِيَهْ ﴾، هـا بگـرن، نووسراوەکـەم بخوێننـەوە.

(قُطُوفُهَا): (**القُطُـوفُ: جَمـعُ قِطَـف، وَهُـوَ المَقطُـوفُ، جَمعُـهُ قُطُـوف**)، (**قُطُـوف**) کـۆی (**قِطَـف**)ە، (**قِطَف**)یـش بـە مانـای (**مَقطُوف**)ە، واتـە: چـنراو، لێکـراوە، کەواتـە: (**القِطـافُ: جَنـيُ الثَّمَـرَةِ**)، چـنراوی ئـەو میوەیـەی دەچـنرێ، یاخـود (**قِطـاف**) چاوگـە و واتـە: چنینـی میـوە، لێکردنـەوەی میـوە، (**قِطَـف**) تاکەکەیـەتی (**قُطُـوف**) کۆیەکەیـەتی، واتـە: میـوە چـنراوەکان.

(هَنِيٓـًٔا): (**الهَنِـيءُ: كُلُّ مَـالا يَلحَـقُ فِيـهِ مُشَـقَّةٌ وَلا يَعقُـبُ وَخامَـةً**)، (**هَنِـيء**) هـەر شـتێکە زەحمـەتی بـەدوادا نەیـەت و، دەردو ئـازاری لـێ نەکەوێتـەوە، (خواردنێـك کـە نارەحەتیـی و گرفتـی بـەدوادا نەیـەن).

(أَسْلَفْتُمْ): پێشتانخسـتوە، (**السَّـلَفُ: المُتَقَـدِّمُ، أَسـلَفتُم أَي: قَدَّمْتُـم**)، (**سَـلَف**) یانـی: پێشـوو، ڕابـردوو، (**أَسـلَفَ**) واتـە: پێشیخسـت و ئەنجامـی دا، کەواتـە: (**بِمـا أَسـلَفْتُم**) واتـە: بەهـۆی ئـەوەوە کـە پێشـتر کردووتانـە لـە دنیـادا، یـانی: کارە چاکـەکان و پێشتانخسـتوون.

(ٱلْخَالِيَةِ): (**الماضِيَـة**)، ڕابـردووەکان، ﴿ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴾، لـە ڕۆژە ڕابردووەکاندا، مەبەسـت ژیـانی دنیایـە، دەگوتـرێ: (**خَـلَا الزَّمـانُ أَي: مَـضَى وَذَهَـبَ**)، کات تێپـەڕی و ڕابرد.

(ٱلْقَاضِيَةَ): (**المَـوتُ**)، (**يُقـالُ ضَرَبَـهُ ضَرْبَـةً قَاضِيَـةً أَي: مُمِيتـً**)، واتە: لێیـدا بە لێدانێکی یەکجارەکیـی، یاخـود: لێدانێـکی کۆتایـی پێهێنـەری لێـدا، واتـە: مرێنـەر، کەواتـە: ﴿ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴾، واتـە: (**يـا لَيْتَهَـا كَانَـتِ المَوتَـةُ مَوتَـةً قَاضِيَـة**)، بریـا مردنەکـەم مردنێـکی یەکجارەکیـی بووایـە، واتـە: زینـدوو کرانـەوەی بـەدوادا نەهاتبایـە.

(سُلْطَانِيَهْ): دەسـتەڵاتەکەم، (السَّـلاطَةُ: التَّمَكُّـنُ مِـنَ القَهـرِ، سَـلَّطتُهُ فَتَسَـلَّطَ، وَسُـمِّيَ الحُجَّـةُ سُـلطاناً)، (سَـلاطَة) بریتیـە لـە دەستڕۆیشـتوویی بەهـۆی باڵادەسـتییەوە، دەگوتـرێ: (سَـلَّطْتُهُ فَتَسَـلَّطَ)، زاڵمکـرد، ئەویـش زاڵبـوو، (وَسُـمِّيَ الحُجَّـةُ سُـلْطَاناً)، بەڵگـە پێـی گوتـراوە: (سُـلْطان)، چونکـە دەسـتەڵاتی هەیـە بەسـەر عەقـڵ و دڵـی بەرامبەرەکـەدا، ئەگـەر لـە هەقـێ بگـەڕێ.

(فَغُلُّوهُ): ئنجـا کـۆتی بکـەن، (الغُـلُّ: مُخْتَـصٌّ بِمَـا يُقَيَّـدُ بِـهِ فَتُجْعَـلُ الأَعْضَـاءُ وَسْـطَهُ وَجَمْعُـهُ أَغْـلَال)، (غُـلّ): تایبەتـە بـەوەوە کـە مرۆڤـی پـێ کـۆت دەکـرێ، ئەندامـەکان دەخرێنـە نێـوە ڕاسـتیەوە (بـە تایبـەت گـەردن و دەسـت و پـێ)، بـە (أَغـلال) کـۆ دەکرێتـەوە، (غُـلّ) کـۆت، جـاری وایـە وەك کەلەبچـە لـە دەسـتان دەکـرێ و دەسـتەکان دەخرێنـە نێـوی، یـان پێیـەکان دەخرێنـە نێـوی، جـاری واشـە دەخرێتـە گەردنـەوە، بـۆ ئـەوەی ئـەو گەردنـە بـەرز بـێ و نەتوانـێ سـەر دانوێنـێ، یاخـود مـل بسـووڕێنێ بەمـلاو لادا.

(ذَرْعُهَا): (الـذِّرَاعُ: العُضْـو المَعْـرُوفُ يُعَـبَّرُ بِهَـا عَـنِ المَـذرُوعِ أَي: المَـذرُوع بِالـذِّراعِ، وَالـذَّرْعُ بَسْـطُ اليَـدِ)، (ذِرَاع): ئـەو ئەندامـە ناسراوەیـە، باسـك، لە پەنجەکانی دەسـتەوە تاکـو ئانیشـك، پێـی دەگوتـرێ: (ذِراع)، هەندێکیـش دەڵێـن: لـە پەنجەکانـەوە تاکو بن هەنـگڵ پێـی دەگوتـرێ: (ذِرَاع)، بـەڵام ئەگـەر هـەردوو دەسـت بـڵاو بکەیـەوە، پێـی دەگوتـرێ: (بـاع) بـاڵ، (ذِراع)، بـە کوردیـی دەگوتـرێ: گـەز، کـە دەوری نیومەتـرە.

بـە کورتیـی: (ذِراع) بـە کوردیـی دەگوتـرێ: باسـك یـان گـەز، دوایـی بەکارهێنراوە بـۆ پێوراوێـك بـە باسـك (مَـذرُوع)، شـتێك کـە بـە باسـك دەپێـورێ، (ذَرْع)یـش بریتیـە لـە بڵاوکردنـەوەی هـەردووك دەسـت و کردنەوەیـان و ئەگـەر هـەردووك دەسـت بکرێنـەوە بـاڵ (بـاع)ە، بـەڵام ئەگـەر تەنیـا یـەك دەسـت بـێ (ذِرَاع)ە، بۆیـە لـە فەرمـوودەی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە کـە خـوا ﷻ لـە فەرمایشـتی قودسـییدا دەفەرمـوێ: {وَإِذَا تَقَـرَّبَ مِنِّـي ذِرَاعَـاً تَقَرَّبْـتُ إِلَيْـهِ بَاعَـاً} (أخرجـه البخـاري: ٦٩٧٠،

ومسلم: ٢٦٧٥)، ئەگەر بەندە باسكێك بۆ لام بێ، من باڵێك بۆ لای دەچم، لێی نیزیك دەبمەوە.

(فَاسْلُكُوهُ): (السُّلُوكُ: النَّفَاذُ فِي الطَّرِيقِ)، مانای بنەڕەتیی (سُلُوك) بریتیە لە بەڕێدا ڕۆیشتن، كەوتنە نێو ڕێ، (فَاسْلُكُوهُ) واتە: ئەو كەسە بخەنە نێو زنجیرەكەوەو زنجیرەكەی لێ بئاڵێنن، با ئەو بچێتە نێوی.

(وَلَا يَحُضُّ): (الحَضُّ: التَّحرِيضُ كَالحَثِّ، إلاّ أَنَّ الحَثَّ يَكُونُ بِسَوقٍ وَسَيرٍ، وَالحَضُّ لا يَكُونُ بِذَالِك)، (حَضّ) هاندان، وەك (حَثّ) وایە، بەڵام (حَثّ) ئەوەیە كە لەگەڵ وەپێش خۆدان و ڕۆیاندن بێ، بەڵام (حَضّ) مەرج نیە بە پێش خۆدانەوە بێ و بریتیە لە هاندان.

(حَمِيمٌ): (الحَمِيمُ: الـمَاءُ الشَّدِيدُ الحَرارَة، وَالقَرِيبُ المُشْفِق)، (حَمِيمٌ) لە ئەسڵدا بە ئاوێكی زۆر گەرم دەگوترێ، بەڵام دوایی خوازراوەتەوە بۆ نیزیكێكی دڵسۆزو دڵگەرم بۆ مرۆڤ، چ خزم بێ چ بێگانەبێ، چونكە لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ١٠١﴾ الشعراء، هەروەها برادەری دڵگەرم و دڵسۆزم نییە.

(غِسْلِينٍ): (الغِسْلِينُ: غُسَالَةُ أَبدانِ الكُفَّارِ)، چڵك و شۆراوی جەستەی بێبڕوایەكانە، یاخود: كێم و زووخاویانە.

(الْخَاطِئُونَ): گوناهباران، تاوانباران (خَطِأَ يَخْطَأُ خِطْئَاً وَخَطَأً، الخِطْأُ وَالخَطَأُ: العُدُولُ عَنِ الجِهَة، وَأَخْطَأَ فَهُوَ مُخْطِيٌّ إِخْطَاءً، مَنْ أَصَابَ فِي الإِرَادَةِ وَأَخْطَأَ مِنَ الفِعْلِ، لَكِن خِطْأ أَن تُرِيدَ غَير مَا تُحْسِّنُ، فَتَفعَلُهُ)، (خَطِأَ يَخْطَأُ خِطْئَاً وَخَطَأً)، واتە: گوناهی كرد، گوناح دەكات، گوناهكردن، (خِطأ)و (خَطَأ) هەردووكیان بە مانای گوناح كردنن و، لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا بە مانای لادانن لە ڕێ، لەولایەی كە ڕاست و چاكە، بەڵام (أَخْطَأَ فَهُوَ مُخْطِيٌّ إِخْطَاءً)، ئەمە بە مانای هەڵەی كرد، هەڵە دەكات، هەڵە كردن، یانی: كەسێك كە لە ویستندا دەیپێكێ و لە كرداردا هەڵە دەكات، واتە: كەسێك كە مەبەستی نیە گوناح بكات، بەڵام لە كرداردا هەڵە دەكات، هەر

چەنـد بـە دڵ نایـەوێ هەڵـەو گونـاح بـكات، بـەڵام (خاطِـيء) كەسـێكە بـە نیـەت و بـە كرداریـش گونـاح و هەڵـە دەكات، (خِطْأ: أَن تُرِيـدَ غَيْـرَ مـا تُحَسِّـنُ، فَتَفْعَلَـهُ)، (خِطْأ) ئەوەیـە شـتێك بـزانی بـاش نیـەو خراپـە، كەچـی بتـەوێ و ئەنجامیـشی بـدەی.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

ئـەم بیسـت و پێنـج (٢٥) ئایەتـە موبارەكـە، هەموویـان تەرخانكـراون بـۆ بـاسی ڕۆژی دوایـی، هەڵبەتـە ئایەتـەكانی سـەرەتاش، ئـەو دوازدە ئایەتـەی پێشـتر باسـمان كـردن، ئەوانیـش چـاو پێداگێڕانێـكی مێـژوو بـوون و، خـوا ﷻ سـێ جـاران وشـەی (حاقـة)ی لـە سـێ ئایەتانـدا دووبـارە كـردەوە، ئنجـا یەكسـەر هاتـە سـەر بـاسی گـەلی سـەموودو گـەلی عـاد، دواتـر گـەلی فیرعـەون و ئەوانـەی لەگەڵـی بـوون، یاخـود ئـەو كۆمەڵگایانـەی لەپێشـیەوە بـوون، هەروەهـا شـارە هەڵگێـڕدراوەكان، ئـەو چـوار گەلـەی ناویـان هێـنراوەو گەلـە پێشـووەكانیش، هەموویـان بێبڕوابـوون بـە (قارِعَـة)، واتـە: ئـەو كارەسـاتەی خەڵـك دادەچڵەكێنـێ و ڕادەچڵەكێنـێ، كـە مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـە، ئنجـا دوای ئـەو چـاو پێـدا گێڕانـەی مێـژوو، خـوا ﷻ بـاسی ڕۆژی دوایـی دەكات، كـە دوو قۆناغـەو هـەر كامیـان دوای فووپێداكردنێـكی كەڕەنـا (النفخ في الصور) كـە دووجـارە، دێتـە پێـش و، یەكەمیـان ئاخیرزەمـان (ساعة)و، دووەمیـان هەڵسـانەوە (قيامة)یـە.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ ﴾، هـەر كاتێـك فـوو بـە كەڕەنـادا كـرا، یـەك فـوو، واتـە: بـۆ جـاری یەكـەم فـووی پێـدا كـرا، كـە لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ هاتـوە: {كَيْـفَ أَنْعَـمُ، وَصَاحِـبُ الصُّورِ قَـدِ الْتَقَـمَ الْقَـرْنَ، وَحَنَـى جَبْهَتَـهُ يَنْتَظِـرُ مَتَّـى يُؤْمَـرُ أَنْ يَنْفَـخَ} (أخرجـه الترمـذي: ٣٢٤٣، والطـبراني في الأوسـط، وابـن حبـان: ١٩٣٦٤، عـن أبي سـعيد الخـدري رضي الله عنه، قـال شعيب الأرنـؤوط: إسناده صحيح عـلى شرط الشـيخين).

واتــە: چــۆن لــە ژیــانی دنیــادا ڕابوێــرم و خۆشــگوزەران بــم! لــە حاڵێکــدا خــاوەنی کەڕەنــا (**صــور**) قۆچەکــە (**قــرن**)ی بــە دەمــەوە گرتــوەو ســەریشی بەســەردا نووشــتاندۆتەوە، چاوەڕێیــە کــەی فەرمــانی پــێ دەکــرێ، فــووی پێــدا بــکات.

خــوا دەفەرمــوێ: کاتێــك فــوو بــە کەڕەنــادا کــرا، یــەك فــوو، واتــە: بــۆ جــاری یەکــەم، ﴿ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴾، لــە ئەنجامــی فــووی یەکەمــدا، کــە ئاخیــر زەمــانی بــەدوادا دێ، زەوی و چیایــەکان هەڵگیــران و یــەك جــار پێکــدا دران و وردو خــاش کــران، ﴿ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴾، لــەو ڕۆژەدا ڕووداوەکــە (کارەســاتەکە) دەقەومــێ، ﴿ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴾، ئاســمانیش لــەت و پــەت دەبــێ، لــەو ڕۆژەدا ئاســمان بــێ هێــزە، واتــە: ئــەو تونــدو تۆڵیــی و پتەوییــەی گــەردوون ئێســتا هەیــەتی، ئــەوەی نامێنــێ و لێــك هەڵدەوەشــێ، چونکــە خــوا ئــەم دۆخــەی بــۆ تێــدا تاقیکردنــەوە مرۆڤــان و جنــدان ڕەخســاندوویەتی، هەڵیدەگــرێ و ئــەم ژیانــە کۆتایــی پێدێنــێ و، قۆناغێــکی دیکــەی ژیــان دێنێتــە گــۆڕێ، ئــەوەش هەمــووی بــاسی ئاخیــر زەمانــە، بــاسی قۆناغــی یەکەمــی ڕۆژی دواییــە، دوایــی یەکســەر خــوا ﷻ قۆناغــی دووەمیــشی لەگەڵــدا ئاوێتــە دەکات، ئەگەرنــا لــە ســووڕەتی (**الزمــر**)دا دەفەرمــوێ: ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾**الزمــر**، فــوو بــە کەڕەنــادا کــرا، هەرچــی لــە ئاســمانەکان و زەویــدا هەیــە مــرد، (یاخــود: لــە هــۆش خــۆی چــوو)، مەگــەر ئــەوەی خــوا بیــەوێ نەمــرێ، (یــان لــە هــۆش خــۆی نەچــێ)، کــە مەبەســت فریشــتەکانن، ئەگەرنــا جنــدو مــرۆڤ هیچیــان نامێنــن، هەروەهــا باڵنــدەو ئــاژەڵ و، زژیانــداران هیچیــان نامێنــن، دوایــی دەفەرمــوێ: ﴿ ...ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾**الزمــر**، دوایــی جارێکی دیکــە فــووی پێــدا کــرا (واتــە: بــە کەڕەنــادا)، یەکســەر هەســتان و چاوەڕێیــان کــرد، کەواتــە: دوو جــاران فــوو بــە کەڕەنــادا دەکــرێ، جــاری یەکەمیــان دەبێتــە هــۆی پەیدابــوونی ئاخیــر زەمــان، واتــە: ئــەم کــەون و گەردوونــە دەپێچرێتــەوەو ئاســمان و زەوی وەك خۆیــان نامێنــن، وەك لــە ســووڕەتی (**إبراهیــم**)

دا باسکراوەو[1]، لە تەفسیری سوورەتی (**الواقعة**)دا، کورتە باسێکمان لەو بارەوە کردوە، کە زەوی و چیایەکان چییان لێ دێ؟.

بەڵام بۆ جاری دووەم کە فووی پێدا دەکرێ، قیامەت دێ، واتە: هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوەو ئامادەکردنی خەڵك بۆ سزاو پاداشت، بۆیە لێرەدا یەکسەر خوا ﷻ پێکەوەی پەیوەست کردوون، دەفەرموێ: ﴿وَالْمَلَكُ عَلَىٰ أَرْجَائِهَا﴾، فریشتەکانیش لەسەر قەراغەکانی ئاسمان دەبن، لەسەر لێوارەکانی دەبن، ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾، لەو ڕۆژەدا عەرشی پەروەردگارت هەشت هەڵیدەگرن لەسەریانەوە، واتە: لە سەرووی فریشتەکانەوە، یان لە سەرووی ئەوانەوە کە کۆ دەکرێنەوە بۆ سزاو پاداشت، لە سەرووویانەوە تەخت و عەرشی پەروەردگارت هەڵدەگرن، هەشت فریشتە، یان هەشت دروستکراوی دیکە، یان هەشت کۆمەڵە فریشتە، ئێمە نازانین، گرنگ ئەوەیە خوا فەرموویەتی: هەشت هەڵیدەگرن، لە هەندێك شوێنەواراندا هاتوە، کە ئێستا عەرشی پەروەردگار لە لایەن چوار فریشتانەوە هەڵگیراوەو، لەو کاتەدا دەبن بە هەشت، کە هی چوارەکان هیچ دەقێکی ڕوون و ڕاشکاوی لەسەر نیە، بەڵام ئەوە ئایەتە کە هەشتەکان لە ڕۆژی دوایی دا لە ڕۆژی قیامەتدا، تەخت و عەرشی پەروەردگار هەڵدەگرن.

﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ﴾، لەو ڕۆژەدا ئێوە ڕادەنوێنرێن، واتە: پێشان دەدرێن، ﴿لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾، هیچ شتێك لە ئێوە پەنهان نابێ، یانی: هیچ شتێکتان لێ پەنهان نابێ و هەموو شتێك دەزانن، هەموو شتێکتان بۆ ئاشکرا دەبێ، یاخود: ﴿لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾، هیچ شتێکی ئێوە پەنهان نابێ، هیچ شتێکتان نابێ شێردراوەو پەنهان و نەزانراو بێ، هەموو شتێکتان دەکەوێتە گۆڕێ، وەك لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ۝٩﴾ **الطارق**، ئەو ڕۆژەی نهێنییەکان دەکەونە گۆڕێ و ئاشکرا دەبن.

---

(١) ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ ۖ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ۝٤٨﴾ إبراهيم.

ئنجا خـوا ﷻ بـاسی ئـەوە دەکات کـە دوایـی مرۆڤـەکان چییـان لـێ بەسـەر دێ؟ دوای ئـەوەی ڕادەنوێنرێـن و هیـچ شـتێکیان لـێ پەنهـان نابـێ، بـە هـەردوو واتایەکـەی، دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾، ئنجـا هـەر کەسـێك نووسراوەکـەی بـە (دەسـتی) ڕاسـتی بدرێتـەوە، ﴿ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴾، دەڵـێ: هـا بگـرن نووسراوەکـەم بیخوێننـەوە، ﴿ هَآؤُمُ ﴾، واتـە: هـا بیگـرن، ﴿ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴾، نووسراوەکـەم (نامەکـەم) بڕوانامەکـەم بخوێننـەوە، شـانازیی پێـوە دەکات، کەسـێك شـتێکی هەبـێ شـانازیی پێـوە بـکات، پێیخۆشـە خەڵـك ببینـێ، وەك گوتـراوە: پێـی شـەرم نیـە، بەڵکـو پێـی سـەر بـەرزەو شـانازیی پێـوە دەکات، ﴿ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ﴾، مـن دڵنیـا بـووم کـە تـووشی لێپرسـینەوەکەم دەبـم، لێـرەدا ﴿ ظَنَنتُ ﴾، وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانیشـدا زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر، یـانی: (عَلِمْـتُ)، یاخـود (أَيْقَنْـتُ)، زانیـم، یاخـود دڵنیـا بـووم، ﴿ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ﴾، کـە مـن تـووشی لێپرسـینەوەکەم دەبـم، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی ئـەو کاتـە دڵنیـا بـووم لـە دنیـادا، کـە ڕۆژێـك دێ لێـم دەپرسرێتـەوەو، سـزاو پاداشـت هەیـە، بۆیـە خـۆم ئامـادە کـردوە، کەسـێك بەرچـاوی ڕووناکـە، پەرێـزی پاکـە، کەسـێك دەزانـێ بـەرەو کـوێ دەچـێ؟ دەزانـێ چـۆن خـۆی بـۆ ئامـادە بـکات، هەروەهـا کەسێکیش پەرێـزی پاکـە، بـێ باکـە.

ئـەو کەسـەش دەڵـێ: مـن دڵنیـا بـووم کـە پێگەیشـتووی لێپرسـینەوەکەم دەبـم و تـووشی دەبـم، ﴿ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴾، ئنجـا ئـەو جۆرە کەسـە لە ژیانێکی ڕازیی دایە، ژیانەکـە ئەوەیـە خاوەنەکـەی لێـی ڕازییـە (فِي عِيشَـةٍ مَرْضِيَّـة)، بـەڵام لێـرەدا ڕازیـی بوونەکـە پاڵدراوەتـە لای ژیانەکـە، بـۆ زێدەڕۆیـی، یـانی: ژیانەکـە لـە خاوەنەکـەی ڕازییـە، ئەگەرنـا لـە ڕاسـتییدا ژیانەکـە ڕەزامەندیـی بەرانبـەر دەردەبـڕدرێ و لێرازیبـوو و پەسـندکراو (مَرْضِيَّة)ەکەیـە، ڕازیـی بووەکـە خاوەنەکەیـەتی، یاخـود مەبەسـت پێـی ژیانێـکی پڕ ڕەزامەندییـە، یـانی: وەختێـك تەماشای ئەو ژیانـە دەکەی، هـەر ڕەزامەندیـی و بەختەوەریـی تێـدا بـەدی دەکـەی، ﴿ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴾، لـە باخێـکی بڵنـددا، بڵنـد بـە هـەردوو واتـای کـە ئێسـتا بـۆ ئێمـە زانـراون:

أ- بڵند بە مانا ماددیی و بەرهەستەکەی واتە: شوێنەکەی بڵندە.

ب- بڵند بە مانای مەعنەوییەکەشی، واتە: باخێکە کە لە ڕووی قەدرو قیمەت و بەهاوە، زۆر باڵاو بەرزە.

﴿قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾، چنراوەکانی (میوە چنراوەکانی) نیزیکن، (**قُطُوف**) کۆی (**قِطَف**)ە، واتە: میوەی چنراو، (**قِطَاف**)یش چنین و لێکردنەوەیە.

میوە چنراوەکانی ئەو باخە نیزیکن، واتە: دەست گەیاندنە میوەکانی بۆ چنین و لێکردنەوە، مرۆڤ ماندوو ناکات، ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾، (پێیان دەگوترێ): بخۆن و بخۆنەوە ئەمە گوتراوی قسەیەکی لابراو (**مَقُولُ قَولٍ مَحْذُوفٍ**)ە، واتە: بێژەرێك پێیان دەڵێ: کە فریشتەکانن. بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێ، ﴿هَنِيٓـًٔا﴾، خواردن و خواردنەوەیەك دوایی گرفتی بەدوادا نەیەت، چ گرفتی وەك دەردو نەخۆشیی، چ گرفتی وەك پاشەڕۆك و، ئەزیەت کێشانی مرۆڤ بە فرێدانی پاشەڕۆکەکەی، ئەو جۆرە گرفتانە لە بەهەشت دا نین.

ئایا لە بەرانبەر چی دایە، ئەو ژیانە پڕ ڕەزامەندییە؟ لەو باخە بەرزەدا، کە میوەو بەرەکانی نیزیکن و پێیان دەگوترێ: بخۆن و بخۆنەوە بەبێ گرفت و کێشە؟ ﴿بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە پێشتانخستوە لە ڕۆژە ڕابردووەکاندا، یانی: (**بِمَا قَدَّمتُم فِي الأَيَّامِ الماضِيَة**)، بە هۆی ئەوەوە کە پێشتانخستوە بە ئیمان و بە کردەوەی چاك، لە ڕۆژە ڕابردووەکاندا، واتە: لە ژیانی دنیادا، ئەمە بە نسبەت کەسانێکەوە، کە بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکان و بڕوانامەکانیان وەردەگرنەوە.

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَـٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ﴾، بەڵام کەسێك نووسراوەکەی بە (دەستی) چەپی بدرێتەوە: ﴿فَيَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَـٰبِيَهْ﴾، دەڵێ: خۆزگە نووسراوەکەی خۆمم پێ نەدرابایە، یانی: (**لَمْ أُعْطَ**)، ﴿وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ﴾، هەروەها خۆزگە

هـەر نەمزانیبایـە لێپرسـینەوەکەم چۆنـە، ﴿ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴾، بریـا مردنەکـەم کـە دەمـردم یەکجارەکیـی بووایـەو کۆتایـی پـێ هێنـەر بووایـە، یـانی: (یـا لَیتَهـا کانَـتِ الموتَـةُ مَوتَـةً قاضِیَـة)، خۆزگـە مردنەکـە مردنێـکی کۆتایـی پێهێنـەر بووایـە، نـەك ژیـان و زینـدوو کرانـەوەی بـە دوادا هاتبایـە، بـەڵام ئـەو خۆزگـەو بریایانـە بـێ سـوودن و، وەك پێشـینان گوتوویانـە: درەختـی خۆزگـەو بریـا بـۆ کـەس بـەری نەگرتـوە، ئـەوە بـەس قسـەیەکەو دەیڵێـن، ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾، دەڵـێ: مـاڵ و سامانەکەم هیـچ سـوودی پـێ نەگەیانـدم، ئـەو مـاڵ و سـامانەی کـۆم دەکـردەوەو، لەسـەری خـۆم شـەرمەزارو عەیبـدار کردبـوو، بەهۆیـەوە خـۆم گوناهبـار کردبـوو، هیـچ سـوودی پـێ نەگەیانـدم و ڕۆیشـت، ﴿ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، دەستەڵاتەکەشـم فەوتـا، ﴿ سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، دەگونجـێ بـە مانـای دەسـەڵات و دەستڕۆیشـتوویی بـێ، واتـە: دەسـتەڵاتی ڕواڵەتیـی، دەشـگونجێ بـە مانـای دەسـتەڵاتی مەعنەویـی بـێ، یـانی: بەڵگەکـەم، واتـە: دەسـەڵاتەکەم لـە دەسـتم ڕۆیشـت و فەوتـا، نەمـا، ئـەو خەڵکـەی بـە دەوری خۆیـەوە کـۆی کردبوونـەوە بـە پـارەی حـەڕام و، بـە زۆری دەسـەڵات و خـۆ سـەپاندن، نەمـا، یاخـود: ئـەو شـتانەی دەمکـردن بـە بەڵگـە بـۆ خـۆم و خـۆم پـێ ئیقنـاع دەکـردن، ئـەو بـڕو بیانووانـە هیچیـان نەمـان و ڕۆیشـتن، قیامـەت شـوێنی دەرکەوتنـی ڕاسـتییەکانە، درۆو دەلەسـەو فـرت و فێـڵ دادی کـەس نـادات، ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾، فەرمـان دەکـرێ بـە فریشـتەکان بیگـرن، ئنجـا کـۆتی بکـەن، ئەمـەش گوتـراوی بێژەرێـکی قرتێنـدراو (قَـولُ قائِـلٍ مَحـذُوف)ە، یـانی: (یُقـولُ قائِـلٌ لِلمَلائِکَـةِ: خُـذُوهُ فَغُلُّـوهُ)، بێژەرێـک بـە فریشـتەکان دەڵـێ: بیگـرن و کـۆتی بکـەن، (کۆت)یـش ئەوەیـە کـە لـە گـەردن دەکـرێ، یـان لـە دەسـتەکان دەکـرێ، وەك کەلەبچـە، هەروەهـا لـە پێیەکانیـش دەکـرێ، ﴿ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴾، دوایـی فڕێیدەنـە نێـو کڵپـەی بەهێـزی ئاگـری دۆزەخ، ﴿ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴾، دوایـی بیخەنـە نێـو زنجیرێکـەوە کـە درێژییەکـەی حەفتـا گـەزە، یـان حەفتـا باسـکە، واتـە: زنجیرەکـەی لـێ بئاڵێنـن و ئـەو بخەنـە نێـو زنجیرەکـە، چونکـە هەندێـك لـە

ڕوونکـەرەوان، کـە لـە نێویانـدا تەبەریـی و ئیبنـو کەسـیرو زۆری دیکـەش هـەن، بـە جۆرێـك مانایـان لێکداوەتـەوە، کـە بـە دڵنیایـی شایسـتەی فەرمایشـتی خـوا نیـە، شـتی وا بفەرمـوێ ئەویـش ئەوەیـە کـە دەڵێـن: زنجیرەکـەی بخەنەتـێ بـە لای زاریـداو بـا لـە پشـتەوەی لـە کۆمـی دەربچـێ! کـە هەرگیـز تەعبیـری وا خـوا لـە قورئانـدا بـەکاری نەهێنـاوەو ئەگـەر واش بووایـە دەبـوو فەرمووبـای: (**فَاسلُكُوها فِيهِ**)، زنجیرەکـە بخەنـە نێـوی، بـەڵام خـوا دەفەرمـوێ: ئـەو بخەنـە نێـو زنجیرەکـە، کەواتـە: زنجیرەکـەی لـێ بئاڵێنـن، ئـەو بـا بکەوێتـە نێـو زنجیرەکـە، بێگومانیـش شـتێك حەفتـا گـەز بـێ لـە کەسـێکی بئاڵێنـی، بـۆی وەك کووپەیـەك سـندووقێکی ئاسـنی لـێ دێ و، ئـەو دەچێتـە نێـوی، نـەك زنجیرەکـە بچێتـە نێـو ئـەو.

پێشـم سـەیرە وایـان لێکداوەتـەوە، لـە حاڵێکـدا کـە ڕواڵـەتی بێـژە قورئانییەکـە ئـەو مانایـە ناگەیەنـێ!

ئنجـا ئایـا بۆچـی وای لـێ دەکـرێ؟ ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوەش بەهـۆی ئـەوەوە، کـە بـڕوای بـە خـوای مـەزن نەبـوو، ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾، هانیـشی نـەدەدا بـۆ خـواردنی نـەدار، واتـە: بـۆ خـواردن دان بـە نـەدار، خـۆشی نەیدەکـردو هـانی خەڵکیـشی نـەدەدا، ﴿ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴾، ئنجـا بەهـۆی ئـەوەوەش، ئەمـڕۆ هیـچ دۆسـتێکی دڵگـەرم و نیزیـك و دڵسـۆزی نیـە، نـە خزمێـك نە دۆسـتێك، نـە برادەرێـك، نـە دڵسـۆزێکی بـە پـەرۆشی نیـە، ﴿ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴾، خواردنیـشی نیـە، جگـە لـە چڵپـاو (غِسْلِينٍ)، کـە هـەم بـە مانـای کێـم و زووخـاو دێ، هـەم بـە مانـای ئـەو ئـاوەش کـە لـە داشـۆرینی بریـن و پێسـتی دۆزەخییـەکان دێتـە خـوارێ، واتـە: کێـم و زووخـاو، یـان چڵـکاوی دۆزەخییـەکان، خـواردنی هـەر ئەوەیە، ﴿ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴾، ئـەو خواردنـە پیسـەش، تەنیـا تاوانبـاران ئەوانـەی بـە ئانقەسـت تـاوان و خراپـە دەکـەن، تەنیا ئەوانـە دەیخـۆن، نەیفەرمـووە: (**لا يَأْكُلُونَ إِلاَّ المُخطِئُون**)، ئەوانـەی هەڵـە دەکـەن، نـا، چونکـە هەڵـە کـردن ئەوەیـە کەسـێك نەزانـێ شـتێك گوناهـەو بیـکات، ئـەوە هەڵەیـە، بـەڵام (**خاطِئ**) کەسـێکە دەشـزانێ

گوناهـەو دەیـكات، دەشـزانێ حەڕامـەو دەیخـوات، ئـا ئەوانـە خواردنەكەیـان ئـەو جـۆرە خواردنەیـە، خـوا پەنامـان بـدات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**کاتێك فووی یەکەم بە کەڕەنادا دەکرێ، زەوی و چیایەکان یەکجار پێکدا دەدرێن و وردو خاش دەبن و، کارەساتی ئاخیر زەمان دەقەومێ، ئاسمان شەق و پەق و هەڵوەشاو دەبێ و، فریشتەکان دەکەونە کەنارەکانی و، عەرشی پەروەردگاریشت، هەشت هەڵیدەگرن بەسەریانەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ﴾، هەر کات فوو بە کەڕەنادا کرا، یەك فوو، (الطبري) گوتوویەتی: (وَهِيَ النَّفخَةُ الأُولَى)، ئەوە فووی یەکەمە، پێشتریش ئاماژەمان بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کرد، کە دەفەرموێ: **{كَيْفَ أَنْعَمُ، وَصَاحِبُ الصُّورِ قَدِ الْتَقَمَ الْقَرْنَ، وَحَنَى جَبْهَتَهُ، يَنْتَظِرُ مَتَى يُؤْمَرُ أَنْ يَنْفَخَ} (أخرجه الترمذي: ٣٢٤٣، والطبراني في الأوسط، وابن حبان: ١٩٣٦٤، عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين).**

واتە: چۆن لە ژیانی دنیادا ڕابوێرم و خۆشگوزەران بم، لە حاڵێکدا خاوەنی کەڕەنا، کەڕەنای بە دەمیەوە گرتووەو سەریشی بەسەردا نووشتاندۆتەوە، چاوەڕێیە کەی فەرمانی پێ دەکرێ، فووی پێدا بکات!.

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ لـە دوازدە ئایـەتی پێشـوودا، مرۆڤـەکانی بـە گشـتیی و بـە تایبـەت بێبڕوایـەکانی ترسـاندن لـەو ڕۆژەی بـە (**الحَاقَّة**) و (**القارِعَة**)ش نـاوی بـرد، واتـە: ئـەو ڕۆژەی چەسـپاوە، یاخـود هەقی تێدا دەچەسـپێ، ئـەو ڕۆژەی خەڵك دادەچڵەکێنێ، ئنجـا سـەرەنجامی هەندێـك لـە گەلـە پێشـووەکانی بـە تایبـەت گـەلی عـادو سـەموودو گـەلی فیرعـەون و گـەلی لووطـی بـاس کـرد، ئنجـا بـاسی خـودی ئـەو ڕۆژە دەکات و وردەکارییـەکانی ئـەو ڕۆژەو، ئـەو کارانـەی لـەو ڕۆژەدا ڕوودەدەن، کـە ڕۆژی دواییـە، ڕوودەدەن، دەفەرمـوێ: هـەر کات بـۆ یەکجـار فـوو بـە کەڕەنـادا کـرا، یـەك فـوو.

٢)- ﴿ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴾، زەوی و چیایەکانیش هەڵگیران و یەکجار پێکدادران، (**حُمِلَت**) خوێندراویشەتەوە: (**حُمِّلَت الأرض والجبال**)، زەوی هەڵگیراو چیایەکانی هەڵگیران، ﴿ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴾، پێکدادران یەك پێکدادران، زانایان بە چەند جۆرێك تەعبیریان لێ کردوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: بۆ وێنە (شوکانی): (**حُمِلَت**) یان (**حُمِّلَت**)، (**رُفِعَت مِن أَماكِنِهَا وَقُلِعَتْ عَن مَقَارِّهَا**)، لە شوێنی خۆیان بەرز کرانەوە، هەم زەوییی و هەم چیایەکان و هەڵقەندران لەو شوێنەی تێیدا نیشتەجێن (ئنجا پێکدا کێشران).

ب- هەندێکیان گوتوویانە: (**كُسِرَتا كَسرَةً وَاحِدَة**)، شکێندران بە یەك شکاندن.

ج- هەندێکیان گوتوویانە: (**ضُرِبَتا ضَربَةً واحِدَةً بَعضُهُما بِبَعضٍ حَتَّى صَارَتا كَثِيباً مَهِيلاً**)، واتە: بە یەکجار پێکدا دران، هەر کامێکیان بەویدیکە دادرا، تاکو بوونە لمێکی نەرم.

د- (**الطبري**) گوتوویەتی: (**زُلزِلَتا زَلزَلَة وَاحِدَة**)، بە یەك لەرزان لەرزێندرانەوە.

بـەڵام بێگومـان تەنیـا لەرزاندنەوەیـان نیـە، بەڵکـو تێکشـکێندران و وردو خـاش کرانیشـیانە، وەك لـە شـوێنەکانی دیکـەش دا باسـکراوە.

وشـەی (**دَكّ**)یـش وەك چـۆن بـە مانـای پێکـدادان و پێکداکێـشران، وێ، مانـای وردو خـاش کردنیـش دەگرێتـە نێـو خـۆی.

٣)- ﴿ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴾، لەو ڕۆژەدا ڕووداوەکە ڕوودەدات، یاخود کارەساتەکە دەقەومێ.

بۆیەش گوتم: ﴿ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴾، تەنیا ئەوەندە نیە بلەرزێندرێنەوەو پێکدابدرێن و، لە شوێنی خۆیان بەرز بکرێنەوە، بەڵکو ئەو تەعبیرە تێکشکێندران و ورد و خاش کرانیش دەگرێتە خۆی، چونکە: (الطبري) لە (ابن زيد)ەوە دەڵێ: (﴿ وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴾، **قَالَ: صَارَتْ غُبَارًا**)، (**جامع البيان: ٣٤٨٧٢**) واتە: بوون بە تۆز و خۆڵ، واتە: چیایەکان و زەوی بوونە تۆزو خۆڵ.

(**الطبري**) دەڵێ: (**وَلَمْ يَقُلْ: فَدُكِكْنَ، لِأَنَّهُ جَعَلَ الْجِبَالَ كَالشَّيْءِ الْوَاحِدِ**)، بۆیە نافەرموێ: (**فَدُكِكْن**)، واتە: ورد و خاش کران؟ چونکە چیایەکان وەك یەك شت دانراون، زەوییش وەك یەك شت، بۆیە وەك دوو شت پێکدابدرێن باسکراون.

٤)- ﴿ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴾، لەو ڕۆژەدا کارەساتەکە ڕوویدا.

٥)- ﴿ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴾، ئاسمانیش لەت و پەت بوو، ئنجا ئەو ڕۆژە (ئاسمان) بێهێزە، (**انشقَّت أَي: إِنصَدَعَت**)، واتە: ئاسمان شەق و پەق بوو، قڵیشا، لەت بوو، ﴿ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴾، ئاسمان لەو ڕۆژەدا بێهێزە، (**واهِيَة أَي: ضَعِيفَة مُستَرخِيَة**) بێهێزەو، شل بووەوەیەو هەڵوەشاوە، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (**مُتَمَزِّقَةٌ ضَعِيفَةٌ**)، لێکپچڕاوو بێهێزە.

٦)- ﴿ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ﴾، فریشتەکانیش لەسەر کەنارەکاننی، (**أَرجَاء: جَمعُ رَجاء**)، (**رَجاء**) یەکەم، (**رَجَوَان**) دووانە، (**أَرجَاء**) کۆیە، (**مِثْلُ قَفا، قَفَوَانُ، أَقْفَاء، أَرجَائِها، أَي: أَطْرَافِهَا وَجَوَانِبِها**)، وشەی (**أَرجاء**) کۆی (**رَجا**) و (**رَجاء**)ە، یانی: قەراغ و کەنار، (**رَجَوان**)، واتە: دوو قەراغ، هەروەك (**قَفا**) واتە: پشتە مل، (**قَفوان**) واتە: دوو پشتە مل، ئنجا کۆی (**رَجاء**)، (**أَرجاء**)ە، هەروەك کۆی (**قَفا**)، (**أَقفاء**)ە، کەنارەکان و پشتە ملەکان.

**(الطـبري)** دەڵـێ: **(أَي عـلى أَطرافِهـا وَ جَوانِبهـا)**، یـانی: لەسـەر قەراغـەکان و تەنیشـتەکانی ئاسـمان، فریشـتەکان دەچنـە تەنیشـتەکان و قەراغـەکانی ئاسـمان، لـە ڕۆژی دوایـی دا، دوای تێکـدانی ئاسـمانەکان و زەوی و نەمـانی حاڵـەت و سیسـتمی ئێسـتایان.

**(الطـبري)** لـە سـەعیدی کـوڕی جوبەیـری هێنـاوە، کـە ئایـەتی: ﴿ وَٱلْمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرْجَآئِهَا ﴾ی، ئـاوا مانـا کـردوە: **(الأَرجـاءُ: أَقفـاتُ السَّماء)**، **(جامـع البيـان: ٣٤١٨٢)**، **(أَرجـاء)** واتـە: قەراغـەکان و کەنـارەکانی ئاسـمان.

**٧)-** ﴿ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴾، لەو ڕۆژەدا عەرشی پەروەردگارت هەشت هەڵیدەگرن، وشەی **(مَلَك)** پێشتریش هێنامان کە هەموو **(مَلَك)**ێك مەلائیکەیە، بەڵام مەرج نیە هەموو مەلائیکەیەك **(مَلَك)** بێ، وەك ڕاغیبی ئەصفەهانیی دەڵێ، **(مَلَك)** ئەوەیە کارو سەرپەرشتیارییەکی پێ سپێردرابێ و، وشەی **(مَلَك)** ناوی کۆیەو بۆ جینسە، واتە: کۆی ئەو فریشتانەی کارەکانیان پێ سپێردراون.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴾، بـارەگاو تەختی پەروەردگارت لـەو ڕۆژەدا هەشـت هەڵیدەگـرن، ئایـا ئەو هەشـتە مەبەسـت پێیـان چییە؟

**أ-** هەندێك لە زانایان گوتوویانە: **(ثَمانِيَةٌ مِنَ المَلائِكَة)**، یان **(ثَمانِيَةُ أَملاكٍ)**، هەشت فریشتە.

**ب-** هەندێك گوتوویانە: **(ثَمانِيَةُ صُفُوفٍ مِنَ المَلائِكَة)**، هەشت ڕیز لە فریشتان.

**ج-** دەشگونجێ بگوترێ: **(ثَمانِيَةُ مَجموعاتٍ مِنَ المَلائِكَة)**، هەشت کۆمەڵ لە فریشتەکان.

**د-** دەشگونجێ مەبەست هەشت دانەیان کۆمەڵە دروستکراوی دیکەن.

خـوا ﷻ ڕوونی نەکردۆتـەوە، ئەو هەشـتانە کێن و چین و چ جۆرە دروسـتکراوێکن؟ بـەڵام بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە خـوا هەمـوو کاروبـارەکانی خـۆی بە فریشـتان سـپاردوون، بـە تایبـەتی کاروبـاری ئاسـمانان، بۆیـە زۆربـەی زانایـان ڕایـان وایـە ئەوانـە هەشـت فریشـتەن، یـان هەشـت ڕیـز فریشـتەن، یـان هەشـت کۆمەڵە فریشـتەن.

(الطبري) دەقێك دێنێ دەڵێ: (وهُمُ اليَوْمَ أرْبَعَةٌ، فَإذَا كَانَ يَوْمُ القِيامَةِ أَيَّدَهُمُ اللَّهُ بِأرْبَعَةٍ آخَرِينَ فَيَكُونُونَ ثَمَانِيَةً)، (جامع البيان: ٣٤٨٩١)، واتە: هەڵگرەكانی تەخت و بارەگای خوا، عەرشی خوا، ئەمڕۆ چوارن، بەڵام لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا خوا بەهێزیان دەكات بە چواری دیكەو دەبنە هەشت.

بەڵام لە ڕووی سەنەدەوە ئەم دەقە بێهێزەو، (الطبري)یش ڕوونی نەكردۆتەوە ئەو قسەیە سەرچاوەكەی چییە؟ كە جگە لە (الطبري) زانایەكانی دیكەش هەندێكیان هێناویانە.

لێرەدا با ئەم دەقە بێنین كە تیشكی باشترمان بۆ دەخاتە سەر ئەوەی لەو ڕۆژەدا ڕوو دەدات، ئەوەش هەمووی جاریٔ هەر باسی ئاخیر زەمانە، بەڵام دەگونجێ هەڵگرتنی تەختی پەروەردگار لە لایەنی هەشت لە دروستكراوەكانی خواوە، لەو ڕۆژەدا پەیوەندیی بە ڕۆژی قیامەتەوە هەبێ، بەڵام ئێمە ئەم دەقە لێرەدا دێنین، كە (الطبري) هێناویەتی:

{عَنِ الْأَجْلَحِ، قَالَ: سَمِعْتُ الضَّحَّاكَ بْنَ مُزَاحِمٍ، قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَمَرَ اللَّهُ السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِأَهْلِهَا، وَنَزَلَ مَنْ فِيهَا مِنَ الْمَلَائِكَةِ، فَأَحَاطُوا بِالْأَرْضِ وَمَنْ عَلَيْهَا، ثُمَّ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ الثَّالِثَةَ، ثُمَّ الرَّابِعَةَ، ثُمَّ الْخَامِسَةَ، ثُمَّ السَّادِسَةَ، ثُمَّ السَّابِعَةَ، فَصَفُّوا صَفًّا دُونَ صَفٍّ، ثُمَّ نَزَلَ الْمَلِكُ الْأَعْلَى عَلَى مَجْنَبَتِهِ الْيُسْرَى جَهَنَّمُ، فَإِذَا رَآهَا أَهْلُ الْأَرْضِ نَدُّوا، فَلَا يَأْتُونَ قُطْراً مِنْ أَقْطَارِ الْأَرْضِ إِلَّا وَجَدُوا سَبْعَةَ صُفُوفٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ، فَيَرْجِعُونَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي كَانُوا فِيهِ، فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ: ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖ...﴿٣٣﴾﴾غافر، وَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ﴿٢٢﴾ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٢٣﴾﴾الفجر، وَقَوْلُهُ: ﴿يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾﴾الرحمن، وَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾﴾الحاقة} (جامع البيان: ٣٤٨٧٣).

واتـە: ئەجلـەح دەڵـێ: گوێـم لـە زەححـاكی كـوڕی موزاحیـم بـوو، دەیگـوت: {كەواتـە: ئـەم دەقـە موڕسـەلە، بـەڵام زانایـان گوتوویانـە: ئـەو قسـانەی زانایـانی تابیعیـن گوتوویانـن، لـە خـۆوە نەیانگوتـوون و حەتمـەن لـە هاوەڵانیـان بیسـتوون، ئەوانیـش لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە تایبـەت ئەگـەر پەیوەندییـان بـە ئـەو شـتانەوە هەبـێ كـە نادیـار (غیـب)ن، بـە تایبـەت ڕۆژی دوایـی}، لـە ڕۆژی قیامەتـدا خـوا فەرمـان دەكات بـە دانیشـتووانی ئاسـمانی یەكـەم (واتـە فریشـتەكان)، ئنجـا هەرچـی لـە فریشـتان تێیدایـە، هەموویـان دێنـە خـوارو، دەوری زەوی دەدەن، دەوری ئـەو خەڵكـەش كـە لـە زەویدایـە، دەدەن، دوایـی فەرمـان دەكات بـە فریشـتەكانی ئاسـمانی دووەم، ئنجـا سـێیەم، ئنجـا چـوارەم، ئنجـا پێنجـەم، ئنجـا شەشـەم، ئنجـا حەوتـەم، ئنجـا هەموویـان ڕیـز ڕیـز دەوەسـتن، ڕیـز لـە دوای ڕیـز، دوایـی (خـوای) حوكمـڕانی هـەرە بـەرز، دادەبـەزێ (بـەو شـێوەیەی بـۆ خـوا شایسـتەیە)، لـە لای چەپـی دۆزەخ هەیـە، كاتێـك خەڵـكی سـەر زەوی دۆزەخ دەبینـن، ڕادەكـەن، ئیـدی ناچنـە هیـچ گۆشـەو كەنارێك، لـە كەنـارەكانی زەوی، مەگـەر حـەوت ڕیـزی فریشـتان دەبینـن و بـە ناچـاری دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو شـوێنەی پێشـتر لێیبـوون، ئـەوەش مانـای قسـەی خـوای بـەرزە (كـە لەسـەر زمـانی ئـەو پیـاوە ئیمانـدارەی بەرگریی لـە مووسـا دەكات (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لـە بەرامبـەری فیرعـەون و دارو دەسـتەكەیدا، دەفەرمـوێ): ﴿وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖ... ﴿٣٣﴾﴾ غافر، واتـە: ئـەی خەڵكەكـەم! مـن لـە ڕۆژی یەكـدی بانگكردنێـدا لێتـان دەترسـێم، ئـەو ڕۆژەی ڕادەكـەن و پشـت هەڵدەكـەن، هیـچ پارێزەرێكتـان نیـە.

هەروەهـا ئـەوە مەبەسـت پێـی قسـەی خـوای بـەرزە، كـە دەفەرمـوێ: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ﴿٢٢﴾ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ ﴿٢٣﴾﴾ الفجر، واتـە: پـەروەردگارت و فریشـتەكان هاتـن ڕیز ڕیـزو، دۆزەخ هێنـدرا، لـەو ڕۆژەدا مـرۆڤ دێتـەوە بیری، بـەڵام هاتنـەوە بیـر چ سـوودێكی هەیـە! هەروەهـا ئـەوە مەبەسـتی قسـەی خـوای بـەرزە، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ

وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُواْ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُواْ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾**الرحمن**، ئەی کۆمەڵی جند و مرۆڤ! ئەگەر توانیتان دەربچن لە گۆشەو کەنارەکانی ئاسمانەکان و زەوی، دەربچن، دەرناچن، مەگەر بە دەستەڵات (ئەو دەستەڵاتەشتان نیە).

هەروەها ئەوەش مەبەستی قسەی خوای بەرزە، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِىَ يَوْمَئِذٍ وَاهِيَةٌ ﴿١٦﴾ ﴾**الحاقة**، واتە: ئاسمان شەق و پەق بووە ئنجا لەو ڕۆژەدا هەڵوەشاوەو بێهێزە.

**مەسەلەی دووەم:**

**لەو ڕۆژەدا جند و مرۆڤ ڕادەنوێنرێن و هیچ شتێکیشیان لێ شێردراوە نابێ و، وەرگرەوەی لیستی کردەوەکانی بەڕاستە، بە دڵخۆشییەوە بە خەڵك دەڵێ: بیگرن نووسراوەکەم بخوێننەوە، من دڵنیابووم تووشی لێپرسینەوە دەبم، ئەوە لە ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی دایە، لە باخێکی بڵندی میوە نیزیك، پێیان دەگوترێ: بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُواْ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴿٢٣﴾ كُلُواْ وَٱشْرَبُواْ هَنِيٓـًٔا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِي ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

**١)-** ﴿ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴾، لەو ڕۆژەدا ڕادەنوێنرێن هیچ پەنهانێكتان لێ ناشێررێتەوە، واتە: دوای ئەوەی ئاخیر زەمان دێ، ئنجا قۆناغی قیامەت دێ، دوای ئەوەی هەشت لە دروستكراوەكان عەرش و تەختی پەروەردگار هەڵدەگرن: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ ﴾، لەو ڕۆژەدا ڕادەنوێنرێن، ﴿ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴾، ﴿ لَا تَخْفَىٰ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (لا يَخْفَى مِنْكُم خَافِيَة)، هیچ پەنهانێكتان لێ ناشاررێتەوەو ون نابێ.

ئەم ڕستەیە چوار واتای هەن:

**أ-** ﴿ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴾، (لاَ تَخْفَى عَلَى اللهِ مِنْكُم خَافِيَة، لأَنَّهُ عَالِمٌ بِجَمِيعِكُم مُحِيطٌ بِكُلِّكُم)، واتە: هیچ شتێكتان لە خوا پەنهان و شێردراوە نیە، چونكە زانایە بە تیكڕاتان و، دەورە دەری هەموو شتێكتانە.

**ب-** ﴿ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴾، واتە: لەو ڕاستییانەی لە دنیادا پێیان بێبڕوابوون، لەو ڕۆژەدا هیچ شتێكتان لێ پەنهان نابێ و، هەموو شتێكتان بۆ ئاشكرا دەبێ.

ج- هەروەها ئەو واتایەش دەگەیەنێ، وەك لە سووڕەتی (الطارق)دا، دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ تُبْلَى ٱلسَّرَآئِرُ ﴿٩﴾﴾، واتە: ئەو ڕۆژە هەموو نهێنییەكان دەكەونە گۆڕێ و ئاشكرا دەبن.

د- لەو ڕۆژەدا هیچ كام لە نیەت و قسەو كردەوە پەنهانەكانتان لێتان شێرراوە نابن و هەموویانتان بۆ دەردەكەون.

٢)- ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ﴾، ئنجا هەر كەسێك نووسراوەكەی بدرێتەوە دەستی ڕاستی، واتە: لیستی كردەوەكانی بدرێتەوە دەستی ڕاستی، بڕوانامەكەی بە لای ڕاستیدا بیدرێتەوە.

٣)- ﴿فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ﴾، ئەوە دەڵێ: ها بیگرن، بیخوێننەوە نووسراوەكەم، (هاؤُم: تَعالَوا)، وەرن، هەندێكیش گوتوویانە: (هاؤم: خُذُوا)، بیگرن، پێشم وایە دووەمیان زیاتر ڕاستە، هەرچەندە ﴿هَآؤُمُ﴾، مانای (وەرن)یش دەگەیەنێ، بەڵام لێرەدا بە مانای (بیگرن)ە.

﴿ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ﴾، نووسراوەكەم بخوێننەوە، پێشتر گوتمان (هاؤم) بە مانای (خُذ)، پێچەوانەی (هاتِ) بە مانای (أَعْطِ)، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ ... ﴿١١١﴾﴾البقرة، بڵێ بەڵگەكانتان بێنن، ئنجا ﴿هَآؤُمُ﴾، لە ڕووی ڕێزمانییەوە پێی دەگوترێ: ناوی كردار (اسم فعل) بە مانای: ها بیگرن و، بۆ كۆیە، (هاء) بیگرە، بۆ تاكەو ﴿هَآؤُمُ﴾، بۆ كۆیە، واتە: بیگرن، زانایان گوتوویانە: ئەم وشەیە (هاؤ) و ﴿هَآؤُمُ﴾، چەند زار(لهجة)ێكی تێدا هەن، باشترینیان وەك زۆربەی تەفسیرەكان گوتوویانە، بۆ وێنە: (القرطبي) ئەوەیە:

(هاء: لِلرجُل، هائِي: لِلمَرأَة، هائا: لِلإثنَينِ مِنهُما، هاؤُم: لِلرجَال، هَاؤنَّ: لِلنّساء)، (هاء) بگرە، بۆ پیاوێك، (هائِي) بگرە، بۆ ئافرەتێك، (هائا)، هەردووكتان بگرن، بۆ دوو پیاوو دوو ئافرەت، بە جیا جیا، (هاؤُم)، بگرن، بۆ كۆمەڵە پیاوێك، (هاؤنَّ)، بگرن، بۆ كۆمەڵە ئافرەتێك.

کەواتـە: ﴿ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴾، یـانی: دەڵـێ: هــا بیگــرن خەڵکەکـە نووسراوەکـەم بخوێننـەوە، ئنجـا کاتێـك پیـاوان و ئافرەتانیـش پێکـەوە دەبـن، لـە ڕێزمـانی عەرەبییـدا پیـاوان زاڵ دەکرێـن بەسـەر ئافرەتانـدا، واتـە: ئـەی خەڵکەکـە بـە پیـاوو ئافرەتـەوە! هـا بیگـرن، ﴿ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴾، نووسراوەکـەی مـن بخوێننـەوە.

٤)- ﴿ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ﴾، من دڵنیابووم گەیشتووی لێپرسینەوەکەمم، بە ڕواڵەتەکەی ئەگەر (ظَنّ) بە گومان لێك بدرێتەوە، یانی: من گومانم وابوو تووشی لێپرسینەوەکەم دەبم، بەڵام ئەگەر ورد سەرنج بدەین (ظن) لە هەندێك سیاق لە قورئاندا، ناگونجێ بە مانای گومان بێ، بەڵکو بەمانای زانینە، یاخود بە مانای دڵنیاییە، چونکە کەسێك هەر گومانی وابێ، تووشی لێپرسینەوە دەبێ، ئەوە نەك هیچ ئازایەتیی نیە، بەڵکو بێبڕواییشە! خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ ...(١٥) ﴾الحجرات، بڕواداران ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی هەیە، دواییش هیچ دوو دڵییان نیە، هەروەها خوای بەرز چەند جارێك لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ (٤) ﴾البقرة، ئەوان دڵنیان بە مەنزڵگای کۆتایی.

کەواتە: لێرەدا (ظَنّ) بە مانای زانیاریی و دڵنیاییە.

**(الطبري)** لـە (ابـن زیـد)ەوە دەهێنێ، دەڵـێ: (**قَـالَ: إِنَّ الظَّنَّ مِـنَ الْمُؤْمِنِ يَقِـينٌ، وَإِنَّ عَـسَى مِـنَ اللَّـهِ وَاجِـبٌ:** ﴿ فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ (٦٧) ﴾القصـص)، (**جامـع البیـان: ٣٤٩٠٠**)، واتـە: (**ظَـنّ**) لـە بـڕوادار (واتـە: لە هـەر سیاقێکدا لە قورئانـدا (**ظَن**) پاڵدرابێتـە لای بـڕوادار)، بـە مانـای یەقیـن و جێـی دڵنیاییـە، هەروەهـا هـەر کات خـوا (**عـسی**)ی بـۆ خـۆی بەکارهێنـا، مانـای پێویسـتبوون دەگەیەنـێ، وەك: ﴿ فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ (٦٧) ﴾القصـص، واتـە: نیزیکـەو لەوانەیـە لەسـەرفرازان بـێ، یـانی: مسـۆگەر لەوانـە.

ئێسـتاش بـا دوو نموونـە بـۆ (**ظـن**) بهێنینـەوە، کـە ناگونجـێ بـە مانـای گومـان بـێ و بـە مانـای زانیاریـی و دڵنیاییـە:

**١-** لە سووڕەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەوانەی دڵنیان کە بە پەروەردگاریان دەگەن و بۆ لای وی دەگەڕێنەوە.

**٢-** هەروەها لە سووڕەتی (**البقرة**)دا، خوا ﷻ دیسان لە بەسەرهاتی (**طالوت**)دا، وشەی (**ظَنَّ**) بەکاردەهێنێ و بێگومان مەبەست پێی دڵنیاییە، کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةَۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ ﴾البقرة، ئەوانەی دڵنیان بە دیداری پەروەردگاریان دەگەن، گوتیان: زۆرجاران کۆمەڵێکی کەم بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا زاڵ بوون، بە مۆڵەتی خواو خواش لەگەڵ خۆڕاگرانە، کەواتە: ئەمە بنچینەیەکی چاکە، وەك (**إبن زيد**) گوتوویەتی، کە دیارە لە ئەنجامی تێوەڕامان و ئیستیقڕای هەموو سیاق و ئایەتەکاندا، ئەو بنچینەیەی هەڵهێنجاوە، وەك من دوو نموونەم لە سووڕەتی (**البقرة**) دا بۆ هێنانەوە، کە هەر کاتێك (**ظَنَّ**) بۆ بڕوادار بەکارهێنرا، مەبەست پێی دڵنیا (**يقين**) ە، لەبەر چی؟ هەندێك لە زانایان شیکردنەوەیان بۆ کردووەو دەڵێن:

**أ-** لەبەر ئەوەی ئیمان و بڕوا کە دەست پێ دەکات، مرۆڤ یەکسەر یەقینی نیە، بەڵکو پلە پلەیە، پێشێ گومانێکی زاڵی هەیە، دوایی وردە وردە بەهێز دەبێ و دەبێتە زانیاریی، دوایی دەبێتە جێی دڵنیایی، ئنجا چونکە سەرەتای ئیمان هێنان لە گومانەوە دەست پێ دەکات، بۆیە جاری وایە لە ئیمانەکەدا سەرەتاو دەستپێکەکەی ڕەچاو کراوەو، گومان (**ظن**)ی بۆ بەکارهێنراوە.

**ب-** یاخود (**ظَنَّ**) وەك چۆن مانای گومانی هەیە، گومانی زاڵ، بەهەمان شێوە مانای یەقین و دڵنیاییشی هەیە.

(**إبن عجيبة**) خاوەنی (**البحرُ المَدِيد في تفسيرِ القرآن المجيد**)دا[1]، لە (**أبو السعود**)ی خواستۆتەوەو دەڵێ: (**التَّعبيرُ بِالظَّنِ، للإشْعَار بِأنَّه لَا يَقدَحُ فِي الإعْتِقَاد، مَا يَهجِسُ فِي النَفْسِ مِنَ الخَطَراتِ الَّتِي لَا تَنْفَكُّ عَنْها العُلُوم النَظَرِيَّةُ غَالبًا**).

---

(١ ) ج٨، ص١٢٧.

منیش تێبینییەکەییم پێ جوانە.

واتە: بۆیە لێرەدا (بۆ ئیمان) تەعبیر بە گومان (**ظن**) کراوە، {هەرچەندە مەبەست پێی یەقین و دڵنیاییە، بەڵام بۆیە بە وشەی (**ظن**) دەربڕدراوە} بۆ زانین و هەست پێکردنی ئەوەیە، کە ئەگەر جار جار خەتەرەیەك بە دڵدا بێ، کە زانیارییە وەدەستهێنراوەکان لێی خاڵیی نابن، ئەوە زیانی نیە بۆ بڕوا، (ئەگەر جار جار مرۆڤ شتێکی بە دڵدا بێ و دوو دڵییەك، خەتەرەیەك، شتێکی خراپ).

٥)- ﴿ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾، ئنجا ئەوە لە ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی دایە، (**الطبري**) دەڵێ: (**فِي عَيْشَةٍ رَضِيَّةٍ**)، واتە: لە ژیانێك دایە پڕە لە ڕەزامەندیی.

هەروەها واتایەکی دیکەشی بۆ لێکداوەتەوە دەڵێ: (**عَيْشَةٍ فِيهَا الرِّضَا**)، لە ژیان و گوزەرانێك دایە ڕەزامەندیی تێدایە، ئنجا ئایا عەرەب تەعبیری وایان هەیە؟ بەڵێ: دەگوترێ: (**لَيلٌ نائِم، وَسِرٌّ كَاتِم، وَماءٌ دافِق**)، (**لَيلٌ نَّائِم**) یانی: (**لَيلٌ نَّائِمٌ فِيهِ المَرْءُ**)، شەوێکی خەوتوو، یانی: شەوێك کە مرۆڤ تێیدا خەوتوە، (**سِرٌّ كَاتِم**)، نهێنییەکی شێرەرەوە، یانی: نهێنییەك کە خاوەنەکەی شێرەرەوەیە، (**ماءٌ دافِق**)، ئاوێکی دەرقوڵیو، یانی: ئاوێك کە دەرقوڵێنراوە، هەموو ئەو تەعبیرانە هاتوون.

٦)- ﴿ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴾، واتە: لە باخێکی بڵنددایە، بڵندییەکە هەم مانای ڕواڵەتیی و بەرهەستی دەگەیەنێ، هەم مانای مەعنەوییشی دەگەیەنێ، یانی: لە ڕووی مەعنەوییەوە زۆر بڵندو باڵایەو بە نرخ پڕ بەهایە.

٧)- ﴿ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ ﴾،(میوە) چنراوەکانی نیزیکن، (**قُطُوف أَي: مَا يُقْطَفُ مِنَ الجَنَّةِ مِنْ ثِمَارِهَا، دَانٍ قَرِيبٌ مِنْ قَاطِفِهِ**)، واتە: ئەوەی لە باخەکە دەچنرێ (لە میوەکانی)، ئاسان و نیزیکە لە بابای چنەری {ئەو کەسەی دەیچنێ}، (**قُطُوف**)، کۆی (**قِطَف**)ە، یانی: (**مَقْطُوف**) ە، لێکراوە، چنراو ئەوەی دەچنرێ، (**قِطَاف**) پرۆسەی چنینەکەیە، (**دانِيَة**)ش سیفەتی (**قُطُوف**)ە، واتە: چنراوەکان نیزیکن.

٨)- ﴿ كُلُوا۟ وَٱشۡرَبُوا۟ هَنِيٓـَٔۢا ﴾، واتە: پێیان دەگوترێ: بخۆن و بخۆنەوە، بێ گرفتن، **(الطبري)** دەڵێ: (**هَنِيئاً: لا تَتَأَذُّونَ بِمَا تَأْكُلُونَ، وَلَا بِمَا تَشْرَبُونَ، وَلَا تَحْتَاجُونَ مِنْ أَكْلِ ذَلِكَ إِلَى غَائِطٍ وَلَا بَوْلٍ**)، واتە: (**هَنِيئاً**) یانی: بە هۆی ئەوەوە کە دەیخۆن و دەیخۆنەوە، تووشی ئازار نابن، هەروەها بە هۆی ئەو خواردن و خواردنەوەوە، حەوجێی پیسایی کردن و میز کردن نابن.

ئایا ئەو پاداشتەیان بەهۆی چییەوەیە؟!

٩)- ﴿ بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِى ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە پێشتانخستوە لە ڕۆژانی ڕابردوودا، **(الطبري)** دەڵێ: (**أَيْ: عَلَى مَا قَدَّمْتُمْ فِي دُنْيَاكُمْ لِآخِرَتِكُمْ مِنَ الْعَمَلِ بِطَاعَةِ اللَّهِ:** ﴿ فِى ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ﴾)، بە هۆی ئەوەوە کە لە ژیانی دنیاتاندا پێشتانخستوە لە کردەوە، بۆ ڕۆژی دواییتان بۆ مەنزڵگای کۆتاییتان، بە فەرمانبەریی و ملکەچیی بۆ خوا، لە ڕۆژانی ڕابردوودا.

**(الطبري)** لە قەتادەوە ئەم تەعبیرەش دێنێ: (**أَيَّامكُمْ هَذِهِ أَيَّام خَالِيَة: هِيَ أَيَّام فَانِيَة، تُؤَدِّي إِلَى أَيَّام بَاقِيَة**)، (**جامع البيان: ٣٤٩٠٥**) ئەم ڕۆژانەتان (ئەی خەڵکینە!) ڕۆژانی تێپەڕیون، ڕۆژانی تەواو بوون، کە سەر دەکێشن بۆ ڕۆژانی بەردەوام و بێ کۆتایی لە ڕۆژی دوایی دا.

لە زۆر شوێنی قورئان دا، خوا ﷻ باسی نازو نیعمەتەکانی بەهەشت دەکات و زۆرجار باسمان کردوە، لێرەش دا ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین، کە دەفەرموێ: {**أَنَّهُمْ يَعِيشُونَ فَلَا يَمُوتُونَ أَبَدًا، وَيَصِحُّونَ فَلَا يَمْرَضُونَ أَبَدًا، وَيَنْعَمُونَ فَلَا يَرَوْنَ بُؤْسًا أَبَدًا، وَيَشِبُّونَ فَلَا يَهْرَمُونَ أَبَدًا**} (**أخرجه مسلم: ٢١٣٧**)، واتە: بەهەشتییەکان لە بەهەشتدا دەژین، هەرگیز نامرن، تەندروست دەبن و، هەرگیز نەخۆش ناکەون، لە خۆشیی و چێژو لەزەتدا دەبن و هەرگیز گرفت و نارەحەتیی نابینن، هەر گەنج دەبن و هەرگیز پیر نابن.

بێگومان حاڵ و بارودۆخی ژیانی بەهەشت وەك هی ژیان دنیانیە، بەڵكو واپێدەچێ هی بەرزەخیش بە هەمان شێوەبێ، دوای ئەوەی ڕووحی مرۆڤ لەو جەستە خاكییەی دەچێتە دەر، وا پێدەچێ كات (زەمن) بوەستێ و بەو شێوەیەی هی ئێرە نابێ، هەر بۆیە ئەوانەی ئێستا لە قۆناغی بەرزەخدان، ئەگەر لەوەتەی مرۆڤ لەسەر زەوییە، ئنجا ملیۆنێك ساڵە یان زیاتر یان كەمترە، زۆر لە مێژە لەوێ لە ژیانی بەرزەخیی دان، بێگومان ژیانیان وەك هی ئێرە نیە، كە لێرە مرۆڤ بەشی حەفتا هەشتا نەوەد ساڵێك دەكات، كەچی لە قۆناغی بەرزەخدا هەزاران ساڵە لەوێن، چ لە خۆشییدا بن، وەك پێغەمبەران **(عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام)**و صیدیقان و شەهیدان و صاڵیحان، چ لە ناخۆشییدا بن، وەك هەموو ئەو فیرعەون و **طاغووت** و خۆ سەپێنەرو بێبڕواو كەللە ڕەقانەی، دژایەتیی پێغەمبەرانیان **(عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَ السَّلام)**كردوە.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

وەرگرەوانی لیستی کردەوەکانیان بە دەستی چەپ، یەکجار خەفەتبارو پەشێمان دەبن و مردن بە ئاوات دەخوازن و، دوایی کۆت دەکرێن، پاشان بە زنجیرێکی حەفتا گەزیی زنجیر پێچ دەکرێن، ئەویش لە سۆنگەی بێبڕواییانەوە بە خوای مەزن و، هاوکاریی نەکردنی نەداران و هان نەدانی خەڵکیش، بۆیە لە قیامەتدا هیچ دڵسۆزێکیان نابێ و، خۆراکیشیان جگە لە زووخاو نابێ و بە هۆی تاوانبارییەوە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنِّي مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ ﴾، بەڵام کەسێك نووسراوەکەی (لیستی کردەوەکانی) بدرێتەوە دەستی چەپی.

٢)- ﴿ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴾، دەڵێ: خۆزگە نووسراوەکەمم پێنەدرابایەوە، وەرم نەگرتبایەوە.

٣)- ﴿ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴾، خۆزگە نەمزانیبایە لێپرسینەوەکەم چۆنە، (**أي: لَيتَني لَم أَدرِ ما حِسابيَه**)، خۆزگە نەمزانیبایە لێپرسینەوەکەم چییە، وشەی (ما) بۆ پرسیارکردنە (**ما إستِفهامِيَّة**)، واتە: نەمزانیبایە لێپرسینەوەکەم چییە.

٤)- ﴿ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴾، ئەی خۆزگە مردنی ڕابردوو یەکجارەکیی بووایە، (ها) ی (لَيتَها) دەگەڕێتەوە بۆ زاندراوێك بەپێی سیاق، یانی: (لَيْتَ مَوتَتي أَو مُصِيبَتِي كانَتِ القَاضِيَة)، بریا بەڵایەکەم یان مردنەکەم یەکجارەکیی بووایە، واتە: کۆتایی پێهێنەر بووایەو کاری منی هەڵبڕیبایە، یانی کۆتایی بە بوونی من هێنابایە، چونکە (قَضَى عَلَيهِ) واتە: نەیهێشت و کۆتایی پێ هێنا، دەگوترێ: (ضَرَبَهُ ضَرْبَةً قاضِيَةً)، لێدانێکی لێدا کۆتایی پێ هێنان، لێرەدا بابای بێبڕوای دۆزەخیی سێ خۆزگان دەخوازێ، بەڵام بە دڵنیایی داری خۆزگەو بریا بۆ کەس بەری نەگرتوە، تاکو بۆ ئەو بەر بگرێ.

٥)- ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾، ماڵ و سامانەکەم هیچ سوودی پێ نەگەیاندم، (ما) دەگونجێ لابەرە (نافية) بێ، یانی سوودی پێ نەگەیاندم، دەشگونجێ پرسیارکردنانە (إستفهامية) بێ، ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾، ماڵ و سامانەکەم چ سوودێکی پێ گەیاندم؟ هەر کام لە: ﴿ مَالِيَهۡ ﴾ و ﴿ سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾ش، خوێندراونەوە: (مالِي وسُلطانِي)، یانی: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾، ﴿ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، خوێندراونەوە: (ما أَغنَى عَنِّي مالِي)، (هَلَكَ عَنِّي سُلْطانِي)، کە (هـ)ی سەر: ﴿ مَالِيَهۡ ﴾ و ﴿ سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، بۆ وەستانن، ئەگەرنا لە ئەسڵ دا ئەو دوو وشەیە (مالِي) و (سُلْطانِي)ین.

٦)- ﴿ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، دەسەڵاتەکەمم لە دەست چوو، ڕۆیشت، (سُلطَان) دەگونجێ بە مانای دەسەڵات و دەسترۆیشتوویی بێ و، دەشگونجێ (سُلطَان)، بە مانای بەڵگە بێ، هەروەها: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾ش، دەگونجێ دوو واتای هەبن:

أ- (مالِي) واتە: ئەوەی هی من بوو، سوودی پێ نەگەیاندم، یان چ سوودێکی پێگەیاندم؟.

ب- (مالِي) یانی: ماڵ و سامانەکەم، سوودی پێنەگەیاندم، یان چ سوودێکی پێگەیاندم؟.

٧)- ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾، بیگرن، ئنجا کۆتی بکەن، لێرەدا قسەیەك یان گوتنێك تەقدیر کراوە: (يَقُولُ اللهُ للملائكة لِزَّبانِيَةِ)، خوا بە فریشتە دۆزەخەوانەکان دەفەرموێ: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾، بیگرن، ئنجا کۆتی بکەن، مەبەست لە گرتن، وێڕای گرتنی ڕواڵەتیی، خستنە ژێر ڕکێف و کۆنترۆڵیشە.

(**وَغُلُّوهُ: أَمْرٌ مِنْ غَلَّهُ إِذَا وَضَعَهُ فِي الْغُلِّ، وَهُوَ الْقَيْدُ الَّذِي يُجْعَلُ فِي عُنُقِ الْجَانِي أَوِ الْأَسِيرِ**)، وشەی (**غُلُّوهُ**) فەرمانە لە (**غَلَّهُ**)، کاتێك بخرێتە کۆتەوە، یانی: کۆت بخرێتە گەردنیەوە، کە بریتیە لەو کۆتەی دەخرێتە گەردنی بابای تاوانبار یاخود دیلەوە.

٨)- ﴿ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴾، دوایی بیخەنە نێو کلْپەی (سەوزی) ئاگرەوە، ﴿ ثُمَّ ﴾، لێرەدا (**لِلتَّرْتِيبِ الرُّتْبِي**)، بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونکە گرتن و کۆتکردنەکەی شتێکە، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە بخرێتە نێو دۆزەخەوە.

٩)- ﴿ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴾، دوایی بیخەنە نێو زنجیرێکی حەفتا گەزییەوە، ئەمەش دیسان بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونکە لە هی پێشووش خراپتر ئەوەیە کە بخرێتە نێو زنجیرێکەوە، کە ئەندازەکەی حەفتا گەزە، حەفتا باسکە، واتە: بیخەنە نێو زنجیرێك و زنجیرەکەی لێ بئاڵێنن، (**ذَرع**) بە مانای ئەندازە دێ، (**أَي: قِياسُ طُولِها**)، ئەندازەی درێژییەکەی، (**ذِراع**)یش یانی: باسك، (**ذِراعُ اليَد**)، دەشگونجێ ژمارەی حەفتا (٧٠) بۆ زۆریی بێ، دەشگونجێ بۆ دیارییکردن بێ و ڕێك (٧٠) گەز، حەفتا باسك بێ، کە دەفەرموێ: ﴿ فَاسْلُكُوهُ ﴾، (**وَمَعْنَى فَاسْلُكُوهُ: اجْعَلُوهُ سَالِكًا، أَيْ دَاخِلاً فِي السِّلْسِلَةِ، وَذَلِكَ بِأَنْ تُلَفَّ عَلَيْهِ السِّلْسِلَةُ فَيَكُونُ فِي وَسَطِهَا، وَيُقَالُ: سَلَكَهُ، إِذَا أَدْخَلَهُ فِي شَيْءٍ**)، واتە: بیخەنە نێو زنجیرەکە کە زنجیرەکەی لێ بئاڵێنرێ و ئەو بکەوێتە نێو زنجیرەکە، چونکە (**سَلَكَهُ أَي: أَدخَلَهُ**)، خستیە نێوی، هەروەها (**أَسلَكَهُ**)ش بەهەمان شێوە، (**الذَّرْعُ: كَيْلُ طُولِ الْجِسْمِ بِالذِّرَاعِ، وَهُوَ مِقْدَارٌ مِنَ الطُّولِ مُقَدَّرٌ بِذِرَاعِ الْإِنْسَانِ، وَكَانُوا يُقَدِّرُونَ بِمَقَادِيرِ الْأَعْضَاءِ مِثْلُ الذِّرَاعِ، وَالْأُصْبُعِ، وَالْأُنْمُلَةِ، وَالْقَدَمِ**)، (**ذَرْع**) ئەندازەی درێژیی جەستەیە بە (باسك) کە بریتیە لە ئەندازەیەك درێژیی، بە ئەندازەی درێژیی باسکی مرۆڤ {کە لە بن هەنگلیەوە تاکو سەرە پەنجەی دەگرێتەوە}، عەرەب عادەتیان وابووە بە ئەندامەکان شتیان دەپێوا، وەك باسك و پەنجەو سەرە پەنجەو پێ، ئەو تەعبیرانەیان بەکارهێناون.

(**الـذِّرَاعُ: مِـن طَـرَفِ المِرْفَـقِ إِلَى طَـرَفِ الأُصبُـعِ الوسْـطَى**)، (ذراع) باسـك لـه ئانیشـكەوە تاكـو سـەری پەنجـەی نێوەڕاسـت، بـەڵام پێـم وایـە (باسـك) لـە بـن هەنگڵـەوە تاكـو سـەری پەنجەیـە.

بـەڵام پێـم وایـە كـە دەگوتـرێ: (**ذِرَاعُ**)، لـە بـن هەنگڵەوە تاكـو سـەری پەنجەكان، بـە كوردیـی (باسـك و گەز)ی پێدەڵێـن، دەیگرێتـەوەو هەمووی (٦٤) سـەنتیمە[1].

ئنجا ئایا بۆچی وای لێدەكرێ؟

١٠)- ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، چونكە ئەو بڕوای بە خوای مەزن نەبوو.

١١)- ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴾، خەڵكیشی هان نەدەدا لەسەر خواردندان بە نەدار، واتە: نە بۆ خۆی هاوكاریی نەداری دەكرد، نە خەڵكیشی هان دەدا.

١٢)- ﴿ فَلَيۡسَ لَهُ ٱلۡيَوۡمَ هَٰهُنَا حَمِيمٞ ﴾، ئەمڕۆش ئەو هیچ دۆست و دڵسۆزو نیزیكێكی نیە.

١٣)- ﴿ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنۡ غِسۡلِينٖ ﴾، خۆراكیشی نیە، جگە لە غیسلین، (**الغِسلين: قيلَ مُشتَقٌّ مِنْ (غِسيلِ)، الإنَّهُ سَالَ مِنَ الأَبدانِ، فكَأَنَّهُ غَسيلٌ عَنهَا، وَالأَصَحُّ هو ما يُدخَلُ فِي أَفواه أَهل النَّارِ مِن المَوادّ السَّائِلَةِ مِنَ الأَجسادِ وَماءِ النَّارِ وَنَحوِ ذالِك**)، (**غسلين**) هەندێك گوتوویانە: داتاشراوە لە وشەی غەسیلەوە، چونكە لە جەستەكان دێتە خوار، وەك ئەو ئەندامانە داشۆرابن، بەڵام ڕای ڕاستتر ئەوەیە كە بریتیە لەوەی دەخرێتە نێو زاری ئەوانەوە كە لەنێو ئاگردان، لەو ماددە شلەمەنییانەی لە جەستەكان و ئاوی ئاگرو كێم و زووخاوی دۆزەخییان دێتە خوار.

١٤)- ﴿ لَّا يَأۡكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡخَٰطِـُٔونَ ﴾، جگە لە ئەوانەی گوناهبارو تاوانبارن، ئەو خۆراكە ناخۆن، وشەی: (**خاطِئُون**) خوێندراویشەتەوە: (**خاطِيُّون**) و خوێندراویشەتەوە: (**خاطُون**)، واتە: بە سێ جۆر خوێندراوەتەوە: (**خاطِئُون**)، (**خَاطُون**)، (**خاطِيُّون**)، واتە: ئەوانەی كە خاوەن گوناهی ئانقەستن، (**خَطِئَ: أَذنَبَ**)، یانی: گوناه و تاوانی كردوە.

---

(١) المعجم الوسيط، ص: ٣١١.

## کورتە باسێک

## حەوت سەرنج لە بارەی خۆزگە خواستن و پەشێمانیی و سزای سەختی بێبڕوایان لە دۆزەخ دا

**سەرنجی یەکەم:** بابای بێبڕوا لە ڕۆژی دوایی دا، دوای ئەوەی سزا دەدرێ و، دەخرێتە دۆزەخەوە، سێ خۆزگەی بۆش دەخوازێ، پێشینانیش گوتوویانە: (داری خۆزگە بۆ کەس بەری نەگرتوە)، یان (داری بریا بەر ناگرێ)، بریا وام کردبایەو بریا وا چووبایە، بێ سوودە، لە کاتی خۆیدا دەبێ، ئاگات لە کاری خۆت بێ، ئەگەرنا دوای ئەوەی تێپەڕی بە خۆزگەو بریا هیچ شتێك قەرەبوو نابێتەوە، ئنجا مرۆڤی بێبڕواو لارو تاوانبار لە ڕۆژی دوایی دا، سێ خۆزگان دەخوازێ:

**١)-** خۆزگەی یەکەمی: دوای ئەوەی نامەو لسیتی کردەوەکانی دەدرێتەوە دەستی چەپی، دەڵێ: ﴿ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ﴾، ئەی خۆزگە نووسراوەکەمم نەدرابایەوە، ﴿ يَٰلَيۡتَنِي ﴾، (لَيتَ) خۆزگە خواستنەو (یا)ی خراوەتە سەرێ: ﴿ يَٰلَيۡتَنِي ﴾، (ئەی خۆزگەکەم) من نووسراوەکەی خۆمم نەدرابایەوە، بۆچی؟ چونکە هیچی وای تێدانیە، پێی دڵخۆش بێ، ئەوەی لە لیستی کردەوەکانیدا تۆمار کراوە، هەر ئەوەیە کە لە ژیانی دنیای لادەرانەو بێبڕوایانەی دا، ئەنجامی داوە، گوتراویشە: {مرۆڤ چی بچێنێ ئەوە دەدوورێتەوە}، ئەویش هیچی چاکی نەچاندوە، بەس تۆوی بێبڕوایی و خراپەو تاوانباریی و لاریی چاندوە، دیارە هەر ئەوەش دەدوورێتەوە لە قیامەتدا، ئەوە خۆزگەی یەکەمی.

**٢)-** خۆزگەی دووەمی، دەڵێ: ﴿ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴾، یانی: **(لَيتَنِي: لَمْ أَدر ما حِسابِيَه)** (و)، ئەم ڕستەیە با دەداتەوەو دەگێڕێتەوە بۆ ڕستەی پێشێ، واتە: ئەویش ﴿ يَٰلَيۡتَنِي ﴾، دێتەوە سەرێ، یانی: **(وَيا لَيتَنِي لَم أَدر ما حِسابِيَه)**، هەروەها: خۆزگەم نەمزانیبایە لێپرسینەوەکەم چۆنە؟

لـە ئەصڵـدا ﴿مَاحِسَابِيَهْ﴾، بریتیـە لـە: (مـا حِسـابِي)، بـەڵام پیتـی (ھ)ی دوایـە بـۆ وەسـتانە، بریـا، خۆزگـە نەمزانیبایـە لێپرسـینەوەکەم چۆنـەو چییـە؟ چونکـە لێپرسـینەوەکەی خـوای پـەروەردگار لەگەڵیـدا کـردوە، هیچـی وەڵامـی ڕاسـت و دروسـتی پـێ نەبـووە، وەڵامـی ڕاسـت و تـەواوی پرسـیارەکانی پـێ نەبـووە، بۆچـی خـوات نەپەرسـت؟ وەڵامـی پـێ نەبـووە، بۆچـی خراپـەت کـرد؟ وەڵامێـکی پـێ نەبـووە ئیقناعکـەر بـێ، بۆچـی چاکـەت نەکـرد؟ بۆچـی یارمەتیـی خەڵکـت نـەدا؟ بۆچـی ئـەو سـیفەتە خراپانـەت لـە خۆتـدا هێنانـە دی؟ بۆچـی خـۆت بـە سـیفەتی چـاك نەڕازانـدەوە؟ بـۆ هیچـی وەڵامـی ڕاسـتی پـێ نیـە.

**٣-** خۆزگەی سێیەمی: ﴿يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ﴾، (لَيتَ) دووبارە دەکاتەوە، ﴿يَٰلَيْتَهَا﴾، ڕاناوی (ها) دەگەڕێتەوە بۆ باسنەکراوێکی قرتێنراو، کە بە سیاق دەزانین مەبەست پێی شتێکە ڕابردوە، ئنجا عەڕەب عادەتیان وابووە، بە زۆری ڕاناوی (ها) کە ڕاناوی مێینەی مەجازییە، بۆ مردن و بەڵاو موصیبەت و کۆست و کارەسات، بەکاربێنن، یانی: ﴿يَٰلَيْتَهَا﴾، یانی: (**يا لَيتَ مَوتَتي، يا لَيتَ مُصِيبَتي كانَتِ القاضِيَة**)، خۆزگە مردنەکەم، خۆزگە بەڵایەکەم کۆتایی پێهێنەر بووایە، (**قَضَى عَلَيهِ**) واتە: کۆتایی پێ هێنا، وەك لە سوورەتی (**القصص**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ...﴿١٥﴾﴾، مووسا مستێکی لێداو کۆتایی پێ هێنا، واتە: مراندی و بوو بەهۆی لە بەینچوونی، بێبڕواش خۆزگە دەخوازێ کە ئەو مردنەی دەمرد، بریا کۆتایی پێهێنەرو مرێنەر بووایە، واتە: وابووایە جارێکی دیکە ژیانی بەدوادا نەهاتبایەوە، بابای بێبڕوا ئەم سێ خۆزگەیە دەخوازێ، کە دیارە هیچیان بەری بۆ ناگرن و، هەموویان هەر خۆزگەو ئاواتی بۆش و پووچن.

**سـەرنجی دووەم:** بابـای بێبـڕوای تاوانبـار بـاسی دوو شـتان دەکات کـە سـوودیان پـێ نەگەیانـدوەو ئـەو دوو شـتەش، دوو هـۆکاری سـەرەکیین بـۆ بوغڕابـوون و یاخیبـوون و لـە کەوڵـی خـۆ دەرچـوونی مـرۆڤ:

**١-** یەکیان ماڵ و سامان.

**٢-** ئەویدیکەش دەسەڵات، دەڵێ: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾، ماڵ و سامانەکەم سوودی پێ نەگەیاندم، (**ما نَفَعَنِي**)، یان (**ما دَفَعَ عَنِّي**)، هیچ بەڵای لێ دوور نەخستمەوە، هیچ دادی نەدام، دوایی دەڵێ: ﴿ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، دەستەڵاتەکەم فەوتاو نەما.

پێشتریش گوتمان: (**مالِيَه**) و (**سُلطانِيَه**)، لە ئەسڵ دا (**مالي**) و (**سُلطانِي**)ین و، بەو شێوەیەش هەر خوێندراونەوە، بەڵام (هـ)، (**هاء السكتة**)، (ها)ی وەستانی پێدەڵێن.

(ما)ش دەگونجێ بۆ لابردن بێ و (**ما النافية**) بێ، واتە: سوودی پێ نەگەیاندم، دەشگونجێ (ما) بۆ پرسیار کردن بێ، (**ما الإستفهامية**) بێ، واتە: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴾، ئایا ماڵ و سامانەکەم کە لە دنیادا وەسەریەکم دەناو پەزمەندەم دەکرد، چ سوودێکی پێگەیاندم؟ هیچ، ﴿ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، دەسەڵاتەکەم فەوتاو لە دەستم ڕۆیشت، واتە: ئەو دەسەڵاتەی شانازییم پێوە دەکردو پێی بوغڕا دەبووم و، خەڵکم پێی دەچەوساندەوەو ستەمم پێدەکرد، ڕۆیی، نەما.

کەواتە: بابای بێبڕوا، ئەو دوو شتەی لە دنیادا زۆری پێ خوڕیون و پێی نازیون و وایزانیوە بۆ قیامەتێش وادەبن، کە بریتین لە سەروەت و سامان و دەسەڵات، بەڵام هەندێك لە زانایان (**سُلطان**) بە (بەڵگە) لێکدەدەنەوەو مانای یەکەمیش بەهێزترە، ئەگەرنا زانایان هەندێکیان دەڵێن: ﴿ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴾، واتە: بەڵگەکەمم لە دەست فەوتا، ئەو بەڵگەیەی لە دنیادا خۆم پێ ئیقناع کردبوو، کڵاوم پێ لەسەری خۆم نابوو، بەرگرییم پێ لە بیروڕا پووچەکەی خۆم دەکرد، بەڵام لەڕاستیدا ماڵ و سوڵتان بە زۆریی پێکەوەن، سامان و دەسەڵات، (**الثروة والسلطة**)، ئەو دوو شتەی خوا ﷻ لە قورئاندا وشەی (**دولَة**)ی بۆ بەکارهێناون، واتە: دەبێ دەستاو دەست بکەن و بسووڕێن:

أ- بە نسبەت ماڵەوە فەرموویەتی: ﴿ كَيۡ لَا يَكُونَ دُولَةَۢ بَيۡنَ ٱلۡأَغۡنِيَآءِ مِنكُمۡۚ ... ﴿٧﴾ ﴾**الحشر**، با ماڵ و سامان تەنیا لە دەستی دەوڵەمەندەکانتاندا نەسووڕێ، با بسووڕێ، بەڵام

نەك تەنیا لە دەستی دەوڵەمەندەكانتاندا قۆرخ بێ، وەك ئێستا دەیبینین، هەم لەم هەرێمەی خۆماندا هەم لە عێراقدا، هەم لەسەر ئاستی دنیا، بە تایبەت ئەو وڵاتانەی مسوڵمانن‌نشینن، ئەوانە زیاتر قۆرخكاریی و گەندەڵیی و ملیاردێر دروستكرانیان تێدایە، لە حاڵێكدا كە خۆیان بە مسوڵمان دەزانن و، دەزانن (**الأَرضُ أرضُ الله، وَالمالُ مالُ الله، وَالنَّاسُ خلق اللهُ**)، زەوی زەوی خوایەو، ماڵ ماڵی خوایەو، خەڵكیش هەموویان دروستكراوی خوان، هەموویان وەك یەكن، كەچی ئەو قۆرخكاریی و خۆ سەپاندن و قۆرخكارییەی لە وڵاتانی مسوڵمانن‌نشیندا هەیە، لە هیچ شوێنێكی دنیادا نیە!.

**ب-** هەروەها بە نسبەت دەستەڵاتیشەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ ... ﴿١٤٠﴾﴾ آل عمران، ئەو ڕۆژانە دەستاو دەستیان پێدەكەین، لەنێو خەڵكیدا، كەواتە: سوڵتەش دەبێ دەستاو دەست بكات، نابێ قۆرخ بێ لە بنەماڵەیەكدا، لە كەسێكدا، لە حیزبێكدا، لە عەشرەتێكدا، لە نەتەوەیەكدا، لە وڵاتێكی فرە نەتەوەو فرە پێكهاتەدا، بەڵكو دەبێ دەستاودەست بكات، چونكە ئەو دووانە: سامان و دەسەڵات، خوا بۆ خەڵكی خوڵقاندوون و، دەبێ هی هەموو خەڵك بن و، نابێ هیچكەس لە دەستی خۆیدا هیچ كامیان قۆرخ بكات، ئنجا ئەو دوو شتەی لە دنیادا، زۆربەی تاوانبارو بێبڕوایان پێیان بوغڕا دەبن، لە ڕۆژی دوایی دا تازە بە دەستیانەوە نامێنن و، پەنجەی پەشێمانیی دەگەزن و، ژیوان دەبنەوە، كە بۆچی ئەو ماڵ و سامانەیان لەسەر حیسابی خەڵك وەسەرێك ناوەو، بۆچی ئەو دەسەڵاتەیان كردۆتە هۆكاری خۆسەپاندن و قۆرخیان كردوە بۆ خۆیان و حیزب و، بنەماڵەیان و، كردوویانەتە حوكمی میراتیی و بنەماڵەیی؟!.

**سەرنجی سێیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴾، بیگرن و كۆتی بكەن، (**غُلُّوهُ**) كردارێكە لە وشەی (**غُلّ**) دروستكراوە، (**غُلُّوهُ: يَعني إجعَلُوهُ فـي غُـلّ**)، بیخەنە كۆتەوە، بیخەنە نێو كۆتەوە، یانی: گەردنی بخەنە نێو كۆتەوە، با كۆت دەوری گەردنی بدات، ئایا كۆت چییە؟ (**الغُلُّ: طَوقٌ مِن حَدِيدٍ أَو جِلدٍ يُجْعَل فِي عُنُقِ**

**الأَسِير، أَوِ المُجرِمِ، أَو فِي أَيدِيهِما وَالجَمعُ أَغلال)**[1]، واتە: (**غُلّ**) بازنەیەكە لە ئاسن، یاخود لە چەرمێكی بەهێز، دەخرێتە گەردنی بابای دیل، یاخود تاوانبارەوە، یان دەخرێتە دەستیانەوە، كۆی (**غلّ**) (**أغلال**)ە، بە كوردیی هی دەست كەلەبچەی پێ دەڵێن، بەڵام هی گەردن كۆتی پێدەڵێن، چونكە كۆت دەخرێتە گەردنەوەو سەری هەڵدەبڕێ و، ناهێڵێ، نە سەری بەملاولادا بسووڕێ، نە بەرزو نزم بكات، ڕێك لە یەك ئاستدا دەبێ و حاڵەتێكی زۆر ناخۆشە بۆ مرۆڤ، كە نەتوانێ مل بسووڕێنێ، ئەگەر بكرێتە دەستیشیەوە، چ لە پێشەوە، چ لە دواوە، دیسان حاڵەتێكی زۆر ناخۆشە، ئنجا خوا دەفەرموێ: بیگرن و كۆتی بكەن، واتە: كۆت بخەنە گەردنیەوەو، كەلەبچە بخەنە دەستەكانیەوە.

**سەرنجی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَٱسْلُكُوهُ ﴾، دوایی بیخەنە نێو زنجیرێك كە ئەندازەكەی حەفتا باسكە، وەك پێشتریش گوتمان هەندێك لە زانایان گوتوویانە: باسك لە ئانیشكەوە تاكو سەری پەنجەكانەو، زۆربەش گوتوویانە: لە سەری پەنجەكانەوە هەتا بن هەنگڵە، واتە: قۆڵ (**عَضُد**)یش دەگرێتە خۆی، كە بە هەمووی باسكیشی پێ دەگوترێ و، دەستیشی پێ دەگوترێ، بەڵام ئەگەر هەردووك دەست بن و بكرێنەوە، پێی دەگوترێ: (باع)، باڵ، بەڵام یەك دەست پێی دەگوترێ: باسك (**ذِراع**)، كە نیزیكەی نیو مەترە یان شتێك زیاترە، خوا دەفەرموێ: بیخەنە نێو زنجیرێكەوە كە ئەندازەكەی حەفتا باسكە، بۆیەش ئەوەم لێرە دووبارە كردەوە هەرچەندە پێشتریش هێنام، چونكە لە زۆربەی تەفسیرەكاندا واتایەكیان بۆ ئەو ئایەتە موبارەكە هێناوە پێم وایە شایستەی فەرمایشتی خوا نیەو، هەر لەگەڵ بێژەو ڕواڵەتی ئایەتەكەشدا ناگونجێ، ئەویش ئەوەیە، بۆ وێنە:

(**الطبري**) لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، هێناویەتی، گوتوویەتی: (**تَسْلُكُ فِي دُبُرِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ مِنْخَرَيْهِ، حَتَّى لَا يَقُومَ عَلَى رِجْلَيْهِ**)،

---

(١) المعجم الوسيط: ص٦٦٠.

(**جامع البيان**: ٣٤٩١٨) واتە: ئەو زنجیرە دەخرێتە کۆمیەوەو لە زاری دەردەچێ، بۆ ئەوەی لەسەر پێیان نەوەستێ! بەڵام بە دڵنیایی خوا ﷻ وای نەفەرمووەو ئەو تەعبیرەش خوا ﷻ لە هیچ شوێنێکی قورئان دا بەکاری هێناوە، بەڕاستیی پێشم سەیر بوو کە زۆربەی تەفسیرەکان، لەوانە: (**الطبري**) و (**إبن كثير**) و (**الرازي**) و(**البحر المديد في تفسير كتاب الله المجيد**)، وایان هێناوە، کە: ئەو زنجیرە دەخرێتە کۆمی مرۆڤەوەو لە زاری دەردەچێ! کە خوا ﷻ لە قورئاندا تەعبیری وای بەکارنەهێناوەو، ئەم تەعبیرەش ئەوە ناگەیەنێ:

چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ ﴾، دەفەرموێ: بیگرن و کۆتی بکەن، (یاخود کەلەبچەی بکەن)، دوایی بیخەنە نێو ئاگرەوە، دوایی زنجیرێك کە حەفتا باسکە ئەو کەسەی بخەنە نێو، واتە: مرۆڤەکە دەخرێتە نێو زنجیرەکەو زنجیرەکەی لێ دەئاڵێنرێ، چونکە شتێك درێژییەکەی حەفتا باسك بێ، کە لە کەسێکت ئاڵاند، مانای وایە، وەك بخرێتە نێو قەفەسێکی ئاسنەوە، کەواتە: مرۆڤەکە دەچێتە نێو زنجیرەکە، نەك زنجیرەکە بە نێو مرۆڤەکەدا بکرێ، خوای پەروەردگاریش نەیفەرمووە: (**فَاسْلُكُوها فِيهِ**)، زنجیرەکە بخەنە نێو مرۆڤەکە، بەڵکو فەرموویەتی: (**فَاسْلُكُوهُ فِيها**)، مرۆڤەکە بخەنە نێو زنجیرەکە، کەواتە: دەبێ زنجیرەکە لە مرۆڤەکە بئاڵێ و مرۆڤەکە بخرێتە نێو زنجیرەکە.

ویستم ئەوە ڕاست بکەمەوە، بێگومان خوای پەروەردگار لە قورئاندا هەمیشە کە باسی ئەندامەکانی کە جێی شەرمن بۆ مرۆڤ باسیان دەکات، لە پەناڕاو بە کینایە باسیان دەکات و، یەك وشە لە قورئاندا نیە کە نەگونجێ لە مەجلیسدا بگوترێ، بۆ وێنە: کە باسی پێکەوە جووتبوونی ژن و مێرد دەکات، دەفەرموێ:

ئەگەر دەستان گەیاندنێ ﴿ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ ﴾المائدة: (٦)، ئەگەر چوونە لایان ﴿ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ﴾النساء: (٢١)، بەڵام ناوی پرۆسەکە ناهێنێ،

هەروەها کە باسی جێی شەرمی مرۆڤ دەکات، دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ... ﴿٣٠﴾﴾النور، بە پیاوانی بڕوادار بڵێ: با لە نیگای چاویان بگرنەوەو جێی شەرمیان بپارێزن، (عەورەت) یانی: ئەو شوێنەی کە مرۆڤ پێی ناخۆشبێ دەربکەوێ، ئیدی باسی ئەندامی زاو زێیەکە ناکات، دیسان بۆ ئافرەتانیش بەهەمان شێوە.

بۆیە لێرەدا وەك لە (**إبن عباس**)ەوە هاتوە، ئەویش نازانم داخۆ سەنەدەکەی ڕاستە، یان نا، وەك پاڵدراوەتە لای ئەو، مانای وایە خوا ﷻ ڕێك باسی ئەندامی شەرمی مرۆڤی کردوە، کە لە هەموو قوڕئاندا تەعبیرێکی دیکەی ئاوامان نیە، بۆیە هەقە ڕەتی بکەینەوە، وێڕای مانای ڕواڵەتی ڕوونی ئایەتەکەش.

**سەرنجی پێنجەم:** خوا ﷻ ئەو مرۆڤە بە دوو تاوانی هەرە گەورە تاوانبار (**تجریم**) دەکات و، دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾، ئایا بۆچی ئەو مرۆڤە ئاوا سزا دەدرێ؟ چونکە: ئەو بڕوای بە خوای مەزن نەبوو، هانیشی نەدەدا لەسەر خواردنی نەدار، واتە: هانی خەڵکی نەدەدا کە خواردن بدرێ بە بابای نەدار، ئەمانە دوو تاوانە هەرە گەورەکەن، کە خوای دادگەر ﷻ ئەوانی پێ تاوانبار دەکات و، ئەم تەعبیرە لە سووڕەتی (**المدثر**)یش لە ئایەتی (٤٣ و ٤٤)دا هاتوە، کە هاوەڵانی ڕاستە لە تاوانباران دەپرسن: ﴿فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾﴾المدثر، هاوەڵانی دەستە ڕاست لە تاوانباران دەپرسن: چ شتێك ئێوەی خستۆتە نێو سەقەڕ؟ (یەكێكە لە ناوەكانی دۆزەخ)، دەڵێن: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین و، خواردنیشمان نەدەدا بە نەدار، لە نوێژکەران نەبووین، واتە: خواپەرست و بڕوادار بە خوا نەبووین و، فەرمانبەری خوا نەبووین، لەگەڵ خەڵکیشدا چاکەکار نەبووین، کە گرنگترین شت بۆ خەڵك کە پێویستیی پێبێ خواردنە، بۆیەش لە هەندێك لە کتێبەکانمدا گوتوومە: ئیسلامەتیی و مسوڵمانەتیی لە دوو شتدا خوڵاصە دەبێتەوە:

**یەکەم:** خواپەرستیی.

**دووەم:** خەڵك دۆستیی.

ئەوەشـم لـە ئایـەتی ژمـارە (٧٧)ی سـوورەتی (الحـج) وەرگرتـوە، کـە خـوا لـە کۆتاییەکەیـدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾، پەروەردگارتـان بپەرسـتن و چاکـە بکـەن، بەڵکـو سـەرفراز بـن، واتـە: پەروەردگارتـان بپەرسـتن و چاکەکاریـی بکـەن لەگـەڵ خەڵـکی خـوادا.

**سـەرنجی شەشـەم:** خـوا ﷻ بـاسی (**غِسلين**) دەکات، کـە پێشـتریش هێنامـان، بـەڵام بەباشـم زانی زیاتـرو باشتر تیشکی بخەمـە سـەر، ئیبنـو زەیـد کـە تەبەڕیـی لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا لێیـەوە هێنـاوە، لـە بـارەی (**غسلين**)ەوە گوتوویـەتی: (**لَـوْ أَنَّ دَلْـوًا مِـن غِسْـلِينٍ يُهَـراقُ فِي الدُّنْيـا لَأَنْـتَنَ أَهْـلُ الدُّنْيـا**) (**جامـع البيـان: ٣٤٩٢١**)[1]، واتـە: ئەگـەر دۆڵچەیـەك لـە غیسـلین لـە دنیـادا بڕێـژرێ، هەمـوو خەڵـکی دنیـا بۆگـەن دەکات، ئنجا ئایـا (**غِسلين**) چییـە؟ ڕای ڕاسـتتر ئەوەیـە: (**مَـا يَسِـيلُ مِـنْ صَدِيـدِ أَهْـلِ النَّـارِ، ومَـا يَجْـرِي مِـنَ الْجِـرَاحِ إِذَا غُسِـلَتْ**)، کەواتـە: (**إبـن زيـد**) (**غِسْـلِين**)ی بـە دوو واتایـان لێکداوەتـەوە کـە پێـم وایـە لـە هەمـوو واتایـەکان ڕاسـتترن.

١- ئەوەی دێتە دەر لە کێم و زووخاوی دۆزەخییان.

٢- ئەو چڵکاوەیە کاتێك برینێك دادەشۆرێ و ئاوەکەی لێی دەچۆڕێتەوە، بەوە دەگوترێ: (غِسلِين)، واتە: ئاوی داشۆراوی برین، کە بە دڵنیایی خوێن و کێم و زووخاوی پێوەیە.

**سـەرنجی حەوتـەم و کۆتایـی:** بـا تەماشـایەکی دیکـە ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە بکەیـن: ئێمـە لـە مەسـەلەی یەکەمـدا بـاسی ئـەو کەسـەمان کـرد کـە نامـەو نووسراوەکـەی دەدرێتـەوە دەسـتی ڕاسـتی ﴿ فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴾، دواییـش

---

(١) أخرجـه الحاكـم: ٣٨٥٠، وصححـه، ووافقـه الذهبـي، بـەڵام هـەردوو دەرهێنـەر (مخـرِّج)ی دەقـەکانی تەفسـیری (روح المعـاني) لـە (ج٢٠، ص٧٦)، گوتوویانـە: سـەنەدەکەی بێهێـزە.

ئـەو کەسـەی نامـەی یـان لیسـتی کـردەوەکانی دەدرێتـەوە دەسـتی چەپـی ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ ﴾.

ئنجـا لێـرەدا یەکێـك بـۆی هەیـە بڵـێ: کەواتـە: خەڵـك دەبنـە دوو بـەش، یـان بـە دەسـتی ڕاسـتیان نامـە وەردەگرنـەوە، یـان بـە دەسـتی چەپیـان، کەواتـە: کۆمەڵێـکی دیکـەی سـێیەم نیـەو، ئەمـە لـە سـوورەتی (الشوری)شـدا هاتـوە: ﴿ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ ﴾الشـوری، کۆمەڵێـك لـە بەهەشـتن و کۆمەڵێـك لـە دۆزەخدان، کـە ئـەوە هەندێـك لـە زانایـانی هاوچەرخیـش لـە کـوردو جگە لـە کـورد، بیرۆکەیەکی وایـان هەیـەو، کاتی خـۆی خەوارجیـش بیرۆکەیـەکی وایـان هەبـووە، کەواتـە: ئایـا بیرۆکـەی سـێ کۆمـەڵ بـوون لـە ڕۆژی دواییـدا چییـە؟! لـە وەڵام دا دەڵێیـن:

ئـەدی ئـەو هەمـوو فەرمایشـتانەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە بـاسی ئـەوە دەکـەن، کەسـانێك لــە ئوممــەتی پێغەمبــەری کۆتایــی ﷺ ئەهــلی ئیمانــن، بــەڵام چونکــە تاوانبــارن و گوناهبــارن، دەخرێنــە دۆزەخــەوەو دەســووتێنرێن و ســزا دەدرێــن، دوایــی کــە پــاك بوونــەوە دەچنــە بەهەشــت، ئایــا بــاسی وان لــە کوێیــە؟

بەڵکـو ئایـا خەڵکـی ئەعـراف لـە کوێـن؟ ﴿ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ ...﴿٤٦﴾ ﴾الأعـراف، خـوا دەفەرمـوێ: دیوارێـك لـە نێـوان خەڵـکی بەهەشـت و دۆزەخ دا هەیـە، لەسـەر قەراغـەکانی پیاوانێـك هـەن، بـە هـەردووك لایـان دا دەڕوانـن و جـاری بـە هیـچ لایـان دا نەکەوتـوون!

وەڵامەکـەش ئەوەیـە: خـوا ﷻ لێـرەدا بـاسی سـەرەنجامی کۆتایـی دەکات، کـە بـەو شـێوەیە دەبـێ، یـان دەسـتە ڕاسـت یـان دەسـتە چـەپ، بـەڵام بەرلـەوەی بگەنـە ئـەو ئەنجامـە کۆتاییـە، حاڵـەتی دیکـە هـەن، بـۆ وێنـە: ئەهـلی ئەعـراف نـە ئـەوەن کـە بـە دەسـتی ڕاسـت نامەکەیـان وەرگرتبێتـەوەو بـۆ بەهەشـت بـڕۆن و، نـە ئەوەشـە بـە دەسـتی چـەپ و بـۆ دۆزەخ بـڕۆن، بەڵکـو لەسـەر قـەراغ و کەنـارەکانی نێوانێـکی نێـو قـەدی بەهەشـت و دۆزەخـدان، وەك خـوا فەرموویـەتی: ﴿ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ ...﴿٤٦﴾ ﴾الأعـراف.

هەروەها ئـەو هەمـوو فەرمایشـتانەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە بـاس دەکـەن، کەسانێك دەبـن سـزا دەدرێـن، دوایـی کـە پاك بوونـەوە لـە دۆزەخ قوتـار دەبـن و دەچنـە بەهەشـت، بـەڵام ئایـا ئەوانە بە دەسـتی چەپیـان نامـەو لیسـتی کرەوەکانیان وەردەگـرن، یـان بـە دەسـتی ڕاسـتیان؟ وا پێدەچـێ بـە دەسـتی چەپیـان بـێ، وای تێدەگـەم، بـە دەسـتی چەپیـان لیسـتی کردەوەکانیـان وەربگرنـەوە، چونکـە سـەرەتا بـۆ دۆزەخ دەچـن، بـەڵام دوایـی چونکـە ئیمانیـان هەیـە، دەربـاز دەبـن و دەچنـە بەهەشـت، نـەك بـە دەسـتی ڕاسـتیان وەری بگـرن، چونکـە ئەگـەر بـە دەسـتی ڕاسـتیان وەری بگـرن، دەبـێ یەکسـەر بچـن بـۆ بەهەشـت.

لێـرەش بـاسی ئەوانـە نەکـراوە کـە لەسـەر ئەعـراف‌ن، واتـە: قەراغـەکانی ئـەو دیوارو سـنوورەی دەکەوێتـە نێـوان بەهەشـت و دۆزەخـەوە، هەڵبەتـە مەرجیـش نیـە هەموو مەسـەلەیەك لـە هەمـوو ئایەتێکـدا هاتبـێ، ئەوەتـا لێـرە خـوا تەنیـا بـاسی (**أصحـاب اليمـين**) و (**أصحـاب الشـمال**) دەکات، هەروەهـا لـە زۆر جێـی دیکـەش، بـەڵام لـە جێـی دیکـەدا خـوا ﷻ بـاسی (**مقرَّبين**) و باسی (**سـابقون**)یش دەکات، وەك سـوورەتی (**الواقعة**) کـە پێشـتر تەفسـیرمان کـرد، هەروەهـا لـە سـوورەتی (**فاطـر**)دا هاتـووە: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَـٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ ﴾فاطـر، لێـرەدا خـوا ئەهـلی ئیـمان پۆلێـن دەکات بـۆ سـێ کۆمـەڵ: {**ظـالم لنفسـه، مقتصـد، سـابق بالخـيرات**}، بـەڵام کـە لـە سـوورەتی (**الشـورى**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ ﴾، ئـەوە دەرەنجامـی کۆتاییـەو ڕێگریـش نیـە لـەوەی بـەر لـەو دەرئەنجامـە کۆتاییـەو هەتـا دەگاتـە ئـەو دەرەنجامـە کۆتاییـە، کەسـانێکی دیکـە بچنـە دۆزەخ و بـە ئەنـدازەی گوناهەکانیـان سـزا بدرێـن و دوایـی دەربازبـن.

لـەو بـارەوە (**ابـن عجيبـة**) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی (**البحـر المديـد في تفسـير القـرآن المجيـد**)دا[1]، دەقێـك لـە (**إبـن أبي جمـرة**)ەوە دێنـێ، کـە یەکێـك بـووە لـە زانایـان و

(١) ج٨، ص١٢٩.

صەحیحی بوخاریی شەرح کردوە، دەڵێ: (**عادَتُهُ تَعالَى في التَّنزيلِ أَن يَذكُرَ الكامِلَ في الطَّاعَةِ وَالكامِلَ في العِصيانِ أي الكُفرِ، وَيَسكُتَ عَنِ المُخَلِّطِ فَدَلَّ عَلى أَنَّهُ يَرى مِن هَذا وَيَرى مِن هَذا**).

واتە: خوا ﷻ یاساو دەستووری وایە لە قورئاندا ئەوەی بە تەواویی فەرمانبەرو ملکەچە بۆ خوا، باسی دەکات و، ئەوەش کە بە تەواویی سەرپێچیی کردوە، باسی دەکات و زۆرجاران، لە بابای تێکەڵکەر (**مُخَلِّطِ**)، {چاکەو خراپەی تێکەڵ کردوون}، بێ دەنگ دەبێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بابای تێکەڵکەر، هەم لەوە دەبینێ و، هەم لەوەش دەبینێ.

واتە: دەگونجێ دۆزەخیش ببینێ و سزا بدرێ، لەسەر گوناهەکانی و، دوایی بەهەشتیش ببینێ و، پاداشت بدرێتەوە لەسەر ئیمان و چاکەکانی، کەواتە: دەبێ ئاوا بەگشتگیریی تەماشا بکەین، نەك هەر دەقێکمان لە قورئاندا بینی، یەکسەر حوکمێکی لێ هەڵبهێنجین، بێ ئەوەی تەماشای دەقەکانی دیکە بکەین.

لێرەدا ئاماژەیەك دەکەم بە قسەیەکی کاك ناصری سوبحانیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، لە هەندێك لە کتێبەکانی دا ئاماژەی بۆ ئەوە کردوە کە لە قیامەتدا خەڵك ڕێك دوو کۆمەڵە: یان بەهەشتیین یان دۆزەخیین، بەڵام ئایا ئەو هەموو فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی لێ بکەین؟ ئەو ڕایەش ڕایەك نیە کە کاك ناصر خۆی گوتبێتی، بەڵکو ئەوە ڕای خەواریجەو کاتی خۆی ڕایان وابووە، هەموو ئەوانەش کە کەمتر پشت بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبەستن، تووشی ئەوە دێن، لە حاڵیکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ شتی ڕوونکردۆتەوە، کە خوا ﷻ لە قورئاندا بە گشتیی فەرموویەتی، هەرچەندە ئەوەی گوتم لە قورئانیشدا ئاماژەی پێکراوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**فاطر**) دا کە پێشتریش هێنامان خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ ...﴿٣٢﴾ ﴾، وەك

دەبینین پۆلێنیان دەكات بۆ سێ بەش، ئنجا ئەوانە چۆن دەبێ هەموویان لێكڕاو وێكڕا بچنە بەهەشت؟ بێگومان ﴿ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾، دەبێ لەسەر ستەم و خراپەكانیان سزا بدرن، هەروەها ﴿مُّقْتَصِدٌ﴾، بە جۆرێك دەچنە بەهەشت و ﴿سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ﴾یش بەجۆرێكی دیكە دەچنە بەهەشت، كەواتە: بۆ وەرگرتنی حوكمێك لە ئایەتێكدا، ئەگەر چاوی خۆمان بەس لەسەر ئەو ئایەتە كورتهەڵێنین، تووشی هەڵە دەبین، دەبێ تەماشای كۆی ئەو ئایەتانە بكەین، كە لەو بارەوە هاتوون، هەروەها تەماشای فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خواش ﷺ بكەین مادام بە سەنەدێكی ڕاست بە ئێمە گەیبن و، دەبێ دوای سەرەنجدانی هەموویان، ئەوجار هەڵوێست لە بارەی ئەو مەسەلەیەوە بنوێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان پانزە (١٥) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (الحاقة) دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٣٨ - ٥٢)، ئەو (١٥) ئایەتەش هەموویان باسی قورئانن و باسی بەرپەرچدانەوەی تۆمەت و قسە و قاڵی کافرانن، لەو بارەوە، کە بە شیعرو قسەی کاهین و قسەی هەڵبەستراو، قورئانیان تۆمەتبار دەکرد، خوای کاربەجێ ڕایدەگەیەنێ کە سوێند بە بینراو و نەبینراو، قورئان قسەی نێردراوێکی بەڕێزە، کە مەبەست پێی جیبریلە (عَلَيْهِ السَّلام)و، دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانییانەو، ئەگەر گریمان موحەممەدیش ﷺ قسەیەکی بە ناوی خواوە هەڵبەستبایە، ڕەگی ملی دەپچڕێنراو، هیچ کەسیش بەرگریی بۆ لێ نەدەکرا.

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖۚ قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوۡلِ كَاهِنٖۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذۡكِرَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعۡلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسۡرَةٌ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٥٢﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

(نەخێر وانیە وەك ئێوە دەڵێن، ئەی بێبڕوایەکان!) سوێند دەخۆم بەوەی دەیبینن، (٣٨) هەروەها سوێند دەخۆم بەوەش کە نایبینن (٣٩) ئەو قورئانە گوتراوی نێردراوێکی پەسندو بەڕێزە (کە جیبریلە) (٤٠) هەروەها ئەو قورئانە قسەی شاعیرێك نیە، بە کەمیی بڕوا دێنن (٤١) هەروەها قسەی کاهینێك نیە، بە کەمیی بیر دەکەنەوە (٤٢) لە لایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە دابەزێنراوە (٤٣) ئەگەر (موحەممەد) هەندێ قسەشی بەناوی ئێمەوە گوتبان (کە نەمان فەرموون) (٤٤) بە دڵنیایی دەستی ڕاستیمان دەگرت (٤٥) دوایی شادەماری خوێنبەریمان دەبڕی (٤٦) ئنجا هیچ کامیشتان نەدەبووە بەرگرییکاری و لەمپەر لەبەر دەممان دا (٤٧) بە دڵنیاییش ئەو قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ پارێزکاران (٤٨) بێگومانیش ئێمە دەزانین کە بە درۆ دانەرانێك (بۆ قورئان) لە ئێوەدا هەن، (ئەی بێبڕوایان!) (٤٩) مسۆگەریش ئەو قورئانە مایەی خەفەت و پەشێمانییە لە ڕۆژی دوایی دا بۆ بێبڕوایان (٥٠) بە دڵنیاییش ئەو قورئانە ڕاستییەکی جێی دڵنیاییە (٥١) ئنجا ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاك بگرە (٥٢)}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(كَاهِنٍ): (**الكاهِنُ: الَّذِي يُخبِرُ بِالأَخبارِ الماضِيَة الخَفِيَّة بِضَربٍ مِنَ الظَّنّ، وَالعَرَّافُ: الَّذِي يُخبِرُ بِالأَخبارِ المُستَقبَلَة**)، (**كَاهِن**): ئەو کەسەیە بە جۆرێك لە گومان هەواڵ دەدات بە هەواڵە ڕابردووەکان، ئەوانەی تێپەڕیون، بەڵام (**عرّاف**): ئەوەیە کە هەواڵ دەدات بە هەواڵە داهاتووەکان، هەڵبەتە هەردووکیان بە گومان، بۆیەش هەردووکیان زەمکراون لە قورئانداو، لە سوننەتی پێغەمبەریشدا

ﷺ، چونکە نادیارو پەنهان تەنیا خوا دەیزانێ، ﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ...﴿٦٥﴾﴾ النمل، بڵێ پەنهانی ئاسمانەکان و زەوی تەنیا خوا دەیزانێ.

(تَقَوَّلَ): (تَقَوَّلَ عَلَيهِ قَولاً، أَي: اَخْتَلَقَهُ كَذِباً)، (تَقَوَّلَ عَلَيهِ)، قسەی بە دەمیەوە کرد، قسەی بە ناویەوە کرد، درۆی بە ناویەوە هەڵبەست، (الأَقاوِيل: جَمعُ أَقْوَال، وَالأَقْوَالُ جَمعُ قَول)، (أَقاوِيل) کۆی (أَقوال)ە و ئەویش کۆی (قَول)ە، کەواتە: (أَقاوِيل) کۆی کۆ (جَمعُ الجَمع)ە، واتە: ئەگەر موحەممەد ﷺ چەند قسەیەکی بەناوی ئێمەوە کردبانایە، وەك ئێوە دەڵێن «ڕەگی ملیمان دەبڕی».

(ٱلْوَتِينَ): (الشِّرْيَانُ الرئيسُ الَّذِي يَغُذُّ جِسمَ الإنسانِ بِدَمٍ نَقِيٍّ خَارِجٍ مِنَ القَلبِ)[1]، (وَتِيْن): بریتیە لەو شادەمارە سەرەکییەی کە جەستەی مرۆڤ بە خوێنی پاك بژیودار دەکات، ئەو شادەمارەش لە دڵەوە دەردەچێ، بە کوردیی پێی دەگوترێ: خوێنبەر، شاخوێنبەر، بەڵام ئەوەی لە جەستەوە خوێنی پیس دێنێتەوە بۆ نێو دڵ، بۆ ئەوەی پاك بکرێتەوە، پێی دەگوترێ: خوێنهێنەر (وَرِيْد).

(حَٰجِزِينَ): (حَجَزَ: أَي فَصَلَ، حَجَزَ فُلاناً: كَفَّهُ وَمَنَعَهُ مِن غَيرِهِ)، (حَجَزَ) جیای کردەوە، (حَجَزَ فُلَاناً) ڕێی لە فلانکەس گرت و نەیهێشت لە بەرانبەر کەسێکی دیکەدا (حَجَزَهُ عَن فُلانٍ)، لە فلانکەسی گرتەوەو دووری خستەوە.

(لَحَسْرَةٌ): (الحَسرَةُ: شِدَّةُ التَّلَهُّفِ وَالحُزنِ لشيءٍ)، (حسرة) زۆر خەفەتبار بوون و دڵتەنگ بوون و بە پەرۆشەوە بوون بۆ شتێك.

(لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ): زانیارییەکی چەسپاو، چەسپاوێکی جێی دڵنیایی، (الحَقّ: حَقَّ يَحِقُّ حَقّاً وَحَقَّهُ، أَي: صَحَّ وَثَبَتَ وَصَدَقَ)، واتە: ئەو شتە ڕاست بوو، چەسپا، ڕێك دەرچوو، چەسپاندی.

---

(١) المعجم الوسيط: ص١١٠.

(يَقِـنَ الـشَّيءُ وَيَقَـنَ وييقَـنُ يَقْنَاً وَيَقِينَاً، أي: ثَبَـتَ وَتَحَقَّـق وَوَضَـحَ، فَهُـوَ يَقَـنٌ وَيَقِين)، واتـە: شـتەکە چەسـپاو سـاغبۆوەو ڕوونبـۆوە، ئـەو چەسـپاوەو جێـی دڵنیاییـە، (يَقَـنَ الـشَّيءَ وَيَقَـنَ بِـهِ: عَلِمَـهُ وَتَحَقَّقَـهُ)، واتـە: شـتەکەی زانی و سـاغی کـردەوە.

(اليقـين: العلـم الـذي لا شـك فيـهِ)، (يقـين) ئـەو زانیارییـە دوو دڵیـی تێـدا نیـە، (اليَقِـين في الفلسـفة: إطمئنـان النفـس إلى حكـمٍ مـع الإعتقـاد بِصِحَّتـه)، (يقـين) لـە فەلسـەفەدا: دڵئـارام بوونـە بـە حوکمێـك لەگـەڵ بڕوابـوون بـە ڕاسـتیی ویـدا[1].

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای بـەرزی مـەزن ئـەم پـازدە (١٥) ئایەتـەی هەموویـان تەرخـان کـردوون بـە بـاسی قوڕئـان و، ئاماژەیەکیـش بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەدەوە ﷺ، چونکـە ئێمـە هـەر لـە سـەرەتای پێناسـەی ئـەم سـوورەتەوە، گوتمـان: ئـەم سـوورەتە بـۆ دوو تـەوەری سـەرەکیی دابـەش کـراوەو، قسـە لـە دوو بابـەتی سـەرەکیی دەکات:

**یەکەم:** ڕۆژی دوایی.

**دووەم:** باسی قوڕئان و ئاماژەیەکیش بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، هەر بە بۆنەی باسکردنی قوڕئانەوە.

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾﴾، وانیــە (وەك ئێــوە دەڵێــن ئـەی بێبڕواینـە!) سـوێند دەخـۆم بـەوەی دەیبینـن و بـەوەش کـە نایبینـن.

وەك زۆر جـاری دیکـەش گوتوومانــە، بـە تایبــەت لـە سـەرەتای سـوورەتی (**الواقعـة**)وە کـە هەندێـك لـە زانایـان لـە بـارەی ئـەو (لا)یـەوە کـە لـە سـەرەتای هەندێـك لــە ســوێندەکاندا هاتــوە، وەك:

---

(١) المعجم الوسيط، ص: ١٠٦٦.

١- ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ٣٨ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ٣٩ ﴾.

٢- هەروەها: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ١٦ ﴾الانشقاق.

٣- هەروەها: ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ١ ﴾البلد.

٤- هەروەها: ﴿ لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ ﴾القيامة.

٥- هەروەها: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ ﴾الواقعة، گوتوویانە: (لا) بۆ لابردنی سوێندەکەیە، واتە: پێویست ناکات سوێند پێ بخۆم!.

لە ڕاستییدا خراپ بە هەڵەدا چوون، چونکە خوا لە سەرەتای سوورەتی (**الواقعة**)دا دەفەرمووێ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ٧٦ ﴾الواقعة، بێگومانیش ناگونجێ خوا بفەرمووێ: سوێند ناخۆم و ئەگەر بشزانن ئەوە سوێندێکی مەزنە، بەڵکو مانایەکەی ئاوایە: ڕاست نیە، وەك ئێوە دەڵێن، سوێند دەخۆم بەڕێ و شوێنی ئەستێرەکان و ئەگەر بزانن، ئەوە سوێندێکی مەزنە، یانی: ئەگەر زانیاریی گەردووناسییتان ببێ و، بزانن خوا ئەو گەردوونەی چۆن خوڵقاندووەو، ئەستێرەکان و کەهکەشانەکان چۆنن؟ کەواتە: (لا) لابەرە (نافیة)ی سوێندەکە نیە، بەڵکو شتێکی دیکە بەرپەرچ دەداتەوە کە بە سەلیقەو سیاق دەزانرێ، لێرەش ئەوەی بە سەلیقەو سیاق دەزانرێ ئەوەیە کە بێبڕوایەکان دەیانگوت: قورئان شیعرە، کەهانەیە، موحەممەد هەڵیبەستوە، خواش دەفەرمووێ: ﴿ فَلَآ ﴾، ئەوەی دەیلێن، یان گومانی دەبەن، ڕاست نیە، ﴿ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴾، سوێند دەخۆم بەوەی دەیبینن، هەرچی کە بەرهەستەو دەیبینن، ﴿ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴾، هەروەها سوێندیش دەخۆم بەوەی نایبینن، کە ئەوەی نایبینن، زۆر زۆر زیاترە لەوەی دەیبینین.

﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴾، بە دڵنیایی ئەمە قسەی نێردراوێکی بەڕێزە، کە مەبەست پێی جیبریلە عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام وەك لە سوورەتی (التكوير)دا خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى

ڕوونتر باسی ئەوە دەكات و دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿١٩﴾ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ﴿٢٢﴾ ﴾التكوير، كەواتە: ئەوەی پێشێ ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿١٩﴾ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ﴾، هەمووی باسی جیبریلە، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ﴾، هاوەڵەكەشتان (موحەممەد) شێت نیە، لێرەش دەفەرموێ: ئەمە قسەی نێردراوێكی بەڕێزە، واتە: خوا بە نێردراوێكی بەڕێزدا ناردوویەتی كە جیبریلەو، ئەویش بە قسە بە موحەممەدی ﷺ ڕاگەیاندوە، ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖۚ قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ ﴾، هەروەها ئەمە قسەی شاعیرێك نیە بە كەمیی بڕوا دێنن.

﴿ وَلَا بِقَوۡلِ كَاهِنٖۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، هەروەها قسەی بابایەكی كاهین و فاڵچییش نیە، كەم وایە بیر بكەنەوە، كەم وایە ڕامێنن و پەند وەربگرن، ئەگەرنا هەر تۆزێك تەماشای قورئان بكەن، دەزانن ناگونجێ ئەمە لە مەخلووقەوە دەرچووبێ و، بێجگە لە خالیق ناگونجێ قسەی هیچ كەسێكی دیكە بێ، نە موحەممەد ﷺ و، نە جندو شەیتان و، نە فاڵچیی و كاهین و، نە تەنانەت فریشتەو، بگرە جیبریلیش، قسەی هەر كامیان نیە، بەڵكو ئەوە فەرمایشتی خوایە، وەك لە سوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ...﴿٦﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەو كەسەی ئەو قورئانەی دابەزاندوە نهێنیی هەموو ئاسمانەكان و زەوی دەزانێ، ﴿ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، دابەزێندراوە لە لایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە.

﴿ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴾، ئەگەر گریمان موحەممەدیش ﷺ هەندێ قسەی بە دەمی ئێمەوەو، بە ناوی ئێمەوە كردبانایەو هەڵبەستبانایە، (تَقَوُّلْ): (هُوَ أَن تُقَوِّلَ شَخْصاً أَو ذَاتاً مَا لَمْ يَقُل)، (تَقَوُّل) ئەوەیە تۆ بە ناوی كەسێك یان بابایەكەوە قسەیەك بكەی، نەیگوتبێ، كەواتە: ئەگەر موحەممەد لە خۆیەوە ئەو قسانەی كردبانایە، ئنجا گوتبای: هی خوان، مانای وایە قسە بە ناوەوەكردن ﴿ تَقَوَّلَ ﴾ بوو، ئەو كاتەش: ﴿ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ﴾، دەستی ڕاستیمان

دەگرت، چونکە ئینسان بە دەستی ڕاست بەرگریی لە خۆی دەکات، دەستی ڕاستیمان دەگرت، بۆ ئەوەی بەرگریی بۆ لە خۆی نەکرێ.

﴿ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴾، دوایی شادەماری گەردنیمان، خوێنبەریمان دەبڕی، مرۆڤ هەر کات ئەو شادەمارەی بڕا، یەکسەر دەمرێ، ﴿ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَـٰجِزِينَ ﴾، ئنجا هیچ کامێکیش لەئێوە نەدەبوونە ڕێگرو پەردەو پەرچ، وەك بەرگرییکار لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەم قورئانەش بیرخەرەوەیە بۆ پارێزكاران، بێگومان بیرخەرەوەیە بۆ هەموو كەس، وەك لە شوێنی دیكەدا دەفەرموێ: ﴿ ذِكْرٌ لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ص، بەڵام تەنیا پارێزكاران لێی بەهرەمەند دەبن.

﴿ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەشزانین ئێوە بە درۆ دانەرانێكتان تێدا هەن، كەواتە: كافرەكان هەموویان بە درۆ دانەری قورئان نەبوون، هەندێكیان زانیویانە كە قورئان فەرمایشتی خوایە، وەك ئەبوو جەهل و زۆرێك لە زلە زلەكانی قوڕەیش، زۆرێك لە زلە زلەكانی هەموو ڕۆژگارەكانیش دەزانن، كە قورئان ناگونجێ قسەی مرۆڤ بێ، بەڵام بۆ چەواشەكردنی خەڵك دەڵێن: شیعرە، جادوویە، كەهانەیە، بۆ ئەوەی كڵاو لەسەری خەڵك و جەماوەرە هەڵخەڵەتاوەكەیان بنێن، ناكرێ بڵێن: ئێمەش دەزانین قورئان قسەی خوایە، بەڵام بە قسەشی ناكەین!.

﴿ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (قورئان)ە، مایەی پەشێمانیی و داخ و خەفەتە بۆ بێبڕوایان، واتە: لە ڕۆژی دوایی دا، ﴿ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴾، بە دڵنیایی ئەمە هەقێكی زۆر جێی دڵنیاییە.

﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴾، كەواتە: (ئەی موحەممەد!) ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاك بگرە، یانی: گوێ مەدە بە قسەو قاڵی ئەوان و، لەسەر كاری خۆت و جێبەجێكردنی ئەركی خۆت بەردەوام بە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە هەرچی بینراوو نەبینراوە، كە قورئان بێژراوی نێردراوێكی بەڕێزو پەسندە، كە جیبریلە، نە قسەی شاعیرو نە قسەی كاهین و، دابەزێنراوی پەروەردگاری جیهانییانە:**

وەك خوا ﷻ دەفەرمویَ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَاعِرٖۚ قَلِيلٗا مَّا تُؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوۡلِ كَاهِنٖۚ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾،

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴾، وانیە (وەك ئێوە دەڵێن) سوێند دەخۆم بەوەی دەیبینن و، بەوەش كە نایبینن، هەندێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان گوتوویانە: (لا) بۆ لابرد (**نفي**)ی سوێندەكەیە، واتە: سوێند ناخۆم بەوەی دەیبینن و بەوەش كە نایبینن، ئنجا ئەگەر لێرە وابێ، لە شوێنەكانی دیكەش هەموویان وایە، بەڵام ئەوەی زۆر بە ڕوونیی ئەو بۆچوونە هەڵدەوەشێنێتەوە، ئایەتەكانی سوورەتی (**الواقعة**)ن، كە خوا دەفەرمویَ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾**الواقعة**، لێرەدا زۆر بە ئاشكرا دیارە كە سوێندەكە خوراوە، چونكە خوا دەفەرمویَ: ﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾، نەخێر، سوێند دەخۆم بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەكان و، ئەگەر بشزانن ئەمە سوێندێكی

مەزنە، واتە: ئەگەر زانیارییتان هەبێ بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەکان و، کەهکەشانەکان کە ئەستێرەکان پێکیان دێنن، دەزانن کە ئەو سوێندە زۆر مەزنە.

کەواتە: ئاشکرایە کە لێرەدا سوێندەکە خوراوەو تەواو بووەو، لەڕاستییدا هەموو ئەو (لا)یانەی لە پێش سوێندەکانەوە هاتوون، کە لە گەڵێك شوێنی قورئاندا وا هاتوون، هەموویان بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەی بێبڕوایانن، کە بە سەلیقەو سیاق دەزانرێ ئەو قسەیە چییە، لێرەدا بە پێی سیاق و بە سەلیقە دەزانین کە بێبڕوایەکان هەمیشە قورئانیان بەوە تۆمەتبار دەکرد دەیانگوت: شیعرە، دەیانگوت: قسەی کاهینە، دەیانگوت: جادوویە، دەیانگوت: موحەممەد هەڵیبەستوە، جاری وا هەبوو دەیانگوت: موحەممەد شێتەو قورئان قسەی شێتانە، خوای پەروەردگاریش لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ ﴾، ئەم (ف)ە دەبێتە (ف)ی دەرخەر (**فصيحة**)، (**تُفْصِحُ عَمَّا قَبْلَهَا**)، هی پێش خۆی دەردەخات، واتە: کە ئەوەی لە ڕابردوودا باسکرا زانیتان، لە بارەی هاتنی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت و، هەر کەسە بەپێی خۆی مامەڵە لەگەڵدا کرانیەوە، کەواتە: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴾، (لا) وانیە، (وەك ئێوە دەڵێن)، سوێند دەخۆم بەوەی کە دەیبینن، یان دەگونجێ (ف)ەکە بۆ لق لێکردنەوە (**تفريع**) بێ، واتە: بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد، من قسەی ئێوە بەرپەرچ دەدەمەوەو، ڕاست نیە وەك ئێوە دەڵێن، کە قوڕان شیعر بێ و، کەهانە بێ و جادوو بێ، ﴿ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴾، سوێند دەخۆم بەوەی دەیبینن، ﴿ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴾، هەروەها سوێند دەخۆم بەوەی ناشیبینن.

(**القرطبي**) دەڵێ: (**هذا رَدٌّ عَلَى كَلامٍ سَابق، أَي: لَيْسَ الأَمْرُ كَمَا يَقُولُهُ المُشْرِكُون**)، واتە: ئەمە بەرپەرچدانەوەی قسەیەکی پێشوویە، یانی: وەك هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەڵێن وانیە.

ئنجا بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوە کە وانیەو، بۆ جەختکردن لەسەر ئەو لابردن (**نفي**)ە، خوا دەفەرموێ: ﴿ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴾، سوێند دەخۆم بەوەی دەیبینن و بەوەش کە نایبینن.

## کورتە سەرنجێک لەسەر بینراو و نەبینراو

بەڕێزان! ئێمە ئەگەر بمانەوێ باسی ئەو شتانە بکەین کە دەبیندرێن و، ئەو شتانەش کە نابیندرێن، کە لەڕاستییدا هەموو گەردوون دابەش دەبێتەوە بۆ ئەو دوو جۆرە دروستکراوەو، یان دەبینرێن و بەرهەستن، بە چاوو بە هەستەکانی دیکە، هەستیان پێ دەکرێ، یان نەبینراوو نابەرهەستن، شتەکان مادام ماددیی و بەرهەست بن، بە یەکێك لە پێنج هەستەکان (دیتن، بیستن، بۆنکردن، تامکردن، دەستلێکوتان)، دەتوانین پەییان پێ ببەین، بەڵام ئایا دروستکراوەکان تەنیا ئەوانەن کە دەکەونە بەر حوکم و ڕکێفی چراو تۆڕو شەداوی پێنج هەستەکان؟ بێگومان نەخێر، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَا تُبْصِرُونَ﴾، هەروەها سوێند دەخۆم بەوەش کە نایبینن، بە دڵنیایی ئەوانەی نەبیندراون، زۆر زۆر زیاترن لەوانەی دەبینرێن، بۆ وێنە: ئەم گەردوونە، ئێستا نوێترین بیردۆزەی گەردوونیی فیزیایی دەڵێ: گەردوون تیرەکەی سێزدە (١٣) ملیارو، هەشتسەد ملیۆن (١٣،٨٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵی تیشکییە.

هەڵبەتە لەو شوێنەوە کە ئێمە لێینی، ئەگەر دابنێیین کە ئێرە چەقی گەردوونە، بەملادا بیپێوەو بەولادا بیپێوە، دەڵێن: سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن ساڵی تیشکییە، واتە: ئەندازەیەك کە تیشك بە سێزدە (١٣) ملیارو، هەشتسەد ملیۆن ساڵ بیبڕێ، تیشکیش لە چرکەیەکدا (٣٠٠،٠٠٠) کم دەبڕێ، ئنجا ئەوە جارانی (٦٠)ی بکە بۆ ئەوەی خولەکت بۆ دەربچێ، دوایی جارانی (٦٠)ی بکە بۆ ئەوەی سەعاتت بۆ دەربچێ، دوایی جارانی (٢٤)ی بکە بۆ ئەوەی شەوو ڕۆژت بۆ دەربچێ، دوایی جارانی (٣٦٥)ی بکە، بۆ ئەوەی کیلۆمەترەکانی ساڵت بۆ دەربچن، کە دەکاتە: (٣٠٠،٠٠٠ × ٦٠ × ٦٠ × ٢٤ × ٣٦٥ = ٩،٤٦٠،٨٠٠،٠٠٠،٠٠٠) نۆ تریلیۆن و چوارسەدو شەست ملیار و هەشتسەد

ملیـۆن کـم، دەبـێ سـێزدە (١٣) ملیـارو هەشتسـەد ملیـۆن سـاڵی ئـاوا تیشـك بـڕوا، ئنجـا ئەمسـەرو ئەوسـەری گـەردوون دەکات، کـە تاکـو ئێسـتا کەوتۆتـە بـەر حوکمـی تەلیسـکۆبەکانی کـە مـرۆڤ دروسـتیکردوون، کـە وەك پێشـتریش باسـمان کـردوە لـە چەنـد شـوێنێك دا، وا پێدەچـێ ئـەوەش هەمـووی لـە سـنووری ئاسـمانی یەکەمـدا بـێ، بـە بەڵگـەی ئـەوەی خـوا لـە چەنـد شـوێنێکدا وەك سـووڕەتی (**الملك**) و سـووڕەتی (**فصلت**) دەفەرمـوێ: ﴿...وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ ... ﴿١٢﴾﴾**فصلت**، دنیـا مێینـە (**مؤنـث**)ی (**أدنى**)یـە واتـە: ئاسـمانی نزیکترمـان بـە چرایـان ڕازاندۆتـەوە، کـە (**مَصَابيـح**) یـش کـۆی (**مِصبـاح**)ە و یـانی: چـرا، مەبەسـت پێـی ئەسـتێرەکانە، کەواتـە: هەرچـی ئەسـتێرەیەو کەهکەشـانەو جگـە لـە کەهکەشـان دەبینـدرێ، هەمـووی لـە سـنووری ئاسـمانی یەکـەم دایـە، ئنجـا ئەویـش نازانیـن سـنوورەکەی لـە کـوێ کۆتایـی دێ، ئنجا لـە سـەرووی ئـەو ئاسـمانەوەش کـە ئاسـمانی یەکەمـەو، ئەسـتێرەی تێـدان و کەهکەشـانەکانی تێـدان، لەسـەرووی ئـەوەوە شـەش ئاسـمانی دیکـەش هـەن، کەواتـە: ئایـا ئێمـە لـە هەمـوو بوونـەوەر (**گـۆن**) چەنـد دەبینیـن؟ بێگومـان زۆرکـەم، هەروەهـا گـوێ لـە بیسـت لەرینـەوە (**ذبذبـة**) دەبیسـتێ، هەتـا بیسـت هـەزار (٢٠،٠٠٠) لەرینـەوە، ئەگـەر لـە بیسـت کەمـتر بـێ، نایبسـتێ و، لـە بیسـت هەزاریـش زیاتـر بێـت، هـەر بـۆی ئیسـتیعاب ناکـرێ و نایبیسـتێ، هەروەهـا ئایـا هەمـوو بۆنـەکان دەتوانیـن بـۆن بکەیـن؟ یـان هەمـوو تامـەکان دەتوانیـن تـام بکەیـن؟ یـان هەمـوو دەسـت لێکوتـراوەکان (ملموسـات) دەتوانیـن دەسـت لـێ بکوتیـن؟ بـە دڵنیایـی نەخێـر، کەواتـە: ئـەوەی نایبینیـن، زۆر زۆر زیاتـرە لـەوەی دەیبینیـن.

لەڕاسـتییدا ئـەوەی لـە بـوون (وجـود) دەیبینیـن، گۆشـەیەکی بچووکـە لـەوەی خـوا ﷻ خوڵقاندوویـەتی، ئنجـا ئـەوەش هـەر لـە گـەردوون و شـتە بەرهەسـتەکان، بـەڵام ئەگـەر بێینـە سـەر ئـەوەی نایبینیـن، کـە فریشـتەکان و جنـدو ڕووحـەکان و هەمـوو ئـەو شـتانەی دیکـەن کـە نابینرێـن، کـە پەیوەندییـان بـە جیهـانی ماددەوە

هەیە، وەك هێزی موگناتیسیی و هێزی كێشندە، كە هەموو گەردوون بە هێزی كێشندەوە ڕاگیراوەو، خوای پەروەردگار لە دوو سوورەت لە قورئاندا بە كۆڵەكە نەبینراوەكان (**عَمَد غیر مرئیة**) ناوی هێناوە، كە لە سوورەتی (**الرعد**) دا دەفەرمووێ: ﴿ اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ... ﴿٢﴾ ﴾**الرعد**، ئەو خوایەی ئاسمانەكانی بە كۆڵەكانێك كە نابینرێن، بەرز كردوونەوە، هەروەها لە سوورەتی (**لقمان**)یشدا: ﴿ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾**لقمان: ١٠**، زانایان دەڵێن: ﴿ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ﴾، - (**عَمَد**)یش كۆی (**عَمُود**)ە - یانی: (**بِعَمَدٍ غَيرِ مَرئِيَّةٍ**)، بە كۆڵەكە نەبیندراوەكان، كە واپێدەچێ مەبەست پێی هێزی كێشندە (**قوة الجاذبية**)بێ.

هەروەها ئەگەر بێینە سەر ئەصڵی ماددەش، كە خشتی یەكەمی ماددە بریتیە لە: گەردیلە (**ذرة** - Atom)، گەردیلەش بۆ خۆی لە سێ بەش پێكدێ: ئیلیكترۆن (Electron) كە لە سوورگەدا دەخولێتەوە بە دەوری نێوكدا، نێوكەكەش لە پرۆتۆن (Proton) و نیوترۆن (Neatron) پێكدێ، كە نەك هەر نیوترۆن و پرۆتۆن، نابیندرێن و، ئیلیكترۆن كە لەوانیش زۆر زۆر گچكەترە، نابیندرێ، بەڵكو گەردیلە خۆشی هەر نابینرێ، بەڵكو گەرد (مۆڵكۆڵ (**جزيئ** -- Molecule)یش كە لە ملیۆنان پێكدێ، ئەویش هەر نابینرێ، هەر نەك نابینرێ بە چاو، بەڵكو بە میكرۆسكۆب (زەڕڕەبین)یش نابیندرێ، وێڕای ئەوەی كە هەركام لە نیوترۆن و پرۆتۆنیش بۆ خۆیان لە چەند بەشێك پێكهاتوون، كە كوارككەكان (quarks)ن، ئێمە ئەو باسەمان بە درێژیی لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا) باسكردوە كە ئێمە لە تیشكەكان ئەندازەیەكی زۆر كەم دەبینین، تەنیا یەك بەش لەسەر چەند ملیار بەشی تیشك، دەتوانین ببینین، چ جای شتەكانی دیكە، بۆیەش خوا دەفەرمووێ: سوێند دەخۆم بەوەی دەیبینین، بەوەش كە نایبینین.

٢)- ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾، بە دڵنیایی ئەم (قورئان)ە بێژراوی نێردراوێکی بەڕێزە، ئایا ئەو نێردراوە بەڕێزە مەبەست پێی کێیە؟ زۆربەی زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی جیبریلە.

بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێی موحەممەدە صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەردووکیان بێ.

بێگومان ڕای یەکەم ڕاستە، چونکە ئەگەر لێرەدا ئەگەری هەیە مەبەست پێی موحەممەدیش بێ ﷺ، بەڵام لە شوێنی دیکەدا - قورئانیش هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە - بۆمان دەردەکەوێ کە مەبەست لە: ﴿رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾، جیبریلە، ئەویش ئەوەیە کە لە سوورەتی (التكوير)دا خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ١٥ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ١٦ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ١٧ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ١٨ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ١٩ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ٢٠ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ٢١﴾التكوير، دەفەرموێ: وانیە (وەك ئێوە دەیڵێن)،سوێند دەخۆم بە خۆ پەنهانکەرەکان، ئەوانەی دەڕۆن و دەچنەوە مەنزڵەکانی خۆیان، (وەك چۆن ئاژەڵێك دەچێتەوە هێلانەکەی یان کونەکەی خۆیەوە، کە مەبەست پێی ئەستێرەکانن) سوێندیش بە شەوگار کە دێت، یاخود دەڕوات، {چونکە وشەی ﴿عَسۡعَسَ﴾، دوو مانای پێکەوە دژی هەن، واتە: هەم بە مانای: هات و بە مانای ڕۆیشت، دێ}، سوێندیش بە بەرەبەیان کاتێك هەناسە دەدات، (سوێند بەوانە)، ئەم قورئانە بێژراوی نێردراوێکی بەڕێزە، زۆر خاوەن هێزە، لە لای خاوەن عەرش (کە خوایە) پێگەدارە، گوێڕایەڵیی بۆ کراوە لەوێ و ئەمیندارە، یانی: زۆر ئەمینداریشەو خوا چی پێ بفەرموێ، ئەوە دەگەیەنێ، ئاشکراشە کە مەبەست پێی جیبریلە (عَلَيْهِ السَّلام) لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ﴾، یانی: ئەوەی خوا ناردوویەتی بۆ گەیاندنی ئەو فەرمایشتە، نێرراوێکی بەڕێزە کە جیبریلەو، ئەویش گەیاندوویەتی بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ.

٣)- ﴿ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ﴾، هەروەها ئەو (قورئان)ە قسەی شاعیرێك نیە.

٤)- ﴿ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴾، بە کەمیی بڕوا دێنن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴾، ئەم (ما)یە سێ ئەگەری هەن:

أ- زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوە، یانی: (**إِيماناً قَلِيلاً تُؤْمِنُون**)، ئیمانێکی کەم ئیمان دێنن.

ب- یاخود (ما) لابەرە (**نافية**)یەو بۆ لابردنە، یانی: تەنانەت ئیمانی کەمیش ناهێنن، ﴿ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: تەنانەت ئیمانێکی کەمیش ناهێنن.

ج- یاخود لێرەدا ئیمان بە مانای بەڕاستدانانە، یانی: (**قَلِيلاً ما تُصَدِّقُون**)، ئێوە کەمێکتان قورئان بەڕاست دادەنێن، ئەویش ئەوانەن کە دوایی ئیمان دێنن، یاخود ئەوانەن کە لە نەفسی خۆیاندا دەیانزانی قورئان هەقە، بەڵام بڕوایان پێ نەدەهێنا، لەبەر خۆ بەزلگریی و، لەبەر لێ تێکنەچوونی ئەو بەزم و بازاڕەی لە نەبوونی شەریعەت و دینی خوادا، بۆ خۆیان پێکیان هێنابوو.

٥)- ﴿ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ﴾، هەروەها ئەم قورئانە قسەی کاهین (فاڵچیش) نییە، پێشتر پێناسەی کاهینمان کرد، کە کەسێکە هەواڵ دەدات بەو شتانەی لە ڕابردوودا بوون، یاخود هەندێکیان دەڵێن: لە داهاتوودا دەبن، هەندێکیش گوتوویانە: کاهین ئەوەیە کە هەواڵ دەدات چ بە شتی ڕابردوو، چ بە شتی داهاتوو، واتە: کەسێک قسە لە غەیب و نادیار دەکات.

٦)- ﴿ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، بە کەمیی پەند وەردەگرن، ﴿ تَذَكَّرُونَ ﴾، بە دوو جۆر خوێندراوەتەوە.

ا- (**تَتَذَكَّرُون**)، خوێنراوەتەوەو، ب-(**تَذْكُرُون**)یش خوێنراوەتەوە، (ما)یەکەش دیسان دەگونجێ زیادکرابێ بۆ جەختکردنەوەی کەمیی بیر کردنەوەو پەند وەرگرتنیان، یاخود بۆ لابردن، ﴿ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾، تەنانەت کەمیش بیر ناکەنەوەو پەند وەرناگرن.

٧)- ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە، ﴿ تَنزِيلٌ ﴾ خوێنراویشەتەوە: (تَنزِيلاً)، واتە: هەم بە (رفع)، هەم بە (نصب) خوێنراوەتەوە، دابەزێنراوە لە پەروەردگاری جیهانییەکانەوە، ئەگەر بە ڕەفع بێ، بەڵام ئەگەر بە نەصب بێ: (**تَنزِيلاً مِن رَبِّ العالَمِين**)، یانی: لە حاڵێکدا کە لە لایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە دابەزێنراوە.

## مەسەلەی دووەم:

**ڕاگەیاندنی خوای کارزان، کە ئەگەر گریمان موحەممەد ﷺ شتێك بە ناوی خواوە بڵێ، زۆر بە سەختیی سزای دەدات و، هیچ کەسیش ناتوانێ بەرگریی لێ بکات.**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴾، ئەگەر گریمان (موحەممەد) هەندێ قسەشی کردبانە بەناوی ئێمەوە، یەکێ لە ڕوونکەرەوانی قورئان ئاوا ئەم ڕستەیە مانا دەکات: **(وَلَو ادَّعَى مُدَّعٍ عَلَيْنَا شَيْئاً لَمْ نَقُلْهُ إفتِرائاً عَلَينَا، سَمَّى الإفتِراءَ تَقَوُّلاً، لأَنَّهُ قَولٌ مُتَكَلَّفٌ، وَالأَقوال المُفتَرَاتِ أَقاوِيلَ، تَحقِيراً لَهَا، كَأَنَّها جَمعُ: أُفعُولة مِنَ قَولِكَ أَضَاحِيك، أُضحُوكَة)**، واتە: ئەگەر بە ناوی ئێمە قسەیەکی گوتبایە کە نەمانفەرمووە، وەك قسە هەڵبەستن بە ناوی ئێمەوە، لێرەدا قسە هەڵبەستنی ناوناوە (**تَقَوُّل**) {واتە: قسە بەناوەوە کردن}، چونکە کەسێك قسەیەك بە ناوی کەسێکەوە بکات، مانای وایە قسەیەکی هەڵبەستراوی کردوە، هەروەها قسە هەڵبەستراوەکانیشی ناو ناون: (**أَقاويل**)، (کە کۆی (**أَقوال**)ە و ئەویش کۆی (**قَول**)ە)، وەك بە کەم تەماشا کردن و بە بێڕێز دانان، وەك (**أَقاويل**) کۆی (**أفعُولة**)بێ، وەك چۆن (**أَضَاحِيك**) کۆی (**أُضحُوكَة**)یە، (واتە: شتێك کە مایەی پێ پێکەنین بێ).

٢)- ﴿ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴾، [ئەگەر هەندێك قسەی بە ناوی ئێمەوە کردبانایە]، ئێمە دەستی ڕاستیمان دەگرت.

٣)- ﴿ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴾، دوایی خوێنبەریمان دەبڕی، (**الوَتِين: الشِّريَانُ الرَّئِيس**) خوێنبەری سەرەکیی کە ڕێك بە دڵەوە پەیوەستەو، لە دڵەوە خوێنی پاك دەبات بۆ

هەموو خانەکانی جەستە، لەوسەریشەوە لەڕێی وەرید (خوێنهێنەر)ەوە خوێنەکە دەگەڕێتەوە بۆ دڵ بۆ پاڵاوتن و پاککردنەوەی، هەم لە ڕێی دڵەوە، هەم لە ڕێی سییەکانەوە، پاشەڕۆکەکەی فڕێ بدرێتە دەرێ و، بپاڵێورێ، ئەو پرۆسەیەش هەمووی لە خولەکێکدا دڵ چەندان جار لێدەدات و ئەو پرۆسەیە دووبارە دەبێتەوە، ئەگەر شەست جارە، ئەگەر حەفتایە، یان زیاترە[1]، کە دەفەرموێ: ﴿ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾، دەستی ڕاستیمان دەگرت دوایی شادەماریمان دەبڕی، یەکێك لە زانایان مانای ئەو دوو ئایەتەی ئاوا تەعبیر کردوە، دەڵێ: (**لَقَتَلْنَاهُ صَبْرًا، كَمَا تَفْعَلُ الْمُلُوكُ بِمَنْ يَتَكَذَّبُ عَلَيْهِمْ، مُعَاجَلَةً بِالسَّخَطِ وَالإِنْتِقَامِ، فَصَوَّرَ قَتْلَ الصَّبْرِ بِصُورَتِهِ لِيَكُونَ أَهْوَلَ، وَهُوَ أَنْ يُؤْخَذَ بِيَدِهِ وَتُضْرَبَ رَقَبَتُهُ**)، واتە: دەمانکوشت بە شێوەیەکی خوێنساردانە، وەك چۆن حوکمڕانەکان کەسێك درۆ بەناوی ئەوانەوە بکات، ئاوا دەیکوژن و لە گەردنیان دەدەن، ئنجا ئەو کوشتنەی کە خوێن ساردانە دەکوژرێ، (واتە: بە شێنەیی دەکوژرێ)، بەو شێوەیە وێنای کردوە کە دەستی ڕاستی بگیرێ و لە گەردن بدرێ، تاکو سامناك و بێزەزاتر بێ.

٤)- ﴿ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴾، هیچ کامێکیش لەئێوە ناتوانن بەرگرییکاری بن، (**حاجِز: الحَجزُ الدَّفعُ وَالحَيلُولَة**)، (**حَجْز**) پاڵ پێوە نان و ڕێ لێگرتنە، ﴿ حَاجِزِينَ ﴾یش، کۆیە یانی: (**دَافِعِيْن**) هیچ کام لە ئێوە ناتوانن بەرگرییکاری بن، بۆیەش کۆی کردۆتەوە چونکە ئەمە وەصفە بۆ (**أحد**)، (**أحد**)یش بەڵێ بۆ تاکە، بەڵام لە مانای کۆ دایە، ﴿ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴾، هیچ کامێك لە ئێوە بەرگرییکاری نەدەبوون، یانی: ڕێگرمان نەدەبوون کە بیفەوتێنین.

---

(١) دڵ لە حاڵەتی ئاسایی داو بەشێوەیەکی هاوکۆیی (مُعدَّل) حەفتاو سێ (٧٣) جار لە خولەکێك دا لێدەدات.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**قورئـان بیرخـەرەوەی پارێزکارانـە، بێگومـان بێبڕوایانیـش بـە درۆ دانەریـان تێـدان و، لـە ڕۆژی دوایـی دا قورئـان مایـەی خەم و خەفـەت و پەژارەو پەشێمانییە بۆیـان و، قورئانیـش ڕاسـتی جێـی دڵنیایـی و هەقـی بـێ خڵتەیـە، بۆیـە لـە بەرانبـەر بـەدرۆ دانانیانـدا، پێویسـتە نـاوی پـەروەردگاری مـەزن بـە پـاك بگیـرێ:**

وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾، بە دڵنیاییش ئەو (قورئان)ە، بیرخەرەوەیەو ئامۆژگارییکارو پەندو عیبرەتە بۆ پارێزکاران، (تَذْكِرَة)یان ئاوا لێکداوەتەوە (أَي: عِظَةٌ وَتَذْكِيرٌ لَهُم)، ئامۆژگارییەو بیرخەرەوەیە بۆ پارێزکاران، بۆچی بۆ پارێزکاران؟ چونکە هەر پارێزکاران لێی بەهرەمەند دەبن، ئەگەرنا لە ئەصڵدا خوا قورئانی ناردوە بۆ هەموو لایەك، وەك دەفەرموێ: ﴿ ... ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾یوسف، بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، بەڵام کێ لێی بەهرەمەند دەبێ؟ بە دڵنیایی ئەهلی تەقوا، ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لە کوفرو شیرك و گوناه و تاوان و لادان، ئەوانەی دەروونێکی پاك و دڵێکی ڕووناکیان دەبێ، دەتوانن قورئان وەك خۆی ببینن و لە نوورو بەرەکەتەکەی بەهرەمەند بن، بەڵام بە دەروونێکی پیس و بە دڵێکی تاریك و بە جەستەیەکی گوناهکارەوە، مرۆڤ لە خوار ئەوەوە دەبێ کە لە قورئان بەهرەمەند ببێ، لەڕاستییدا بەرەکەت و نووری قورئان، وەك میوانێکی بەڕێزە کە ناچێتە هەموو ماڵێك، دەبێ دڵ و دەروونێکی چاك و پاك ببێ، ئنجا ڕووناکیی و بەرەکەتی فەرمایشتی خوایە تێیدا نیشتەجێ دەبێ، وەك لە سوورەتی (الحجرات)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمْتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ ... ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئەوانە کەسانێکن خوا دڵی بۆ تەقوا پاڵاوتوون، تەقوا دەچێتە دڵێکی

پاڵفتەو پاك و خاوێنەوە، قورئانیشش بە ئەندازەی ئەوە کە ئێمە دڵی خۆمان پاك و دەروونی خۆمان خاوێن دەکەینەوە، دڵی خۆمان ڕووناك دەکەینەوە، لە قورئان زیاتر تێدەگەین، زیاتر نهێنییەکانی کە خوا ﷻ لە فەرمایشتی خۆیدا دایناون، تێیان دەگەین، نهێنییەکانی فەرمایشتی خواش بێ سنوورن، حیکمەت و پەندو زانیارییەکانی فەرمایشتی خوا بێ سنوورن، چونکە سیفەتەکانی خوا هیچیان سنووریان نیەو هەموویان ڕەهان، ئەو کاتە هەر کەسە بە ئەندازەی ئەوە کە دڵ و دەروونی خۆی پاك و چاك دەکات، خۆی شایستە دەکات کە لە قورئان تێبگات، لێی تێدەگاو لێی بەهرەمەند دەبێ، شاعیرێکی فارسیش جوانی گوتوە:

**گوهَرِ پاكِ ببايد كەشَوَدْ قابِلِ فَيْض گرن هَرسنگ وگلی لؤلؤ و مرجان نَشَود**

واتە: گەوهەرێکی پاك بێنە شیاوی بەسەردا ڕژانی فەیزو بەرەکەتی خوا بێ، ئەگەر هەر بەردو قوڕێك نابێتە گەوهەرو مرواریی.

**٢)-** ﴿ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەزانین (ئەی بێبڕواینە!) کە لەنێو ئێوەدا بە درۆ دانەرانێك هەن، لێرەدا ئەمە دوو ئەگەری هەن:

**أ-** یان ڕووی دواندن لە خەڵکە، ئەی خەڵکینە! ئێمە دەزانین کە ئێوە کەسانێکتان تێدا هەن، بەدرۆ دانەرن، بە درۆ دانەرن بۆ قورئان و بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ ڕۆژی دوایی، بە تایبەت ڕەنگە مەبەست پێی قورئان بێ، چونکە سیاقەکە باسی قورئانە، بەڵام کەسانێکیشتان تێدا هەن ئەی خەڵکینە! کە بەڕاست دانەری قورئان دەبن.

**ب-** ئەگەری ئەوەش هەیە کە لێرەدا ڕووی دواندن لە بێبڕوایەکان بێ، یانی: ئێوە بە درۆ دانەرانتان لە نێودا هەن، واتە: کەسانێکتان لە نێودا هەن کە قورئان بە درۆ دادەنێن، بەڵام کەسانێکیشتان تێدا هەن، کە قورئان بەڕاست دادەنێن، بەڵام دانی پێدا ناهێنن وەك عینادیی و کەللەڕەقیی، بۆ ئەوەی ئەو بەزم و بازاڕەی بە زوڵم و ستەم و لە کاتی ئامادە نەبوونی شەریعەتی خوادا، بۆ خۆتان پێکتان هێناوە، لێتان تێك نەچێ، وەك هەموو ئەو دیکتاتۆرو حوکمڕانە خۆ سەپێنانەی حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی و

عەسکەرتاریی و خۆ فەرز کردن لە وڵاتانی مسوڵمانشینندا پەیڕەو دەکەن و پەیڕەویان کردوە، ئایا نازانن کە خوا فەرموویەتی: ﴿...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ... ٣٨﴾ الشوری، کاروباری مسوڵمانان دەبێ بە ڕاوێژ بێ؟ ئەدی بابایەکی ناشایستی خۆسەپێن کە ئەو عیبادو بیلادە هەمووی بە موڵك و ماڵی خۆی دەزانێ، ئایا ئەو حوکمە میراتیی و بنەماڵەییەی لە کوێ هێنا؟ لە کوێی قورئاندا هەیە؟ ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ مامی خۆی کە عەبباس بوو، ئامۆزایەکەی کە عەلی بوو ﵄، کەسی لەوان کرد بە جێنشین؟ نەخێر، بەڵکو بۆ مسوڵمانانی بەجێهێشت، چونکە خوا بنچینەی بۆ حوکمڕانیی و ئیدارەدانی کۆمەڵگا داناوە: ﴿...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ... ٣٨﴾ الشوری، بۆیەش هاوەڵان ڕاوێژیان کرد، پێشێ پشتیوانەکان پێیان وابوو کە دەبێ خەلیفە لەوان بێ، هەروەها کۆچکەران پێیان وابوو دەبێ لەوان بێ، دوایی هەموویان هاتنە سەر ئەوە کە ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ لە هەموویان شایستەترە، لە دوای ئەبوو بەکریش ڕایان هاتە سەر عومەری کوڕی خەتتاب بەڵێ ئەبوو بەکر پێنیاری کردبوو کە عومەر بێ، بەڵام وەك کە ئیبنو تەیمییە ڕەحمەتی خوای لێبێ لە (**منهاج السنة النبوية**)دا گوتوویەتی: ئەگەر مسوڵمانان بەیعەتیان بە عومەر نەکردبایە، تەنیا بە پێشنیار کردنی ئەبوو بەکر نەدەبوو بە خەلیفە، چونکە هەق هەقی مسوڵمانانەو، ئەو پێشنیاری کردبوو ئەوانیش پێشنیارەکەیان پێ چاك بوو، پێشنیارەکەی لەجێی خۆیدا بوو، لە دوای عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ) عومەر ئەو کردیە ڕاوێژ لە نێوان شەش کەساندا، شەش کاندید، دوایی لە نێوان ئەو شەش کاندیدە بوو بە کێبڕکێ لە نێوان عوسمان و عەلییدا، بەڵام زۆربەیان عوسمانیان بە دڵ بوو، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، لەدوای عوسمانیش مسوڵمانان چوون هەر ئەوانەی کە سێ خەلیفەکانیان هەڵبژاردبوون، زۆربەیان چوون بەیعەتیان بە عەلی داو، عەلییان کرد بە چوارەمین خەلیفەی ڕاشید.

بەڵێ زۆرێك لە بێبڕوایەکانی کاتی خۆی و، بێبڕواو مونافیق و دەغەڵ و دڵنەخۆشەکانی ئێستاش، دەزانن کە قورئان هەقەو، ئیسلام هەقەو، حوکمی قورئان دەبێ چۆن بێ، بەڵام بۆچی کەیفیان پێ نایەت و، دانوویان لەگەڵی

ناکوڵێ؟ چونکە ئەو بەزم و بازاڕە ناشەرعییەی ئەوان پێکیانەوە ناوە، لە غیابی قورئاندا، لە غیابی حوکمی شەریعەتدا، ئەگەر بێت و ملکەچ بکەن بۆ حوکمی قورئان، لێیان تێکدەچێ، بۆیە ئامادە نین.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴾، واتە: هەرچەندە دەشزانین بە درۆ دانەرانێکتان لە نێودا هەن، بەڵام ئێمە هەر پێغەمبەرمان بۆ لا ناردوون و ئاگادارمان کردوونەوە، تاکو بیانووتان نەبێ و بیانوو بڕاوتان بکەین.

٣)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (قورئان)ە مایەی خەم و خەفەتە بۆ بێبڕوایان، (**حسرة**) واتە: پەشێمانیی و خەفەت خواردن لەسەر شتێك کە ڕۆیشتووەو تێپەڕیوەو ناگەڕێتەوە.

٤)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (قورئان)ە چەسپاوێکی جێی دڵنیایە، واتە: (**لَلْحَقُّ اليَقِينُ الَّذي لا شَكَّ فيهِ، أَنَّهُ مِن عِنْدِ اللهِ لَم يَقَوَّلْ وعليه مُحَمَّدٌ**)، ئەو چەسپاوەو جێی دڵنیاییەو هیچ دوو دڵییەکی تێدا نیە، کە لە لایەن خواوەیەو موحەممەد ﷺ لەخۆیەوە نەیگوتوە.

شەیتان فێریان نەکردوەو هیچ کەس فێری وی ﷺ نەکردوە، هەر کەسێك قورئان بخوێنێتەوە، دەزانێ کە جگە لە خوا ﷻ شایستەی ئەوە نیە قسەی وا بکات، لێی ناوەشێتەوەو هەڵناگرێ.

٥)- ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴾، کەواتە تۆ ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاك بگرە، واتە:

أ- بە پاکی بگرە کە هیچ کەس بتوانێ قسە بە ناوی خواوە هەڵبەستێ و، خوا سزای نەدات.

ب- یاخود: خوا بە پاك بگرە لەوە کە پێغەمبەرێك بنێرێ، دوایی ئەو پێغەمبەرە لابدات، کەچی خوا سزای نەدات.

ج- یاخود: بە پاکی بگرە لەوە کە خوا کەسێك بنێرێ شایستە نەبێ، دوایی قسە بە ناوی خواوە هەڵبەستێ.

د- یاخود: بە پاکی بگرە لەوە کە خوا فەرمایشتێك بنێرێ، وەك شیعرو قسەی کاهینان بچێ و دوایی لێیان تێکەڵبێ.

خوا بە پاك بگرە لە هەموو ئەوانە.

ئێستاش با ئەو سێ وشەیە تۆزێك شی بکەینەوە: (التَّذكِرَة، الْحَسْرَةُ، وَحَقُّ اليَقِين):

**یەکەم:** (التَّذكِرَة)، (**التَّذْكِرَةُ: اسْمُ مَصْدَرِ التَّذْكِيرِ، وَهُوَ التَّنْبِيهُ إِلَى مَغْفُولٍ عَنْهُ، وَالْمَعْنَى: أَنَّهُ مُذَكِّرٌ لِلنَّاسِ بِمَا يَغْفُلُونَ عَنْهُ**)، (**تَذْكِرَة**)، ناوی چاوگەو بریتیە لە ئاگادارکردنەوەی کەسێك لە شتێك کە لێی بێئاگا بووە، واتە: ئەوە بیرخەرەوەی خەڵکە بۆ شتێك کە لێی بێئاگان.

کە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خواو چۆنیەتیی ژیان بەو شێوەیەی خوا پێی خۆشەو وریا بوون لەو چارەنووسەی چاوەڕێی دەکات لە ڕۆژی دوایی دا.

**دووەم:** (الْحَسْرَة): (**الْحَسْرَةُ: النَّدَمُ الشَّدِيدُ الْمُتَكَرِّرُ عَلَى شَيْءٍ فَائِتٍ مَرْغُوبٍ فِيهِ، وَيُقَالُ لَهَا: التَّلَهُّفُ، اشْتُقَّتْ مِنَ الْحَسْرِ، وَهُوَ الْكَشْفُ لِأَنَّ سَبَبَهَا يَنْكَشِفُ لِصَاحِبِهَا بَعْدَ فَوَاتِ إِدْرَاكِهِ وَلَا يَزَالُ يُعَاوِدُهُ**)، (**حَسْرَة**): بریتیە لە پەشێمانییەکی زۆری دووبارە بووەوە لە سەر شتێك کە جێی ئارەزوو بووە بەڵام تێپەڕیوە، بە (**حَسْرَة**)یش دەگوترێ: (**تَلَهُّف**)، وشەی (**حَسرَة**) لە (**حَسر**)ەوە هاتوە، {دەگوترێ: (**حَسَرَ عَنْ ذِرَاعِهِ**)، واتە: قۆڵی هەڵکرد}، (**الحَسْرُ: الكَشْفُ**)، هەڵکردن دەرخستن، چونکە هۆکاری ئەو پەشێمانییە بۆ خاوەنەکەی دوای ئەوەی شتەکە تێپەڕیوە بۆی ڕوون دەبێتەوەو بەردەوام ئەو خەفەت خواردنە بۆی دووبارە دەبێتەوە.

**سێیەم** (**حَقُّ اليَقِين**)، زانایان دەڵێن: زانیاریی سێ پلەی هەن: (**عِلْمُ اليَقِيْن، عَيْنُ اليَقِين، حَقُّ اليَقِين**)، کە هەرسێکیان لە قورئاندا هاتوون:

**١-** (**عِلمُ اليَقين**): (**الجرجاني**) لە (**التعريفات**)ەکەیدا[١] هێناویەتی، دەڵێ: (**عِلْمُ اليَقِيْن: مَا أَعْطَاهُ الدَّلِيلُ بِتَصَوُّرِ أُمُورٍ عَلَى ما هُوَ عَلَيهِ**)، واتە: (**عِلمُ اليَقين**) بریتیە لەو زانیارییەی

---

(١ ) ص١٥٦.

بەڵگە دەیبەخشێ بەهۆی ئەوەوە کە کارەکان بەو شێوەیەی هەن وێنا دەکرێن لە مێشکدا.

٢- (عَينُ اليَقِين): بریتیە لە بە چاو دیتنی ئەوەی بە بەڵگە چەسپێنراوە.

٣- (حَقُّ اليَقِين) بریتیە لە دەست لێدانی، یاخود چوونە نێوی، یان مامەڵە لەگەڵدا کردنی، زانراوەکە، یەکێك لە زانایان دەڵێ: بۆ وێنە کە باسی کەعبە دەکرێ، کە یەکەمین ماڵی خوایە لەسەر زەوی دانراوە، ئەگەر باس بکرێ بە شێوەیەك کە بۆ مرۆڤ تەواو جێی دڵنیایی بێ و ببێتە زانیارییەکی جێی دڵنیایی، کە ئەو کەعبەیە لە شاری مەککەیەو، لە فڵان شوێنەیەو، لە ڕووی جوگرافییەوە ئەوەندە دوورە، ئەوە پێی دەگوترێ: (عِلمُ اليَقِين)، (عَينُ اليَقِين)یش ئەوەیە کە بچێ و بە چاوی خۆی کەعبە ببینێ، (حَقُّ اليَقِين) یش ئەوەیە کە بەکردەوە دەست لە دەرو دیوارەکانی بداو بە دەوری دا بسووڕێتەوە.

یاخود شانە هەنگوینێك: (عِلمُ اليَقِين) ئەوەیە کە بۆت باسبکەن هەنگوین ئاوایەو ئاوایە، (عَينُ اليَقِين)یش ئەوەیە شانە هەنگوینەکە ببینی، (حَقُّ اليَقِين) یش ئەوەیە کە لەو شانە هەنگوینە تام بکەی، ئەو سێ پلەیە بۆ زانیاریی هەن، کە دیارە باڵاترینیان (حَقُّ اليَقِين)ە.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیر کردنی سوورەتی (الحاقة) دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

# نێوەڕۆک